# ٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا





حازمی عەلی کوتک

یادداشت و بیرەوەری

# ٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا

## حازمی عەلی کوتك

٢٠٢٠




**کتێب:** ٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا

**بابەت:** یادداشت و بیرەوەری

**نووسینی:** حازمی عەلی کوتك

**هەڵەبڕی:** هێمن زەندی

**دیزاینی ناوەرۆك:** شۆڕش غەفووری

**دیزاینی بەرگ:** هەڵمەت حازم

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**نرخ:** ١٠٠٠٠ دینار

**چاپ:** یەکەم- ٢٠٢٠

**چاپ و بڵاوکردنەوە:** دەزگای فێربوون

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارە سپاردنی (٣٣) ساڵی ٢٠٢٠ی پێ دراوە.**

**پێشکەشە..**

بـەو مرۆڤانەی لە پێنـاوی پێکەنینی منداڵەکانیان، منداڵی خەڵک ناگرییێنن.

•

# ناوەڕۆك

**هۆزەکان**

# پێشەکی

**خوێنەری قەدرگران:.**

مەبەست لە نوسینی کتێبی ( ٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا) هەڵدانەوەی گۆشەیەکی شانۆ سوتاوەکە و ترازاندنی دەرخۆنەی سەر دەلاقەی ئەو مەنجەنیقەیە، کە ژیانی زۆر خێزانی کوردی تیادا بوو بە سوتماکێکی فەرامۆش کراو.

لە زۆربەی لاپەڕەکانی، هەست بە تامی تفت و تاڵی شکستەکانی خەباتی چینایەتی و خەباتی ڕزگاری خوازی گەلی کورد دەکرێ. بۆ شکان و ناوزڕانی هیچ کەس و لایەنێک نییە، بەڵکو هەوڵدانە بۆ ڕێگری لە دووبارەبونەوەیان. لەگەڵ نوسینی زۆر لە ڕووداوەکان، کەوا بۆ من زۆر بە ئازار و بە سۆن، کولانەوەی قەتماغەی برینی کەون و نوێی هەموو ژیانمە. ئەگەر ئەو غرورە ساویلکەیەم بەسەرمدا زاڵ نەبوایە، ڕەنگە لەگەڵ زۆر لە بابەتەکان تێر گریابام. هیوادارم بە سینگێکی فراوان و، تێڕامانێکی سەردەمیانە نوسینەکانم وەربگرن

# دەستپێك

**خوێنەری بەڕێز:**
بەر لەهەرشتێک داوای لێبوردن دەکەم، کە نەمتوانیوە ئەو کتێبە بەزمانێکی ئەدەبی سەردەمیانە بنووسم. چونکە ئەو کۆلکە خوێندەوارییەی من هەمە، نەبەشی ئەوە دەکات و نەیارمەتی دەریشمە بۆ ئەوکارە.
لەمێژە، هەتادێت کۆڵەپشتەکەم وەک قورقوشم قورس دەبێ، هێندەی ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سەربازی و سیاسییەکانی شەست و پێنج ساڵی تەمەنمی تێ بئاخنم، بێ ئەوەی بزانم کامیان بەکەڵک دنیام دێ و کامیان بۆ قیامەت دەشێ. کاتی ئەوە هاتوە، بەنقەنق بیگەیێنمە سەر دووتوێی لاپەڕەکانی ئەو کتێبە، تاوەکو هەردوو قوژبنی بگرم و هەڵیبرێژم، هەتا عەشتەبای تێدا نەهێڵم. بۆ ئەوەی، کۆڵەکەم سووک بێت. دەمەوێت لەو پێنج و دووو ڕۆژەی ماوە لە ژیانم هەناسەیەکی ئاسوودە هەڵمژم. ڕووداوەکان بەجۆرێک سواری سەری یەکتربوون و کەڕەسیسە یان کردوە، ئەگەر (هەڵم و بەڵم) و(قرشەشکێنم)کردبێ هەر بۆ ئەوە بوە زوو لەئەستۆی خۆمی دارنم. هەڵاواردن و هاوێرکردنەکەی بخەمە ئەستۆی ئێوە. بۆئەوەی ئەو ڕاسپارەدەیە چیتر دوولینگانم لەسەر ئەستۆیدا نەهێنێ. وەک ئەوە وایە: کاروان چیەکان لەبەر دەرگا چاوەڕێم بکەن، تاوەکو لەسەر چینچکان پارویک نان دەخۆم، منیش بەرداشی کاکیلەکانی ئێستام هەر ئەوەندەم بۆ دەهاڕن، ناچارم وەکو قەلی بەڕووخۆر بەسەر یەکیدا ئاوا بکەم. هەوڵ دەدەم لەتوربێنی میمۆری مێشکم ئەو هەموو کەوتن و هەڵسانەوەو سووتان و کوژاندنەوەو سەرکەوتن و ژێرکەوتنە، ئەوهەڵەو ڕاستیی و گریان و پێکەنین و شین و شای و خوێن و پاکی و ناپاکیانەی بەدرێژایی تەمەنم، بەچاوی خۆم

بینیومــن، یاخــود دایک و باوکم بۆیان گێڕاومەتەوە، کاوێژی بکەمەوە و چۆڕبڕی بکەم.

دەزانــم ئەوەنــدە بە پەلە پروزێ پەرش و بڵاوم کردوە، دەبێ تۆی بەڕێز ئەرک بکێشــیت، گێشــکەو ســەلەند و بێژینگی بکەی. بۆ ئەوەی سەرکۆت و بنکۆت و کوزرەکەی لێک جیا بکەیتەوەو کاکڵەکەی گل بدەیتەوە و توێکڵەکەی فڕێبدەی. ئەگــەر زانیــت تیکەیەکی تێدایە بەکەڵک پینەی ئانیشــکی کورتەکەکەت، یاخود سەرچۆکی شەڕواڵەکەت دێت. ئەوا لەلایەکیدابنێ!! ئەو بزگوڕانەی تیتۆڵ تیتۆڵ بــوون، هێندە کۆن و کلاســیکن کــە بەکەڵکی هیچ نایەن. هەتا دەســتت تێدایە تووڕیان هەڵدە، وەک شــڕەو بڕەی بێ سوود، با شوێنت لێنەگرن.

مەبەســتم لەنووســینی ئەو کتێبە ئەوە نییە خۆم وەک کارەکتەری (حەمەدۆک) وێنابکــەم، یــان مێژوی خەباتی خــۆم و بنەماڵەکەمان بخەمە بــەر دیدی پارتە سیاسیە دەستڕۆیشتوەکان، بۆ ئەوەی لەبەر تەرازوی فرۆشتنی بنێم، بەچەشنی ئــەو قەڵــەم چاو شــۆڕانەی لەوەرگەیــان گواســتەوە. ڕەنگە منیــش ڕۆژگارێک دەروێشــی گەرمــە تەریقی پارتێکی سیاســی بووبم. بەهەمــوو کارە دزێوەکانیم گوتبێت: دەستخۆش، چاکت کرد، بەڕاستی شاکارە!! بەڵام لەهەشتاکانی سەدەی ڕابــردوەوە هەوڵــم داوە خۆم بم و ســەربەخۆبم، بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕین، کە کاتی بەخشــینەوەی پۆســت و پارە بوو بەســەر کۆیلەو ویژدان فرۆشەکان. نەم ویســتوە مێژوی خەباتی پارتێکی سیاســی دیاریکراو بنووســمەوە، چونکە ئەوە نــەکاری منــە و نەمن دەتوانــم خۆم لەقەرەی وەهــا بابەتێک بــدەم. (باول)ی ئەرشــیفی دیکۆمێنتەکانی هزرم ئەوەندە بەبڕشــت نییە، بــەڵام هەوڵم داوە ئەو ئەســتێرە پڕشــنگدارانەی ئاســمانی خەباتی چینایەتی و نەتەوەیی ونیشتیمانی گەلەکەمان، کەدۆســیەی ئەرک و ماندووبوونیان لەسەر ڕەفەی فەرامۆشی تۆزی زەمەن داپۆشــیون. وەک میراتی بێ وارس، یان دە دزرێ، یان دەشــێوێندرێ. مــن وەکــو ئەرکــی ویژدانی و ئەخلاقــی، لەهەمبەر ئــەو کەڵە پیاوانــەی مێژوو بەئەنــدازەی زانیاریــم لەســەریان ئامارەیان پــێ بدەم. چونکــە دەبینم نەکەس باس و خواســێک و نەکەس خاوەنداریشــیان لێ دەکا. هەر بۆیە دەمەوێ تۆز و

گەردی ڕۆژگاریان لێ بتەکێنم و بیخەمە بەردیدی ئەو نەوەیەی ئێستا، کە ڕۆژانە مێژویکی چەواشــەکراوی دەرخوارد دەدرێ، لەلایەن دەرچووانی (مەرکەز شەباب وتەلایعی)بەعســی دوێنێ وکادیری پێشکەوتوی حیزبەکانی ئەمڕۆ.

لەنیوەی دوەمی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیست و یەک، شاهێدی زۆر ناهەقــی و داماڵیــن وکەوڵ کردنی کەرامەتی مرۆڤەکان بووم. ڕەنگە لەو ســەدە پــڕ ســەرانگرێ بــوون و هەڵســانەوەو، بەفیرۆدانی ئەو هەمــوو تاقەتە مرۆیی و ماددیەی گەلەکەمان، بەدەستی ســەرکردەکانمان. وە بینینی ناپاکی نیشتیمانی و نەتەوەیــی و ئەخلاقــی و نۆکەرایەتــی داگیرکەرانی کوردســتان و چەمانەوەو خۆزەلیــل کــردن لەبــەر دەمیان. ئاخرئــەوان لەوەتەی هــەن برینەکانمان قوڵتر دەکــەن، خوێن وفرمێســک هەڵدەهێنجن، بەتایبەتی لــە دوای ڕاپەڕین. دەتوانم بڵێــم: ســەردەمی داماڵین و ئاوەڕووت کردنی کۆمەڵــگا بوو، لە بەها جوانەکانی مرۆڤایەتــی. لەلایەن دەســەڵاتی خۆبەخۆ، ڕۆژانە بەچاوی خــۆم دەمبینی، دیل کوڕە گرگنەکان، وەک گیســکە نێر، هەر بابا بوو لەپاشڕا هەڵدەهاتنە دایکیان!! چەقۆ کێش و هەتیو خەسێنەکانیشــم دەبینی، بەشمشــێرەکانیان، کەزی دایکی شــەهیدانیان خشــت و خشــت لەبنڕا دەبڕی، بۆ هەوســاڕ و ڕێشــمەی ئەســپی تەنگە تاوی داگیر کەران. کاتێک دەمبینی، بەرپرسە نمەک حەرامەکان خەریکی خەســاندنی ئەو مرۆڤە خاوەن هەلوێستانە بوون، کە بەیعەتیان بەپیس خۆرییان نــە دەدا، ئــەو ڕووداوانەی نەدەبایە بێن و ببن، کەچی هاتن و بوون.

من شــتێکم نەماوە لەدەســتی بدەم، جگە لەســەربەخۆ بوونم، کەتاوەکو ئێســتا پاراســتوومە و زۆر شتیشــم لە پێناویدا بەخشــیوە و لەدەستداوە. لەوکاتەدا کە هەســت دەکەم دەســتم لە قوژبنی جەوال دەرچوە، دەشــێ بۆ ڕەشــکردنەوە و نووســینی لاپەڕەکانی ئەوکتێبە، سۆزی خۆم پێ جڵەونەکرابێ لەنووسینی چەند بابەتێک. قەلەمەکەم هەرزەلی بێت و ســەرچیغ چوبێ.

بــە ڕێژەیەکــی زۆر دیماگۆگیــەت و چەواشــەکاری ئامانجی خــۆی پێکاوە. ئای چ ئازاریەخشــە کە دەبینم کۆیلە و خەســێندراوەکان، شــوکرانە بژێری قەدەری خۆیانن، ڕۆژانەش ســوکایەتی بەخەبات و ماندووبوونی تێکۆشەرە ڕاستەقینەکان

دەکرێ. کاتێک بەدەرکەوان و ڕێکخەری شــەوانی ســوری بەرپرسان و گارسۆنی مێــزی شــەڕابیان دەگوتــرێ (پێشــمەرگە)!! ئای چەنــد لەمــرۆڤ بوونی خۆم دەکەومــە گومان کاتێک، زەقە زەق لەنغرۆ بوونی وڵاتەکەم لەناو مەنجەنیقی بێ دادی بڕوانم. لانی کەم وەک پەڕەسێلکە، قومێک ئاو بە ئاگری ابراهیم دانەکەم. بەئەرکــی ویژدانــی خۆمم زانیــوە ئەگەر بەدێڕێکیش بێت باســی ئــەو هاوڕێ و برادەرە خۆشەویســتانە بکــەم، کەلەپێناو ئــازادی ودادپەروەری وپێشــکەوتنی کۆمەڵایەتی بەســەخاوەتەوە گیانیان بەخشــی. پێم خۆشــە باڵای خۆم لەئاست گەورەییــان بچەمێنــم. ئەگەر لەپارتەکەی منیش نەبووبن، کە ئەوە لایەنی کەمی وەفادارییە.

تــا ئەو پەرتووکە بەچاپ دەگەیەنم، خــۆم وەک ئەومرۆڤە دێتە بەرچاو، لەدوای سی ساڵ هاوسەرگیری، بۆ یەکەم جار دکتۆر مژدەی لەدایک بوونی کۆرپەیەکی پێبــدات، من هەمان هەســتم هەیە بــۆ ئەم کتێبە. لەکۆمەڵــگای ئێمەدا، ئەوەی منداڵــی نەبــێ و نەتوانــێ وەچە بخاتــەوە، پێی دەڵێن: وجــاخ کوێر. بەڵام من تێڕوانینــم جیــاوازە، پێــم وایە: ئەو کەســەی خوێندەوارە و چەنــد لاپەڕەیەکی نووسراو لەدوای خۆی بەجێ نەهێڵێت،، وجاخ کوێری ڕاستەقینەیە!! بۆیە منیش هاتووم بۆ ئەوەی بە وجاخ کوێری نەمرم، ئەوەندەی هێز و توانا و خوێندەواری و ئەقڵم پێیدابشکێ، دەستم داوەتە قەلەم، تا لوغە لوغێک بکەم و مرۆڤی ژێری وەک بەڕێزتــان لێــم تێ بگات. هەوڵیشــم داوە کە هیچ پارتێــک و کاراکتەرێکی ناو پارتە سیاســیەکان نەبوێرم و خاتریان نەگرم، وە بێ ئینسافیشیان بەرامبەر نەکەم.

خوێنــەری بەڕێــز: لەگێڕانەوەی نوکتــە و بابەتە کۆمەڵایەتیــەکان هەندێک ناوی جەســتەی مرۆڤــم هێنــاوە کە ناو هێنانیــان لەکۆمەڵگای ئێمەدا یاســاغە. بەڵام من نەهاتووم، مت و مورووی وەک (ئاشــاک و پەرژینی بەگوڵان قایم بێ و دوور لەڕوی جەنابتان ) زۆر لەو ئاگر بڕانەی پێ هەڵواســم!! چونکە پێم وابوو چێژی خۆیــان لەدەســت دەدەن. بۆیە داوای لێبوردن لەئێــوەی ئازیز دەکەم، ئەگەر نا لەفەرهەنگــی خۆم و خانەوادەکەم جنێودان بوونی نییە.

لەســەر لووتکەی تەمەنمەوە، تای ماشــەری ژیانی خۆم هەڵدەوێژنم، تا دەگاتە ئــەو گرێ کوێــرەی مامانەکەم بە کلەوە، لەناوکی دام. ئەگــەر هەموو کتێبەکەم بەزمانــی نووســینی ئەو دەســتپێکە بنووســیبایە، دەبوو ســاڵانێک بەدیارییەوە دانیشــتبام و زۆری تەمەن و کاتم پێ بەخشیبایە!!
کاتێک کەمن هێندە بەخشــندە نیم ئــەو چاوەڕوانییەت لێم هەبێ، بۆیە پێم وایە شــەقاوەکانم هەڵێناوەو و ڕستەکانم درشتن. هیوادارم ئەگەر سوودم بەنەوەکانی داهاتوو نەگەیاندبێ، زیانیشــم لێ نەدابن.

**حازمی عەلی کوتک**

# سوپاسنامه

لـەدوای گەڕانـەوەم لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان، لـە دەروازەی ڕاپەڕیـن (ڕانیە) نیشتەجێ بووم. ڕێگای چونم بۆبازاڕ، بە بەردەم بارەگای حیزبی زەحمەتکێشان دابوو. زۆرجار لام دەدا ئەو بارەگایە، زۆربەیان برادەری شـاخ بوون.
بەگەنجێکی خوێندەوار ئاشـنا بووم، بەناوی (هەندرێن شـێخ ڕاغب). ئەوگەنجە، بێ ئەوەی کەس دەستی بگرێ و فێری مەلەوانی ناو وشەکان و ڕستەکانی بکات. بەهەوڵـی کەسـی خۆی، بوەتە مەلەوانی ناو وشـەکان، چەنـد کتێبێکی بەچاپ گەیاندوە.
هەرجارێکی، باسـی بەسەرهات و ڕۆژانی پێشـمەرگایەتیم دەکرد، کاک هەندرێن هەموو ئەندامەکانی جەستەی دەبوون بە گوێ. ئێستاش، کوڕو برا و ئامۆزاکانم، هێنـدەی کاک هەندرێـن، بەسـەرهاتەکانی ژیانی منیان لەهزر نـەڕواوە، هەموو جارێک دەیگوت: کاک حازم بۆ نایان نوسـیەوە؟ من بۆت تایپ دەکەم و ڕێکی دەخـەم، بۆ ئەوەی بیکەی بە کتێبێک.
ئاخر کورد گوتەنی: ئەگەر زمان لێت بگەڕێ، سـەر سـەلامەت دەبێ. بەڵام کاک هەندرێن زمانی یارمەتی نەدا، بۆ ئەوەی سـەری سـەلامەت دەرچێ. تاوەکو ئەو ئەرکە سـەنگینەی خسـتە سەرشـانی خۆی. منیش بیرم کردەوە، گوتم: ئەوەی من لێی دەگەڕێم بەپێی خۆی هاتۆتە بەردەسـتم، خۆشناو گوتەنی (ئەوە توتنێ خۆنە).
هەمـوو جارێـک دەیگوت: ئەرێ هاوڕێ حازم چیـت کرد؟ منیش خۆم دەگرخاند و پاسـاوی بـێ بنەمام دەهێنایـەوە. تا وای لێهات زۆری دەهـری کردم. گوتم: بەخوای ئەمن ئەو هەندرێنەی بناسم لەخۆی ناگەڕێ. ڕۆژێک لەبەر دەرگای ماڵی خۆمان، یەک فەردەی داخ سـوری شـیش کوتم، پڕاوپڕ لە وشە لەبەردەمی دانا. یەک ڕبە، فاریزە و هێمای پرسـیار و هێمای سەرسـوڕمان، خاڵی هەڵوێسـتە و

واوی زیاد و حەوتی ژێر ڕێ و سەرییێ یانم بەسەردا کرد و دەرکم بەست. گوتم: دەوجا دان بژێر و بەردە شۆری بکە. دیاربوو بەو حاڵەش هەر ڕازی بوو. تاوای لێهات ئێستا زۆرجار دەڵێم: کاک هەندرێن بەخوای چاکت توش کردم!!

**هیوادارم لە ئایندەدا ببێتە ئەستێرەیەکی پڕشنگداری ئاسمانی نوسینی کوردی.**
**بۆیە دەمەوێ پڕ بەدڵ سوپاسی بکەم و هیوای سەرکەوتنی بۆ بخوازم.**

# لەدایکبوون و منداڵیم

دیارە هەموو وەرزەکانی ساڵ جوانی خۆیان هەیە، لەناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازی هەیە، ئەوەی لەپایز زۆرم پێ خۆشە: بۆنی یەکەم بارانی ساڵە. کاتێک بەسەر قەسەل و کوزرە و بن جۆخین و خۆڵەپۆتی بزنە ڕێگا و خۆڵ وگردیلەکانی سـەر شارە مێرولەکان، نەرم نەرم دادەبارێ. پێم لە بۆنی بەناوبانگترین گوڵاوی فەرەنسـی خۆشـترە. لەهەڵمژینی تێرنابم، تاوەکو هەموو خانە هەسـتیارەکانی بۆنکردنمی لێ تەژی دەکەم.

گوندی (گردلانکە)لـە دەشـتی دزەیـی، دەکەوێتـە بنـاری زورگـەزرا و، ڕوبار و نـزە ئاوێکـی بەپێشـدا تێپەڕ دەبێ. پڕە لـە زەل وقامیش، بۆتـە لانەی بۆق و کیسەڵەکان. گوندیەکان، لە پایزان هەر بابایە وەک مێرووله خەریکی کێشانەوەی دانەوێڵەکانیانـن، وەک: بـاراش و بنەتـۆ، بۆ داکردنی لە چـاڵ و عەمبارەکان. کادێنەکانیش دەئاخنن، هەتا بن میچی بانەکان لە تفاق و ئالیک بۆ ئاژەڵەکانیان. قشپلدان، پڕاوپڕ دەکران لە قشپل و سەرگین، تاوەکوولەکاتی سەرمای زستاندا، بۆ خۆگەرم کردنەوە بەکاری بهێنن.

کۆکردنەوەی بەرهەمە لەخۆ زیادەکانی وەک: گەنم، جۆ، نیسک، نۆک، گیسک و کاوڕە نێر، گۆلک، بۆ فرۆشتن لەشارەکان. کاتێک گیرفانەکانیان گەرم دەبوو، لە گەڕانەوەیاندا، شـەکرو چاو، جل وبەرگیان بۆ خاو وخێزانیان دەکڕی، بەدەستی پڕ دەگەڕانەوە.

کـە ئیش وکار کـەم دەبوو، ئەو قەیرە کچانە، مێخـەک بەندیان لە ملی دەکرد، لەگەڵ چەند ڕستە توێکڵە پرتەقاڵێک کە شەوی ڕابردوو خواردبویان. (لەچەندین ماڵ سـاڵی یەکجار بە ڕێکەوت پرتەقاڵ دەخورا) بۆیە توێکڵەکەی فڕێ نەدەدرا، کچـان لەبەرۆکـی خۆیـان دەدا. کاتێک ڕوەو شـەماڵ لەسـەر کـۆل و بیری ئاو دەگەڕانـەوە. ئـای کە چ بۆن و بەرامێکیان گەوال ،گەوال لەدوای خۆیان پەرش و بڵاو دەکردەوە.

لەچاوەڕوانـی ئـەو کوڕو کچانەی لەیەکتر مارە کرابـوون، چاوەڕوانی پایز دەبن،

بۆئــەوەی بچنە جلکان. ڕاســتە پایز وەرزی لێــک دابڕانی گەڵا و دارەکانە، بەڵام لــەوێ وەرزی بەیەک گەیشــتنە. لەوکاتەی قەتێ کــۆچ دەکەن، قاز و قورینگ و مراوی، پۆل پۆل وەک لەشکرێکی بەدیسپلین بەتاقی ئاسمانەوە، دەشتی هەولێر بەجــێ دێڵن، لەوکاتەی خڕنوکەکان دەبنە مەحچەچە.

## یەك لەو شەوانەی پاییزێ..

شەو ڕادەشکێ، قیرەی بۆقەکانی دەو ڕوباری گردلانکە، لەگەڵ قیژەی دایکم، بێ دەنگی شــەو دەقەڵاشن. لەو سەردەمە بۆ ژنی کورد چەند ڕوومەتێکی گەورەبوو کــەوا نۆبەرەی کوڕ بێ. شــوکر ئێســتا لەنــاو خێزانی کورد ئــەو جیاوازییە کاڵ بۆتەوە، بەتایبەتی لەلای ئێمە.

باوک خەریکە باڵدەگرێ میراتگرو پشتیوانی پەیدا بوو. دراوسێ و قەوم و قیلە، کۆدەبنەوەو ئێشــک دەگرن بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ، (پێی دەڵێن شــەوارە) نەبادا شەوە بمبا!!

باوک و باپیرم جوتیارو مەڕدار بوون، لەو دەشتە پان وبەرینەی دەشتی دزەییاتی (واتە دەشتی هەولێر). لەگوندی گردلانکەی گەورە، لە شەوێکی پایزێ هاتومەتە دنیــا. وەک دایکــم دەگێڕێتەوە: لەپاش کۆتایی وەرزی هاوین و ســەرەتای پایز. ئەوکاتەی خەڵک چیتر لەدەرەوە ناخەون، لەدوای هەڵهاتنی ئەســتێرەی گەلاوێژ دەچنــە ژوورەوە بــۆ خەوتن. وردە وردە ســەرما دەســت پێدەکات. لەدەشــتی هەولێر، بەو کاتە دەوترێ: (ســەرپەر) واتە: کاتی بارینی یەکەم بارانی ســاڵ.

گردلانکــە دوو گونــدە، گردێــک لە شــێوەی لانک لە نێوان هــەردوو گوندەکەیە، گردلانکە کەوتۆتە بناری زورگەزراو، ڕۆژئاوای شەقامی سەرەکی نێوان قوشتەپە و پــردێ. لەپایــزی ١٩٥٤ لەگەرمــەی ناکۆکی نێوان ئاغا و جوتیارانی دەشــتی دزەییاتی و سوێندخواردنی جوتیارەکانی گوندی قازیخانە و گردلانکەو گەڕەشێخان و زۆربەی گوندەکانی تری دەشــتی هەولێر، هاتوومەتە دنیا.

زۆرجار گلەیی لەبەختی ڕەشــی خۆم دەکەم، بۆ لەو ســەدە پڕ لە کێشمەکێشەو ناکۆکیە لەدایک بووم؟!!

وەک خەیامی نەیشابووری دەفەرموێ:

هاتن بەدەست خۆم نەبوو هێنایانم
دەرچونــە دەریش چۆنە و کەیە نازانم
خۆزگە نەهاتبام نەچوبام و نەببام
لەو گێرەو کێشــەیە ڕەحەت با گیانم

# چاوکردنەوەم لەناو کێشە چینایەتییەکان

ئەوکات کێشە چینایەتیەکان لە ئەوجی خۆیدا بوو. کێشە نەتەوایەتیەکان، لەناو کێشە چینایەتیەکان ون ببوو. بەڕێژەیەکی زۆر سوخرەی ئاغا و چەوساندنەوەی جوتیــارە هــەژارەکان لەهەموو کێشــەکانی تر زەقتر بوو. بۆیە (حاجی ســمایل ســولاحی) لەقازیخانــەو (حاجــی تاهیر)ی باپیرم لــە گردلانکــەو ماڵی (عەلی کوێخا قادر، ســەلیم برایم) لەگەڕەشــێخان و زۆربەی گوندەکان، جوتیارەکانیان کۆکردۆتــەوەو پێشــەنگایەتیان کردوون. بۆ ئەوەی ســوێند بخــۆن بە قورئان و تەڵاق، بڵێن: (خێرمان خێرو شــەڕمان شــەڕ). بەیەک دەنگی بە ئاغاکان بڵێن: نەخێر بۆ ســوخرەو بێگاری و چەوســانەوەو سەرانە بە ڕێژەی (چوار لە بیستی) بەرهەمەکانیان بۆ ئاغا.

سوخرەی ئاغا بریتی بوو لە: هەر ماڵێک هەڵسن بە برینی چەند هەزار خشتێک بۆ خانوو دروســت کردن بۆماڵی ئاغا، (چونکە دیواری ماڵی ئاغاکان لەمەترێک پانتــر بــوو)، پێیــان دەگوت: خشــت و نیو. بەرزیشــی ســێچار بەقــەد خانوی جوتیــارەکان بوو. بە جوتیارەکان دەگوترا: کرمانج.

ئاغا، مەلای گوندی لەســەر پارەو خەرجــی جوتیارەکان ڕەوانەی حەج دەکرد!!

ئەو خانوانە بە بازوی جوتیارەکان هەڵدەچندرا، حەسار لەچوار دەوری خانوەکە دەکێشرا.

لەداهاتی ســاڵانە دەبوایە لە بیســتی چوار بدەن بەئاغا (واتا لەســەدا بیســت).

دەبوایە بۆ خۆشــت بۆی بەریتەماڵەوەو بـۆی دا بکەیت لەعەمبار. بەهارێک کە وەرزی درونە نییە، لەبەهاران باراش واتە (گەنمی ئاردو جۆ)کەم دەمێنێ، فشار بۆ باپیرم دێنن، کەوا حەلبەیەک گەنم (واتە شازدە تەنەکە ) بفرۆشێ و پارەکەی ببـات بـۆ ماڵی ئاغا. لەبەرئەوەی کوڕی ئاغا لـە قومارکردندا پارەی دۆڕاندوە!! دەبـێ باجەکـەی جوتیارەکان بیـدەن. یەکێک ژنـی بۆ کوڕی هێنابـا، دەبوایە پارەیەک بدات بە ئاغا. ئەگەر شایی دەبوو لە گوندەکان، ئاغا لە شاییەکە چاوی دەگێڕا، دەیگوت: کچی فلان یان بوکی فلان بۆ دیار نییە لەناو شایی؟ زۆر جار خاوەنەکەی ســزای ماددی دەدرا!! بوک دەبوایە بچێتە دەســتی کوڕی ئاغا لەناو شـاییدا، پاشان دەچوە دەســتی زاوا، پیاوەکان بەتەنها نەدەچەوسانەوە، بەڵکو ژنەکانیـش دەچەوســێندرانەوە. دەبوایە هەوێزی ماڵی ئاغا بماڵن، قشـپلەکەش بکێشـنەوە ژووری، بۆیان دابکەن بۆ سـوتاندن لە زسـتاندا. ئاغاژن هەر ماڵەی چەند بەنێکی بۆ دەناردن، هەریەک بە ئەندازەی نیو مەتر درێژبوون. چەند بەن بوایە، دەبوو ژنی ئەو کرمانجە ئەوەندە گەسکە بۆ ئاغاژن دروست بکات و بۆی بەرێتـەوە ماڵەوە. نەدەبوو یاریەکانی نـاو گوند کوڕی ئاغا بیدۆڕێنێ لەبەرامبەر کـوڕی کرمانجەکان!! منداڵی کرمانجەکان نەدەبـوو لەقوتابخانە بخوێنن، چونکە مـەلاکان دەیانگوت: (عیلمی شـەیتان) فێردەبن، بەڵام بۆ کوڕی ئاغا حەڵاڵ بوو بخوێنـێ!! ئـەو جوتیارانـەی ملیان بۆ ئاغـا کەچ نەکرد، وەفاداربوون لەسـەر سـوێندخواردنەکەیان هەمویان دوورخرانەوە بۆناوچەکانی تر، بۆ نمونە: (حاجی سمایل سولاحی) لەقازیخانە لەگەڵ چەند کەسێکی تر، کە پێشەنگی جوتیارەکان بوون، بۆ ڕانییە دوورخرانەوە. (حاجی تاهیر)ی باپیرم لەگەڵ چەند کەسێکی تر، بۆ مەخمور دوور خرانەوە. (علی کوێخا قادرو سەلیم مام برایم) و چواردە ماڵی تر بۆ سـەیادەی خوار کەرکوک دوورخرانەوە. ماوەی شـەش ساڵ لەوێ مانەوە. بەم شـێوەیە ئەوانەی نەچونەوە ماڵی ئاغاکان بۆ پاکانە دوور خرانەوە. ئەوانی تـر خەریکی چاکردنەوەی تەڵاقەکانیان بوون لەلای مەلاکان. مەلاکان بڕیاریاندا کـە دەبێ مـارە بەجاش بکرێن، (مارە بەجاش ژنەکەیان لەپیاوێک مارە دەکرد، دەبوایە شـەوێک لەگەڵی بخەوێ، پاشان سێبەسێ تەڵاقی بدات، ئینجا لەمێردی یەکـەم مارە دەکرایەوە) بەم شـێوەیە تەڵاقی چاک دەبـوەوە. بەڵام هەندێکیان بەم شێوەیە ڕازی نەبوون، مەلا بیری لە شتێکی تر کردەوە، ژنی تەڵاق کەوتوی

وا هەبوو لە کەڵەشـێر مارە دەکرا، پاشـان کەڵەشێرەکەیان سەردەبڕی و ژنەکە بێـوەژن دەبـوەوە و لەمێردی یەکەم مارە دەکرایـەوە. ئاغا و مەلاش دەکەوتنە سـەر گۆشـت خواردنی کەڵەشـێر. هەندێکیان لە جـرج و هەندێکیان لە گۆزەو شـەربە، مارە بەجاش دەکرد. بەم شـێوەیە تەڵاقی جوتیارەکان لەلایەن مەلا و ئاغاکان چاک دەکرایەوە. لەناملیکەی ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشـتی هەولێر وەک خۆی، کە وێنەی مامم (پیرداود و حاجی بەسێ)ی مامۆژنم لەناو ئەو نامیلکەیە وەک کارەکتـەر هەیـە، چاوپێکەوتن لەگەڵ دایکم وە وێنەی دایکم لەو نامیلکەیە تۆمارە.

## دایکم ناسیەوە

لەبەرئـەوەی باپیـرم مەڕدار بوو، ناچار بوە لەبەر مەڕوماڵاتەکەی بچێتە گوندی قولتەپە، دایکم لەوێ نەخۆشی سیلی گرتوە، لەبەر کاری مەڕداری و کشتوکاڵی پێیان نەکراوە زوو دایکم ببەنە دکتۆر. دواتر خاڵم (عەبدوڵلا)دایکم بۆ چارەسەر دەباتە بەغدا. ماوەی چەند سـاڵێک لەبەغدا نەخۆشـی سـیلەکەی نەشتەرگەری دەکـەن و چەند پەراسـوێکی دەبڕن. لەسـەر ئـەوە بەینی دایکـم و باوکم تێک دەچێ، لەچارەی ڕەشـی منی شـیرە خۆر. چارەسـەرەکە بوە هـۆی دابڕانم لە دایکم بۆ ماوەی چوارتاپێنج ساڵ. بەناچاری نەنکم، دایکی باوکم (عەیشە پیرە) بەخێوکردنی من دەگرێتە ئەسـتۆ. ئەوکات مەمە نەبوو، شـیری مەڕوماڵاتیان بە کتری چایە بەسـەرەوە کردووم. باوکم ژنێکی تری هێناوە بەناوی (لەعلی) خوا لێـی خۆش بێت، بەڕاسـتی لەگەڵ دایکی خۆم جیـاوازی نەبوو. هەر چەندە من نەدەچوومـە لای باوکـم و باوەژنم، بەڵام هەسـتم نەکـردوە ڕۆژێک منی ناخۆش بوێ، وەک خەڵک باسی باوەژن دەکەن. من هەر لەگەڵ دایکم عەیشێ دەنوستم. پاشـان لەقولتەپە باریان کردوە بۆگردلانکەی سەعید ئاغا، لە گردلانکەی بچوک خانویان دروست کردبوو، دەستیان بەکەسابەتی خۆیان کردبوو. ئەوکاتە تەمەنم ببـوە چوار پێنج سـاڵان، بەمنیان دەگوت: دایکت نەمـاوە. هەندێک دەیانگوت: دایکـت عەرەبە. پاشـان بەهەوڵی چەند خزمێکـی خێرخواز دایکم ڕازی دەکەن،

پاش چوار تا پێنج ســاڵ دابڕان بگەڕێتەوە.
لەیادمە، منیان دەترســاند، دەیانگوت: لەگــەڵ خۆی دەتباتەوە. بۆیە بڕیارماندا لەگــەڵ ئامــۆزا هاوتەمەنەکــەم (مەولود) خۆمان لەناو قشــپلدان بشــارینەوە!! هەمــوو شــوێنێک لەدوای من گەڕابــوون، لەناو قشــپلدان دۆزرامــەوە، بردمیان بــۆ لای دایکــم، چەند ژنێکی لــەدەورە بوون، هەتا ئەم دیبوو بە پەلکێشــکردن دەیان بردم، بەڵام ئەگەر چاوم پێی کەوت یەکســەر چوومە ئامێزی، هەرچەندە نەمدەزانــی کامیــان دایکمە!! ژنەکان گریان، گوتیــان: بزانە ئەو منداڵە لە پاش ئەو هەموو ساڵە، چۆن زانی ئەوە دایکیەتی؟! لە دەرەوەی گوندی لەناو گژوگیا دانیشــتبوون. بەبیرم نەدەهات کە بینیبم، بەڵام خۆشمویست.
بۆیە وا بەوردی باس دەکەم، بۆ ئەوەی بزانن، ئەوکات موڵکداری منداڵ، بۆ باوک دەگەڕایەوە نەک دایک!! لەگەڵ باوکم ژیانی ئاســایی خۆیان دەستپێکردەوە.

# منداڵی ناو شەڕە تفەنگ

ناکۆکــی لەگــەڵ ئاغاکانی ئەوێش دەســتیپێکرد. شــەوانە لەدەنگی دەســترێژی تفەنگەکانــی ئاغــاو پیاوەکانــی خەبەرمان دەبــوەوە. باوکم دەیگــوت: ئاگاتان لەمنداڵەکان بێت، ئێمەش لەئامێزی دایکمان لەگۆشەیەکی وا، گوللە نەیگرێتەوە خۆمان حەشاردەدا. باوکم خەریکی تەقەکردن بوو، لەسەر دیواری حەوشەکەمان.
لە بیرمە، جارێک باوکم جلی سپی خەوتنی لەبەربوو، بەریبووەوە لایەکی جلەکانی بەقوڕ ببوو، مانگەشــەو بوو، دایکم و لەعلی گریان، گوتیان: کوێربین برینداری؟ باوکم گوتی: مەترسن بریندار نیم، قوڕە بەجلەکانمەوە. بەڵام بۆ من و ئامۆزاکەم زۆر خــۆش بوو، کــە بەیانی دادەهات قەوانمان کۆدەکردەوە بۆ یاری کردن. ئەو کاتە قەوان دەســت هەموو منداڵێک نەدەکەوت بۆ یاریکردن!!
لەگەڵ منداڵانی گوند، دەمانکرد بەشــەڕ لەســەر قەوان، دەمانگوت: ئەو تەقانە لەماڵــی ئێمە کراوە، دەبێ قەوانەکان بۆ ئێمە بێ.
باپیرم، سێ کوڕی مابوو، بەناوەکانی ( حوسێن و عەلی و یاسین) مامم حەسەن مرد بوو.

دەچـوون ماڵـی ئاغاکانیان دەدا بـەر تفەنـگ، وای لێهات ئاغـاو کرمانجەکانی گوندەکانـی تریـش بەشـداریان دەکـرد. ئاغـاکان یارمەتـی ئاغاکانیـان دەدا، کرمانجەکانیـش یارمەتـی ماڵی ئێمەیان دەدا. تەقە لەماڵـی ئێمە بکرابایە، یان لە ماڵی ئاغاکان. بەشـی ئێمە هەر گرتن بوو. ئەوکات بە ئۆتۆمبێلی پۆلیسـیان دەگوت: (مسـەلەحەی شـورتەی))، هەر کە مسەلەحەی شـورتەی پەیدا دەبوو، هەمـوو خەڵـک دەیانزانـی بـۆ ماڵـی ئێمەیە. پێش ئـەوەی لەخەڵک بپرسـن، دەیانگوت: ئەوە ماڵی حاجی تاهیرە!! کە باوکم و مام حوسـێن و مامم یاسـین ڕاپێچی زیندان دەکران، شەوێ داپیرم عەیشێ بەدایکم و مامۆژنەکانمی دەگوت: ئەو سـەگانە داکەن، با نەوەڕن، میوانمان دێت. دوای نوێژی شـێوان جوتیارانی گوندەکانی دەوروبەرمان، بە تفەنگ و بێ تفەنگ پەیدا دەبوون. لەوانە (هیدایەت) لەگـەڵ زۆربـەی بـرادەری گیانی بەگیانـی مامەکانم و باوکـم. دەیانگوت: هەتا حوسـێن و عەلی و یاسـین گیراون، فرسەتە سەر لەحکومەت تێک بدەین!! دایە عەیشـێ ماڵی کامە ئاغا بدەینە بەر تفەنگ؟ دایکم عەیشـێ، دیاری دەکرد کام ئاغا لەهەموان خراپترە. دوای نیو سـەعات، لەگوندی دەبوە شـریقەی تفەنگان. باپیرم دەیگوت: کوڕی من هەموو گیراون، ئێستاش هەر ئێمەین؟! بەڵام ڕۆژێک من و ئامۆزا هاوتەمەنەکەم (مەولود)لەگەڵ منداڵی ئاغاکان بەشـەڕهاتین لەسەر قـەوان، دەمانگوت: ئـەوە قەوانی تفەنگ و دەمانچـەی بابمانە، دەمانەوێتەوە!! ئاغاکان ئەو قسـەی ئێمەیان کردبوو بە بەڵگە، دەیانگوت: قسـەی منداڵەکانیان بەڵگەیە!!

## ئەو سەردەمەی مێیایەتی لە ئاژەڵیش نەنگی بوو

بـۆ یەکەمجار، مـن و ( مەولود)ی ئامۆزامیان بردە هەولێـر، وێنەیان گرتین بۆ ناسـنامە (نفوس). بۆ ئەوەی لەقوتابخانە ناونوسـمان بکـەن، لەگوندێک بەناوی ئۆمـەراوە. چونکـە لەم ناوچەیـە تەنها لەو گونـدە قوتابخانە هەبـوو. خەڵکی گوندەکانی دەورو بەر وەک: (عەلیاوە، هەردوو گردلانکە، سێنارە، سێ قوچان،

گردەسۆر، تەتەراوە، پۆریچە، میرەکان)و چەند گوندێکی تریش لەو قوتابخانەیە دەیانخوێند. ئێمە دەبوایە لە شـارێی نێوان هەولێروکەرکوک، بپەڕینەوە. ڕێگاکە دووربـوو، لەبەرئەوەی ئێمـە بچووک بوین، نەمان دەتوانی پاسـکیل لێبخوڕین. بۆیە ماکەرێکی شـینیان بۆکڕی بوین. زۆربەی ڕۆژەکان لەسەر پێشەوەی پشتی ماکەرەکە شەڕمان بوو!! دوایی پێکهاتین هەر ڕۆژێک یەکمان لەپێشەوە سواربین. قوتابخانەکە، هێندەی پاسکیل لێ کۆدەبوەوە، دەتگوت: وڵاتی چینە!! جگە لە پاسـکیلەکانیش، هەر چوار دەوری قوتابخانەکە، کەری لێدەبەسـترایەوە. جاری وا هەبوو لەبەر زەڕەی نێرە کەرەکان، مامۆسـتا نەیدەتوانی وانە بڵێتەوە، یەک لەیەکـی وەردەگرتـەوە. زیاتـر بە ئاش دەچـوو، نەک قوتابخانـە. داوامان کرد ماکەرەکەمان بۆبکەن بەنێرەکەر.

گوتیان: ئێوە ئەو سـاڵ بەسـەرکەوتویی دەرچن، ئینجا ماکەرتان بۆ دەکەین بە نێرەکەر!!

جارێـک نۆرەی من بوو لە پێشـەوە سـواربم، هێندەم قەڵەم لـە ملی ماکەرەکە وەژاند، تاوای لێهات لای (زێنەب کوژرا)ی بەری دامەوە و سەرم شکا. مەولودی ئامـۆزام هەندێـک خۆڵەپۆتی ڕێـگای بە برینەکە داکرد، ناو لەپی لەسـەر دانا، گوتی: خوێنەکەی وەستا.

ئاخـر ئـەو ڕۆژە زۆر لە ماکەرە شـین دەهـری ببووم، دەمویسـت تێی بگەیەنم نامـوس چەنـد پیـرۆزە لەلای ئێمـە، چونکە ئەو ڕۆژە هەسـتم دەکـرد ماکەرە شـین سـوکایەتیمان دێنێتە سـەر!! لەبەرچاوی دۆسـت و دوژمن سەرمان شۆڕ دەکا. کاتێک نێرەکەرەکان دەزەڕین، ماکەرەشـین ئاوڕی لێ دەدانەوە و بەچاوە حیزەکانی تەماشـای نێرەکەرەکانی دەکرد، بێ ئەوەی حسـاب بۆ ئێمە بکات!! هەستمان بەشەرمەزاری دەکرد، لەبەرخۆمەوە دەمگوت: چاوپان، با بۆت بمێنێ لەنـاو دوو نانـی گەرم. (ئاخر لەو ڕۆژگارە مێ بوون بەڵا بوو!! نێر سـالاری لە لوتکـە دابوو.) کە نێرەکەرەکان بۆنی تەرسـی ماکەرەکـەی ئێمەیان دەکرد، یا بۆنـی بن کلکیان دەکرد، خۆزگەم دەخواسـت خەنجەرێکـی دەبانی هێندە تیژم پـێ بـێ، زرێـی هەڵبگرتایە، بۆ ئـەوەی ورگـی هەردووکیان بـدڕم و نێرایەتی خـۆم نیشـان بدەم. بەناچاری مـن و مەولود بە بەردان سـێرەمان لەنێوچاوانی نێرەکەرەکان دەگرت، ئەوەندە شارەزا بوین لەشەڕە بەرد، هەموومان لە تەختی

نێوچاوانــی نێرەکەرەکان دەدا. بەردەکان هەڵدەقۆزینەوە، وامان ســەر وەشــێن دەکردن، هەر خوا خوایان بوو لە کۆڵیان بینەوە، لەســەر جێی ماکەرە شــینمان دوور دەخستنەوە.

ئای چەندمان هەست بەشەرمەزاری و ناموس چونێکی گەورە دەکرد، کاتێک ئەو نێرەکەرانە بێ شەرمانە ئەسبابیان دادەهێشت و شلکەیەکیان پێ دەکرد و لەبەر زگــی خۆیان دەدایەوە. کونە کەپویان فش دەبوو، ئەوەی وای لێ دەکردم لێوی خۆم بکرۆژم ئەوەبوو: ماکەرە شین، لنگی لەبار یەک دەبرد و گەلی دادەپچڕی و چۆرە میزێکی دەکرد، ئاوڕی لە نێرەکەرەکان دەدایەوە (بە ئاماژەی ڕازی بوون ). هێنــدەم ڕق لێ هەڵدەگــرت، دەمگوت: وەڵڵاهی لە گەڕانەوە دەبێ ئەوەندەت قەڵــەم لــە ملی بوەژێنم و جوتەت پێ باوێم، هەتا گوێت پێ شــۆڕ دەکەم. پێم دەگوت: دەتەوێ ئەو ناموسەی چەند ساڵە کۆمان کردۆتەوە لەسەر (هەرامەی) تۆی دابنێین، هەی چاوپان؟!! مەگەر لە ڕێگەی (هەولێر- کەرکوک) نەپەڕمەوە. قــەرات لــە گیانم، با بگەمە لای زێنەب کــوژرای، دەبێ بەدەردی زێنەبێت ببەم. (زێنەب کوژرا: چەند بەردێک لەســەر تەپۆلکەیەک کۆکرابوەوە، پێیان دەگوت: زێنەب کوژراو، دیارە زێنەب لەبەر مێردەکەی هەڵاتبوو، لەســەر بابەتی ناموس، مێردەکــەی لەوێ دەیگاتێ و دەیداتە بــەر خەنجەران) زێنەبیش هەروەک زۆرێک لە ژنانی تر، بوە قوربانی زهنییەتی نێر ســالاری.

نیــوەی ســاڵی خوێندن بــوو، لە بۆنەیەکی بوک گواســتنەوە دایکم جلێکی وەک عبدالکریــم قاســمی بۆ کڕیبــووم. لە دوو گونــد تەنهامن ئەو جلــەم لەبەر بوو، جلی ســەربازی ئەفسەران. پێیان دەگوت: (کەشافە)تورتوڕە و سیدارەی لەگەڵ بوو. لەبیرمە لە گوندی گردلانکەی لای زورگە زراو، ژن گواســتنەوەبوو، ئێمەش چووبوین بۆ ئەوێ. ئەوەندەیان ئازاردام خەریک بوو جلەکانم فڕێ بدەم، بەقوون ڕوتــی هەڵبێم!! ئەو پیاوە ســمێڵ بابڕانە ئــەو تورتوڕەیان پڕ تف کرد، هێندەی تورتــوڕەی لێ بــدەن و لەیەکتری وەربگــرن!! نۆبەیان لێ گرتبــوو. تورتوڕەش بەگیرفانــی جلەکەمەوەبــوو، لێنەدەکرایەوە بیاندەمێ و نەجاتم بێ. پێم وایە لەو دوو گونــدە، بــەژن و پیاوەوە تەنها مەلای ئاوەدانی مابوو تورتورەی پێ لێ بدا. لەو ســەردەمی، کۆمەڵــگا زۆربەی نەخوێندەوار بوو، بۆیە بە ئاســانی فێڵی لێ دەکرا، بۆ نمونە : ئەو دەشتی دزەییاتیە بەکشتوکاڵ و مەڕداری خەریک بوون.

كاتێک ڕەوسە سور دەبوو واتە ( گەنم و كا لێک جیا دەكرایەوە )بەشی ئاغا و زەكاتی مەلا و دەست موستی پاڵە و تێلەكێش جیا دەكرایەوە!! باراش و بنەتۆ دادەكرا لە عەمباران یان لە چاڵان، ئەوەی دەمایەوە (تەڕاحەكانی) پردێ دەهاتن بۆ كڕینی. كراسێكی شۆڕیان لەبەربوو، قایشێكیان لەسەر دەبەستا. دەهاتن گەنم و جۆ لە جوتیارەكان بكڕن. بەڵام كە ڕبەیان وەبەردەنا، دوو جاریان بنی ڕبەی لە زەوی دەدا. یا دار ڕبەیان بەلاری بەسەر ڕبە دادەهێنا بۆ ئەوەی زیاتر بگرێ. لەكاتێكدا كە دەگەیشتنە ژماردنی هەژدە ڕبە، بۆ فریودانی كاكی جوتیار كە هەموو بەرهەمەكەی كەوتبوە ژێر ڕەحمەتی ڕبەی كاكی (تەڕاح) دەیگوت: هەژدە و هەژدە و لەناكاو دەیگوت: (هەزار سەڵاوات لەدیداری مەحەمەد مستەفا) ناچار كاكی جوتیار چەند جار دەیگوت: (ئەلاهو مەسەللی عەلا مەحەمەد وە عەلا ئالی مەحەمەد). ڕۆحم بە فیدای بێ، لەگەڵ ئەو سەڵاواتانە ژمارەی ڕبەكانی لەبیردەچوو كە هەژدەن، لە ناكاو كاكی (تەڕاح) دەیگوت: هەشت و هەشت و هەشت، بەیەک سەڵاوات، (دە) ڕبە گەنمی دەدزی، بەو شێوەیە بەرهەمی یەک ساڵی جوتیار تەخشان و پەخشان دەكرا.

لە ساڵی ۱۹٦۱ـ ۱۹٦۲ ، لەقوتابخانە خواردنیان دەداینێ، وەک: سێو، پرتەقاڵ، ڕۆنی ماسی، شیر، كێک، هێلكە، پەنیر، مرەبا و زۆر شتی تر. هەموو ساڵێک لەدژی دوو سێ نەخۆشی دەیان كوتین.

من و ئامۆزاكەم بەشی خۆمان هەڵدەگرت لەسێوو هێلكە، بۆ مامم یاسین، كەلەسەر ڕێگای ئێمە جوتی دەكرد، ئەویش ڕیشۆڵەی دەداینێ.

باپیرم حاجی تاهیر ڕادیۆیەكی كڕیبوو، هێندەی تەلەفزیۆنێكی چواردە ئینج دەبوو، پاترییكی هێندەی پاتری ماتۆڕێكی گەورەی لەگەڵ بوو، دارێكی درێژیان بەوایەرەوە لەسەربان بۆ كردبوە ئالیار، تەنها ئێواران كۆ دەبوونەوە ڕادیۆ هەڵدەكرا، وێنەی قرژاڵێكی لەپێشەوە لەسەربوو، گڵۆپێكی سەوزی لەناو هەڵدەبوو، زۆرمان پێ جوان بوو. خەڵكی هەردوو گردلانكە لێی كۆدەبوونەوە. پیاوێكی لێبوو زۆرجار لە خەڵكەكەی ڕا دەخوڕی بۆ ئەوەی بێدەنگ بن. گوایە گوێ لە هەواڵەكان دەگرێ. بۆ وی فەرقی نەبوو كوردی، عەرەبی، ئینلگیزی.. هتد. ئەو هەر گوێی ڕا دەگرت و سەری دەلەقاند، وەک بەزمانی كوردی زاراوەی هەولێری قسەی بۆ بكەن، یان فیكەیەكی درێژی دەكرد، وەک هەواڵێكی دڵتەزێن

بلاوکرابێتەوە. یان دەستی بۆ لایەک بەرز دەکردەوە، وەک ئەو هەواڵە پەیوەندی بەلای ئامادەپێکراوەوە هەبێ، زۆر ئامادەی تریش. کە هەواڵ کۆتایی دەهات لێیان دەپرسی: فلان چی گوت؟ دەیگوت: ئەولایە ئەم لای ویران کردوە، بەراستی بێ ویژدانییە!!

# تەمموزی مەزن..یاخیبوونی ئاغاکان

دەمەوێ تۆزێک بگەڕێمەوە دواوە، لە ١٩٥٨/٧/١٤ لەوسەرو بەندە شۆڕشی چواردەی تەمووزی مەزن بەرپا بوو. لەمێژوی عێراق تەنها بەوشۆڕشە دەگوترێ شۆڕش. چونکە عێراقی لە مەلەکیەوە کردە کۆماری. ژیانی خەڵکی، لەقۆناغێکەوە گواستەوە بۆ قۆناغێکی تر، بۆ یەکەمجار، یاسای (ا سلاحی زراعی)دانا کە زەوی هەموو ئاغاو شێخە عەرەبەکانی دابەشکرد بەسەر جوتیاران بەیەکسانی.
عێراقی دەرهێنا لە پەیمانی سەنتۆ، کە ئەو پەیمانە دژی کورد بوو، دەستی برد بۆ خۆماڵیکردنی نەوت. دراوی عێراقی لەژێر کاریگەری جونەیهی ئیستەرلینی بەریتانی ڕزگارکرد. بەندی سێی لە یاسای عێراقی جێگیر کرد، کە کورد و عەرەب لەخاوەنداری عێراق هاوبەشن. ژن و پیاوی لە میرات هاوتا کرد. یەکەم وڵاتی عەرەبی بوو، وەزیری ژنی دانا، بەناوی نەزیهە دلیمی. پارتی و شیوعی و زۆر لەو حیزبانەی تری ئازاد کرد لە کاری سیاسی و ڕۆژنامەی ئازاد. ئەو شۆڕشە قەڵەم بازی زۆر پێشکەوتنخوازانەی نا، کە بە ئیمپریالیزمی جیهانی هەزم نەدەکرا. کەوتە هاندانی دەست و پێوەندەکانیان. یەکەم سەرۆک بوو ڕایگەیاند: نەوت بە دراوی نیشتمانی دەفرۆشێت. ئەوەش بوە هۆی نارەزایی ئاغاکان، دژایەتیان دەکرد. بۆ یەکەمجار جوتیار بوو بە خاوەنی زەوی خۆی، گورزێکی زۆر کاریگەر بوو بۆ خاوەن موڵکەکانی سەرانسەری عێراق. کورد ئەوکات هەستی بە شەڕاکەتی ڕاستەقینە دەکرد، دژایەتیکردنی حکومەت ناپاکی مەزن بوو، ئاغاکان زۆریان چون بۆ شارەکان، بەڵام لەدواییدا هەندێکیان گەڕانەوە گوندەکان و خەڵکی خۆیان هاندەدا لەدژی (ا سلاحی زراعی)چاکسازی زەوی کشتوکاڵی. لەپشدەرو بازیان و خەلەکان و زۆر شوێنی تر، هەندێک لە

ئاغـاکان یاخـی بوون لەمیـری. بەبیرمە لەگوندی سـێ قوچـان هەندێک کەس بـە گوریـس ڕێگایان لـە ئۆتۆمبێلەکانی نێـوان: (کەرکـوک.. هەولێر) دەگرت، ئەوانیـش ڕایان نەدەگرت، بەدوای خۆیاندا ڕایاندەکێشـان. بەناچاری سـەرێکی گوریسـەکەیان بـەر دەدا. بەوانەیان دەگوت: (کۆمەرە) ئـەو کۆمەرانە بەزۆری کۆنەدیوار بڕو دزوپیاوی ئاغا و خاوەن موڵکەکان بوون، شەوان لەماڵی ئاغاکان قەلیان دەخوارد، پاشان ئەو ماڵانەیان دەدایە بەر تفەنگ، کە لایەنگیری شۆڕشی چـواردەی تەمموز بوون، یەک لەو ماڵانە ئێمە بوین.
ئەوانـەی دژی ( یاسـای چاکسـازی زەوی کشـتوکاڵی )بـوون، گروپی بچووک بچووکیان پێک هێنا، بۆ دژایەتی عەبدولکەریم قاسم و (یاسای چاکسازی زەوی کشتوکاڵی)، تا وای لێهات پێیان دەگوت: شۆڕشی عەشایەری، کەچی لەسەرەتا شۆڕش نەبوو، بەڵکو زادەی دژایەتی یاسایەکە بوو. پاش دوو سێ مانگ پارتی بەیانـی دەرکرد، ئێسـتاش ئاغاکانـی میراودەلـی دەڵێن: ئێمە یاخـی بوونمان دەسـتپێکرد، بارزانی و پارتی خۆیان کردە خاوەنی و سـواری شەپۆلی ناڕەزایی ئاغاکان بوون و گوتیان: ئێمەش دژی( یاسـای چاکسازی زەوی کشتوکاڵی)ین. پاش ماوەیەکی زۆر لە یاخی بوونی کۆمەرە، ئینجا بوە بەناو شۆڕشـی ئەیلول. ئاغـای گوندەکانـی لای ئێمـە زیندووبوونەوە، بە پاڵپشـتی پارتـی. بۆ نمونە: قـادر مەنتـک کە سـەر بە پارتی بـوو، چەکداری دژی (ا سـلاحی زراعی) بوو، بەسـەر گوندی گەڕە شـێخانی دادا کە هەمویان شـیوعی بوون، هەرچی چەک و شـتی بەنرخیان هەبوو بردی. چل دیناری لەماڵی عەلی کوێخا قادر سـەندبوو. پاشـان گوندەکـە چەکیان کڕی، پاسـەوانیان لەگوندەکەیـان دەکرد، بۆ ئەوەی خۆیـان بپارێـزن لەچەتەو ئەشـقیاکانی ئـەودەم. خەڵکی گونـدەکان ببوون بە دوو بەرەی بابەکوشـتەی یەکتر، بەرەی چەوسـاوە و کرمانجەڕەش و ڕوتەکان، کە لەگەڵ یاسـایەکە دابوون، بێ ڕێکخسـتن خۆیان بە شـیوعی دەزانی، حیزبی شیوعی داکۆکی لێ دەکردن. بەرەی دژی یاسایەکەش، کە ئاغا و خاوەن موڵکە گەورەکان (فیوداڵ) و شـێخەکان، پارتی پشـتگیری دەکـردن. لەوان ڕۆژگاران کێشـە چینایەتیەکە زەقتر بوو لە کێشە نەتەوایەتیەکە.
ئاغاکانـی گونـدی ئێمە، ئەو گروپە یاخیانەیان بـەکار دەهێنا دژی ئێمە، تاوای لێهات باپیرم گوتی: پێش ئەوەی بمانکوژن، یان پیاوێک بکوژین، با ماڵەکەمان

باربکەین. بارمان کرد بۆ گوندی گەڕەشـێخان.
دۆسـتەکانمان لـە گوندی گەڕەشـێخان، بۆیارمەتـی هاتن، ماڵـی ئێمە و مەڕو ماڵاتیان لەگەڵ خۆیان بۆ بەخاوەن کردین، بەفشـاری برادەرەکانی مامم و باوکم چوونە سەر ئاغاکان، هەتا بەیانی دایانگرتنە بەر گوللە. ئاغاکان شەوێک هەموو خانوەکانی ماڵی ئێمەیان سـوتاند، خانوەکانی ماڵی باپیرم و ئێمە و مامەکانم، گەلێ زۆربوون، وەک گەڕەکێک وابوو، دەیانگێڕایەوە: چەند ڕۆژ هەر سـوتاوە و دووکەڵ ئەو ناوەی داپۆشیوە.
من و ئامۆزاکەم گوازراینەوە بۆ قوتابخانەی گەڕە شێخان، لەدوای چەند مانگێک مـەڕو مـاڵات جێگای نەبوو. بەناچاری بارمان کـرد بۆ گوندی ئۆمەراوە. خەڵکی گەڕەشـێخان زۆریـان پێ ناخۆش بوو. بەڕاسـتی بۆ مامەکانـم و باوکم برادەری گیانی بەگیانی بوون. ئێمەیان لای ماڵی (سەلیمی مام برایم) بەجێهێشت. (مام سـەلیم) پیاوێکی چوارشـانەی کەڵەگەتی قسەخۆش بوو، سـعاتێکی بەزنجیری بەگیرفانـی کورتەکـە مورادخانییەکـەی وەبـوو. دوو بـرای هەبـوو بەناوی مام عەباس سەرپەرشـتی کشـتوکاڵی دەکرد، مام عوسـمانیش سەرپەرشـتی مەڕو ماڵاتـی دەکرد. مام عوسـمان زۆری پێ خۆش بـوو زوو قوتابخانە تەواو بێ، جا بۆئـەو فەرقـی نەبوو منداڵی خۆی و برازاکانی دەرچوویـان یان نا. ئەو ڕقی لە ئیکمالـی بوو، چونکە نەیدەتوانی لە پشـوی هاوین بەکاریـان بێنێ بۆ خزمەتی مەڕو ماڵات. جا بۆیە قسەیەکی هەبوو دەهاتە لای قوتابخانە ڕۆژی کۆتایی ساڵ کە شـەهادەمان وەردەگرتەوە، دەیانگوت: مام عوسـمان بۆ هاتوی؟؟ دەیگوت: من هاتووم بەس ئیکمالان ( واو وا....) لێ بکەم. ئاخر ناجیح ناجیحە. سـاقیت سـاقیتە. ئیکمال ئەتۆ چی؟ بۆیە ئێسـتا من ئەگەر لایەنێکی سیاسـی لەسـەر ڕووداوەکان دنیابینی ڕوونی نییە، هەڵوێستێکی نییە، بەیانێکی شلەتێن دەردەکا، دەڵێم: ئەوە ئیکمالە، ئای عوسمانە ڕەش لەکوێی؟ ئەوە نەئۆپۆزسیۆنە نەلەگەڵ دەسەڵاتە!! (ئیکمالە)

# وەهمی شۆڕش

## پەنجاوحەوت ســاڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕش دا

لەوەتەی من بەبیرم دێ لەعێراق بەگشــتی و لەکوردســتان بەتایبەتی، دەتوانم بڵێم لە عەبدولکەریم قاســم کە شۆڕشــی چاردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ی کرد، شــۆڕش بە واتای وشــە شۆڕش نەکراوە. شــۆڕش دەبێ کۆمەڵگا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بگوێزێتەوە بەرەو باشتر. لەهەموو ڕوەکان، گۆڕانکاری لە ژیان و بەرەوپێشــچونی کۆمەڵگادا بکات. ئێستاش ســروده نیشتمانییەکانی ئەو کاتم لەگوێیدا دەزرنگێتەوە، وەک (هل وتن شــرکه لكراد وعرب) واتە: ئەو نیشــتمانە کــوردو عــەرەب تێیدا هاوبەشــن، هــەر بژی کــوردو عەرەب ڕەمزی تێکۆشــان، کە ئێســتا لەپاش نیو ســەدە تێکۆشــان و ئەو هەموو کارەســات و نەهامەتیە بەســەر کورد دا هاتوە، کێوێک لە کەللەســەری شــەهیدەکانمان هێندەی ئەوەی شۆڕشــی عەبدولکەریممــان بــۆ قایل نین. بەهــۆی ناکارامەیی ســەرکردەکانمان بوون بە ئامرازی دەســتی داگیرکەران و کۆیلەی پارەوپۆســت. شۆڕشی چاردەی تەمموزی (عەبدولکەریم قاسم) هەنگاوی گەورەی نا بەرەو یەکسانیبوون لە ڕوی کومەڵایەتی و ئابوری و نەتەوایەتی.

خــاوەن موڵکــە گەورەکانی کوردوعــەرەب ئەوەیان بۆ شــیکار نەدەکرا. کەوتنە هاندانــی دەســت و پێوەندەکانیــان بۆ دژایەتی کردنی چاکســازی کشــتوکاڵی. لەکتێبی (بارزانــی و بزوتنەوەی ئــازادی خوازی کورد) بەرگی دوەم لاپەڕە ٢٤٧ نوســینی مەســعود بارزانی بەناوی: (ڕاپۆرتێک بەناوی جەلال تاڵەبانی لەبارەی کردەوە و هەڵوێستی دەرەبەگەکان، مانگی ١١ی ساڵی ١٩٥٨. ناوی ئەو ئاغایانەی تێدایە کە دژی شۆڕش یاخی بوون). جوتیارەکان پشتیوانی شۆڕش بوون، باوکم دەیگێڕایــەوە: لەگەڵ چەند جوتیارێکی دەشــتی دزەییاتی، چــوون بۆ بەغدا بۆ خۆپیشــاندان کــە خەڵکێکی زۆر لــە هەموو پارێزگاکان بەشــداریان تێداکردبوو، باوکم گوتی: کاتێک لە شەقامی ڕەشید، خۆپیشاندانی مەزن بۆ پشتگیری کردن

لە (عەبدولکەریم قاسـم) کە لە گۆڕەپانی (تەحریر)خۆی لە پێشـوازیمان بوو. هاوارمـان دەکـرد: (عاش زعیم عبدالکریم، حیزب الشـیوعی للحکم، متلب عزیم) واتە بژی زەعیم، عەبدلکریم، حیزبی شیوعی بۆ حوکم داخوازی مەزنە. لەوکاتەدا نەژادپەرسـتانی عەرەب بە پیلانی بەعسـیەکان تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد. چەند کەسێک بریندابوون.

لـەلای (لوحت الشـعب) تابلۆی گەل، کە تاوەکو ئێسـتا لەگۆڕەپانی (تەحریر) ە، لەلایـەن هونەرمەندی هەمیشـە زیندوو (جەوادسەلیم)دروسـتکراوە، لە کاتی دروست کردنی بە (عەبدولکەریم قاسم)ی گوتبوو: وێنەیەکی تۆ لەناو تابلۆیەکە دادەنێم. لە وەڵامدا (عەبدولکەریم قاسم) گوتبوی: ئەوە موڵکی گەلانی عێراقە، من هەتا سەر نامێنم، کاتێک هەوڵی ڕوخان یان کوشتنی من دەدرێ، باتابلۆیەکە بەهـۆی وێنەی من نەروخێندرێ، وەک هێمای گەلی عێراق بۆ ئازادی بمێنێتەوە. باوکـم گوتـی: پـاش پێشـوازیمان لەلایـەن (عەبدوالکریم قاسـم) هاتینەوە بۆ کوردسـتان، دوای ماوەیەک شێخە عەرەبە خاوەن موڵکەکان، سەدام حوسێنیان هانـدا، تەقـە لە (عەبدولکریـم قاسـم ) بـکات. بەسـوکی برینـداری کـرد، لە شەقامی (رشـید). لەو کردە تیرۆریسـتیە (سەدام)خۆیشی بریندارکرا، ڕای کرد بۆ سـوریا. لە کتێبی (من هو سـەدام) سـەدام کێیە؟ وردەکاری ژیانی سـەدام باس دەکات.

لـەو ئان و سـاتەدا، ئاغا و خاوەن موڵکە گەورەکانـی کوردیش کەوتنە خۆ، بۆ دژایەتی کردنی یاسای چاکسازی زەوی کشتوکاڵی (ا سلاح زراعی)، و ئاستەنگ دروستکردن لەبەردەم جێبەجێکردنی ئەو یاسایە، بۆ نمونە: لە پشدەر ئاغاکانی میراودەلی و، لە بیتوێن لە گوندی بۆسـکێن لەلای شـێخ حوسـێن و، لە دۆڵی خەلـەکان هەندێک پشـێوی دروسـت بوو، وەک یاخی بوونـی چەکداری. زۆر لە ئاغاکانی میراودەلی (کە دەکەوێتە سـەر سنوری ئێران) یاخی بوون. بۆ ئەوەی ڕێگابگرن لە دابەشـکردنی زەوی بەسـەر جوتیارە هەژارەکان، بۆیە یاخی بوونی چەکداریان ڕاگەیاند. بۆ زانیاری زیاتر لە کتێبی (شۆڕشـی ئەیلول سـاڵی ١٩٦١ دژی ڕژێمی قاسـم) نوسـەر: (عەبدوڵا ئاغای پشـدەری) کە پێشەکیەکەی کاک (مەسـعود بارزانی) بۆی نوسیوە. داواکاری ئاغاکان لە خاڵی (٣) لاپەڕە (٢٢) داوای هەڵوەشانەوەی یاسای (ا سلاح زراعی)دەکەن، هیچ داواکاریەکی نەتەوەیی

و فەرهەنگی تێدا نییە، ئەو یاخی بوونە عەشـارییە.
جێـگای داخە ئەوانـەی کە خەریکی ڕێگا گرتن بوون، سـودمەندی یەکەم بوون لە یاسـاکە، مەبەسـتم جوتیارە هەژارەکانە لەدەشـتی هەولێـر، هەر جوتیارێک (شەسـت) دۆنـم زەوی درابـوێ، کە ئێسـتاش ماویانە، بەهـۆی کاڵ فامیانەوە نەهاتن پشتگیری لەو یاسایە بکەن. تاوەکو ئێستاش، لەدوای نیوسەدە هەر ئەو یاسایە کاری پێدەکرێت، هیچ یاسایەکی پێشکەوتووتر دەرنەچوە. بۆیە ئێستاش ئاغـاکان دەڵێن: ئێمە (شۆڕشـمان کرد) سـەرکردایەتی پارتی بـوو بە خاوەنی. بەڵام خۆی لەخۆیدا دژایەتی شـۆڕش بوو، نەک شۆڕش.
زۆر لەوڵاتانی دەوروبەر وەک سـعودیە، ئـوردن، ئێرانیش، هەموو هەوڵی خۆیان دا بە پێشـەنگی بەریتانیا،کە خۆی بەداهێنەر و پارێزەری سیسـتەمی ئاغایەتی دەزانێت، بۆ ڕوخانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز، ئێستاش منداڵە ئاغاکان لەبەریتانیا دەبـن بـە پەناهەندە. پـاش چەند مانگێـک لەیاخی بوونی چەکـداری، ئاغاکان توانیان، سود لە ئەزمونی سەربازی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا وەربگرن. ئەویش ڕەزامەند بوو بە سەرپەرشـتی کردنیان. بارزانی بە ئاغاکان و سەرپەرشـتیاری ئەو یاخی بوونە چەکداریە دەڵێ: من یارمەتیتان دەدەم، بە شـەرتێک نەچنەوە ناو حکومەت و دژی ئێمە شـەڕ بکەن، بەڵام ئاغاکان کاتی عەبدولکەریم قاسـم کوژراو پرۆژەکانی ئیفلیج کرا، زۆربەیان بوونە جاشی عەبدول سەلام عارف لەدژی جوڵانەوەکـە، وەک بارزانی پێشـبینی کردبوو. دوایی، شـای ئێـران بە ئاماژەی بەریتانیـا و ئەمریکا و ئیمپریالیزمی جیهانی، پشـتیوانی کردن بۆ ئەو بزوتنەوە چەکداریە کە لەدەسـتپێکدا دژی چاکسـازی بـوو. ئینگلیز ناڕاسـتەوخۆ کەوتە هاندانـی خەڵکی خوێندەوارو ڕۆشـنبیر بۆ بەشـداریکردنی بۆئەوەی سـیمایەکی نەتەوەیـی بە شۆڕشـی ئەیلول ببەخشـن. لەدواییـدا، خوا لێخۆشـبوان (برایم ئەحمـەد و مـام جەلال) و زۆر خەڵکی ڕۆشـنبیر بەشـداریان کـرد، ناویان لێنا شـۆڕش. دوایـی، جیابوونەوە بەناوی باڵی مەکتەبی سیاسـی. بـە بۆچونی من ئەو هەموو میرو ئاغا و شـێخ و سـەرۆک عەشیرەتە، زۆربەی نەیدەزانی شۆڕش چیـە!! بەڵکوکوردگوتەنی: (بەگەر هەڵڵای کەوتبوون). دژایەتی شۆڕشـی ١٤ی تەمموز لەبەرژەوەندی ئامانجی ئەوان بوو( دەتوانم بڵێم ئەو بزوتنەوە چەکداریە خەڵکی زۆر شۆڕشـگێڕی هاتە ناو ڕیزەکانی، خاڵی نەبوو لەخەڵکی شۆڕشـگێڕو

نەتەوەپــەروەر)، ئەوەم هاتەوە یاد کە بارەگامــان لە (ئیروان) بەرامبەر ڕێزان، ســاڵی ١٩٨٦، کابرایەک هاتبوو کوڕە تازە پێشــمەرگەکەی ببینێ و ڕازی بکات بیباتــەوە. ئەوانــەی لەوێ بوون هــاوڕێ (خەیری)م لەیادمــاوە. باوکەکە لەبەر چــاوی ئێمــە بە کوڕەکەی دەگوت: کــوڕم نەدزیت کردوە، نە پیاوت کوشــتوە، نەژنت هەڵگرتوە، نە ئەشــقیای، تۆ بۆچی بوی بە پێشــمەرگە؟!! منیش گوتم: مامی خۆم بۆ ئێمە لەســەر ئەوشــتانە بوینە پێشــمەرگە؟!! گوتی: پێشان هەر وایــان دەگوت، کابــرا ئەگەر کەتنێک بکات هەڵدێ دەبێتە پێشــمەرگە. بەخوای کوڕی من زۆر پاک و بێ تاوانە بۆ پێشــمەرگایەتی نابێ. مەبەســتم ئەوەیە ئەو بەناو شۆڕشــە چەکداریەی ئێمە و ئەیلول شــەش (حیزب) لە شــاخ بوین، ســێ کەسمان فێری خوێندەواری نەکرد!!

شۆڕشەکانمان وەک شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ و ئەم جۆرە دروشمانە، تەنها خولانەوە بوو لەژێر وەهمی شۆڕشکردن، سوان و تیژکردنی چەکدارەکانمان بوو، بۆ قرچاندنەوەی ملی یەکتر، دەتوانم بە باشور بڵێم: شۆڕشێکی بێ سەرپەرشت و گەلێکی بێ خودان.

جێگای هەموو کەســی تێدا دەبوەوە، ئەوپەڕی شۆڕشــگێڕو پاک، هەتا ئەوپەڕی خائیــن و ناپاک و فایلدار. بۆیــە پیاوێکی جوتیاری نەخوێندەوار ناهەقی نەبوو، بەو شــێوەیە بیر بکاتەوە!! ئەوەی بۆ من جێگای داخە، لەدوای شۆڕشــی ١٤ی تەمموز، چۆن توانیان، چۆن ئەو هەقەیان بەخۆیاندا دژایەتی عەبدولکەریم قاسم بکەن، لەجیاتی پشــتگیریکردنی ئەو شۆڕشە مەزنەو بەرەو پێشبردنی!!

جاســم عــەزاوی ســکرتێری تایبەتــی عەبدولکەریــم قاســم بــوو، لەیەکێــک لە بیرەوەریەکانیدا باسی چۆنییەتی خەرجکردنی موچەکەی سەرۆک کۆماری عێراق دەکات، عەزاوی دەڵێت: ســوێند بەخوا عەبدولکەریم قاســم لەو ڕۆژەی پۆســتی ســەرۆک کۆماری وەرگرت، تا ئەو ڕۆژەی شــەهیدکرا، هەرگیز مووچەکەی خۆی وەرنەدەگرت، بەڵکو من هەموو جارێک مووچەکەیم وەردەگرت و واژۆکەشم لەجیاتی ئــەو دەکرد. دواتر پارەکەیم دەخســتە نــاو دەخیلەکەیــەوە، مووچەکەی (چوار سەدو چل ) دیناری عێراقی بوو. بۆ هەر مانگێک لەو برە پارەیە (سەد) دیناری دەدا بــە برایەکــی بەناوی حامد، (چونکە ئەو برایەی هەموو ڕۆژێک خواردنی بۆ دروســت دەکرد، لەناو سەفەر تاســێک بۆی دەهێنایە نوسینگەکەی. خواردنەکە

بریتــی بــوو لــه برنج و گۆشــتاو شــۆربا،لەگەڵ نانێک و نیو مریشــک، وەچەند جۆرێکی تری ســوب و ســەوزەوات. لەکاتی نان خواردن بانگهێشــتی هەموو ئەو کەســانەی دەکرد کە لە نوسینگەکەی کاریان دەکرد). (سەد) دیناری تری دەدا بە خوشــکێکی، بەناوی ئوم ئەحمەد، (چل) دیناری دەدا بەو ئەفســەرەی نانی بەیانی و ئێوارەی بۆ ئامادە دەکرد. ڕۆژێکیان ســەردانی وەزارەتێکی کرد، کاتێ گەڕایــەوە پیاوێکی بەســاڵاچوی لەگەڵ بوو، داوای لە مــن کرد (پەنجا) دیناری پــێ بدەم. منیش ســەیرم کرد، تەنها (پەنجا) دینارلــە دەخیلەکەدا ماوە!! پێم گــوت: گەورەم دەکــرێ (پێنج تــا دە) دیناری پێ بدەم؟ چونکــە دەخیلەکەت تەنهــا پەنجــا دیناری تێدایە، ئێســتا دەی مانگە هێشــتا بیســت ڕۆژی ماوە بۆ مووچــەی مانگــی داهاتوو؟!! عەبدولکەریم قاســم بەتوڕەییەوە گوتی: باشــە تۆ بۆچــی دەتەوێ من شــەرمەزار بکەی لەبەرامبەر ئەم پیــاوە پیرە؟! من لەنزیک وەزارەتــی ناوخــۆ بینیم، شــەش منداڵی هەیە و بێکارە، مــن بەڵێنم پێدا پەنجا دینــاری پــێ بدەم، تاوەکو ســەماوەرێک و قۆریەک بکرێ لەهەمان شــوێن چای بفرۆشــێ. وە بەڵێنم پێدا جارێکی تر ســەردانی بکەم و چایەکی لەلا بخۆمەوە. دواتــر ئەم پیــاوە پیرە بوە چایچی عەبدولکەریم قاســم، وە ناوبانگێکی باشــی پەیداکرد، خانەوادەکەشی لەهەژاری ڕزگارکرد. عەبدولکەریم قاسم، هەندێک جار ئەو برە پارەیەی زیاد دەبوو بۆ ماوەی شــەش مانگ کۆی دەکردەوە، دەیدا بەو ئەفســەرانەی لەڕیزی پێشــەوەی شۆڕشــەکەی ١٤ی تەمموز بەشداریان کردبوو، ئەوە ڕەوشت و مرۆڤایەتی ئەو سەرۆکە بوو، کە دووبارە بوونەوەی زۆر ئەستەمە لەعێراقدا.

ئەو کاتێک لەســاڵی ١٩٦٣ کوژرا، تەنها دینارێک و ســەد فلس لەباخەڵی بوو، هــەر لەبەرئەوەبــوو دکتۆر عەلی وەردی، کۆمەڵناســی گــەورەی عێراقی، دوای کوژرانی عەبدولکەریم قاســم گوتی: گەورەترین هەڵە لەمێژوی عێراقدا کوشــتنی عەبدولکەریم قاســم ە، لەوەرگێرانی (قەهار حەسەن کەپەنکی).

هەمــوو وڵاتانــی عەرەبی داوایان لە عەبدولکەریم قاســم کرد، کۆماری عێراق ناو بنــێ (جمهــوري عێراقی عربی) بــەڵام عەبدولکەریم گوتی: عێــراق تەنها موڵکی عــەرەب نییە، عێراق موڵکی کوردو عەرەب و هەموو گەلانی عێراقە.

# پێش زاوا بوکمان بینی

پاش تاقیکردنەوەی سەری ساڵ، باپیرم حاجی تاهیر. بەسواری ئەسپێکی کەوێت (کەوێت بەو ئەسپە دەگوترێ سورێکی جەرگی مەیلەو ڕەشبێت) هاتە ماڵی مام سەلیم، زۆر ڕێزیان گرت و چێشتیان بۆ کرد. بۆ بەیانی من و ئامۆزاکەم (مەولود)ی لەپشت خۆی سوارکردو بەرەو گوندی ئۆمەراوە بۆماڵی خۆمان کەوتینەڕێ.

دوای چەند مانگێک، ماڵی ئێمە بەتەنها گەڕاینەوە گوندی گەڕەشێخان. بابم برادەری زۆر باشی هەبوو، وەک: (عەلی کوێخا قادر، سەلیم، برایم..وە زۆرانی تر). لەگوندی گەڕەشێخان بابم دەستی لەو برادەرانەی بەر نەدەبوو، زۆریان یەکتر خۆش دەویست، نانیان بەبێ یەکتر نەدەخوارد. شانسی ئێمە کچێک لە گوندەکەی ئێمە هەڵگیرا، ئەوانەی کچەکەیان هەڵگرت ڕایان کرد، خانوەکانیان چۆڵ بوو، چوون بۆگوندێک چوار گوند لە نێوانمان بوو. ئێمە بەکرێ چوینە ناو خانوەکانی ئەوان دەتوانم بڵێم: بەس ئێمە لەوێ کرێ نشین بوین. لەدوای بیست وچوار ساڵ ئەو کچە، خاوەنی چەند منداڵ بوو، کوڕیکیشی پێشمەرگە بوو، کوشتیان. لەسەرئەوەی بەکەیفی خۆی شوی کردبوو، گوێی نەدابوە ماڵی باوکی، واتە: بەدووکەوتبوو، یان ڕەدووکەوتبوو.

من چوومەوە قوتابخانە، لەبەرئەوەی کوڕی گەورە بووم، هاوینان یارمەتی باوکم دەدا. باوکم کارگەی لباد دروستکردنی هەبوو، وە لەروی حیزبایەتی ببوو بە بەرپرسی ڕێکخستنی حیزبی شیوعی لەو گوندە.

بەهاران پێش ئەوەی کاری خۆمان دەست پێبکات، کرێ پاڵەی دەکرد. (واتە: بەکرێ دروێنەی جۆی بۆ خەڵک دەکرد.) باوکم سەپانێکی زۆر کارامەو لێزان بوو. لە حەیران و گۆرانی دروێنەو ساوار کوتان، دەنگی زۆر خۆش بوو. ئێمە ببوینە خێزانێکی گەورە، بەرەی دوو ژن بوین، بەلام کەس نەیدەزانی کاممان لەکامە دایکین. حەوت براو پێنج خوشک، ژمارەمان ببوە خێزانێکی پانزە

کەسی. جگە لەوانەی لێمان دەمردن. ژمارەی مردوەکانیش نۆ بوون. باوکم حەزو ئارەزوێکی زۆری بۆ ڕاوکردن هەبوو، هەمیشە تاژی مامزکوژی هەبوو. دێڵە تاژی زۆر خێرای هەبوو، ڕاوچیەکان برادەری باوکم بوون. دێڵەکەی لەگۆلێکی بەناوبانگی دەڤەرەکە چا دەکرد. لەپاش چل ڕۆژ توتکەی دەبوو، باوکم بەخۆی و تەرازوەکەوە بەدیار کولانەکەوە دادەنیشت. ئەو گۆلەی لەهەمویان قورستر بوو، بۆ خۆی نیشانی دەکرد، ئەو دێڵە لەهەمویان سوکتر بوو، بۆ خۆی نیشانی دەکرد. ئەوانی تری دەدا بە دۆستە ڕاوچیەکانی. کلکی دەگرت بەرزی دەکردەوە، کام دەستی زۆر هەڵێنابا، ئەوی پەسەند دەکرد. هەمیشە گۆشت کەروێشک و مامزمان هەبوو، ئەو سەردەمە خەڵک زۆر نەداربوو، زۆر نیوەڕۆ، ئەو خێزانە گەورەی ئێمە بە دەسکێک توور نانمان دەخوارد. چایەش هەر سێ ژەم نەدەخورایەوە. وە نەبێت هەر ئێمەش وابین، خەڵک هەموی هەروا دەژیا، بەڵکو خراپتریش.

لەیادمە ژن گواستنەوەبوو، بۆ دراوسێیەکمان، دۆڵ و زوڕنا دەیکوتا. ڕەشبەڵەک دەستیپێکرد، باو بوو لە ناو شایی، شاباش دەکرا، ئەوەی پارەی هەبوو لەناو ئەو شاییە، بەدەست چاوەشەکەوە بەرز دەکرایەوە بۆ ئاسمان، وەیا بەناو ئەو شاییە بڵاودەکرایەوە، جا یەکێ لە دۆستەکان شاباشی دەکرد ( شاباش کاک فلان شاباش) پاشان هەڵیدەکێشا دەمانچە، چواردە گولەی بەئاسمانەوە دەنا. شایی بەم جۆرە گەرمتر دەبوو. جا ئەوەی لەگەڵ ئەو کەسە تۆزێ کێشەی لەسەر زەوی و یا کێشەی کۆمەلایەتی و وە یاسایی ناو گوند هەبوایە، ئەو پارەی زیاتری دەدایە چاوەشەکە و تەقەی زیاتری دەکرد. لەشایی و خۆشی نەدەچوو، وەک دەڵێن، دەتگوت: فەلوجەیە. لەیادمە جارێکیان باوکم چوار یەدەگی چواردە خۆری لەشاییەک خاڵی کرد، ئێمەی منداڵ تەنها قەوانەکانمان هەڵدەگرتەوە، یاریمان پێ دەکرد. ئەنگوچکی ژنەکانمان، لەپشتەوە لەیەکتر گرێ دەدا، ئەوان لەگەڵ پیاوەکان شاییان دەکرد. بەلام لەهەموی سەیر تر ئەوەبوو، ئەو زاوا بەدبەختە هێشتا بوکی نەبینیبوو، ئێمەی منداڵ پێش زاوا بووکمان دەبینی!!

# شانازیکردن بە گوندیبوونم

چـواردەی ڕەمەزانی سـاڵی ١٩٦٣، قەومیەکان حکومەتی عبدالکریم قاسـم یان ڕووخانـد، عبدالسـلام عارف هاتە سـەر حوکـم، وردە وردە زۆر لـە ئاغا یاخی بوەکانی دژی یاسـای چاکسازی زەوی، بوون بەسەرۆک جاش، پشتی شۆڕشیان بەردا. سـاڵی ١٩٦٣ بەسـاڵی حەرەس قەومی ناسرا. دەیانگوت: ساڵی حەرەس قەومی.

فەڕاشێکی هەژارو بەرێزی مەکتەبی ئۆمەراوەیان کوشت، بە ناوی کاک قادر، ئەو حەرەس قەومیانە، جلی عەرەبیان لەبەر بوو. (واتە: کراسە شۆڕەکەو عەگالیش لەسـەر)، هەرکێی بیان بنیبایە دەیان کوشـت، هەرچی پێان چوبایە دەیان برد، بەو کردەیە دەگوترا (فەرهود، واتە تالآن). تاوەکو ئێسـتاش فەرهوود لەعێراق پیادە دەکرێ، بەکوردستانیشەوە.

ماڵی ئێمە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە چوین بۆ شوێنێک، پێی دەگوترێت: (ئاوی گردمەلا)، ،سـەر بە ناحیەی قوشـتەپەیە. سـەرانەو گیسکی قەڵەویان دەبرد بۆ حەمـەی سـابیر ئاغا ( جاش بوو)، بۆ ئـەوەی پارێزگاریان لێ بکات. باوکم، بۆ ئـەوەی تۆزێک باری سـوک بێ، من و دایکمی ڕەوانـەی ماڵی باپیرم کرد (واتە: باوکـی دایکـم لەهەولێر) بە خۆی و باوەژنم مانەوە لە ئاوی گردمەلا.

چویـن بـۆ هەولێـر. ڕۆژێکیان لەگـەڵ باپیرم، چـووم بۆ مزگـەوت، لەگەڕەکی عارەبـان. لای پارێـزگا، نـاوی مزگەوتی پاشـا بوو. لەوێ چووم بۆ ئاودەسـتی مزگەوت، بەلام زۆرم پێ سـەیر بوو، ئەو گڵۆپە ڕووناکانەم دەبینی، یەکەمجارم بوو بەدەسـتی خۆم گڵۆپ پـێ بکەم و بیکوژێنمەوە!! هێنـدەم گڵۆپ هەڵکردو کوژانـدەوە، خۆم لەبیرکرد. باپیرم وایزانـی، چوومەتەوە ماڵەوە!! (ئەو وەختە مزگەوتەکان لەپاش نوێژی عەسـر دادەخران) لەپێش ڕۆژئاوا قەدەغەی هاتووچۆ ڕادەگەیێنـدرا. مـن هەر کە لەئاودەسـت هاتمە دەرەوە، کـەس نەمابوو، چووم بۆ دەرگا داخرابوو. زۆر ترسـام، منداڵێکی سـادەو نەزانی گوندی بووم. چووم

بـۆ نـاو مزگەوت، چاوم کـەوت بەم هەموو قورئان و جزوەی بە پەڕۆکی سـەوز بـەرگ کراون، تۆقیم!! چونکە زۆریان ترسـاندبووم، کـە قورئان کوێرت دەکات. گەڕامـەوە دواوەو چـووم بـۆ هەیـوان، لەوێ ئـەو دارەم بینی کـە پێی دەڵێن: دارەمەیـت. مردوی پێ هەڵدەگرن، بۆ گۆڕسـتانی دەبەن. زیاتر ترسـام. چووم بۆ ژووڕێک، ئەو تەختەیەم تێدا بینی کە مردوی لەسـەر دەشـۆن و پێی دەڵێن تاتەشـۆر. ئیتـر زۆر هەراسـان بووم، بیرم لەوە دەکردەوە کـە ئەو ڕۆژەی پێی بچم ئەو ڕۆژەیە!! خۆزگەم دەخواسـت لەگوندەکەی خۆمان گورگ بیخواردمایەو ئـەو ڕۆژەم بەچاوی خۆم نەبینیبایە. پێتان سـەیر نەبێـت زۆر پیاوی گەورەش لـەو شـتانە دەترسـێت، جا منـی منداڵ چۆن ناترسـم؟!! ڕامکرد بۆ سـەربانی مزگەوت، خەریک بووم لەوێوە خۆم فرێبدەمە خوارەوە، پێم وابوو ئەگەر ملیشم بشکێ قازانجە، نەوەکو بگەڕێمەوە ناو مزگەوت و ئەو هەموو کەرەستە سامناکە ببینـم. وامدەزانـی جنۆکەو مەلایەکەتی دنیام بەدواوەیـەو دەمگرن. ئەفەندیەک چاوی لێم بوو، هاواری کرد: نەکەی ڕۆڵە، کوڕم ڕاوەسـتە، چارەسـەرت دەکەم. زۆر هەوڵیـدا وەرمبگـرێ، بەڵام باڵای نەدەگەیشـتە بانـی مزگەوتەکە، بۆیە زۆر بەشـێنەیی و ئاقڵانە پێی گوتم: بچۆوە حەوشـی مزگـەوت، دیوارێکی نزم هەیە شتێک لەژێر پێت دابنێ، بچۆ بۆ ئەوماڵەی هاوسێی مزگەوتەکە، ئەوان نەجاتت دەدەن. بەڵام من زۆرم پێخوش بوو بچم بۆ ناو ئاگر، یاخود بەسەر مین بکەوم، تەنها نەچمەوە ناو مزگەوت، نەوەکو ئەو هەموو کەرەسـتە سـامناکە ببینمەوە، هێندەیان ترسـاندبووم، کە قورئان هەردوو چاوت کوێر دەکات، بەچاک و خراپ نابـێ لێـی نزیک ببمەوە. ئەو دارەبازەو مەیت شـۆرەش هـەر باس مەکە. بەلام ناچـار بووم کە بەقسـەی ئەو ئەفەندیـە بکەم، (ئەفەندی بەو کەسـە دەگوترا جلـی پانتـۆڵ و چاکەتی لەبەر بـێ)، چوومە خوارەوە. باوەڕتـان بێت کێڵگەی مینم پێ خۆشتربوو، پێم لەجەرگی خۆم نا، چوومەوە ناو مزگەوت، دڵم زۆر بە پەلـە لێی دەدا، هەر چرکەیەک دەمگوت: ئێسـتا، مـردوەکان و مەلایکەتەکان و جنۆکەکان، لەنێو کەرەسـتە سامناکەکان دێنە دەروو دەمگرن. کەس چاوی پێم ناکەوێتـەوە، هەرگیز گونـدو منداڵەکانی هاوتەمەنم نابینمەوە. بەهەر جۆرێ بوو خۆم گەیاندە ئەو دیوارەی کەوا دیوی دەرەوەی ماڵێک بوو، بەهەر شێوەیەک بو چوومە سـەر دیوارەکە، لای ماڵەکەم پێ ئەمین تر بوو لەمزگەوت، بۆیە سەیری

لای مزگەوتــم دەکــرد، خــۆم شــۆڕکردەوە لای ماڵەکە. کاتێــک تەپەم لە زەوی هێنا، پیاوێکی کەڵەگەتی ســورەی چاوشــین، کراســێکی شۆڕی سپی لەبەربوو، وەک مەلایکــەت وابــوو، توند دەســتی گرتم و هاواری کــرد، گوتی: وەرن گرتم. هەتا بڵێی یەک و دوو، کچ و کوڕەکانی پەیدابوون، هەمویان گەورەبوون، هاتنە دەرەوە، ئــەو هەمــوو نەفەرە هەمویان دەتگوت: جوانــەگای ئەلبانینە، مۆڕەیان لــێ دەکردم. چاویان لێ ســور دەکردمەوە، هەتا منیان بردە ســەر قەنەفەکانی ژوورەوە. هەروام دەزانی ئەو کابرایە جل سپیە مەلایکەتی ناو مزگەوتەکەیە منی گرتــوە. بەڵام کــە چوینە ژوورەوە دەرگایان داخســت، گوتیان: ئەوە دزەکەمان گــرت!! دەســتیان کرد بە گەڕانــی گیرفانەکانــم، لەبەرگــە پاکەتێکی جگەرەی جمهوری زیاتر، هیچم پێ نەبوو. ئەویش سێ کەلا شوشەو، بیست و پێنج فلسی تێدابوو. (خاڵم زۆری خۆش دەویســتم ئەو بیســت و پێنج فلسەی دابوومێ. ئەو ســا ئەو برە پارەیە زۆربوو، خاڵم (عەبدوڵا) پیاوێکی بەخشــندە بوو، کەس ئەم بــڕە پارەیەی لەو کاتــەدا نەدەدا بە منداڵ). هەموو (ئەموالــی مەنقولەو غەیرە مەنقولــەم) هــەر ئەوەنــدە بوو، دەســتیان بە پرســیاران کــرد: چەندجار دزیت کــردوە؟ کێ فێــری کردوی؟ بەزۆری چی دەدزی؟ منیش ئەوەندەم شــانازی بە گوندەکەمــان دەکرد، لەبەرامبەر هەموو ئەو پرســیارانە دەمگوت: ئەمن خەڵکی گوندیمە، ئێوە بۆ لە من تێناگەن! وامدەزانی خەڵکی گوندی واتە پاک، ڕاستگۆ، هەموو شــتەجوانەکان. گوتیان:کێ دەناسی؟ گوتم: جارێک لەگەڵ باپیرم چووم بــۆ ماڵــی مــەلای ئەو مزگەوتە، ئەو دەمناســێ. کابرای کراس شــۆڕ بەکراســی ســپی بەگەڵــم کەوت، توند دەســتی گرتبووم. بەلامــەوە زۆر ناخۆش بوو، وەک تاوانبارێکــی گــەورەی گرتبێــت، بردمیە لای مەلا. پێش ئەوەی کابرا پرســیارلە مەلا بکات، گوتم: مامۆســتا من کوڕی کچی ســۆفی شــێخەم، گوتی: دەیناســم. ماڵــی ئــەو کچەی لەگونــدە. گوتیان: ماڵی باپیرت پــێ دەزانییەوە؟ هەرچەندە پێــم نەدەزانی، بەڵام بۆ ئەوەی لەدەســت ئەو کابرایــە ڕزگارم بێ، گوتم: بەلێ. گوتیــان: ئازادی برۆ. ســێ کۆڵانم بــڕی بوو هەر ئاوڕم دەدایــەوە، بزانم کابرام بەدواوەیە یان نا.

# کوشتنی ڕانکوچۆغە سپییەکان

ماوەیەک دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ گوندەکەمان، حەمەی سـابیر ئاغا، برایەکی کـوژرا، بەنـاوی ئاغا سـابیر ئاغا، گوتیان: ئەوەی کوشـتویەتی ڕانک و چۆغەی سپی لەبەردابوە. حەمە فەرمانیدا : ئەوەی ئەمڕۆ لە هەولێر ڕانک وچۆغەی سپی لەبەردایـە بیکـوژن!! لە ئەنجامدا ئەو ڕوژە چواردە هاولاتی، کە ڕانک و چۆغەی سـپیان لەبەر بوو لەهەولێر شـەهید کرد، لە تۆڵەی ئاغا سابیر.

لـە دواییدا حەمەی سـابیر ئاغا، لەسـەر پردی قەجەر، لەکەمینی پێشـمەرگەی ئەیلولدا کوژرا.

عوسـمان یەکێک بوولە دانیشـتوانی گوندەکەمان، کرێـکاری دەکرد لەکەرکوک، ئەیـان ویسـت ژنی بۆ بێنـن، باوکمی کردە وەکیلی خـۆی. کاتێک چووبوون بۆ خوازبێنی و مارەکردن، ئەو لەکەرکوک لەسـەر کاربوو. لەیادمە، پێمان دەگوت: چـۆن دەبـێ تـۆ بوکت نەدیـوە؟ دەیگوت: ئەوە نییە وەسـتا عەلیـم کردوە بە وەکیل؟! باوەڕ ناکەم وەسـتا عەلی شتی خراپی بۆ من بوێت!

ئەوکاتـە مـن هەراش بـووم، لەبەرئەوەی کـوڕی نۆبەرە بووم، بابـم هەوریەکی سوری بۆ کڕیبووم. لەسەرم دەنا، بەڵام زۆر لەسەری خۆم گەورەتربوو. لەماڵەوە دەیانگوت: شوکر بۆ خوا ئەحمەد گەورە بوە بۆتە پیاو، کاتی ئەوە هاتوە چەکی بۆ بکڕین.

لـە کـوردەواری بـاو بوو، ئـەوەی ژن بە ژنەی دەکـرد، جاری وابـوو ئافرەتێک لەئەوی تر جوانتر بوو. زۆرجار دوو کچ بەکچێک دەدرا. وە یا سـێ کچی بچوک مـارە دەکـرا لەبری کچێکی گەورە. وە یا ئـەو ماڵەی کچەکەیان ناحەز بوو، جل و زێڕی هەردوو تەرەفەکەی دەکرد بۆ هەردوو لایەن! ڕۆژی گواستنەوە شوێنێک دیـاری دەکـرا، بۆ ئەوەی تفەنگانـێ بکرێ، جەرەیەکی پڕ ئـاو، یان کاخەزێکی سـپیان تێوەردەگرت و لەدوور دایان دەنا. ئینجا ئەو میوانانەی دەوروبەر لەگەڵ خەڵکی گوند دەبوو بە پێشـبرکێ، ئاخۆ کێ تفەنگ چییێکی کارامە ترە؟! ڕۆژی

پێشـــوو، جگەرە دادەگیرا بۆ میوانان، بەزۆری هەرزەکاران ئەو کارەیان دەکرد. لەیادمە ڕۆژێک جگەرەیان دادەگرت بۆ ژن گواســتنەوەی عەلی پلکە فاتم. ئێمە نزیکـەی نـۆ کەس بوین، ژوورەکە لە خشـت و قوڕ دروســت کرابــوو. چەند دڵ خــۆش بوین. تازە ببوینە (بارە جاحێڵ)هەرزەکار.

هێندەم لێ بەپەلەبوون، هەر دەیانگوت: شــوکر بۆتە پیاو. باوکم، دەمانچەیەکی ستاری بچوکی بۆ کڕیبووم، بەو هەموو قایش و قرۆشەوە لەپشتی خۆم دەبەست، بۆ خۆی دەمانچەی ستاری بچوک لەناو گیرفان جێگای دەبێتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی لــەدوورەوە بزانــدرێ چەکداری، بۆیە ئەو هەموو قایش و قرۆشــەی پێوەدەکرا!! بەڕاستی بۆ من زۆر زوو بوو کەوا دەمانچەم پێبێ. یەک لەو هەرزەکارانە، کاتی خۆی باوکی ســەر بە پیاوەکانی ئاغا بوو.

لە خۆشی ئەو گۆڕانیەی کەبەیەکەوە دەمانگوت، سەرمەست ببوین، دەمانچەکەی هەڵکێشــا، دوو دەمانچەی لەڕاستی سەری من، لەدیواردا. ئەوەش ئەگەر وەڵامی نەدرابایەوە نەنگی بوو. منیش دەمانچەی ستاری بچوکم هەڵکێشاو یەک یەدەگم لەســەر ســەری ئەو، لــە بانی خانوەکەدا. بــوو بە تەپوتۆزێک بــۆ ماوەی پێنج دەقیقە چاو چاوی نەدەدی!!

ڕۆژی دواتر، چوین بۆ مەڕاسیمی بووک گۆڕینەوە، لەکوردەواری باو بو، شوێنێک دیاری دەکرا، دەیانگوت:

لە فلان شــوێن دەیان گۆڕینەوە. هەر دوولا هەوڵیان دەدا جێی ئەوی تر بڵندتر بێ، وە ئەوی تر زیاتر بە پیل ئەوەوە بێ. زۆرجاریش کێشــە لەســەرئەو شــتە لاوەکیانــە دروســت دەبوو. لــە ژن بە ژنیدا، لــە هەموی ســەیرتر ئەوەبوو هەر لایەنەی هەوڵی دەدا پێش ڕۆژئاوا بوون زاوا بنێرێ بۆ لای بوک، بۆ ئەوەی ئەگەر پــەردەی کچێنــی نەما بێ زوو فریای ئەوە بکەون خوشــکی خۆیــان بهێننەوە!! پێــش ئــەوەی زاوا چوبێتــە لای، قوڕ بەســەر ئەو بوکەی کــە زاوا بیگوتایە کچ نەبوە، وە یا خەســوو بێ ویژدان بوایە، ئەوا کوشــتنی مسۆگەر بوو.

# ئۆمەرە کوژرا

ئەو ڕۆژانەی ماڵمان لە گردلانکە بوە، باپیرم مەڕدارو جوتیارێکی خاوەن جووتە هێستر بوە، باوکم دەیگێرایەوە: لەبەر مەڕی بوە، ڕۆژێک تایەری حەمە سەعدون و ئۆمــەرە و (دارەبەن) و چەند کەسـێکی تــر، لەشـوانکارەیی بەیەکەوە دەبن، یەکێکیان دەڵێ: بڕۆن نیشانم بۆ دابکەن، بزانن چۆن نیشان شکێنێکم؟ ئۆمەرە دەچێ نیشانەکە دابکات، لەوکاتەدا مێگەلە مەڕی باوکم دەڕوا دوور دەکەوێتەوە، باوکـم دەچــێ مەڕەکە دابگێڕێتەوە. شـوانی تفەنگدار خۆی لەسـەر سـک درێژ دەکاو نیشــان دەگرێ. پێش ئەوەی ئۆمــەرە بگەڕێتەوە لایان، تەقەی لە تفەنگ دێنێ. لەجیاتی نیشـانەکە ئۆمــەرە دەئەنگێوێ و دەیکوژێت. (دارەبەن) تۆزێک کاڵ فـام بـوە، هەڵدێ بۆ گوندو دەیکات بەهەرا، هـاوار دەکات: ئۆمەرە کوژرا، هاوارە ئۆمەرە کوژرا. هەر زوو کەسوکاری دارەبەن دەست دەخەنە سەر دەمی و دەیگرن، دەڵێن: دارەبەن، بێ دەنگ بە، (بەردێکی لەســەر دابنێ) پاش ناشـتن و لەکاتــی لێکۆڵینــەوە دەڵێن: لەوکاتەی تەقەکە کـراوە کێ لەدیاربوە؟ ، حاکم بانگی چەند کەسـێک دەکات بۆ لێکۆڵینەوە، یەک لەوانە دارەبەن. دەپرسـێت:

تۆ دارەبەنی؟

- بەڵێ قوربان.

-ناوی باوکت ؟

- ناوی باوکمە

- ناوی باوکت ؟

- ناوی باوکمە !!

- ئەو ڕووداوە چۆن بوو؟

- ئۆمەرە کوژرا بەردێکی لەســەر دانێ.

هەرچەنــدی حاکــم بەدوای وردەکاری دا دەگەڕێ بــەڵام لەوەی زیاتر لە دارەبەن نابیستێ.

حاکم دەڵێ: چەند دووربوو؟
دەڵێ: ئێرەو مەڕەکەی من.
بەناچاری حاکم دەڵێ: با چایەک لەدەرەوە بخواتەوە، بۆ ئەوەی بێتەوە سەرخۆ. برۆن نیو (ڕبە) بەردم بۆ بێنن. حاکم هەموو بەردەکان لەسەر مێز وەک مێگەلە مەڕ جیاجیا دادەنێ، بانگی دارەبەن دەکەنەوە بۆ لێکۆڵینەوە، حاکم دەڵێ: ئێستا ئەوانە مێگەلە مەڕن، کامە مەڕەکەی تۆیە؟ دەست لەسەر کۆ بەردێک دادەنێ دەڵێ: ئەوە مەڕەکەی منە. دەست لەسەر شانی حاکم دادەنێ و دەڵێ: ئەو کەرە مەڕی تایەرۆکییە، ئێرەو مەڕەکەی من دووربوو، تۆمەرە کوژراو بەردێکی لەسەر دانێ. ساڵێک بۆ گەواهی، دارەبەن دێنن و دەبەن، لە تۆمەرە کوژراو بەردێکی لەسەر دانێ، زیاتر لەدارەبەن هەڵناکرێنن.
دوو بنەماڵە بەشەڕ دێن، کاتێک دادوەری لێکۆڵەر بانگی شاهید دەکات، بۆ ئەوەی شاهیدیەکەی بنوسێ، لێی دەپرسێ: ئەو شەڕە چۆن بوو؟
شاهید دەڵێ: گەورەم گارەگار بوو، چراوەیان دەهات.
دادوەر دەڵێ: چۆن؟
شاهید دەڵێ: هەر چەقەچەق و مشتومر بوو.
دادوەر دەڵێ: چیتر؟
دەڵێ: شەش و حەوتیان بوو، لێکیان دەمراند.
دادوەر دەڵێ: کاکە شتێکم پێ بڵێ، لەسەر کاخەز بنوسرێ، ئێستا من چی بنوسم؟!

# گوتی بە فیشەکی دەدەین

دایکم بۆی گێرامەوە: پێش ئەوەی مێرد بە باوکم بکات، لەهەولێر دراوسێی ماڵی جولەکەیەک دەبن. کاتێک جولەکەکانی عێراق دەردەکەن بۆ ئیسرائیل، ناوماڵی خۆیان دەفرۆشت. منیش چووم (ئاون)ێکی چاکیان هەبوو لێیان بکرم. باوکم گوتی: کچم حەرامە، ئەوانە بەدڵ نایفرۆشن!! دیارە ئەوەی ئاینی بگۆڕیبا دەر نەدەکرا. بەڵام لەلایەن موسوڵمانەکانەوە زۆر دەچەوسێندرانەوە، بەچاوی سوک

سەیر دەکران، منیش لەدوای کرینی ئاونەکە، لەبەر وتەکانی باوکم، ئاونەکەم بۆ بردنــەوە گوتم: تازە پارەتان بۆچیە؟ پیاوە جولەکە پیرەکە گوتی: بەفیشــەکی دەدەین بەجەرگی ئێوەی دەنێینەوە.

ئــەوەی ســەیر بــوو بەمندالْــی گوێم لــە هەندێک جنێــو دەبوو، کە ئێســتا کالْ بوونەتــەوە، ئەگــەر منداڵێــک بترســابایە دەیانگوت: بتۆقی هــەی جولەکە، یان ئەگــەر یەکێ قەولی شــتێکی دابایە، دەیگوت: لەژنــان کەمتر بم ئەگەر وانەکەم، قەت بانگم مەکە بە موســوڵمان هەر پێم بڵێ جولەکە.

# دەردێکی ئەوتۆیە باوك لەهانای کوڕ نایە

ماڵە دراوســێیەکمان بوکیان هێنا، زاوا شــوانێکی هەژاربوو. برا گەورەکەی دوو ســێ گۆپاڵــی لــێ دابوو، پێی گوتبو: ئــەوا خەریکە دەبێ بەنوێژی شــێوان، بۆ ناچــی بــۆ لای بوکێ و ئاواو ئاوای لێ بکەی؟! تۆ دەزانی ئێســتا حەوت زەمانە ئەوان خوشکی ئێمەیان کردۆتە ژن!! کابرای قوڕ بەسەر، زەوقی هیچی نەمابوو، لەبەر ژانی ئەو هەموو گۆپالەی خواردبوی، بە زاوا نەدەبوو. برا گەورەکەی هات بۆ لای باوکم، گوتی: وەســتا عەلــی، چارەیەکمان بۆ بدۆزەوە. ئەو برا خوێڕیەم بە زاوا نابێ، لام وایە بەســتراوە؟! باوکم وەستای لباد دروستکردن بوو، دیواری دەزانی، جەوبرێکی زۆر باش بوو، ســەرپاڵەی سەپانەکان بوو، مێشی هەنگوینی دەبرِیەوە، یەکێ دەســتی یان پێی لەجێ چوبا، دەیزانی بیهێنێتەوە جێی خۆی، ناوکیشــی دەهێنایــەوە، من پێم وابوو وایان دەزانی دەبــێ لەوەش لەوان چاکتر بزانێ بۆیە پرســیان پێ دەکرد. بابم زۆر بەســادەیی پێی گوت: کاکە ئێوە لێتان داوە، خۆتــان لــێ گرتــوە، بزانن چی لە بوک دەکات، ئەویش شــەرم دەکا وازی لێ بێنن. بەڵام بێ ســود بوو برا گەورەکەی ســوێندی خوارد،گوتی: بەسەری تۆ وەســتا عەلی ئەگەر ئەمشــەو بەزاوا نەبێ، دەبێ لەبەر ئاوی بنێم هەموو گیانی بشکێنم.

ماوەیەکی زۆر ببوە بنێشتە خۆشکەی سەر زاران، لەناو ژن و پیاوی ئەو گوندە، بگرە ئەو خەبەرە گەیشــتبوە زۆر لە گوندەکانــی دەوروبەرمان. باوکم گێڕایەوە:

مـــام مەحمود کوڕێکـــی هەبوو، بەناوی خدر، (دراوســـێ گوندمان بوون). تاقانە بوو، مام مەحمود ژنی بۆ کوڕەکەی هێنا، بەڵام خدر بەزاوا نەدەبوو، دەیانگوت: بەســتویانە. (بەستان: گوایە لەکاتی مارەکردن ئەگەر یەکێ شتێ گرێبدات ئەوا دەبەسترێ، وە یا تەزبیحی بەدەستەوە بێ) ئەگەر ژن مارە دەکرا دەبایە هەموو ئەوانەی لەوێن دەســتیان لەســەر ئەژنۆیــان دابنێن، وە جوڵــە نەکەن، نەوەکو ناحەزێ زاوا ببەســتێ!! جــا خەڵکی دەیان گوت: خدر بەســتراوە. خەڵکی زۆر قســە خــۆش هەبوون لە گوند، گاڵتەی زۆر خۆشــیان دەکــرد. بەیانییەک، یەک لەوانەی نامەوێ ناوی بهێنم، مام مەحمود پیاســە دەکات و گۆچان بەدەستەوە، ناوە، گۆچانەکەی دەکێشــێ بە پێڵاوەکەی، لێی دەپرســێ: مام مەحمود، ئەم شــەو خدر هیچی نەکرد؟ مام مەحمود هەناســەیەک هەڵدەکێشــێ و دەڵێ: دەردێکــی ئەوتۆیە باب لەهانای کوڕی نایە!!

## چاکم دۆڕاند

ڕەســوڵ قولی پیاوێکی قســەخۆش، تەنها کەس بوو کە ئازادبوو قســەی بەدڵی خــۆی بکات، ئەگەر جنێویشــی دابا کەس لەبەردڵــی نەبوو، ڕۆژێک هات گوتی: وەســتا عەلی دۆڕام. باوکم گوتی: خێر، پێم ســەیرە تۆ بدۆڕێی کاک ڕەســوڵ!! هەڵبەتــە دەشــتی دزەییاتــی بەکــۆڵ و بیــر مەشــهورە، کۆڵ یان بــە چیمەنتۆ یــان بەتەنەکە دروســت دەکرا، بــۆ ئاودانی ئاژەڵ، لەلای ئێمــە هەرچی خەڵکی ســماقوڵی و دەشــتی کۆیــە بوایە دەیانگوت: خەڵکی وڵاتــی کۆیە، لەلای ئەوان چایان بە دیشــلەمە واتە بەقەند دەخواردەوە، دیشــلەمە خواردن جارجار هەندێ کەس ملچەیەکی لێ دێنن. مام ڕەسوڵ، خەڵکی نەشناسیبا گاڵتەی خۆی لەگەڵ دەکرد. کاتێک چەند کاروانچیەک دەگەنە سەر کۆڵ و بیر، مام ڕەسوڵ خەریکی ئاودانی هێســترەکەی دەبێ، لەوکاتە ســەگێک کە زۆر تینو دەبێ لەسەر کۆلەکە ئاو دەخواتەوە، مام ڕەســوڵ دەڵێ: جەغە دەڵێی خەڵکی وڵاتی کۆیەی چای و

دیشـلەمە دەخۆی!! دیارە کە نۆبەی کاروانچیەکان دێ و ولاخەکانیان ئاوبدەن، دێلەسـەگێک (بەبا) دەبێ ئەو هەموو گۆلە سەگەی لەدوا دەبێ دەیانەوێ ئاو لە گۆلەکـە بخۆنەوە، یـەک لەکاروانچیەکان دەڵێ: جەغە، دەڵێـی ئاغای دزەییانی دەسـتت لەپشت قونت گرتیە، ئەو هەموو کرمانجەت لەدوو دەروا!! باوکم گوتی: کاک ڕەسوڵ بەراستی پیست دۆراندوە.

# تاژی نەجیبترە لە سەگ

لەگوندی گەڕەشـێخان دەچوومە ئۆمەراوە، ماڵی مامم حوسـێن و مامم یاسـین لـەوێ بـوون، چونکـە مامم حوسـێن پیکەبێکی (جەمسـی) هەبـوو، پاش نان خواردنی ئێوارە، مامەکانم لەگەڵ چەند برادەرێک لەوانە شـەهید سـەلیم سەعید کە لەسێدارە دراو شەهید سەلیم چاوکەلا، کە بە ئۆتۆمبێلی ئەمنەکانی قوشتەپە شـەهید کـرا. لەگەڵ چەنـد برادەرێکی تر، وەک هـادی و هیدایەتی مام پیرداود کورەی گردلانکە، من و (مەولود)ی ئامۆزام کە هاوتەمەن بوین، لەگەڵیان دەچوین بۆ پردێ. چایەخانەی (بەیسون) تەنها ئەو تەلەفزیۆنی هەبوو، سەرو کۆلایان بۆ دەکڕیـن تا وەختی خەوتنان چاومان لەسـەر تەلەفزیۆن هەڵنەدەگرت، جا ڕۆژی دوایـی، وەک توتـی هەموومـان بۆ منداڵان دەگێرایەوە، هـی وا هەبوو دەیگوت: ئەوە درۆیە! ( باوەڕی نەدەکرد شـتی وامان دیبێت ).

ئەو کات زۆر شـتم لە دایکم دەپرسـی، کە تا ئێستاش بێوەڵامن، لەجیاتی وەڵام یـەک چەپەرۆکـی لە تەپلی سـەرم دەدا، دەیگوت: ئەوە کەی ئیشـی تۆیە، بۆ هێندە هەڵەوەر و بە پرسیاری؟

بـۆ نمونـە: کە مریشـکە کورکـی دادەنایەوە، سـەلیبێکی بە تەنیمۆک، لەسـەر هێلکەکان دەکرد، یان مەشـکەیان دەغاراند بە تەنی لەسـەر سینگی سەلیبێکیان دروست دەکرد، یان کەندو،کە لە قوڕ دروست دەکرا لە پێشەوە بە قوڕ سەلیبێکی بەرجەسـتەیان دروسـت دەکرد. یان ئەو محەلەبیەی کە بۆ ڕەمەزان بەدارچین، ئامـادە دەکرا، سـەلیبیان لەسـەر دەنەخشـاند و، زۆر شـتی تـر!! لەبەردەمی مریشـکە کورک، لەسـەر هێلکان گاسـنێکی ئاسـنیان دادەنا، لەبەر بروسـک و

**هەورە تریشقە!!**

وەک لەپێشەوە باسم کرد باوکم و مامەکانم، تاژی زۆر خێراو مامزکوژیان هەبوو. چوبوونــە گوندی (شــەناغە وقەپــڕان) چونکە لەلای خۆمان کەروێشــک زۆر بە کەمــی و تــاک و توک، شــوان دەیانبینی و بە باوکمیان دەگوت: لەفڵان شــوێن لەپێش مەڕی، کەروێشکێک هەڵساوەو ڕای کردوە. ئەو شوانانە دەوری موختار و سیخوڕەکانی زەمەنی بەعسیان دەبینی کەهەواڵی پێشمەرگەیان دەگەیاندە ڕژێم. لەگوندی شــەناغەو قەپڕان کە دەکەوێتە ئەودیوی زورگەزراو (حەســۆو عومەری فاتەلەکە)هەبــوون. زۆر دۆســتی باوکــم و مامەکانــم بوون، زۆرجار بەســەردان دەهاتــن بــۆ لای ئێمە. عومەری فاتەلەکە خۆی بەخــوارزای باپیرم حاجی تاهیر دەزانــی، هــەر دەیگوت: ماڵی خاڵم، یان بە بابــم و مامەکانمی دەگوت: منداڵی ماڵی خاڵم. خەنجەرێکی دەبانی لەبەرپشت بوو، زڕێی هەڵدەگرت. کاتێ باوکم و مامەکانم حوسێن و یاسین، گەیشتبوونە شەناغە، عومەری فاتە لەکە دەستوری دابــوو بــە خێزانەکەی نیســکێنە بۆ تاژیــەکان لێ بنێ، جێگایــان گەرم بێ، بۆ ســبەینێ ڕاوە لەحــاوی شــەناغە. بەڵام تاژی چ تاژی، بەیانــی ئەگەر جلیان لێ دەکردنــەوە ڕاوێچکەیــان دەکرد، هەر چوار پەلیان بەخەنە، ئەوەندە بەناز پێیان لەسەر زەوی دادەنا، دەتگوت بوکی ساڵێنە. دوو ڕۆژ لەسەر یەک چووبوونە ڕاو، دوازدە کەروێشــکیان کوشــتبوو، ئەوە لەناوچەکە دەنگی دایەوە!! ماڵی حاجی تاهیــر دوازدە ڕســت کەروێشــکیان هەســتاندوە و تاژیەکانیــان هیچیان نەجات نــەداوە. کاتێــک تاژی زۆر تێبەر دەدرێ، تینو دەبێ. گۆمێکی گەورەی پڕ لەئاو لەوێ دەبێ، شــوانێک مەڕی لەســەرئاو دەدات. تاژیەکان ڕا دەکەنە ناو گۆمەکە بــۆ ئاو خواردنەوەو خۆ فێنک کردنەوە، مەڕیش دەرەوێتەوە، شــوانەکە بەردێک هەڵدەگــرێ و ڕا دەهاوێتــە تاژیــەکان و دەڵێ ( چەغە.. چەغــە). باوکم گوتی: هەر ئەوەندەمان زانی، عومەر خەنجەری لەســەر ملی شوانەکە دانا، گوتی: هەی ســەگباب ئەوە چەغەیە یان (وشــتەیە)؟ ئاخر تاژی تۆزێک نەجیبترە لەســەگ، چەغە بۆ سەگە و وشتە بۆ تاژی بەکاردێ، شوانە سپی دەبێ لە ترسان. عومەر دەنەڕێنــێ دەڵــێ: تۆ نازانی تاژیەکانی ماڵی خاڵم دوازدە ڕســت کەروێشــکیان کوشــتوە لەدوێنێــوە؟ تــۆ چۆن زاتی ئەوە دەکــەی پێیان بڵێــی چەغە!! ئاخر کوێری قەتت ئەوەندە خەنە بە دەســتوپلی دایکتەوە دیتوە؟ بەهەرحاڵ، عومەر

لەیەخەی شوانەکە دەکەنەوە. کاتێک خەنەیان لەهەر چوار پەلی تاژیەکان دەنا، بــۆ ئەوەبوو کە نــاو لەپی تاژیەکان قایم بکات، تاوەکــو لەکاتی ڕاکردن بەدوای کەروێشــک یان مامز، ناو لەپیان بریندار نەبێ.
سەید مەحەمەدە شەلە کە ماڵی لەپرکانیان بوو، ولاش ڕاوچی بابم و مامم بوو، دەهاتە ناوچەی ئێمە، دەیپرسی: کێ تاژی خێرای هەیە؟ بۆ ئەوەی لێی بستێنێ. لەبیرمە ڕەسوڵی مام عەزیزی تاژیەکی هەبوو،ساڵێک دەبوو بە خێوی دەکرد، لە ڕەسەنی تاژیەکانی ئێمەبوو، تازە وەختی ڕاوی هاتبوو. سەید مەحەمەد هێندەی پێگوت: ئەگەر ئەو تاژیەم نەدەیتێ نێچیری لەدەمی ناکەیەوە، دوعای من یەکەو یەکە، بەمجۆرە تاژیەکەی لێســتاند. ڕۆژێک پرســی بوی: کــێ تاژی مامز کوژی هەیە؟ پێیان گوتبوو: حوســێن و علی و یاســینی حاجی تاهیر. گوتبوی: ئەوانە لەنوشــتەو دوعا ناترســن، ئەگەر ســوێندێکی زۆر گەورە بخۆن، دەڵێن: بەکلکی تاژیە بەلەکی. ســوێندی بەکلکی تاژیەکانیان دەخۆن کوا دەیدەن بە من!!

# دووڕینی گیرفانێك بۆ پێنج دینار

لــە گوندەکەمــان یەکێــک لەتەمەنی چل ســاڵی مرد. لەگەڵ دایکم چووم، شــین و شــەپۆڕێک بوو مەپرســە. دوو ســێ خوشــکی هەبوو، هەریەکەی ئەو کەزی و بسکە جوانەی خۆی دەرهێنابوو، بەنینۆکەکانیان ڕوی خۆیان دەردەهێنا، خۆیان لەخوێــن ســورکردبوو، وە یەکەی تەشــتێک قوڕیان لەســەر ســەری خۆیان ڕوو کردبوو، بۆم دیارکەوت ئەوەی لەهەموان زیاتر پرچی خۆی دەرهێناوە لەباســک و زەنــدی هاڵاندوە، ڕوی خــۆی لەهەموان زیاتر دەرهێناوە، خــۆی زیاتر بریندار کــردوە، ئەوە لەهەمویان دڵســۆزترو خۆشەویســتری ئەو مردوەیــە. لەپیاوانیش ئەگــەر خــزم بوایە لــەدوور ڕا پێش بگاتە لای پرســەکە بەســەری خۆیدا دەدا، لەئەژنــۆی خــۆی دەدا و لــە برا ڕۆی دەدا، ئەوەی خزم بوایــە دەبوایە لە بانگێ بداو لە برا ڕۆ بدا. پاشــان باوکم و هەموو دراوســێیەکان لەناو گوند، نەدەبوایە ڕیشــیان بتاشــن، ســێ ڕۆژ شــیوە غەریبەمان دەبرد بۆ مزگــەوت. ماڵی مردوو نانیان ساز نەدەکرد، جاری واهەبوو مانگی پێ دەچوو، جا دەچوونە لای خاوەن

مردوو، بەزۆری ڕیشیان پێ دەتاشی، زۆرجار پاش ساڵێک بەلای ئەو ماڵە ڕەت بوینایـە، گوێمـان لـە گریانێکی زۆر بە کـوڵ دەبوو، یان لەلایـەن دایکی وە یا خوشـکی مردوەکـە. ئەگەر ژنی مردوەکە دووگیان بایـە، لەکاتی بەرزکردنەوەی دارەمەیتەکـە بـۆ ئەوەی خەڵکەکە تـێ بگەیەنێ لەو مردوە دوو گیانە، سـێجار بەژێـر دارەمەیتەکە ئەودیو ئەودیوی دەکرد، تا بزانن دوو گیانە!

گردبوینەوە بۆ سـواقدانی سـەری خانوەکانی عەزیزی مام حەمەد عەلی، کاتێک سەری یەک دوو هۆڵمان قوڕ دەدا، حەیدەر گوێی لێ بوو پلکە عەیشێ گوتبوی: ئـەو مەنجەڵـە ماسـتە بۆ ئـەو هەرەوەزیە یە. بۆیـە حەیدەر توڕەبـوو، گوتی: دەسـتتان سـوک بکەن، پلکە (پوور) عەیشێ چێشـتمان بۆ ناکا. لەقەدەر نان و ماست دەبێ کارەکە بکەین!!

لـەڕوی هـاوکاری: خەڵک زۆر هاوکار بـوون لەگەڵ یەکتر، بەتایبـەت ئەگەر لە وەرزی هاویـن، کـە وەرزی کارکردنە، یەکێ نەخۆشـی هەبوایە، یـان کارەکانی دواکەوتبایە، هەرەوەزیان بۆ دەکرد. تا ئەویش کاری تەواو دەبوو. وە یان پایزان سەری هەموو خانوەکانی گوند، دەبوو قوڕ بدرێنەوە، هەمویان هاوکاری یەکتریان دەکرد بە بێ جیاوازی. زسـتانان، باوکم وەختی خۆی بە ڕاوکردن دەبردە سەر، ڕاوی کەروێشـک و مامـز. جارێکیان باوکم لە ڕاو گەڕابـوەوە، چوومەوە ماڵەوە دایکـم و باوەژنم زۆر خەمناک بوون، پرسـیم: چیبوە؟ دایکم گوتی: ئەو پارەی هەمانبوو بۆ شـەکرو چای زسـتان، لەکاتی ڕاوکردن باوکت هەموی ون کردوە. پارەکە هەموی پێنج دینار بوو. لەناو جزدانێکی گەورە کە خۆی کووڕ کردبوەوە بـۆ پارێزی مامزان، لێی کەوتبوو. ماڵی باپیرم زانیبویان، داپیرم عەیشـێ پێنج دینـاری لەنـاو گیرفانی مەولود ی ئامۆزام بـەدەرزی و داو دووری بوو، نەوەکو ونی بکات، سـواری ئێسترێکیان کردبوو، هات بۆ گەڕەشێخان بەدایکم و باوکمی گوتبـوو: وەرن بمهێننـە خـوارەوە!! گوتبویـان: بۆ بەخـۆت نایەیتە خوارەوە؟ گوتبوی: پارەم پێیە بۆ ئێوەم هێناوە. دورمانی گیرفانەکەیان هەڵوەشـاندەوە، پێنـج دینـاری تێدابوو، لەگەڵ دروێنـەی جۆ لەگوندی پۆریچـە، کابرای خاوەن زەوی، پارەکـەی دۆزیبـوەوە. زانیبـوی باوکم پارەی ونکردوە بـۆی هێنایەوە. بەداخەوە ناوەکەی نازانم.

# نەکەی دەستت دەسوتێ

باوکم گوتی: لەئاقاری گردەسوّری، مامزێکم ڕاوکردبوو، بەتەنیشتی ئەسپی (سامۆتەی زینی)م هەڵواسیبوو. سەید مەحەمەد منی بینی، هات بۆ لام، هیچی ڕاو نەکردبوو، گوتی: عەلی بۆ نەچین لەگردەسوّر ئەو مامزە لەماڵی فلان کەس بخۆین؟ منیش گوتم: کەیفی جەنابتە. چوین بۆ گردەسوّر، ئەو ماڵەی سەید مەحەمەد گوتی، مامزەکەمان لەماڵی ئەوان داگرت و وڵاخەکانیان بەستەوە. باران دەیپرۆشاند، بەبای دەباری زۆر ساردبوو. پیاوەکە لەماڵ نەبوو، هەرکە کەلەشە مامزیان بینی، خێزانی گوتی: بەخوای دێتەوە چۆتە هەولێر. نوێژی شێوان چاوەڕوان بوین، ژنە قاپێکی گەورە کە پێی دەڵێن (لەگەن) پڕ لە گۆشت بۆمان سورکاتەوە، بەڵام کە لەسەر سینییەک ساوەریان لەناو لەنگەری بۆ هێنابن، لەگەڵ سەلکە پیازێک لەسەر ساوەر، چەند کوتە (پشکە) گۆشتێکی بەسەربوو. منداڵێک دەم نا دەم پڕی دەدایە پشکە گۆشتێک و دەیخوارد، ساوەر هەڵمی لێ هەڵدەستا ئەوەندە گەرم بوو، سەید مەحەمەدیش پێی ناخۆش بوو، کە منی تووشی ئەو شوێنەکردبوو. لەناکاو دەستی منداڵەکەی گرتوو لە بن ئەو ساوەرە گەرمەی نا، هەتا دەنگی تێدابوو هاواری کرد:

ڕۆڵە دەستت دەسوتێ، کوڕم دەستت دەسوتێ. منداڵەکە دەیزیڕاندو هەڵدەهات، ئایکی بە ڕاکردن هات و هاواری کرد، ئەوە چی بەسەرهات ئەو منداڵە!!

سەید مەحەمەد گوتی:

زۆرم پێگوت دەستت دەسوتێ، بەڵام وای دەزانی ساوەرەکە گۆشتی لە بنە، دەستی خۆی سوتاند. کە ژنە ڕۆیشت سەید مەحەمەد گوتی: هێندەی گۆشت بۆ هێناوین، بەو منداڵەشی گوتوە بڕۆ لای مامەی (جزەی) بخۆ، ئاوا دایکت ئاوا وا لێ دەکەم!! لە کەلەشە مامزێک قاپە گۆشتێکی بۆ ئێمە نەهێناوە!!

# لە جێگەی شێتێك ، ئاقڵێك دەكوتن

لەگوندی گەڕەشـێخان، دراوسـێی ماڵی عەلی کوێخا قادر بوین. زۆر یەک ماڵ و تێکەڵ بوو لەگەڵ باوکم. لەدۆڵە بەکرە، پیاوێک هەبوو بەناوی دەروێش مەحەمەد، ئەندامی حیزبی شیوعی بوو. لەگەڵ ماڵی مام عەلی هاموشۆیان زۆر خۆش بوو، ئـەوکات دەرگای دار لەگەڵ تەنەکە دروسـت دەکرا. مـام عەلی (بەکوێخا عەلی ناسرابوو)، ئەو ڕۆژە دەرگای دروست دەکرد، دەروێش مەحەمەدیش میوان بوو. دەروێش لەجوڵەو هەڵسـوکەوتی هەڵەشــە و عەجول بوو، لەچرکەیەک دوو سێ جار ســەری بەولاو بەولادا دەجولاند، کلکە جامانەکەی بە لاچاوی دەکەوتنەوە، کوێخـا عەلــی دەیگـوت: چەکوش و بزمـاری لەمن وەرگـرت، هەرچەندی گوتم: دەروێـش لێـی گەڕێ. بێ سـود بوو، دەسـتی کرد بـە بزمارکوتـان لەدەرگای تەنەکە، تاچەکوشێکی لەدەرگا دەدا، دوو چەکوشی لەدەست وپلی خۆی دەدا!! تاوای لێهات دەسـتی چەپـی، ئەوەی بزماری پێ دەگرت، پەنجەی سـاغی تێدا نەما، هەر پێنج پەنجەمان بۆ پێچایەوە. مام عەلی دەیگوت: هەتا جارێک بەمنی دەگـوت: کوێخـا، دە جـاری بەفاتمی خێزانـم دەگوت: کوێخـا. بەمنی دەگوت: کوێخـاژن، وای لـێ تێکەڵ ببوو. مام دەروێش جوڵەی ســەیری هەبوو، برایەکی هەبوو بەناوی عوسەگول. عوسەگول شێتبوو، لەبەر بەژن کورتی پێیان دەگوت: عوســەگول، ڕۆژ تـا ئێوارە لەســەر شـاڕێی (هەولێر- کەرکـوک) بەرگە پاکەتە سیگاری غازی و جمهوری و دەسماڵ کاخەزی قەراغ ڕێگای کۆ دەکردەوە، هەتا هەمـوو گیرفانەکانی دە ئاوسـا، بـەڵام ئەگەر یەکێ نەیناسـیبا قەت جوڵەی بە شـێتان نەدەچوو، بە ویقارو کەم دوو، هێمن و ئارام.

مـام دەروێـش مەحەمــەد ڕۆژێـک بردبوی بۆ ماڵی شـێخ عبدالرحمانی سـەیدە ئەحمــەد لەپردێ، کە دەیانگوت: شـێت و هاریان لـە ماڵی چاک دەبێتەوە. مام دەروێـش و عوســەگول دەچنــە تەکیەی شـێخ عبدالرحمان، شـێخ لەماڵ نابێ. فەرمویان لێ دەکەن، لەتەکیە دادەنیشــن. شێخ دەگەڕێتەوە، دەڵێن: دوو کەس لەتەکیە دانیشـتون، یەکێکیان شـێتە برایەکی هێناویەتی، دەبێ جنۆکەکانی پێ

ئاشـکرا بکـەی. (دیـارە ئەو کارەش لەلایەن شـێخەکان بە دارکاری شـێتەکان دەکرا). شێخ لە تەکیە وەژوور دەکەوێ، (حەیزەرانەکەی) لەپشت دەرگا دەست دەداتـێ، سـەیریان دەکا عوسـەگول ئـارام و بەویقـار، دەروێـش مەحەمەد بە جولّە، شێخ عبدالرحمان ناکاتە نامەردی، سێ چوار حەیزەرانی مزر لە دەروێش مەحەمەد دەدا، دەروێش هاوار دەکات: یا شـێخ من شـێتەکە نیم، ئەو برایەمە. شـێخ دەڵێ: بە جەدی بابم ئەوە زۆر لە تۆ لەسەرەخۆترە!!

بەداخـەوە سـاڵی ١٩٧٧ دەروێش مەحەمـەد کە ئەندامی حیزبی شـیوعی بوو، لەلایـەن دائیرەی ئەمنی قوشـتەپە، هەر بەو ئۆتۆمبێلەی کە سـەلیم چاوکەلای تۆمـەراوەی پـێ شـەهید کرا، دەروێـش مەحەمەدیشـیان لەنێوان قوشـتەپە و تۆڵەبەکـرە، گوندەکـەی خۆیـان، ماتۆری هەبوو، شـەهید کرد. بەو شـێوەیە، دەروێش مەحەمەدی قارەمان باجی بە بەعسـی نەبوونی خۆی بەگیانی خۆیدا.

# ئیشی پیاوی گەورەی کردوە
# خوێندنی ساڵی (١٩٦٧ـ ١٩٦٨)

لەپۆلـی شەشـی سـەرەتایی چوومـە تاقیکردنـەوەی بەکەلـۆری (وەزاری)، لە قوتابخانــەی ئیبن خەلەکان لەهەولێر، لای ماڵی نەنکم دەمخوێند، دایکی دایکم. یەک ژووری سێ بەچواری قوڕ لە گەڕەکی عارەبان. لە تاقی کردنەوە دەرچووم. چوومـە قوتابخانــەی ناوەندی ئیسـکان، ماڵی نەنکم یـەک ژوور بۆ خەوتن، بۆ خوێنــدن و چێشـتلێنان، بۆ عەمبارو کەلوپەل!! بەڕاسـتی ناخۆش بوو. هەندێ قوتابی گوندەکەمان خانویان گرتبوو، بەناچاری چووم بۆ لای ئەوان. شەو دەبوو بەتەقــە، باڵی مەکتەبی سیاسـی، بەنـاوی جەلالی مەقەڕیـان لەهەولێر هەبوو، مەقەڕێکـی چەکدارەکانـی مـام جەلال لای ژوورەکـەی ئێمە بوو، پێشـمەرگەی پارتیش دەهاتنە سـەریان. ئێمە تابەیانی هەڵدەلەرزین لەسـەرمان و لە ترسان. تـا وای لێهـات زۆربەمـان قوتابخانەمان تـەرک کرد، چوینـەوە بۆگوندەکەمان. یارمەتـی باوکـم دەدا لـە هەموو کارەکان، بـەڵام لەهەموی ناخۆشـتر ئەوەبوو،

دایکــم دەیگــوت: باراشــمان نەماوە. بەیانی باراشــیان بۆ بار دەکــردم، بازۆ بۆ دۆڵەبەکرە، ئاشــی حاجی حەمەد عەلی، لەوێ نۆبەم دەگرت، هەمیشــە کارێکی وام دەکــرد، لێــم بپرســن: کوڕی کێــی؟ دەمگوت: کوڕی عەلــی حاجی تاهیرم. دەیانگــوت: کــورە بــۆ دەنگ ناکەی تۆ برازای، باراشــەکەیان بــۆ لێ دەکردم و بۆیان بار دەکردم. دەیانگوت: سڵاو لە باوکت بکە، بڵێ هاوینێ لباد یان قاپوتی چاکمان بۆ دروســت بکات. ڕۆژێکیان باوکم چوو بۆ شــار، گوتی: هەتیو نەچی تاژی بەری لە ڕێوی بەربدەی، چونکە ڕێوی بریندار دەکا. منیش دوو برادەرم هەبــوو، هاوتەمــەن بوین، حەیدەرو برایم، گوتیان: بــۆ تاژیەکە ناهێنی بچین بۆ ڕاو؟ منیش ڕازی بووم. چوین بۆ لای مەحەتە، شــتێکی مەیلەو ســپی دوور بوو، تاژیەکــە دیتی، لە ڕســتەکەی دەســتم بەرمدا، هەر زوو هێنــای و بردی، ئەگەر چوین یەک مامزی زۆر گەورەبوو لە ئەرزی دابوو، سەرمان بڕی و هێنامانەوە بۆ ناو گوند، هەموو خەڵک تەماشــای دەکردین، ئەو ڕۆژە لەســەر ڕێگای ئۆتۆمبێل وەســتابوین. باوکــم هاتــەوە، زۆر کەیفی پێ خۆش بوو، کــە کوڕەکەی خەریکە دەبێتە ڕاوچی.

بۆ هاوین بووم بە شەغرە کێش، لای ماڵی مام کاک. دوو کوڕی هەبوون شیوعی بوون، برادەری باوکم بوون، مام عەوڵاو مام عومەر. کوڕەکانی مام کاک، گەورەو بەتەمــەن بــوون، کە وازیان لە حیزبی شــیوعی هێنا، بوون بە مەلای زۆر چاک، هەریەکەیان بوون بە ئیمامی گوندێک. زۆر خوێندەوارو تێگەیشتووبون، بەراستی تاقیکردنەوەیەکی ســەرکەوتوە لەپاش چەند ســاڵ شــیوعیایەتی ببیت بە مەلا!!

مــەلا عەوڵا بوو بە مەلای گوندی تووڕەق.

ڕۆژی بەســێ پەنجایی شــەش کاروانم شــەغرە دەکێشــا، بەڵام بەراستی ماندوو دەبووم، مەلا عەبدوڵاو مەلا عومەر زۆریان خۆش دەویســتم، هیچ ماندووبوونم لە بیرنەدەماو پێکەوە نان و ماســتاو، یان نان و دۆمان دەخوارد. جاری وا هەبوو دووانمان بە یەکەوە دەستمان بۆ کەوچکە دارینەکەی دۆیەکە درێژ دەکرد، ناچار یەکمــان پەنجەمــان لە جامەکە دەدا، دەمانگوت: ئەوە ســفرە یــان فافۆنە؟ بۆ ئەوەی تەریق نەبینەوە! (شەغرە لەدار دروست کراوە بۆ کێشانەوەی ئەو گەنم و جۆیەی کە بەداس دەی دوورنەوە، شــەغرە قۆناغێک پێش عارەبانەیە).

چــووم بــۆ لای مامــم یارمەتی بــدەم، مەڕی ماڵی شــێخم لە شــینایی دەرکرد،

گوتیـان: زارت خـوار دەبێت، هێندەیـان گوت: زارت خوار دەبێت، شـەوەکەی خەبەرم دەبوەوە دەستم لەزارم دەدا!!
وەسـتا عەولاو وەستا عوسمان کوڕی مام شێخەبوون، زۆر برادەری باوکم بوون، ئەندامی حیزبی شـیوعی بوون. منیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ موسـڵ، سەربازگەی موسڵ دروست دەکرا بەبەردی حەلان. کە چاویان بەمن کەوت، گوتیان: ئەوە زۆر منداڵـە ڕۆژانەی تـەواوی نادەینێ! ڕۆژانەم دوازدە پەنجایی بوو، لەهەموو عێراق گرانتر بوو، من چیمەنتۆم بۆ وەسـتا دەکێشـا بەدوو سـەتڵ، ئەوەی شـارەزابێ دەزانـێ، دیـواری بەرد چەنـدی چیمەنتۆ دەوێ. باوەڕتان بێ پێنج شـەممە کە پارەیـان دا بەکرێکاران، گوتیان: کاری پیاوی گەورەی کردوە، پارەیان تەواو دا پێم. هەرچەندە شـەوانە لەترسـی ڕۆژی دواتر خەوم لێ نەدەکەوت، چونکە زۆر لەو ئیشـە دەترسـام. بەڕاستی ئەوکارە لە ئاسـتی توانای جەستەیی من نەبوو. کە گەڕامەوە بۆ ماڵ، باوکم ئەوەندە بەکزو لاوازی بینیمی، نەیهێشت بچمەوە بۆ موسـڵ. بۆ ئەوکات پارەی چاکم هێنابوەوە. پاش ماوەیەک چووم بۆ کەرکوک، چونکە زۆربەی خەڵکی گوندەکەمان لەکارگەی کەرپوچی وەسـتا هوبی ئیشـیان دەکرد، ڕۆژی بە هەشـت پەنجایی، ماوەیەک لەوێ کارم کرد. ئینجا کە هاتمەوە باوکـم تفەنگێکـی ئینگلیـزی یازدە خۆری بۆ کڕیم، هێنـدەی بالای خۆم دەبوو. هێنـدەم گـوێ لە مامم و باوکم ببوو، دەیانگوت: پیاو بکوژرێ، نەوەک چەکی لە بن سـەری دەربێنن و لێی بدزن یان چەکی بکەن. وا لەگوێم چەسـپی بوو، ئەو تفەنگە بۆ من ببوو بە بەلایەکی زۆر گەورە! چونکە خەوم نەما بوو، نەوەکو لێم بدزن. سێ چوار جار جێگای خۆم دەگۆڕی، شەوێ کە لەخەو هەڵدەستام، پێش هەموو شت دەستم لەتفەنگەکەم دەدا بزانم ماوە؟! شەوی وا هەبوو خەوم پێوە نەبینی، کە هەڵدەسـتام شـوکرانەی خوام دەکرد کە خەونەو کەس نەیتوانیوە بگاتە لام تا چەکم بکات.
دراوسێیەکمان هەبوو لەگەڵ هەموو خەڵکی شەڕی دەکرد، جارێک هاتە دەرگای ئێمـە، باوکـم گوتی: نۆبەم نییە، دوو ماڵم لەپێش ماوە. دوایی کە نۆبەمان هات شەڕی خۆمان لەگەڵ کرد.

# شیوی حەمەشێت

حەمەشـێت: شـێتێکی بەناوبانگی شـاری هەولێربوو، لە عەشـیرەتی لەک بوو، هەڵـە نەبـم لەکۆن خەڵکی گوندی قەشـقەبوون. موی سـەری لولـی خواردبوو بەسـەری دا شـۆڕببوونەوە، بەجۆرێک وەک ئەوانەی ئەفریقا کە بۆ جوانی موی سـەریان وەک کەزی لول دەکەن و شۆڕ دەبێتەوە بۆ سەر ملیان.

نەیدەزانـی خۆشـۆردن چیـە، زۆر دەگریـا هـاواری دەکـرد: پێغەمبـەر وەرە بگـە ئۆمەتەکـەت هەموی فەسـاد بوو، ئەگەر شـوانیت پێ ناکـرێ بۆ گۆپاڵت دەسـتداوەتێ؟!! خەڵکی واهەبوو دەیانگوت: ئـەوە وەلییە (غەیب زانە)، بەڵام خۆی لەخۆیدا شێتێک زیاتر هیچی تر نەبوو، لەبن دیواری مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ بارگە و بنەی دەخسـت، بەرامبەر بازاڕی سـیروان ( ئەسواق سیروان). من ئەوکاتـە پۆلی یەکی ناوەندی بووم، کە لە قوتابخانە دەگەڕامەوە، بە کتابەکانی بن هەنگڵمەوە، لەلای دەوەسـتام. پرێمز یان تەباخەکەی هەڵدەکرد، مەنجەڵێک ئـاوی دەکوڵانـد، بڵـق بڵق، دۆشـاوی تەماتە و ڕۆن و برنج و گۆشـت و چاو و شـەکر و خوێ و دەسـکەتورو کەرەوز و سڵق و پەتاتە و خەیار و تەماتە و زۆر شـتی تر، کە ئەو ڕۆژە دوکاندارەکانی شـاری هەولێر پێیان دەبەخشی، هەموی لەناویەک مەنجەڵ دەکوڵاند.

بۆیە ئێسـتاش هەولێریە بەتەمەنەکان، ئەگەر شـتێک هەمەجۆر و فرە بابەت و پێچیدە و ئاڵۆز و تێکەڵ بێت، پێی دەڵێن: بۆتە شـیوی حەمەشـێت. بۆیە بیرم کردەوە بۆگێڕانەوەی بیرەوەریەکانم، کتێبەکە ناو بنێم شـیوی (حەمە شـێت)، کـە بـەم توانا کەمەی لەبواری نوسـین هەمە، بەسـەرهاتەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتـی و چینایەتـی و سیاسـی و حیزبایەتـی و خەباتی پێشـمەرگایەتیم لەچوارچێـوەی ئـەم کتێبە جێـگا بکەمەوە. لەبەر دووهۆکار ناوم نەنا (شـیوی حەمەشـێت)، هۆکاری یەکەم ئەوەبوو، زۆر لەناوی کتێبەکەی (چێشـتی مجێور) ی مام هەژار نزیک بوو، وە وشـەی (شـیو) تەنها لە زاراوەی هەولێری بەمانای

چێشــت دێت. وەک منداڵێکی یەک ساڵانە دارە دارە دەکەم بەناو بیرەوەریەکانم و کردوومەتە شــیوی (حەمە شــێت). ئەوکات دزی و دەستپیســی لەســەرەوە بــۆ خوارەوە جەســتەی کۆمەڵــگای نەئەنجنی بــوو، لەبیرمــە بارەگایەکی تری حەمەشــێت لــەلای منارەی چۆلی بوو، ئاســنەواڵەی زۆری لــەوێ کۆکردبوەوە، بــۆ خەوتــن دەچوو بۆ ئــەوێ. تەنەکەیەکی پڕ لە پــارەی وردە (قەرەپول) لەو شــوێنە بەجــێ دەهێشــت، کەس دەســتی بۆ ئــەو پارەیە نەدەبرد، لــەو پارانە بــوو کــە دوکاندارەکانی هەولێر ڕۆژانە دەیاندا بە حەمەشــێت. ئەوکاتە کۆمەڵگا کەرەســتەیەکی خامی چەند پاک و بێگەردبوو، دەتواندرا لەجیاتی بەکۆیلەکردن و بێ ئیرادەکردن و داڕزان و داماڵینی لە هەموو بەها جوانەکان شــتێکی نایاب و کۆمەڵگایەکی ژینگەدۆســت و مرۆڤ دۆســتی لێ دروســت بکرێ، نەک ڕۆژانە مێشــک و دەماری بتاخنی، بە وشــەی (گەندەڵی) و بمانسون لەدژی یەکتری.

# ڕاکردن لە دۆڵمە

باوکم زۆر ڕقی لە چێشــتی دۆڵمە بوو، دەیگوت: دۆڵمە چێشــتی ژنانە. ڕۆژێک دایکــم و لەعلــی باوەژنــم خەریکی پێچانەوەی دۆڵمە دەبــن. باوکم گوتبوی: کە نایخۆم، خۆ دەتوانم لەدەستی هەڵبێم و ماڵەکەی بۆ چۆڵ بکەم؟! گوندەکەمان، بە پیادە کاتژمێرێک لەشــەقامی ســەرەکی نێوان (هەولێر- کەرکوک) دوور بوو. دەکەوێتە ڕێ، دەســت لە ئۆتۆمبێل ڕادەگرێ، تا ئۆتۆمبێلێک بۆی دەوەســتێ، دەچێتە هەولێر، بۆ ماڵی خاڵم حاجی عەبدوڵڵا، کە دەگاتە ماڵی خاڵم، دەبینێ خاڵۆژنــم یــەک مەنجەڵ دۆڵمەی پێچاوەتەوە!! باوکــم لەوێش خواحافیزی دەکا. هەرچەنــدی خاڵۆژنم دەڵێ: مــەڕۆ. دەڵێ: کارم هەیە دەبێ بڕۆم. دەچێتە ماڵی جێگــر ئەفســەر (نایب زابت نــوری )کە یەکێک بــوە لە هاوڕێیــە ڕاوچیەکانی. دادەنیشــێ هێنــدەی ڕۆژ نەمــاوە، بەخێرهاتنێکــی گەرمــی دەکەن و،ســنییەک دۆڵمــەی لــە پێــش دادەنێن!! لە دڵەخــۆی دەڵێ: بێ تەقە گیــرام. بەنابە دڵی هەندێک دۆڵمەی دەخوات، بۆ شــەوەکە دەگەڕێتەوە ماڵی خاڵم.

بــۆ ڕۆژی دوایــی دەچێتە بــازاڕی هەولێر، دوکانەکانی قەیســەری. ســەرێک لە

دوکانــی ڕەفعەت بەقاڵ دەدات، ڕەفعەت بەقــاڵ چاوی بە باوکم دەکەوی، زۆری بەخێــر دەهێنــی، دەڵێ: دانیشــە. (حەســەنە لاڵ) لەگردلانکە دراوســێی ماڵی ئێمــە بــوو، لەگەڵ باوکم و مامم حوســێن برادەربوو، ڕەفعــەت بەقاڵ دوکانێکی یەکجار گەورەی هەبوو، سەڵتەوکەوێی لەبەر دەکرد، جامانەیەکی وەک هەولێریە کۆنەکان لەســەر دەبەستا،کیســە پارەیەکی پڕ (قەرەپول) خوردە، لەبەر پشتی دادەنا. باوکم دەیگوت: ســەری هارومارى لەو دوکانە بە دەســت دەکەوت. دیارە بــۆ ســۆراخکردنی بانگهێشــتی باوکمی کردبــوو، گوایە لەتۆک چانــدن هاوبەش بــوون لەگەڵ حەســەنەلاڵ. ڕەفعەت بەقاڵ دەفتەرێکی گەورە دەردێنێ، لیســتی ئەو پارانەی داویەتە حەســەن بۆ تۆک چاندن. لەپێشــەوە بڕە پارەیەک تاوەکو ببێتــە شــەریک، دوایــی پارەی تۆک کڕیــن و پارەی تراکتــۆر و کێڵان و پارەی تۆدەران و خواردن بۆ جوتکەرو تۆدەر. دیارە لە زستان حەسەن پارەی نەماوە، چــوە گوتویەتــی: دەبێ بژاری بکەیــن، ڕەفعەت دەڵێ: بە بــرام بلێم بڕۆ چەند کرێکاری دەوێ بیگرە، ئەوە پارە بتدەمێ، لەپێش تۆک ڕنینەوە حەسەن دەچێ دەڵــێ: چەنــد ڕۆژێکی تر دەســت بە دروێنــە دەکەین، بــەڵام تەنەکە ڕۆنێک بۆ ناســکەنانی ســەپانەکان، ئەوەندە شــەکرو چا، دوایی هەندێک کوتاڵی قوماشی ژنان هەڵدەگرێ بۆ تێلەکێش، واتە (ئەو ژنەی لەدوای ســەپانەکان مەلۆی تۆک کــۆ دەکاتــەوە) ئینجا پێــڵاو و گــۆرەوی و جلوبەرگی تێلەکێــش. باوکم گوتی: ئەوەی لەلای من زۆر سەیربوو، پارەیەکی خەیاڵی نوسرابوو دار دووگێ!! گوتم: ئەوە چیە؟ گوتی: کاک حەسەن هات گوتی: تۆکەکە بەری زۆری گرتوە هەموی دا هاتــوە وەک مێوی ترێ، دەبــێ داری بدەینە بەر بۆ ئەوەی تۆکەکە نەکەوێتە سەر زەوی، ئەو پارەی لەو نیوەیەی هاوبەشی تۆک سەرف کرابوو هەموو گوندی گردلانکە ئەو دەرامەتەی نەبوو!! باوکم هەڵدەستێ و دەڵێ: کە چوومەوە بەکاک حەســەن دەڵێم: حیســابی هاوبەشــیەکەت بۆ بێنێ، بەڵام هەتا مرد هەر چاوی لە ڕێ بوو. مامم حوســێن پارەیەکی زۆری دابوە حەســەنە لال، چەند ســاڵ بوو نەیدەدایەوە، کە عومەری کوڕی بوو بە سەرۆک جاش، مامم هەر بەتەواوی وازی لێ هێنا، حەســەن ئەویشــی کردە حوشترۆکە. بەو حالەشەوە باوکم و مامم هەر خۆشیان دەویست.

# خوێن له دارەبازەکەی دەتکایەوە

ماوەیەک بوو چوبوومە ماڵی مامم بۆ یارمەتی دانیان، بۆ بێستان کردن، وەک تەماتەو خەیار، ئەو گوندەی ماڵی مامم تێیدا دەژیان، بەگشتی خەریکی جوتیاری و خەرمان و مەڕداری بوون، پێکهاتبوو لە هەشتا بۆ نەوەت ماڵێک. هەتاوەکو پارتی و شیوعی ناکۆک نەبوون، پەیوەندی کۆمەڵایەتیان زۆرباش بوو، لە زستاندا لە دوای نان خواردنی بەیانی کۆ دەبوونەوە. داخی بەجەرگم شەهید کەریمی برام، زۆر بە دڵسۆزی و ئازایانە بەم تەمەنە بچوکەیەوە، کۆمەکی کردم و یارمەتی دام، زۆری شەونخونی لەگەڵ چێشتم.

لە ڕۆژێکی هاوینی (١٩٧٢) دەنگۆیەک بڵاو بوەوە، کچێکی تەمەن پازدە ساڵان، لەگەڵ کوڕێکی حەڤدە ساڵان، ڕاوەستاوە و قسەیان کردوە. لەوکاتەدا مەودای نێوانیان نزیکەی دوو مەتر بوە، ئامۆزای کچەکە بینی بوی، کچەکە ڕای کردبوو بۆ ماڵەوە. هەر ئەوەندەی خۆش بوو تا ئەو قسەیە کەوتە ناو خەڵکی گوندەکەیان. ڕۆژی واهەبوو ژنێک نیوەی گوندی بەسەر دەکردەوە بۆ ئەوەی ئەو هەواڵەیان پێ ڕابگەیەنێ!! جاری واهەبوو زۆر ماڵی دووبارە دەکردەوە، نەوەکو باش حاڵی نەکردبن. لەبیرمە ژنێک کە زۆر قسەی لەنێوان خەڵک دەهێنا و دەبرد، ڕوی لەماڵی مامم کرد، پێش ئەوەی سڵاو بکات مامم بۆ ئەوەی تەریقی بکاتەوە، گوتی: لەدوێنێوە زانیومانە بزانە کێ ماوە نەیزانی بێت برۆ پێیان بڵێ!! ئەو ژنە هەموو جارێ دەیگوت: من لەبن باڵی خودام کەس لەزارم نایزانێ، بەڵام دەڵێن: لەژوورەوە بوونەو بەیەکەوە، ئاخری زەمانە..!! ئێمە چاک دەمانزانی درۆ دەکات. هەرچەندی مامم دەیویست، ئەو قسەیە تەشەنە نەکات و نەبێتە هۆی کوشتنی ئەو کچە بێ تاوانە، کە هەموو گوناهەکەی ئەوەبوو، لەگەڵ ئەو کوڕە قسەی کردبوو. بەڵام ئەوکاتە ڕاوەستان لەنێوان ئەو دوو ڕەگەزە یاساغ بوو، قسەکردن لەنێوان کوڕوکچ باجەکەی کوشتن بوو.

کچەکە، براێێکی خوێندکاری هەبوو لە ئامادەیی دەیخوێند، دەمانچەیان لێ

شـــاردبوەوە . کچەکەیان لە ئامۆزایەکـــی خۆی مارەکرد، کەوا تەمەنی وەک خۆی بوو. بەڵام قسە و قسەڵۆکی ناو گوند و کولتوری سەقەتی نێر سالاری (سەنەگەی) لەســەر ئەو کچە و خانەوادەکەیان هەڵنەگرت. بەداخەوە ئێمە ئێستاشـــی لەگەڵ دابێ، دەبێ لەو کۆمەڵگایە بۆ خەڵکی دەوروبەرمان بژین. هەروەک باســم کرد، هاوین بوو لەســـەربان دەخەوتین، ئەو بانەی ئەو کچەی لەسەر دەخەوت، لەتەک بانـــی ماڵـــی مامم بـــوو. برای کچەکـــە دەمانچەکەی لەماڵـــەوە دۆزیبوەوە، خۆی ئامادەکردبوو خوشـــکەکەی بکوژێ. کچەکەش دەیزانی دەیکوژن، منداڵێکی ســـێ ســـالانی ماڵـــی مامی لەگەڵ خۆی دەخەوانـــد، لەئامێزی دەنا، بـــۆ ئەوەی لەبەر ئەو منداڵە نەیکوژن. بەڵام کاتێک کە براکەی بەســـەربان کەوتبوو خوشـــکەکەی لەخەوی شیریندا بوو، منداڵەکەی لەئامێزی دەرهێناو، دوری خستبوەوە، کاتژمێر دوازدەی شەو گوێمان لە شریقەی چەند گوللەیەک بوو. مامم لەسەر جێگای خۆی جگەرەیەکی داگیرســـاند و گوتی: بە کوشتنیان دا، بەقسەو قسەڵۆکی ناو گوند. بەیانی گۆڕمان لێدا، چوین دارەبازەی تەرمەکەمان هەڵگرت بۆ ســـەر گۆڕســـتان. ئـــەو دیمەنـــە لە میمۆری مێشـــکمدا هەرگیز ناســـڕێتەوە، خوێـــن لەدارەبازەکەی دەتکایەوە ســـەر شانمان. ماڵی ئەو کوڕەی کە لەگەڵ کچەکە وەستابوو، لەگوند باریـــان کـــرد، کوڕەکـــە ڕایکرد، بـــوو بە پێشـــمەرگەی پارتی. پاشـــی ماوەیەک، شـــێخێک لەهەولێـــر دوو خوشـــکی ئەو کـــوڕەی هێنا بۆ ماڵی کچـــە کوژراوەکە!! ئەوکات لە کۆمەڵگا، نەدەبوو فەرمایشـــتی شـــێخ ڕەت بکرێتەوە، شـــێخ فەرموی ئـــەوە دوو کچم هێناوە، خوشـــکی ئـــەو کوڕەن، لەکێیان مـــارە دەکەن، مارەیان بکـــەن!! ئـــەو دوو کچە بێ ئەوەی بزانن هاوســـەری داهاتویان کێیە، وەک مەڕی بـــەر چەقۆ، لە چاوەڕوانـــی دا بوون، خودایە دەبێ کێ ئامادەیی ئەوەی تێدا بێ مارەیان بکات؟!! بەو شێوەیە هەریەکەیان لە کوڕیک مارە کرد. چوار قوربانیان، بۆ ســـەر قوربانی یەکەم زیاد کرد.

خوێنەری بەڕێز: مەبەســـتم لەنوسینی ئەم چیرۆکە بە ئازارو بەسۆیە، بۆ ئەوەیە کـــە نەوەکانـــی دوای ئێمـــە، ئەو هەڵانەی ئێمـــە دووبارە نەکەنـــەوە، وەک وانەو ئامـــۆژگاری وەربیگـــرن، لەبەر ڕێزو حورمەتی بنەماڵەکان ناوەکانم نە نوســـیوە، چونکـــە زۆرم خـــۆش دەوێـــن و نامـــەوێ برینیـــان بکولێنمەوە، کـــە بەخۆم پێی کولاومەتەوە.

# بڕۆن لەیەکێتی سۆڤیەت زەوی وەربگرن

ململانێی نێوان پارتی و شیوعی بە تین و تەوژم بوو، پارتی کاربەدەستی ناوچەکە بوو، کە زەوی دابەش دەکرا، ئێمە و ماڵی مامەکانم، زەویمان بەسەردا دابەش نەکرا. لەهەموو گوندەکان ئەو خێزانانەی کە خەڵکی ڕۆشنبیرو ئازاو چاونەترس بوون، شیوعی بوون. یەکێک زیرەک بوایە دەیان گوت: شیوعییە. ساڵی١٩٧٠ ئەوکات تەمەنم نەگەیشتبوە هەژدە ساڵ، بەڵام زۆر کاروباری حیزبی شیوعیان پێ دەکردم، چونکە باوکم بەرپرسی ڕێکخستنی گوندەکە بوو. لەیادمە کادیری ئەوکات ناوی مەلا مەحەمەد بوو، مامۆستا بوو، ناوی حیزبی مەلا ئازاد بوو. (ئێستا لە ئیسرائیل نیشتەجێیە، باوکی شەهید (چەتۆ سەحەر) کەلەتەقینەوەکەی هەولێر شەهید بوو لە مەڵبەندی سێ.) مەلا ئازاد ژنە گەورەکەی ئامۆزای خۆی بوو، کە هاتە ناوچەکەی ئێمە ژنێکی تریشی هێنا، کردی بە دوو ژن. لەکاتێکدا لەحیزب دوو ژن قەدەغە بوو، مەلا ئازاد منی هێنایە ڕیزی ڕێکخستنی حیزبی شیوعی. گوتی: تەمەنت لەگەڵ پەیڕەوی ناوخۆی حیزب ناگونجێ، تەمەنت بچوکە، بەلام چونکە کاری زۆرمان بۆ دەکەی، با ماندووبوونت بەلاش نەچێ. بووم بە پاڵێوراو، بۆ ئەندامی حیزبی شیوعی. ئەوکاتە کەرەستەیەکی خاو بووم، فێریان کردم پاک و خاوێن بم، ڕاستگۆ بم، ژینگە دۆست بم، ڕێز لەکات بگرم، دەست پاک بم، چاونەترسبم لەسەر مافەکانم، نیشتمان پەروەربم، یەکسانی لەنێوان نەتەوە و هۆزو ئایینەکان بپارێزم، هەمیشە دژی سیخوڕ و جاشی هەر چوار پارچە بم، دژی هەلپەرست و خۆرەپێشکەر و ئینتهازی بوەستم و بەدوژمنی بابەکوشتەی خۆمیان بزانم. دژی کونەپەرستی و خورافیات و پلەبەندی مرۆڤەکان بم. خەڵک وشیار بکەمەوە بە مافەکانیان، دژ بە گەندەڵی و بێ ئیرادە کردن و بە کۆیلە کردن خەبات بکەم، بۆ ئەوەی ببمە شیوعیەکی ڕاستەقینە، واتە (تەواو و تایبەت).

ـە ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ بەیانێکی مێژویی لەلایەن حکومەتی ئێراق دەرچوو، ـانی بە بەشێک لەمافەکانی کورد نا، چەند وەزیرێک و پارێزگارو بەڕێوەبەری

پۆلیس لەپارتــی دانران، بە نمونە: بەڕێوەبەری پۆلیســی هەولێر (شــێخ ڕەزا) و پارێــزگار (عبدالوهــاب ئەتروشــی) بوو. پێشــمەرگە هاتنەوە ناو شــارەکان، ئــەوەی ژنــی نەبوو ژنی هێنا، ئــەوەی یەک ژنی هەبوو کردی بــەدوان، بەبیرمە دەهۆڵ و زوڕنا لە زۆربەی گوندەکان دەکوترا. شــایی و ڕەشــبەڵەک و تفەنگانێ دەکرا، دەنگ و باس هەر ئەوە بوو بلێن: فلان سەرپەل، یان سەرلق، یان ئامیر بەتالیۆن، ژنێکی تر دێنێ!! بەم شــێوەیە یەکەم نەورۆزی ئەو ســاڵە لە گوندی دارەتــوو کرا. هەوادارانی حیزبی شــیوعی و پارتی کەوتنە لێدانی یەکتر، هەموو ســەرو گوێلاکی یەکتریان شــکاند. لەوە بەدوا نەورۆز بەیەکەوە نەدەکرا. حیزبی شــیوعی بەجیــاو پارتی بەجیا. ئــەوکات چەندین جار لەگــەڵ هەوادارانی پارتی لەیەکترمان دەدا، لەســەر شــیعری (قەلب ی من گەر چەشنی لالە بێت و نەوتی تێبکەن) کە مامۆســتا تایەر تۆفیق، بە مەقام دەیچڕێت.

برادەرانی پارتی کە گوێیان لەو شیعرە دەبوو، زۆر پێی ناڕەحەت دەبوون دەیان گوت: ئەوە شــیعری شیوعیەکانە. (شیعری سامی عەودالٚ)ی خوالێخۆش بوو.

ئێمەو گشــت خانەوادە شــیوعیەکان بەبێ زەویماینەوە، پارتیەکان بە شــۆخی پێیان دەگوتین: ئێوە بڕۆن لەیەکێتی ســۆڤیەت زەوی وەربگرن..!!

## دوای بەیانی ١١ی ئازار

لــەدوای بەیانــی ١١ی ئــازاری ســاڵی ١٩٧٠، لــە زۆر بۆنە و ئاهەنگــی پارتی، پێــش ئەوکاتــە گوێمان لێ دەبوو هاواریان دەکرد: (بژی بابی لوقمانی، شــەش خەریتەی لە شــانی) مەبەســتیان مەلا مستەفا بوو. بەڵام لەناکاو ئەو وتەیان لێ قەدەغەکرا، کەس نەیدەزانی لەبەر چ هۆکارێک، بەڵام کادیری پارتی بە خەڵکی خۆیان گوتبوو: چی تر باســی لوقمانی مەکەن. بێ ئەوەی هۆکارەکەی بەخەڵک بڵێن، خەڵک وەک ئێستا نەبوو

بەهــۆی پێشــکەوتنی ئامێرەکانی پەیوەندی کــردن، دنیا بۆتە گوندێکی بچوک. خەڵکەکــەش وردە وردە نــاوی لوقمانیــان فەرامــۆش کرد. دیــارە پێیان وابوو، (حەتمــەن زیانێکــی بۆ پەزی هەیە) بۆیە کادیری پارتــی دەڵێ: ناوی مەهێنن.

ئەو پرســیارەمان لە کادیری حیزبی شیوعی مەلا ئازاد کرد، گوتی:
ئەوە کێشــەی ناومالّی بارزانییە، مەلا مســتەفا ســێ هاوســەری هەیە، دویان بارزانیــن، یەکێکیــان دایکــی لوقمــان و ســابیر و عبێداللەیــە و، یەکیان دایکی ئیدریس و ئەوەی تر، دایکی مەسـعود و سـیداد و دڵشاد و نیهاد و وەجیهە ئەو بەرێزانەیە، کە زێبارییە.
دیارە عبێدالله و شـێخ عوسمان پاڵیان داوەتە حکومەتی بەغدا، بۆیە نایانەوێ ناویان بێنن. نەوشـیروان مستەفا لە کتێبی پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، لاپەرە (١٠٦) بەدرێژی باسی ئەوبابەتەی کردوە.

# رەنگدانەوەی شەڕی سارد

رۆژێکیان لەگوندەکەی ئێمە کەرە مستانێ ( کلاّوێن) دەکرا، شیوعیەکان لەلایەک، پارتیــەکان لەلایەکــی تر. باوکم و پیــرداودی مام مەولود و چەند کەســێکی تر لەلایەک بوون، چەند کەسـێکی تر لە پارتی بەرامبەربەوان یاریان دەکرد.
یــەک لە پارتیەکان گوتی: ئەو کلاّوە تێیدایە.
پیرداود گوتی: تێیدا نییە.
پارتیەکە گوتی: بەخاکی کوردســتان تێیدایە.
پیــرداود گوتی: بەخاکی کوردو عەرەب تێیدا نییە.
پارتیەکــە گوتی: بەرێبازی پارتی تێیدایە.
پیــرداود گوتی: بە مەبدەئم تێیدا نییە.
پارتیەکە گوتی: بەســەری مەلا مستەفای تێیدایە.
پیرداود گوتی: بەســەری خرۆشۆف تێیدا نییە.
پیرداود پێلاّوێکی لەدواوەی خۆی هەڵگرت لەپارتیەکەی دا، بوو بەشــەڕە پێلاّو. یاریەکە کۆتایی هات.
لەگوندی گردەڕەشە دوو پیرەمێرد بەشەڕهاتبوون، لەسەر ئەو مانگە دەستکردانەی شــەوان بە حاڵ دەتروسکێنەوە، لەناو ئەستێرەکان.
پارتیەکە گوتبوی: ئەوە ئەمریکیە.

شیوعیەکە گوتبوی: ڕووسیە.

بەشەڕهاتبوون. شەڕی ساردی بلۆکی سۆسیالیستی و ئیمپریالیزمی جیهانی،گەیشتبوە گوندی گردەڕەشە!! پارتیەکان ئەمریکی و شیوعیەکان هەتا سەر ئێسقان ڕووسی.

ململانێی پارتی و شیوعی لەهەموو شتێک ڕەنگی دابوەوە، شیوعیەکان تەنها لەگەڵ یەکتر ژن و ژنخوازیان دەکرد. پارتیەکانیش بەهەمان شێوە، لەکاتێکدا هەردووکیان بە (دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان)ڕازی بوون.

لەو کاتەدا پارتی دیموکراتی کوردستان هەموو چالاکیەکانی تەنها دژایەتی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی بوو. لەململانێی ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٧١ ـ ١٩٧٢ حیزبی بەعس کەوتە ڕاوە دوونانی شیوعیەکان، بەسەرپەرشتی (نازم گزار). کە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو، (لە دواییدا سەدام کوشتی). کۆشکی کۆتایی (قصر النهایە) ببوە شوێنی ئەشکەنجەو لەناوبردنی شیوعیەکان. لەو ڕۆژگارانەدا، کە وەرزی هاوینی ساڵی ١٩٧٢ بوو، شێخ عەلی بەرزنجی و زۆر لە هاوڕێیان، لەژێر ئەشکەنجە گیانیان بەخت کرد.

ڕژێمی بەعس وردە، وردە بەناوی، یەکسانی (ئیشتراکیەت) خۆی لە یەکێتی سۆڤیەت نزیک کردەوە، ڕێکەوتنێکی لەگەڵ سۆڤیەت مۆرکرد، بۆ ماوەی پازدە ساڵ (الصداقە والتعاون). خاڵەکان بریتی بوو لە: نەوتی ڕومێلە و کڕینی چەک و پرۆژەی پترۆ کیمیاوی و فۆسفات و ، دروستکردنی بەنداوی سەرسار و، زۆر ڕێکەوتنی ئابوری تر. ئەوکات هێشتا خوێنی هاوڕێیانی کۆشکی کۆتایی (قصر النهایە) وشک نەبوبوەوە.

حیزبی شیوعی پشتگیری ئەو ڕێکەوتنەی کرد. بەوەش نەوەستان، یەکێتی سۆڤیەت وردە، وردە پاڵەپەستۆی خستە سەر حیزبی شیوعی عێراق، بۆ نزیک بوونەوە لە ڕژێمی بەعس، بەناوی یەکسانی (ئیشتراکیەت) کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی بەعس. ڕژێمی بەعس هەموو خاڵەکانی خۆی بەسەر حیزبی شیوعیدا سەپاند، وەک: پارتی سەرۆک (حیزب القائد). واز هێنان لە ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی جیهان کە حیزبی شیوعی نوێنەری تێداهەبوو. نوێنەری بەعسی جێگای گرتەوە. هەر کەسێ شیوعی بێ لەریزەکانی سوپا و پۆلیس لەسێدارە بدرێ، شایانی باسە ئەوکاتە دەیانگوت: بچیە سەربازی، نابێ لەریزەکانی حیزب

بمێنـــی!! ســـەربازیمان بـــۆ چەند مانگێک دواخرا. هاوڕێ شـــەهید عادل ســـەلیم زۆر جـــار دەیگـــوت: ئەگەر بڕۆیە ســـەربازی، بەهیچ شـــێوەیەک نابێ پەیوەندیت بەهاوڕێیانەوە هەبێ، چونکە مەترسی دەکەوێتە سەر ژیانت. ئەوەی ڕاستی بێ، دوایی زانیمان تەنها هاوڕێ مەلا حەســـەن دژی نزیک بوونەوەو درووســـت کردنی بەرە بوو لەگەڵ بەعس. لەلایەکی تر پارتی ژیانی لە شـــیوعیەکانی کوردســـتان هەراســـان کردبـــوو، کەوتبـــوە ڕاوە دونانیان و گرتن و تۆمەت بۆ داتاشـــین. لەو کاتەدا خانوی ماڵی شـــێمەی هاروون لەســـەرگردی مەلا ئۆمەر، کرابوو بە زیندان بـــۆ شـــیوعیەکان. ماڵی شـــێمە، چونکە ســـەرۆک جـــاش بـــوون، چووبوونە ژێر دەســـەڵاتی حکومـــەت، خانوەکەیـــان چۆڵ بوو، لـــەو زیندانە ســـەگیان لەخەڵک بـــەردەدا بەناوبانـــگ بوون، ناوی (ج، جەلاد)و( س، مەســـیفی)م لەیاد ماوە بۆ ئەشـــکەنجەی شـــوعیەکان. حکومەتی بەعس و حیزبی شیوعی لەگفتوگۆدابوون، بەڵام بەرە واژۆ نەکرابوو.

لەوســـەروبەندە دا (یـــازدە) خوێندکاری شـــیوعی کە لەخوێندنی بـــاڵا لەیەکێتی ســـۆڤیەت گەڕابوونـــەوە، لەڕێگای ســـوریا بۆ زاخۆ. کشـــتیان گوللەبـــاران کران لەلایەن (عیســـا ســـوار)ەوە کە بەر پرســـێکی پارتی بوو. تەنها لەداخی ئەوەی ژنە ڕووســـیەکەی لەلای دانەنیشـــت، کەژنی دوەمی هێنا بوو، ژنە ڕووســـیەکەی گەڕابوەوە ســـۆڤیەت، داخی ئەو ژنە ڕووســـیەی بەو گەنجانە ڕشـــت. ئێســـتاش گۆڕیان دیار نییە، هەروەک گۆڕی ســـەعید ئێلچی و دکتۆر شـــڤان. لەدوای ساڵی ١٩٧٥ عیســـا سوار بەدەستی پاسەوانێکی خۆی کوژرا.

کادیرانی پارتی شـــەو ڕۆژ بەدوامانەوە بوون، چۆن شتێکمان بۆ دروست بکەن، بمانگرن، ئەشـــکەنجەمان بدەن، بێ ئەوەی گوناهێکمان کردبێت. ئەوەی ڕاســـتی بـــێ ئێمـــە شـــیوعیایەتی و (ئومەمیەتێکی) دەرویشـــانەمان دەکرد. بـــۆ نمونە: تراکتۆری بەلەڕووس، خراپترین تراکتۆر بوو، ئێمە بەزۆری بە مامم حوسێن مان کڕی، دەمانگوت: لەفەرگەســـۆن چاکترە چونکە ڕووسیە!!

# کۆشکی کۆتایی (القصر النهایە)

یــەک لە ڕۆژەکانی هاوینی ســاڵی ١٩٧٢، باوکم هاتەوەماڵەوە، ڕیشــی تاشــی و جلی گۆڕی. کەیفی ســازبوو، هەواڵێکی دڵخۆشــکەری پێبوو، گوتی: ئەحمەد خــۆت ئامــادە بکە، تــۆش لەگەڵ خۆم دەبەم بــۆ مورتکە، عبدالقــادری حاجی عەبۆی بەربوە، لە قەســابخانەی کۆشــکی کۆتایی (قەســری نیهایە) کە شوێنی کەوڵکــردن و پاکتاوی شــیوعیەکان بوو، نــاوی خۆی بەخۆیەوە بوو. مام حاجی عەبۆ (دوازدە) ســەر مەڕی، بۆ پێشــوازی لە خۆشــی بەربوونی کاک عبدالقادر ســەر بڕی بوو. عبدالقادر، بۆ باوکمی گێرایەوە: ڕۆژێک لەگەڵ مامزی خوشــکی مەلا خدر، دەچن بۆ کەرکوک، بۆ هەندێک کاری پێویست و گواستنەوەی چەک، بــەڵام جــاری دوایی بــە تەنها دەچــن بۆ ئەو شــوێنەی کە لــە ڕەحیماوە بۆی دیــاری کــراوە. ئەو کارەی بریتــی بوو لە بارکردنی (دوو سەد)کلاشــینکۆف بۆ بەغدا، بۆ شۆڕشکردن و ڕوخانی ڕژێمی بەعس، بەسەرۆکایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر و ســەدام حوســێن. ئەو چاپەخانەی بۆی دیاریکراوە لە ڕەحیماوە، کەسی دیاریکراو دەبینن، ســەیارەکەی دەداتێ، کە چەکەکان بار دەکەن، شــێخ عەلی بەرزنجــی سەرپەرشــتیاری ئەو کردەیــە بوە (ئەندامی لێژنــەی مەرکەزی بوو). چەند ئۆتۆمبێلێکی بەعســیەکان دەوریان دەگرن، شێخ عەلی و ئەحمەد ڕەجەب هەر لەوێ دەســگیردەکەن، عبدالقادر و برادەرەکەی تریشی بەهەمان شێوە. بەو ئۆتۆمبێلــە پڕ لە چەکەوە بۆ بەغدا بۆ (قەســری نیهایــە) دەبردرێن. عبدالقادر، گوتی: شــێخ عەلی پێی گوتم: بڵێ نایناســم، هاتووم ماڵی بۆ بار بکەم، چووم نان بخۆم تا هاتمەوە ماڵ بارکراوبوو. نەمزانیوە لە ژێرەوە چەکی تێدایە، ئەگەر وا بڵێــی تــۆ زیندوو دەمێنیتەوە، بــەڵام من هەر دەکوژن. تا لەژێر ئەشــکەنجە شــەهید بــوو تەنانەت دانپێدانانی لەســەر ناوی خۆشــی نەکرد. گوتــی: ئەوانە کەســیان ناناسم. پاشــان یەک لە ئەندامانی لێژنەی مەحەلی کەرکوک ناسراو بە (هەژار) بەرەو ڕوی شێخ عەلی دەکەن، دەڵێ: ئەوە شێخ عەلیە ئەندامی لێژنەی مەرکەزیە. پاشان ئەو خائینە خۆ فرۆشە پۆستی باڵای لەلایەن بەعسەوە پێدرا.

## حیزبەکان نایەڵن کاڵ بێتەوە

لەهەمــوو گوندەکانــی دەشــتی هەولێــر، لە کاتــی گەرمای هاویــن، خەڵک یان لەســەربان، یاخود لەســەر سەکۆ، (لەحەوشە دروســت دەکرا)، دەخەوتن. ئێمە لەســەربان دەخەوتین، لەیادمە لەناکاو یەدەگێک فیشەکی دەمانچە، دەتەقێندرا. گــورج ڕادیۆمــان دەکردەوە، باوکــم دەیگوت: بزانن کاوێس ئاغــا گۆرانی دەڵێ، یان برایانی زیزی، یاخود حەســەن زیرەکە!! ئەوە عومەی پلکە هەمینێیە لەگەڵ گۆرانی جەزم بوە، یان کوڕە جحێڵێکی تری ئاوایییە!! لەناکاو لەســەربانێکی تر بەتەقــە وەڵام دەدرایــەوە، کەم وابوو لەگەڵ لاوکی کاوێس ئاغا تەقەی خۆشــی نەکرێ!!

تەقــەی خۆشــی لەکوردســتان ڕەگ و ڕیشــەی لەمێژینــەی هەیــە، حیزبەکانی کوردســتان نەیان هێڵاوە ئەو کولتورە سەقەتە کاڵ بێتەوە.

## پیاو نین، شیوعین!!

ڕووداوەکان وای لێهات مامم (یاسین)دەستگیرکرا. منیش دەترسام بمگرن، لەگەڵ (نۆ)هاوڕێی تر هەڵاتین بۆ ســەروچاوەی بیتوێن، بەچەند شــەو و ڕۆژ ڕۆیشــتن ئینجاگەیشــتینە بارەگای حیزبی شــیوعی کە (ملازم ئەحمەد جبوری) لەوێ بو. لەیادمە، ڕۆژێک بەفر زۆر باری بوو، من و هاوڕێیەکی تر، بەناوی (نەجم مستەفا) یــان بانــگ کرد، کە بچین بۆ گونــدی ئانگۆز، بۆ کارێکــی حیزبی. بەڵام هاوڕێ جەعفــەرەڕەش، یادی بەخێربێت، پێیگوتین: مێگەلە مەڕی خوالێخۆشــبوو عەلی شــەعبان (ئامیر بەتالیۆنی پارتی بوو) لەســەر ڕێگاتانە، ئەگەر سەگەکان بۆتان هاتــن لێیــان مەدەن، باکێشــە لەبەینی ئەو دوو حیزبە دروســت نەبێت. ئەوکات من گوتم: باشە ئەگەر سەگەکانی کاک عەلی شەعبان بۆمان هاتن، درێژ دەبین. دەڵێیــن: فەرموون بمانخــۆن، چونکە بڕیاری حیزبی شــیوعی عێراقیە کە لێتان نەدەیــن!! بــوو بە پێکەنیــن. دەمێکە تێکچوونــی پەیوەندی نێــوان حیزبەکانی

باشــوری کوردستان خولامی یەک شەڕە ســەگە، یان ڕوخانی دیواری دوکانێک، یان گواســتنەوەی یەک هەنگاو تخوب و ....هتد.
ســەروچاوە زۆر خــۆش بــوو، دوو چاخانــەی لێبــوو، گۆرانی حەســەن زیرەک، چریکەی دەهات. دیســپلینی حیزب ئەوەندە بەهێز بوو، بۆمان نەبوو هیچ شــتێ بکەین کە لەگەڵ دابونەریتی ناوچەکە نەگونجێ، یاخود بە پێچەوانەی کولتوری ناوچەکە بێ.
لــەم نێوانــەدا هادی مام پیــرداود، لەزیندانی مەلا ئۆمەر کــە لەژێرخانوی ماڵی شــێمەی هاڕوون بــوو، هەڵات. پارتی ســەگیان تێبەردابوو، هێشــتا بەعس ئەو شــێوازە ئەشــکەنجەدانەی تاقی نەکردبوەوە، کە گەیشتە سەروچاوە پێی ئاوسا بــوو، پاش مانگێک ئینجا چاک بوەوە.
لەســەر دیسپلینی هاوڕێیانە بەســەرهاتێکی ڕاستەقینە دەگێرمەوە: ڕۆژێک چەند ئافرەتێک لەسەر ئاو خۆیان دەشۆن، ڕووت و قوت دەبن. چەند هاوڕێیەک بەوێدا تێدەپــەڕن، ژنێک دەڵێ: خۆتان داپۆشــن، پیاو هاتــن. یەکێکیان دەڵێ: نا..نا، خۆتان دامەپۆشــن پیاو نین، شیوعین، سەیرمان ناکەن !!

## شینی من بۆ حوسێن نەبوو

لــە ســاڵی ١٩٧٣ گەڕامەوە گوندەکەمان، پەیوەنــدی حیزبیم نەما، لەبەر ئەوەی بووم بە سەرباز. لەهەولێر ئێمەیان برد بۆ سەربازگەی هەولێر، بە تەپڵ و زورنا ماوەیەکــی زۆر دەورەی ســەربازیمان کرد. پاشــان ڕۆژێک ناویــان خوێندینەوە، بە شــەمەندەفەر گواســترابنەوە بۆ کەرکوک. لەوێشــەوە بۆ بەغدا. نەماندەزانی بۆ کوێمان دەبەن!! لەبەغداوە بەرەو بەســرە. ئەمە هەر بەقســە خۆشە، چونکە نــە ئــاو هەبوو، نە نان. لەســەر حســابی خۆمان نــان و پێویســتیمان دەکڕی. بەدرێژایــی ڕێــگا قادر زیــرەک گۆرانی بۆ دەگوتین. لەبەسـره لێکیــان دابڕین، وەکــو مــەڕ بر، بڕیــان کردین، گوتیان: ئێوە بۆ ســەیحان دەچــن، نەماندەزانی ســەیحان کوێیە!! (دوازدە) ســەربازی کوردبوین، هەر کە دەیانگوت: (هەدۆلە ئەکراد) بەچاوێکی زۆر سوک سەیریان دەکردین. سواری کۆنە زیلێکی سەربازیان

کردین. لێخوڕە بەناو ئەو هەموو لم و تۆزەی خوار بەسـرە . گەیشـتینە سەیحان، شـەو درەنگ بـوو، هەر (دوازدە)مان پشـتی یەکترمان گرتبوو، ئەو شـوێنە بۆ ئێمە زۆر نامۆ بوو، هەموی دارخورما بوو. سـەربازگەکە لەقوڕ دروسـت کرابوو، سـەری بە دار خورما گیرابوو، زمانی عەرەبیمان نەدەزانی. زۆرمان برسـی بوو، فرۆشـگا (حانـوت) نەمابوو. هەرچی دەهات سـەیرێکی دەکردین، دەتگوت مەڕ دەکرێ!! کابرایەکی کەڵەگەتی چاوشـین هات، بەکوردی قسـەی لەگەڵ کردین، خزمەتگوزار (کەنـاس)ی مەعەسـکەر بوو. خەڵکـی دووزخورماتوو بوو، بە ناوی مـام جەمیل،گوتی: برسـیتانە؟ هەمـوو پێکەوە گوتمان: بەڵـێ زۆریش. کەونە سـەمونی سـەربازگەکەی کـۆ دەکردەوە بۆ فرۆشـتن بەخەڵکی گونـدەکان، بۆ گامێش و مانگا. نیو فەردەی لەوە هێنا، چوو بۆ چێشـتخانە، تەشـتێکی ئاوی پاقلە و پاقلە مابوەوە، سـەمونەکەی تێکوشـی. بەڕاسـتی بە لەزەت بوو، لەناو تەنەکەیـەک چای بۆ لێناین، ئۆخەی ئەو جارەش تێرمان خوارد.

بەیانـی ڕیزیان کردیـن، ئەوەندەیان غار، غارێن پێکردیـن، لەگەڵ ئارەقە کردن ڕەش هەڵگەرابویـن، بۆ ماوەی یەک هەفتە زۆر ماندویان کردین. پاشـان لەگەڵ سـەربازەکانی تر، تێکەڵاوکراین. هەر دوازدەمان داوامان دەکرد، خانوێک بەقوڕ بـۆ خۆمان دروسـت بکەین. نوسـتنمان پێکـەوە بوو، تا خانوەکەمان دروسـت کرد. پاشـان لێمان پەشیمان بوونەوە، دابەشـیان کردین. ئەوکات هێشتا شینی حەسـەن و حوسـێن قەدەغە نەکرابوو، ڕۆژانە پاش ڕاهێنانی سەربازی بڵاوەمان دەکرد، بۆ ماوەی یەک کاتژمێر. پاشـان سـەربازیان بـۆ کار دەردەهێنا، پێیان دەگوتـن (جندی شـغل)، کارەکە قوڕکاری بوو، قـەت کار تەواو نەدەبوو، زیاتر لەکرێکار دەچوین نەک سەرباز.

ڕۆژێک سـەربازەکانی شـینی حەسەن و حوسێن جیابوونەوە، پێیان گوتن: بڕۆن بـۆ خۆتان لەشـوێنێک شـین بکەن، ئـازادن. ئەوانـی تریش هەمـوی بۆ کاری قوڕکاری. منیش لەگەڵ سەربازە شیعەکان جیابوومەوە، گوتم: هەر نەبێ ئەمڕۆ قـوڕکاری ناکـەم. لەخۆیـان دەدا ئەمان لەخۆدان، نەفەرێـک خەریکی چا لێنان بوو، چایەکی ترشـیان لێ دەنا، پێیان دەگوت: (چای حامز) بە لیمۆی بەسـرە چایەکەیان دێم دەکرد. جۆرە چایەکی زۆر خۆش بوو، دیاربوو ئەو چایە تایبەت بوو بە ڕۆژەکانی عاشـورا. دەیانگوت: عەباس چوو بۆ مەیدانی شـەڕ، شمشێری

دەرهێنــا. غەزەبی لــە (حەفتا هەزار) کەس گــرت. هەرچەندی بەراوردم دەکرد بــاوەڕم نەدەکرد. باشــە نەفەرێک تیشــکی لێزەریش بێ، چەکــی کیمیایش بێ، چۆن دەتوانێ غەزەب لە حەفتا هەزار کەس بگرێت؟!! بەڵام لەترســی قوڕکاری هەر بۆم دەگێڕانەوە وەکو گۆرانی ســاوەر کوتانەوە.
ئــەوەی لەهەمویان زیاتر ســینگی خۆی بریندار بکردبایە، زیاتر دڵســۆزی ئیمام حوســێن و حەســەن بوو. ســەربازی وا هەبوو، شــلپەی خوێنی دەهات. ئەوەی وای لەخــۆی دەکرد، بەتەمای پاداشــتی زیاتر بوو لــەدوای مردنی وەرگرێتەوە.
لەناکاو (نائب زابت ســابیر) پەیدابوو، سەیرێکی ناو کۆڕی شینگێڕانی کرد. لای چایچیەکە چاوی بە من کەوت، یەکسەر بانگی کرد: ئەحمەد عەلی تاهیر، تەعال. چوومە پێشــەوە، ســڵاوێکی ســەربازی زۆر چاکم بۆکرد. بەتوندی لێی پرســیم، گوتی: ئەوانە شــیعەن، بۆ حەســەن و حوسێن شــین دەگێڕن، لەخۆیان دەدەن، پێم نالێی تۆی ســونەو کورد چی دەکەی؟!! لەوچرکەســاتە زۆر ترســام تەمبێم بکات، ئەوکات ســەرباز تەمبێکردن سەرســفر کردن بوو. بەڕاســتی قەبیحاتێکی گەورەبوو، نەمدەزانی چیبڵێم، ڕاســتیم پێ باشــتر بوو، گوتم: سەیدی (انا التم علــی چــای حامز) واتە: من بۆ چای ترش لەخــۆم دەدەم. لەکاتێکدا چاوەڕوانی ئەوەبووم ئاگر لەبناگوێم هەڵســێ، بەپێچەوانەوە دەســتیکرد بە پێکەنین و لێی دووبــارە کردمــەوە، خەریک بوو ببورێتــەوە هێندە پێکەنی. پــاش نیو کاتژمێر لەژووری بەرپرســی گشــتی (ئامر) داوایــان کردم، کە چوومــە ژوورەوە، هەموو ئەفســەرو دەرەجەدارەکان دانیشتبوون. یەک سڵاوی سەربازیم کرد، گوتم: بەڵێ گەورەم.
پرســی: ئەو شــینەی بۆ حەسەن و حوسێنت کرد چۆن بوو بیگێڕەوە؟
منیش پێم گوت: گەورەم ئێمە زۆر ماندوو دەکرێین بەو قوڕکاریە، من لەترســی کارکردن چوومە لای ئەوان بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژە بحەســێمەوە.
ڕاســتیەکە چۆن بوو بۆ ئەویشــم وەها گێڕایەوە. حەوت ڕۆژ پشــوی بۆ نوسیم، ئەفســەرەکان زۆربەی ســونی بوون، ســاڵێک ســەربازیم مابــوو، گوازرامەوە بۆ هەولێــر، کــرام بە ئینزیبات. شــەوانیش لەقوتابخانەی شــەوانە لەهەولێر دەوامم دەکــرد. زۆرم پێ خۆش بوو پۆلی ســێی ناوەنــدی تەواو بکەم، بەڵام هەموومان پیاو و گەورەبوین، ئەوەی کارێکی هەبوایە، یان میوانی هەبوایە، یان مەبەســتی

بوایە بچێتە میوانی، ئەوا دەبلی کارەبای دەکوژاندەوە. دوو سێ جار دووبارەی دەکردەوە، نەمان دەتوانی بخوێنین و بڵاوەمان لێدەکرد، بەم شێوەیە خوێندنم بۆ نەکرا.

# حزب پێی دەگوتن:
# پاشماوەی زومرەی یەمینی

لە سالی ١٩٧٣ سەرباز بووم لە شاری بەسرە. هیچ پەیوەندیەکی تۆرگانی و ڕێکخستنم، لەگەڵ حیزبی شیوعی نەمابوو. زۆر جار هاورێ (عادل سەلیم) هۆشداری پێ دەدام و دەیگوت: کە چویە خزمەتی سەربازی دەبێ وریا بیت و پەیوەندیت لەگەڵ ڕێکخستن ببڕیت. ئەوکات من گەنجێکی بێ ئەزموون بووم، لەڕوی ڕێکخستن. هیچ پلەیەکی حیزبیشم نەبوو. هەر لەو ساڵە، کە سەرباز بووم، وەک ئەوەی خوا خەنی کردبم لەدەست ڕاوەدونانی پارتی ڕزگارم ببوو. دوورو نزیک ئاگام لە سیاسەتی شیوعی نەمابوو. ئەو کات (ئەحمەد حەسەن بەکر) سەرۆک کۆمار بوو، بەڵام بە بێ (سەدام حوسێن) پەنجەی نەدەخستە ناو ئاو. لە هەموو دامودەزگا حکومیەکان وێنەی سەرۆک کۆمار و جێگرەکەی هەڵدەواسرا. ئەو دەمە سەردەمی شەڕی ساردبوو، لەلایەن وولاتانی سەرمایەداری و بلۆکی سۆسیالیستی. حکومەتی بەعس خۆی لە بلۆکی سۆسیالیستی نزیک دەکردەوە، کەیەکێتی سۆڤیەت سەرکردایەتی دەکرد. بەیاننامەی (الصداقة والتعاون)دۆستایەتی وهاوکاری، لە نێوان حکومەتی بەعس و سۆڤیەت واژۆ کرا. حکومەتی بەعس خۆماڵی کردنی نەوتی ڕاگەیاند. فۆسفات وپترۆکیمیاوی کە دوو پرۆژە بوون لەگەڵ سۆڤیەت واژۆ کرا. بۆڕی (رومێلە)و بەنداوی سەرسار وکڕینی چەک و فرۆکەی ڕووسی و زۆر شتی تر کە من نایزانم. ئەو نزیک بوونەوەی حکومەتی بەعس لە بلۆکی سۆسیالیستی، وڵاتانی پەیمانی ناتۆی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا زۆر نیگەران کردبوو. چونکە تا ڕادەیەک بەرژەوەندی ئەوان لێدرا. بە تایبەتی بە (خۆماڵی کردنی نەوت). سۆڤیەت فشاری دەخستە سەر حیزبی شیوعی کەوا لە حیزبی بەعس نزیک ببێتەوە و پشتگیری بکات،

لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی. حیزبی شیوعی عێراقی خستە ژێر باڵەپەستۆ (الجبهە الوتنییە الدیمقراتیە التقدمیە) بەرەو نیشتمانی دیموکراتی پێشکەوتنخوازی پێ واژۆ کرد، لەلایەن حزبی بەعس (ئەحمەد حەسەن بەکر) و لەلایەن حزبی شیوعیش، هاوڕێ (عەزیز مەحەمەد) واژۆ کرا.
هەر بە واژۆ کردنی ئەو بەرەیەو نزیک بونەوەی حکومەتی عێراقی و حزبی بەعس، لە یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی بلۆکی سۆسیالیستی، ڕۆژئاوا و ڕژێمە سەرمایەداریەکان، بە سەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نیگەرانی و مەترسی لێدانی بەرژەوەندیەکانیان باڵی بەسەریان داکێشا، حزبی شیوعی عێراقیش پێی وابوو (سەدام)دەبێتە کاسترۆی عێراق!!
ئەمریکاو ئیسرائیل، لەگەڵ شای ئێران، بە دوای بەلایەک دەگەڕان بۆ حکومەتی عێراق، لەبەر ئەو هۆکارانەی لە پێشدا باسم کرد. دیارە پڕ چەک کردن و هاندانی سەرکردایەتی پارتیان بە باشترین ڕێگە زانی، بۆ هەڵگیرسانەوەی شەڕ دژی حکومەت. لەو کاتەدا، حیزبی شیوعی وەک ئەوە وابوو تازە ببێتە ئەندامی پەیمانی (وارشۆ)و پارتیش خۆی بە ئەندامی پەیمانی (سەنتۆ) هەژمار دەکرد، نەیاندەزانی (ئاخر کێشکە چ خۆی هەیە هەتا چەلاویشی هەبی)؟!!
دکتۆر (مەحمود عوسمان) لە ڕادیۆ، قسەی بۆ خەڵک دەکرد. کەوا شەڕ دەست پێدەکەنەوە بە پاڵپشتی ئێران، حکومەتی بەعس بە چ جۆرە چەکێک لیبان بدە ئەوانیش بەو جۆرە چەکە لێیان دەدەنەوە. ڕاستی دەکرد، چونکە ئەوەندە تۆپی (ئیسرائیل)ی وپسپۆری سەربازی هێنابوو، لە ڕێگای شای ئێرانەوە، دکتۆر مەحمود ئەوەی بەسەر زاری نەدەهات و بەلایدا نەدەچوو، ناوی شاری (کەرکووک) بوو. کەچی لە دوای نزیک بە نیو سەدە، چەواشەکارانی مێژوو، ئێستا بۆ خۆڵ خستنە چاو دەڵێن (ئێمە شۆڕشێکمان لەسەر کەرکووک دانا) حزبی شیوعی و پارتی، بوون بە دوو شاگرد (تۆغلان)ی هەردوو زلهێزەکەی جیهان، واتە (سۆڤیەت و ئەمریکا).
لای پارتی شاری کەرکووک وەک بڵێی: حیزبی شیوعی زەوتی کردبێ! کەوتە گیانی شیوعیەکانی کوردستان، بێ ئەوەی یەک فیشەک بە حکومەتی عێراقەوە بنێ. لە زۆر جێگا پارتی ڕووبەڕوی ئەندامان و لایەنگرانی حزبی شیوعی دەبوەوە و کردی بە شەڕ، بۆ نمونە: لە ماڵی (حسێنە قەڵەو) و لە (شەهیدانی کوران)

ولەگەلێک شوێنی تر، هێزە سەربازییەکانی حکومەتی بەعس دەبوونە ناوبژیوان. لە زاخۆ (تەها مزەمید)، لە شەقلاوە (بیا سلێوە)، و لە دەشتی هەولێریش (حەمەدەمین بەرزەواری) و (یاسیین حاجی تاهیر) لە گوندی ئۆمەراوە. هەروەها لە زۆر شوێنی وەک (سفەیە و بەڕانەتی)، ئەوانەی کە ناوم هێنان و چەندانی تریش لەبەرچاوی کەس و کاریان و لە بەر دەرگای ماڵەکانیانەوە درانە بەر گوللە و کوژران. زۆریش قۆڵبێچ کران و ڕاپێچی زیندانەکانی (رایات) و (چۆمان) کران. پاشان بێ دادگایی کردن هەمویان کوشتن،کە هەندێکیان پێشمەرگەی ئەیلول بوون. شەهید بوونی مامم ( یاسین حاجی تاهیر ) لە ناوچەکە دەنگی دایەوە، بەراستی بۆ بنەماڵەکەمان کارەساتێکی گەورە و جەرگ بڕبوو. شیرازەی خانەوادەکەمان بە لەدەست دانی ئەو شێوا، کە لەو باوەڕەدام تا ئێستا لە هزری هەموومانـدا فەرامۆش نەبوە، تاوانی ئەویش تەنها ئەوە بوو کە شیوعی بوو. لە نزیک قەلاتی شاری هەولێر تەقینەوەیەک ئەنجام درا، لە چایخانەی (مام عومەر) کە تەنها لایەنگرانی حزبی شیوعی تێیدا گرد دەبوونەوە. دوو برینداری سووکی لێ کەوتەوە، هەروەها نارنجۆک لە ناو بەشە نان (سەمون)ـی بارەگای (عەنکاوە)ـی حیزبی شیوعی دۆزرایەوە، بەلام نەتەقیەوە. لەو دەمەدا پارتی دەسەلاتی زۆربەی دام و دەزگاو بەڕێوەبەرایەتیەکانی شاری هەولێری بەدەستەوە بوو. بەرێوەبەری پۆلیس (شێخ ڕەزا) و (عبدالوهاب ئەتروشی) پارێزگاری هەولێر، بە نیاز بوون (احمد کریم، ئەبو ڕاستی، مەحەمەد میرخان )چەک بکەن کە تەنها دەمانچەیان پێبوو ئەوانیش لێیان هاتبوونە دەست و ببو بە شەڕ بە دەمانچە بەرگرییەکی دلێرانەیان کردبوو و تاکوو خۆیان گەیاندبوە بارەگای حزبی شیوعی.بەم شێوەیە شەڕ دەستی پێ کردەوە لە نێوان پارتی و حکومەت، حزبی شیوعیش بەشداری کرد لە پێکهێنانی حکومەت بە دوو وەزیر و دە ئەندام لە ئەنجوومەنی یاسا دانان (التشریعی) و سێ ئەندام لە ئەنجوومەنی ڕاپەراندن ( التنفیـزی) ،لە لایەکی ترەوە پارتی و شیوعی، دەستیان لێک نەدەپاراست. چەندین خەڵک لە هەردوولا کوژرا،حزبی شیوعی بە شۆڕشی ئەیلوولی دەگوت: (زومرەی یەمینی) !

هەموو ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی ئاشکرا بوون، لە زاخۆوە تا دەگاتە فاو، بە ڕێژەی لە سەدا نۆهەد ٪۹۰ ی بنکەی حیزبی لەو بەرەیە نارازی بوون و

بـە پێچەوانەی سـەرکردایەتی حزب!! چونکە هەموو خواسـتەکانی بەعس هاتە دی و بڕیـارەکان بە سـەر حزبی شـیوعی دا سـەپێندران وەک: (حـزب القائد) زۆربەی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان دران بە دەسـتەوەو لە سـێدارەدانی سـەربازە شـیوعیەکان وزۆر شتی تر!! .

لـە سـاڵی ١٩٧٥ ڕێکەوتنامـەی جەزائیـر، لە نێوان سـەدام وشـای ئێران واژۆ کـرا. هەر لە یەکەم سـاتی ڕاگەیاندنیدا، پایدۆسـتیان لە شـۆڕش کرد، چونکە سـوکانیان لـە دەسـت خۆیان نەبوو! (ئـاش بەتاڵیان کرد). خوێنـەری بەرێز: ئێسـتاش ئەو دوو وشـەیە، پارتیەکان دڵگران و نیگـەران دەکا. دڵنیام، نازانن داهێنانـی ئـەو دوو وشـەیە، بۆ یەکەم جار لە پێشـەکی (هەمبانـە بۆرینە)ی، نوسـەر و شـاعیر (مامۆسـتا هـەژار موکریانی) بـە ناوی (مـن و فەرهەنگ)لە لاپـەرە ٢٨ ئامـاژەی پـێ دراوە، کە ئەو بەڕێزە وەک مورید و کەسـێکی نزیکی ماڵـی بارزانـی هەژمـار دەکرێ و کەسـیش لە پێش ئـەودا ئەو پەیڤـەی بەکار نەهێنـاوە. دەبـێ بڵێین کەوا لـە داهێنانی خۆیەتی. ئەو تۆپـە دورر هاوێژانەی دەستکردی ئیسرائیل بوون، شۆڕش ڕادەستی حکومەتی عێراقی کردنەوە. هێزی سـەربازی حکومەتی عێراق، لەو جۆرە تۆپانەی نەبوو، لە سـەربازگەی شـاری هەولێر کۆکرابوونەوە. دوابەدوای ئاشـبەتاڵ، حکومەتی عێراق بیری لە توانەوەو پاکتاوکردنی حزبی شیوعی کردەوە بە شێوازی جۆراوجۆر لە گرتن و کوشتنیان سـڵی نەکردەوە. شـاڵاوێکی بەرفراوانی کردە سەر حیزبی شیوعی، بۆ نمونە: لە گونـدی (ئۆمەراوە) (سـەلیم چاو کەلا )و لە گوندی (دۆڵـە بەکرە )(دەروێش موحەمەد) بە ئوتومبێلی (دائیرەی ئەمن) شـەهید کران. شـاڵاوەکە بەغداشـی گرتەوە، زۆر کەسـی شـیوعیان گرت و تیرۆریان کرد، لە ناویشـیاندا (ام احمد) پاڵێـوراوی کۆمیتـەی ناوەندی حزبی شـیوعی بوو، هەروەها: (عایدە یاسـین) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و هاوسەری سیاسەتمەداری کورد ( بەهائەدین نوری) شـوێن بزر کرا. بە هەمان شـێوە، بەرپرسـی یەکێتی قوتابیانی گشـتی و گرتن و ڕاپێچ کردنی سـی و یەک پۆلیس و سـەرباز بۆ زیندان، کە تێکڕایان ئەندامی حزبی شـیوعی بوون. لە دوای سـاڵی ١٩٧٨ هەموویان لە سێدارە دران. کەچی، حیزبـی شـیوعی هـەر موکور بوو، لـە قوڵکردنەوەو بەهێزکردنـی بەرە. تا وای لێهـات، لـە نێوان ئەندامانی حزب یەک لە یەکی دەپرسـی: لە حیزب چ باسـە؟

دەیانگوت: (کورتەکی بە لۆکەی ئەستوور لە بەر بکە و شان بدە بەر جەبهەی وەتەنی!!).

ماوەی سەربازیم تەواو بوو، پەیوەندیم بە ڕێکخستنی حزبی شیوعی کردەوە، خەریکی وەرگرتنی مۆڵەتی شۆفێری بووم. مۆڵەتی گشتیم وەرگرت، ئەو کاتە هاوڕێ (عادل سەلیم) ئەمینداری گشتی گواستنەوە و گەیاندن بوو. منیش لەو بەڕێوەبەرایەتیە بووم بە شۆفێری ئۆتۆمبێلی بارهەڵگرو لەوێ دامەزرام. لەسەر ئاستی کاری حیزبی، من هەر زوو لەگەڵ ئەو سیاسەتەی حیزب نەبووم کە پەیڕەو دەکرا. هەمیشە لەگەڵیدا نەدەگونجام و لە هەموو کۆبونەوە حیزبیەکان ڕەخنەم لێی دەگرت. هەر ئەوەش بوو، خولێکی ڕۆشنبیری و هزری و سیاسی کرایەوە، بۆ ئەوانەی کە ناکۆک بوون و لەگەڵ پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتەی حیزبدا نەبوون. پێیان دەگووتن: کەلێنی هزری (خلل الفكري)و هەرس نەکردنی سیاسەتی حیزب. هەمیشە من یەکەم ناو بووم، لەگەڵ منیشدا لە یادمە چەند هاوڕێیەک ناڕازی بوون، لە ناویاندا ئەوانەی کە ناویانم لە یاد مابێ: ( زاهیری مام ڕەسول و هاشم شێروانی ناسراو بە احمد کادیر ) و زۆری تر. لەو خولانە چەند هاوڕێیەک، وتاریان پێشکەش دەکرد، لە ناویاندا هاوڕێیان: ( نەجمەدین مامە و احمد بانی خێلانی و چەند هاوڕێیەکی تریش). خولەکان لە بارەگای حیزبی شیوعی لە هەولێر بە ڕێوە دەچوو. نیوەڕۆیەکان نان و کەبابیان بۆ دەهێنان. سەرجەم وتار و بابەتەکانی خولەکە، نەیانتوانی کاریگەری ئەوتۆیان هەبێ لەسەر بەشداربووان، بەتایبەتی لەسەر من. بە سێ وێنە نامەی دەست لە کارکێشانەوەی خۆم لە کاری حیزب و ڕێکخستن ڕاگەیاند. لە کاتێکدا باوکم و (کەریم)ی برام و هەموو بنەماڵەکەمان، لەگەڵ حیزب بوون و بە ناچاری ئەو سیاسەتەی حزبیان قەبوڵ بوو. بۆ بژێوی ژیان خۆم بە کار و کاسبی سەرقاڵ کرد. دوای چەند ڕۆژێک لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش (دائره الامن)ی (قوشتەپە) داواکرام. (معاون یونس) بەڕێوەبەری ئاسایشی (قوشتەپە)بوو. بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کردم. بە شێوازی خۆیان زۆر بە شان و باڵی داهەڵدام و پێی گووتم: تۆ کوڕێکی زیرەک و خوێندەواری، مخابنە بۆ تۆ سیاسەت نەکەی!! چونکە ئێمە دەزانین تۆ لە حیزبی شیوعی دانیشتوی، ئەگەر هەر چ داواکاریەکت هەیە بۆت جێبەجی دەکەین، لە فەرمانگەی خۆتان دەتکەین بە

سەرۆکی شۆفێران (رئيس السائقين)!! ئاخر خەڵکی لە من شوفێر تری لێ بوو، خۆ من یەک بە خۆم شەرمم لێیان دەکرد ببمە سەرۆکی شوفێرەکان. داوای لێ کردم، بگەڕێمەوە بۆ ناو ڕیزی ڕێکخستنی حیزبی شیوعی. بەڵام بۆ بەرژەوەندی ئەوان کار بکەم، واتە بەدەست بچمەوە (ناپاکی) بکەم!! لە وەڵامدا گوتم: کاتێک من لە لایەن حیزبی شیوعی، بە ڕێکخستن (تنزيم) کرام پێیان گوتم: ئێمە کارەبا و ئاو و خزمەت گووزاری و خۆشگوزەرانی بۆ خەڵک دابین دەکەین، ئێمە بینیمان حکومەت هەموو ئەو شتانەی فەراهەم کرد، ئیتر کاری سیاسی بۆمن ئاستەمە. بەڵێنم داوە، جگە لە کاسبی هیچ کارێکی تر ئەنجام نەدەم. هەر بەڕاستی، ئەگەر دڕندەیی و خوێن ڕێژی ئەو دکتاتۆریەتەی بەعس نەبایە، من ئەوە خواست و ئارەزووم بوو هەر ئەوهاشم دەکرد. دەتوانم بڵێم (معاون يونس) ڕێژەی (٧٠٪) باوەڕی بە قسەکانم کرد. لەهەمان کاتدا داوای لێ کردم، ئەو قسانە بۆ (مەلا نەفتە و سەلیم شێخ مەحەمەد) نەگێڕمەوە. بەڵام من لەلای خۆم هەستم دەکرد، ئەگەر بەوان نەڵێم ناپاکی دەکەم. بۆیە چووم هەمویم بۆ ئەوان گێڕایەوە. بەڵێنم لێیان وەرگرت، کەوا لە کۆبوونەوەی لێژنەی بەرەدا، باسی ئەو بابەتە نەکەن. ئەوکات مانگانە لێژنەی بەرە کۆبوونەوەیان ئەنجام دەدا. حزبی شیوعی لە کۆبوونەوەکانیاندا هەمیشە جەختیان لە پرۆژەی بەنداوی (سەرسار) دەکردەوە، کە کۆمپانیایەکی یەکێتی سۆڤیەت ئەنجامیان دەدا بۆ خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە. دایکە نەخوێندەوارەکەی منیش، چنینی خەونی چێنراوی سەرابی بوون، گوایە ئەو بەنداوە چەند ئاو گڵ دەداتەوە و چەند بە دیزاینێکی ئەندازیاری پێشکەوتووانە دروست دەکرێ. لەدوای نزیکی نیو سەدە، ئێستاشی لەگەڵدا بێ دایکم، بەنداوی (سەرسار)ی لە بیر نەچۆتەوە!! هێندەی کادیرانی حزبی شیوعی دەرخواردی بدەن. پاش ئەوەی شۆڕشی ئەیلول (ئاش بەتاڵ)ی لێ کرا، ئەو پێشمەرگانەی کە خۆیان ڕادەست کرد، پێیان دەگوتن: (عائدون) گەڕاوەکان. کە زۆربەیان فەرماندەی هێز و فەرماندەی بەتالیۆن و سەر لق و سەر پەلەکان بوون، لەگەڵ هاتنەوەیان هەندێکیان بوون بە بەعسی و مەفرەزەی تایبەتی و موستەشار، ئەوانەی کە چوون بۆ ئێران بە ڕەنجی شانیان خۆیان ژیاند، بێ ئەوەی کەس خاوەنداریێتیان بکات.

حکومەتی بەعس دەستی کرد بە ڕاگواستنی گوندەکانی کوردستان. خەڵکەکەی

ئاخنییــە ئــۆردوگا زۆرە ملێیــەکان و نیشــتەجێی کــردن. بــە عــەرەب کردن و بەعسی کردن لە ئەوجی خۆیدا بوو، وردە وردە، چەند مەفرەزەیەکی سەرەتایی کۆمەڵە و بزوتنەوەو کەسانێکی سەربەخۆ لە کوردستان دروست بونەوە. لەگەڵ هەموو تێبینییەکانمان لەســەریان، بەڵام بەداخەوە حزبی شــیوعی پێی دەگوتن: (پاشــماوەی زومــرەی یەمینــی). لەکاتێکــدا خەڵکــی کوردســتان بە تاســەوە خواســتیان گوێ بیســتنی دەنگــی دوو تفەنگ بوو، بە ڕژێمی بەعســەوە بنرێ. ئەو هەڵوێســتەی حزبی شــیوعی، نارەزایی لە ٩٨٪ ی ئەندامانی خودی حیزبی لێکەوتــەوە، لــەو دەمانە هاوڕێ (بەکــر تەلانی) زۆر هاموشــۆی باوکمی دەکرد لــە گوندی (گەرەشــێخان). پێشــنیاریان بــۆ حزب کرد: چەنــد هاوڕێیەک بچنە شــاخ. حیزبیش، بەیانامەیەکیان لەسەر دەربکا، بڵێ: ئەوانە لە حیزب نەماون و دەرکــراون. بۆ ئەوەی بتوانن بارەگاو جێــگای گونجاو ئامادە بکەن، بۆ ئەوانەی مەترســی گرتن و هەڕەشــەی بەعسیان لەســەرە. کەچی حیزبی شیوعی زۆر بە تونــدی دژی ئەو پێشــنیارە وەســتایەوە، بە لــەت کردنی حیزبــی هەژمار کرد. جێگەی داخە ئەو بنکە جەماوەریە فراوانەی حزبی شیوعی لەڕوی جۆری هەیبوو، ئەگــەر بهاتبایە ســەرکردایەتیەکی لێهاتوی وەک خۆی هەبوایە، ســێ حکومەتی وەک بەعسی پێ دەروخا!! لە هەموو شارەکان، لێژنەی بەرە هەبوون، لە هەولێر هاوڕێ (عادل سەلیم) ئەندامی بەرە بوو. زۆر جار کە کۆبوونەوەی لێژنەی باڵای بــەرە لەبەغــدا ئەنجام دەدرا، دەبوایە ســەرجەم ئەندامانی ئــەو لقانەش ئامادە بونایە. بە دەرفەت، جارێکیان کۆبونەوەی ئەو لێژنانە دەبێ. (ســەدام حوسێن) سەرپەرشــتی ئەو کۆبونەوەی کردبوو، هاوڕێ (عادل سەلیم)لەســەر ڕاگواســتن و تەعریب کردنی ناوچە کورد نشــینەکان، بەتایبەت گوندە ســنوریەکان، زۆر بە توندی ڕەخنەی ئاراستەی سەدام کردبوو. سەدام، بەو هەڵوێستەی هاوڕێ عادل زۆر نارەحــەت و تورە دەبێت، هۆڵەکە بــە جێ دەهێڵێ. جێگەی ئاماژە پێدانە، هاوڕێ (عادل ســەلیم) کەســایەتیەکی خاوەن هەڵوێســت و نەتــرس، ئەوەی لێ نەدەترســا مردن بوو. بۆ جاری دوەمیش، لە کۆبونەوەی ئەمینداره گشــتییەکان لە ســەربازگەی هەولێر، بەهەمان شــێوە بە توندی لە ڕوی (ســەدام حوســێن) هەڵوێســتی تووند دەردەبڕێ، بەرامبەر پێشێلکاریەکانی ڕژێمەکەیان. بۆ گەواهی ئەو بابەتە، هاوڕێ (فەهدی کاکەی عەنبەری) کە پاسەوان و شوفێری ئوتومبێلی

هاوڕێ ( عادل سـلیم ) دەبێ، گوێ بیسـتی پاسەوان و شوفێرەکانی تر دەبێ کە دەڵێن: ئاستەمە بە سەلامەتی دەربازتان ببێ. ئەوە بۆ ملی لە چەقۆی (سەدام) دەسـوێ؟! کـێ دەوێـرێ لە ڕویدا بـەم جۆرە قسـە و ڕەخنە بگـرێ!! لەدوای ماوەیەکی کورت، بە مەبەسـتی بەسـەرکردنەوەی هاوڕێیانـی کۆمیتەی مەحەلی کەرکـووک و چارەسـەرکردنی کێشـەی گرتنـی چەند هاوڕێیـەک، هاوڕێ (عادل سـەلیم) و هاوڕێ (ئەبو حیکمەت) بە ئەرکی حیزبی دەچنە شـاری کەرکووک. لەوێ دەچنە بارەگای بەرە و لەگەڵ دەسـەڵاتدارانی حکومەت لە گفتووگۆیەکدا، هاوڕێ (عادل سلیم) ڕەخنەی توند دەگرێ، هەر لەوێ قاوەیەک دەخواتەوە، لە گەڕانەوەیاندا بەرەو هەولێر لە نزیک شارۆچکەی (ئالتون کۆپری) پردێ، هاوڕێ (عادل) هەست بە ئازار دەکا لە گەدە و سکی، داوا لە هاوڕێ (ئەبو حیکمەت) دەکا کە ئۆتومبێلەکە ڕاگرێ، بۆ ئەوەی بچێتە سـەر کورسی پشتەوە و ڕاکشێ. چونکـە ئازارەکـەی ڕوو لـە زیـاد بوونە، تـکای لـێ دەکا کـە زوو بیگەیەنێتە هەولێـر، کـە دەگەنەوە بارەگای لێژنەی هەرێمی کوردسـتانی حیزبی شـیوعی، خێـرا هـاوڕێ (ئەبو حیکمەت) بانگـی هاوڕێیان دەکا، فریایـان بکەون. چونکە ڕەوشی تەندروستی هاوڕێ (عادل سلیم) زۆر خراپ دەبێ. بە خێرایی دەیگەیێنە نەخۆشـخانە، بەڵام بە داخەوە پزیشـکێکی خزمی هاوڕێ (عادل سـلیم) کە لە نەخۆشخانە دەبێ، دوای پشکنینی لاشەکەی دەڵێ: ماوەی پازدە خولەکە گیانی دەرچـوە. بەو شـێوەیە، ئەوکەڵە پیاوەی مێژوی هەولێریـەکان، باجی بوێری و هەڵوێسـتە مەردایەتیەکانی خۆی دا. بوو بە ئەسـتێرەیەکی پڕشنگداری خەباتی چینایەتـی و نەتەوایەتـی. حکومەتی بەعس ماوەی مانگێک بوو شـاڵاوی گرتنی شـیوعیەکانی لە شاری بەسرا دەست پێ کردبوو، بۆ سەر ڕێکخستنەکانی حزبی شـیوعی. بـێ ئەوەی لاقەی یـەک وەزیر و ئەمینداره گشـتیەکان و ئەندامەکانی ئەنجوومەنـی یاسـا دانـان و ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی سـەر بە حیزبی شـیوعی و بگرە سـەرکردایەتی حیزبی شـیوعیش بکا، قسەشیان لەگەڵ بکرێ و بیانگرن!! تەنهـا بنکـەی حیزبی و ڕێکخسـتنەکان نەبێ، هاوکاتیش لەگەڵ ئەو شـاڵاوەدا، لـە هەولێریـش نزیک بـە پازدە ڕۆژ بوو دەسـت بـە گرتنی هاوڕێیـان کرابوو. کەچـی چەنـد هاوڕێیەکـی سـەرکردایەتی حیزب وەکو: (یوسـف حەنـا ـ یا ـ ئەبـو حیکمـەت) و (ئەحمەد حامید) و زۆری تر لە هەولێر دەسـوورانەوە!! ئەو

هاوڕێیــە قارەمانانەی کە ڕویان کردە شــاخ و بڕیــاری هەڵگرتنی چەکیاندا دژی حکومەت، تەنها بە پشــت بەســتن بە ئیرادە و بڕیاری جەربەزەیی خۆیان بوو. ئەگینا حیزبی شــیوعی، خاوەنداری لە کەس نەکردو بە کەسیشــی نەگوت: بچن بۆ شــاخ. وەزیر و ئەمیندارە گشــتیەکان و ئەندامەکانی ئەنجومەنی یاسادانان و ڕاپەڕاندن، نەیاندەویســت لــە خۆیان تێکبدەن، هەر واشــیان کرد!! ئەو خەڵکە پاک و چاکانەیان بە گورگەکانی بەعس ســپارد.

# پڕۆسەی هاوسەرگیریم

لەهەولێــر ســەربازبووم، زســتانی ســاڵی ( ١٩٧٤) بێ ئەوەی کەس پرســم پێ بــکات، باوکــم و مامم بڕیاریان دابوو، تێکەولێکەیــەک لەناو خێزانی ئێمە و ماڵە مامەکانــم بکــەن. بەم جۆرە هاوســەرگیریەی کە بڕیاریان بــۆ دابوو، دەگوترێ: (ســێ بەگایی) واتە: خوشــکی من بۆ ئامۆزایەکم، خوشــکی ئەو بۆ ئامۆزایەکی تــرم، خوشــکی ئەویــش بۆ من. نایلەی ئامۆزام بۆ من دیــاری کرابوو. من لەبەر ئەوەی نا،کە هاوســەری بەوەفاو ماندوو نەناس و خۆنەویستم، ژنێکی خراپ بێ. بەڵکــو لەبەرئەوەی کە قەت بیرم لە شــتی وا نەکردبــوەوە، چونکە ئێمە لەیەک مــاڵ گــەورە ببوین و لەهەمان کات دڵم بە کچێکی ترەوە بوو بۆ هاوســەرگیری. لەو شــەڕەی، مامم حوسێن لەگەڵ پارتی کردی لەگوندی ئۆمەراوە، کەوا هەشتا پێشــمەرگەی پارتی دەوری ماڵیان گرتبوو، مامم حوســێن و مەولودی ئامۆزام و نایلەی هاوســەرم (ئەوکات کچی ماڵ بوو) لەشەڕەکەدا بەشدار بوون. لەناوچەی دەشــتی هەولێر، دەنگی دایەوە کە کچی حوســێنی حاجی تاهیر، شەڕە تفەنگی کــردوە لەتــەک باوکی. جا بۆیــە بڕیاریان دابوو کە ئەو کچــە قارەمانە بدەن بە مــن، نابــێ بدرێتە خەڵکــی بێگانە، بۆ ئەوەی وەچەی بــاش و ئازا بخەینەوە بۆ بنەماڵەکەمــان!! ئەوکات وەک ئێســتاو شــەڕی بەرگری لە کۆبانــێ نەبوو، ژنی کــورد ئاوا ئازا بــێ، ئەگەر ژنێک ئاوا هەڵبکەوتایــە دەگمەن بوو. دەبوە وێردی ســەرزمان. ئێســتا زۆرجــار بە نایلەی خێزانــم دەڵێم: ئامۆزا بریــا ئەوکاتی ئەو تفەنگانــەت هەمــوی لەنێوچاوانی من خاڵی بکردبایەوە، نــەک ئاوا لەجیاتی من

بڕیارم بۆ بدەن. بەڵام ئەوەی جێگای پێزانین و سوپاسی منە، ئەوەیە: ئەگەر نایلە نەبوایە، هیچ ژنێکی تر بەرگەی ئەو هەموو دەربەدەری و دابڕان و ترس و هەڵاتنەی نەدەگرت، کە لەگەڵ من چەشتویەتی. بەراستی بەژیانم قەرزباری دڵ گەورەیی ئەو ژنەم.

ئەوکات کە بوک دەگوازرایەوە، باو بوو دەبوایە خەزوری بوکێ، یان برا گەورەی زاوای لە پێشەوەی ئۆتۆمبێلێک سواربێ و بوک و بەربوک لەپشتەوە سوار دەبوون. دیارە باوکم کە بوکیان سواری ئۆتۆمبێل کردبوو، وای پێ چاک بوو بچنەوە ڕێگای (هەولێر- قوشتەپە)ی کۆن، کە ڕێگایەکی چۆڵ بوو، لەبەر سەلامەتی. لەهەولێر دەرچوبوون، پێش ئەوەی بگەنە قوشتەپە هەندێک لە برادەرەکانی باوکم، چەند تفەنگێکیان بەسەر بوکێدا تەقاندبوو. (یەک لەوانە عومەر کادیر کە ئێستا لە دانیمارکە)، لەوکاتە بوک، واتە: نایلەی هاوسەرم داوای تفەنگی لە باوکم کردبوو.

باوکم ڕازی ببوو، تفەنگەکەی دابوێ، ئەویش بە شۆفێرەکەی گوتبو: ڕاوەستە، کە هاتبوە خوارەوە ڕایکێشابوە تفەنگ و (سی) فیشەکی واتە (یەک مەخزەنی) کلاشینکۆفی بەسەر مەلا عومەرو ئەوانی تر تەقاندبوو.

بەڕاستی بوک وەک هەمیشە، دەبێ بۆنی عەترێکی خۆشی لێ بێت، بەڵام لە بەدبەختی من لەبۆنی باروت زیاتری لێ نەدەهات، دەتگوت: ژنە شەڕڤانە لەبەرگری کۆبانێ گەڕاوەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، زۆرجار لە پێشمەرگایەتی کە دەیزانی زۆر هیلاکم، یان پێویستمان بە وشیاری هەیە، دەیگوت: ئەو تفەنگەم بدەرێ، تۆزێک بخەوە من پاسەوان دەبم. من بەتەواوی دڵنیادە بووم، دەخەوتم. نایلەیەی هاوسەرم بۆ هەموان ژیا، تەنها بۆ خۆی نەژیا. پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵەکان، لەخوێندنیش هەر نایلەبوو، من میوانی ماڵ بووم، تەنها بژێویم بۆ دابین کردوون، ئەوانەی دێنە ماڵی ئێمە، دوو بەشی لەبەر نایلەی هاوسەرم دێن، بەشێکی لەبەر من.

# حوکمی هەتاهەتایی باوکم و مامم

سـەربازیم تەواو بوو، بووم بە شـۆفێر لە بەڕێوەبەرایەتی گواستنەوەو گەیاندن، بەشۆفێری ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر. هێشتا ئۆتۆمبێلەکان نەگەیشتبوون بۆ بەشەکەی ئێمـە، بۆیە ڕۆژانە بە کەلایانێ (هەڵماتێن) دەوامەکەمان بەڕێ دەکرد. هەوڵمدا، ژیانـم وەک خەڵکی نا سیاسـی لێ بکەم. لەگەڵ خزمێکـم بەناوی هیدایەت، کە بەیەکـەوە بویـن لـە دەوام، پاسـێکی بچوکمان کڕی بە قیسـت. (ئەوکات پێی دەوتـرا تێمس). من مۆڵەتی شـوفێریم هەبوو، بەڵام ئـەو نەیبوو. دەبوایە پاش دەوام کاری نەفەرکێشی بکەین، بۆ ئەوەی پارەی قیستی پاسەکە پەیدا بکەین. ڕۆژێک لە دوای دەوام، چەند برادەرێک لەوانەی لە دەوام بەیەکەوە بوین، لەگەڵ ئێمە سـواربوون بۆ بازار. خزمەکەم لێیدەخوڕی. گەیشـتینە لای کۆتری سەلام، لـە پێش دوکانی ڕۆسـتەمی تایەفرۆش (ئـەوکات دوکانەکەی مەشـهوور بوو)، ئۆتۆمبێلێکی (گاز)ی دوو تەنی لە ڕۆخی شۆسـتەکە وەسـتابوو، شـوفێری تێدا نەبوو. ئەو خزمەم یەکسـەر خۆی کێشـا بەپشتی ئۆتۆمبێلە وەستاوەکە. هەموو شووشـەو لایـت و چەمبـەری سـەیارەکەمان هاتە خوارەوە. لەسـەر ئەو حاڵە، خۆی لە خاوەنی ئۆتۆمبێلەکە ڕاسـت و چەپ دەکرد، دەیگوت: تۆ سـەرپێچیت کردوە !! ئەو هیچ گوناهی نەبوو، بەگوێرەی یاساکانی هاتۆچۆ. خزمەکەشم ڕوی لەمـن کرد، گوتی: تۆ بۆ قسـەیەک ناکەی؟ گوتـم: بۆ منی لێبگەڕێ (کابرا زۆر ترسـا)، ڕووم لە کابرا کرد، گوتم: کاکە ئەتۆ گەورەترین گوناهت هەیە!! گوتی: گوناهی چی؟ گوتم: یەکەم سـەیارەکەت زۆر ڕەقە، دوەم تۆ دەزانی ئێمە خۆی پێدا دەدەین، دوو دۆشـەکی نەرمت لە پشـتەوە بدوریبایە؟!! بوو بە پێکەنین. وازمـان لێهنا چوین چاکمان کردەوە. پێش جەژن بوو، دەمانویسـت چوار ڕۆژی جەژن کاری چاک بکەین، بۆ ئەوەی قسـتی سـەیارەکەمان بدەین. (بۆیە باسی ئـەو ئۆتۆمبێلـە دەکەم، چونکە لە سـەرەتای ژیانم بووم، زۆرم دەردی سـەری لەگـەڵ ئـەو ئۆتۆمبێلە بینی، بۆیـە قەت فەرامۆشـی ناکەم)خزمەکەم گوتی: با ئۆتۆمبێلەکـە لای مـن بـێ. بەیانـی کانی جـەژن دەخۆم و دێم بـۆ ماڵی ئێوەو دەچیـن بـۆکار. بەیانی زۆر دواکـەوت، هەر نەهات، بوو بە نیـوەڕۆ ناچار پاش

نیــوەڕۆ مــن چووم بــۆ لای ماڵیــان، ئۆتۆمبێلەکە لە پێش ماڵیان ڕاوەســتابوو، بەڵام وەک چۆن پێ لە شقارتەیەک بنێی، ئاوای لێهاتبوو!! دیاربوو وەرگەڕابوو. چوومە ژوورەوە، خێزانەکەی ئامۆزام بوو، لێیم پرســی: هیدایەت سەلامەتە؟
گوتی: بەڵێ سەلامەتە.
گوتم: لەکوێ وای لێهاتوە؟
گوتی: دوازدە بێوەژنی ســوار کردوە، بۆ ســوڵتان عەبدوڵڵای. لەوێ وەرگەڕاوە، بێوەژنێک دەستی شکاوە.
ئەویش لەسەرچاو لێی نوستبوو، لەگەڵم کردە گاڵتە، گوتم: ئەتۆ لەگەڵ بێوەژنان ببیت بە قاورمەش پێت خۆشە!!
پارەمــان نەبــوو چاکــی بکەینــەوە، ناچــار بەخۆمــان کوشــنەکانمان دەرهێنا، وەریگەڕاینــێ بــە چەکوچان، لەژوورەوە بۆ دەرەوە. باشــمان گــەورە کرد، پێم گوت: بەسە وابزانم نەفەری زۆرتر دەگرێ، پاشان بە برایەکی ئەومان فرۆشتەوە، ئەویــش ئەوەنــدەی من ئاگام لێ بــێ، دوو جاری وەرگێڕا. ئــەو ئۆتۆمبێلە دوو بەرەبابی پێ فێرە، شوفێری بوو.
هەندێک بگەڕێمەوە دواوە، لەساڵی ١٩٧٥ پیلانگێڕی (جەزائیر)لەنێوان، ئێران و عێراق مۆرکرا. پێشــمەرگەکانی پارتی، هەندێکیان چوون بۆ ئێران و زۆربەشــیان خۆیــان ڕادەســتی حکومەتــی عێــراق کردەوە، بەنــاوی (عائدون) گــەڕاوەکان. هێندەی نەخایاند، یەک لەو بەرپرسە سەربازیانەی کە خۆی ڕادەستی حکومەتی عێــراق کردبوەوە، بەناوی (ا.م)، پایزی ١٩٧٦ شــەوی جەژنــی قوربان لەماڵی خــۆی لەگوندی کــەردز کوژرا. بــۆ بەیانییەکەی، یەکــەم ڕۆژی جەژنی قوربان، مــن و باوکــم لەجەژنانــەی خەڵکــی ئاوایی گەڕەشــێخان بویــن، لەماڵی تایەری مام ســمایلی. لەدوای باوکم هاتن، گوتیان: پۆلیســی قوشــتەپە لەماڵی ئێوەن، داواتان دەکەن. ئێمە بێ خەبەربوین بۆچی هاتون!! بەڵام (معاون شورتە) واتە ئەفســەری پۆلیس، کاک هاشــمی ســەید خەنجەر بوو کە لە خوێندنی ناوەندی هاوپۆل بوین. باوکم و هەردی و شــەهید کەریم دەســتگیرکران. لەبەر ئەوەی من نەخۆشــی زەردوییــم هەبوو، بە حاڵ پێــم دەکرا ڕێ بکەم، بۆیــە منیان نەبرد، گوتیــان: ئەگــەر ویســتمان بــەدوات دا دەنێرین. لە هەولێریش مامم حوســێن و حاجی و مامم پیرداود دەســتگیرکران. پاشــان ئێمە زانیمان لەسەر کوشتنی ئەو

کەسـەی کەردز گیراون. ئێمە هیچ ئاگادارنەبوین کە ئەو کەسە بکوژی یاسـین حاجـی تاهیـری مامـە، مەگەر حیزبی شـیوعی بـەوەی زانیبێت. بـەلام ماڵی ئـەو کوژراوە ئەو کوشـتنەیان لە ئێمە دەزانـی. دوو پارێزەرمان هەبوو، ڕۆژانی دادگایی ئێمە بۆمان هەبوو بچین لەسەرەوەی شوێنی دادگایی دابنیشین، سەیری دادگاییەکـە بکەین. لەو کاتە بەس باوکم و مامم حوسـێن مابوونەوە لە زیندان. کاتێک باوکم و مامیان هێنا بۆ ناو قەفەزی تاوانباران، سـەرۆکی دادگای تاوانە قورسـەکان (حاکم قـەدۆ)، (کوڕی یەک لە ئاغاکانـی لای خۆمان بوو). لەبیرمە کـە بڕیاری دادگای خوێنـدەوە هەردووکیانی بە زیندانـی هەتاهەتایی حوکم دا، باوکـم زۆری جنێـو بـە حاکم قـەدۆ دا. باوکـم و مامم گوتیان: ئێمەت لەسـەر ئـەو کوشـتنە حوکم نەدا، بەڵکو تۆڵـەی کۆنەقینی سـوێندخواردنی جوتیارانی دزەییـت بە ئێمە ڕشـت، ئەگەر نا تۆ لە ئێمە باشـتر دەزانـی کە ئێمە بەرامبەر ئەو کوشـتنە بێ تاوانین. لەگەڵ خوا لێخۆشـبوو مام (حوسێن مەیاس)چووم بۆ بەغـدا، پارێزەر (عەونی یوسـف)مان کرد بە وەکیل، بـۆ دادگای تێهەڵچوونەوە. ئەوانیش، پارێزەر (سـەنعان ئەحمەد قەساب)یان کردبوو بە وەکیل. (سەنعان) ئەو دۆسـیەی خستبوە قاڵبی سیاسـی دەیگوت: دەبێ لەسێدارە بدرێن، چونکە بڕیاری (سەیدالرەئیس) یان شکاندوە کە لە (شئون شیمال) ئەو بڕیارە هەبوو، (عەونی یوسـف) ئەو داوایەی بردەوە لە (سـەنعان ئەحمەد قەسـاب)، ئەوەبوو باوکم و مامم بێ تاوان دەرچوون لە زیندانی موسـڵ ئازادکران.

## باجی خۆنەبوون

لـەدوای ڕێکەوتنـی جەزائیر و دەرچوونی بەیاننامە لە نێوان سـەدام حسـێن و شـای ایـران، بـە ناوەندگیری ئەمریکا. سـەرانی بەناو شۆڕشـی ئەیلـول تەنها ئومێدیـان بە پاڵپشـتی و هاریـکاری وڵاتانـی دەرەوە بەسـتبوو، تەنها ئەوەی باوەڕیـان پێـی نەبـوو، توانای گەلی خۆیان بـوو. ئەو باوەڕبەخـۆ نەبوونە، لە ئاکام دا خۆ بەدەسـتەوەدانی لێکەوتەوە. ئەم خۆ بەدەسـتەوەدانە، نەک تەنها ئەندامانـی پارتی، بەڵکـو خەڵکی نیشـتیمانپەروەری هەرچوارپارچە و ئەوانەی

لەگــەڵ پارتیــش ناکۆک بــوون بوە مایــەی دڵتەنگی و نیگەرانیــان. ئەو هەموو توانا مرۆیی و ئابووری و لۆجســتیکی لەڕوی چەک و تەقەمەنی بە ناو شۆڕشــی ئەیلــول دەکرا، ئەگەر پشــت بەســتن بەهێز و توانای خۆمــان هەبوایە، دەتوانرا چەند ســالێک بەرگری بکرابایە. لەســەروبەندی پیلانگێڕی و ڕێکەوتنی جەزائیر ژمارەی پێشــمەرگە و خۆبەخش زیاتر لە (ســەد و بیست هەزار) کەس، کە ئەم ژمارەیــە زۆر لە ســوپای ئەوســای عێراق زیاتر بوو. لــەڕوی چەک و جبەخانە و توانــای لۆجیســتیکی زۆر بەهێزبو. ئــەو تۆپە دوورهاوێژە ئیســرائیلی و ئێرانی و ئەمریکیــەی هەیانبــوو، زۆر لــە توانای تۆپەکانی ســوپای عێــراق بە هێزترو زیاتربــوو. تەنهــا فڕۆکەی نەبوو. هەروەها توانای دارایی ئەو کاتەی ســەرانی بە ناو شــۆڕش، بە پێی چەند ســەرچاوەیەک، سندوقی دارایی شۆڕشی ئەیلول بڕی بیست و چوار ملیۆن دیناری عێراقی تێدا بوو. دەیکردە زیاتر لە (حەفتاو پێنج) ملیۆن دۆلاری ئەو کاتە، ئەمەش بڕە پارەیەکی یەکجار زۆر بوو لەو ســەردەمە.

کاک مســعود بارزانــی لــە کتێبــی (بارزانــی و بزوتنەوەی ڕزگاریخــوازی کورد) نوســیویەتی: لــە مــاوەی یــەک ســاڵدا، لــە بــەرواری (١٩٧٤/٣/١١) هەتــا (١٩٧٥/٣/١١)، (سی و نۆ) باڵە فڕمان خسۆتە خوارەوە، هەروەها (دووسەدو نەوەت و شــەش) تانک و ســەرباز گوێزەرەوەمان تێکشکاند و هەروەها (نەوەت و شــەش) تۆپــی دوورهاوێژ تێک شــکێندرا. لە هەمان کتێبی مەســعود بارزانی (بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد) لە بەرگی ســێیەم و بەشــی دوەم، باســی هاوکاری دارایی و لۆجیستیکی وڵاتانی ناوچەکەی کردوە.

ئەو داتایانە دەخاتە ڕوو دەڵێ: ئێران لە بواری دارایی و لۆجیستیکی، هاوکاری زۆری کردوین و پێداویستیەکانی بۆ دابین کردوین، مانگانە بڕی (بیست) ملیۆن تومەنی ئێرانی ئەو کاتە، کە دەکاتە (شــەش) ملیۆن دۆلاری ئەوکات، هاوکاری کردویــن. دوای ڕێکەوتنامەی جەزائیر ئەم هاوکاریە بڕاوە. ڕوســیا ســاڵانە بڕی (ســێ ســەدو شەســت) هەزار دۆلاری ئەو کاتە هــاوکاری کردویــن، دواتر بۆی کردوین بە ( ملیۆنێک و پێنج ســەد هەزار) دۆلار. دوای ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق ئــەو هاوکاریانــەی بڕی. ئەڵمانیا لە ســاڵی (١٩٦٩) بــڕی (دوو) ملیۆن مارکی ئەڵمانــی هــاوکاری پارتــی دیموکراتی کــرد. بەریتانیا بڕی (دووســەدو پەنجا) هەزار پاوەنی ئیســتەرلینی هاوکاری کردوە. شــای ســعودیە لە ســاڵی (١٩٧٤)

(یـەک) ملیۆن دۆلاری هاوکاری کردوە، ئەمریکا لە سـەرەتای سـالّی (١٩٧٣) تاوەکو سـەرەتای سالّی (١٩٧٥) بڕی (شـەش) ملیۆن دۆلار، هاوکاری کردوە. بـە بـڕی دە ملیـۆن دۆلاریش، چەکی بـۆ کڕیوین. هەروەها لـە هەمان پەرتوک لە ژێر ناوی (موشـەکی دژە باڵەفر و تۆپخانەی ئێرانی ) کاک مسـعود بارزانی دەڵێـت: لێرە بوو، ئێـران ئامادەیی خۆی دەربڕی کـەوا کەتیبەیەکی تۆپخانەی (١٣٠ ملم ) و (٢ پاتری موشەکی ڕاپیێر )ـی دژە باڵە فڕ، بنێرێ بۆ پتەوکردنی بەرەی ڕەواندز، کە لە ڕۆژی ( ٢ ی تشرینی ١٩٧٤) گەیشتە شوێنی مەبەست. دیسـان لـە ژێـر ناوی (چالاکـی ڕوس و بەرەی سۆسیالیسـت لـە عێراق) کاک مسـعود دەلێت: بە شـێوەیەکی دیار و ڕوون سـەرنج دەدرێ کەوا شـارەزایانی ڕوس لە ناو سـوپادا زۆر زیادیان کردوە و هەروەها شـارەزایانی ئەڵمانی و چەک و سـلۆڤاکیایش بەهەمان شـێوە زیادیان کردوە. شـارەزایانی ڕوس بە ناوەکانی (عقید ئەلکسـاندر ڤاسیلیڤ) و چەند باڵەفڕوانێکی ڕوس وەک:
(رائیـد کراڤچینکـو) و (رائید دەیڤـد ئینکۆ) و (رائید یـوری) و (رائید لۆنیا) و( ڕائیـد ڤۆڵدیـا) و ( ڕائید ڤیکۆر).. من لە کاتـی خوێندنەوەی ئەم بابەتەی ناوبـراودا، هەسـتم نەدەکرد مێـژوی خەباتی گەلێکی ڕزگاریخـواز دەخوێنمەوە. ئەوەندەی هەسـتم بە شەڕی گەرمی بلۆکی سۆسیالیستی و بلۆکی سەرمایەداری دەکرد. لەسەرخاک و ورگی گەلێکی ماف زەوت کراو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بەداخەوە ئێستاش زهنییەتی پشت بەستن بە هاوکاری پەیوەندیەکانی دەرەکی و خۆچەتاڵ کردن بە داگیرکەرانی کوردستان و زلهێزانی دنیا، کە چاو و ویژدانیان تەنهـا بەرژەوەندی خۆیان دەبینێ. لە باشـور لەلایەن پارتە دەسـەڵاتدارەکان، بەردەوامـی هەیە کە بەداخەوە ئەوەی ئومێدی لەسـەر هەڵناچنن، توانای گەلی خۆمان و ئیرادەی خۆمانە.
خوێنـەری بەڕێز: من وەک گەواهـی دەرێکی مێژوو دەڵێم: لەوەتەی بەبیرم دێ، لە باشـوری کوردسـتان نەشەڕ نە ئاشـتی نە گفتوگۆ نە خۆبەدەستەوەدان، نە شـەڕی براکوژی نە بردنەوە و نە تێکشکان، بەدەست خۆمانەوە نەبوە. هەمیشە کۆنترۆلەکانمان بە دەسـت خەڵکانێکی دەرەوەی شانۆ سوتاوەکەوە بوە.

# مارکسی بوون

لــەدوای پیلانگێڕی ڕێکەوتنی جەزائیر، لە دوای خۆبەدەســتەوەدانی بزوتنەوەی چەکـداری ئەیلـول، کە لەهەر چوار پارچەی کوردســتان هەسـتی پێدەکرا، ئەو بزوتنەوەیــە وابەســتەیە بــە ئەمەریــکا و ئیســرائیل و شــای ئێــران، گرێدراوی ڕۆژئاوایە. ئەوکاتە بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە ململانێی شەڕی سارد دابوون، بــە بیرمــە لەهەر چــوار پارچەی کوردســـتان لــەدوای پیلانگێــڕی جەزائیر هەر گروپ و ڕێکخســتن و حیزبێک دروســت دەبوو، خۆی بە مارکســی لینینی تەواو عەیار دەزانی. زۆربەیان ئەســتێرەی ســورو وێنەی گیڤارایــان کردبوو بە لۆگۆی پارتەکانیان. ئەندامەکانی خۆی بەفکری مارکسی پەروەردە دەکرد و شانازی بە مارکســیەتی خۆی دەکرد، پێیان وابوو ئەوەی مارکســی نەبێ دواکەوتوە!! هەتا هەندێک برادەرم هەبوو، لەناو پارتی، خۆیان بە مارکســی دەناســاند، بە نمونە: شــەهید (وەســتا یونس) و زۆر برادەری تر، کە لەنزیکەوە یەکترمان دەناســی. پێشــبرکێ بــوو، هەر بابایەکی لەویتر مارکســیتر بێ. نامــەوێ ناوی ئەو هەموو حیــزب و ڕێکخراوانە بێنم. لەهەر چوارپارچەی کوردســتان، پێیان وابوو حیزبی شــیوعیان تێپەڕاندوە، لەڕوی مارکسیەت و سۆسیالیستی. لەدوای (پریسترۆیکا و گلاس نۆســت) لەیەکێتی ســۆڤیەت و داڕمانی بلۆکی سۆسیالیســتی، هەر بابا بــوو تەوقی مارکســیەت لەملی خــۆی داڕنی، هەندێکیــان دەیانگوت: بە ژیانمان ئێمە مارکســی نەبوین و نابین. زۆریان پاشــناوی تریان لەجیاتی مارکســیەت بۆ خۆیــان دا دەنــا، وەکوکاژ مارکســیەتیان لەبەر خۆیان دادڕی و وردە، وردە لێی دوورکەوتنەوە. ئەوەی جێگای تێڕامانە لەکوردســتان، هەموو حیزب و ڕێکخراوە مارکســیەکان دوژمنی بابەکوشتەی یەکترن. هیچیان ئامادەنین لەگەڵ حیزبێکی مارکسی لەخۆیان نزیک، هاوکاری و ڕێکەوتن لەگەڵ یەکتر بکەن، کە خاڵی لەیەک چونیــان زۆرە. بەڵام ئامادەن لەگەڵ پارتێکی بــۆرژوای دواکەوتوو، هاوپەیمانی بکــەن، یاخــود لەبەرەیەک کۆببنەوە. ئەوە بۆ حیزبە نەتەوەییەکانیش ڕاســتە، بــۆ حیزبە ئیســلامیەکانیش هەر ڕاســتە، لەبەرئــەوەی هەر هەمویــان ئەوی تر بەجێگرەوە و میراتگری خۆیان دەزانن و، بەرامبەرەکەیان بە لادەرو چەواشەکارو گومڕا دەزانن.

# مام پیرداودو ئاوێنه

لەو ســەردەمە، لەناو کۆمەڵگای ئێمە کەم کەس هەبوو، بۆ ســەیرکردنی قەدوو باڵای خۆی، ئاوێنەی یەک مەتر درێژی لەماڵەوە هەبێ. تەنها ئاوێنەیەکی بچوک لە ماڵان هەبوو، بۆ ڕیش تاشین. ئەو ماڵانەی بوکی تازەیان هێنابوو، ئەو جۆرە ئاوێنەی لێ دەســتدەکەوت. زۆر لەو ماڵانە ســندووقێکی دار، کە دوو سێ وێنەی (بوراق)یان لەســەر دەنەخشــاند، یان لەســەر شوشەی ســندووقەکان، وێنەکان سەریان کچ بوو، جەستەشیان ئەسپ یان ماین بوو، پێیان دەگوت: ( دوڵدری) ئیمامی عەلی!! وێنەیەکی کچی کافرۆش بەدیوار هەڵدەواســرا، ئەوشتانە نیشانی دەدا ئەو ماڵە بوکی نوێی لێیە، پێی دەگوترێ: بوکی ســاڵێ.

ڕۆژێــک حاجی پیــرداودی ئامۆزای گەورەی باوکم، پێمــان دەگوت: مامە. کەس نەیدەزانــی ئامۆزای باوکمــە، بەڵکوو وایاندەزانی برا گــەورەی باوکمە، هەرواش بــوو. لەبەرئــەوەی لەگەنجیــەوە شــیوعی و چەپ بوو، زۆر لەگــەڵ ئێمە کراوەو ڕاشــکاوبوو. ڕۆژێــک چــوە ژوورەکەی من و نایلەی هاوســەرم، ســەیری ئاوێنە گەورەکــەی دەکرد. کاتێک زانیم، هەتا دەنگی تێدایە جنێوان دەدا!! پڕ بەدەمی تــف دەهاوێــژێ. من چاک دەمزانی، لەمامم زیاتر کەس لەژوورەوە نییە!! کاتێک چوومــە ژوورەوە ئاوێنەکــەی لەگەڵ تف ســواق دابوو. بەخــۆی دەگوت: (تف، ســەگی سەگبابی قوتە میتحۆی ورگن، دەڵێی بۆقی ئاوسی)!!

گوتم: ئەوە چیتە مامە؟!!

گوتــی: کوڕم، من چەند ســاڵە خۆم ئاوا نەدیوە، لەوەتــەی هەم، ڕقم لەوجۆرە پیــاوە ورگنانــە دەبێتەوە، ئێوە چۆن بەرگەتان گرتوە، تا ئێســتا دەعبای وەک من لەبەرچاوتان هاتوچۆ بکات؟!!

لــەو ڕۆژەوە دەســتی بــە ڕێژیم کرد، هەتا خۆی کز کرد، دەیگوت: ئێســتاکە بە بەشەران دەچم.

# مانگای سیاسی

دڕندایەتی سەدام و بەعس ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە تەوژمتر دەبوو. بۆ خێزانێکی وەک ئێمە کە پێشینەی سیاسیمان هەبوو، ژیان زۆرئەستەم بوو. چەندین کەس لەسەر سروودێکی شوان پەروەر لەسێدارە دەدرا. چەوسانەوە و پاکتاوی نەتەوەی کورد لە لوتکەدا بوو، بەهاوڵاتی ژمارە سێش ئێمەیان قبوڵ نەبوو. دڕندایەتی بەعس هەموو سنوورێکی تێپەڕاند، گەرمەی گواستنەوەی گوندە شاخاویەکان بووبۆ ناو کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکان. ئێمە ئۆتۆمبێلی بارهەڵگرمان پێ بوو، شۆفێری گواستنەوەوگەیاندن بوین، فەرمانگەکەمان لەسەر شەقامی شەستی بوو لای سایلۆ. ڕەوانەی سنوریان دەکردین بۆ گواستنەوەی مەڕو ماڵاتی دێهاتیەکان، لە مەڕو بزن وگا و گۆلک و ...هتد. لە هاوینی ١٩٧٧ ،گەرمەی هێنانەخواری گوندنشینەکانی ناوچە شاخاویەکان بوو. ئێمە، چوار بۆ پێنج بارهەڵگر، نێردراین بۆ گوندەکانی، چامەو شێروان مەزن، (دەکەوێتە ناوچەی مێرگەسور)، بۆ ئەوەی مانگاو جوانەگاو، گولکەکانیان بار بکەین. من و یاسین یابە و خالید شیینە و سالحۆک بوین، (داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر کەسی ترمان لەگەڵ بووبێ و ناوم لەبیر نەمابێت)، لە گوندی چامە و شێروان مەزن، مانگا و گاوگۆلکمان بارکرد. دنیا گەرم بوو، نوسراویان بۆ کردین بۆ فەرمانگەی کشتوکاڵی پارێزگای بەسرە، کە لە گوڕنە بوو. هەر ئۆتۆمبێلێک چەندین مانگا و گۆلکمان پێیە. بەرێکەوتین، بەدرێژایی ئەو ڕێگایە ئاویان نەخواردبوو، کە گەیشتینە گوڕنە لە پارێزگای بەسرە، فەرمانگەیەکی کشتوکاڵی لێبوو. یەک دوو فەرمانبەر لەگەڵمان هاتن، بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان بژمێرن. سالحۆک کەمێک لە ئێمە بەتەمەنتر بوو، پێی گوتن: با ئۆتۆمبێلەکان ببەینە شوێنێک بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان ئاو بخۆنەوە. دێتەوە یادم، گوڕنە ئاوێکی وەک دەریاچەی لێبوو، ئۆتۆمبێلەکانمان لای تۆپەڵە گڵێک وەستاند، یەک لەدوای یەک ئۆتۆمبێلەکانمان خاڵی کرد. زۆرمان پێ خۆش بوو پێش ئەوەی ڕادەستیان بکەین تێر ئاویان بکەین. ئاژەڵەکانمان لێ خوڕی، چاویان بە ئاو کەوت، لەچامەو شێروان مەزنەوە

ئاویان نەخواردبوەوە، پێشبینیمان دەکرد هەر یەکێکیان بیست بۆ سی لیتر ئاو بخۆنــەوە. بــەڵام، کە دەمیان لە ئاوەکە نا، یەک قومیان نەخواردەوە. ســەریان ڕاوەشــاند، یەک لەدوای یەک دوور کەوتنــەوە بۆ قەراغی ئاوەکە، ئاوێری گوڕنە ســوێرو بۆگەنیــوە!! هەر چوارمــان ســەیری یەکتریمان کرد، ئەگــەر لەبەر ئەو دوو فەرمانبــەرە عەرەبــە نەبوایە، ڕەنگــە تێر بۆ ئەو مانگایانــە بگریابایین. زوو پســوولەی ڕادەســتە مان وەرگرت، چوینە ناو بەســرە، ئۆتۆمبێلەکانمان ڕاگرت. زۆر خەمباربوین، ئاخر مانگایەک بەئاوی چامە و شــێروان مەزن گەورە بوو بێ، کــوا ئاوی بەســرەی پێ دەخورێتــەوە؟!! دەمگوت: ئاخر تاوانیــان چیە مانگای کوردانن، بۆ دەبێ ســزا بدرێن بە دوورخرانەوە.

هەر یەکەمان شتێکمان دەگوت، یەک دەیگوت: ئەگەر پیاو بم دەبمە پێشمەرگە، تۆڵــەی ئەو مانگایانە لە فاشســتەکان وەردەگرمەوە. هەر چوارمان کە ســەیری یەکتریمــان دەکــرد، لەچــاوی هەمووومــان تۆڵەکردنــەوەو بەرەنگاری فاشیســت دەخوێنرایەوە. ئێســتا لەدوای چل ســاڵ، کە دەگەینە یەکتر جار نییە باسی ئەو مانگا دوورخراوە سیاســیانە نەکەین؟!! کەوا تاوانیان تەنها ئەوەبوو، گاوگۆلکی کوردان بوون. گەیشتمە ئەو باوەڕەی هەر ئێمە هاوڵاتی پلە دوو نین، بەڵکو گاو گۆلکەکانیشــمان مانگای پلە دوون، لەو وڵاتەی ناو عێراقی عەرەبیە.

کاتێــک چەتەکانی ئۆردوگان لــە عەفرین، بزن و کاریلەکانــی کوردانیان لەدوای ئۆتۆمبێلەکان بارکردبوو، بۆمن هەمان ئازاری هەبوو، قەتماغەی برینی چل ساڵ لەپێش ئێستام کولایەوە. دیمەنی دوور خستنەوەی ئەو مانگایانە و، ڕاگواستنی گوندە سنوریەکان، ڕۆژ بەرۆژ گوریسی ڕق و تۆڵەی ئەستورتر دەکردین، بەرامبەر ڕژێمــی بەعــس. بۆیە کە دەچوین بۆ بەغــدا، لەخوار چیای حەمرین بەدەســتی ڕاست، غەرە تەمۆخ و بەرد هەیە، پێی دەڵێن ئەوە (پیاوچاکە)، هەندێک دەڵێن ئەوە گۆڕی حەسەن کوردییە، هەندێک دەڵێن گۆڕی حەسەن بڵباسە، بەهەرحاڵ ئەوێ سنوری کوردستانە بەگوتەی خەڵک. ئێمەش، من و خالید شینە و یاسین یابــە و فەرخ و ســیامەند، هیچی شــاراوەمان لەگەڵ یەکترنەبوو. شــەوانە، ئەو ســنورەمان تۆخ دەکردەوە، زۆرجار خالیدشــینە بەردەکانی پێ دەگواستینەوە، بۆ ئەوەی چەند مەترێک سنوری کوردستان فراوان تر بکەین. ئێمە لە خۆمانەوە ئەو کارەمان دەکرد، هیچمان ڕێکخستنی پارتێک نەبوین و کەس ئێمەی ئەرکدار

نەکردبوو بۆ ئەو کارە. هەندێک جار خالید شینە بەردی زیادیشی لەکوردستان لەگەڵ خۆی دێنا، چەندجار من کۆنە کورتەکی مرادخانی و جەمەدانی باوکم، وەک داوەری بێستان لێ دەکرد و لەو سنورەم دەچەقاند، بۆ ئەوەی تخوبی کوردان بۆ لای عەرەبان بگوێزینەوە و مەملەکەتی خۆمان فراوان بکەین. ڕۆژی دوایی لە شاری (عزێم) جەیشی شەعبی دەهاتن، کورتەک و جامانەی باوکمیان دەسوتاند، بەردەکانیان بڵاودەکرد. تا وای لێهات، تیمی گەڕۆکیان بۆ ئەو شەقامە دانا. ئێمە لە کۆتایی حەفتاکان ئەوکارەمان دەکرد، بە ترۆپکی حەمرین ڕازی نەبوین، گۆڕی حەسەن کوردیمان بە تخوب دەزانی، کەچی ئێستا لەسایەی حوکمڕانی خراپ، ئەو تخوبەیان هێناوەتە پردێ؟!

حاجی پیرداودی ئامۆزای بابم ماوەیەک بوو، بەگەڵ پارتی کارتۆنی کەوتبوو کە حکومەتی بەعس دروستی کردبوو. یەک لەو برادەرانەی مام پیرداود، کوڕێکی خەڵکی چەمەزەردە بوو بەناوی (ن) کە باوکی شیوعی بوو. واتە: کوڕ پارتی کارتۆنی و حاجی باوکی شیوعی بوو. بەڵام زۆرجار لەدژی حیزبی شیوعی پڕوپاگەندەی نالۆژیکی و پاشوەڕۆ دەکرا، بۆ ئەوەی خەڵک دەورە لەو حیزبە نەدا و لێی بتەکێتەوە. ئەو پڕوپاگەندانەش لەناو کۆمەڵگای ئێمە کاریگەری هەبوو. کاک (ن) لەگەڵ چەند برادەرێکی، ڕێک کەوتبوون بچنە ماڵی (ن)، مام حاجی باوکی توڕە بکەن کە شیوعی بوو. مام حاجی چەند ساڵ بوو ژنی مردبوو، واتە دایکی (ن). تەنها، ژنی (ن) کابانی ماڵ بو. لەکاتێکدا وەک پێشوو لەسەری ڕێک کەوتبوون لەماڵی (ن) مام حاجی بەخێرهاتنیان دەکات. ئەوانیش دەڵێن: بەڕاستی زۆر عەیبە، شیوعیەکان لەدایک و خوشکی خۆیان ناپرینگێنەوە، جیاوازی پێ ناکەن. مام حاجیش زۆر توڕە دەبێ، بە بوکەکەی کە خێزانی (ن) ی کوڕی دەبێ، دەڵێت: ئاوێکم بۆ بێنە. کاتێ دێتە ژوورەوە پێی دەڵێ: کچم پرسیارت لێ دەکەم ڕاستم وەڵام بدەوە. ئەویش دەڵێ: بەڵێ مامە. حاجی دەڵێ: ئەوە چەند ساڵە تۆ بوکی منی، منیش بێ ژنم، هەتا ئێستا چەند جار لەگەڵت خەوتوم؟!! ئەویش دەڵێ: ئەیەڕۆ ئەوە تێکچوی؟!! مام حاجی دەڵێ: بەو گەوادەی مێردت بڵێ، خۆ بوک لە کچ و خوشک باشترە بۆ گ.... !! (ن) و برادەرەکانی دەست دەکەن بە پێکەنین و لەترسی حاجی وە دەردەکەون.

## ماڵی زیادەمان نییە

ئەمنێکـی عەرەبی بەد فەسـاڵمان لەقوشـتەپە دراوسـێ بوو، نـاوی (گبریل) بوو. ژنێکی گەنج و ژن خوشـکێکی گەنج کە لەلای مێردی دانەدەنیشـت، ڕۆژانە گبریل دەچوە دائیرەی ئەمنی قوشتەپە، ئەو دوو ژنە ئاودیوی ماڵی ئێمە ومامم دەبوون. ڕۆژێک مامم لە ئاودەسـت بوو، ژن خوشکی گبریل سۆندەی ئاوی برد، ئـاوی بـە گەڵ و گونی مامـم دا کرد، مامم هاتــە دەرەوە گوتی: خۆت بەمنەوە گرفتـار مەکـە، هیچی لە خۆمان زیـادم نییە، خوا خوامە حاجی بەسـێ چاوی لەدەسـتی خەڵکی نەبێ. ئینجا من (هی تالوکانم نەماوە) برۆ گژ ئەو گەنجەی، (دەسـتی بۆ من درێژکرد)، منیش بە ڕۆح لێیان دەترسـام، نەوەک تەڵە بێ و دائیرەی ئەمن بۆ منی نابێتەوە، بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە کوشتنم بدەن بەدەستی گبریـل و لەبەرچـاوی خەڵـک نـاوی خێزانەکەمـان بزرێنن، بۆیە بە دڵشـکاوی دەگەڕانەوە ماڵی خۆیان.

## جەماعەتی ئێمە دەگرن

شـاری هەولێر شـێتی زۆر بـوو، بەڵام (هەیاس) کە لـە تەعجیل لەخوار کۆتری سـەلام دەژیـا، شـێتێکی زۆر بەهێـزو زەبر وەشـێن بوو. (مەحەمـەدی حاجی باتاسـی) ئەویش شـێت بوو، هەڵە نەبـم خەڵکی گوندی (بیـرە عارەبان بوو)، بەڵام هەر بە باتاسی مەشهور بوو. مەحەمەد هەتا خوا حەزکا کەڵەگەت تۆزێک بە لووتی قسـەی دەکرد (گن بوو)، زۆری حەز بە لاقەی ماکەر دەکرد، زۆرجار، ناو لەپی دەستی بەنێوچاوانی دەکێشاو شەقەی لێ دێنا، دەیگوت: کوێربم ماڵی فلان ماکەرێکیان کڕیوە کلکی دەڵێی تەشـیە، ئەوەندە باریک و جوانە.

ڕۆژێـک بڕیـار درابـوو، هەموو شـێتەکانی ناو هەولێـر کۆبکەنـەوە، بیانبەن بۆ شـاری (بەعقوبە) بۆ شـێتخانە. کاتێک مەحەمەدە شێت بەلای کۆتری سەلام و

چایخانــەی قەرداران دا ڕادەکات، بەرەو پردی تەعجیل. هەیاس هەرای دەکاتێ، دەڵــێ: مەحەمەد بۆ وا ڕادەکەیــت؟ مەحەمەد بەدەم ڕاکردنەوە دەڵێ: بەدوامدا ڕاکە، لەناو شــاری جەماعەتی ئێمە دەگرن.

## سادەیی ژیانی پێشوو

پورێکــم هەبوو ناوی ئەســمەربوو، لەدایکم گەورەتربوو، بەڵام شــوی نەکردبوو، لەبەرئەوەی کەم ئەقڵ بوو، بەشێتیان دەزانی. ماوەیەک بوو لە لای ئێمە دەژیا، ماوەیــەک بــوو لەهەولێر بووم، شــەوێک من و هیدایەت چوینــەوە گوند، بۆ لای دایکم و خوشک و براکانم. کە گەیشتینە ماڵی ئێمە، دایکم گوتی: ئەگەر بگەیە هیدایــەت کەســت وەبیر نامێنــێ، ئەوە چەند ڕۆژە نەهاتیەوە؟! پلکە ئەســمەر، وەک قەتی ئێمە نەدیبێت وا بەوردی ســەیری دەکردین!! دایکم گوتی: ئەســمەر، ئەوە نایان ناســیەوە، ئــەوە هیدایەتە ئەوە ئەحمەدی خوشــکە زاتە؟!! ئەویش گوتــی: بەخــوای ئەمن ئەو شــتانە نازانم، وەکی تو (ئاوقــات) نیمە، ئەوەندەی دەزانــم، کەرو جاشــک هــەر تێکەڵاوە!! ڕووم لــە هیدایەت کــردو، گوتم: دەبێ کاممــان کەرەکەبین و کام جاشــک؟!! هیدایەت، دە ســاڵ لەمــن گەورەتر بوو، گوتــی: بەو حســابەی بێ مــن کەرەکەم. ڕوی لەمن کرد گوتی: ســەگباب چیتر لەگەڵ تۆ ناگەڕێم چی باشــم بۆ نایە!!

ماوەیەک بوو، لە چوون بۆ ئاش و مانگا چاکردن حەسابوومەوە، شەهید کەریم و هەردی دەچوونە ئاش، لەیەخەی منیان کردبوەوە. مانگا چاکردنیش فەرمانگەی کشتوکاڵی قوشتەپەی دەویست، بە دەستکرد مانگایان چاک دەکرد. بە (بەزری) جوانــەگای ئەلبانــی. ئەو مانگایەی کارمەندی کشــتوکاڵی چاکــی کردبایە، واتە (کــەڵ بدرایە)، ئاوس دەبوو، پارەی زیاتــری دەکرد. لەبیرمە کاخەزێکیان دەدا بە خاوەنی مانگایەکە. تازە کارەبا هاتبوە گوندەکان، حاجی (ق) چوبوە مەیدانی هەولێر، مانگاکە بفرۆشــێ. کاخەزی چاکردنی لەخێزانــی وەرگرتبوو لە گیرفانی نابــوو. لەمەیــدان هــەرای کردبوو: ئەو مانگایە بەشــەرتی ئاوســی لە (بەزری) جوانەگای ئەلبان، کاخەزی چاکردن و مێژوەکەی لەسەر پشتی مانگاکە دانابوو.

کاتێک سەیری کاخەزەکە دەکەن، دەڵێن: (حاجی ئەوە خۆ کارەباش قەرزدارە) نــەک ئاوس بێ!! دیارە خێزانی لەماڵەوە ئەو کاخەزەی وە بەردەســتی هاتبوو، دابویە حاجی هەردووک نەخوێندەواربوون.

# مارەکردنی منداڵ

لەکۆتایی حەفتاکان کە لەگواســتنەوە و گەیاندن شــۆفێربووم، ڕۆژێک چووم بۆ ماڵــی حاجــی عەبدوڵڵای خاڵــم لەهەولێر. خاڵم و حاجی ســێودین ڕێکەوتبوون کچەکانیان بدەن بە کوڕەکانی یەکتر. کچەکان تەمەنیان لە نێوان، نۆ بۆ دەساڵ دابوو، بڕیاریان دابوو مارەیان بکەن، تاوەکو گەورە دەبن ئەوکات بیانگوێزنەوە. بۆیــە کــە خاڵۆژنــم چاوی بــە من کەوت گوتی: بــاش بوو هاتی، پــاش نیوەڕۆ قــازی هەولێــر دێت ئەو کچانە لە کوڕەکان مــارە دەکات، بەڵام هیچ کەس بانگ نەکرابــوو لەخزمــەکان، چونکە دوو منداڵ مارە دەکران، تەنها باوکیان ئامادەبوو وەک سەرپەرشــتیاری شــەرعی. واتە حاجی عەبدوڵڵای خاڵم و حاجی ســێودین لەجیاتــی هــەر چوار کچ و کوڕەکان وەکیل بــوون. ئەوان بێئاگا. بەڵام ماوەیەک پێــش ئەوکاتــە قازی هەولێــر چەند خەنجەرێکــی لەنــاو دادگا لێدرابوو لەلایەن کابرایەکی خۆشــناو، کە قازی لەســەری کردبوو ژنەکەی تەڵاق بدات، بۆیە قازی کە هاتە ماڵی خاڵم پۆلیســێکی لەگەڵدا بوو، ئامادەباش بەچەکەوە.

ئــەوکات خەڵک نوێنی لەســەر بۆفیــە دادەنا هەتا بن میچــی خانوو، بۆ ئەوەی میوان هەموو دۆشــەک و لێفە و بالیفەکان بە ئاســانی بژمێرێ. (پێی دەگوترا: ئەســتێرک) تۆڕێکــی گەورەیان بە ســەر نوێنــەکان دادەدا. خاڵۆژنم ئەو هەموو دۆشــەکە لۆکــە و خوریــە گەورە گــەورەی ســازکردبوو، پۆلیســەکە لای دەرگا وەستابوو، بۆ پارێزگاری کردن لە قازی. قازی دەستی بەو کڵێشە کرد کە پێش مارەکردن دەیڵێ. ئەو هەموو دۆشــەک و نوێنەی ماڵی خاڵم بەســەرو ناوشــانی قازی کەوت، ئەو تۆڕە کەوتە ســەری وەک لە فیلمەکان بە (تۆڕ) شێروپڵنگەکان دەگرن. پۆلیسەکە کەوتە تورِ تورە لێدان و هەردووک قاچی جووت کرد لەزەوی دا، ئامادەباش دەســت لەســەر چەکەکەی، وەک ئێمە بەنیازی کارێکی خراپ و

نەخــوازراو بین. بەئازایی نوێنەکانم لەســەر قازی وەلانــا، تۆڕەکەم لێ کردەوە، مەندیلم داوە دەستی، کە بریتی بوو لە شتێکی سووری وەکو مەنجەڵ. بەشێنەیی ئاوێکمــدا بەقــازی، بــەڵام، کاکــی پۆلیس هــەر ئامادەباش وەســتابوو تا قازی فەرمانی پێکرد، تفەنگەکەی بێنێتە خوارەوەو قاچی لەبارییەک جیا بکاتەوە. من لەبــەر پێکەنیــن چیتر نەمتوانی لەوێ بوەســتم. قازی بــە خاڵمی گوتبوو: ئەوە کوڕتە؟خاڵم گوتبوی: نا خوارزامە. قازی گوتبوی: ئەو خوارزایەت نەبوایە لەژێر ئەو هەموو نوێنە دەخنکام.

بەداخەوە ئەو چوار قوربانییەی دەستی نەریتی کۆمەڵگا، تا کوڕو کچیان شویان کردو ژنیان هێنا، لە جەنگی بەردەوام دابوون، بە درێژایی سیوپێنج ساڵ تەمەن.

# با شێخ بفەرمێ چیمەنتۆ،چیمەنتۆ

لەفەرمانگەی گواســتنەوەی هەولێــر، هەموو ڕۆژێک جگەلە ڕۆژانی هەینی، چەند بارهەڵگرێــک، ڕەوانەی کارگەی چیمەنتۆی بــادوش و حەمام عەلی دەکراین. بۆ ئــەوەی هەریەکەمان بڕی پازدە تــۆن چیمەنتۆ بێنین بۆ هەولێر. دەچوینە پێش نوســینگەی (مەکتەب) چیمەنتــۆ کــە دەکەوتە ســەر جادەی ســی مەتری نزیک فرنــی ســەمونی ئۆتۆماتیکی (نزیک پێنج ڕیانی (بەتەمای خوای)ئێســتا). ســێ چوارکارمەندی لێبوو، لە برا مەسیحیەکانی عەنکاوە بوون، یەکێکیان ناوی یوسف بــوو. ئــەو کارمەندانە، چیمەنتۆیان دابەش دەکرد، هــەر پێنج تۆن بۆ خانوێک. ئێمــە لەبــەر دەرگا، لای ئۆتۆمبێلــەکان چاوەڕوانمــان دەکــرد، بۆ ئــەوەی بەم شــێوەیە بارەکان خاڵی بکرێن. کاتێک پیکەب تۆیۆتایەکی ســوور لە بەردەممان وەســتا، دوو کەس هاتنە خوارەوە، چوون بۆ لای کارمەندە مەســیحیەکان. یەک لە پشــتەوەی پیکەب دابەزی، کەرتە جەمەدانییەکی بۆری لەســەری بوو، هەتا خــوا حــەز دەکات چڵکن دیاربوو، لە پشــتەوەی پیکەب ئەوەنــدەی با چووبوە ناو دەمی، وەک فەرخە چۆلەکە دەمی وشــک ببوو. چاوی بە شــێرەی ئاوکەوت دەمــی پێوەنا، شــێرەکەی هەموو کــردەوە. ئەوکاتە، ئاوی هەولێــر بەهێز بوو، فشاری زۆر بوو، هێندەی نەمابوو، گوپی بدڕێنێ،. دیاربوو زگی پڕ ئاو بوو، هەر

دەکۆخی ئاوی دەهێنایەوە. ئێمە ئانیشـکمان لەسـەر بۆدی پیکابەکە دانا بوو. گوڕی کردە باسکی من، لەسەر پیکەبەکەی لا برد. خەریک بوو چەناگەم بشکێ، پاشان ئەوانی تر هەموی لەدەوری پیکەبەکە دوورخستەوەو، گوتی: ئێوە دەزانن ئەوپیکەبە هی کێیە؟ ئەوە کوڕی فلان شێخە، بە باب و باپیرەوە بەقوربانی بم. شـێخ فلان، کاتێک چووبوە ئاشـی، ئاشەوان باراشـەکانی بۆ لێنەکردبوو، تورە بـوو، ئاگری لەهەردوو چاوی هەسـتابوو. گۆپاڵی لە باراشـە گەنمەکان دابوو، (لەنێوان قسەکانیشـدا دەیگوت: بەباب و باپیـرەوە بەقوربانی بم، لەباپیرمەوە ئێمە سـەگی بەر دەرگای ماڵی شـێخین) لەنەعرەتەی دابـوو فەرمووبوی: ئارد، ئارد. کاتێک سەیری جەواڵان دەکەن، هەموی بوە بە ئارد!! منیش گوتم: ئەدی خێرە ئێسـتا تەشریفی هێناوە بۆ ئێرە؟ گوتی: دوو کیس چیمەنتۆمان دەوێ بۆ پێـش دەرگای تەکیـە. منیش، گوتم: ئەو کارمەندانە هەموو غەیرە دینن گوناهە شـێخ داوای دوو کیـس چیمەنتۆ لەو کافرانە بـکات. ئەو پیکابە پڕ خۆڵ بکەن، یا شـێخ گۆپاڵی لێ بداو بفەرموێ چیمەنتۆ، چیمەنتۆ!! تۆش بیهێنە خوارەوە، دەتوانـن هەر بیکەن بە کارگەی چیمەنتۆ.

ئـەو سـەردەمە من (مەولـود) و (ئەگلەنجە)ی شارسـتانەکانی ناو هەولێرم بۆ لێـک جیانەدەکرایـەوە، کە بـەزۆری تورکمانەکان کە مەولودیـان دەکرد، دەف لێدان و گۆرانی زۆر خۆشیان دەگوت، قەت لەبیرم ناچێ، ئاخر ئەوان ئەفەندیان زۆر پـێ گەورەیـە، بۆیـە هەتـا دەنگیان تێدابـوو هاواریان دەکـرد: پێغەمبەرە ئەفەندی سەلەوات!!

# شێواندنی کەسایەتی

لەو سـەردەمە لەهەولێر، تەق و تۆق و چالاکی مەفرەزە سـەرەتاییەکانی هێزی پێشـمەرگە کەمتر بوو، وەک لە سـلێمانی. دەیان گوت: لە سـلێمانی شـەوانە جارجارە تەقەدەکرێ. زۆرجار، بارمان بۆ سلێمانی دەبرد، یان بلۆک بۆ چوارتاو کەناروێ، لەسـلێمانی دەمانەوە، بەس بۆ ئەوەی گوێمان لە دوو تەقەی تفەنگ بـێ، بۆ ماوەیـەک دڵی خۆمانی پێ خۆش بکەین و ئومێدی لەسـەر هەڵبچنین.

هەتا دەهات ژمارەی ئەو مەفرەزەو جاشـانە زیادی دەکرد کە سـەرۆک جاش و مەفرەزە تایبەتەکان، زۆربەی لە کۆنە پێشـمەرگەکانی پارتی بوون. یەک لەوانە (عومەر حەسـەن) کە لەگەڵ (قەرۆ) پێشمەرگەبوو.

رۆژێک لەسـەر شەقامی لای یاریگای تۆپی پێ وەستابووم، کاتێک ئۆتۆمبێلێکی شـۆفرلێتی سـوور لەبەردەمم وەستا، سـەیرم کرد، عومەرحەسـەن و خەسرەو بـوون، ئێمـە منداڵی یەک گوند بوین، باوکی عومەرحەسـەن دۆسـتی شـیوعی بوو، خەسـرەویش کۆنە شـیوعی بـوو. بەلام ئەوکات عومـەر مەفرەزەی ئەمنی وەرگرتبوو. بەپێکەنینەوە گوتیان: سوار بە، دائیرەی ئەمن تۆی دەوێ. لەکاتێکدا هـەر دووکیان ئەگەر پارێزگاریان لەمن نەکردبایە، ئەوا شـتی خراپیان بەرامبەر من هەرگیز نەدەکرد، عومەر گوتی: دەچیەوە قوشـتەپە؟

منیش گوتم: بەڵێ. سـواربووم، لەکاتێکدا ئەو شـوێنەی منی لێ وەسـتابووم، تا ڕادەیەک لەدەرەوەی شـاربوو، بەڵام ئەوان بەرەو ناو شـار گەڕانەوە، لەکوێ خەڵکـی ناوچەی ئێمە کۆدەبوونەوە، پاش کڕینی شـتومەک و بازاڕکردن، ئینجا دەگەڕانـەوە گوندەکانیـان، لەسـەرەخۆ بەوێدا سـوڕایەوە!! خەریـک بوو ببمە قەترەیـەک ئـاو. ئەوانیش هـەر پێدەکەنیـن گوتم: عومەر ئەگـەر نەڕۆی، خۆم فـڕێ دەدەمـە خوارەوە. گوتـی: بۆ خەڵک جنێو بە من بـدەن بەتەنها، با بڵێن ئەحمـەدی عەلی حاجی تاهیریش بۆتە جاش!! گوتی: ئەگەر بەیانی بە گۆشـت و جـەرگ خـواردن دەعوەتمان بکـەی دەڕۆین. فەرمانگەی ئێـوە جەرگێکی زۆر نایابـی لێیە، بۆ خواردنی بەیانیـان. گوتم: کاکە بەس بڕۆ، بەیانی حەز دەکەی هەمـوو جاشەکانیشـت بێنـە. گوتـی: نا بەس من و خەسـرۆ دێیـن. بەو حاڵە منیان بردەوە بۆ قوشـتەپە، لەوێ دەیگوت: ئەگەر ئەمنەکانی قوشـتەپە لەگەڵ ئێمـە بتبینـن، ئەوا بانگت ناکەن، وازت لێ دێنن. گوتم: جا بۆ پارەی ئەوەشـم لێوەرناگری پاش جەرگ خواردنەکەی بەیانی؟!! (عومەرحەسـەن دوای ڕاپەڕین لە کەرکوک کوژرا).

# ئەحمەد بەخۆی قونی پیسە

هاوینی ١٩٨١، لە ڕێگەی کادیری حیزبی شیوعی لە شاری هەولێر بەناوی شەهید (سالار)دووبارە پەیوەندیم کردبوەوە بە حیزب. نامەیەکی شەهید (ڕۆستەم) م بەدەست گەیشتبوو، ڕۆژی سێبۆ چوار جار دەمخوێندەوە. یەک دوو ڕۆژ بوو هەستم دەکرد لە قوشتەپە، فەرمانگەی ئاسایش (دائیرەی ئەمن)ی قوشتەپە بەدوامەوە بن، بۆیە وام بە باش زانی چەند ڕۆژێک نەچمەوە قوشتەپە. چوومە لای ماڵی خاڵم، بارهەڵگرەکەم لای دیواری ماڵی سەید حەسەن جووت کرد. دراوسێی ماڵی خاڵم بوو. چوومە ژوورەوە، خاڵۆژنم وەک هەمیشە لە قسانی گرتم، هەر ئەوەندەم زانی سێ چوار ئەمن بەچەکەوە هاتنە حەوشە، گوتیان: کوا شۆفێری ئەو لۆریە؟!

تازە نەمدەتوانی ڕابکەم، چونکە یەک ژووربوو، ئەوانیش لەدەرگا!! گوتم: منم. بردمیانە لای ئۆتۆمبێلەکە، لەپەنای ئۆتۆمبێل، دیوار بە بۆیە هەموی نوسرابوو. چی خراپە، بە سەدام و بەعس کرابوو!! خەڵکی گەڕەک تێمان هاڵان، سەیری دەست و پلیان کردم هیچ بۆیەی پێوەنەبوو، گوتیان: ئەوە بە چیت لێکردۆتەوە؟! ناوبارهەڵگرەکە هەموی گەڕان بەدوای بۆیە و شتی دژی سەدام، جا وەرە ئەوەیە لە کۆلکەی بڕەوییەوە بەسەر بەرازیدا بکەوی!! زۆرم گوت: من ئاگام لەهیچ نییە، بەڵام ئەوان دەیانگوت: دیارە تۆ ئەو (لۆری)یە دەکەیە پەنا، لە هەر شوێنێک بتانەوێ بینوسن لەدژی سەیدو لرەئیس و حیزبی بەعس. برادەرێکی خاڵم، دەستی دەڕۆیشت، لەو دەمە پەیدا بوو، خاڵۆژنم پێی گوتبو: ئەحمەد لەخۆڕا (قونی پیسە) ئەگەر فریای نەکەوی بزانن پێشینەی سیاسی هەیە دەیکوژن. باش بوو ڕازی کردن، کەوا لەگەڵ خۆیان نەمبەن.

(لەناو خەڵکی ئاسایی ئەوەی پێشینەی سیاسی هەبوایە دەیانگوت فلان (قونی پیسە).

# ژن بەژنە

دوو پیـاوی بەتەمەن کچیان هەبـوو کوڕیان نەبوو. ڕیکەوتبوون ژن بەژن بکەن، کچەکانیـان بـدەن بەیەکتـری. لەبیرمە بابـم بەیەکێکیانی گـوت: کچەکەت زۆر منداڵە، ئەو منداڵانە کوا لەتەمەنی ئێوە دەوەشێنەوە؟!! لەوەڵامدا گوتی: وەستا عەلی ئەدی بەشـیربایی بدەم؟!! (شـیربایی واتە (شـیر بەها) نرخی ئەو شیرو بەخێوکردنـە). کـوڕم نییـە ژن بە ژنی بۆ بکەم، ناچـارم بۆ خۆمی بەژن بدەم. دیـارە ئەوکات باوبـوو، هەندێک کەس دەچوون خۆیان لەبوک و زاوا دەگرت، تا بزانن چی دەڵێن و چی دەکەن. ئەو پیاوەی باوکم لۆمەی کرد، خۆیان لێگرتبوو. کـە لەبـوک چووبـوە ژوورەوە، بوک منداڵ بـوو، لەبەردەسـتی هەڵاتبوو، چوو بوە سـەر (ئەسـتێڕکی) نوێنان. تا دەسـتی پێی ڕانەگا، ئەویش نەیزانیوە بەچ بیانویـەک بیهێنێتـە خوارەوە، پێی گوتبو: مەترسـێ کچی خۆم، بەخوای نیازی خراپـم نییـە. دایکەکەم، تەنهـا دەمەوێ گۆرەویەکانت لەپـێ دابکەنم، گۆرەوی شەوان لەپێی نەکەیتەوە بۆ چاوەکانت خراپە، چاوت کول دەبن. وەرە خوارەوە بـا گۆرەویەکانـت لەپێ داکەنم، بەڵام کوا (فرۆج) بـاوەڕ بە ڕێوی دەکات، بێتە بەرچەنگـی!! خۆی بخاتە بەر حەملەی ئەو پیرە خرتە.

# برا ئەنگۆش پیاون

من و هیدایەت بە دوو بارهەڵگری پڕلە شـەکرەوە، بەرەو شاری سۆران و ڕواندز کەوتینە ڕێ، ئەوکاتە هەرەتی گەنجیم بوو، دەمەوێ ڕووداوەکان نەبوێرم، ئەگەر بە زیانی خۆشم بێ بیان نوسم. بەهیدایەتم گوت: با نهێنییەک لە نێوان خۆمان دابنێین. گوتی: باشە. ئەگەر بەرەوڕوو بە یەکێکمان گوت: ئەوە زۆر پیاوە، واتە (نا پیاوە)!! لە گەلی عەلی بەگ دەربازبوین، شـەکرەکەمان بەسـەر دوکانەکان دابـەش کـرد، کابرایەک هەبوو، هەتا ئێمەی دەدی هەزارو یەک ڕاسـپاردەی پێ

دەسپاردین، تا لە هەولێر جاری ئاینده لەگەڵ خۆمان بۆی بێنین. من دەمویست هیدایەتیش تووشی ئەو بێگاریە بکەم لە ئایندەدا. لەناکاو(ح) پەیدابوو، گوتی: ها ئەحمەد، ماندوو نەبی چۆنی چاکی؟ گوتم: باشـم. کوڕە ئەحمەد ئەوە کێیە لەگەڵت؟ گوتم: ئەوە کاک هیدایەتە بن ئامۆزامە، خێزانەکەی ئامۆزای گەورەمە. بەهیدایەتیشـم گوت: (هەروەک ئەو نهێنییەی لەسەرەوە باسم کردوە)، هیدایەت ئـەوە مـام(ح)ە لە گەلی عەلی بەگ دەرباز بوی، لەو پیاوەی پیاوتری لێ نییە. یەکجـار زۆر پیـاوە، مام (ح)یش گوتی: برا ئەنگۆش پەخۆ پیاون پیاو!! لەگەڵ هیدایـەت سـەیرێکی یەکترمان کـرد، وەک (ح) بزانێت کـە جنێوە، چۆن ئاوای وەڵام داینەوە!!

ئێسـتاش لەگەڵ هیدایەت دەڵێین: برا ئەنگۆش پیاون.

# زیارەتی نەجەف و کەربەلا

لەگـەڵ عومەر نـەورۆز، بارمان بارکـرد بۆنەجەف و کەربـەلا. بارهەڵگرەکانمان لەمەیدانێـک ڕاگـرت، عومەر گوتی: با بچینە زیارەت زۆر خۆشـە، کاتەکە لەوێ بەسـەر دەبەین. هەر لـەدەرگای مەرقەدی ئیمام عەلـی وەژوور کەوتین، زانیان ئێمـە کوردیـن. ئەوانەی دەستکێشـی خەڵک دەکەن، زوو بـە پیرمانەوە هاتن. دەتگوت نان و پیازیان لەگەڵ خواردوین، ناویان پرسین، گوتم: ناوم ئەحمەدە، ئیتـر بووم بە ئەبو شـەهاب، هەر ئۆتۆماتیکـی عومەر گوتی: عەبدولڵام!! چوینە زیـارەت لـەدەوری ئەو قەفەزەی پڕ لـە پارەبوو. من و عومەر نـەورۆز لەفکری ئەوەیـدا بویـن، چـۆن پیاو دەسـتی بەو هەمـوو پارەیە بگات، بەخێـری ئیمام خەرجی بکات. دەستی تێوە نەدەچوو، لەگەڵ عومەر بەکوردی دەدواین، عومەر گوتی: ئەحمەد ئەوە دارێک بێنی سـەری بە قیر بکەی، لەو قەفەزەی وەربدەی، وای پـارەی لەخۆی دەهاڵێنێ، زوڵمـە بهێڵی ئەو هەموو پارەیە لێرە فرێبدرێت. دەستکێشـەکانی زیـارەت، هـەر گوێیـان لە وشـەی (زوڵمە) بوو، لـە هۆرژنی گریانیاندا، گوتیان: ئی وەڵا کاکە مەزلوم، هاتینە دەرەوە. عومەر، گوتی: دەبێ پـاش و پـاش بکشـێینەوە هەتا دەرگا. کـە چوینە ناو حەوشـەی مەرقەدەکە،

پێنج دینارمان دا بە دەستکێشـەکان. ئەو کات ئەو بڕە پارەیە زۆر بو، گوتیان: ئەگـەر دەتانەوێ هەموو شـتێک هەیـە!! بەزۆری عومەرم لەدەسـت دەرهێنان، بـەڵام نەیگوتبـوو ناوم عومەرە، یەکێکیان کە هەموو پەنجەکانی ئەنگوسـتیلەی شین و ڕەش و هەمەجۆر بوو، دەیگوت: تا خزمەتتان نەکەین نایەڵم بڕۆن، ئێوە میوانی ئێمەن.

(ڕەئیـس عورەفا)یەکی پۆلیسـمان دراوسـێ بوو، پیاوێکی چـاک، خەڵکی لای کۆیەبوو، نیمچە کۆلکە مەلابوو. باوکم خۆشـی دەویسـت دەیگوت: پیاوێکی بێ زەرەرو زیانە لە کۆمەڵگا. لەبیرمە ڕۆژێک باسی پیاوێکی بۆ باوکم دەکرد: فڵان، هێندە، هێندە پیاوێکی چاکە و بە ویقارەو بەدینەو زۆر شتی تر.. . باوکیشم تا ڕادەیەک زانیاری لەسـەر ئەو پیاوە هەبوو، کەوا جاسوسـی ئینگلیزان بوە، بۆیە گوتـی: (م،ک) چـۆن دەزانی پیاوی چاک بوە؟! ئەویش گوتی: ئەو بەرغەبابەی واتـە (بەرچەناگـە)ی شـۆڕببوەوە!! باوکـم گوتـی: کاکە گەر پیـاوی چاک بە شـۆڕبوونەوەی بەرغەبابـەی بێ، دەبوایە جوانەگا برا گـەورە بوایە، بەرغەبابەی شۆڕبۆتەوە.

# یەکەم شەڕی نێوان دوولایەن

لەهاوینـی ١٩٨١ کاتێک بارەگاکانی حیزبی شـیوعی لـە مەلەکان و وەرتێ و لە بنـاری چیای کارۆخ بـوو. چەکدارێکی ڕژێم، وا چاکە بڵێم: جاشـێکی ئەو کاتە کـە لـە کۆندا شـیوعی بوو، بەناوی (عـەولا ماویلی)، خۆی و یـازدە چەکداری تر پەیوەندیان بەحیزبی شـیوعیەوە کرد بـوو بەچەکەوە. ئەوکاتە چەک گرنگی خـۆی هەبوو بۆ شـۆڕش. یەکێتی و سۆسیالیسـت و پارتـی، زۆر نارازی دەبن. داوا دەکـەن دەڵێـن: دەبێ وەریان نەگرن و بیان کـوژن. لەپاش هەوڵێکی زۆر، سۆسیالیسـت و پارتی لەلایەن حیزبی شـیوعی قەناعەتیـان پێ دەکرێ، ئەگەر ئـەو جاشـانە وەرنەگیرێن یان سـزا بدرێـن، ڕەنگە هیچ چەکدارێکـی تری ڕژێم نەوێرێ بێتە ناو شۆڕش. بەڵام دیارە یەکێتی هەر لەسەر ڕای خۆی مکور دەبێ. بۆیـە ڕۆژێـک لە دەرگەڵە فرسـەت دێنێ دەوری عەولا ماویلـی دەگرێ و لەگەڵ

دوو کەســی تر دەکوژرێ. دەتوانین بڵێین: ئەوە یەکەم دەستپێکی شەڕی نێوان یەکێتی و شـیوعی بوو، نەک وەک هەندێ یاداشــت نوس ئەو شــەڕە نەگریســە دەگێڕنەوە بۆ شــەهیدبوونی شــەماڵ و ســەرباز، کە پاش دوو ســاڵ لە باداوانی کۆیە شــەهید بوون. بەو شــێوەیە نێوان یەکێتی و شــیوعی ناکۆکی تێکەوت و خوێن لە نێوانیان ڕژا. لەپاش کوژرانی عەولا ماویلی و دوو کەســی تر، شــەش کەســیان ڕۆیشــتنەوە ناو ڕژێم و سێ کەسیش بە دیل گیران. ئەو ڕووداوە پێش شــەڕی سێکانی بوو، هێشتا کەریمی برام شەهید نەببوو.

چەند ڕۆژێک دوای ئەو ڕووداوە، عەلی کلاشــینکۆف لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک لەوەرتێ دەچێت بۆ گەرەوانی خواروو. بەنیازی ئەوەی لەگەڵ چەند بەر پرسێکی یەکێتــی لەمزگەوتــی گەرەوان کۆببنــەوە. بۆ تاوتوێکردنی ئەو کێشــەیەی کەوا ڕویدابوو. لەلایەن حیزبی شــیوعی: هاوڕێ عەلی کلاشینکۆف و لەلایەن یەکێتی: وەســمان بــەگ نوێنەرایەتی دەکرد. کۆبوونەوەکە لەنــاو حەرەمی مزگەوت بوو. کەســیان لەوەی تریان ئەمین نەبوو، هەر لایەنەی چەند پێشــمەرگەیەکی لەگەڵ بــوە. وادیارە قســەکانیان یەکانگیر نابێ، ئەوەی ڕاســتی بێ، شــەهید کەریمی برام لەو کاتە لەحەوشــی مزگەوتی گەرەوان دەبێ، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تــر، وەک: هــاوڕێ بەکر جۆلا و شــێخ لەتیف، لەو کاتەدا لەنــاو مزگەوت لەناو کۆبوونەوەکە دەبێتە هاڕەی دەســترێژی گوللە لەیەکتر. ئەوانەی ژوورەوە ســنگ بە ســنگ یەکتر گوللە باران دەکەن، ئەوانەی دەرەوەش تەقە لە یەکتر دەکەن. بــرای بەریــزم پێشــمەرگەی دێرین کاک شــێخ لەتیف بۆی گێڕامــەوە: گوێی لە ناڵەی ئەبو ئنتیســارو سەلیم شێخ شەروانی دەبێ، (شەهید سەلیم زۆر برادەرم بوو). شێخ لەتیف کە دەچێتە ناو مزگەوت، لە سوچێکی مزگەوت ئەبو ئنتیسار ڕادەکێشــێ بۆ دەرەوە، لەو کاتە لەناو مزگەوت بەهۆی ئاگرو دوکەڵ چاو چاوی نەدیوە. بەداخەوە لەو پێکدادانە دا، سەلیم شێخ شەروانی و ئەبو ئنتیسارشەهید بوون لەگەڵ چەندین بریندار لە لایەنی حیزبی شیوعی. وەسمان بەگ و حەمەلاو و پێشــمەرگەیەکی تــری یەکێتیش شــەهید بــوون. بەهەردوولا پێنج شــەهید و چەندین بریندار هەبوو. شایانی باسکردنە بەکر جۆلا (بەداخەوە لەتەقینەوەکەی ناو مەڵبەندی ســێ لەهەولێر شــەهید بوو)، ببوە کارگێڕی مەڵبەندی ســێ، ئەو ماوەیەی عەولا ماویلی لەناوچەکە بوو، مام جەلال دوو نامەی بۆ ناردبوو. داوای

لێکردبوو ببێتە یەکێتی، ئەویش چونکە کۆنە شیوعی بوو ڕەتی کردبووەوە.
شایەنی باسە، هاوڕێ عەلی کلاشینکۆف لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک لەشاخی سورێن، ئەشکەوتی بەسەردا ڕووخاو هەموویان شەهید بوون.

# کەریمی برام بوو بەپێشمەرگە

لەتەمموزی ١٩٧٩ لیژنەی (مەرکەزی) حیزبی شیوعی بڕیاریدا ببێتە ئۆپۆزسیۆن لە بەرەی نیشتیمانی دیموکراسی (الجبهة الوطنية الديموقراطية) بێتە دەرەوە. بەڵام بەعس لەمێژ بوو، لە هەموو شتێک ببووەوە. بۆیە باوکم هەموو جارێ دەیگوت: لایەکی ڕانەمەڕ گورگ دەیخوا، تازە مەڕی کەڕە دەڕەوێتەوە. هەندێک بارەگایان لە نێوزەنگ کردبووەوە، تەنها یەکێتی هەندێک تفەنگی دابوو پێیان، جێگای پێزانینە. وردە، وردە خەڵک شوێنی بۆ پەیدا بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی پێشمەرگە زیادی دەکرد. ڕۆژ نەبوو نەبیستین کەوا چەند کەسێک شاریان بەجێهێشت بەرەو شاخ.

ساڵی ١٩٨٠ گەرمەی شەڕی عێراق و ئێران بوو. کەریمی برام سەرباز بوو، دەستی بریندار ببوو، هاتەوە ماڵێ. من و باوکم و کەریم پێکەوە کۆببووینەوە. ماڵەوە نوستبوون. بۆ ئێمەی کۆنە سیاسی ڕۆژانێکی زۆر تەنگ بوو. باوکم بە کەریمی گوت: نازانم چیت پێ بڵێم، ئەگەر ڕەوانی سەربازیت دەکەمەوە، دەترسم شتێکت بەسەربێ، جا من چ وەڵامی خەڵک بدەمەوە!! دەڵێن کوڕی عەلی حاجی تاهیر لە (قادسیەی سەدام) کوژراوە، بۆ ئێمە شەرمەزاریەکی گەورەیە. کەریم گوتی: ئەگەر ئێوە ڕێگەم پێبدەن دەبم بە پێشمەرگە. کەریم ڕوی لەمن کرد، گوتی: کلاشینکۆفەکەی خۆتم دەدەیێ؟ (چونکە پێشمەرگە چەکی نەبوو، خەڵک دەبایە بەچەکی خۆی پێشمەرگایەتی بکات،لەو سەردەمە نەک تفەنگ بەڵکوو یەک فیشەک بە هەر کەسێ بگیرابایە لەسێدارە دەدرا).
گوتم: تفەنگم لە تۆ خۆشتر ناوێ. چووم کلاشینکۆفەکەم بۆ هێنادەر لەهەولێر، لای ماڵی خزمێکم شاردبووەوە. ڕۆژی دواتر بردم بۆ کەلی (قەشقە)، بوو بە پێشمەرگە.

داخی بەجەرگم، لەگەڵ یازدە پێشـمەرگەی قارەمانی حیزبی شـیوعی لەشـەڕی سـێکانی شـەهید بـوو، ئیتر چاوم بەو برایـەم نەکەوتەوە، ئەوانـەی لەنزیکەوە شـەهید کەریمیان ناسی بێت، دەزانن چ جوامێرێک بوە.

ئێمە لە قوشـتەپە بوین، کە خەبەریان بۆ هێناین، باوکم گوتی: ئەو کەرەسـتەی ریش تاشینەم بۆ بێنن، ریشم بتاشم. دایکم پێی گوت: ئەوە تێک چوی؟ گوتی: نەخێـر. با دۆسـتەکانم نارەحەت نەبـن، بڵێن: عەلی بەو کـوڕەی زۆر تێکچوە. سـەری لێشـێواوە. وە دوژمنەکانم با خۆشحاڵ نەبن بڵێن: با ئاوا دوولا بێتەوە. نەمانتوانی پرسـەی بۆ دابنێین، لەترسی ئەمنەکان.

# دایك دەیگوت: شیری مەمکم حەڵاڵ بکە

مەبەسـتم لەنوسـینی ئەو چەند داسـتانەی پێشـمەرگەکانی حیزبی شیوعی کە خـۆم لەگەڵ نەبووم، بەکورتی بۆ ئەوەیە لە فرۆشـتن و دەسـت بەسـەرداگرتن بیـان پارێزم. تاوەکو بەدەردی داسـتانی هەندرێن نەبراون، کە لەسـاڵی ١٩٦٦ ئەو داستانە حیزبی شیوعی تۆماری کرد، ئێستا خەریکە پارتی دەستی بەسەردا دەگرێ.

بەهـاری سـاڵی ١٩٨٢ پۆلێـک پێشـمەرگەی حیزبـی شـیوعی بـە فەرماندەیی (بەکرتەلانی)کە ژمارەیان (بیست وچوار) پێشمەرگە بوو، لەدەشتی کۆیە لەگوندی بولقامیش دابەش دەبن، بۆ بەیانی واتە ١٩٨٢/٤/٢ کاتێک پاسـەوان (حەرەس) ئاگاداریـان دەکاتـەوە لەجاش و جەیش و هەلیکۆپتەر بـەرەو گوندی بۆلقامیش دێـن. (بەکرتەلانی) فەرمان دەکات بۆ پاراسـتنی خەڵکـی گوندەکە لەناو گوند بچنـە دەرەوە، چونکە لەوکاتە شـەڕی نـاو گوند تاقی نەکرابـوەوە، بۆیە لەناو گوند دەچنە دەرەوە، کاتژمێر حەوت ونیوی بەیانی شـەڕ دەست پێدەکات.

هێزی دوژمن بە پاڵپشتی هێزی پیادە بە بەشداری سەرۆک جاش (حەمەی شێخ حەسـەنی بەفراو) هەندێک لەجاشەکانی (تەحسـین شاوێس) و (قاڵەفەرەج) و چەندیـن بەکرێگیـراوی تر، بە پاڵپشـتی هەلیکۆپتەری جەنگی. یەکەم شـەهید کاتژمێر نۆی بەیانی (شـۆرش حەسـاری) شـەهید دەبێ، مام (جوامێر) بریندار

دەبێ لەگەڵ (حەمە ڕەشاش)، (حەمە ڕەشاش) بە بریندراری دەکەوێتە دەستی دوژمن. پاشان بە حوکمی لەسێدارەدان حوکم دەدرێ، پێش ئەوەی حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ بکرێت، لە پازدەی ڕەمەزان بەر لێبوردنی گشتی دەکەوێ و بەری دەدەن.

ئەو داستانە بەخوێنی ئاڵی پازدە شەهیدی گەلە ستەم لێکراوەکەمان تۆمار کرا، کە لەناویاندا فەرماندەی ئازاو چاونەترس (بەکرتەلانی) بوو. بەراستی بەشەهیدبوونی هاوڕێ (بەکرتەلانی) و هاوڕێکانی، گورزێکی کوشندە بەهێزی پێشمەرگە کەوت، بەتایبەت باوکم هەتا کۆچی دوایی کرد وە لەژیانی پێشمەرگایەتی، هەردەم (بەکر تەلانی) لەسەر زارو زمانی بوو. زۆر برادەری تایبەتی باوکم بوو. چەندینجار هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە لەحەفتاکان. شایەنی باسە ئەو شەڕە هەتا کاتژمێر پێنجی ئێوارە بەردەوام بوو. پێشمەرگەکان فیشەکیان تەواو دەبێ هەر هەموو شەهیدەکان هەلیکۆپتەر شەهیدی کردبوون. کەسیان بە گوللەی تفەنگ شەهید نەبوون. ئەمەش ناوی شەهیدەکان:

١. بەکر تەلانی
٢. ئەحمەد حەساری
٣. شۆڕش حەساری
٤. کاکە مەد حەساری
٥. گۆران حەساری
٦. مەلا وشیار حەساری
٧. ئۆمەر تورکمان باغ
٨. مجید مام سەعید
٩. مجید نجم الدین
١٠. یاسین برای مام سەعید
١١. فوئاد شوقلیجە
١٢. سەرکەوت بۆلقامیش
١٣. ئەبو قیس هاوڕێی عەرەب بوو.
١٤. عادل عەرەب
١٥. شوانە تۆپزاوەیی.

هەتا کاتژمێـر پێنجی ئێوارە، چوار هەلیکۆپتەری بارهەڵگرو، دوو هەلیکۆپتەری شەڕکەر، لەو شەڕە بەشداربوون. لەگەرمەی شەڕەکەدا دایکی شەهید (سەرکەوت) کەماڵیان لە بۆلقامیشـە بەدیار شـەڕەکەوە بوو. پڕ بە گەروی هاواری دەکرد: سەرکەوت کوڕم، شیری مەمکی من لەخۆت حەڵاڵ بکە، تەسلیمی ئەو خۆفرۆشانە نەبیت، سـەری دایکی خـۆت و گوندی بۆلقامیش شـۆر نەکەی. کاتێ (حەمەی شـێخ حەسـەنی بەفراو) دەگاتە سەر تەرمی شەهید (سـەرکەوت) گیرفانەکانی دەکۆڵنـەوە، وێنەی هەندێـک ئافرەت لەگیرفانی دەردێنن، دەیبەنەوە ناو گوندی بۆلقامیـش بـۆ لەکەدارکردنی شـەهید سـەرکەوت، بەخەڵکەکە نیشـان دەدەن، دەڵێـن: هـا ئەوانەن کە بەقسـەی خۆیان پارێـزگاری لەشـەرەف و کەرامەتان دەکەن، وێنەی ئەو ئافرەتانە ببینن کە سـەرکەوت خۆشـی ویستون و پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبوە!! دایکی شـەهید (سەرکەوت) نەفرەت لەو بەکرێگیراوە دەکات و دەڵـێ: بـا خەڵکی بۆلقامیـش جوان ئەو وێنانە ببینن، وێنەی خوشـکەکان و برازنەکەیەتی کەوا شـەهید سەرکەوت زۆری خۆش دەویستن.
دایکی شـەهید سـەرکەوت پێیان دەڵێ: دەتانەوێ ناپاکی و بێ شەرەفی خۆتان لەژێر ئەو تۆمەتە درۆزنانەیە بشارنەوە؟!!

# باوك و کوڕ بەیەك پەت لەسێدارە دران

لە زسـتانێکی سـاردو باراناوی، مام غەفوری سۆسیالیسـت ناسـراو بە (غەفە)، هەندێک شـارەزا و خەڵکی بیانی سەرپەرشـتیاری پرۆژە ئاودێرییەکانی هێنابوو بۆ بەسـتی شـەرغە. لەو کاتەدا ڕژێم بۆ ئەوەی لەدەرەوەی وڵات، نەزاندرێ کە شۆڕشـی کـورد دەسـتی پێکردۆتەوە، هـەر زوو کەوتەخۆی بـۆ ڕزگارکردنیان. هێزێکی زۆری کۆکردەوە بۆ دەشتی کۆیە، ڕۆژی ١٩٨٢/١/٢٧ لە گوندی سێکانی دەشـتی کۆیە لەگەڵ هێزێکی پێشـمەرگەی حیزبی شیوعی بەرەو ڕوو دەبێتەوە. شـەهید مام کاوێس فەرماندەی ئەو هێزە بوو، بەلام پێشـمەرگە هیچ ئەزمونێکی شەڕی ناو گوندەکانی نەبوو، بۆیە هەر زوو لە گوندەکە وەدەرکەوتبوون. لەوکاتە ببوونـە نێچیرێکی ئاسـان بۆ هەلیکۆپتەرەکانی ڕژێـم. ئەوەبوو لە هەموو لایەک

شــەڕ فراوان دەبێ، کاتێک کە چەکێکی کاریگەرت نەبێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەلیکۆپتــەرەکان، بەچەکی ســوک هیچ ناکرێ. ژمارەیەک لەجاشــەکان و هێزی پیادە دەکوژن، بەڵام توانای شــەڕی ئاســمانیان نابێ جگــە لەگیان بەختکردن، بۆیە کاتێ فرســەتی مام نەجمەدین برینــدار دەبێ، کەریمی برام نایەوێ بەجێی بهێڵێ، کاتێ هەلیکۆپتەرەکان دەیانەوێ بنیشنەوەو بەزیندویی بیانگرن، کەریمی بــرام تەقەیــان لێ دەکا. بەقســەی خەڵکی گونــدی نێرەگێن، گوایــا هەندێکیان دەکوژێ، پاشــان هەلیکۆپتەرەکان بڵند دەبنەوە، بە دۆشــکە تەقە لە کەریم و فرسەت دەکەن، هەردووکیان شەهید دەکەن.

دواتر جاشــەکانی (فارس کەریم)ی ســەرۆک جاش و (مەفرەزە خا سە)ی ڕژێم دەگەنە ســەریان، تفەنگ و ڕەختەکانیــان لێدەکەنەوە، تەرمەکانیان دەخەنە ناو عارەبانەی تراکتۆر، بۆ چاوشکانی خەڵکی گوندی نێرەگێن دەیان بەنە ناو گوند. (فارس کەریم) ئێســتا شــەهیدی پارتیــە و موچەکەی لە شــەهید کەریمی برام زیاترە. لەو شــەڕە داســتان ئامێزەدا، یازدە هەڵۆی بەرزەفڕی بەرەنگاربوونەوە شــەهیدبوون. لەوانە: شەهید سەمەد، شــێرۆ، فرسەت، کەریم..بەداخەوە ناوی هەموویانم بیر نییە. لەو کاتەدا ئەو یازدە شەهیدە کە هەر هەمویان پێشمەرگەی شەڕی دەستە و یەخەو بە ئەزمون بوون، زیانێکی یەکجار گەورەبوو، بۆ حیزبی شیوعی و شۆڕشی گەلی کورد.

هەر ئەو شــەوە ئەو عارەبانەی تەرمی شــەهید کەریمی تێدابوە، لای ماڵی مام ڕەحمان کە لەلای سەرەوەی گوندی نێرەگێنە، ڕادەگرن. لەوشەوە عومەر گێرسە ی پێشــمەرگەی سۆسیالیست، لەهێزەکەی خۆیان دادەبڕێ، بەدوای شەهید قادر مستەفادا دەگەرێ. ئەوکات لەگەڵ کاک قادر پێشمەرگەبوو. عومەر خزمێکی زۆر نزیکی ئێمە بوو. دەیەوێ بچێتە ماڵی مام ڕەحمان، پرسیاری هەواڵی کاک قادر بکات، شــانی بەو عەرەبانەیە دەدات کە تەرمی شــەهید کەریمی برامی تێدابوە. بەمنداڵــی بەیەکــەوە گەورە ببــوون، بەڵام لە بەر تاریکی تەرمی شــەهید کەریم نابینێ. جاشەکان دەڵێن:

تــۆ کێی، چی دەکەی لێرە؟ ئەویش دەڵێ: من پێشــمەرگەی سۆسیالیســتم، لە کاک قــادر دەگەرێم!! ئەوانیش دەڵێن: کاک قــادر لەژوورەوەیە. بەفێڵ دەیبەنە ژوورەوە، جاشــەکان پەلاماری دەدەن، کەڵەکەی لەســەر دەکەن، چەکەکەی لێ

دەستێنن، بۆ بەدەستهێنانی چەند قروشێک تەسلیمی ئەمنی دەکەن. جێگەی باسە یەک مانگ پێش گرتنی عومەر گێرسە، باوکی دەستگیرکرابوو، لەناحیەی قوشتەپە. بە تۆمەتی ئەوەی کە گوایە لەژێر سکەی قیتار لە نزیک گوندی ئۆمەراوە، مینی داناوەتەوە، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی حیزبی شیوعی، مام سەلیمی باوکی عومەر گێرسە شیوعی بوو، کاتێ شەو کانەبی گەورە وموحسین دەشتی چونەتە ماڵی مام سەلیم، هەندێک لە سیخورەکانی ڕژێم دیویانە، ئاگاداری ئەمنی قوشتەپەیان کردبوەوە. مام سەلیم دوو شەو و دوو ڕۆژ ئەشکەنجە درابوو، بەڵام هیچ نهێنییەکی نەدرکاندبوو، بەقەد تاڵەموەک ورەی بەرنەدابوو، مام سەلیم پیاوێکی زۆر چاوقایم و نەترس بوو، پاشان کە پێی دەڵێن: دوو کچە گەنجەکەت و خێزانت دێنین لەبەرچاوت دەستدرێژی شەڕەفیان دەکەینەسەر.

مام سەلیمی باوکی عومەر گێرسە پێیان دەڵێ: هەرچی دەینوسن و هەر شتێک پلەوپایەی ئێوەی پێ سەردەکەوێ، من واژۆی لەسەر دەکەم، بەس ئەو کارەم لەگەڵ مەکەن. (ڕۆژی پێش لە سێدارەدانی لە قەسابخانەی مو سڵ، بۆ من و باوکمی گێرایەوە). کە بۆ کاتژمێر دوازدەی شەو لە سێدارە دەدرا.

ئێمە وەک خزمی نزیکی ئەو چوین بۆ دواین دیدار لەگەڵ مام سەلیمی مەجلیس خۆش و چاونەترس. لەیادمە پێش دوا ماڵئاوا بوون، مام سەلیم گوتی: ئەگەر خوا ئەجەلی منی نەهێنابێ، کوا من بەو خوێریانە دەخنکێندرێم. شەو مام سەلیمیان لەسێدارە دابوو، هەر یەک مانگ دوای لەسێدارەدانی مام سەلیم، عومەر گێرسەی کوڕی بەهەمان ئەو پەتەی کە باوکی پێ خنکێندرا، ئەویشیان لەسێدارە دا. کەتەرمی شەهید مام سەلیم دەدەنەوە خانەوادەکەی، ڕژێم داوای پەنجا دیناریان لێدەکات تا تەرمەکەیان ڕادەست بکات، بەداخەوە منداڵەکانی هێندە نەداربوون توانای ئەو برە پارەیان نەبوو، بەناچاری پارەکە قەرز دەکەن بۆ وەرگرتنەوەی تەرمی باوکیان، کەچی تەرمەکەشیان نەدانەوە.

ڕۆژی پاش گرتنی عومەر گێرسە، ماڵی بابە عەلی نێرەگینی، کە شێخی گوندی نێرەگینن، تەرمی شەهید کەریمی برامیان بەڕێزەوە لە جاشەکان وەرگرتبوەوە، لەگوندی نێرەگین بەخاکیان سپاردبوو، وەک کوڕی خۆیان. ئەوەبوو حیزبی شیوعی لە دوای چواردە ساڵ، تەرمی شەهید کەریمیان هێنایەوە گۆڕستانی گردە

ڕەشــە (گۆڕستانێکی گەورەیان بۆ شەهیدەکان لەوێ دروست کردوە)، بۆ دایکم ئەوێ زۆر نزیک بوو، بۆ سەردانی گۆڕەکەی. بەڵام جامانەکەی کە کاشمیلۆن بوو لە برینەکەیان پێچابوو، گرێیەکی گەورەیان خستبوە سەر برینەکەی، جامانەکەی لای منە کە ئێســتاش خوێنی وشکی پێوەیە، لای سەرەوەی نەرزیبوو.



جامەدانە بەخوێنەکەی شــەهید کەریمی برام

# من و باوکم بووین بە پێشمەرگە

باوکم و مامم و هەموو خێزانەکەمان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، ڕقوکینەمان بەرامبەر بەو ڕژێمە خوێن ڕێژە ئەستورتر دەبوو. لەساڵی ١٩٨١ پەیوەندیم کرد بەکادری حیزبی شیوعی لەناو هەولێر، نامەیەکی شەهید ڕۆستەمم بە دەست گەیشت، نوسیبوی: ئەگــەر نەیەیتــە دەرەوە دەتکوژن. نزیکەی شــەش مانگ لەنــاو هەولێر مامەوە. مــن بڕیارمدا جێگای شــەهید کەریم چــۆڵ نەبێ، ببم بە پێشــمەرگە. برادەرێکم ناوی شوکربوو، بە ماتۆڕ بردمیە گوندی قەشقە، لەوێ چووم بۆگوندی پەرکانە، ماڵــی مام حەســەن لەوێ بوون، خزممان بوون، بەڵام ئــەوکات ئەوەی لەماڵێک دەبوو بە پێشمەرگە، لە ماڵەوە نەیان دەتوانی بمێننەوە، دەبوایە جێگای خۆت بگــۆڕی، ئەگەر نا ڕژێم، کۆی خانەوادەکەی بەژن و منداڵەوە دەســتگیر دەکرد. ئەوەبــوو باوکــم، پینج ڕۆژ دوای من هاتە دەرەوە، لە لقی دەشــتی هەولێر بوین بە پێشمەرگە. ئەوپێشمەرگانەی ئێمەیان نەدەناسی، دەیانگوت: دوو برا هاتون، دەڵێــی پاڵەوانــن، نیازیان وابــوو چەکە قورســەکانی وەک حەفــارۆف بە ئێمە هەڵگرن!!

شــەهید عەباس ســەر لق بوو، هەر زوو کلاشینکۆفێکی دا بەمن، لەگەڵ باوکم و چوار پێشــمەرگەی تر، بەرێکەوتین بۆگوندی مەلەکان. زۆر بەناخۆشــی لە چیای باواجی ســەرکەوتین، لە ســماقولی ماینەوە، بەیانــی بەرێکەوتین نیازمان وابوو لەگوندی سکتان بمێنینەوە، زۆر گەرما بوو، نیوەڕۆ گەیشتینە سکتان. لە بەختی ئێمە گوندی سکتان، دووبەرەبابی دووژمنداری تێدابوو، هەردوولا پێشمەرگەبوون، هــەردوولا مەفرەزەی خۆیان هەبوو، ئەو ڕۆژە ئەو دوو مەفرەزەیە لێکیان دابوو، دوو کــەس کوژرابوو. ئێمەش توانای گوڕ لێدانمان نەبوو، ناچار بەنوێژی نیوەڕۆ بەرێکەوتین بەرەو چیای هەورێ، زۆر چیایەکی وشــک و بێ ئاوە. لە ڕێگا باوکم خەریک بوو لە تێنوێتیدا بخنکێ، نەخۆشــی گورچیلەی هەبوو، خوێن دەمیســت. هەندێ وڵاغدار لە چیوە دەهاتن بۆ ســکتان، بە زۆری وڵاغێکم گێرایەوەو گوتم: پارەت دەدەمێ پێت خۆش بێ یان ناخۆش، ئەو وڵاغە دەگێرمەوە، باوکم ســوار

بێ. جا باوکم خەمی منی بوو، شـەهید بڕیار لە پێشـەوە دەڕۆیشت، بەهەرحاڵ خۆمـان گەیانـدە گونـدی چیوە، بەڵام نیـوە مردووبوین لە تینـوان. ئەو پیاوە پیرانـەی لەنزیـک حەوزەکە دانیشـتبوون، پێیان گوتین: ئـاو نەخۆن، بەجل و مەغزەنەوە خۆمان لە حەوزەکە هاویشـت، تۆزێ هاتینەوە سـەرحاڵ. خەڵکەکە کاڵەکیان داینێ، گوتیان: بۆ ئێسـتای ئێوە کاڵەک لە ئاو چێترە.

یەکەمجار بوو دەرەشـیر ببینم. قەت باوەڕم نەدەکرد، ڕێگا لەو شـاخە سـەختە سـەرکەوێ، بەهەزار حاڵ بەسەرکەوتین. بۆ نوێژی شـێوان گەیشتینە مەلەکان. لـە بارەگا، خوالێخۆشـبوان: کانەبی گـەورە و مەلا نەفتە لـەوێ بوون. زۆریان بەخێرهێناین، چونکە چەند ساڵ بوو پێکەوەبوین. ڕۆژی دوایی گوتیان: میوانمان دێت، شەهید حەسەن کوێستانی لەگەڵ سێ پێشمەرگە هاتن، لەگەڵ هاوڕێ مەلا نەفتە باسی سیاسەت و باری ئەوکاتەیان کرد. ئەوەی بۆ من جێگای تێڕامان بوو، مەفـرەزەی هەمـوو لایەنەکان کە دەچوون بۆ هـەر گوندێک، ئەوەی کاڵ فامیش بوایە بەرپرسـی لەگەڵ پێشمەرگەی ئاسـایی لێک جیادەکردەوە، بەتفەنگەکەی، جلەکەی، جامانە خاوێنەکەی، ڕەختەکەی، جگەرەکەی، پێڵاوەکەی و زۆر شـتی تر.

ڕەنگە بڵێن: ئەگەر لەسیاسەتی حیزبی شیوعی هێندە ناڕازی بوی، بۆ لەگەڵ ئەو حیزبە بوی بە پێشـمەرگە؟! لەباشـوری کوردستان، تارادەیەک لە ڕۆژهەڵاتیش، حیزبایەتی لەروی سۆزداری بڕیاری لەسەر دەدرێ، هەر خێزانێک ئەگەر شەهیدی لەگـەڵ حیزبێـک هەبـێ، دەبێ بـە موڵکی پوختی ئـەو حیزبە، ئەگـەر نا پێی دەڵێن: خیانەتی لەخوێنی شـەهیدەکانی کردوە، وازی لەحیزب هێناوەو.....هتد. لەو سـەردەمە کەسـی لەوان چاکترم شک نەدەبرد پێشمەرگایەتی لەگەڵ بکەم.

دوو خوشـکی گەنـج و ئامۆزایەکـی گەنجـم هەبـوو، باوکم بە دایکمـی گوتبوو: ئـەو کچانە نەکەونە دەسـت حکومەت، دوایی لێت نابـورم. لەبەرەبەیانێکی زوو کـە خەبەریـان دابـوو بە دایکم (هەندێک کوردی کوردی دڵسـۆز پێیـان گوتبوو)، تۆو کچەکانت دەگرن لەگەڵ بوکەکانت، دایکم دەستی خوشکەکانمی گرتبوو، بەپەلە ڕایکردبوو بۆ هەولێر. ئەمنەکانی ڕژێم چووبوونە ماڵی ئێمە کەسی تێدا نەمابوو، بـەڵام هەمـوو کەلوپەلی مـاڵ وەک خۆی وابوو، بۆیە هەموو ماڵەکەیان دەسـت بەسـەرداگرت، کەلوپەلـی ماڵـی باوکم و ماڵی منیان دەسـت بەسـەرداگرتبوو،

گواســتبویانەوە بۆ دوکانەکانی شــارەوانی. هەتا هەندێ پارە لەناو دۆشەکەکان دابوە، دایکم نەیتوانی بوو بیهێنێت. پاشان هەر ئەمنێک کە دەهات بۆ قوشتەپە دەچوو پێداویستیەکانی خۆی لەناو کەلوپەلەکانی ماڵی ئێمە دابین دەکرد، هەتا کۆتاییان پێهێنا. لە قوشتەپە تاکە خێزان بوین کە باوک و کوڕەکان و برازاکان هەر هەمووومان دوازدە کەس بوین بە پێشــمەرگە.

لەو ســەروبەندە کۆتایی ســاڵی ١٩٨٢ بوو، سەدام حوســێن دەستوری دەرکرد. هەر کەســێ لەســەربازی (قادســیە) ڕابکات، دەبێ گوێی ببرن. وە هەندێکیان لەســێدارە دەدا، ئەوانەی لەبەرەکانی جەنگ ڕایان دەکرد، لەدواوە دەســتەیەکی گوللە بارانکردن هەبوو بەخۆیان دەیانکوشتن، بەوانە دەگوترا: ترسنۆک (جەبان)، لەســندوقی لاشــەکانیان دەنوســی (جەبان) تاکو ئۆتۆمبێل و زەوی و پارە بە کەســوکاریان نەدرێــت. ئەو کات بــۆ کوژراوانی (قادســیە)دەدرا. ئەو کردەوەی ســەدام حوســێن بوە هۆی زیادبوونی ژمارەی پێشمەرگەی هەموو حیزبەکان، بە حیزبی شیوعیشــەوە. گوندی نازەنین وەکو شــارەدێیی لــێ هاتبوو، دوکانی لێ بــوو، ئــەو هەنارە جوانانە، ماڵەکان لە کەپری هاوینەدا بوون، لە هاوینی ١٩٨٢ لە ماڵی هاوڕێ حەســەن کاکە لەگەڵ باوکم و چەند پێشــمەرگەیەکی تر، ئەودەم هاوڕێ (مەحەمەد حەلاق) پەیدابوو، کە دایکی پێشــمەرگان (ئایشــەگوڵ) لەوێ بــوو، یەکــەم جارم بوو بۆنی لەچکە ســپیەکە و بەرامپیلــی بکەم، بۆنی دایکمی لێ دەهات.

هــاوڕێ (مەحەمەدحەلاق) گوتی: هاوڕێ حازم بڕۆن با بچین لە گۆمەکانی گەلی (جەلی) ماسی بگرین، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک چوین. یەک لەو پێشمەرگانە خەڵکــی قــەراج و کەندێناوە بوو، وا پێ دەچوو قەتی ماســی نەخواردبێ، ناوی (ح . د) بــوو، کاتێــک کە من و هاوڕێ مەحەمەد ماســیمان فرێدەدایە دەرەوەی گۆمەکــە ئــەو هاوڕێیە کۆی دەکردنــەوە، گوێم لێبوو دەیگــوت: خێراکەن وەرنە دەرەوە هەمــوو ماســیەکان دەمــرن، ئا ئەوەتــە دوو ماســی مرداربوونەوە، من وامزانــی گاڵتــە دەکات، کە زانیم بەراســتیەتی، گوتم: ئــەو (مەحەمەدحەلاقە) جیــاوازی لەبەینــی حــەڵاڵ و حەرامی ناکا، بۆ ئەوەی هێندەی تر ڕشــتی بکەم. هاوڕێ مەحەمەد هاتە دەرەوە دەســتمان بە ماســی چاکردن و برژاندن کرد ئەو هاوڕێیــە دەســتی لەیەک ماســی نــەدا گوتی: من ماســی مردار ناخــۆم، هاوڕێ

مەحەمەد هەرچەندی لەگەڵ گوت: کاکە ماسی مردار نابێ ماسی سەر نابردرێ بەلاش بوو. گوتی: بچمەوە ئەوە بە حیزب ڕادەگەیەنم، بەلاش نییە خەڵک دەڵێن: شیوعی کافرن. هەر لەبەر دوو شتی ئاوایە کە خەڵک بەکافرمان دەزانن. هاوڕێ مەحەمەدحەلاق هەموو جارێ کە یەکترمان دەبینی دەیگوت: نەچین هەندێک ماسی مردار بخۆین؟!! جارێک لە بارزان گوتم: وەرە لەگەلی سولێ ڕاوەماسیەک بکەین زۆرمان ماسی مردار خوارد!!

لەدەشتی هەولێر و بەستی شەرغە سۆسیالیست کە کورتکراوەکەی (حسک) بوو، ئەو سەردەمە لەهەموو لایەنەکان زیاتربوون، نازانم کێ ئەو دەستەواژەی داهێنابوو (حسک حەرز دەدڕێ)!! پێشمەرگەیەکی حسک شەوێک لەدەرگای ماڵێک دەدا، شەو درەنگە خاوەن ماڵ دەڵێ کێیە؟ پێشمەرگە دەڵێ: حسکە، حسک حەرز دەدڕێ. ئەویش تورە دەبێ دەڵێ: قەسەم بەخوای دەرگات لێ ناکەمەوە مادام (حسک حەرز دەدڕێ )بڕۆ دەرگای بکۆڵە و بیدڕە ئینجا وەرە ژوورەوە دەی بزانم حەرز دەدڕێ؟!!

## هەر ئەو شوێنە بۆ ئاودەست باشە

لە قڕناقە و پشت ئاشان، هاوڕێیانی پێشمەرگە، ویستبویان بارەگایەک دروست بکەن، ئێمە کە بارەگامان دروست دەکرد لە شوێنێک دەگەراین کە گۆشەی مردوو بێت. واتە لەسەربازی پێ دەگوترێ: (زاویە میتە) کە تۆپ بە ئاسانی نایگرێتەوە، دیواری نەوی بەحاڵ سەرمان لەناوی ڕاست دەبوەوە، بەلام هاوڕێیان گوتوبویان با ئەندازیار (س) شوێنەکە دیاری بکات، ئەویش وەک لە پایتەخت باڵەخانە دروست بکات، دوو سێ شوێن دەگوازێتەوە کە گوایا خاکەکەی بەرگەی باڵەخانەی چەند نهۆم ناگرێ، ئەوەندە خۆی دەهێنێ و دەبا و هەڵدەتوتکێ و ڕاست دەبێتەوە، بۆ دڵنیابوون لە لیڤڵ و ڕاستی شوێنەکە، کە سەری تەنافی بەدەستەوە بوە، سەرێکی بەدەستی کاک (حەسەن خدر)ەوە بوە. هاوڕێ (حەسەن خدر) جوتیارێکی گوندی زوورگان و پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوو، بۆی گێڕامەوە: هاوڕێی ئەندازیار زۆر هیلاکی کردوە، لەکاتێکدا هاوڕێی ئەندازیار

هەڵدەتوتکێ و لە تەنافەکە خێس دەبێتەوە، بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی شوێنەکە، ترێکی گەورەی لێ بەردەبێ، هاوڕێ حەسەن پێی دەڵێ: مەجوڵێ هەر ئەو شوێنەش بۆ ئاو دەست دیاری بکە.

# ئاوێکی ون

هاوینی ١٩٨٢ ، بارەگای بەتالیۆنی (٥) کە هاوڕێ (کانەبی گەورە) فەرماندەی بوو، لەگوندی مەلەکان. هەندێک کەپری هاوینە لەپشت گوندی مەلەکان لەسەر کانییەکی گەورە دروست کرابوو، ملازم (ئەحمەدجبوری)یەک لە فەرماندە سەربازیەکان بوو، لەهێزی پێشمەرگە. دەیویست بارەگایەکی تر دروست بکەین لەگوندی بناوێی نزیک ئالانەی دۆڵی بالیسان و سۆسەی مۆڵگەیەکی دوژمن لەلای پێچەکانی سپیلک. ئەو سەردەمە حیزبی شیوعی هەوڵی دەدا چالاکیە سەربازیەکانی هێزی پێشمەرگە فرە لایەن بێ، لەگەڵ هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی حیزبەکانی باشور، بۆ نمونە: لێدانی (جەیشی شەعبیەکانی) سەر بە ڕژێم لەگوندی دۆڵەبەکرە، لەلایەن شیوعی و یەکێتی، زۆر شتی تر، بۆیە لە سۆسەکردنی ئەو مۆڵگەیە بڕیاربوو بەهاوبەشی لەگەڵ سۆسیالیست بکەین، (تەنها هێزی پێشمەرگەی پارتی لەو ناوچانە نەبوون) بەچاوساغی مام ڕەسو بناویی چوینە گوندی ئالانە، دابەش بوین بەسەر ماڵەکاندا بۆ نان خواردن، دوایی چوینەوە مزگەوت، فەرماندەی ئێمە (ملازم ئەحمەد جبوری) بوو، ئەوانەی لەیادم مابن، ملازم فایز، هەڵکەوت، هەڵمەت، مام ڕەسو، من و چەند پێشمەرگەیەکی تر، لەلایەن سۆسیالیست، بورهان بلەیی و چەند پێشمەرگەیەکی تر. لەکاتژمێر چواری شەو، هەڵستاین لە مزگەوت و مەتارەکانمان پڕ ئاو کرد، بە هەر دوو پێشمەرگە نایلۆنێکی ڕەش، کە نانی ڕۆژی دوایی تێدا بوو، ملمان لەبەر چیای بەنی هەریر نا. لەڕاستی ئالانە لەنێوان سپیلک و کەپکی حەمەد ئاغا، کاتێک کە سەرکەوتین تازە گزنگی ڕۆژ لەدار قەزوانەکانی سەرکەپکی حەمەداغاو بەنی هەریری دەدا. لە دوای وچانێک بەرەو لای پێچەکانی سپیلک ڕۆیشتین، ئەو شوێنەی کە بەدووربین دەبوایە سۆسە بکرێ دەکەوێتە خوار پێچەکانی سپیلک،

لەلای هەندێ دار قەزوانی گەورە دانیشتین، نەدەبوایە هەموومان بۆ سۆسەکردن بچین. تەنها مـلازم ئەحمەد و بورهان بلەیی و ملازم فایز چون بۆ سۆسە، ئێمە لەبن دارەکان دانیشتین، پاش نیوەڕۆ هاتنەوە مەتارە ئاوەکانمان کەمی تێدامابوو، دیاربوو لەلای گەلی سوێرە هەندێک دارەبەنی گەورە هەبوو، لەوێ ئاویان پێ شک دەهات، چوین بۆ ئەوێ کەس لەو باوەڕەدا نەبوو ئاو لەو شوێنە هەبێ، بەڵام کە گەیشتینە لای دارەبەنە گەورەکان، چوینە سەر چاڵێکی وەک کۆنەبیری ڕوخاو بە ئەندازەی دوو مەترێک قوڵ، بنی هیچ تەڕیەتی لێ نەبوو، (بورهان بلەیی و مام ڕەسو، ئەو شوێنەیان شک دەبرد)بورهان بلەیی، بێ چەک و ڕەخت چوە خوارەوە، کونێکی بچوکی بەقەد مرۆڤێک کە خۆی زۆر بچوک بکاتەوە، لەسەر سک چوە ژوورەوە، من و دوو پێشمەرگەی تر بەدوای ئەودا چوینە ژوورەوە، بەڵام هەر بەقەد نیو مەتر شوێنەکە بچوک بوو، ئیدی لەژوورەوە هەڵسااینە سەر پێ، لایتی بچوکمان پێبوو، هەموو شاخەکە تەڕایی ئاوی لێ دەچۆڕایەوە، حەوزێکی لەناو شاخەکە، دەستکرد نەبوو پڕ لەئاو بوو، لایەکی کەندڕ بوو ئاوەکەی تێدا دەچوە خوارەوە، هەموی شاخی لە چەشنی چەقۆتیژ نەدەبوو بچینە لای ڕاست، نەوەک بکەوین شاخەکە لەبەر تەڕایی خلیسک ببوو، ئاومان خواردەوەو مەتارەکانمان پڕ کرد، دەبوایە هەموو یەک یەک ئەو شوێنە تاقی بکەینەوە، بۆ ڕۆژی تەنگانە و بێ ئاوی. لەدوای هاتنە دەرەوەی ئێمە، پێشمەرگەکانی تر چونە خوارەوە، پاشان من پرسیم: هیچ ئاسەواری ئاو دیار نییە، ئاوی لەبەر نازوا، ئاوەکە بەناو ئەو شاخە دەچێتە خوارەوە، چۆن زاندراوە کە ئەو کونە بچوکە لەژوورەوە ئاوی تێدایە و ئەشکەوتێکی ئاوا گەورەیە؟!! کاک بورهان و مام ڕەسو گوتیان: کاتی خۆی ڕاوچییەک لەراوی بزنەکێوی بوە، ئاژەڵەکێوی چۆتە خوارەوە، کە هاتۆتە دەرەوە ڕیشی خۆی تەکاندوە، ئاوی بەریشی وە بوە، سەری خۆی ڕاوەشاندوە. پاشان ڕاوچییەکە چۆتە ناو ئەو کونە کە لەبنی چاڵەکە دایە، دەبوایە هەموو پێشمەرگەیەک ئەو شوێنە بزانێ کە لەسەر ئەو چیایە وشک و بێ ئاوەدایە. بۆ ئێوارە گەڕاینەوە ئالانە و ڕۆژی دوایی بۆ مەلەکان. دوای چەند ڕۆژێک زانیمان لقی خۆشناوەتی بەفەرماندەیی هاوڕێ موحسین لەو مۆڵگەیەی دوژمنیان داوە، کە (ملازم ئەحمەد و بورهان بلەیی سۆسەیان کردبوو) بەلام ئەنجامەکەم لەیاد نەماوە.

لـەوێ پێیان ڕاگەیاندم، لەگەڵ ئەو مەفـرەزەی لقی هەولێر کە لە مەلەکان بوو، سـادق و شـەهید بڕیار و چەند هاوڕێیەکی تر پەیوەندی بکەم بە لقی دەشـتی هەولێر، کە شـەهید عەباس فەرماندەی بوو.

# چالاکییەکی هاوبەش

شەهید عەباس، سەرلقی دەشتی هەولێربوو، ئێمەش پێشمەرگەی ئەو لقە بوین. ئێوارەیەک لەگەڵ شـەهید کاوە مەخموری ناسـراو بـە کاوە مل درێژ (گەردەنی زۆر درێژبـوو)، لەگەڵ ئەو بەرپرسـە سـەربازیەی یەکێتی کۆبوینـەوە، بڕیاردرا ڕۆژی دواتـر لـە گوندی دۆڵەبەکرە، کە (جەیشـی شـەعبی بوون)لێیان بدرێت. مانگی ١٩٨٢/٧ ، بۆبەیانی چوین بۆ گوندی ئیلنجاغ، زۆری پێ نەچوو شـەهید کاوە بەخۆی و پێشـمەرگەکانی پەیدابوو، ئـەو چالاکیە زیاتر ئامانجی ئەوەبوو، کە لەنێوان پێشـمەرگەکانی شـیوعی و یەکێتی هیچ جیاوازیەک نییە و ئامانجی سیاسـی تێدابوو، هەڵوێسـتێکی دڵخۆشـکەر بوو. بوین بەدوو قۆڵ، قۆڵێک بۆ لای ڕێگاکە، دەیانزانی تانکی سـەربازی لە قوشـتەپە دێ بەهانای جاشـەکان و جەیشـی شـەعبی. ئەو گوندە سـەگی زۆر دڕیان هەبوو، زوو هەشـیار بوونەوە، تەقـە دەسـتی پێکرد، ئەوکات گولە ئاربی جـی زۆر کەم بوو، نەدەبوو بۆ کاتی زۆر زەرور نەبێ بەکاری بێنی. نیو سەعات دەبوو تەقە دەستی پێکردبوو، تانکی دووژمـن بـە ڕێگەی قوشـتەپە هات، خەریک بوو بەسـەر ئەو چوار پێشـمەرگە بکـەوێ کـە ئاربی جیان پێ بوو، بەڵام ئاربـی جیەکە تەقەی پێ نەکرا، چونکە نازانم نە گولەکە نەتەقی، نە ئاربی جیەکە شـکابوو، تانکەکە بە دۆشـکە دەی ڕشـاندین، بـەڵام هێنـدە ئەو چوار بـرادەرە نزیک بوون لێی، ئێمـە دەمانگوت: ئێسـتا تانکەکە دەسـوتێنن لەبەر نزیکی، چاک بوو ئەو چوارپێشمەرگەی نەدی، دوو پێشـمەرگەی شیوعی و دوو پێشـمەرگەی یەکێتی بوون، لەپاش کاتژمێرێک شـەڕ گەڕاینـەوە، بەڵام شـەهید کاوەو شـەهید عەباس بڕیاریانـدا ئەگەر چەک دانەنێن بۆیان دێینەوە، وازیان لێ ناهێنین. ئەوەبوو دواتر چەکی ڕژێمیان فڕێدا. ئەوشـەوە چویـن بـۆ تۆمەرگومبـەت، ئـەوەی ڕێـگای کەوتبێتـە گوندەکانـی

(سـێگردکان، ئۆمەرگومبەت، سـێکانی، قەنبەر و کانی لەلە) دەزانی، ئەو چەند گونـدە زاراوەیەکـی تایبەت بەخۆیان هەیە کە دەچێتەوە سـەر زاراوەی لوڕی و لەکـی ئێـران، ئەو چەنـد گوندە ئاخاوتنی پـێ دەکەن کە ئێسـتا بەداخەوە وا هەسـت دەکـەم لەناو زاراوەی ئـەو ناوچەیە توایەوە، بۆ نمونـە: بە کچ دەڵێن: (دۆیتە) زۆر لە ئینگلیزی نزیکە، ئەگەر بیانەوێ بڵێن: بۆ کوێ دەچی؟ دەڵێن: (ئەرا کورەچی)، پاشـماوەی مانگا، تەڕ بێ پێی دەڵێن: ڕیخ. بەڵام کە وشـک بویـەوە لەهەولێر پێی دەڵێن: سـەرگین، لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان پێی دەڵێن: تەپاڵـە، بەڵام لەو پێنج گوندە دەڵێن (لاس).

ڕۆژێـک، پێشـمەرگەی ڕۆژە سـەختەکان شـەهید قـادر مسـتەفا لەگـەڵ چەند پێشـمەرگەیەک دەچێتـە کانی لەلـە، زۆر سـەرما دەبـێ خانەخوێیەکە دەڵێ: ئادەی (دۆیتـە لاس بیارە)واتـە: ئادەی کچێ تەپاڵە بێنـە، کاک قادر دەڵێ: با هیـچ نەهێنێ بەخوای لە گوندی ئۆمەرگومەت نانمان خواردوە، پێویسـت ناکات هیـچ بێنـێ!! کابرا دەڵـێ: برا (یەژم لاس بیارە).! کاک قـادر، دەڵێ: بەخوای برسـیمان نییـە، نـەک لاس ڕۆحیش بێنـێ پێمان ناخورێ. دوایـی لاس دێت و دەیخەنە ناو سـۆبا، ئەوکاتە کاک قادر دەزانێ لاس مانای تەپاڵەوسـەرگینە.

هـەر لەبـارەی کاک قـادرەوە : لـەو ڕۆژگارە چـەک بەگوێرەی پێویسـت نەبوو بدرێتە پێشمەرگە. کاک قادر چەند تفەنگێکی (ئۆمێکی) هێنابوو(جۆرەچەکێکی سـەدەی ڕابردوو بوو)، لەوکاتە پێشـمەرگە حەزی بەچەکی ڕیز(سـەلیە) دەکرد کە فیشـەک زۆر بگرێ، بۆیە بۆ ڕازیکردنی پێشـمەرگە دەیگوت: کوڕم بەخوای تفەنگی چاکە بۆ هەڵیناگری(خوا حافوت کا)؟!! بەدوو جاران شازدەی دەگرێ، بـە چـوار جاران لە کلاشـینکۆفی زیاتر دەگـرێ، ئاخر تفەنگی ئۆمێک هەشـت فیشەکی دەگرێت.

ئـەو ڕووداوانـەی کـە پەیوەنـدی دارن بەیەکـەوە، ناچارم لـەلای یەکتر کۆیان بکەمـەوە، هەرچەنـدە لەمێـژوی ڕودانیاندا جیـاوازی هەیە بۆ ئـەوەی ئەڵقەی بیرکردنـەوەی خوێنـەر تێـک نەدەم، ڕووداوەکان هێندە سـواری سـەری یەکتر بـوون، جاری وا هەیە دەبێ تۆزێک بگەڕێمەوە دواوە.

لەسـاڵی ١٩٨١ کاتێـک ئێمـە، پێشـینەی سیاسـیمان لەگـەڵ حیزبی شـیوعی هەبـوو، ڕژێمـی بەعـس بەتایبەتی دائیـرەی (ئەمن)، ڕۆژ نەبوو بـەدوای باوکم

و مامـم حوسـێن دا نەنێـرن و ئـازاری ڕۆحیمان نـەدەن، بە باوکـم و مامميان دەگوت: دەبێ فەوجێکی جاشـان بکەنەوە. من ئەوکاتە شـەش مانگ بوو لەناو هەولێربـووم، من بەهانەی چاکم هەبوو کە کەمتر بچمەوە ماڵەوە. ئەو بنەماڵەی کوشـتنی (ا.م) یـان لـە ئێمە دەزانی، هەمویـان بوون بە جـاش و مەفرەزەی تایبەت، بەعسـیش دەسـتی لە پشـتی دان بـۆ نوێکردنەوەی ئـەو دوژمنایەتیە کـە لە بنەرەتـدا دوژمنایەتی ناکۆکی حیزبی شـیوعی و پارتی بوو، نەک ئێمە. ئەوەبـوو مامم حوسـێنیان لە شـەقامی ئەلبـان لەهەولێر شـەهید کرد، لەدوای سـاڵێک کە ئێمە هەموومان پێشـمەرگەبوین. ئەو بنەماڵـە لەناو ئۆتۆمبێلێک لە گەڕەکی (موفتی) دەسـترێژی گوللەیان لێ دەکرێ، دوو کەسـیان لێ دەکوژرێ و هەڵە نەبم برینداری سوکیشـیان هەبوو. ئەو چالاکیە دەنگی گەلی کوردسـتانی یەکێتی خوێندیەوە، هەر ئەو ڕۆژە جاشێک بەناوی (ر.م) لەگەڵ چەند جاشێکی تر دەچن بۆ گوندی گەڕەشـێخان، دیارە ئەو چالاکیەیان لە ئێمە زانیبوو، لەبەر دەرگای قوتابخانەی سـەرەتایی گەڕەشـێخان، (واحید)ی برام لـەو قوتابخانەیە پۆلی پێنجی سـەرەتایی بوو، کە دەزانن ئەوە برای ئێمە و کوڕی عەلی کوتکە، لەبەرچاوی دایکم، لە ١٩٨٣/٢/٢٤ ترسنۆکانە دەیدەنە بەر دەست ڕێژی گوللە و شـەهیدی دەکەن، کە بەهیچ پێوەرێکی عەشایەریش ئەوکارە نامەردانە بەرامبەر بـەو منداڵە نەدەچوە خانـەی تۆڵەکردنەوە. حکومەتی بەعـس لەجیاتی گرتن، پاداشـتی کردن (مەفرەزە خا سه)ی دانێ!! لەدوای ڕاپەڕین کە لێبوردنی گشتی لەلایەن بەرەی کوردستانی دەرچوو، ئێمەی پێشمەرگە پابەندبوین بەو لێبوردنە. بەڵام لەدوای تێپەڕبوونی بیسـت و دووسـاڵ بەسەر ئەو ڕووداوانە و پڕۆسەی بە تێکۆشەرکردنی خائین و خۆ فرۆشان لەلایەن پارتی و یەکێتی، ئەو جارە (ر.م) لەنـاو شـاری هەولێر لە سـاڵی ٢٠٠٣ کە بڕیاری توند هەبـوو لەلایەن حکومەتی کاتـی بەغـداو حکومەتی هەرێم بۆ سـزادانی نوێکردنەوەی ئەم جـۆرە تاوانانە، کەهـەر کەسـێک یەکێک بکـوژێ بەدە کوشـتن ئەژمار دەکرێ، وەهـەر یەکێک دزیێـک بکات بەدە دزی ئەژمار دەکرێ. لەکاتی ئەو بڕیارە توندانەدا، هەڵسـان حاجـی مەحەمەدیان شـەهید کرد، کـە پێشـمەرگەیەکی دانەبڕاوبوو. حکومەتی هەرێـم تاکە یەک ڕۆژ نەیگرتن؟ ئەوا پازدە سـاڵە کاک مەسـعود بارزانی لە بن باڵـی خـۆی ناون، دەیەوێ سـوڵحی عەشـایەریان بۆ بـکات، ڕۆژ نەبوو ئازاری

ڕۆحی ئامۆزاکانم و ئێمە نەدرێ لەلایەن کاک نیهاد بارزانی، کە دەیگوت: ئەمری جەنابی ســەرۆکە دەبێ ســولْح لەگەڵ ئەو جاشــە بکەن، کاتێک ئێمە هەموومان پێشــمەرگەی دانەبراویــن. نامــەوێ زیاتــر ڕۆبچمە ناو ئەم بابەتــە، کاتی خۆی، جاشی ناوبراو لەگوندی پەرکانەش چەند پێشمەرگەیەکی سۆسیالیستیان گرت و تەســلیم بە ڕژێمیان کردن، لە هاوینی ١٩٨٣ لە سێدارە دران.

# جێبەجێکردنی چەند ئەرکێك

پایــزی ١٩٨٢ لقــی دەشــتی هەولێــر، بــە فەرماندەیی شــەهید عەبــاس (دە) پێشــمەرگەیان ئەرکدارکرد بەسەرپەرشــتی کەریم قادر، ناســراو بە (سادق ،کە ئێســتا ئەندامی لقی پارتیە لە مەخمور). من و، هاوڕێیان: هەڵکەوت و، شــەهید داود و، عەباســی حەمەڕەشید برای شــەهید کانەبی گچکە و، شەهید ئیسماعیل چۆمــە زەردەرە و، کارزان و ،ئامۆزایەکــی هــاوڕێ مــەلا جەلال (کــە ماڵیان لە گوندی ماجید) بوو، شــێخ لەتیف. دەبوایە بچینە چیای قەرەچوغ ، دەبوو شەو بــە بــێ لایت ڕێ بکەیــن، خۆمان بگەیەنینــە ئەو چیایە، پێش ئــەوەی ڕووناک دابێت. ئۆتۆمبێلێکی لاندرۆڤەری درێژمان لەلا بوو، لای ســەرەوەمان لێکردبوەوە هەتا ئاســتی کوشــینەکان، بۆ ئــەوەی لە کاتی هاتنــی هەلیکۆپتەر بتوانین زوو بڵاوببینــەوە. چەندگونییەیەکــی ڕەنــگ خاکیمان لەیەکتــری درووی بوو، تا وەک چادرێک ئۆتۆمبێلەکەی پێ دابپۆشین، وەک کەرتە شاخ دیاری دەکرد. فیشەکی زیادمان هەڵگرتبوو، چونکە لەقەرەچوغ کەس نەدەگەیشتە فریامان. شەومابوو، گەیشــتینە گونــدی مەلاقــەرەو ماجیــد. چوینە ماڵــی ئامۆزاکەی مــەلا جەلال، بەداخــەوە ناوەکەیــم لەیاد نەماوە. بەم شــەوە قەلیان ســەر بڕی، قەل بەشــلە ساواریان لێنا، نانمان خواردو بەڕێکەوتین بۆ قەرەچوغ. لای گوندی کورتان درو خۆمان کرد بە گەلیەکدا، ئۆتۆمبێلمان داپۆشی و بە خۆمان سەرکەوتین بۆ لای ســەرێ. لەوێ دابەش بوین، هەر دوو پێشــمەرگە لەبن بەردێک، دەبوایە تاوەکو تاریــک دادێ لەقەرەچوغ نەیەینە خوارەوە، هەرچەنــد هەنگاوێ دوورکەوتینەوە ئۆتۆمبێل وەک کەرتە شــاخێک دیار بوو.

بەشانسترین پێشمەرگە ئەو پێشمەرگانەبوون کە لەلای ئێوارە لێیان دەقەومێ و نزیک دەبنەوە لەشەو. سادق فەرماندەمان بوو، پاش نیوەڕۆ گوتی: با بچینە ئەو گوندەی کە لەدامێنی قەرەچوغ بوو، هەندێک ماڵە مەڕداری هەرکی لێ بوون لە ئاقاری گوندی هەڵە نەبم (شێخەلاس)، من زۆرم خەو دەهات. من و سادق لەیەک ماڵی مەڕدار بوین، پێشمەرگەکانی تریش دابەش بوون بەسەرماڵەکان، من گوتم: هاوڕێ سادق تۆزێک چاو گەرم دەکەم. ڕووم لە دیوار کرد، تفەنگەکەم لە نێوان خۆم و دیوار درێژ کردبوو، کچی ئەو ماڵە مەڕدارە چای تێ دەکرد، سادق وایزانی من خەوتووم. کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کچە، پێم وابوو دەیویست کاتەکەی پێ بکوژێ، دەیگوت: مێردت کردیە؟

کچە: نەخێر.

سادق: وەڵا منیش ژنم نییە، ئەوە چیە لەملت؟

کچە: خەناوک.

سادق: ئێمەش پێی دەڵێین خەناوکە، ئەدی ئەوە چیە لە پەنجەت؟

کچە: گوستیل،

سادق: ئێمەش پێی دەڵێین ئەنگوستیلە. جارجار هەستم دەکرد کچە لەبەری هەڵدەهات، بە پێکەنینەوە دەگەڕایەوە ژوورەوە، دیارە لە سادقی دەپرسی ئەوە گوێی لێیە؟ واتە من. سادق دەیگوت: نوستوە. ئاخر کەسێک گوێی لەقسەی کوڕوکچێک گرتبێ، ئەگەر نەک شەوێک ساڵێکیش نەخەوتبێ، کوا خەوی لێ دەکەوێ؟!! دیاربوو کچە خۆی بەدەستەوە نەدەدا، منیش هەستامە سەرپێ فیشەکم لێ خوڕیە بەر تفەنگێ، گوتم: دایکم بەڵێنی پێ بدە، با ببڕێتەوە، تاوەکو تەقەی خۆشی بکەم. کچە دەرپەڕی بۆ دەرەوە، سادق گوتی: کافر لەمێژە بەخەبەری؟ منیش گوتم: لە خەناوکێ ڕا بەخەبەرم!! سادق گوتی: هاوڕێ حازم (جددەن تەبیعیە).

دەبوایە بچینە گوندێکی (شەمامک) ناوی کابرایەک درابوو کە موختار و جەیشی شەعبی بوو، سیخوڕی بەسەر پێشمەرگە و هاوڵاتیانەوە دەکرد، تەمبێی بکەین لەگەڵ دوو کەسی تر لە گوندێکی ئەو ناوە. کابرامان گرت، لە پاش ئەوەی نیوە مردووکرا، بەحاڵ نوزەی مابوو بەڵێنی دا ئیترخراپە نەکا، ئەوەبوو وازی لە خراپە نەهێنا، پێشمەرگەکانی یەکێتی پاش ساڵێک کوشتیان. هەموو ئەوانەی

بۆمـان دیاریکرابوو لەو ناوچەیە جێبەجێمانکـرد. لەگوندی عەوێنە، بەڕێوەبەری قوتابخانەیـەک مابـوو کە لەگەڵ خۆمان بیبەین، ئەویشـمان لەناو ماڵ و منداڵی دەرهێنـا بردمـان. لەگوندی جدیدەی لەکان، دەبوایـە پێش ئەوەی بە ئۆتۆمبێل بچینـە ناوهـەر گوندێک، دوو پێشـمەرگە لە پێشـەوە گوندەکـە تاقی بکەنەوە، لەبەر کەمینی جاش و بەعسیەکان. من و شەهید ئیسماعیل خۆمان فڕێدا بچینە یەکەم ماڵ بپرسـین: ئاخۆ گوندی جدیدە چەکدار و کەمینی لێیە یان نا. چوینە ماڵێـک، لەسـەرپەڕی گونـدی بوو، بانگمان کـرد: ماڵێ، ماڵـێ؟ ژنێک وەڵامی دایەوە. لێمان پرسی: ئاخۆ کەمین لەناو گوندی هەیە یان نا؟ گوتی: هەتا ئێمە نوستین کەسی لێ نەبوە. کارزانیش (حسین نەبی) هێندە بێ ئۆقرە بوو، گوتی: هاچی بوو هاوڕێ حازم؟ گوتم: وەرە هیچی لێ نییە بەڵام دنیا مانگەشـەو بوو، دەتگوت ڕۆژە. هێندە ڕووناک بوو من و شـەهید ئیسـماعیل سواری ئۆتۆمبێلەکە بوینەوە، لەناو گوندی جدیدە لەسـەر کۆشـک و بانێکی گەورە ئێمەیان دەنگدا: کێن ئێوە؟ شەهید داود، بە چەکی (ئاربیکە) بەمەخزەنی (حەفتاوپێنج)فیشەکی لەسـەربوو، نازانم چۆن وا دەسـت گەرم پێش ئەوەی خۆی لە ئۆتۆمبێلەکە فڕێ بدا، ئەو مەخزەنە فیشەکە ئاگردارەی بە ڕوودا تەقاندن، وەک شارە زەنگەسورە بـەر هەڵبێ، تومەزە پێشـمەرگەی سۆسیالیسـت بوون!! کاتێـک کارزان بانگی منی کردبوو هاوڕێ حازم چی بوو، ئێمەیان ناسی بوو. بەڵام نازانم بۆ دەنگیان داین!! یەکێکیان گوتی: هاوڕێ حازم ئێمەین، پێشـمەرگەی سۆسیالیستین تەقە مەکەن، ئینجا هاتنە خوارەوە باش بوو کەسی نەپێکابوو، بەڵام من تەنها خەمی ئـەو بەڕێوەبـەرەی گونـدی عەوێنەم بوو، ئاخر لە ترپی سـەی دەچـوو، ئەگەر بکوژرابایە.

بەوشـەوە لـە ڕێگەی هەولێر مەخمورو هەولێر پـردێ پەڕینەوە، دنیا ڕووناک دا هاتبوو گەیشتینە کەلی قەشقە، شۆڕبوینەوە گوندی قەشقە و خوڕخوڕ، دیاربوو شـەهید عەباس لەگەڵ پێشمەرگەکانی لقی هەولێر لەچاوەڕوانی ئێمەبوون. ئێمە زۆر مانـدوو شـەکەت و تـۆزاوی بویـن، شـەهید عەباس گوتی: دابـەش بن لەو ماڵانـەی خوڕخـوڕ نانێک، چایەک بخۆن، تۆزێک بخەون چونکە ئێمە دوو شـەو لەسـەریەک دوو کاتژمێر نەخەوتبوین!! گوتی: هاوڕێ حازم، تۆ ئەو مامۆسـتایە لەگـەڵ خـۆت ببە، گیرابوو لای ئێمە. منیش مامۆسـتام لەگەڵ خۆم بردە ماڵی

یـەک لەو خزمانەی خورپخورپ. نانمان خـواردو تۆزێک خەومان لێ کەوت، کاتێک هەڵسـام پێش نیوەڕۆ بوو، لەمامۆســتام پرسی: تۆ گوناهت چیە، چیت بەخۆت شـک دێت؟ چاک نەبوو ئەو شـەو نەکوژرای!! دیاربوو مامۆســتا ئەو پرسیارەی زۆر لا خۆش بوو، گوتی: هیچ بەخۆم شـک نابەم، یەک شـت هەیە، ئەگەر ئەوە نەبێ، دیارە من تاوانبارم، هەرچی لەگەڵم بکرێ شـایانمە.

گوتم چیە؟ مامۆسـتا گوتی: من بەڕێوەبەری قوتابخانەی عەوێنەم، کچێک لەلای ئێمە مامۆســتایە دەیەوێ بەڕێـک و پێکی دەوام نەکات و وانە نەڵێتەوە، منیش ئـەوەم پـێ قبوڵ ناکـرێ، ئەو کچە برایەکـی لەگەڵ ئێوە پێشـمەرگەیە، ئەگەر لەرێگای ئەو برایەی ڕاپۆرتی لەسـەرمن نوسـی بێ، ئەوا مـن بێ گوناهم، تەنها ناتوانم چاوپۆشی لەدواکەوتن و وانە نەگوتنەوەی بکەم، ئەگەر کەسی تر بەدەر لـەو کچە کە مامۆســتایە لای ئێمە، هەرچی لەسـەرم نوسـرابێ دیارە ڕاسـتە، بەسـزای خـۆم ڕازیـم. منیش چووم ئـەوەم بەرێک وپێکی و بێ زیـادو کەم بۆ شـەهید عەباس و هاوڕێیانی بەرپرسم گواسـتەوە، ناوی مامۆستا کچەکەشم پێ گوتـن. پـاش نیوکاتژمێر شـەهید عەباس بانگـی کردم، گوتی: هـاوڕێ حازم، ئـەوە پێنـج دینار، لەو ماڵە خزمانــەت تراکتۆرێکی بۆ بگـرە پارەکەی بۆ بدە، با بیگەیەنێتەوە سـەر ڕێگەی سـەرەکی. منیش تراکتۆرم بۆ گرت، گوتم: وەرە مامۆسـتا ئازادی، قەمسەڵەیەکی ڕۆمانی لەبەربوو، قەمسەڵەکەی داکەند، گوتی: ئەوە بۆ تۆی بەجێدێڵم، بەڵام من سوپاسم کرد، گوتم: من قەمسەڵە لەبەرناکەم، سوپاسـت دەکەم با خۆت سەرمات نەبێت، بەڕێمکرد.

ڕۆژێـک هاوڕێ (ش) کە سـاڵانێک بەیەکەوە پێشـمەرگە بویـن، دەچێتە گوندی کونەگورگ کە دەکەوێتە باشووری هەولێر. دەچێتە حەوشەی ماڵێک دەبینێ ڕستەی جلـکان لەناو حەوشـەی ماڵەکە پڕە لە جلوبـەرگ، ئەویش خۆی دەچەمێنێتەوە بـە بـن جلەکان ڕەت دەبێ. دەچێتـە ژووری ئەو ماڵە، کابرا فەرموی لێ دەکات ئەویش دادەنیشـێ، کابرای خانەخوێ هەر سـەیری سـەروجامانەی هاوڕێ (ش) دەکات، لەپـڕ بانگـی کچەکـەی دەکات زۆر بە تورەیی دەڵـێ: وەرە کچێ. کچە بەپەلـە دەچێتە ژوورەوە دەڵێ: ها بابـە چیت دەوێ؟ ئەویش پێی عەیب دەبێ قسـە بـکا هـەر بە ئاماژەو زمانی جەسـتە دەیەوێ ئاماژە بکا و سـەرنجی کچە بۆ لای جەمەدانی هاوڕێ (ش) ڕابکێشـێ. لەوکاتە هاوڕێ (ش) قوشـقی دەبێ،

نازانــێ مەســەلە چیە! لەدڵــی خۆی، دەڵێ: دەبێ شــتێکی نابەجێــم کردبێ و نەمزانی بێ!! ئەویش تەبای ئەوان کە ســەیری لا ســەرێکی خۆی دەکات، بزانێ چــی پێوەیــە، دەبینێ کاتێــک بە بن جلەکانی ناو حەوشــە ڕەتبوە، دەرپێیەکی ژنان بەســەرو جەمەدانی هاوڕێ (ش) هەڵواســراوە. بۆیە بە شــەرمەوە دەرپێیە ژنانەکــە بەلای پشــتەوە بەردەداتەوە بۆ ئەوەی کچەکــە لەگەڵ بالیف دانان یان هەر شتێکی تر هەڵیبگرێ.

## پێ بەپێ پێشمەرگایەتیم دەستی پێ کرد

ماڵی ئێمە ژمارەمان دوازدە کەس بوو، واتا دوازدە پێشمەرگە، باوکم و پێنج برا و شەش ئامۆزا بوین، هاواری برام و ئەردەلانی ئامۆزام تەمەنیان زۆر بچوک بوو، باوکــم دەیگــوت: ئاگاتان لێیــان بێت، نەخەون لێمان بەجــێ بمێنن، یان تفەنگ لەبیر بکەن. ئەوانە بچوکترین پێشــمەرگەی کوردستان بوون، بەڵام ئێستا کوڕی بەرپرســێکیان کردۆتە بچوکترین و کەم تەمەنترین پێشمەرگە. لەوەش هەر زوڵم لە ئێمە کراوە، بۆ نمونە: تەمەنی ئەردەلان ) دوازدە (ساڵ بوو. پێشمەرگایەتی ئەوکات سەخت بوو، پێش نوێژی شێوان دەچوینە گوندێک، دابەش دەبوین، هەر دوو پێشمەرگە بۆ ماڵێک، نهێنی شەو دەگوترا، ماڵەکان زۆربەیان نەداربوون، لەو وەزعە بێزار ببوون. لەدەشــتی کۆیە و بەســتی شەرغە یەکێتی دەڕۆیی، شیوعی دەیگوت: ســەلام و عەلەیەک، شیوعی دەڕۆیی، سۆسیالیست، کە ئەوکاتە ئەوان گەورەتریــن هێــزی ناوچەکــە بوون. نانی شــێوانمان دەخــوارد، دەبوایە بڵێین: خوشــکم نانــی بەیانیمــان بۆ دانێ، ئەویش چوار نان و یان ســەلکە پیازێ، یان تۆزێ ماســت، یان ســێ چوار تەماتە. زۆرجار دەیگوت: کاکە بەخوای پێخۆرمان نییە دەبێ ببورن. پاش ئەوە خوشــکە دوو نوێنمان بدەرێ، نوێنی پێشــمەرگە جیابــوو، دوو کەچــە بەتانــی یــان کەچە لێفێک بــوو، جارێکیان کەچــە لێفێک بەرمن کەوت، شــەو لە مزگەوت هێندەم ســەرمابوو، ئەوەندەم خۆ وەرگێڕابوو، لێفەکــە کــون بوو، پەمۆی ناو لێفەکە خڕخڕ بــوون ئەوەندە کۆنبوو، هیچی تێدا نەمابــوو، ناوئــەو مزگەوتەی ڕاگێرابوو!! گوتم: هاوڕێیــان بەیانیتان باش، کەس

نـــەڕوا ئـــەو پەمۆیەم لەگەڵ لەو لێفەی بکەنەوە. ئێســـتا زۆر برادەر و دراوســـێ پێـــم دەڵێن: کاک حازم، بۆ نایەیت بـــۆ مزگەوت؟ منیش دەڵێم: برام من نیوەی تەمەنـــی گەنجیم لەناو مزگەوتەکانی کوردســـتان بەســـەر بردوە، زۆر شـــەو هەر لەخەڵوەتـــگای مزگەوت بووم، هیـــوادارم ڕۆژی ئەژمار بۆم بێتە ژمار ئەو ژینەی لەناو مزگەوتم ڕابورد.

شـــەوی وا هەبوو کە لەماڵان دەگەراینەوە بۆ مزگەوت، لەخۆمان ئەمین نەبوین، چونکـــە زۆرجـــار کەمینی جاشـــە شـــارەزاکانی ناوچەکە هەبوو، ئەوانەی ئێســـتا بـــە عەقیـــد و لیوا لەســـەر لیســـتی پارتـــی و یەکێتی خانەنشـــینن، دەهاتن یەک دوو پێشـــمەرگە بکوژن، پاداشـــتی چاک وەربگرن. بۆیە پێش ئەوەی بە عەلاگە ڕەشەکەی خواردنی بەیانی و هەردوو نوێنەکە بگەڕێینەوە، یەکێکمان شتەکانمان هەڵدەگرت، ئەوەی تر تفەنگەکەی لەســـەر پێ و لەناو دەســـتی پێش دەکەوت بۆ مزگـــەوت، نەدەبوایـــە هەردووکمان دەســـتمان بگیرێ بەو شـــتانەی پێمان بوون. وردە وردە پەیـــدا دەبوونـــەوە لە مزگەوت. زۆرجار ئەگەر ئەو شـــوێنە لەناوچەی دوژمـــن نزیک بوایە، ئەوا کەمینیش دەردە

کـــرا. تـــا نانمان دەخوارد. جـــا دەبوایە کەمیـــن بگۆڕین، ئەوانیـــش نان بخۆن ( ئەوە زســـتانان). هاوین هەر لەدەشـــت لەســـەر زەوی دەخەوتین ئەمین بوو. لە مزگـــەوت دوو پاســـەوانی چـــاک دادەنرا. یـــەک بەدوای یـــەک دەمانگۆڕین، بەڵام پاســـەوانێک سەری ســـەعات دەگۆڕدرا ئەوەی تر ســـەری نیو سەعات بۆ ئەوەی گۆڕینەکان لەیەک کاتدا نەبن. نەدەبوو تابەیانی لە مزگەوت لێی بخەوین، ئەوەی مـــن زۆرم پـــێ ناخـــۆش بوو، دەبوو هێشـــتا شـــەو بمابایە، تاریـــک بایە، ئەوەی پاســـەوانی ئەوکاتانـــە بوو بانگـــی دەکردین، بەچاوی پڕ خەوەوە هەڵدەســـتاین، نوێنەکانمان لەســـەریەک دادەنا و قەدمان دەکردن، ڕۆژی دواتر ماڵەکان دەهاتن دەیانبردنـــەوە. ئێمـــەش لەگونـــد وە دەردەکەوتین، بەلام یەک لـــەدوای یەک بە ئەســـپایی لەترســـی کەمین، کە لەناو گوند دەبوو بە ســـەگوەڕ، ئێمە ئاراســـتەی خۆمـــان دەگـــۆڕی بۆ لای پێچەوانـــە بۆ ئەوەی ئەگەر ســـیخوڕی ڕژێم لەو گوندە هەبـــێ وا بزانـــێ بۆ لای ســـەگوەڕەکە ڕۆیشـــتوین، نەوەکو بـــۆ بەیانی هەواڵگری بکات، چونکە چەندین دەســـتە پێشـــمەرگە ئاوا شـــەهید ببوون، زۆرجار شـــوێن پێیەکانمان ڕەش دەکردەوە، بە ڕاکێشانی لقە دارێک یان قەمیشێک، لە شوێنی

هەستیار دەڕۆیشتین تاوەکو لە ئاقاری ئەو گوندەی لێی بوین دەردەچوین، لەوێ لە بن ئەو گەورە شاخ و کەند و دۆڵانە دابەش دەبوین. دوو، دوو پاسەوانی ڕۆژ دەخوێندرایەوە، پاسەوانێک یان دوو پاسەوان.

نەدەبوایــە پاســەوان جلی شــازو دیــاری لەبەربوایە، مەبەســتم ڕەنگەکەیەتی. نەدەبوایە بە پێوە بوەســتێ، دەبوو لەســەر سک ڕابکشێ، خۆی نەجوڵێنێ، وە یا ئەگەر شــوێنەکە چاک بایە دابنیشــێ و نەجوڵێ لەو کاتانە هەلیکۆپتەر چاوی پیاوی دەردەهێنا، هێندە بەســەر ئەو ناوچانە دەخولایەوە، ناوە ناوە پاســەوان بانگــی دەکرد: برادەران کۆپتەرە نەجوڵێن. دەبوو ببین بە بەرد.

بەیانیان کە دەگەیشــتینە شــوێنی مەبەســت هەر کەســە نایلۆنە ڕەشــی خۆی دادەنــا، ئیــداری وا هەبوو هەموی کۆدەکردەوە، هەبوو ماســتی پێ بوو، هەبوو تەماتە، پیاز، نانی وشــک...هتد. ماســتەکە دەدرا بەو کەســانەی کە نەخۆشی گەدەیان هەبوو، ئەوەی تر بە یەکســانی دابەش دەکرا، هەر کەســە و بۆخۆی، نایلۆنــە ڕەشــەکان کۆدەکرانــەوە لە کەلێنــێ ژێرخاک دەکران، بــۆ ئەوەی هیچ ئاســەوارێکی ژیانی لێ نەمێنێ، لەبەرگە پاکەت و زۆر شتی تریش.

بــۆ ئێوارە لە کونە شــاخەکان دوو دوو دەردەهاتیــن، هەرچەندی بەرەو ئێوارە دەچــوو، ئومێدمــان بەژیان زیاتر بــوو، چونکە ئەگەر بەرەو ئێوارە توشــی هەر شەڕێک بوینایە، بۆ ئێمە باشتر بوو، ئەو ڕۆژەی مەفرەزەمان بۆ خوارەوە بەڕێ بکردایــە لە گوندە نزیکەکانی نزیک بە ڕژێم دابەش دەبوین.

# ئومێدی چەپڵەیەك لەدوای شەهید بوون

ڕۆژی مابــوو، لەگونــدی بایزئاغــا دابــەش بویــن، کچێکی لاڵ و بیرکــۆڵ، ناوی ئایشێ مام عەوڵا بوو، پێشمەرگەی زۆر خۆش دەویست، زۆربەی پێشمەرگەکانی یەکێتی و سۆسیالیست و شیوعی دەناسی، لەیادمە یەک لە برادەرەکانی شەهید کەریمی برام ئەمنی بە ئایشــێ ناســاند، پێی گوت: ئەوە برای شــەهید کەریمە، لەجێــگای کەریــم بۆتــە پێشــمەرگە. ئایش خەریک بوو بمخوا، پاشــان ســەری

داخست و فرمێسکی بەسەر ڕوومەتە هەتاو گاز و قەڵشاویەکانی هاتە خوارەوە. ئـەو فرمێسـکانە بۆ من هەزار مانای دەبەخشـی، پێم وابوو ئایشـی لاڵ دەڵێ: شـەهید کەریـم بۆ ئێمە پێشـمەرگەبوو، ئێمە لەیـادی ناکەین، بـۆ ئێمە گیانی بەخشی. لەشەڕێکی نابەرابەر شەهید بوو، زۆر شتی تر.. . پاشان بە ئیشارەت حاڵـی کـردم کە بچمە ماڵی ئەوان، ناچار هاوڕێیان گوتیان: شـەهید کەریم زۆر لـەو ماڵـە دابـەش دەبوو، پێمـان چاکە بچـی. ئایش، وەک هەمیشـە کەوا پێ خواس بوو، بەپێخواسـی بەپێشـمان کەوت، بەو لورە لورەی خۆی خۆشـحاڵی خـۆی دەردەبـڕی. هەندی بلێی یەک و دوو هەمـوو ماڵی خۆیانی حاڵی کرد کە من برای شـەهید کەریمم. ئایش پرسـی: شەهید منداڵی هەیە؟ پێم گوت: بەڵێ (سێ) منداڵی لەپاش بەجێماوە، دوو کوڕو کچێک، دەستی بەرزکردەوە شوکری خودای کرد. خۆزگەم دەخواسـت شـەهید کەریم بۆ پێنج چرکە زیندووببایەوە، ئایشـێی بدیبا، چەندەی بۆ پەرۆشـە، بۆ ئەوەی بزانێ کە ئەو خەڵکە شـایانی ئەوەیە، لەپێناو مافەرەواکانیدا شـەهید بێ.

لە شـوێنی مەترسیدار و لە کاتی شەڕەکاندا، کاتێک هیوای دەرچونمان ئەستەم دەبـوو، یەکسـەر دایکـم و منداڵەکانی خـۆم دەهاتنەوە یاد، کـوڕە گەورەکەم (ئاراس)، بیرم دەکردەوە دەمگوت: ئەگەر من شەهید بم ئەوا ڕۆژێک دادێ شۆڕش سـەردەکەوێ. لە قوتابخانە بە منداڵەکان دەڵێـن: بەیانی کۆبوونەوەی باوکانە، باوکتـان بێت بۆ قوتابخانـە. بەیانی ڕۆژی دواتر هەمویان باوکیان ئامادە دەبێ، بەڵام ئاراسـی کوڕم باوکی نەماوە، مامۆسـتا لێی دەپرسێ: بۆ باوکت نەهاتوە؟ لەوەڵامدا ئاراس دەڵێ: باوکم شەهیدبوە. لێی دەپرسێ: لە کوێ؟! دەڵێ: باوکم لە فلان داسـتانی پێشـمەرگە شەهید بوە. مامۆسـتا دەڵێ: چەپڵەیەکی قایم بۆ ئاراسـی کوڕە شـەهید. باوەڕتان بێت چەندین ساڵی پێشـمەرگایەتیم، بەهیوای ئـەو چەپڵەیە لە پاش خۆم بۆ منداڵەکانم لێ دەدرێ، بەرێکرد.

ڕۆژێک شەهید عەباس گوتی: دەمەوێ لەگەڵ قەهاری مام عەلی، شەهید وەیسی لە ڕێگەی سەرەکی (هەولێر- کەرکوک) بپەڕێننەوە، دەچێت بۆ چالاکی ناو شار. ئەوەبـوو دوو ڕۆژ پاش ئـەوەی پەراندمانەوە گەڕایەوە، ئۆتۆمبێلێکی زۆر مۆدێل بەرزی ڤاڵڤۆی هێنا بوو لەگەڵ شـۆفێرەکەی، کە شـۆفێری ماڵی حوسێن ئاغای سـورچی بوو. لە مزگەوتی گوندی بێسـتانە بوین، شـۆفێرە دیلەکە پرسـیاری

وێـــسـکی دەکـــرد، لەکاتێکـــدا ئێمە خواخوامان بـــوو چا هەبـــێ بیخۆینەوە. بۆیە بـــرادەران گوتیان: بیبەنە دەرەوە تۆزێک ئامۆژگاری بکەن، (مەبەســـتیان لێدان بوو). منیش گوتم: لێی مەدەن هەر یەکێکتان، دوودانە ئەسپێی لەلەشی خۆتان بگرن، بیخەنە ناو کراســـی ئەو برادەرە، لە لێدان باشـــترە. با بزانێت ئێمە چۆن دەژین.

## کەس نەما لای ماڵی مام عەلی ئەم درۆیانە بکەی؟!

بەستی شەرغە گوندێکی زۆری لەسەرە، لەهەردوو بەر لە گوندی پەرکانە، لەماڵی مـــام حەســـەن و پلکە ســـەفیە بوین کـــە هەردووکیان خزممان بـــوون، کابرایەک میوان بوو، هەر کەزانی ئێمە پێشمەرگەی حیزبی شیوعین، کەوتە باسی کێشەی چینایەتـــی و جوتیـــاران. گوایـــە بەگژ وەزیری کشـــتوکاڵ هاتوەو لەســـەر زەوی گوندەکەیان شرت و شۆی وەزیری شکاندوە، بەعەرەبیەکی زۆر سەقەت. جەنگی و ئاســـۆو ئەوانی تر، هەموو وشـــەکانیان لەبەر کردبوو، ڕۆژی دوایی لەمزگەوتی گوندی نێرەگین، پۆلێک پێشـــمەرگەی سۆسیالیستیشـــی لێبـــوو، هەر هەموومان لاسایی کابرای ماڵی مام حەسەنمان دەکردەوە، کە دەیگوت: (هزا ئارازی زراعیە، چونکە نزیکی گوندییە، دەست نادا للتجاریە) زۆرم لەبیرچۆتەوە، ماوەیەک بوو، ببوە وێردی ســـەر زمانی براو ئامۆزاکانم، لەناکاو پێشـــمەرگەیەکی سۆسیالیست بۆ ئەو قســـانەی هەموو نەناســـیبووەوە!! لەپڕگوتی: ئەوە ئەو سەگبابەی مامم لە کوێتان کەوتە بەردەســـت؟ ئاخر هەی ســـەگباب کەس نەما لای ماڵی مام عەلی ئەو قســـە تەراوزو درۆیانە بکەی؟ هەرچەندی ویســـتم پینەو پەرۆی بکەم بەڵام بەلاش بوو، گوتی: کاک حازم، بۆ خۆم قســـەکانی دەناســـم پێویست ناکات.

## فرچکی هیچ سۆسیالیستێك لەجێ نەچووە؟!

ڕۆژێـــک مێـــرد منداڵێک، تەمەنی (پازدە بۆ شـــازدە) ســـاڵێک دەبـــوو، لەگوندی بایزاغا پەیدابوو. لە دوای چەند پرسیارێک لێی، گوتی: هاتومە ببمە پێشمەرگە.

هاوڕێیــان باوەڕیان پێــی نەبوو، بۆیە نارنجۆکێکیان داین، گوتیان: برۆ لەهەولێر ئەو نارنجۆکە باوێ ماڵی (فلان)، ئینجا باوەڕت پێ دەکەین. نارنجۆکی لەبەرپشتی ئاخنی و ڕۆیشــت، بەراستی ئەو منداڵە بۆ ئەو چالاکیە نەدەبوو.

باش بــوو لەگونــدی پونگینــە برادەرانی یەکێتی کــە دەبینــن نارنجۆکی پێیە دەیگــرن، لەگوندی شاخەپیسکە کوڕەکــەو نارنجۆکیان دایەوە ئێمە. بۆ شــەو لەمزگەوتــی شاخەپیســکە، هاوڕێیــان دەوریــان دابوو، هــەردوو قاچیان جووت کردبــوو، لەکــوردەواری دا یەکێــک ئاوا لــە منداڵی دەکات کە پێــی دەگوترێ: (فرچک هێنانەوە)، دەســتیان لەژێر پێی دەدا دەیانگوت:

( فرچکــە وەجێ فرچکێ سۆسیالیســتەکی بچی لەجــێ فرچکی ئەو هاوڕێیەی بێتــەوە جــێ)، تــەواو نخونیان دەکــردەوە، گوتیــان: دەبێ هەڵێی بــۆ ماڵەوە تــا فرچکــی سۆسیالیســتێکی لەجــێ دەچــێ و فرچکی تــۆ دێتەوە جــێ، لێرە نەتبینینەوە، هەڵات و ڕۆیشت. ناوە ناوە وەڵامی بۆ شەهید عەونی دەنارد، ئایا فرچکی هیچ سۆسیالیســتان لەجێ نەچوە بۆ ئەوەی بێم ببمە پێشــمەرگە؟!!

## شاندانە بەرئومەمیەتێکی تاکلایەنە

زستانی ساڵی ١٩٨٢،شەهیدان وەیسی و داود، ئۆتۆمبێلێکی ئەمبولانس (اسعاف) لەنــاو هەولێــر دەرفێنن، ئەوکاتە هێنانــی ئۆتۆمبێلی ڕژێم باو بوو، لەلای هەموو لایەنەکانــەوە. بــەڵام کە شــەهیدان وەیســی و داود ئــەو ئەمبولانســەیان هێنا، هاوڕێیان لەدەوری سوڕان نوسرابوو: دیاری وڵاتێکی سۆسیالیستی بوو بۆ عێراق، هاوڕێیان گوتیان: هەڵەیەکی یەکجار کوشــندەیە، ئێمە دیاری وڵاتانی ئیشتراکی برفێنیــن!! لەکاتێکدا بەخۆمان دەڵێین ئێمە (ئومەمین) چۆن ئەمبولانســی وڵاتی پۆڵۆنیای سۆسیالیستی برفێنین!

ڕۆژانە ئێمە شــەهیدمان دەدا، بە هەلیکۆپتەر و فڕۆکەی ســیخۆ و چەک و تانک و گوللەی وڵاتانی ئیشــتراکی، لەسەروی هەمویان یەکێتی سۆڤیەت.

ئەوانەمان هیچی وەبەرچاو نەدەهات، تاک لایەنە شانمان دابوە بەر (ئومەمیەت)، بــێ ئــەوەی کەس پێ بزانێ وە یــان منەتی پێ بێ. هاوڕێیــان چەند نامەیەکی لێبوردنیــان بەچەند زمانێکی بیانی نوســی، چونکە ئێمە خەڵکی زۆر خوێندەوار

و ئەکادیمیانەمـــان لەگــەڵ بوو. نوســرابوو: ئێمە مەفرەزەکانی حیزبی شـیوعی عێراق، بە هەڵە دەســتمان بۆ ئەو کارە بردوە، ئەوا بۆتان دەنێرینەوە.
ئەوەبوو ئەمبولانســەکەیان بردە نزیک شــاری هەولێر، لای دەواجنێک دایان نا. نەک خوانەخواســتە (ئومەمیەتەکەمان) لەکەدار بێ و بکەوێتە ژێر پرسیارەوە!!
لەبیرمان چووبوەوە، هێرشــی بەعس بۆ ســەر حیزبی شیوعی و قڕچ و بڕکردنی ئەندامەکانی وڵاتە سۆسیالیستەکان، لەسەروی هەمویان ڕوسیا، لەگوڵ گرانتریان بەســەدام و بەعــس نەگــوت!! بگرە چــەک و تەقەمەنیان زیاتر پێ فرۆشــت، تا ڕۆژانە ئێمەی پێ بکوژێ. ئێمەش چۆن یەکلایەنە لەحەفتاکان شانمان دابوە بەر (جەبهەی وەتەنی)، هەر بەو نەفەســە کوێرانە شــانمان دابوە بەر (ئومەمیەت).

# شەونخونی و شەهیدبوون

هاوینی ١٩٨٢ شــەهید عەباس گوتی: هاوڕێ حازم لەگەڵ ( قەهاری مام عەلی کوێخا قادر) کە لە (گوندی گەڕەشێخان دراوسێ بوین)، هاوڕێ وەیسی و هاوڕێ شــاخەوان لەگــەڵ خۆتان بــەرن، ئێوە شــارەزان لەڕێگەی ســەرەکی (هەولێر-کەرکوک) لەنزیک گوندی گەڕەشێخان بیان پەڕێننەوە هەتا دەیان بەنە ئەوبەری ڕێگاکە، بۆ لای گوندی دووکەڵە و قازیخانە، پاشان تۆو هاوڕێ قەهار بگەڕێنەوە ســەرێکی ماڵــەوە بــدەن، بۆتــان هەیە دوو شــەو لەماڵــەوە بمێننــەوە، هاوڕێ ڕەحمان چاوشــینیش ماڵــی لای ماڵەکانی ئێمە بوو، لەگــەڵ هاوڕێ ڕەحمانیش یەکتربگرنەوە، بەڵام زۆر وشیاربن.
وەیسی، ناوی خۆی ڕەفیق مەلا ئومەری کوشاف بوو، من و وەیسی و شاخەوان و قەهــار و ڕەحمــان چاوشــین لەگوندی گەڕەشــێخان، نانــی ئێوارەمان خوارد. بەڕێکەوتین بۆ ڕێگەی ســەرەکی (هەولێر- کەرکوک) لەنزیک گوندی دۆڵەبەکرە، هــاوڕێ وەیســی و شــاخەوانمان پەڕانــدەوە، یەکترمــان مــاچ کرد بــە ئومێدی سەرکەوتن و دیدار.
گەڕاینەوە گوندی گەڕەشێخان هەریەکەمان چوینەوە ماڵی خۆمان. دەبوایە شەو بمێنــێ لەگونــد دەرکەویــن (پێش ڕووناک دابێت) خــواردن و ئاو لەگەڵ خۆمان

بەریــن. مەلا بانگی بەیانیدا هەر ســێکمان بەیەک و کیســە خواردنەوە لەگوندی دەرکەوتیــن بۆ لای گردی نیســکان، (لەنێوان گەڕەشــێخان ئیلنجاخ لەســەروی شاخی گاوانان)، لە ئاودڕێکی قووڵ خۆمان حەشاردا، هەتا دەبێتەوە شەو جوڵە نەکەیــن، نانــی بەیانی و نیوەڕۆ لەو کەندڕە بخۆین و هەر کەس مەتارە ئاوەکەی بەشــی بــکات تا ئێوارە. مێگەلــە مەڕێک لە گوندی ئیلنجاخ بە ئاراســتەی ئێمە هــات، خۆمــان لەگەڵ زەوی کرد بەیەک. مەڕەکــە تێپەربوو، بەڵام کەرە مەڕەکە هەردووک گوێی موچ ( قولاغ )کردبوو، دەی فیشــاند بۆی ساغ نەدەبوەوە ئێمە چین لەوێ؟!! گوتم: ئاشکرامان دەکات. کاک ڕەحمان شارەزابوو گوتی: هەستن دانیشــن با کەرەکــە بمانبینێ کە مرۆڤین، تۆزێک نانــی بۆ فڕێدا، کەرەکە وازی هێنــا، باش بوو شــوانەکە ئاگاداری نێــوان ئێمە و ئەو کەرە نەبــوو، مێگەلەکە ڕۆیشت.

نانــی نیوەڕۆمــان لەبــەر ئەو ســورەتاوە خوارد، پێش نوێژی عەســر ڕۆژ ســێ کاتژمێــری مابوو، مێگەلە مەڕەکە گەڕایەوە. کەرەکە چاوی دابوە ئەو شــوێنەی ئێمــەی لێبویــن، دووبــارە گوێــی لێ کردین بــە چەپەر، ســێبەری کەندەلانێکی بچوک خۆی کێشــابوو، دیاربوو شــوانەکە تینوبوو ئاویش لەناو تێری سەرپشتی کەرەکــە بوو. شــوانەکە بــۆ لای کەرەکە دەهــات، ئێمەش بەناچاری شــوێنمان گواســتەوە بۆ سێبەری کەندەلانەکە. کە شوانەکە ئێمەی بینی، سێ چەکدار لەو دەشتە، ویستی بگەڕێتەوە. بانگمان کرد، هات. لەلای خۆمان دامان نا، قسەمان لەگــەڵ کرد، مەڕەکەی خەریک بوو دەڕۆیشــت بــۆ لای گوندی. قەهار، تفەنگ و ڕەختەکــەی دا نا، مەڕەکەی گێڕایەوە، نەمان دەویســت شــوانەکە بڕواتەوە ناو گونــدی، نەوەکو گوزارشــتمان لێ بدرێ، هەتا دنیــا تاریک دەبێ. لە بیرمە کاک ڕەحمان پرســیارێکی ســەیری لە شــوانەکە کرد، گوتی: چل کاوڕ بۆ سێ مانگ، چەندی کاو و جۆ دەوێ؟ شــوانەکە دەمی بوە تەڵەی تەقیو، نەیزانی چی بڵێ. هاوڕێ قەهاریش لەپشــتی ڕەحمان دەســتی بۆ ســەری درێژکردو جولاندی، واتە مێشــکی تەواونییە!! شوانەکە بەتەواوی ترسا.

لەرەحمــان دووردەکەوتــەوە. ڕەحمان چــوو بۆ میزکردن، شــوانە گوتی: ئەوە مادام شــێتە چۆن چەکتــان داوەتێ؟!! قەهار گوتی: دەرزیلــەم لێ دەرهێناوە، مەترســە ئێمە هەر دەمانویســت شوانەکە دوا بخەین لەچوونە ناو ئاوایی، پاشان

کات درەنگ بوو، شوانەکەمان ئازادکرد. بەڵام ئەوەندە لە ڕەحمان ترسابوو، هەر سەر سمی دەداو ئاوڕی دەدایەوە.
دوای دوو ڕۆژ گەڕاینـــەوە لای هاوڕێیـــان لـــە گونـــدی بەلەبـــان. ســـەد مخابن لە گەڕانەوەی هاوڕێ وەیســـی و هاوڕێ شـــاخەوان، لەگونـــدی نێرەگین لەماڵی مام ڕەحمـــان، کـــە دەکەوێتە ســـەرەوەی ئاوایـــی، کەوتنە بەر پەلاماری جاشـــەکانی ســـەیدۆ. وەیسی لەوێ شـــەهیدبوو، هاوڕێ شاخەوان دەربازبوو، کە گەیشتە لای ئێمـــە پێڵاوی لە پـــێ نەمابوو. خوێنی لە قاچەکانـــی دەتکایەوە، هەتا ماوەیەک نەیدەتوانـــی ڕێبـــکات. هەتا ئەو ســـاڵانەی دوایـــی دەمانچە سمیســـە ڕوبعیەکەی شـــەهید وەیســـی لەبەر پشـــتی ســـەیدۆ بوو، کەتا مابوو ســـەر بە کاک کۆسرەت ڕەســـوڵ بوو، لەلای بازگەی تاســـڵوجە و کەڵەوانـــان، خانویەکی بەردی حەلانی گەورەی دروســـت کردبوو، ئەو پاداشـــت کرا. هەتا وەکو من ئاگاداربووم هاوڕێ شـــاخەوان لە کەنەدا دەژی، خانەنشینی پێشمەرگەشی بۆ نەکراوە.

## خوایە شیوعی بێن بۆ مزگەوت

لەســـەرەتای ســـاڵی ١٩٨٣ بەدواوە شـــەڕی عێراق و ئێران، هەتا دەهات بەتین و گوڕتر دەبوو، حکومەتی بەعس زۆر نەدەپرژایە ســـەر پاکتاوکردنی پێشـــمەرگە. لەلایەکـــی تریش ئەزمونی شـــەڕی نـــاو گوندەکان تا ڕادەیەک ســـەرکەوتوو بوو، لەبەرامبـــەر هەلیکۆپتەرە جەنگیەکانی ڕژێم، کە ببوونە دوژمنێکی مەرگ هێنەر، بۆیە لە هەڵسانی نیوەشەوان و چونە دەر لە گوندەکان ڕزگارمان ببو. لە مزگەوتی گونـــدەکان دەماینـــەوە. دیارە هەر کەســـێ دەبـــوو بە پێشـــمەرگە ناوێکی نهێنی واتـــە (حەرەکـــی) جوڵانەوەیی بۆ دادەندرا، نەدەبوو کەس بەناوی ڕاســـتەقینەی خـــۆی بانگی بکات. بەزۆری خۆی پەســـەندی ناوەکـــەی دەکرد بەناوێکی کوردی ســـەردەمیانە وەک ( ســـەنگەر، شۆڕش، خەبات، کۆســـرەت، ئاسۆس، قەندیل، پـــۆڵا، تێکۆشـــەر) و هەزاران ناوی تـــر. خەڵکی گونـــدەکان دەیانزانی ئەو ناوانە ناوی ڕاستەقینەی خۆمان نین، چونک
ە نـــاوی خۆمـــان ناوی کلاســـیک و نـــاوی ئاینـــی و عەرەبین. بۆیـــە ڕۆژێک دوو

پیرەمێردی گوندی نێرەگین، کە لەژێر پێی پێشـمەرگە ببوونە پێخوسـت و نانی بەتەنیایـان نەدەخوارد. لە بن دیواری مزگەوت یەک لەو پیرەمێردانە بەشـێوەی لاسـایی پێشـمەرگە بەوی تر دەڵێ: هاوڕێ سـەنگەر بەیانیت باش. ئەوی تریان دەڵێ: هەڤاڵ شێرکۆ گیانت باش.

بەم شـێوەیە لاسـایی ئێمەیان دەکردەوە. لەگوندی سـێ گرتکان کە گەورەترین گوندی ناوچەکەیە، ڕۆژێک پیاوێکی تر، بە یەکی تر دەڵێ: مام عەولاّ بەراسـتی مزگەوتەکەمـان پیـس بـوە، بۆ نوێژی هەینی تۆ بڵێی تا ئەو کاتە شـیوعیەکان نەیـەن، ئەو یـەک دوو ڕۆژە بۆمان پاک بکەنەوە؟ بەراسـتی کە هەمووجار دێن لـەدوای خۆیان مزگەوتی چاک پـاک دەکەنەوە، دەڵێی زگماک مجێوری مزگەوت بوینە. ڕاستی دەکرد ئێمە بۆ ئەوەی پڕوپاگەندەی نەیارەکانمان ڕەت بکەینەوە، کە دەیانگوت: شـیوعی کافرن، دەچوینە هەر مزگەوتێک لەدوای خۆمان پاکمان دەکـردەوە بەتایبەتـی پێـش نوێژی هەینی لـەدوای پاک کردنـەوە لەدەرەوەی مزگـەوت دەوەسـتاین هەتاوەکو خەڵکی گوندی لەنوێـژی هەینی تەواو دەبوون. هەندێـک پێشـمەرگە بەشـداری نوێژکردنەکـەش دەبوون. ئەوانەی بـە ئێمەیان دەگـوت: کافـر و دژە دین، ئێسـتا لەنـاو میحرابی مزگەوتەکان ڕیشـی مەلاکان دەسـوتێنن. هەر مەلایـەک دوو قسـەی لەبەرژەوەندی هەژاران بـکات، تیرۆری دەکەن و مەندیلی سـپیان لەخوێن سـور دەکەن، ئەو مەلایانەی بەیعەت بە پیس خۆریان دەدەن دەیان بەنە پێش.

# کێ دێ بچین کێشکان بگرین؟

لە سـەرەتای پایزی ( ١٩٨٢ )لەگوندی ئاخوڕە ی بەسـتی شەرغە، چاوم بە ناله قەشـقە کـەوت. خۆمان بە خزمی یەکتر دەزانی، ئەو ئامـر کەرتی یەکێتی بوو. هەتا بڵێی پیاوێکی ئازا بوو، زۆرجار لەبەستی شەرغە و دەشتی کۆیە یەکترمان دەبینی، ئەو بەتەمەن لەمن گەورەتر بوو، هەسـتم دەکرد لە ڕوانگەی خزمایەتی منـی زۆر خۆشـدەوێ. دواین جار کەبینیم، زۆری تکا کـرد چیتر ئەو ئۆتۆمبێلە گەورەیە لێ نەخورم، کە پڕلە پێشمەرگەمان دەکرد، شەوانە دەچوینە دەوروبەری

هەولێر. بەقسەی نالە قەشقە،گوایە من دەست نیشان کراوم، بۆیە دەبێ خۆم بپارێزم. ماوەیەک بەو ئۆتۆمبێلە نەگەڕێم. بەڵام بەداخەوە لەسەرەتای مانگی ١٠/ ١٩٨٢ لەگوندی سابلاغی هەولێر کەوتە کەمینی جاشەکانی مەلا عوزێر. لەگەڵ چوار پێشمەرگەی قارەمانی کەرتەکەی شەهید بوو، وابزانم نالەو سێ پێشمەرگەی تر قەشقەیی بوون و یەک پێشمەرگەش خەڵکی دوو شیوان بوو. نالە قەشقەیی دەیویست من بپارێزێ، بەڵام بەداخەوە بۆ خۆی شەهید بوو. ئەوەی ڕاستی بێ نالە قەشقەیی لە ئامر کەرتە هەرە ئازاکانی یەکێتی بوو لەدەشتی هەولێر. ئێستا مەلا عوزێری جاش لەشاری کۆیە نیشتەجێیە، من نەمدیوە بەڵام دەڵێن: هەر چوار دەوری ماڵەکەی کامێرایە و یەکێتی بەپلەی باڵای سەربازی، خۆیی و ئەوانەی لەگەڵیدان خانەنشینی کردوون.

لەبەستی شەرغەوگوندەکانی دەشتی کۆیە، هەتا دەهات بارەکە نالەبار تر دەبوو. شەماڵ و سەرباز لەناوچەکە بوون، ئێمەش چەند ڕۆژێک بوو لەگوندی سێ گرتکان و تۆمەرگونبەت، چاوەڕوانی ملازم خدر بوین بێتە ناوچەکە. برادەرانی سۆسیالیست چاوەڕوانی سەید کاکە بوون بێتە ناوچەکە، هێزەکەی ئێمە لەگەڵ هێزێکی سۆسیالیست لەگوندی نێرەگین، پاش نان خواردنی ئێوارە لەمزگەوتی نێرەگین کۆبوینەوە، هەردوولامان چەند برادەرێکی پاسۆکیش لەوێ بوون کە ژمارەیان سێ کەس بوو، کاک سابیر ساروخ بەرپرسیان بوو، دوو قۆڵە قەمسەلەی کردبوە بەلەک پێچ (پوزەوانە) دەم نادەم دەیگوت: دەبێ هێرش بکەین!! ئاخر ئەوان سێ کەس بوون، یەکێکیان تازە هاتبوە ڕیزی پاسۆک بۆ پێشمەرگایەتی، هیچی لەبارەی پێشمەرگایەتی نەدەزانی، ئەگەر نا پاسۆک خەڵکی زۆر وشیارو ڕۆشنبیریان هەبوو، ئەو برادەرە دەیگوت: دوو گولە تەرحیان دەدەمێ. من نەمدەزانی تەرح مانای چیە، دوایی گوتیان: تەرح واتە، با دوو گوللەم لێبدەن ئینجا من دەست بەشەڕ دەکەم. (زیاتر ئەوە بۆ چەقۆ بەکار دەهات لەناو چەقۆکێشەکان).

پێشمەرگەیەکمان هەبوو، لە ئێمە بەتەمەنتر دیاربوو، ڕیشی بە موکێش قەڵەم کردبوو، قەمسەلەکەی بەسەر شانی دادابوو، گۆپاڵێک بەدەستەوە. لەمزگەوت بە ژوور کەوت، ئەگەر نەدوابایە زۆر بە بەرپرسێکی سەربازی دەچوو. لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی و سڵاوکردنی، غرمەی لەبەر هەڵسانی هەموو پێشمەرگەکانی سۆسیالیست، سەرنجی هەموانی ڕاکێشا!! یەکسەر لەگەڵ فەرموو هاوڕێ، فەرموو

لای میحرابــی مزگــەوت، بەتەواوی بۆ (م.ف) چۆڵکــرا. ئێمە زوو زانیمان کە بە مــلازم خــدر یــان فەرماندەیەکی ســەربازی ئێمەی لێ حاڵی بــوون. هەرچەندی گوتمــان: کاکە دانیشــن پێویســت بەو ئەزیەتــە ناکات. بەڵام ئــەوان وا چاویان بڕیبوە (م.ف) چاویان لەســەر نەدەگواســتەوە، چاوەڕێیان دەکرد دابنیشــێ و چەنـد وتەیەک پێشــکەش بــە ئامادەبوان بکات. لەســەر ئەو بــارە ناهەموارەی ناوچەکــە، بــەڵام لەناکاو (م.ف) لایتێکی ســێ پاتری گــەورەی بەقەدەوە بوو، لــە نیتاقەکــەی کردەوە، لایتێکی لەبەر میچــی مزگەوت دا، گوتی: کێ دێ بچین کێشــکان بگرین؟!! بوو بە پێکەنین.

هەر (م.ف) ڕۆژێک لەگوندی قەشــقە بوین، ماتۆڕ ســوارێک دوو ســێجار بەلای ئێمــەدا هاتوچــۆی کــرد، ئێمەش تۆزێک لێــی کەوتینە گومان. شــەهید عەباس گوتــی: بانگــی بکەن بزانن ئەو کەســە کێیــە، چ کارەیە؟ ئێمــەش گرتمان، لە ژوورێکــی خانوێکــی چــۆڵ دامان نا، ئەو کــوڕە چاکەتێکی پانتــۆڕی لەبەربوو، لەگــەڵ شــەروارێکی کــوردی، وەک برایانی ســابڵاغی و کەرکوکیــەکان. کاتێک چوومــە بەرپەنجەرەکــە (م.ف) زۆر بە پیســی لێــی دەدا، لەجیاتی ئەوەی لێی بپرســێ: خەڵکــی کوێــی؟ نــاوت چیە؟ زۆر شــتی تر کــە لەکاتی لێپرســین لە گومان لێکراو پرســیاردەکرێ، ئەو دەیگوت: پێم بڵێ پانتۆڕی ئەو چاکەتەی لە کوێیــە؟!! وای دەزانــی، ئەگەر جلەکەی بوو بە چاکەت و پانتۆڕ ئەوا نیشــانەی بەعســی بوونی پشت ڕاست دەکاتەوە، ئەویش سوێندی دەخواردو دەیگوت: ئەو چاکەتە پانتۆڕی نییە. بەشــەهید عەباسم گوت: ئەوە (م.ف) خەریکە ئەوکوڕە، بە لێدان دەکوژێ، شــەهید عەباس گوتی: بەری بدەن.

# خەریکی خوێنڕشتنی یەکتر بووین

ئەوکات شــەڕی هەموو شتێکمان پێدەکرا، بەڵام هەلیکۆپتەر پێشمەرگەی شپرزە کردبوو، هیچ چەکێکی وامان نەبوو شەڕی هەلیکۆپتەرمان پێبکرێ، پێشمەرگەیەکی زۆر شــەهید دەبوون بە هەلیکۆپتەر لەهەموو لایەنەکان. ڕۆژێکیان شــەهید قادر مســتەفا، بەرپرسی هەرێمی سۆسیالیست بوو، بەهێزترین هەرێم بوو لەناوچەکە. سۆسیالیســت بەقەد ئێمە و یەکێتی دەبوو، زۆرینە پێشــمەرگەی سۆسیالیســت بوو، شــەهید قادر ســەفەری ســەرکردایەتی کردبوو. گەڕایەوە ناوچەی بەســتی

شــەرغە، خەڵک هەمــوی چاوەڕوانی ئەوەبــوو کاک قادر چەکێکــی وای هێنابێ شــەڕی هەلیکۆپتەری پێ بکرێت. کاک قادر فەردەیەکی بەکۆڵی پێشــمەرگەیەک دادابوو، لەگوندەکانی بەســتی شــەرغە بۆ نمونە: لە گونــدی بەردبڕ، بۆ ئەوەی ورەی خەڵــک بەرز بکاتەوە ئاماژەی بۆ فەردەکە دەکرد دەیگوت: ئەوە مەیدان، ئەگــەر ڕژێم دێتە ســەرمان. کەس نەیدەزانی ئەو فەردەیــە چی تێدایە!! هەواڵ بڵاوبوەوە، گوایە کاک قادر مســتەفا لە گەڕانەوەی لەسەرکردایەتی سۆسیالیست چەکــی دژی هەلیکۆپتــەری هێنــاوە. بۆیــە هەوڵم دەدا کاک قــادر ببینم و لێی بپرســم. کاک قادرمــان بینی، لــە گوندی ســێکانی، لێمان پرســی، گوتی: ئەو فەردەیــە گولــە ئارپیگیــە، هــەر بۆ ئــەوەم بوو دوژمن مەشــغول بکــەم، ورەی جوتیارەکانــی ناوچەکــە بەرز بکەمــەوە. کاک قادر عەقیدێکی ســەربازی بەدیل گرتبــوو لەگــەڵ خۆی بردبوو بۆ ســەرکردایەتی، ئەو گوتبوی: فیشــەکی تانکبڕ هەیــە، هەلیکۆپتــەر دەبڕێ. جا ماوەیەک بوو، پێشــمەرگە هەر کەســە بۆ خۆی لەدوای فیشــەکی تانکبڕ دەگەڕاین و لەســەر ئاسنی ئەستور تاقیمان دەکردەوە. لەگوندی پەرکانە لە ئاسنێکمان دابوو، بەراستی زۆری بڕیبوو، فیشەکی ئاسایی بەحاڵ شــوێنی دیاردەبوو، کەچی ئەمجۆرە فیشەکە دوو قەدی بڕیبوو!!

شــۆڕش لە ســەردەمی جەنگی (عێراقــ ئێران) تەوژمێکی تــری بەخۆیەوە بینی، پێشــمەرگە ڕوو لــە زیاد بــوون بوو. وای لێهــات هەر لایەنــەو ئۆتۆمبێلی خۆی هەبــوو، ئۆتۆمبێــل ڕفاندنی ڕژێم زۆر باو بوو، باس باســی ئەوەبوو: جەماعەتی قادر مســتەفا ئۆتۆمبێلێکی ســەیریان هێناوە، ســعیدی علی ســۆر ئۆتۆمبێلێکی لەندگرۆزی هێنا، دکتۆر ڕشــید لەناو هەولێر دوو ئۆتۆمبێلی هێنا، شــێخ شەماڵ و ســەرباز لەکۆیە، ئەوەندە ئۆتۆمبێلیان هێنا. پێشــمەرگە هەموی بە ئۆتۆمبێل دەســوڕایەوە. لەبەســتی شــەرغە ئێمە لقی هەولێــر پێنــج ئۆتۆمبێلمان هەبوو، پێشــبڕکێ بــوو لەســەر ئۆتۆمبێل هێنــان، ئێمە لۆریشــمان هەبوو. هــەر لەناو ئەزمونی ناو گوند، داســتانی قازان و حەمک بە فەرماندەیی شــەهید مامەڕیشــە نیشانی دا، کە شەڕی ناو گوندمان پێ دەکرێ. بۆیە لەناو گوندەکان دەمانەوە، لە هەڵســانی کاتژمێر ســێ بۆچواری شــەو، نەجاتمان بوو. ئۆتۆمبێلەکانمان لە پەنای دیوارو خانوەکان دەشاردەوە، سەری زۆربەی ئۆتۆمبێلەکانمان بەتەورداس بڕیبوەوە. قوڕمان تێهەڵدەســوون، بۆ ئەوەی هەلیکۆپتەر نەیانبینێ.

هەواڵێکمــان بۆهات گوایە، دوو پێشــمەرگەی سۆسیالیســت، لەرۆژهەڵاتی کۆیە پێشــمەرگەی هەرێمەکــەی حەمەســور بوون (حەمەســوری کوێخــا تەهای کانی کوردەیــی)، لەلایەن پێشــمەرگەکانی یەکێتــی چەک کراون. لەوکاتــەدا یەکێتی لەرۆژهەڵاتی کۆیە باڵادەســت بوو. لەڕوی ژمارەی پێشــمەرگەکانی، لە بەســتی شــەرغە و دەشــتی کۆیەو دەشــتی هەولێر سۆسیالیســت باڵادەســت بوو. بۆیە حەمەسور بەدوای تۆڵەکردنەوە دەگەڕا. ئەوەش دەبوو لەدەشتی کۆیە ئەنجامبدا، کە سۆسیالیســت باڵادەســت بوو. بەلام ئێمە کە پێشــمەرگەی حیزبی شــیوعی بویــن، دەمانویســت لەو ململانێیــە بێ لایەن و ناوبژیکاربیــن. ئێمە لە مزگەوتی گوندی (ئۆمەر گومبەت) لەدەشتی کۆیە کۆبوینەوە. لەدوای نان خواردنی نوێژی شــێوان، پاسەوانی شــەو خوێندرایەوە، نهێنی شــەو داندرا. مامۆستا سەیفەدین و دوو پێشــمەرگەی تری یەکێتی پەیدابوون. (مامۆســتا ســەیفەدین سەردەمێک بوە بەرپرســی ئاسایشــی گشــتی، لەســلێمانی). ئێمە مامۆســتا ســەیفەدینمان خۆشدەویســت، چونکــە خۆی بە کابرایەکی چەپ دەزانــی، ئەویش بۆ ئێمە هەر وابــوو. چاکم لەیادە کڵاوێن (کەرەمســتانێ) مان کرد، هەموومان هەولێری بوین، ئێمە تیمی شیوعیەکان: شەهید عەباس، هەڵکەوت، شێخ لەتیف، بەندە، (داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر ناوی کەســێکم بیرچووبێ)، مامۆســتا ســەیفەدین و دوو پێشــمەرگەکەی لەگەڵــی بوون، دوو پێشــمەرگەی ئێمەش بوونە لای مامۆســتا سەیفەدین، لەسەر چەند کیلۆ پڕتەقاڵێک، تیمی ئێمە بردمانەوە. شەهید عەباس ناردی پڕتەقاڵ هات، هەرچەندی مامۆســتا ســەیفەدین گوتی: من دۆڕاندومە، من پڕتەقاڵــەکان دەکرم. بەڵام شــەهید عەباس گوتی: ئێــوە میوانی ئێمەن، پێتان ناکــرم. ئێمەی پێشــمەرگەی هــەردوولا بێخەبەر لەوەی پاش چەنــد ڕۆژێکی تر بەدەســتی داگیرکەران و هەندێک ســەرکردەی فایلدار، دەستمان دەچێتە خوێنی یەکتــرو ئیتر هەرگیز کڵاوێن ناکەینەوە.

شەو خەوتین، بەیانی برای بەڕێزم شێخ لەتیف پاسەوان بوو، حەمەسورو چەند پێشــمەرگەیەکی سۆسیالیســت هاتنە حەوشــی مزگەوت، دیاربــوو لەناو گوندی ئۆمەرگومبــەت هەنــدێ ڕێکخســتنی سۆسیالیســت پێیان ڕاگەیاندبــوو کە چەند پێشــمەرگەیەکی یەکێتــی لەنــاو شــیوعیەکانن لەمزگەوت. لەیادم نەچێ، شــێخ لەتیــف ئێمــەی ئاگادارکــردەوە: هێزێک بــەرەو مزگەوت دێت. ئێمــە هەموومان

خۆمـان بەسـت و ئامادەبویـن بۆ هەر ئەگەرێک. شـەهید عەباس لە حەوشـەی مزگـەوت پێشـوازی لێکردن. ئێمە حەمەسـورمان چاک دەناسـی، دەشـمانزانی بۆچی هاتۆتە ناوچەکەی ئێمەی لێین، حەمەسور دەیویست بەهەر شێوەیەک بێ بێتە ناو مزگەوت کە برادەرانی یەکێتی لێبوون، بەڵام شـەهید عەباس پرسـیاری لەحەمەسـور کرد بەرەو کوێ دەڕۆن؟ حەمەسـور گوتی: لەگەڵ ئێوە لەمزگەوت دەمێنینەوە. شـەهید عەباس گوتی: گوندی ئۆمەرگومبەت ئەوەندە پێشمەرگەیە هەڵناگـرێ، با هاورێ حـازم بۆ کوێتان دەوێ بتانگەیەنێ. سـووکە دەرکردنێک بوو، من ئۆتۆمبێلێکی شـلەخەجێم پێبوو. ئەوکات حەمەسـور و پێشمەرگەکانی سۆسیالیسـتم سوارکرد، دوو پێشـمەرگەی خۆمانیشم لەگەڵ خۆم برد، بۆ کاتی گەڕانـەوەم. بردمـن بۆ گونـدی سـێگردکان و گەڕامەوە لای هاورێیـان. کاتێک گەیشـتمەوە لای هاورێیان، مامۆسـتا سەیفەدین و دوو پێشـمەرگەکەی یەکێتی لـەوێ نەمابـوون. دیارە حەمەسـور لەگەڵ چەنـد هەرێمێکی سۆسیالیسـت لەو ناوە یەکتریان گرتبوەوە، بۆ ئەوەی چەند پێشـمەرگەیەکی یەکێتی چەک بکەن، لەتۆڵەی ئەو چەککراوانەی خۆیان.

رۆژی دوایـی کاتژمێر نۆی بەیانی، سـەرەتای ئازاری سـاڵی١٩٨٣بوو، لەگوندی ئاومـار چوار دەوری نۆ پێشـمەرگەی یەکێتی دەگـرن، بە نیازی چەک کردنیان، شـەش کەسـیان چەک دەکەن، دوانیان بەناوەکانی ( سەعید پیرداود و م شاکر، کـە ئێسـتا لـە ژیاندا ماون خانەنشـینن) ڕا دەکەن و ڕزگاریـان دەبێت، چونکە دەزانن شـەڕی ئـەو هێزەیان پێ ناکرێ، بەڵام فەرەیدون بیرەسـپانی، دەرچوی کۆلیـژ بوو ڕادەکاتە پشـت دیوارێک، بۆ ئەوەی چەکەکەیـان نەداتێ و تەقەیان لێ بکات، دەسـترێژی گوللەی لێ دەکەن و شـەهیدی دەکەن. بەشـەهیدبوونی ئەو پێشـمەرگەیەی یەکێتی و چەک کردنیان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هێزیان بۆ یەکتر کۆدەکـردەوە، شـەماڵ و سـەربازیش بەهێزێکـی زۆرەوە هاتبوونـە ناوچەکـە. لەوکاتەدا خۆپیشاندان لەهەولێر بەردەوام بوو، بەتایبەتی لە سەربازگەی هەولێر کـە سـەربازێکی زۆری کوردی لـێ گیرابوو بۆ شەڕی (قادسـیە). ڕۆژانە هەواڵی سەرهەڵدان و خۆپیشاندانمان بۆ دەهات، زۆری نەمابوو ڕژێم لەهەولێر کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات، ناچار بە سەربازەکانی گوتبوو: دەوام مەکەن. لەبەرئەوەی چەند ئۆتۆمبێلیان لەناو سـەربازگەی هەولێر سوتاندو تێکشکاند.

ئـەو ناوچەیـە ئەوەندە پێشـمەرگەی بەخـۆوە هەڵنەدەگرت، ئێمـە وەکوحیزبی شیوعی، تەرەف نەبوین لەو کێشەیە. ڕۆژێک لە بەتالیۆنی پێنج، دوو پێشمەرگە هاتن نامەیەکیان دا بە شـەهید عەباس، ئەوکاتـە کانەبی گەورە ئامیر بەتالیۆن بـوو، شـەهید عەباس زۆر بـاوەڕی بەمن هەبوو بانگی کردم، نوسـراوەکە چەند ڕێنمایەکی تێدا نوسرابوو:

١. نابێ بەهیچ شـێوەیەک لایەنگیربن لەو شـەڕە چاوەڕوان کراوە، بەڵکو دەوری ناوبژیوان ببینن لە بەینی یەکێتی و سۆسیالیسـت.

٢. ئەگەر پێشـمەرگەی سۆسیالیست یان یەکێتی لەلای ئێوەبوون، نابێ دەرفەت بدەن هێرشیان بکرێتەسەر.

٣. دەبـێ چالاکـی خۆتان بەرامبەر دوژمن (رژێم) زیاد بکەن، با ڕژێم وا هەسـت نەکات ئێمە بەیەکەوە سـەرقاڵین و ئەومان لە یادچۆتەوە.

لەبەرئـەوەی ئێمە خاوەن شـەهید و ڕابوردومان لەگەڵ ئـەو حیزبە بەرێکردبوو، هـاوڕێ کانەبـی و هاوڕێ شـەهید عەبـاس و ئەوانی تر، زۆر باوەڕیـان بە ئێمە هەبوو، بۆ نمونە: هاوڕێ کانەبی دەیگوت: کە ئێوە حەرەسـن ئەوکات تێر خەو دەبم.

## نەمانتوانی چەپەکان کۆ بکەینەوە

گەڕاینەوە بۆ بەسـتی شـەرغە، لەوێ چوینە گوندی بانـی ماران، لای مزگەوتی گونـد وەسـتابوین، گەنجێکی قۆز هاتە لام گوتـی: تۆلەگەڵ برادەرێکی تر وەرن بـۆ ماڵـی ئێمە، منیش لە جلوبـەرگ وخاوێنی زانیم خەڵکی گونـد نییە، بەڵکو فیرارە، پێم گوت: ئێمە نایەین بۆ ماڵی ئاوارەی وەک تۆ، جوتیارەکان وەزعیان لە ئێوە باشـترە. بەڵام زۆر پەلـەی لەگەڵ کردین، زۆری پێ خۆش بوو، گوتی: دەچیـن باسـی وەزعـی ئەمرۆ دەکەیـن. ناچار چوینـە ماڵەکـەی. گوتم: ناوی جەنابـت؟ گوتـی: عوسـمان. ماڵـی لەخوار ماڵـی کوێخا عەولا بـوو، ژوورێکی بچوکـی لەقـوڕ دروسـت کراو، بـەڵام ماڵێکی پـاک و خاوێن، شـتەکانی هەروا سـەفەری بوو، دیاربوو لەترسـی ڕژێم هاتبوە ئەو ناوە. باسی وەزعی سیاسی و مەسـەلەی کورد و توندوتیژی ڕژێم مان باس کرد، بۆم بەدیارکەوت ڕێکخسـتنی

سۆسیالیستە. داوای لێبوردنم لێکرد کە من وامزانی هەر لەبەر سەربازی هاتۆتە ناوچەی ئازادکراو، لەورۆژەوە کاک عوسمانم ناسی (سەردەمێک بووبە سەرۆکی فراکسیۆنی سەوز لە پەرلەمانی کوردستان) وە لەوکاتەوە پێی دەڵێن: عوسمان بانی مارانی. لە ئێرانیش یەکترمان دەبینی لە دوای ساڵی ١٩٨٨. بەداخەوە لە شەڕی ناوخۆ، قادری برای و دوو برای تری شەهید بوون، بەگوللەی تانکەکانی تورکی داگیرکەر کە یارمەتی پارتیان دەدا لە نەوەتەکان.

لە گوندی نێرەگین، لقی دەشتی هەولێر کۆبوونەوەمان کرد، بڕیاردرا، ئەو شەوە بچین بۆ گوندی سیاو کە دەکەوێتە نێوان شارێی (هەولێر- مەخمور)، بەشێکی گوندەکە (جەیشی شەعبی) واتە: چەکداری ڕژێم بوون. چوین بۆ چەک کردنیان. شەو لە گوندی گردەسۆر نانمان خوارد، نهێنی شەو دابەش کرا، بە دوو ئۆتۆمبێلی پیکاب بەرەو گوندی سیاو کەوتینەڕێ، مانگە شەو بوو، ئۆتۆمبێلەکان بێ لایت دەرۆیشتن، لەبەر گوندی باشتەپەو قازی خانە ڕەتبوین، چەکدارێکی ڕژێم بەناوی (زەردە) وەک هەمیشە هەندێک تەقەی بەچەکی (بی کەی سی) لێکردین، ، بەڵام گوێمان پێنەدا، ڕۆیشتین. لە دووری گوند، ئۆتۆمبێلەکان وەستان، هەرچەند پێشمەرگەیەک بۆ ماڵێک داندرا، یەک دوو کەسیان شەڕی کرد، ئەوانیش چەک کران. ئێمە ژمارەمان ئەوەندە نەبوو، بۆئەوەی لەدواوەی گوندەکە بۆسە دابنێینەوە، بۆیە ئەوەی چەکمان کردن ئەوی تر هەڵاتن بۆ بناری زورگە زراو. ماڵێک تەقەی زۆر لە پێشمەرگەکان کرد، گوللە ئاربیجیێکیان لەخانوەکەدا، کابرا بریندار بوو ژنەکەی چەکەکەی هێنا، دایە دەستی من، دوو گوللە بە تفەنگەکە کەوتبوو. کاتێک ژنەکەی تفەنگەکەی هێنا تەنها من و کارزان لەناو گوندی ما بوین، شەهید عەباس و برادەران چوبوونەوە لای ئۆتۆمبێلەکان. دووجار شەهید عەباس، پێشمەرگەی لەدوای من و کارزان هەنارد تا زوو بگەڕێینەوە لایان و بڕۆین، بەڵام من گوتم: هەتا تفەنگی ئەو کەسە نەهێنم نایەم، با بەیانی لەگوندی سیاو مەدالیای ئازایەتی بەعسیەکان وەرنەگرێ!! لێمان بێ بە ئاگر بە چەشنی (زەردە). هاوڕێیان کە بینیان تفەنگەکەم پێیە زۆر دڵخۆش بوون.

گەڕاینەوە، سەرکەوتوبوین، دڵمان زۆر خۆش بوو، چونکە زۆرمان چەک پێویست بوو، بەیانی لە گوندی نێرەگین چەک و فیشەک و مەخزەنەکان دابەش کران.

کلاشـینکۆفێکی زۆر نوێیـان دا بەمن، کەیفی یـەک مۆنیکام پێ دەهات، یەکەی (پێنج) فیشـەکی ئاگردار بۆ ئەوەی ئەگەرشەو ون بوین لەیەکتر، بتوانین یەکتر بدۆزینەوە. چونکە نەدەبوو وەک ئێسـتا هەموو ئاگردارەکان بۆ یەک دوو نەفەر بێ، لەزەتی یەکسـانی و وەک هەڤی لەوان ڕۆژگاران، تایبەت بوو.
لـە گونـدی سـماقە، کۆبوونەوەیەکـی بەرفراوانـی لق کـرا، برِیـاردرا من بکەن بـە بەرپرسـی مەفـرەزە، هەر ئەو ڕۆژە برادەرێکمان لە گوندی سـماقە سـەگی جوتیارێکـی گونـدی کوشـت، هەتا ئەو کێشـەیەمان چارەسـەر کرد قیر سـپی بوو، چونکە سـەگ کوشـتن لە کۆمەڵگەی کوردەواری، بەتایبەتی بەچەک وەک پیاوێکت کوشـتبێ وایە. کابرامان ڕازی کرد، گوایە نەیزانیوە خەڵکی ناوشـارە تازە بۆتە پێشـمەرگە!! خەڵکی ئەو گوندانەی بەسـتی شەرغە و دەشتی کۆیەو ڕۆژهەلاتـی کۆیە، بەراسـتی ماندوو بوون، لەبەر پێی پێشـمەرگە چووبوون، کە هەلیکۆپتەر دەهات جیاوازی نەدەکرد لە نێوان پێشـمەرگەو هاولاتی.
ئەو پەلەی من تێیدا کرام بە فەرماندەی دەستە، هەڵکەوت سەرپەلی بوو، ئەبو احـرار لە سـماقە فێـری بەکارهێنانی ئاربیجی حەوتـی دەکردین، چەند ڕۆژ بوو دەورەی بۆ کردوبوینەوە، لەو حەدوسـەدە دا بوو (١٩٨٣/٥/٤)بەفشاری پارتی بەرەی جودیان ئیمزا کرد، ( پارتی، شـیوعی، سۆسیالیسـت، پاسۆک، بوون).
ئەگەر لە ڕوی فیکری بوایە، ئێمە و پارتی قەت یەک ئەشیامان بۆ یەک نەدەبوو، بەلام قیادەی حیزب لەبەرئەوەی منداڵەکانیان لەسوریا و لەدەرەوەی ولات بوو، تاکە ڕێگاش قامیشـلۆ بوو، ئەو ڕێگایـە بەناو قەڵەم ڕەوی پارتی تێپەڕ دەبوو، ئـەو بەرەیـە مۆرکرا، دەنـا ئێمە لە کۆمەڵـەی ڕەنجدەران نزیکتـر بوین، لەبەر ئـەوەی هەردوولا مارکسـی بوین. نەمانتوانی چەپەکان لـە خۆمان کۆبکەینەوە.
لەکاتێکدا حیزبی شـیوعی چاک دەیزانی پارتی و یەکێتی لەناوچەی هەورامان و سـورێن و سـنوری ڕۆژهەلاتی کوردستان و هەکاری و گوندی ئاوێسەر و دزلی و زۆر شوێنی تر، خەریکی ئێسک کرۆشتنی یەکترن. سەرکردایەتی حیزبی شیوعی چۆن لەگەڵ لایەنێکی ئەو شـەڕە بەرەی جودی پێکهێنا؟!!
ئەگـەر ئـەو بـەرەی جـودە نەکرابایـە زۆر لە پێشـمەرگەی پارتـی و یەکێتی دەهاتنـە لای ئێمـە، دەکـرێ لە سـەرکردەکانی حیـزب بپرسـین بۆچی بەرەی جودیان مۆرکرد؟!!

# شەڕی پەرکانە

وەک لــە پێشــەوە باســم کــردوە، کە دایکــم و خێزانم و خوشــک و ئامۆزاکانم، لە قوشــتەپە ڕادەکەن لە ترســی پیاوەکانی ڕژێم ئەو کاتی کەســوکارو خێزانی پێشــمەرگە، ڕاپێچی زیندانەکان دەکران، بۆئەوەی پێشــمەرگە ناچار بکەن خۆی ڕادەســتی ڕژێم بکات، لە گوندی پەرکانە، مام حســن و تەواوی گوندەکە خزمی خۆمان بوون، وە پیاوەکانی ڕژێم بە ئاســانی دەســتیان ناگاتە ئەو گوندە بۆیە خێزانەکانمان لە پەرکانە نیشــتەجێ بوون. ئێمەش هەندێک جار شەوێک لەلایان دەماینەوە. بەلام پاســەوانییەکی توونەوتۆڵمــان دادەنا، من ئەرکدار کرابووم بۆ نوســینی ئەرکی پاســەوانی، سەرەڕای ئەوەش، باوکم، واتە: هاوڕێ علی کوتک، لەسەرگردەکەی پشت گوندی، سەنگەرێکی زۆر تۆکمەی هەڵکەندبوو، بە تفەنگە برنۆ وەسەتەکەی، پێش هەڵاتنی خۆر، لە ناو ئەو سەنگەرە بە دووربین سۆسەی ناوچەکەی دەکرد، بۆیە پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان بە ئاسوودەیی لە پەرکانە پشــتی خۆیان دەکردەوە دەیانگوت: مام عەلی لەســەر گردیە، پێشــمەرگەیەکی هەرێمەکەی شــەهید قادر مســتەفا، کە سۆسیالیســت بوو، بە ناوی (و) لە کاک قــادر تــورە ببوو، لەلای ئێمە دەمایــەوە. زۆری هەوڵ دەدا لە پاســەوانی ناوی بنوســم، منیــش دەمگوت: تــۆ میوانی ئێمەیت پاســەوانیت پێناگریــن. لەدوای چەند ڕۆژێک دایکی لە هەولێرەوە هاتە لای، دیارە ڕێگەی بۆ تەســلیمبوونەوەی بــە ڕژێم خۆشــکردبوو، کاتێک ناوبراو دیار نەمــا، ئێمە بێ ئاگا لەوەی کە خۆی ڕادەســتی ڕژێم کردۆتەوەو ماڵی ئێمەی دەستنیشــان کردووە، کە جاری وا هەیە لــە پەرکانــە دەمێنینەوە. ئێوارەیەک لەگەڵ ســادق ( بەرپرســی سیاســی لقی هەولێــر بوو)، چوینە گوندی پەرکانە، بەڵام شــەوی مابوو لــە گوند دەرکەوتین بەرەو بەردەســپی، بۆ ئــەوەی لەگەڵ هاوڕێیانی لق یەکتــر بگرینەوە. کە چوین بۆ مزگەوت، هاوڕێیانی لق لەوێ بوون کەرتێکی سۆسیالیســت، بەرپرســەکەیان حاجی شــەوکەت بوو، لەگەڵ نۆ پێشمەرگە، بەم ناوانەی خوارەوە:

١. محمود

٢. تەڵعەتی حاجی حسێنی گردەسۆری
٣. جەوادی مام کەریم
٤. عوسمان چۆمەزەردەرە
٥. سەباح چۆمەزەردەرە
٦. خەسرۆ قەشقەیی
٧. هەینی قەشقەیی
٨. سابیر گەرۆزی
٩. سەرۆ

لــە چالاکی پێشــمەرگانە دەگەڕێنــەوە ناوچەکە. دیارە گونــدی پەرکانە بەباش دەزانــن، بــۆ مانــەوە، تا نانی بەیانــی لێبخۆن، بەو ئومێدەی مام عەلی لەســەر گــردی پاســەوانەو ئێمەش کوڕو برازاکانــی لەناو گوندین. بێ ئــاگا لەوەی (و) لەگــەڵ دائیــرەی ئەمــن و پیاوەکانی ڕژێم بە پێداگری خۆفرۆشــێک بەناوی (ڕ) کەوا مەبەســتی تایبەتی و کەســی لەو هێرشە هەبوو. ئەو بەیانییە بەشێوەیەکی لەنــاکاو، بەڕێگەی چارەگردەرە، دێن بەرەو پەرکانــە. کاتێک کاک مەحمود ئەو هێزە دەبینێت، لەســەر ئەو گردوو زوورگانــە، وادەزانێت ئێمەین، لەو گردۆلکانە بــڵاو بوینەتەوە. تاوەکو تەقــەی لێدەکەن، ئەوکاتە حاڵی دەبێت کە ئەوە هێزی دووژمنە نەک هاوڕێیان. لەگەڵ یەکەم دەســترێژ، هەینی بریندار دەبێت. حاجی شــەوکەت لەگەڵ عوسمان بەرەو ئەو گردەی پشــتی گوندی ڕادەکەن، گولەیەک بەرقوڵی عوسمان دەکەوێت. خەسرەو شەهید دەبێت. پێشمەرگەکان دەڵێن: کێ فیشــەکی هەیە بۆمان بهێنن، لەناو گرمەی ئارپیگی و دەســترێژی گولە و ئاگر و دوکەڵ، دایکم تورەگەیەک فیشــەک دەگەیەنێتە کاک مەحمودو پێی دەڵێ: بە نیازی شــەڕ بکەیت؟ کاک مەحمود، دەڵێ: بەڵێ.

دایکم دەڵێت: کەواتە ئێوە شــەڕ بکەن، منیش پەکتان ناخەم لە فیشــەک. بۆیە بە نایەلەی خێزانم دەڵێت: برۆ فیشــەک بگەیەنە پێشــمەرگەکان، بەداخەوە لەو شــەڕەدا چوار پێشمەرگە بە دیل گیران، بەم ناوانەی خوارەوە:

سەباح
سەرۆ
جەواد

سابیر
هەر چواریان تا ئێستا، بێ سەروشوێنن. کاتێک، خوشکە سەفیەی خێزانی مام حەسەن (و) دەبینێت دەم و چاوی پێچاوە، زۆر جنێوی پێ دەدات و دەڵێ: هەی نمەک بە حەرام، مردم چەند ساڵە هێندەی نانت بۆ ساز بکەم و خزمەتت بکەم، هەی ناپاک! کاک مەحمود شکور ئێستا لە ژیان داماوە. ئێمە لە گوندی بەردە سپی، گوێمان لە گرمەو تەقە بوو، دوکەڵمان لە ئاسمان بەدی کرد، زانیمان شەڕەکە لە پەرکانەیە. لە بەردەسپی، بێجگە لە پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی، هێزێکی سۆسیالیستیش لەوێ بوون، وەک:
مامە غەفە و ئەنوەری عەزە باوە و دەهامی برای فارس باوە، کە بەرپرسی سۆسیالیست بوون، لەگەڵ پێشمەرگەکانیان بەپەلە بەرەو گوندی پەرکانە کەوتینە ڕێ، بۆ فریاکەوتنی پێشمەرگەکان.
من وکاک دەهام، لە پێشەوەی هێزەکە غارمان دەدا. دەهام، لەبەر ئازایەتی بوو لە پێشەوە غاری دەدا، بەڵام من لەبەر ئازایەتیم نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە دایکم و خێزانم و دوو منداڵ و خوشکەکانم و خێزان و منداڵی ئامۆزاکانم لەناو ئەو شەڕە دابوون. دەهام، پیاوێکی ئازاو سادەو گونجاو بوو، هەستم دەکرد، دەیویست ناکۆکی ساڵی حەفتاکانی پارتی و شیوعی کە شۆڕ ببوەوە بۆ بەینی فارس باوە و مامم یاسین، ئەو ناکۆکیە نەهێڵێت و لاپەڕەیەکی نوێ لە پەیوەندیەکانمان بکاتەوە، ئەوەش لە پەیوەندی من و دەهام هەستی پێ دەکرا. خۆزگە لە کوردستان خەڵکانی وەک دەهام باوە بوونیان هەبا، (بەداخەوە دەهام لە ١٩٨٨/٨/١٢ لەسەر ڕێگەی (مورتکە ـ هەولێر) بەدەستی چەند خۆفرۆشێک کە دەیانویست لە باوەشی بەعس شوێنی خۆیان خۆش بکەن، کەوتە کەمین و شەهیدکرا) کاتێک کە گەیشتینە پەرکانە، ئەو هێزەی دوژمن بە پەلە پاشەکشەیان کردبوو، پەرکانە تەنها دووکەڵی ناندێنە بچوکەکەی ئێمەی لێ هەڵدەستا کە بە ئارپیگی لێیان دابوو، ئارپیگیەکیشیان لەماڵی جەنگی ئامۆزام دابوو.
شایەنی باسە، تاشەڕەکەتەواو دەبێت، دایکم یەدەگ بەهەردوو خوشکەکەم (حەسیبەونەجیبە)پڕدەکاتەوە، کاک مەحمود دەیگوت: عەلی کوتک چاکی فێرە پڕکردنەوەی یەدەگ کردوون.

# لەماڵی پارێزگاری هەولێرمان دا

لەوکاتەدا بەهەموو توانای خۆمان دەمانویست ئەو بۆشاییە سەربازیە پڕبکەینەوە لەناوچەکە کە سۆسیالیست و یەکێتی بەهۆی کۆکردنەوەی هێز بۆ یەکتری دروستیان کردبوو. سەنەگەمان لەسەر ڕژێم هەڵنەدەگرت.

شەوی دواتر مەفرەزەیەکمان چوە ناو هەولێر (پێنج) ئۆتۆمبێلی فەرمانگەی کشتوکاڵیان هێنا. دوو شەو دوای ئەوە چوینەوە ناو هەولێر، بە ئاربیگی لەماڵی پارێزگارمان دا، لەگەڕانەوە بە گەڕەکی نەوەتودوو، دوو داواکراومان هێنا، (جەیشی شەعبی) بوون. دوایی بە پارە ئازادکران. بەڵام لێدانی ماڵی پارێزگار سەدای باشی هەبوو، دوو شەو دوای ئەمەش چوینە سەر ڕێگەی سەرەکی (هەولێر- کەرکوک)، لەراستی گوندی سێنارە ڕێگەمان کۆنترۆڵ کرد، خەڵکێکی گومان لێکراومان گرت، دوو کەس (ڕەفیق حیزبی) بوون، خەڵکی دهۆک بوون کوژران، ڕایان نەگرت، کەمینی لای هەولێر لێی دان، لەو گیراوانە هەندێکیان مسری بوون هێندەیان لەسەر یەک دەگوت: ئێمە بەعسین، ڕەفیق حیزبین، (چونکە باوەڕیان نەدەکرد پێشمەرگە بتوانێ بگاتە ئەو ڕێگەیەو خەڵک ڕابگرێ) ئێمەش هێنامانن. دەیانگوت:

ئێوە فرسانن (جاشن)؟!! هاتین بۆ گوندی گردەسۆر، نانی شەومان خوارد، زۆر دڵخۆش بوین کەسمان شەهیدو بریندار نەببوو، دوایی گەڕاینەوە گوندی خورخوڕ. لەو چالاکیە مامۆستا ڕەوەندو چەند هاوڕێیەکی تر لەسەر ڕێگەی (کەرکوک هەولێر) لەژێر پردێک دانرابوون بۆ ئەوەی شوناسنامە وەرگرتن و پرسیار لەو کەسانە بکەن کە ڕاماندەگرتن بۆ لێکۆڵینەوە.

لەسەر ڕێگاکە من وکارزان و بەکر چاوشین و چەند هاوڕێیەکی تر بوین، بەداخەوە ناوی ئەو بەڕێزانەم لەیاد نەماوە داوای لێبوردنیان لێ دەکەم، (ئەگەر نا نامەوێ ڕۆڵی هیچ کەس نادیدە بگرم)، پیاوێکی هەولێری هەندێک پڕتەقاڵی داینێ، من دوو پڕتەقاڵم لە گیرفانم نا، کارزان (حسێن نەبی) گوتی: ئەوە بۆ کێتە ئەو پڕتەقاڵانە؟ گوتم: یەک بۆ هەردی ئەوی تر بۆ داود، ئەویش هەندێک

پڕتەقاڵــی لە گیرفانی نا، گوتــی: ئەوە بۆ گەیلانی برام. بەداخەوە ڕۆژی دوایی گەیلانمــان بە بێ گیانی بینییەوە.

لــەو چالاکیــە لقــی کۆیە لەگەڵمان بوون، شــەهید بەکرجۆڵا، شــەهید مەحمود مەرزانی، شــەهید حاجی بەختیار، زۆر کەسی تریش.

## شەڕی خوێناوی شیوعی و یەکێتی

ئــەو شــەوەی لە چالاکییەکــی ســەرکەوتوانە گەڕاینــەوە، کە لە ڕێــگای هەولێر کەرکوک ئەنجامماندا. لە گوندی خورخوڕ نیو ســەعات وەســتاین لای مزگەوت، لەگەڵ شــەهید عەباس و هاوڕێیان، ڕامان وابوو کە بەیانی لەوەیە ڕژێم هێزمان بــۆ کۆبکاتــەوە، بۆیــە دەبێ بچیــن لە گوندی ســماقە و بایز ئاغــا خۆمان قایم بکەیــن، بــۆ ئەوە بتوانین شــەڕ بکەین، هەر گوندێک ئاشــکرا بوو پێشــمەرگەی تێدایە و شەڕ ڕویدا، هێزەکەی تر بەهانایەوە بچێ، وە گۆشت بۆ هاوڕێیان بکڕین و ژەمێکــی باش بخۆین. لــە گوندی خورخوڕ بەڕێکەوتین بەرەو گوندی بایزئاغا، هەندێــک لەهاوڕێیــان لــەدوای ئۆتۆمبێلەکە خەوتبوون، چونکــە کاتژمێر یازدەو نیــوی شــەو بوو، ڕێکەوتــی ١٤/ ٣/ ١٩٨٣، مــن ئۆتۆمبێلەکەم لــێ دەخوڕی، شــەهید مەحمــود کە ســەرپەل بوو لە لقی کۆیــە، لەگەڵ مام بایز لە پێشــەوە دانیشــتبوون، ئەوانی تر لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکە بوون (ئۆتۆمبێلەکە لە جۆری شلەخەجێ بوو)، پێنج ئۆتۆمبێل بوین، من سێیەم ئۆتۆمبێل بووم، کە گەیشتمە ڕاســتی گوندی بەردەسپی، لەبەستی شــەرغە تۆزێ قایم لە ئاوێکمدا، ئۆتۆمبێل کوژایەوە، شەهید مەحمود گوتی:

هاوڕێیــان وەرنــە خوارەوە، پاڵی پێوە بنێن با هەڵــی بکەینەوە، چونکە پاتری زۆر تــەواو نەبــوو، هاوڕێیان تۆزێ بە گرانی هاتنە خوار، شــەهید مەحمود پێی گوتن: ئەگەر هاوڕێیەکتان شەهید بێ چۆن هەڵیدەگرن ئێستا تواناتان نەبێ پاڵ بــەو ئۆتۆمبێلەوە بنێــن؟!! هاتنە خوارەوەو ئۆتۆمبێــل کەوتەوە ئیش، کەپرێک و ئاوبارەیەکمــان زۆر لــێ نزیــک بوو، شــوێنی بڵنــد بوو، شــوێنی ئێمەش نزم بوو، هەر لەگێری یەک دەرۆیشــتم، هێشــتا گێرم نەگۆڕی بوو لەو کەپرو ئاوبارە

بەدووری پەنجا مەترێک گولله بارانیان کردین، هەرگوێم له هاشـەی ئەو بەسـتە بـوو، کـە بەدەنگی تفەنگ و گوللـە ئاربیجی دەنگی دەدایـەوە، هەروەک تەزرە گولله دەباری. چەند ڕۆژێک پێش ئەوکارەساتە، چوینە لای مام غەفور لەگوندی جل بەسـەر، کە یازدە پێشـمەرگەی شـەهید ببوو لە کەمینی ملازم مەحەمەدی قوشـتەپە ناسـراو بە ئەبو بوشـرە و مەلا عوزێر لە گوندی بیرە عارەبان. بۆی گێراینـەوە: کـە خـۆی لەپەنا ویلـی تایـەی تراکتۆرەکە ناوە بۆیـە گوللەی پێ نەکەوتوە، من لەو چرکەسـاتە ناخۆشـە ئەو قسـەیەی مام غەفورم هاتەوە یاد. خۆم لە پەنای ویلی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکە گرت، کە پێم وابوو گولله ئەو هەموو مەکینـەو ئاسـنە نابڕێ بـەلآم لەوکاتە هەر گوێم لەناڵەی پێشـمەرگەکان دەبوو کـە لەنـاو ئۆتۆمبێلەکە لە پشـتەوە هەر جارەی یەک دەیگـوت: پێم کەوت، من لەبەرئەوەی ئەو گوللانەی دەهاتن بەئاراسـتەی من هەمویان بەشەهید مەحمودو مـام بایز کەوتن، چونکە لەلای ڕاسـتی ئۆتۆمبێلەکە لێمـان درا، گوێم لەدەنگی شەهید مەحمود بوو، هەر دەیگوت:

ئـەوا لێیـان دایـن کوا کلاشـینکۆفەکەم؟ مام بایز بەلای مـن کەوتە خوارەوە، بەسـەر مندا کەوت، دەسـتم گەیاندە کلاشینکۆفەکەم کە لەتەنیشت خۆم دادەنا لەکاتی ئۆتۆمبێل لێخورین. خۆم گەیاندە ناو ئاودڕی بەسـتەکە، بەسـتی شەرغە زۆرە، ئاگری تفەنگەکانیان بڵێسەی لێ هەڵدەستا، مەخزەنی یەکەمم خاڵی کرد، هەر چوار دەوریان کێڵام، ئاربیجیەکیان پێوە نام، سەری کرد، چونکە شوێنیان بڵند بوو شـوێنی من نزم بوو، ئاربیجی ناتوانێ زۆر لولەی واتە گوللەکەی نەوی بکەی دەکەوێتە خوارێ، ئەو ناوەی کردە ئاگرباران، چونکە ئەو بەسـتە هەموی بەردە. لەگەڵ هەر دەستڕێژێک جنێوم دەدا، بەدەست خۆم نەبوو ئەوەندەم ئەو شەڕە پێ ناخۆش بوو، دەمگوت:

بە نامەردی لێتان داین، خەنجەری ناپاکیتان لە پشـتەوە لێداین، لەبەر ئەوەی من هەتا دەنگم تێدابوو دەمهاراند، جنێوم دەدا، نەفەرێک بەخشکە بۆلام دەهات گوێـم لێبـوو دەیناڵاند، زوو زانیم هاوڕێیەکی بریندارە، برادەرێکی عەرەب بوو لە لقی کۆیە ناوی وەسفی بوو، هاتە لام، گوتی: هاوڕێ حازم بمکوژە بەجێم مەهێڵە. گوتـم: ئەگـەر بمێنم نە بەجێت دەهێڵم نە دەتکوژم، بەلآم تۆ بەو ئاراسـتە برۆ بە خۆخشـاندن بۆ بەردەسـپی، من هەتا فیشـەکمان مابێ شەڕ دەکەم، لەپشت

من دوو هاوڕێ بریندارەکەیان برد، شـەهید حاجی بەختیار گێرسـەیەکی پێ بوو تەقەی دەکرد، هاتەلام، گوتی: چی بکەین من فیشـەکم تەواو بوو!! لەو قسـانە بویـن لە بڵندگۆی مزگەوتی بەردەسـپی هاواریان کرد: ئـەو هاوڕێیانەی گوێیان لێیە بێنە مزگەوت، ئێمە لەبەینی پێشـمەرگەکانی مزگەوت و کەمینەکەبوین، بە بیکەیسـی تەقەیان لە کەمینەکە دەکرد ئەو گوللانە بەسـەر ئێمە بۆ کەمینەکە دەچوو. لەگەڵ حاجی بەختیار بۆلای مزگەوت دەچوین، پێش بگەینە مزگەوتەکە ماڵی شـەهید سـەدرەی لێبوو، لامدا ماڵیان، خـۆی و خێزانەکەی لەماڵ بوون، ژنەکەی گوتی: کوێرێم برینداری؟ تەماشـای خۆم کرد دەسـتی ڕاستم هەتا سەر شـانم بەخوێـن بـوو، گوتم: نا ئـەوە خوێنی مـام بایزە بریندار بوو بەسـەرمدا کەوت. ئەو خوشکە بەڕێزە جامانەیەکی دامێ، ئاخر شەهید سەدرەو خێزانەکەی خزمـی خـۆم بوون، زۆریان پەرۆش بووم. شـەهید و بریندارەکانمان لە مزگەوت درێژکرد، بریندارەکان ئەوانە بوون: هاوڕێ وەسـفی، مام بایز، پێشـرەو فاخیرە شەل، عەبدوڵا فەتاح و یەکێکی تر ناوەکەم لەیاد نەماوە، ڕۆژی دوایی لەگوندی نێرەگیـن ماڵێـک کـرا بە نەخۆشـخانە، دکتۆر سـادق هاوڕێیەکـی عەرەب بوو بریندارەکانی چارەسـەر دەکرد بە بێ جیاوازی پێشـمەرگەی هەموو لایەنەکان، بەداخەوە ڕۆژی دوایی سـەرپەلی ئازا و چاونەترسـی لقی کۆیە شەهید مەحمود مەرزانی گیانی سـپارد، خەڵکی گوندی بەیانی لە گوندی بەردەسـپی بە خاکیان سپارد.

ڕۆژێکـی تاڵ بوو هەر لەوشـەوە لەهەموو لایەک بوو بەئاگرباران، لەبەردەسـپی هەتـا بەلەبـان بەدرێژی ئەو بەسـتە کەمین دانـدرا بوو، دیـارە ئۆتۆمبێلەکانی تریـش کەوتنـە کەمین، بەڵام دوور بەدوور ئەو بەرپرسـەی لە کەمینەکەی ئێمە سـەرتیپی یەکێتـی بـوو، بەیانی چـوەوە ناو ڕژێـم نامەوێ ناوی بێنـم. بەیانی شـەڕ دەسـتیپێکرد لـە نێرەگین شـەهید دکتۆر ڕەشـید لەگەڵ عوسـمان بانی مارانی لەخانویەک دەوریان گیرا، شـەڕ گەرم بوو، ناوە ناوە ئاوێنەیان بۆ ئێمە ڕادەگـرت مانـای ئێمە ماوین، کاک عوسـمان بریندارببوو، ئەوکاتـە ئەو بەڕێزانە لە سۆسیالیسـت بوون، لە قۆڵی لای ئێمە، شـەهید قادر مسـتەفا لەگەڵ باوکم هاتـن ئەحوال پرسـیان کردم، شـتەکانم بـۆ کاک قادر گێڕایـەوە، گوتی: یالله شـەڕ گەرمتر دەبوو سات لەقۆڵی لای ئێمە شەهید گەیلان شەهید

بوو، هەتا لەبەستی شەرغە دەپەڕینەوە گوللە وەک زەنگەسورە گزەی دەهات، دەبوایە بە غاردان خۆمان لەبەستێ بپەڕینەوە بۆ پێشەوەی شەڕەکە، جەنازەی گەیلانمان لە کەپرێک دانا، کە حوسێن نەبی (کارزان) لەلای مایەوە، لاشەکەی گەرم بوو بە کارزانم دەگوت: ماوە، ئاخر کارزان ئەو برایەی زۆر خۆشدەویست، دەگریاو دەیگوت: هەڵستە پرتەقاڵم بۆ هێناوی.

لای ئێوارە شەهید ئیسماعیل شەهیدبوو. ئیسماعیل خەڵکی چەمە زەردەبوو، کوڕیکی یەکجار سادە و لەخۆ بوردە و هەتا بڵێی ئازابوو، نەمان دەتوانی بگەینە جەنازەکەی هەتا لای ئێوارە، لەسەر ئەو گردە بوو کە شەڕی لەسەر دەکرد، گوللەیەک بەتەختی نێوچاوانی کەوتبوو. کە هێنامانە خوارەوە کاکۆڵی لەخوێن ڕەق ببوو، ئەوەی لەناخەوە ئازارم دەدا دیمەنی کاکۆڵی لەخوێن ڕەق بوو ئەو جوتە پێڵاوەی پێی بوو، کە هەر تاکەی لە جۆرێک بوو، بەخۆمم دەگوت: ئێمە بە بۆنی کەباب هاتین، لێرە کەر داخ کردنە؟

شایانی باسە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی نوسینەکەم پاش ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی ١٩٩١ هەندێ بەڵگەنامەی مخابەراتی عێراقی دەست هاوڕێیان کەوت. یەکێ لەو بەڵگەنامانە دەڵێ: ئەو پێکدادانەی بەستی شەرغە لەبەینی یەکێتی و حیزبی شیوعی لەلایەن مخابەراتی عێراقیەوە سازکراو نەخشەی بۆ کێشرا.

لای گوندەکانی (بانەمورد)، (بەلەبان)، (بەردبڕ) بەدرێژایی ئەو ڕۆژە هەر تەقە و پێکدادان بوو لە هەموو لایەک، ئەوەبوو، یەکێتی لەگوندی (سێگردکان) و (ئۆمەرگومبەت) کۆکرانەوە، ملازم خدر لەگەڵ فەرماندەکانی یەکێتی دانیشت. ئەوان دەیانگوت: ئێمە بەهەڵە لەو ئۆتۆمبێلەی ئێوەمان داوە، (مەبەستیان ئۆتۆمبێلەکەی من بووکە لێماندرا). ملازم خدر گوتی: پێش کەمینەکە، مام هیدایەت و پێنج هاوڕێی تر لە ماڵی مام ڕەحمانی نێرەگین چەکتان کردن، خۆ کەس هەیە هاوڕێ مام هیدایەت نەناسێ؟ چەندجار گوتبوی: ئێمە شیوعین، چۆن من ناناسن؟! پێتان گوتبون: هەموتان دەناسین بەڵام ئێوەش لەگەڵ سۆسیالیست جیاواز نین. لە گرتنی مەڵبەندی چوار لە بالیسان، لەناو جانتای سەید کەریم نامەیەکی کاک نەوشیروان گیرا، ئەوکات زۆری لێ کۆپی کرا و بڵاوکرایەوە، ئەو نامەیە پەردەی لە ڕوی پاساوەکان هەڵماڵی.

لەو کەندەی خوار مزگەوتی نێرەگین، هەندێک بەردی زۆر گەورەی لێبوو، دوو

سـێ پێشـمەرگەی یەکێتـی لەپەنای ئەو بەردانە شـەڕیان دەکـرد، یەک لەوانە عەلیەکـەڕ بـوو، ئەو بەردەی کە عەلیەکەڕ لەپەنای بـوو، بەقەدەر ئۆتۆمبێلێکی گەورە دەبوو. ئاربیجی لەو بەردەی دەداو دەتەقیەوە، پاشـان زانیمان عەلیەکەڕ چونکـە گوێـی گـران بوو، بـەو گولله ئاربیجیانـەی گوتبو: ئـەو برنۆیە دەنگی زۆر ڕەقـە. ئەبـو ئەحرار یەکێک بوو لە هاوڕێیە عەرەبـەکان، ئاربیجی پێ بوو، عەلیەکـەڕ ڕەشـاش تکتاریۆڤـی پێ بوو، بۆیە ئەبو احرار دەیویسـت بێ دەنگی بکات. عەلیەکەڕی بە ئامانج دەگرت لەپەنای ئەو بەردە گەورەیەی لە تەنیشتمان ئاسـتەنگی دروست کردبوو بۆ پێشڕەوی ئێمە بەرەو (تیرئاوێژ).

لەجەنگەی شـەڕی خۆ بە خۆ لەبەسـتی شـەرغە، هەموومانی لەخۆی لول دەدا، زۆرم پـێ خـۆش بوو گوللـەی هەردوولا هەموی بە جـەرگ و دڵی من بکەوێ و شـەڕ کۆتایـی پێ بێت، چیتر کوڕە کـورد نەکوژرێن، بەڵام بەداخەوە ئەو جۆرە هەڵوێسـتانە لەڕۆژی وا لە کۆمەڵگای ئێمە حسـابی تری بۆ دەکرێ.

ئەو شـەوە کـە میسـریەکانمان هێناولەکەمینی یەکێتی لەبەردە سـپی لێماندرا، نهێنی شـەومان بروسـک بوو، بەیانی ئەو میسـریانەی کە گرتبومانن، بڵاوببوون بەناو بەسـتی شەرغە، شەهید قادر مسـتەفا لەگەڵ خۆی هێنانەوە، دەیانگوت: بەدرێژی ئەوشـەوە هێندەیان گوێ لە وشـەی نهێنی (بروسـک) ببوو لە ئێمە، وایاندەزانی هەمووما‌ن ناومان بروسکە لەو بەستە هەتا دەنگیان تێدابوو، هاواریان دەکرد: بروسـک (بروسـک انت فێن حەرام عەلێک اخ بروسـک). هێنایاننەوە بۆ مزگـەوت هەندێ هاوڕێـی عەرەبمان هەبوو، هێندەیان قسـە بۆ کردبوون، گوایە ئەو شـەڕەمان لەگەڵ یەکێتی دایە، مام جەلالیش بەرپرسـی یەکێتیە، کاتێ کە هاتنە ناو مزگەوت چاویان بە جەنازەی پێشـمەرگە شـەهیدەکان و بریندارەکان کـەوت یەکیـان هاواری کرد: (گەریمەت اتل، حەرام عەلێک یە گەلال مەئتولین)

## براکوژی و ڕەق بوونەوە لەناو بەفر

سۆسیالیسـت و یەکێتی و شـیوعی، ئاگر بەسـتێکی کاتیـان ڕاگەیاند. ڕۆژێکی ساردبوو، وشکەبایەکی زۆر ناخۆش دەهات، لە گوندی بایزاغابوین. چێشتەنگاو،

پێشمەرگەی پاسەوان، گوتی: هێزێکی زۆری پێشمەرگە لە ڕێگای گوندی بانی ماران بەرەو ئێرە دێن، لەوکاتەدا خوێن لەنێوانمان ڕژابوو، متمانەمان بەیەکترنەمابوو، هەروەها نێوانی یەکێتی و سۆسیالیست ناخۆش بوو، هەموو لایەنەکان هێزمان بۆ یەکتر کۆدەکردەوە. هێزەکەی ئێمە دابەش بوین لەدەوروبەری گوند بەشێوەیەکی نادیـار، مـن لەپێش ماڵی قادر تەها و مام عەوڵا لـەلای دیوارێکی کەونە کادێن وەستابووم. چەکەکەم سواربوو ئەمنییەتەکەشی دانەدرابوو، بەداخەوە لەو جۆرە ڕۆژانـە کـێ پەنجەی زوتر بە پەلاپیتکەی تفەنگەکەی ڕابگات ئەو دەیباتەوە، کە خـۆی لەخۆیـدا دۆڕاندنێکـی گەورەیـە..!! هێزەکە دوو، دوو ڕیزیان بەسـتبوو، گەیشـتنە لای من سڵاویان کرد، ماندوو

نەبوونـم لێکـردن، لایـان نـەدا بۆ نـاو گوند، بەرەو گوندی سـماقە ڕۆیشـتن. کاک شـەماڵ و سـەربازبوون، هەڵەنەبم کاک شـەماڵ هەوری ڕەشی لەسەربوو، دوو پێشـمەرگە هێشـتا مابویان بگەنە ڕاسـتی من، یەکێکیان ڕوی لە من کرد، پێدەکەنـی. ئـەی خوایـە خۆ ئـەوە کاک تەحسـین عەقارییە!! لـە هەولێر زۆر برادەربویـن، یەکترمـان لـە ئامێزگـرت، یەکترمان مـاچ کرد بەڵام کە سـەیری تفەنگەکەی منی کرد، گوتی: شـەرمە ئەو تفەنگەت سـوارە. منیش، گوتم: کاک تەحسین، بەداخەوە گەنجی وا هەیە وا دەزانێ بەس تفەنگی ئەو خەڵک دەبڕێ، نازانێ تفەنگی هەموو کەس مرۆڤ دەبڕێ، زۆرمان گلەیی لە لای یەکتر کرد، کەوا ئێمە بۆچی بوین بە پێشـمەرگە، ئێسـتا بۆچی بەکارمان دێنن!! (کاک تەحسین عەقـاری پاش ماوەیەک لەگوندێکی لای قازبەگیان دانیشـت لە ئەنفالەکان گیرا، کەسـێکی دەست ڕۆیشـتوو بەریدا، بە تەحسـین سەرسپی ناسـراوە، ئێستا لە گیانەڵادایە لەسـەر جێگا کەس ناناسـێتەوە، بەداخەوەم بۆی). ئەوکات بەهۆی ئەو شـەڕە نەگریسـە زۆر پێشمەرگەی تێکۆشـەر لە هەموو لایەنەکان دانیشتن. بەداخەوە بەوانەیان دەگوت: (ترسـنۆک) بەلام لەراستیدا بوێرو تێکۆشەر ئەوان بوون، کە شەڕی براکوژیان نەکرد.

مەحموودحاجـی نـادر بـۆی گێڕامـەوە: لەبـەری چیای کۆسـرەت کە شـەماڵ شـەهیدبوو، ئەوەندەی کچ و ژنی شـیوعیەکان کراسـیان بۆ ڕەشـکردبوو، کچ و ژنی یەکێتیەکان کراسـیان بـۆ ڕەش نەکردبوو..!! لەکاتێکدا، عەلی حاجی برای بەدەستی یەکێتی شەهیدکرابوو، ئەگەر شەماڵی خۆش نەویستبا ئەو قسەی بەم

شێوەیە بۆ من نەدەگێڕایەوە. بەهۆی دڵرەقی و ناکارامەیی سەرکردەکانمان ئەو هەموو پیاوە مەزنەمان لەدەستدا، مێژوو نایان بەخشێ، تەنها دەیانویست زۆرو بۆر بێ، بۆ ئەوەی بڵێن: لەشکری فلان بەرێز ژمارەی زیادی کردوە!!

لەدوای شەڕی ناوخۆی بەستی شەرغە و دەشتی کۆیە، لەگوندی نێرەگین، مام خدر مانگایەکی بە بەر ئەو شەڕە ئاربیجیەی ئێمە و سۆسیالیست و یەکێتی کەوتبوو، لایەکی خانوی ئاژەڵەکانی ڕووخابوو، ڕقیان لە فەساڵی براکوژەکانی هەموو لایەنەکان دەبوەوە. نیوەڕۆیەک مامۆستا هەندرێن و برازایەکی فاتیح ڕەسوڵ و پێشمەرگەیەکی تر بەناوی ئاسۆ، خەڵکی کۆیە بوو. دەچنە ماڵی مام خدر، ئەویش لەژێر جێگادەبێ، کە ئەو سێ پێشمەرگەیە دەبینێ، هەڵدەستێ و شرت و شۆیان دەشکێنێ، دەڵێ: ئاخر ئێرە سەربازگەیە، مۆڵگەیە، ئێوە ئەو شەڕەتان لێرە دامەزراندوە؟!! بۆ ناچن ئەو هەموو مۆڵگەیەی ڕژێم لەسەر ڕێگەی کۆیە هەیە، بگرن؟!! لەوکا

تەدا ساواریان لەپێش دادەنێن، پێشمەرگە زۆری ڕق لە ساوار بوو، لەبەرئەوەی لە زۆربەی ماڵەکان ساواربوو. مامۆستا هەندرێنیش کە ناوی خۆی فەرهادبوو، چاوی بەساوارە سۆرە دەکەوێ دەڵێ: مام خدر، مۆڵگە بە ساوارە سۆرە ناگیرێ، وەرە پیاو بە ئەو گۆلکەمان بۆ سەربڕە، پیاو نەبین ئەگەر ئەو مۆڵگانەی ڕێگای کۆیە هەموی نەگرین.

ئەو پێشمەرگەی لەگەڵ هەندرێن چووبوە ماڵی مام خدر خەڵکی کۆیە بوو ناوی ئاسۆ بوو، لەدوای ئەنفالەکان لە بارەگاکانی نێوزەنگ و نۆکان دەیگوت: نەمردبومایە بەچەکەوە لە هەیبەت سوڵتانی شۆڕبامایەوە شاری کۆیە، کچانی کۆیە بە یەکتریان بگوتایە: ئەوە ئاسۆیە. ئینجا شەهیدیش ببام پێم ناخۆش نەبوو.

بەداخەوە لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ کانەبی گەورەو هەردی و ملازم شێرزاد و ئاسۆ و قەندیل و چەند پێشمەرگەیەکی تر، هێرش دەکەنە سەر مۆڵگەکانی ڕژێم لە هەیبەت سوڵتان. ئەو شەوە تەنکە بەفرێک لە چیای هەیبەت سوڵتان دەکەوێ، شەوێکی زۆر سایەقە و سارد دەبێ، بۆیە هەمان شەو ئاسۆ لەسەر هەیبەت سوڵتان لە سەرمان ڕەق دەبێتەوەو شەهید دەبێ. بەداخەوە لەدوای ئەو هەموو ساڵە خۆڕاگریە بە ئاواتەکەی نەگەیشت بگاتەوە ناو شاری کۆیە، تەنها لەسەر

هەیبەت سولّتان دوور بە دوور شاری کۆیە دەبینێ، ئاواتەکەی بردە ژێرگڵ.

## بەرەی جود و بەردەوامی یەکترکرۆشتن

کاتێک بەرەی جود پایەکانی بەرەی جۆقدی لەق کرد، عەسکەرە کوردەکان لەهەولێر دەوامیان نەدەکرد، بەردەوام خۆپیشاندانیان دەکرد، هەر ئەو ڕۆژە هەمویان کۆکردبوونەوە پێیان گوتبون: ئەوەی ڕازی نییە دەوام بکات، با بچێ بۆ بەستی شەرغە یەکتر بکوژێ، فیشەکیشی دەدەینێ. ئەو هەواڵە ویژدانی هەموو کوردێکی دڵسۆزی دەهەژاند، بەراستی کارەسات بوو، لەورۆژە سەختە یەکتر بکوژی. هەستم دەکرد فرێدراومەتە ناو مەنجەنیقی دۆزەخێک و گوناهەکانم بارتەقای ئەو سزا بێ ڕەحمانە نییە کە بەسەرمدا دەسەپێنن. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تێیدا نغرۆ دەبووم، بەجۆرێک خۆم ونکردبوو، چیا بە چیا، گەلی بە گەلی، ڕەوەز بە ڕەوەز، لە دۆزینەوەی خۆم دەگەڕام.

بە خۆمم دەگوت: خۆ تۆ بە ئاگایانە بەرە و لوتکە هەنگاوت دەنا، ئێستا بۆ گلۆر بویەوە، کەوتیە تەپانی بنی؟ سەرانی کورد، دووبەرەکیان چاند و ئێمەی پێشمەرگەش نا ئومێدیمان دووریەوە. نوسینەوەی یادەوەری ئەو ڕۆژانەی یەکترمان دەکرۆشت، سینەفزیۆنی ئەو دیمەنەیە کە لە گوندی نێرەگین جامانەی یەک لە قوربانییەکان مێشکی خوێناوی تێدابوو. تەرمی دوو پێشمەرگەی سۆسیالیست بە قۆڵ بەستراوی گوللە باران کرابوون، لە پشت ماڵی مام ڕەحمان. پەلەفرکێی مانگاکەی مام خدر بە گوللەی پێشمەرگە، ڕادانی ئەو خەڵکەبوو وەک مێگەل بەرەو جاشایەتی، کە لەدواییدا بە سێ سەد هەزار چەکداری کورد مەزەندە دەکرا. دەتوانم بڵێم: دوو سەد و پەنجا هەزاری سەرانی کورد ڕایان دان بەرەو جاشایەتی. سێ ڕێگایان لەبەردەم بوو، یان براکوژی، یان گرتن و گوێ برین و گوللە بارانکردنیان لەلایەن ڕژێم، یان خۆ پەنادان لەو دوو کردەیەو چونە ژێر باڵی ئەژدیهاکان کە مستەشارە خۆفرۆشەکان بوون.

لەگوندی سێگردکان، بەرپرسە باڵاکانی هەر سێ لایەن دانیشتن، ئاگربەستیان ڕاگەیاند، بەستی شەرغەیان بەو بچوکیە بەشکرد، ئەو گوندانەی ئێمەی تێدابوو،

ئەوان نەدەهاتن هەروا بە پێچەوانەوە، دروست دێگەلەی ئێستا.
ڕۆژێکیان لەناوچەکە پێنج هەلیکۆپتەر زۆر بەنزمی هاتن، تەقەیان لێ نەکردین، چونکە دەیانزانی ئێمە لەجیاتی ئەوان چاکتر یەکتری دەکوژین. لە ڕادیۆ کەناڵی ئێف ئێم گوێمان لێبوو، بە یەکتریان دەگوت: ئەو گەوادانە چ ناوچەیەکیان هەیە، دەڵێی بەهەشتە. (گەواوید شلۆن مەنتیقە عدهم عەبالەک جەننە).
لەشارێی (هەولێر- کۆیە) کەمین دەردەچوو، هەموی ڕەبایەی ڕژێم بوو، وردە وردە هەڵیدەگرتن، مەجالی بۆ خۆشدەکردین بەئازادی هێز بۆ گیانی یەکتر کۆبکەینەوە، بۆ نمونە: لە تەکەور ڕەبیەیەکی دوژمن هەبوو پێش براکوژی، بەپیادە ڕەت بوینایە تەقەی لێدەکردین، کە شەڕی ناوخۆ بوو بە ئۆتۆمبێل بەلایاندا ڕەت دەبوین تەقەی لێ نەدەکردین. ڕەنگە ڕژێم ناراستەوخۆ تەقەمەنیشی بۆ هەموو لایەک ناردبێ، لەرێگای پیاوەکانی خۆی. بەداخەوە ئێستا بەوانە دەگوترێ: لە ڕۆژی تەنگانە یارمەتی شۆڕشیانداوە. تەنها خۆیان پێ خاوەنی شۆڕشە، بۆیە من بەو کردەوەیەی پارتی و یەکێتی دەڵێم: بە شۆڕشگێڕکردنی ناپاکەکان و خیانەتکاران.
پایز بوو باران دەباری، لەو هەرەت و زورگانەی بەستی شەرغە دەسوڕاینەوە، ئیتر بە پێچەوانەی پێشوو لەجیاتی خەڵک بێن بۆ ڕیزی شۆڕش، هەموو لایەنەکان وردە وردە لێمان کەم دەبوەوە. لەگوندی نێرەگین دابەش ببوین، دوو پێشمەرگەو بۆ ماڵێک، نیوەڕۆ بوو خەڵک بەڕاستی لەبەر پێیان چوبوون. ئەوەی دەهاتە ناو گوند وایدەزانی تەنها خۆیەتی، کەسیتر پێش ئەو میوانی ئەو ماڵە نەبوە. من بەش بەحاڵی خۆم، خۆم بەشەرمەزارو قەرزداری ئەو خەڵکە دەزانم، قەت باوەڕم نەبوو ڕۆژێک شۆڕش سەرکەوێ، ئاوا بێ پاداشت بمێننەوە، من ئێستا هیچ کارە نیم، هیچم لەدەست نایە، ئەگەر لەدەستیشم هاتبا ڕەنگە لەو بەرپرسانەی ئێستا چاکتر نەبوومایە، منیش کوڕی ئەو کۆمەڵگایەم. کە ئەتکراوە لەلایەن حیزبەکان بەتایبەتی دوو حیزبی دەسەڵاتدار.
ئامر کەرتێک هەبوو سۆسیالیست بوو، نامەوێ ناوی بهێنم سێ پێشمەرگەی هەبوو بەڵام هەر پێی خۆش بوو پێی بڵێن ئامرکەرت، ئەو سێ پێشمەرگەش خزمی خۆی بوون، لەشەڕەکەی نێرەگین و بەستی شەرغە پێشمەرگەیەکی بریندار بوو، برینەکەی سەخت بوو. ئێوارە کە بەرپرسەکان دەیانویست وشەی

نهێنــی شــەو دابنێــن، بەزۆری ناوی شــەهیدێک دەکــرا بەنهێنی شــەو، ئەویش ئەوەندەی پێ خۆش بوو بڵێن: کەرتی فلان کەســیش شــەهیدێکی داوە، گوتی: با نهێنی شــەو فلان کەس بێ، کاک قادر مســتەفا پێی گوت: چما شەهید بوو؟ گوتــی: نەخێــر بەڵام بەدڵنیایی شــەهید دەبێ. کاک قــادر گوتی: (خوا عافوت بکا) ئەگەر شەهید نەبووبێ نابێ.

لەگوندی نێرەگین ماڵێک کرابوو بە نەخۆشخانە، دکتۆر سادق دەرمانی دەکردن، بەکر حەمە و چەند بریندارێکی لێبوو. چووم سەرم لێدان، ناوەکانم لە یاد نییە.

ســەرەتای بەهــاری ١٩٨٣بوو، لــەو ناوچەیەی ئێمەی لێبوین، واتە: لە بەســتی شــەرغە و ڕۆژهەڵاتی کۆیە و دۆڵی ســماقوڵی و هەموو ئەو ناوچانەی مەفرەزەی ئێمەی دەگەیشــتێ، تەنها یەک پێشــمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانیشــی لــێ نەبوو. بــەرەی جود هەبوو، ئەو حیزبانەی ناو بەرەی جود: سۆسیالیســت، شــیوعی، پارتی، پاســۆک، دەیانویســت وا پیشــان بدەن کە بەرەیەکی تۆکمەو ڕێکوپێکیان هەیە، ڕۆژێک لەناکاو هەشــت پێشــمەرگەی پارتی لە گوندی سماقە پەیدابوون، بەراستی موعجیزە بوو، لەبەرئەوەی بەرپرسی ئەو پێشمەرگانە خاڵم قادر بوو، باوکم گوتی: بڕۆ لەو ماڵە برادەرانەت لە گوندی ســماقە، نانێک ســاز بکــەن. چووم دوو مریشــکم کڕی لە ماڵی کاک ئەکرەمــی مام خدری، بۆیان لێ نایــن، لەگــەڵ باوکــم و خاڵم چوین بــۆ ماڵی کاک ئەکرەم، ( ئێســتا ماڵیان لە باداوانی هەولێرە، لە ژیاندا ماوە ). لە ماڵی ئەوان نانمان خوارد. پێمان گوتن: کاکە خەڵک لەگوندی بێســتانە زۆر پرســیارتان دەکــەن دەڵێن: ئەگەر ماون بۆ دیــار نیــن!! ئەوە چەند ســاڵە ئێوە لــەو ناوچانەن بۆ تەنها یەک پێشــمەرگەی پارتیمان نەدیوە؟!

ڕۆژانــە دەمانگێــڕان لەگەڵ خۆمان بەئۆتۆمبێل لــە زۆربەی گوندەکان لەمزگەوت کۆدەبوونــەوە، خەڵکــی گونــد قســەیان بۆ دەکــرا بەناوی بەرەی جــود، پێیان دەگوتن: ئەوانەش پێشمەرگەی پارتین، زۆرکەس هەر باوەڕیشی نەدەکرد، بەڵام بەرپرســەکەیان خزمێکــی زۆر نزیکی من بوو، کابرایەکی دیارو پێشــمەرگەیەکی دێرینی شۆڕشــی ئەیلول بوو، دەمانگوت: ئەوە فلانە قادر عەزیزی پارتی، ئینجا باوەڕیــان دەکرد کە پێشــمەرگەی پارتی هاتونەتە خــوارەوە، بۆ ماوەی دە ڕۆژ مانــەوە، ناوی خوایان لێهێنا مەلەکان خۆت بگرەو هاتم.. !!

هێندەی نەخایاند بەرەی جود بە پارتیشـــەوە لەدۆڵی بالیسان و دۆڵی مەلەکان، هێزیـان کۆکردەوە بۆ ســەر مەڵبەندی چـوار. لە تۆڵەی ئــەوەی یەکێتی چەند پێشـمەرگەیەکی بــەرەی جـود، لە شـیوعی و سۆسیالیسـت شــەهید کردبوو، بەپێداگیری پارتی و سۆسیالیســت، ئەو شەڕە بەهاوکاری ئەبو حیکمەت بەسەر حیزبی شـیوعیدا سەپێنرا، هێرش کرایە سەر مەڵبەندی چوار لە ٢٤/ ٤/ ١٩٨٣ مەڵبەند گیرا.

لەگونـدی کانی بەرد دکتۆر سەرسـۆر لە حیزبی شـیوعی شــەهید بـوو، کە لە شەقڵاوە پیاوەکانی ڕژێمی بەعسی لە زەلالەت نابوو، زۆربەی شەوەکان دەچووەوە ناو شەقڵاوە بۆ چالاکی. لەهەر شوێنێک لە شەقڵاوە تەقە بکرابایە، وای لێهاتبوو ئەگەر دکتۆر ســەر سۆریش نەبوایە، دەیانگوت: دیسان دکتۆر سەر سۆرە.

لەپشــتی بالیســان ئەحمەد قەنبەری لە یەکێتی شــەهید بوو، کە لە پێشــمەرگە ســەرەتاییەکان بـوو، کاتێ بریندار ببــوو، بەخوێنی خۆی لەبەردێکی نوســیبو: لەدوای حەوت ساڵ پێشمەرگایەتی لەشەڕی براکوژی کوژرام. وەک ناڕازی بوون بەو قەدەرە. ئەوەی ڕاســتی بێ ئێمە وەک پێشــمەرگە لەهەردوولا ئەسپێکی بێ ڕێشمە و لغا و هەڵیگرتبوین، خەنجەری ڕووت بەدەستەوە بۆ بڕینی قوڕقوڕاگەی بــرای خۆمان. ئەوەی ڕاســتی بێ، ئەو ڕووداوە پێشــمەرگەکانی بارەگای شـێخ وەسانان گێڕایانەوە.

# شەڕی قڕناقە وپشت ئاشانی یەکەم

ئێمە وەک پێشــمەرگەکانی دەشتی هەولێر، داواکراین بۆ مەلەکان، ئۆتۆمبێلێکی پیکەبی چوار قاپیم پێ بوو، ئەگجۆزەکەی تەقی بوو، بەو شــەوە ســاردە ماوەی کاتژمێرێــک ڕێگا، گوێت لەدەنگی دەبــوو. بەگوندی تەکەور پەڕینەوە لە ڕێگەی کۆیە. هەموو کادیرەکان لەگەڵ من ســواربیوون، وەک: شــەهید ســالارو شەهید کۆچەرو موحسین دەشتی و مەلا نەفتە و ئەحمەد کادیر ....هتد، شەهید عەباس گوتــی: هــاوڕێ حازم، بۆیە هەموو حیزبم لەگەڵ تۆ ســوارکردوە، ( مەبەســتی کادیــرەکان بوو، زۆربەیان بە تەمەن بوون) تائاگاداربی و بیانپارێزی، شــۆفێری

کردنی تۆم پێ باش ترە لەوانی تر، دڵنیام لە ئاست چاوەڕوانی هاوڕێیان دەبی. ڕەبیەیەکی ڕژێم لەسـەر گوندەکە بوو، دەبوایە بۆ سـماقوڵی بەلای ئەو ڕەبیەیە تێپەڕبیـن، منیـش گوتـم: بە دڵنیایـەوە تەقەمان لـێ دەکـەن. خەڵکی گوند، گوتیان: هەقیان بەسـەرتانەوە نییە برادەرانی سۆسیالیسـت پێش ئێوە ڕۆیشتن تەقەیـان لەوانیش نەکرد. ئەوەنـدە بەنزیک ڕەبیەکە تێپەڕبـووم بەو ئۆتۆمبێلە دەنـگ گەورەیـە، ئەگەر داوای ئاوم بکردایـە ڕەنگە بۆیان هێنابـام. بەهەرحاڵ گەیشـتینە سـماقوڵی. ئیتـر ئۆتۆمبێل نەدەڕۆیشـت، بەڵام لەوێ بیسـتمان کە مەڵبەنـدی چوار گیراوە، دەرەدار لەدەسـت بەرەی جودە، دەرەشـیر لەدەسـت یەکێتیە، شـەڕە دۆشـکە بوو. ئێمە سـەرکەوتین بە دەرەدار بۆ دیوی مەلەکان، لەوێ لقی ئێمەیان نارد بۆ پشتی مەلەکان، لەدوو چەقەرە شاخ دامەزراین. باران دەبـاری، ئەمان باران، نە شـەو لێی دەکردەوە نـەڕۆژ. هەورو تەم ئەو دۆڵانەی داگیرکردبوو، نە شـوێنی وشـکمان هەبوو نە ئاگرکردنەوە. جارجار هەوری بڵند دەکـرد، بای هەڵدەکرد بەتەواوی وشـک نەدەبوینەوە دای دەداوە باران. ماوەی هەفتەیەک لەوێ بوین، لەژێر ڕەحمەتی دۆشکەو باران، ئەو حەوت ڕۆژە بەحەوت سـاڵ هەبوو. سـەرەتای بەهاری ١٩٨٣ بوو. چی لەوەی ناخۆشـترە شەڕێک بە قیمەتـی گیانـت تەواو بـێ و باوەڕت پێینەبـێ؟!! دوای هەفتەیـەک لەو ئەرکە قورسـە، ئێمـە گوازراینەوە مەلەکان، چەند پێشـمەرگەیەکی تر هاتنە شـوێنی ئێمـە. هێنـدەی نەخایاند هەواڵی شـەڕی قرناقە و پشـت ئاشـان بـڵاو بوەوە، خەڵکێکی زۆری لە حیزبی شـیوعی و سۆسیالیسـت تێدا قرچ و برکرا. زۆربەیان بەدیلی کوژران، پاش دوو مانگ ئێمە چوینە قرناقە و پشت ئاشان، بۆنی خوێن و لاشـەی لێدەهات، لەژێر بەردەکان یەک یەک دەمان شـاردنەوە، ئەوەی ڕاستی بێ ئەو شـەڕە لەلایەن نەوشـێروان مسـتەفا سەرپەرشـتی دەکـرا. وە دیلەکان بەفەرمانی ئەو، گوللە باران کران، کەوا ژمارەیان شەسـت و پێنج پێشمەرگەبوو لـە دکتۆر و خاوەن بروانامە باڵاکان.

سەرەتای مانگی ١٩٨٣/٥ لەشەڕی نێوان یەکێتی و بەرەی جود، کاتێک پەکەکە بە پێشنیاری بەرێز ئۆجەلان کەوتنە ناوبژی ئەو دوو هێزە کوردیە بەشەڕهاتوە. لەنزیـک کۆمتان کەوتنـە کەمینی یەکێتی، مەحەمەد قەرەسـنگول و برایم بلگن شـەهید بوون و فوئاد ئەسـلان و عەلی ئەرتەک بەدیل گیران. کاتێک بردبویانە

لای نەوشـــێروان مســـتەفا، بەداخـــەوە لەکاتێـــک پێیان گوتبو: ئێمـــە بۆ ناوبژی لەلایەن بەڕێز ئۆجەلان ئەرک دار کراوین، لە وەڵامدا نەوشیروان مستەفا گوتبوی: (ئەگـــەر کەچـــەڵ حەکیم بوایە چارەی ســـەری خۆی دەکرد) ئێـــوە چی دەکەن لێرە؟! چەکەکانیان بدەنەوە با بڕۆن. بۆ زانینی زیاتر بڕوانە کتێبی (پەنجەکان یەکتری دەشـــکێنن) لەنوسینی نەوشیروان مستەفا، لاپەڕە ٢٩٤.

فوئاد ئەسلان و مەحەمەد عەلی ئەرتەک، پاش بەربوونیان لە ئەرارات گەلی داغ شـــەهید بوون. ئەوەی ڕاستی بێ لایەنە بەشـــەڕهاتوەکانی باشور بە پەکەکەیان دەگـــوت: بـــا تۆڵـــەی مەحەمەد قەرەســـنگول و ابراهیـــم بلگن بکەینـــەوە. بەڵام پەکەکە دەیگوت: تۆڵە ســـەندنەوەی ئەوانە شـــەڕ ڕاگرتنە، ئەگەر ڕاست دەکەن. لەوکاتەوە من خۆم بە قەرزداری ئەو دوو شـــەهیدە ئاشـــتیخوازە دەزانم، خەڵکی باشـــور بەگوێرەی پێویســـت ئەو دوو شەهیدی ئاشـــتیە ناناسن، هیوادارم ڕۆژێک بێت پێشمەرگە دێرینەکان لەڕۆژی شەهیدبوونیان لەو شوێنەی لێی شەهید بوون چەنـــد مۆمێک دابگیرســـێنن و یادیان بەرز ڕابگرین. بـــۆ هەتاهەتایە نەوەکانمان بیانناســـن، هەزار ســـڵاو لـــە گیانی پاکیان، ئـــەو گۆڕســـتانەی هەڤاڵانی پەکەکە لەبنـــاری قەندیـــل لەدوای گواســـتنەوەی تەرمـــی مەحەمەد قەرەســـنگول ابراهیم بلگن، گۆڕســـتانەکە بەناوی مەحەمەد قەرەسنگولە.

نەکۆبوونەوەیەک، نە ڕاپرســـیەک، نە ڕا وەرگرتنێک، ئێمە خۆمان وەک برە مەڕ دەهاتە بەرچاو، شەوبوو هەموو هێزەکانیان کۆکردەوە، ئێمە لە مەلەکان نازانین بۆ کوێ، لەدەرەدار ســـەرکەوتین بۆ گوندی شـــێخ وەسانان. یەکەی چوار نانیان داینێ، دوو نان بۆ خۆمان بخۆین و دوو نانیش بۆ حیزب هەڵبگرین. بۆمان نەبوو دوو نانەکەی حیزب بخۆین، بەڵام هەر ڕۆژە و هەر شەوەی چەند پێشمەرگەیەکمان لێ کەم دەبوەوە، خۆیان ڕادەســـتی ڕژێم دەکردەوە، ژمارەیان گەیشـــتە دووسەد پێشـــمەرگە، ئەوەی جێی داخبوو دەبوایە تفەنگە بەجێماوەکانیشیان هەڵگرین.

چوینە گوندی بناوێ، لەوێ سەرەوژێر بوینەوە بۆ نزیک گوندی ئالانە، ئەوهەموو پێشمەرگەیە یەک لەدوای یەک نەسەری دیاربوو، نە بن. لەناو خەلیفان خەبەرمان بۆ هات، کە ناتوانن بەناو خەلیفان تێپەڕ ببن. ناچار بەسەرکەوتین بۆ سەرچیای بەنی هەریر، چی وای شـــەو نەمابوو کاتێک گەیشـــتینە ســـەر چیای بەنی هەریر، پێیـــان گوتین: کەس جگەرە نەکێشـــێ، پیلی لایتەکان ســـەراوبن بکەن. جەنگی

ئامۆزام لەلای من دانیشتبوو، شەو کە بەڕێکەوتین، هەر بەرێوە نوردیە نانەکانی گیرفانمـان لێ دەکردەوەو دەمان خوارد تا تەواو دەبوو، بەڵام ئەو دوو نانەکەی حیزبیشـی خواردبوو، بێ ئەوەی هەسـت پێ بکات. لەناکاو کێشـای بە چۆکی خۆیداو گوتی: چیم لێ دەکەن، خۆ نانەکەی حیزبیشـم خوارد!! ئێمەش هەر بۆ پێکەنین پێمان دەگوت: ئێمە لەحالەتی شـەڕداین، لەوانەیە گوللە بارانت بکەن، حیـزب خۆی و خوای خۆی چیت لێ دەکات.

کە شـەو داهاتەوە دەسـتمان بەرۆیشـتن کردەوە، لەبەینی کەلەکین و خەلیفان، بەناو ئەو شینکانەی پشتی خەلیفان بەرە و سرێشمە، بەڵام ئەوەندە تاریک بوو زۆرجار نێوچاوانم بەتفەنگی ئەو پێشـمەرگەی پێش خۆم دەکەوت نەمدەبینی!! دەترسـام شـەو کوێر بووبم، بەڵام لەزۆر هاوڕێم پرسـی، هەموو وەکو من بوون. هێندەمـان چـۆک و سـپیلکی پێیەکانمان لەبەردان دابوو، بەیانی سـەیری لاقی خۆمان دەکرد، دەتگوت: ئەوشەوە شەڕمان لەگەڵ بەردەلاندا کردوە!! ئەو شەوە هیچ کەس هێندەی هاوڕێ سـالار ماندوو نەبوو، شەهید سالار لاقێکی شەل بوو، بەداخەوە شەهید سالارو کوڕەکەی، لەو شەوەدا ڕیکۆردی بەربوونەوەیان شکاند. بەیانیدا، گەیشـتینە دوو سـێ ڕەشـماڵ. هەندێـک پێشـمەرگەی یەکێتی لەوێ بـوون، چەنـد دوورە تەقەیەکیش کرا، بەڵام هەڵاتن لەبەرئەوەی ئێمە هێندە زۆر بویـن نەیاندەزانـی ئێمە چ هێزێکین لەم ناوە پەیـدا بوین. ماینەوە، هەتا تاریک داهاتەوە شەوی دوایی بەڕێکەوتین، بۆ مەلا بانگدان گەیشتینە گوندی سرێشمە. لـە گونـد دابەش بویـن، هەرچەندە وەک جـاران دوو، دوو جێگامـان نەدەبوو، ئەوجارە، دە بۆ دوازدە پێشـمەرگە دەچوینە یەک ماڵ.

ماوەی کاتژمێرێک لەگوند ماینەوە، نانمان خوارد، زۆر پێشـمەرگە بەدانیشتنەوە خـەوی لێدەکـەوت. بەرەو گەلی عەلی بەگ و خـەلان بەڕێکەوتین، ڕەبایەیەک ، لای دەستە ڕاستمان لەسەر ڕێگەکە بوو، یەک تەقەی لێ نەکردین، دنیا ڕووناک ببوو زۆر بەچاکی ئێمەی دەدی. شۆڕبوینەوە ناو گەلی عەلی بەگ، بەرەو چیای نەواخین و برادۆست، بەئاراستەی گوندی خەلان. لەو ڕێگایە هەتا نوێژی شێوان نەگەیشتینە هیچ ئاوەدانییەک، هەمووومان ماندو و شەکەت بوین، پێمان ئەستور ببوو، ئەگەر پێڵاومان دادەنا، نیو کاتژمێر بحەسێینەوە، لەبەر ئاوسان پێمان بە پێڵاوەکەدا نەدەچووەوە. هەندێکمان بۆ نوێژی شـێوان، گەیشـتینە دوو ڕەشماڵ.

من کە باوکم و سێ براو چوار ئامۆزام پێشمەرگەبوون، لەوهێزە کەسمان ئاگامان لە کەسمان نەبوو. هەندێک پێش من گەیشتبوون هەندێک دوای من، هەندێک مانەوە بۆ ڕۆژی دوایی. کە من گەیشتم، بەچەند ژنێک نانیان دەکرد، دوو ئەنگوتکم وەرگرت وەکو بەشی خۆم، تۆرەم گرت بۆ برژاندنی، پاش کاتژمێرێک ئینجا نۆرەم هات. چونکە سێڵەکان کەم بوون. تاریک داهات لەولای من بوو بەشەڕ. دوو پێشمەرگە لەسەر کورتانی ئێستر بەشەڕ هاتن، ئەو دەیگوت: کورتانی خۆمە! ئەوی تر دەیگوت: پێش تۆ بۆ خۆمم گر داوە، پێی بخەوم و ئەم شەو نایدەم بە تۆ. پێکمان هێنان هەتا کاتژمێر دوازدەی شەو یەکیان پێی بخەوێت، لەدوای ئەوە ئەویتر هەتا بەیانی. بۆنی ئارەقەی ئێستر پیاوی دەکوشت نازانم چۆن پێی دە خەوتن!!

جارێکی تر لەناوچەی زێبارەتی، گوندی چواربۆت کە دەکەوێتە خوار گەلی پڵینگان، هەردی برام دوو کورتانی بەیەک وەنابوو، چونکە ئەو درێژبوو یەک کورتان بۆ هەردی بچوک بوو، لەژێر ئەو دوو کورتانە خەوتبوو. هاوڕێیەکی عەرەب لەپێش هەردی پاسەوان بوو، هەردی لەدوای ئەو بوو، ئەو هاوڕێیە عەرەبە هەردی بۆ نەدەدۆزرایەوە پاسەوانییەتەکەی ڕا دەست بکات بانگی دەکرد ( ڕفیق هەردی وێن؟) دوایی هەموومانی بە ئاگا هێنا، برادەرێک گوتی: هەردی (جوه الکورتان) واتە، هەردی لەژێر ئەو کورتانانە خەوتوە، بەم شێوەیە هەردی نیو کاتژمێری پاسەوانی حەرام خوارد، تا دۆزرایەوە لەژێر کورتانان.

## ئەدی لۆ دەڵێن شیوعی کافرن؟!

تازە گەنجێک هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی ناوی ئارام بوو، خەیری یەک فەردە ئەشیای تایبەتی خۆی پێ هەڵگرتبوو ماوەی چەند شەوو ڕۆژێک، لەبالیسان هەتا ڕوستێ. پێی گوتبو: ئەوە ئەشیای حیزبە، نابێ کەس دەستکاری بکات. هەرچی دەستی بۆ دەبرد دەیگوت: هی حیزبە نەکەی.

ڕۆژی دوایی ماینەوە لەو دوو ڕەشماڵە، بەڵام خوێ، نان، ئارد، هەموی تەواو

بوو، ئەوانەی دواکەوتبوون، لە ڕێگا یەکە، یەکە دەگەیشـتن، ژمارەیەک مەڕیان کـڕی، مەڕەکان سـەربڕان، بـەڵام نە نان هەبـوو، نە خوێ، هەریەکەی بەشـی خۆیان دایە، بە شیشکە تفەنگ لە شیشمان داو بێ نان و خوێ، بەراستی کورد گوتەنی: (هەموو شـت بەخوێ، خوێش بەمانا). ئەو ڕۆژە ئەوەم هاتبوەوە یاد، ئێـوارە هـەر کە تاریـک داهات، نهێنی شـەو داندرا، بەڕێکەوتیـن بەرەو ڕێگەی مێرگەسۆر. بەرەی جود ژمارەمان خۆی لە حەوت سەد پێشمەرگە دەدا، ئەوەی پێشـەوە قسـەیەکی بکردبایە، ئەوەی دوای ئەو دەیگوتەوە بەوەی دوای خۆی، بۆ نمونە: شـەهید بڕیار جنێوێکی بەخۆی دا لەداخان، شـەهید بڕیار سـەرپەل بوو، هەردی برام لەپەلەکەی بڕیاربوو، لەپشـت بڕیار دەڕۆیی هێندەی پرسـیار لە بڕیارکردبوو کە بەرپرسـێکیان سـواری کەرکردبوو بە بڕیاری گوتبو: ئەوەی سـواری کەرەکـە بوە کێیە بڕیار؟ ئەویش لەداخـان گوتبوی: کەر دایکی بڕیاری بگـێ !! ئیتر هەردی بەوەی دوای خۆی گوت: بەو شـێوەیە هەتا پێشـمەرگەی دوایـی دەیانگوت: کەر دایکی بڕیاری بگێ.

ڕۆژی دوایـی گوتیان: ئەو پەیامە سـەقەتە چی بوو لە پێشـەوەهات؟!! ئەوەی دوای شـەهید بڕیـار گوتیـەوە، هەتـا لەدواییـن کەس دەری کرد یـەک بەیەکی دەگوتەوە.

لەسـەر ڕێگـەی مێرگەسـور لێـک دابراین، ئێمە چـوار کەس وتمـان ڕێگا تاقی دەکەینـەوە، دنیا دەهات ڕووناک ببێ، ڕێگای نـاو ڕەبایەمان گرتبوە بەر، بەڵام کاکەشـێخ گوتی: ئـەوە ڕەبایەیە!! گەراینەوە دوایی سـەرکەوتین بۆلای گوندی کەونەگونـد، ڕۆژهەڵات گەیشـتینە کەونەگونـد، خەڵکێکی زۆر چاکـی تێدابوو، هێشتا لەبەر پێی پێشمەرگە نەچوبوون، زۆریان خزمەتکردین. کەمین و پاسەوان داندران و لێی نوسـتین، من بەشـبەحاڵی خۆم نوێژی شـێوان خەبەرم بوەوە لە ئـازاری قاچەکانـم. جامانەیـان بۆ شـۆردبوین زۆر خەڵکێکـی بەخزمەت بوون.

بەڕێکەوتیـن بەرەو گوندی کۆلیت لە گوندی ئسـقێل بەپشـت سـیدەکان بەرەو دۆڵی ڕوسـتێ. لەپاش سـێ شەوو سێ ڕۆژ گەیشـتینە دۆڵی ڕوستێ، ئەو دۆڵە جەنگەڵێکـی زۆر چـڕو دارسـتان بوو. گوێزو تـرێ و هەموو جـۆرە درەختێکی بـەری تێدابوو، خەڵکەکە دەهاتنەوە بەرەو ناوچەکەیان، ئەوانەی پێشـمەرگە و سـەربازی هەڵاتویان هەبوو. گەیشـتینە گوندی ڕوسـتێ. هەر لقە و بۆ گوندێک

دانــدرا، هەندێکمان خەریکی جەولەکــردن بوین، هەندێک لە بنکەکان مابوینەوە، لەبیرمــە لــە گونــدی پیرئۆمەر خانویان دروســت دەکرد، ئەو ماڵــەی ئێمە لێی دابەش بوین گوتی: وەســتامان دەســتناکەوێ بۆ دیواری خانوو، من ئامۆزایەکم پێشــمەرگە بوو لەگەڵ خۆمان وەســتا بوو، وەستا جەنگی. پێم گوت: ئامادەیی خۆی نیشــاندا بەدوو ڕۆژ خانوەکەمان بۆ تەواو کردن، ئەو پیاوە هەر دەیگوت: ئــەدی لــۆ دەڵێن شــیوعی کافــرن؟!! وەالله ئێــوە مەلایەکەتن. لەگەڵ وەســتا جەنگــی گەراینــەوە بارەگا، پاش دوو هەفتە ئەوەی پیــرو پەککەوتە و نەخۆش بــوو لەبنکــەکان مانەوە، ئێمەش هــەر بەتالیۆنە و بەدوای یەکتر ملمان نا بەرەو کێلەشین، پێش بگەینە کێلەشین لقی خۆشناوەتی، ڕۆژی پێشوو لە ڕەشماڵەکان نێریەکی گەورەیان کری بوو، تێر گۆشــتیان خواردبوو. هاوڕێ موحســین یاسین ســەر لقی خۆشــناوەتی بوو، ئێمــەش لقی دەشــتی هەولێر، چونکە گۆشــتمان نەخواردبوو لە خوامان دەویســت شــتێکیان بۆ هەڵبەســتین، (نێری بەو ئاژەڵە دەگوتــرێ زەنگوڵــی لە ملی دەکــەن بۆ پێش ڕانە مەڕ، دەبێ بە چاوســاغ، کە دەخەســێندرێ، تەگە هەر نێریە بەلام دەپەرێ، ئەگەر هەر بزنێک تەگە ســواری بــێ دەڵێن ئەو بزنە تەگەی خواردوە، یان کاریلەی پەیدا دەبێ) ئێمە دەمانگوت لقی خۆشناوەتی هەمویان تەگەیان خواردوە، ساڵێکی تر وەچە دەخەنەوە دەبن بــەدوو لق، ئەوانیش دەیانگــوت ئێمە نێریمان خواردوە، هەتا هاوڕێ موحســین زانــی، تورە بوو بێ دەنگی کردین. هەر لەکوێســتانەکانی پێش گەیشــتنمان بە کێلەشــین، هەر ئەو شوێنەی لقی خۆشــناوەتی تەگەیان لێخوارد ئەو ڕەشماڵ و خێڵاتی هەردوو دیوی باشــورو ڕۆژهەلات (ئێران ـ عێراق)، لەناو ئەو مێرگانە کە دەتگوت:

فەرشی کاشانی سەوزی لێ ڕاخراوە و خورەی جۆگە ئاوەکانی لێ بۆتە نەخش و نیگار و ئەو تابلۆیە جوانە خودابیە سروشتیەم قەت لە بیرناچێتەوە. بەتایبەتی ئــەو حریتکــە و پێکەنینــە وروژێــن و نــاخ هەژێنانەی بێریەکان کــە دەچون بۆ مەڕدۆشــین، زرەی دەســکی ئەو ســەتڵانەی مەڕدۆشــین کە کچەکان لە شــانی یەکتریان دەدا و پاڵیان بەیەکترەوە دەنا، یەکتر بخەنە ناو جۆگاوەکان، لەدوای چەنــد ســاڵ یەکەمجار بوو کــچ و ژنی کورد بە ئارایش و لێوســورکردن ببینین، وەک بــۆ داوەت و بــوک گواســتنەوە بچــن. زۆرجاریش پێش ئــەوەی مەڕ بگاتە

لای ســەر بێرەکان پێچەک شــاییان دەکرد، زۆرجار چاوی خۆم هەلدەگوشــی بۆ دڵنیابوون دەمگوت خوایە ئەو بەهەشتەی باسی دەکەن تۆ بڵێی ئێرە هەو نەبێ؟ دیــارە ئەو کچانە کە ســەریان دەخســتە بن گوێی یەکتــر و لەتریقەی پێکەنیان دەدا، پێشــمەرگەیان دەوروژاند ئەو ڕۆژەمان لەو ڕەشــماڵانە کردە شــەو. لەناو ڕەشــماڵەکان ناوبر کرابوو بە چیغ، پیاو لەلایەک ژن لەلایەکەی تر دەنوســتین، دیارە دوو هاوڕێ کە (هـ) و (ا) بوون، ســەریان بەلای چیغی ناوبرکردبوو، شــەو چرا کوژایەوە، هاوڕێ (هـ) لەبن چیغەکە دەستی درێژ دەکا بەڵکو یەک لەو کچە جوانانەی ئەودیو چیغەکە دەســتی بگرێ و هەندێک دەســتبازی لەگەڵدا بکات، ســوکنایی بەدڵــی کورە ئاســای دا بێنێ. لەوکاتە دەســتێک لەودیــوی چیغەکە دەســتی هاوڕێ (هـ) دەگرێ و ئەویش دەســتی بەپشتی دەســتی دا دەهێنێت و دەیلاوێنێتــەوە دەســتەکەی ئەودیــو چیغەکەش بەهەمان شــێوە، (هـ) لەفکری ئــەوەی خوایــە دەبێ ئەو دەســتە هی کامەیان بێ کچــە خرپنەکە، قژ براوەکە، پێکەنین وروژێنەکە، چاوشــینەکە، خوایە دەبێ کامەیان بێ کە لەدەســت شێلان و دەســتبازی تێرنابــێ، لەکاتێکدا کۆنترۆلی هەژموونــی ئارەزوەکانی پێ ناکرێ چیغەکە بەرز دەکاتەوە، بۆ ئەوەی دەستی ئەو کچە زیاتر بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، کە دەستی ڕا دەکێشێ دەبینێ دەستی هاوڕێ (ا)ـە، ئەویش دەستی (هـ) هەر بەدەســتی کچەکانــی ئەودیوی چیغەکــە حاڵی بوو بوو، داخــوا چەندیان پەنجە لەناو پەنجەی یەکتر وەژاندبێ، لەشــەڕمان و لە ڕقان دەســتی یەکتر بەردەدەن. هاوڕێ (هــ) بۆ بەیانی لەرێگای بەســەرکەوتنمان بۆ کێلەشــین دەیگوت: هاوڕێ حــازم ئــەو هاوڕێ (ا)ــە، زۆر بێ مانا و نا ڕۆشــنبیرە. پاشــان زانیمان هاوڕێی بەرێزو خاوەن هەڵوێســتم هاوڕێ (هـ) کوێی دێشێ!!

لە کوێســتانی سپی ڕێزی خەیلانیان ئاوێکی زۆر بەخوری پێدا دەهاتە خوارەوە، هێنــدە بــە تەوژم بوو وەک دەڵێــن گای دەرفاند، لەوێ شــێخ زادە تفەنگێک و کەرێکی لێ بەئاوێدا چوو، هەر ئەوەندەمان دیت نێرەی شەپۆلەکان ئاومالّی کرد و لەبەرچاوان ون بوو.

لە کێلەشــین ئاوای دیوی ئێران بوین، لەرێگا دەســتە، دەســتە خەڵکی هەڵاتوی حیزبــی تــودەی ئێرانمان دەبینــی، ڕژێمی کۆماری ئیســلامی ئێــران ڕاوە دوی دەنان، فەرماندەی هێزی دەریایی هەموو ئێران لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی تری

حیزبی تودە لە سێدارەدران، ئەوانی تر هەر بابا بوو بۆ هەر چوار دەوری ئێران ڕایـان دەکـرد. زۆربەیان خوێندەوارو دکتـۆرو ئەندازیارو ئەو قشـرەی کۆمەڵگا بوون، هەموو فێری ڕۆیشـتن نەبوون، بەو کوێسـتانە هەر لـە مێرگەچەکۆ بگرە تـا دۆڵی ڕوسـتێ بلاو بـوون بۆ ناو بارەگاکانـی حیزبی شـیوعی. لەتاوڵەکانی مێرگەچەکـۆ ئێوارە دابەش بوین، من لەوزەم ئاوسـابوو، تام لێبوو، وتیان ئێوە برۆنە ئەو خێوەتە گەرمترە لە تاوڵەکان. من لەگەڵ سێ پێشمەرگەی تر چوینە ئەو خێوەتە بچوکە، بەڵام تاوڵەکان هی وا هەبوو بیسـت پێشـمەرگەی تێدابوو، خانەخوێ مەڕدارە ئێرانیەکەم کەخەڵکی سـۆفیان بوو،شـەو لێم پرسی: حیزبی تودە خەڵکی هەیە؟ گوتی: بەڵێ، بەڵام هەمویان با سـەوادن. گوتم: باسـەواد مانـای چیـە؟!!، گوتـی: سـەواد دار. گوتم: سـەواد دار مانای چیـە؟ گوتی: باسـەواد!! بەردەوام بوو لەقسـەکانی، من گوتم: ئەرێ فەرمووت باسەواد مانای چیـە؟ گوتـی: سـەواد دار!! نیو کاتژمێر منی لە سـەواد داریەوە دەبردە سـەر باسـەواد، لە باسەوادی دەیهێنامەوە سەواد داری، ئاخر هەرچەندی دەمکرد بۆم سـاغ نەدەبـوەوە، ئەویـش لەبیری ئەوەدا بـوو کە بە ناوێکی تـر حاڵیم بکات، گوتـی: خولا غەزەبت لێ بگرێ، دەگـەڵ خوێندکاریمە یان میرزا!! ئەوجا حاڵی بووم کە مەبەسـتی خەڵکی خوێندەوارو ئەکادیمیە.

# دایك و کچ پێکەوە ڕەدووکەوتن

لەوسـەروبەندە پێشـمەرگەکانی یەکێتی لەگەڵ پێشـمەرگەی حیزبی دیموکراتی ئێـران بەیەکەوە لەسـوپای پاسـدارانی ئێرانیـان دەدا، کۆمەڵـەی ڕەنجدەرانی کوردستان داوای کوردستانی گەورەی دەکردو دوژمنی کوردی هەموو پارچەکانی بە دوژمنی خۆی دەزانی. لەگەڵ تێبینیمان لەسەر سەرکردەکانیان لەبەر خۆمەوە دەمگوت: باشـە دەکرێت بانێک و چەند هەوایی؟

بەیانی ئەسپێکیان بۆ بەکرێ گرتم، چونکە نەخۆش بووم. بەرەو گوندی گردەسور لەدیوی کوردسـتانی ڕۆژهەڵات، لەگردەسور دوو ڕۆژ ماینەوە، بەرێکەوتین بەرەو

سـێلویّ، سێلویّ وەک شار وابوو، نزیک شـاری پیرانشەهر بوو، دوکانی لیّ بوو بە سـاردیان دەگوت نۆشـابە، نۆشـابە زۆر بوو، شـێتێکی لێبوو ڕۆژ تا ئێوارە دەیگـوت (هـەی بەلەلـی بەلەلی لەبەر ڕەنگـی دووکەڵی) ئێمە لـە لقی هەولێر لەدێـی هەمزاوەی خواریّ نیشـتەجیّ بویـن، پارتی بارەگای بەنـاوی غەزالی لە سـێلویّ بـوو، پێیـان دەگوتن قیـادە، واتە ( قیـادە موەقەتـە). پارتی ماوەی سـاڵێک زیاتر بوو، شـەڕێکی خوێناوی لەگەڵ حیزبـی دیموکراتی ئێران هەبوو، چەند کەسـیان لەیەکتری کوشـتبوو، لەبەرئەوەی نەفەرێک لە حیزبی دیموکراتی ئێـران، تاوانبارکرابـوو بەوەی کە دەسـتی هەبوە لەگـەڵ مخابەراتی عێراقی بۆ دەرهێنانی جەنازەی خوالێخۆشـبوو مەلا مستەفا. لەسەر ئەو جەنازە دەرهێنانە کە دەسـتی مخابەراتی عێراقی بوو، شـەڕێکی گەرم لە بەینی حیزبی دیموکراتی ئێران لە لایەک و پارتی دیموکراتی کوردستانـ عێراق سوپای پاسداران لەلایەکی تـر بەرپابوو بوو، بەکەس خامۆش نەدەکرا. سـەدان خەڵکی زیندوو لەهەردوولا کوژران لەسەر تەرمی بارزانی.

من و هەڵکەوت و سـادق وشـەهید هیوا و عەلی چاوسـۆر بەرگەیەکی پارتیمان بـۆ کـرا بچینە خانیّ و ورمیّ، چونکە جلەکانم زۆر درابـوون، کانەبی گوتی ئەو قۆڵت بۆ هەتا سـەرەوەی ئانیشـکت هەڵکردوە، منیش گوتم ئانیشکم هەردووک درابوون، لێم کردۆتەوە کراسـەکەم هەڵکردوە بۆئەوەی بیشـارمەوە، بۆیە منیش لەگەڵ ئەوانەی ناوم هێنان چووم لەورمیّ جلوبەرگم کری و پێڵاوێکی ئەدیداسـم کـری، ئێمـە پێنج نەفەر بوین، لە چێشـتخانە داوای (دە)نەفەر نان و کەبابمان کرد، هەر هەموومان خوارد، خەڵکی ناو چێشـتخانەکە هەمویان سەیری ئەو نان خواردنەی ئێمەیان دەکرد، کورد گوتەنی دەتگوت گورگمان کوشـتیە، بەخەڵکی ئاوەدانـی نەدەچوین، لە شـەقامی قیرتـاو دەرەوینەوە، شـێتیش دەیزانی ئێمە ساڵانێکە شارمان نەدیوە.

خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان زۆربەی هەرە زۆری دیموکرات بوون بیّ ڕێکخستن، هـەر کـە دەیانگوت حیزب، واتە حیزبی دیموکـرات، ژن و پیاو منداڵ، بەحیزبی خۆیان دەزانی، زۆریان ڕق لە پارتی دیموکراتی کوردسـتانـ عێراق بوو، گەورە و بچوک پیاو و ژن مۆرەیان لە ئێمە دەکرد بە ئێمەیان دەگوت قیادە، وایاندەزانی ئێمەش پارتین. دەچوینە لایان بۆ مەنجەڵ، تەشـت، ماسـت هەر شـتێکی تر،

نەیانـدەدا پێمان، دەیانگوت ئێوە قیادەن، شـەڕی ئێمە دەکەن لەماڵی خۆمان. بۆ لەخاکی کوردستانی عێراق هاتون لە کوردستانی ئێران کورەکانمان براکانمان دەکوژن؟ لەگەڵ سـوپای پاسداران ئێوە جاشی حمهوری ئیسلامین.

هەتـا جارێکیـان دوو کادری حیزبـی دیموکراتـی ئێران هاتن بۆ لامـان، ئەوان دەیانزانی ئێمە قیادە نین، شـەو لە خێمەکانی ئێمە دانیشـتین، بۆمان گێرانەوە کە خەڵک ئێمە بەقیادە دەزانێ، پاش ئەو شەوە باش خەڵکی گوندی هەمزاوایان حاڵی کرد کە ئێمە قیادە نین، جا هەموو شتێکیان بۆ دابین دەکردین، دەیانگوت ئەوانە کۆمەنیسـتن، هەرچی پێویستیان بێت بۆیان دابین دەکەین.

شـایانی باسـە لەگوندی سـێلوێ سەر بە شـارۆچکەی پیرانشـەهر ملازم خدرو هاوڕێیانـی قاتع، بانگیان کردم پێیان ڕاگەیاندم، ئێمە دەچین تۆڵەی شـەهیدان بکەینەوە، بارەگاکانی قرناقە و پشـت ئاشان نوێ بکەینەوە، بۆیە بەپێویستمان زانـی تۆ بکەین بە سـەرپەل و فەرماندەی پەلی سـێ لە لقـی هەولێر، بەمجۆرە بووم بە سەرپەل.

پاش ماوەیەک ماشـێنی سـوپای پاسـداران هاتـن برادەرانی سۆسیالیسـت کە لەزێـوە بوون، باریان کردن بۆ کۆنەلاجان.

لقی خۆشـناوەتی لە ماشـکان بوون، دایک و کچێک نانیان بۆ دەکردن بەکرێ، شـەوێک هەردووکیان ڕەدوکەوتبوون، ئەو لقە پێشـمەرگەیە بێ نان مابوونەوە، جـا ئێمـە وەک لقی دەشـتی هەولێر پێمـان دەگوتن: بۆ ئێوە نەنگـە نانکەری لقەکەتـان ڕەدو بکەون، دەبێ هەقیان وەربگرن!!

بارەگای پارتی، بە بەرپرسـیارەتی ملازم عەلی و چەند بەرێزێکی تر، لە گوندی شـیناوێی نزیک پیرانشەهر بوون، پێشـمەرگەکانی پارتی لەو سەردەمە زیاتر لە بیسـت ژنـی بەمێـرد و کچیان هەڵگـرت، زۆرم هەوڵدا ئامارێکی تەواوم دەسـت نەکـەوت، چونکە چەند سـاڵ بەسـەر ئەو کردەیـە تێپەربوە، بـەڵام زۆر کەس مەزەنـدەی ژمارەیەکی زیاتـر دەکەن لەو کچ و ژنانەی لەلایەن پێشـمەرگەکانی پارتی هەڵگیران، کە ئێسـتا لەداوداوە، گەریاوە، مەسـیف، بەحرکە، ناو شـاری هەولێـر زۆریان دەناسـین لەگەڵ مێردەکانیـان. نامەوێ بێ ڕێزی بەهیچ کەس و لایەنێک بکەم، بەڵام ئامانجمە نەوەکانی داهاتوو بزانن ئێمە شۆڕشمان کرد یان (تەرسـی خۆمان گێرە دەکرد) وەک هەولێری گوتەنی؟!!

## سەلیەیەك فیشەکی پێوەناین

بــارەگای کاتیمــان لە گوندی هەمزاوەی خوارێ بوو، لە دوو خێوەت پێک هاتبوو لەقەراغ ئاوی سێلوێ هەڵدرابوو، لە چاوەڕوانی سازبوونی پارتی و سۆسیالیست بۆ قرناقە و پشــت ئاشــان، چەتۆ سەحەر کە لەســەر لێواری ئاو بارەیەکی بڵند دانیشــتبوو، خەریکی پاکردنــەوەی چەکەکەی بوو. (چەتۆ ســەحەرو بەکرجۆلا و چەنــد کەســێکی تر، لەدوای دابەشــکردنی میراتی پارتیــکار، دیارە ئەوانە بە بــەر یەکێتی کەوتبوون. لەتەقینەوەکەی شــوبات لەناو مەڵبەندی ســێ گیانیان لەدەســتدا، گیان لەدەســتدانی ئەم برادەرە خۆشەویســتانەم کاریگەری لەســەر دانام) چەتۆ زۆر لەو شــوێنەی ئێمە نزیک بوو کە من و وشــیارو بڕیارو خەیری و تەنیــا وەســتابوین، بەشــێوەی بازنەیــی، قســەمان دەکرد. چەتــۆش بەدەم لەسەریەک خستنەوەی چەکەکەی بەشداری قسەکانی ئێمەشی دەکرد، لەکاتێکدا وەک بمانترســێنێ یەک ســەلیە گوللەی لەبەینی ئێمە و ناو قاچەکانمان ڕشــاند. بوو بە تەپ وتۆز، من شــەرواری خۆم داتەکاند بزانم گوللەم بەرکەوتوە یان نا، هــەر بــا با بوو، ســەیری لاق و لەتەری خۆمان دەکرد، بــەڵام هیچمان گوللەمان بەرنەکەوتبــوو، تەنهــا وشــیار کە ئێســتا لیوایە لــە ڕیزەکانی پارتــی، پڕیچکە بەردێکی بچوکی بەرانی کەوتبوو، چەتۆ سەحەر واقی ورمابوو، تفەنگەکەی هەر لەناو دەستی بوو، دیار بوو زۆر پەشۆکاو و شەرمەزار بوو، کە تفەنگی لەدەست دەرچوو بوو، ئێمە دڵ نەوایمان کرد، شــوکر هیچ نەبوە.

## بۆ ئێمە وەك خوشك وایە

کــە بارەگاکانمــان لــە هەمــزاوەی خــوارێ لەدیوی ئێــران بوو، کانەبــی گەورە ئامــر بەتالیۆنــی دەشــتی هەولێربــوو، تازە ملازم خــدر و کانەبــی و هاوڕێیانی فەرماندە منیان بە ســەرپەل دەســت نیشان کردبوو، کانەبی بانگی کردم گوتی:

کلاشـینکۆفێکی (مزەلی)واتـە بێ قۆنداغم لە قامشـلۆ بۆ هاتـوە لای برادەرانی سۆسیالیستە، لەزێوە بچۆ وەری بگرە پێم خۆشە ئەو چەکە بۆ تۆ بێ، چەکەکەی تـۆ دەدەین بە پێشـمەرگەیەکی تر. بۆ بەیانی بەتەنیا ملـم پێوەنا، لە هەمزاوە بـۆ زێوە بەناو ئەو مەزراو کانیاوانـە کە هەمویان پڕبوون لە دۆی مزرو پێخۆری گیادور و مەلەغان کێشـەکان، تا گەیشـتمە زێوە. ئەوکات زۆربەی سەرکردایەتی سۆسیالیست لەزێوە بوون، کە جودایی فکریان لەناوەخۆی سۆسیالیست هەبوو، ئەوەبوو ڕۆشنبیرو خەڵکە چەپ و خوێندەوارەکانی ناو سۆسیالیست دوایی بوون بە (ئیتیجاهی دیموکراتی شۆڕشـگێڕ)، ئێمە لەوکاتەدا خەریکی خۆ ئامادەکردن بوین بۆ قرناقە و پشت ئاشان و پارتیش لەگەڵ سوپای پاسداران بۆ هێرشکردنە سـەر ناوچەی حاجی ئۆمەران و ڕێگای هاملتۆن.

پێش ئەوەی بڕۆین بۆ قەندیل، لەوێشەوە بۆ قرناقە و پشت ئاشان. دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویسـتم گوتیان: با هەرسـێکمان چەندمان پارە پێیە کۆی بکەینەوە، بچین گۆشـت مریشـک بخۆین، با هیچ پارەمان لەگیرفان نەبێ لەو شەڕە لەدوای شـەهیدبوون لەگیرفانمـان دەربێنـن!! من و (ک) و (ا) چوین بۆ ماڵی مریشـک فرۆشـەکە لە سـێلوێ کەناوی عەلی دەروێشی پەسـوێ بوو، مام عەلی هەر کە دانیشتین کردی بە جەفەنگ، گوتی: چوار ژنم هێناوە، ئەوەندەم دڵداری کردوە هەتا خوا دەڵێ بەسـە، ئێوە بۆ ئەو گەنجیەی خۆتان بەفیڕۆ دەدەن؟!! ئەوەی مـام عەلـی بەلای دانەدەچوو کوردایەتی و سیاسـەت بـوو، گوتی: بەخوای ئەو سـمێڵ گەورە (ڕوی لە (ا) کردبوو) وێ دەچێ زۆری دڵداری کردبێ. هاوڕێ (ا) یـش سـەری بۆ دەلەقانـد، بە ئاماژەی بەڵـێ. منیش گوتم: ئەوە تەنها ئیشـی ئەوەبوو لەپێش قوتابخانەی کچان لەهەولێر دەوەسـتا، بۆیە حکومەت ڕاوی نا، هات بوە پێشـمەرگە، لەکاتێکدا هاوڕێ (ا) زۆری هاوسـەرەکەی خۆش دەویست، وێنەیەکی هاوسـەرەکەی لەناو کیسـە باخەڵەکەی دەرهێنا، گوتی: مام عەلی من حەزم لەو کچەی دەکرد. مام عەلیش لێی وردبۆوە وێنەکەی دوور دەخسـتەوەو نزیکـی دەکردەوە، لەبـەر کزی چاوەکانی لەناکاو گوتـی: (بەخوڵای وێ دەچێ خەوتنـی لەگـەڵ خۆش بـێ) منیش گوتم: مام عەلی، بۆ ئێمە وەک خوشـکمان وایـە، بەڵام ئەو بیژوە (ئامـاژەم (ا) کرد) زۆری لەگەڵ خەوتوە، دەزانێ خەوتن لەگەڵی خۆشـە یان نا؟ دەسـتم لەسـەر چەکەکەی (ا) دانابوو، نەبادا دوو سێ قۆنداغە تفەنگی لێ بدا. ئێسـتاش کە بیرم دێتەوە زۆر پێدەکەنم.

# شەڕی قڕناقە و پشت ئاشانی دووەم

ڕۆژێک ماشـێنی سـوپای پاسداران (قرارگا)بەمەبەسـتی گواستنەوەمان هات بۆ لامـان، بـەڵام زۆر لە هاوڕێیان ئامادە نەبوون سـواری ماشـێنی (قـرارگا) بن، چونکـە لـە ڕوانگەی هاودەنگـی، لەگەڵ حیزبی تودەی ئێران کە دەیانکوشـتن، نەدەبوایـە لەگـەڵ ئەوانە هاوکاربین یان سـواری ماشـێنەکانیان ببین، خاوەنی ئەو هەڵوێسـتە هاوڕێیانی عەرەب بوون. ناچار بە پێ، لە پشـتی پیرانشەهرەوە بـۆ کۆنەلاجـان. لەوێ حەمـەی حاجی مەحمودی سۆسیالیسـتی لـێ بوو، خوا لێخۆشبوو کاک ئیدریس بارزانی هات هەندێک قسەی بۆ پارتیەکان کرد، هەندێک تفەنگی خراپی هێنابوو بۆ پارتیەکان، بریتی بوو لە سـەلیبی و برنۆی وەسـەت کـە چەکی سـەدەی ڕابردووبـوون. کاک ئیدریس مەخزەنەکانی هەموو پلاسـکۆ بـوون، من و کارزان (حوسـێن نەبـی) دەمانگوت: دەبێ ئـەو هەموو مەخزەنە پلاسکۆیەی لەکوێ هێنا بێ؟!!

موحسـین یاسین، هەندێک ناوسـێری بۆ ڕێگا هێنابوو. ئێمە چەند ڕۆژێکمان پێ دەچوو تا دەگەیشـتینە قڕناقە و پشـت ئاشان، هێشتا نەگەیشتبوینە بەردەپان، ناوسـێری بۆگەنی کرد، بەگەرمی لەسەریەک داندرابوو، موحسین یاسین هەموی فرێـدا، دەیگـوت: قەیناکا فکری سـەربازیمان نییە، بەڵام فکری ناوسێریشـمان نییە!! ئەو هەموو ناو سـێرییەی لەچیای شـۆرکردەوە، وەک تایەی سـەیارە غل دەبوونەوە خوارێ.

ڕۆژی دوایـی بەڕێکەوتیـن بـەرەو بەردەپان، کـە چوینە بەردەپـان، پڕ بوو لە پاسـدار، چونکە شەڕی (عێراق ئێران) بەردەوام بوو، لەوێ نەفەرێک قورئانێکی بەرزکردبـوەوەو ڕایگرتبـوو، هەمویان وەک مەڕی لەدەرمان بدەی، شـەربەتێکی شـهادەتیان دەنۆشـی و بە بن قورئانەکە دەڕۆیشـتن، بەرەو بۆزی مێرگەسـیرو لای چیای کۆدۆ. وەک مێرووولە، یەک لەدوای یەک ڕیزیان بەسـتبوو، دەپاڕانەوە بەڵکو خوا ڕەحم بکات شـەهید بن!! ئێمەش دەمانگوت: انشالله.

ئێمە بەسـەرکەوتین بۆ قەندیل، بەرەو قڕناقە و پشـت ئاشـان، شەو لە قەندیل

مانەوە. ڕۆژی دواتر گەیشتینە شێخ ئایش، لەپاش دوو ڕۆژ لەسەر سەری سەکران گۆمێکی لێ بوو، لەوێ کاک ئیدریس بارزانیمان بینییەوە، فەرموی: هێزێکی زۆرتان بۆ دەنێرم. ئەوەی ڕاستی بێ هەندێک لە پارتی لەگەڵ پاسداران کەوتبوون. وەک: ئەحمەد کەشخە و نەجمەدین گۆڕۆنی و مام زیاد و قادر و (زۆرانی تر کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە)، بۆ گرتنی حاجی ئۆمەران. پارتیەکان پاشان بۆ ئێمەیان دەگێرایەوە: سیمی تەلەفۆنی ڕەبیەکانیان داوەتە دەست پاسدارەکان، بەو سیمە هەتا چونەتە ناو ڕەبیەکانی سوپای عێراقی نەوەستاون، بەسەر مەیتی یەکتر بازیانداوە تا چونەتە ناو ڕەبیەکان. لە کۆنە لاجان و بەردەپان، ئەو هەموو پێشمەرگە و ئەو هەموو پاسدارە کە لەگەڵ پارتی ژوانیان هەبوو، خارەخولە لەبەرخۆی دەیگوت: بێ ئەوەی بەخۆمان بزانین (تەڕ لەگەڵ سەی کەوتینە چاڵێ) بەناوی خوای لە بن پێیان دەچین. لەکۆنە لاجانێ سەرکردەی هەر سێ لایەنەکەم بەچاوی خۆم بینی، کاک ئیدریس بارزانی، کاک حەمەی حاجی مەحمود، (هەڵەنەبم ڕانک و چۆغەیەکی گورگەیی لەبەربوو)، کاتێ من بینیم لە بن بەردێک دانیشتبوو، جوتێ کڵاشی هەورامانی لەپێ بوو. سەید کاکە و ئەبو عامل، ملازم خدر، مەلا مەحەمەدی پارتی، حەسۆ میرخان و زۆر بەرپرسی تری هەر سێ لایەنەکە. بەڵام هەر لایەنە و بە ئەجێندایەکی تایبەتی لەو شوێنە کۆببوینەوە. ئێمە دەمانویست یەکێتی لەبناری قەندیل دەربکەین و بارەگاکانمان لەقرناقە و پشت ئاشان ئاوەدان بکەینەوە. سۆسیالیستیش بەهەمان شێوەی ئێمە، بەڵام پارتی ڕێکەوتنی دوو قۆڵی لەگەڵ ئێران و سوپای پاسداران لە پشتەوەی بەرەی جود هەبوو، بۆ گرتنی حاجی ئۆمەران. دەیویست ئێمە و سۆسیالیست ناراستەوخۆ بخاتە ناو ئەو جغزەوەو لەخزمەت ئەو ڕێکەوتنە دوو قۆڵیە بەکارمان بێنێ، بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین. پێش ئەوەی هاوڕێ موحسین یاسین ناو سێریە بۆگەنەکان، غل بکاتەوە خوارێ. بەچاوی خۆم بینیم ئاخوندێکی سوپای پاسداران لەبەردەپانی پشتی کۆنەلاجان قورئانێکی بەهەردوو دەستی ڕاگرتبوو، پاسدارەکان و پێشمەرگەکانی پارتی کە هەندێکیانم دەناسی خەڵکی لای دۆڵی ڕوستێ بوون، قورئانەکەیان ماچ دەکردوو بەژێری دا دەرۆیشتن و لەناو ئەو تەشتە شەربەتانە شەربەتێکی شەهادەتیان دەنۆشی و قورئانێکی بچوک و جۆرکێکیان دەدانێ. دوایی لە پێشمەرگەیەکی

پارتیم پرسی: ئەو جۆرکە تەزبێحێک، یەک تومەن، پارچە قوماشێک، هی پاسدارەکان کلیلێکی بەهەشتی تێدابوە. بەرەو بۆزی مێرگەسیر و کۆدۆ ڕۆیشتن، ئێمە لە سێلوێ و هەمزاوە کە بارەگای غەزالی پارتی لێبوو، ئەو ڕێگا دوورەمان بەپشتی پیرانشەهر و کاسورە دێ بەپێیان بڕی بۆ کۆنەلاجان. کوا بۆچونمان لەگەڵ پارتی یەکانگیر دەبێ؟!! ئەوان لەگەڵ پاسداران کلیلی بەهەشتیان وەرگرت و بەرە و گرتنی حاجی ئۆمەران ملیان نا. ئێمەش ئامادە نەبوین تەنانەت سواری ماشێنی قرارگاش ببین.

دەمەوێ بابەتەکان تێکەڵ نەبێ، بۆیە کەمێک دەگەڕێمەوە دواوە، لەساڵی ١٩٨١ سوپای پاسداران و پێشمەرگەکانی پارتی هێرشیان کرد بۆ سەر حاجی ئۆمەران. مەخفەرێکی پۆلیسیان گرت، بەلام لەبەر چڕی بۆردومانی سوپای عێراقی لە ئاسمان و زەوی، نەیانتوانی حاجی ئۆمەران بگرن. عێراق دژە هێرشی زۆر توندی کرد، لەو شەڕە فەتاح ئاغا و حوسێن تیماری و چەند کەسێکی تر لەپارتی کوژران، ڕەئیس عەبدوڵاش کە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری پارتی بوو بریندار بوو، دیارە دەزگا هەواڵگری و سیخوڕیەکانی عێراق (مخابەراتی عێراق) بەو پەیوەندی و وابەستەبوون و خۆ چەتاڵکردنەی پارتی (قیادە موەقەتە) بەسوپای پاسدارانەوە زۆر هەراسانی کردبوون. بۆیە بیریان لە پیلانێکی نا مرۆڤانە و گلاوکردەوە کە زۆر نامۆیە بە کەلتوری کورد و گەلانی ڕۆژهەڵات، ئەویش دەرهێنانی تەرمی خوا لێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی بوو لە ١٠ی پوشپەڕی ١٩٨١ لەرێگای پیاوەکانی هەواڵگری عێراقی. بۆ ئەوەی پارتی (قیادە موەقەتە) نەپرژێتە سەر هاوکاری سوپای پاسداران لەدژی سوپای عێراق. هەر لەدیوی ئێران کارێکی نوێی بۆ هێزەکەی پارتی دۆزیەوە، ئەویش شەڕێکی خوێناوی بوو لەگەڵ حیزبی دیموکراتی ئێران، بۆماوەی چەند ساڵێک. ئەوەی ڕاستی بێت پارتیش فشاری جمهوری ئیسلامی لەسەر بوو بۆ شەڕکردن لەگەڵ حیزبی دیموکراتی ئێران. هەروەک لەپێشەوە باسم کردوە: ئێمە لەکەونە لاجان گردبوینەوە، لەبەهاری ١٩٨٣ کە ئێمە وەکو بەرەی جود بەرێکەوتین بۆ قڕناقە و پشت ئاشان. هەندێک لە پێشمەرگەکانی پارتی، چونە ناو پایەگای سوپای پاسداران لەچیانە، ئەوانەیان کردە دوو بەش، بەشێکیان کە نەجمەدین گۆرۆنی و ئەحمەد کەشخە و چەند پێشمەرگەیەکی دۆڵی ڕوستێ بە کۆنە لاجان و

بەردەپان لەگەڵ پاسـدارەکان بەرەو بۆزی مێرگەسـیر و کۆدۆ ڕۆیشتن بۆ گرتنی حاجی ئۆمەران.

قۆڵی دوەم: کە کاک زیاد و چەند پێشمەرگەیەکی تر بوون، یەک لەوانە کاک قادر بەرە و کانی خولا ( ئەو کانییە شوێنەکەی هێندە بەرزە، بۆیە پێی دەڵێن کانی خوای ) تەمەرچیان و مێرگەچەکۆ لەگەڵ پاسـدارەکان بەڕێکەوتن. ئەو هێرشـە لەژێر ناوی (نەسـری یەک و نەسـری دوو) ئەنجام درا. بەتانکی پڕ لە شەربەتی شـەهادەت پێشـوازیان لێ دەکـردن، ئەو تانکیانـە لەدوای ئۆتۆمبێلی سـوپای پاسـداران ڕادەکێشران. لەسەری نوسرابو: شـەربەتی شەهادەت. کەدەچوون بۆ بەرەکانی جەنگ، لەو شـەربەتەیان نـۆش دەکرد، بەڵام لە گەڕانەوە لەبەرەکانی جەنـگ دیسـان بەو جـۆرە تانکیانە شـەربەت دەدرا بەسـەربازەکان. بەڵام ئەو لەسـەری نوسـرابو: شەربەتی سەڵەوات. کە ئۆشـیان دەکرد دەبایە بەدەنگێکی بەرز سەڵاواتێک لێ بدەن.

ئینجا لەهەموو ئەو بڵندگۆیانەی دەسـتیان، دەیانگوت: بەرە و کەربەلا دەڕۆین. بـرای بەڕێـزم کاک قادر، لەو قۆڵەی لای مێرگەچەکۆ بوو، بۆی گێڕامەوە: کە لە پێنج هەزار پاسـدار تەنها دوو سـەد پاسـدار گەڕانەوە، بەڵام کە دەبینن یەکێک لە پاسـدارەکان بەکوڵ دەگریێ، ئەوان وا هەسـت دەکەن لەترسان دەگریێ، کە لێی دەپرسن: بۆ دەگری؟ دەڵێ: ئێوە نازانن، من ئەوە چەندین شەڕە بەشداری دەکـەم کەچی یان بەسـەلامەتی دەگەڕێمەوە یان بـە برینداری، دیارە خوا منی خـۆش ناوێ پلەی شـەهادەتم بە نسـیب بێ!! بەپێشـمەرگەکانی پارتی دەڵێ: ئـەی ئێوە بەو جلە کوردیانـە چین لەگەڵ ئێمە کەوتون؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە نیروی بارزانین، عێراقین. ئەویش دەڵێ: کەوابێ ئێوە مهاجیرن، دووعای ئێوەی مهاجیر گیرا دەبێ، دوعام بۆ بکەن ئەوجارە شـەهید بم.

ئەوەی ڕاسـتی بێ ئەو پێشمەرگانەی پارتی هەر لەدوای شۆڕشی گەلانی ئێران، لەمیانەی شـەڕ لەگەڵ حیزبی دیموکراتی ئێران و هاوکاری سـوپای پاسـداران و ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ حەسۆ میرخان و مەلا مەحەمەدو شێخ مەحەمەد خالید و زۆرانی تر، لەقرناقە و کونەکۆتر دەکوژران، هەر هەمویان بەشـەهیدی سوپای پاسـداران ئەژمار کران و موچەیان بـۆ بڕایەوە و دەفتەرچەی بیمەیان وەرگرت. هەندێکیان خزمی نزیکی ئێمەبوون، لەکونە کۆتر لەگەڵ حەسۆ میرخان کوژران،

هەتــا دوای ڕاپەڕینیــش منداڵەکانیــان دەچوون لە ئێــران موچەیان وەردەگرت. لەدوای پێنج ڕۆژ شــەڕێکی گران هەردوو قۆڵی هێرشبەری پاسدار و پارتی وەک نوکی مقەس لەخوار پێچەکانی ئازادی بەیەک گەیشتن، ئەوەبوو هەتا دەربەندی ڕایەت کەوتە ژێر ڕەحمەتی ســوپای پاسدارانی ئێران.

گەیشــتینە قڕناقــە و پشــت ئاشــان، خەڵکەکە هــەر بابا بــوو دەیانگوت: دوو نەفەرتــان لێــرە گولە باران کران، چوار نەفەر لێــرە لە بن بەردوو تودڕک و ئاو دڕەکانــن. جەنــازەی زۆری لێبــوو، ڕۆژ نەبــوو چەند جەنازەیەک نەشــارینەوە، هەندێکیان بۆنیان کردبوو.

لەشــەڕی قڕناقە و پشــت ئاشانی دوەم، پارتی دوو ئەجێندای هەبوو، دەیویست هەردووکیان بەیەکەوە جێبەجێ بکات، یەکەمیان لەگەڵ ئێران ڕێکەوتبوو هێرشی حاجی ئۆمەرانی کرد دەیویســت حیزبی شــیوعی و سۆسیالیســت بەکاربێنێ بۆ ڕێگاگرتنــی ڕێگەی لێوژێ و بۆڵێ، بۆ ئەوەی هاوکاری نەگاتە هێزە عێراقیەکان، ئەو بەڵێنەی بە ئێران دابوو. پارتی لەگەڵ سوپای پاسداران لەژێر ناوی (نەسری یەک و نەسری دوو) بۆ حاجی ئۆمەران هێرشی کرد. دوەمیان حیزبی شیوعی و سۆسیالیســت بەکاربێنێ بۆ لاوازکردن و شکاندنی یەکێتی، بێ ئەوەی هێزەکانی خۆی هەموو بەکاربێنێ، پاشــان لەگەڵ ئێران و ســوپای پاسداران ببێتە حاکمی ناوچەکــە. بــێ ئەوەی بە خۆمان بزانین دابەشــیان کردبوین بەســەر دوو بەرەی شــەڕی عێراق و ئێران، یەکێتی کەوتبوە بەرەی عێراق و بەرەی جودیش ئێران. ئەوەبوو پاش هێرشی ئێران و پارتی بۆ سەر حاجی ئۆمەران. سەدام، بارزانییەکانی قوشــتەپە و بەحرکەی ئەنفال کرد، لەلێوژە ملازم خدر لە مەلامەحەمەدی پارتی توڕەبوو، لەبەرئەوەی چەند پاسدارێکی هێنابوو لەگەڵ خۆی. ملازم خدر گوتی: ئەگــەر ئەو پاســدارانە نەگەڕێنەوە ئێمە پاشەکشــە دەکەین. بــە ناچاری پارتی پاســدارەکانی قۆڵــی ئێمەی کشــاندەوە. هەندێک لەپاســدارەکان جلی کوردیان لەبەرکردبــوو، هەڵە نەبم ئەحمەد زەنگەنە بێ ســیمی پــێ بوو لەپارتی، گوتی: هاوڕێ حازم، پاسدارەکان گەڕانەوە ئێران.

پێشمەرگەیەکمان هەبوو ناوی غەفە بوو، کوڕێکی بەژن زۆر کورت بوو، لەوکاتە یەکێک گیرابوو لەســەر ئەوەی گوایە کاتی هێرشــی یەکێتی بۆ قڕناقە و پشــت ئاشــان، یارمەتــی یەکێتــی داوە، بۆ دەستنیشــانکردنی هاوڕێیان. ئــەو گیراوە

ئــەو ڕۆژە غەفــە پاســەوانی لــێ دەکــرد، لەکاتێکدا تــۆپ باران دەســتیپێکرد، غەفــە تینــی بــۆ دێ، دەڵێ: دەچم خۆم دەشــارمەوە لەو تــۆپ بارانە، بێمەوە لێــرە نەمابــی دەتکوژم. (هەڵەنەبم شــەهید بڕیار گوێی لــێ ببوو)، ئێوارە بۆی گێڕاینــەوە، غەفەش نکۆڵــی نەدەکرد، دەیگوت: هەرچاوم لــێ بوو لەبن بەردێ خۆم حەشاردابوو.

لەبیرمــە مــەلا مەحەمــەدی پارتــی دەیگوت: دەبــێ (بەدلم بکــەن) واتە چەند پێشمەرگەیەکی تر بێنە جێگەی ئەوان بۆئەرک، سەید کاکە، ئەوکاتە سۆسیالیست بــوو دەیگــوت: بابە مەلا مەحەمەد جوندی عێراقی شــەش مانــگ لە ڕەبیەی لە ئەرکدایە داوای گۆڕین ناکات، ئەو شۆڕشــە ئەوها ناکرێ.

ڕۆژێک لەگەڵ هەڵکەوت کە زۆر یەکتریمان خۆش دەویســت، هەڵکەوت لەپشــت ئاشــان لەبن چیلەبەردێک دانیشــتبوو، خەریکی دوورینی بەلەک پێچەکەی بوو، لــەلای دانیشــتم. گوللــە تۆپێک لە ئەودیــوی چیلەبەردەکە بــەزەوی کەوت، بۆ ماوەی سێ بۆ چوار چرکە یەکتریمان لەناو خۆڵ و تۆز ونکرد. هەردوکمان بانگی یەکتریمان کرد، بۆ ئەوەی لە ســەلامەتی یەکتر دڵنیابین، ســەلامەتی یەکتریمان زۆر بەلاوە گرنگ بوو.

ڕۆژێــک کــە بەدوای جەنازەی شــەهیدەکان دەگەڕاین، شــەهید ڕۆســتەم وچوار پێشمەرگەی تر، خدری حاجی ئەحمەد، نیشانی داین کە لەیەک قۆڵت گولەباران کرابــوون، پێــش ڕەمی کــردن لەماڵی وان چایان خواردبوو. شــەهید ڕۆســتەم بــەدزی دەمانچەکەی دابــوە خێزانی کاک خدر، باوەڕی نەکردبوو بەدیلی ڕەمیان بکەن. شــایانی باســە لەو شەڕە نەگریســە قارەمانی ڕەبایە گرتن، شەهید خدر کاکیل شــەهید بوو، لەگرتنی موڵگەکانی ڕژێم کە لەســەر چیاکانی کوردســتان هەڵتۆقیبــوون، دەســتێکی بــاڵای هەبوو. جارێکیان لە ڕەبایەکی ڕژێم شــەوێکی ئەنگوســتەچاو ســەربازە پاســەوانەکە میزی بە خدر کاکیل دا کردبوو نەیدیبوو، هەتا دواجار ئەو ڕەبایەی گرت.

ئــەوەی جێــگای تێرامــان و هەڵوێســتەکردنە، لایەنــە بەشــەڕهاتوەکان تەنهــا پێشــمەرگەی یەکتریان بەدیلی دەکوشــت، ئەو کردەیە بەرپرسانی نەدەگرتەوە، لەســاڵی ١٩٨٢ تاوەکو ســاڵی ١٩٩٦ ئەو ســەرکردانەیان بەدیلــی لەیەکترگرت: هاوڕێ کەریم ئەحمەد و ئەحمەد بانی خێلانی، لەلایەن یەکێتی گیران، نەوشێروان

مستەفا لەلایەن سۆسیالیست گیرا، فوئاد مەعسوم و چەند سەرکردەیەکی یەکێتی لەلایەن پارتی بە دیل گیران، مەلا عوسمان عەبدولعەزیز لەلایەن یەکێتی بەدیل گیرا، مەلا بەختیار، ئالآی شۆڕش بوو لەلایەن یەکێتی دیل کرا، زۆرانی تر لەشەڕی خۆبەخۆ گیران. بەڵام سەرکردەکان یەکتریان نەدەکوشت، تەنها پلە نزمەکان یەکتریان دەکوشت.

من نامەوێ زۆر باسی ئەم شەڕە قێزەونە بکەم، بەڵام پێم خۆشە لەدوای ئێمە کارەساتەکان وەک خۆی بۆ نەوەکانی داهاتوو بگێڕمەوە، لەو شەڕە هاوڕێ کەریم ئەحمەد بەدیل گیرا لەگۆمی کرمەسوران. بەچەند پێشمەرگەوە ڕێکەوتنامەیەکیشی لەگەڵ یەکێتی مۆر کردبوو، دوو مانگ لەو قەندیلەماینەوە بەنیازی شەڕێکی قێزەونی تر چاوەڕوانی ئەو هێزەمان دەکرد، کە خوالێ خۆش بوو کاک ئیدریس بارزانی بەنیازبوو بینێرێ. پاشان یەکێتی هێرشی کرد بۆ کونەکۆتر، لەوێ کە یەکێتی جامانەی سوریان لەسەر نابوو، هەتا نەچونە ناو ڕەبیەی شەهید حەسۆ میرخان نەیانزانی. لەوشەڕە دەیان کەس شەهیدبوون کە بەداخەوە ناویان نازانم، لەحیزبی شیوعی هاوڕێیانی بادینان زۆرترین شەهیدیاندا، لەسۆسیالیست سەلاح ئیلنجاغ و چەند پێشمەرگەیەکی شەهیدبوون، حەسۆمیرخان لەپارتی دیموکراتی کوردستان و لەگەڵ شەهید یوسف و چەند پێشمەرگەیەکی تر.

ئێمە لەخوار گوندی کۆیلە بوین، بەسەر کەمیندا کەوتین، هیوا سور شەهید بوو لە حیزبی شیوعی، چوار هەلیکۆپتەریش بەسەر ئاسمانی شەڕەکە دەخولانەوە، بەڵام یەک فیشەکیان نەتەقاند، تەنها چاودێری شەڕەکەیان دەکرد. بۆ ئێوارە دوو پێشمەرگە لەپەلەکەی خۆمان کە نۆرەمان بوو ئارد بێنین، ناردبوومان بۆ هێنانی ئارد، هەردووکیان کەوتبوونە کەمین و شەهید بوون، بەناوەکانی سەمیر عەنکاوەو مازن، کە (عەرەب بوو)، ئێسترەکەشیان کوشتبوو. ئەو کەمینە برادەرانی یەکێتی دایان نابوو، ئەو پەلەی من بەرپرسی بووم سێ شەهیدمان هەبوو. کانەبی گەورە بانگی کردم، گوتی: پەلی ئێوە دەزانم شەهیدتان داوە زۆر ماندون بەڵام دەبێ سەرکەونە سەر شاخ. ئێمە لەگۆمی کرمەسوران کۆبوینەوە، پەلی ئێمە تەکلیف کراین بچین بۆ سەر دوندی قەندیل. بەو شەوە هەرچی زوە، گوایە هێزێکی یەکێتی دزەی کردوە لەپشتەوە بێت بۆمان، هەریەکەی بەشی

خۆی فیشـەک و گولە ئاربی جی هەڵگرت، لەگەڵ هەریەکەی دانەیەک گۆشـتی قوتوو، گەیشـتینە سـەر دوندی قەندیل، لەچەقەلە شـاخێک دانیشتین، برسی و ماندی، قوتیەکانمان شـکاند نان بخۆین، قوتی هەموان گۆشـت بوو، بەس قوتی من شـکاندم دۆشاوی تەماتە بوو، هاوڕێیان زۆرم پێ پێکەنین.

دوو پاسـەوانمان دانا دوو دوو پشـتمان پێکەوە دەداو دەنوسـتین، بەڵام کەس بـۆی نەبـوو مەخزەنـەکان و پێڵاوەکانـی دابنێ. هـەر کە خەبەرمـان دەبوەوە مەخزەنـەکان لە پەراسـومان ڕادەچوو. لەگەڵ مامۆسـتا فەرهـاد و عەولاپۆڵا و چەنـد پێشـمەرگەیەکی تر چوین بۆ تاتی دۆ و چۆمەی لەو ڕەشـماڵانە. دوازدە گیسکمان هێنا، چونکە کەس گۆشتی نەخواردبوو ئەو ماوەی لەوێ بوین پاشان هەر لقەی دوو گیسکی برد.

دوای چەنـد ڕۆژ بـەرەو ئێران گەڕاینەوە، لەبەردەپان شـەهید مام کاوێس پێش ئێمە گەیشتبوە ئەوێ، ناردبوی هەندێ نان و تەماتە لە کۆنەلاجان هاتبوو، هەر کە گەیشـتین گوتی: ها ئەوا سـەرو نان بخۆن، تەماتەیەکی دامێ، منیش ویستم شەقی بکەم. هاواری کرد: نەکەی!!

وەک چەقـۆم لەملـی یەکێ نابێ!! پێم گـوت: چیە؟! مام کاوێس گوتی: مەیلە ئاوەکەی بەلاش بڕوا با نانەکەت نەرم بکاتەوە لەسەر نانەکە شەقی بکە. دوایی ڕۆیشـتین بۆ شـنۆ، لەشـنۆ بەرێکەوتین بۆ بەرازگر. سـواری تراکتۆربوین هەتا نزیک تاوڵی و ڕەشـماڵی مەڕدارەکانی لای سەرسـنور، لەوێ بەپێ کەوتینە ڕێ بـۆ پشـتی سـیدەکان. ڕۆژی دوایی بـەرەو ناوچەی خواکورک، لـەوێ ماوەیەکماینەوە. دکتۆری چاکمان لەگەڵ بوو خەڵکی ئەو ناوچە نەخۆش و ساغ هەموی هەر دەیگوت:

نەخۆشـم چارەسـەرم بکـەن. دکتۆرەکەمان ناوی د.سـادق بوو. لـەو ناوچەیە بویـن لـەدەم ئاوەکە. هەریەکە لەبن سـێبەرێ خەوتبوین. لای پێشـمەرگەکانی لقـی گەرمیـان، بـوو بە هەرایـەک ، مارێکی زۆر گەورە چوو بوە ناو شـەڕواڵی پێشـمەرگەیەک بەناوی عومەر پاپیلانی. لەپاش ئەو ڕێ ڕۆیشـتنە شـەهید بوو، مارەکە نۆ پێ درێژبوو، شاخەوان حەساری و کاوە کەڵکەسماقی پێوایان. سەری مارەکـە گەیشـتبوە لای دۆخینەکەی ئینجا هەسـتی پێکردبوو، لەترسـی گیانی خۆی توند سەری مارەکەی گرتبوو، هاواری کرد: مار خواردمی، ماری ئەو ناوە

زۆر مەترسیدارو ژەهراوی بوون، شەرواڵەکەیان لەپێ داکەند، دۆخینەکەیان بەچەقۆ بری بە ڕوتی هەڵات بۆ پەنای داران، مارەکەیان کوشت.
پاش چەند ڕۆژێک بەرەو عادل بەگ و زێتێ و ئیدلبێ و بێرۆخی، کە سنوری تورکیایە بەرێکەوتین. خەڵکەکە پێیان گوتین: بڕۆن باشە، قەرەقولی تورکی دێن بۆ ئەو ناوە، ڕۆیشتین بۆ لای کانی بۆت، لەوێ بەرێکەوتین بۆ بارزان.
لەگەڵی سولێ بەسەرکەوتین، پێش بگەینە گوندی هۆستان، بیرێکی لێبوو کە هەندێ خەڵکی لەسەر بوو، ئەوان خەریکی قەزوان کردنبوون، بۆ پشودان و نان خواردن لەسەر ئەوبیرە دانیشتبوون، نانیان خواردبوو، دیاربوو شلە ساوەر بەتەماتەیان خواردبوو، ئەو لەتکە نان و ساوارەی مابوو لە تەشتێکی گەورە لەپێش هێسترەکەیان دانابوو. هێسترەکەمان دەرکرد لەسەر تەشتەکە، ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیان خواردین، ماون. هەتا بنی تەشتەکەمان پاک کردەوە خواردمان. پاشان بەرێکەوتین بەرەو بارزان. شایانی باسە ئەو گەشتە لە قڕناقەو پشت ئاشان بەناو خاکی ئێران هەتا بەرازگرو بارزان پازدە شەو و ڕۆژی خایاند.
لێرەدا لەسەر ئەنفالی بارزانییەکان دەمەوێت بڵێم: ئەنفالی بارزانییەکان لە ١٩٨٣/٩/٣٠ لەدوای گرتنی حاجی ئۆمەران لەلایەن پاسدارانی ئێران بەچاوساغی و هاوکاری پارتی. ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس پێی هەڵسا. ڕۆژێک یەک لەو بەیانیانەی پێش ئەوەی خۆر لەدیدەوان هەڵکشێ، تیشکی لە کۆمەڵگای بارزانییەکان بدات، پێش ئەوەی کرێکارە بارزانییەکان دەست بدەنە نان و پێخۆرە پێچراوەکانیان بۆ سەرکار، قەڵەرەشەکانی بەعس دەوریان دەدەن، وەک گەلەگورگ پیاوەکانیان ڕاپێچی ناو ئیڤایەکان کرد، ئەوەی کە تەمەنی بچوک بوو هەویەی پێ نەبوو، دەستیان لەگەردنی دەدا بۆ ئەوەی بزانن ئەو گرێیەی گەردنی دەرکردوە تا بیگرن. ئەو گرێیەی کە لە گەردنی نەوجەوان پەیدا دەبێ نیشانەی باڵق بوونە، بۆیە ئەوەی گرێی گەردنی هەبوو گرتیان و کۆمەڵکوژیان کردن. ئەو کردەیە، مەلا عەلی بۆی گێڕامەوە کە شاهید بوو ئەو زوڵمە گەورەیەی لەو مرۆڤە بێ تاوانانە کرا، ویژدانی هەموو مرۆڤێکی هەژاند، تەنها بەعسیەکان نەبێ.

# تاکتیکی سەربازی بەکارهێنابوو

شایەنی باسە پێش گەڕانەوەمان بۆئێران و لەوێشەوە بۆ بارزان، لەشەڕی قڕناقە و پشت ئاشانی دوەم بوین لەکونەکۆتر، کۆتایی تەمموزی ١٩٨٣ بوو، لەو بناری قەندیلە وەک دەڵێن: ئەسحابەیی کەوتبوینە وێزەی یەکتر. ئەبو لەیلی و دکتۆر عادل و ملازم احسان شەهیدبوون، کە خاوەنی بڕوانامەی باڵابوون. ئێمە و سۆسیالیست چل ڕۆژ بوو چاوەڕوانی پارتی بوین، کەچی یەک پێشمەرگەی پارتی نەهات، جگە لەوانەی لە سەرەتاوە لەگەڵ ئێمە دابوون، کە ژمارەیان کەم بوو!! کانەبی گەورە بە برینداری دەوری گیرابوو، شەڕ لەهەموو بناری قەندیل بەردەوام بوو. هەموی هەر دەتگوت بۆ مزگەوتێی دەکات. کوڕێکمان لەگەڵ بوو (ئەندازیار کە باسم کردوە)، ئەندازیاری جیۆلۆجی بوو (س)، تفەنگێکی برنۆمان دابویە، بۆ ئەوەی لەپشتەوە بێ، بەراستی ئەو پیاوە هی شەڕە تفەنگ و ئەو شەڕە نەگریسە نەبوو، دەتواندرا لە زۆر بواری تر کەڵکی لێ وەربگیرێ. لەسەر گۆمی کرمە سوران و لای کۆپتەرە شکاوەکە، بینیمان ساغ و سەلامەت بوو، چونکە لەشەڕەکە دوور بوو، لەناکاو ون بوو. بەگەڵ چەند کەسێکی پارتی کەوتبوو کە برینداریان پێ بوو بەرەو ئێران، دوایی ئەوانیشی جێهێشتبوو، چوو بوە بەردەپان و کۆنەلاجان، لەوێ خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی بینیبوی، پرسیاری شەڕەکەی لێکردبوو، ئەویش گوتبوی: شەڕەکە گەرمە، باوەڕ ناکەم کەس مابێ. ئەویش گوتبوی: ئەی تۆ چۆنە گەیشتویە ئێرە؟ (ڕێگەکە ماوەی دوازدە کاتژمێر دەبێ، ئەگەر خۆش بڕۆی). ئەویش گوتبوی: ویستم تاکتیکی سەربازی بەکاربهێنم. کاک ئیدریس زانیبوی ڕای کردوە، یەکسەر تفەنگەکەیان لێ سەندبوو. کە گەڕاینەوە بۆ ڕۆژهەڵات، هاوڕێ ملازم خدر، کاک ئیدریسی بینی، دەیگوت: خواخوام بوو ئەو باسەی لە یاد نەمابێ، بڵێ پێشمەرگەیەکتان ڕای کردبوو، گوتم: ڤیروسیا لەتفەنگەکە.

لەوە بەدوا هەر بە گاڵتە لە شوێنێک شەڕ بوایە دەمانگوت: وەک (س) تاکتیکی سەربازی بەکار نەهێنین؟

کارزان (حوسێن نەبی)، لەگۆمی کرمەسوران لەگەڵ کچی یەک لە مەڕدارەکان

لەکاتــی هاتنــی فرۆکە، چوو بــوە ناو کونە تەیــارە، بەڵام دەمێــک بوو تەیارە ڕۆیشــتبوون و دەنگیــان نەمابــوو، کچەکــە دەیویســت بێتــە دەرەوە لــە کونە تەیارەکــە، بەڵام کارزان دەیگوت: بەخوای ئێســتا تەیارەکان دەگەڕێنەوە، نابی بچیــە دەرەوە، باوکت تۆی ئامانەتــی من داوە. گوتمان: وەرە دەرەوە دایکم تۆ لەگــەڵ ئەو گورگەی چی دەکەی لەو کونەی؟!!

# کەژاڵ خان

لەدوای شــەڕی قرناقە و پشــت ئاشــان و کونەکۆتــر، لەکاتــی گەڕانەوەمان بە شــنۆو بەربزین و ســپی ڕێزی خەیلانیان. لەو ڕێگا ڕۆیشتنە هێسترێکی ماچەمان پــێ بوو، کەلوپەلی نان و چاو هەندێک شــتی تری لــێ بارکرابوو. هاوڕێیان ئەو هێســترەیان زۆر خۆشدەویســت، ناویــان لێنابــوو (کەژاڵ)، دەبوایــە بە لێلکان و عــادل بەگ و دەشــتی حەیــات بڕۆین، زێتێ و ئێدلبێ و بێــرۆخ هەر هەمویان لەسەر سنوری تورکیان. بەڵام دەبوایە سێ گوندی باکوری کوردستان ببەزێنین، بەناوەکانی: ســولمانە، نهاوەند، مام ڕەشــان. دیارە ئاوێک بەوێدا تێپەر دەبێ، کە گەیشــتینە ئەو شــوێنە هاوڕێیانی پێشــمەرگە ڕویان لەشــەهید عەونی کرد، (بەداخــەوە لــەدوای ١٩٨٨ لــە ســێدارە درا.) گوتیان: عەونی بۆمــان بگێڕەوە کاتێــک بــەو شــوێنەدا تێپەربوی لە ســاڵی ١٩٨٠ کەوا تۆ بەرپرســی ئەو ســێ پێشــمەرگەیە بوی، لەو شــوێنە تێپەربوون، چۆن قســەت لەگەڵ قەرەقۆڵەکانی تورکیا کرد؟

ئەویش بۆی گێراینەوە: ئەوکات توشــی قەرەقۆڵی تورکیا ببانین، دەبوایە بڵێین: ئێمــە مرۆیــێ بارزانین. ئێمە لەو شــوێنە تەنگەبەرە، لایەکــی ئاوەو لایەکی تری شــاخێکی ئەســتەمە، ســێ قەرەقۆلی تورکیا مان لێ پەیدا بوون، منیش سڵاوم لێ کردنو پێم گوتن: ( قارداش ســەن موســڵمان ســەن، مەن موســڵمان سەن، مادام هەردوولامان موسوڵمان سەن، حەتمەن لازم تێپەڕ ئۆلسن)، قەرەقۆلەکان دەســتیان کــرد بە پێکەنیــن و لەیەک تێپەرین. ئێمە لە بێــرۆخ نانی نیوەڕۆمان خوارد، گوتیان: زوو برۆن، ئێستا قەرەقۆل دێن. ئێمەش گوتمان: مادام تورکی

زانی وەک هاوڕێ عەونیمان لەگەڵە باکمان نییە. کاتێ لەهەورازێکی زۆر سەخت بەسـەر دەکەوتین لەسـنوری چامە، بۆ لای کانی بـۆت، بەداخەوە (کەژاڵ) واتە هێسترەکەمان چـی تر دەری نەبرد، چونکە لە قەندیلـەوە بەناو خاکی ئێران و سـێ گۆشەی هەر سـێ وڵات بەو بارەیەوە کەوت هەڵنەسایەوە، ئەوشەوە لەبەر کـەژاڵ لـەوێ ماینەوە. بەیانی کە هەڵسـاین کـەژاڵ پشـتی برینداربوو هەردی قۆڵۆنیـای پێداکردبـوو، بەراسـتی هەموو پێشـمەرگەکان زۆریـان پەرۆش بوو، لەبیرمـە دەیانگـوت: هەر کەس لـە ئێمە لەژیاندا ماوەو شـەهید نەبوو، ناپاکیە ئەگـەر باسـی ئـەو ڕێ ڕۆیشـتنە بکات و ناوی کـەژاڵ و هـەوڵ و ماندووبوونی بەرز نەنرخێنێ، بۆیە لەدوای تێپەڕبوونی سـی و سـێ سـاڵ، منیش نامەوێ بەر نەفرەتـی مێـژو و برادەرەکانم بکـەوم، دەمەوێ بەو چەند دێـرە یادێکی کەژاڵ خان بکەمەوە.

# مردنی کوڕە بچوکەکەم

کە گەیشـتینە بارزان، لەبەرئـەوەی ناوچەیەکی قەدەغەکراوبـوو لەلایەن ڕژێمی بەعس، کەسـی تێدا نەدەژیا. لەناو حەوشـی مزگەوت بەراز بەڕەوە هەڵدەهاتن. دڕک و تـەڕاش سـەری پێکەوە نابـوو، زۆرجار بەرازو ئـەو زیندەوەرانەی لەوێ بوون بەژێر ئەو دڕک و تەڕاشانەدا دەڕۆیشتن، وەک کۆڵانی بچوک وابوو. چوین بۆ ڕێزان، بارەگای شـەهید علی حاجی نادر لەوێ بوو، عەولا بۆریش لەوێ بوو ئەوکات بەرپرسـی هەرێم بوو لە حیزبی سۆسیالیست.

ماوەیەکی باش ماینەوە، باش حەسـاینەوە. ڕۆژێک ملازم خدر داوای لێکردم کە لەگەڵ چەند پێشـمەرگەیەک لەگەڵی بچین هەتا سەرسـنوری (تورکیا- سوریا)، دەیەویست بچێ بۆ سوریا بۆ بینینی ماڵ و منداڵەکەی لە قامیشلۆ. لەو سەفەرە لەگەڵ ملازم خدر بۆ سنوری سوریا من و شەهید عەونی و ئاسۆی برام و حاجی دەهـام و چەند پێشـمەرگەیەکی تربوین، کۆتایـی مانگی نۆی ١٩٨٣ بوو. ملازم خـدر، نێوانـی لەگەڵ ئەبو حیکمەت بـاش نەبوو، ڕەزامەندی خۆم نیشـاندا کە لەگەڵی بچم. ملازم خدر بەرپرسـی سـەربازی هەموو هێزەکە بوو. لەسـەرەوەی

ڕێـزان برێـک هەبـوو کەدەتواندرا بەپێیـان لەزێی بادینان بپەڕینـەوە. پایز بوو لـەزێ پەڕینەوە بـەرەو گوندی هەڕنێ، لەوێ نانی نیوەڕۆمـان خوارد، تەماتەی پایـزو پیـواز، ئێسـتاش زۆرجـار لەماڵ، خواردنـی هەمەجۆر هەیـە من دەڵێم: تەماتـە و پیواز دەخـۆم، بەتایبەتی پایزان، بەڵام قەت تامـی ئەو تەماتە نادا. باوەربکەن هەردوو شـەویلاکم شـل ببوو بەتەواوی ماندوو بووم لەخواردن، بەڵام تێـرم نەدەخوارد. دووژنیـش نانی گەرمیان دەکردو ئێمـەش هەموومان خوارد. بـۆ ئێـوارە چوینـە گوندی هلوریـان، لەوێ شـێخ عبدولمەجیدم ناسـی، بوینە برادەر، ماڵێکی بەخزمەت بوون. پاشان زۆرجار سەرم لەوێ دەدایەوە. پیاوێکی تێگەیشـتووبوو دەیەویسـت یارمەتـی هەموو لایەنـەکان بدات بەبـێ جیاوازی، پێشمەرگەی زۆر خۆش دەویست.

شەو بەسواری کەڵەک لەزێ پەڕینەوە بۆ ئەوبەر، ڕەنگە بڵێن: ئەو هەموو پەڕینەوە بۆچـی؟! ئەگـەر وامان نەکردبایە ڕێمان دوور دەکەوتـەوە، بەرەو گەلی باڵندە، کـە پردێکـی لێبوو، شـێخ عبدولمەجید پێی گوتم: زۆرجار جاشـە ڕێکانییەکان کەمین لەوێ دادەنێن. ئێمەش نەشـارەزابوین، بەهەزار دەردەسـەرو بە ئەسپایی ئەو شـوێنەمان ڕەت کرد. لەناو گەلی باڵندە دەبوایە لەئاوی ڕۆشـن بپەڕینەوە کە ئاوێکی زۆربوو، کەڵەکمان پەیداکرد. کورتانی ئێسترەکەو ئەو شتانەی لێمان بارکردبوو لەسـەر کەڵەکەکە دانا، بۆ ئەوبەر، ئێسترەکەشـمان لەئاوێدا. بەمەلە پەڕیەوە، ئێمەش سـێ نەفەر سـێ نەفەر پەرینەوە. چویـن بۆگوندی چەمجوو، کە دواهەمین خاڵی باشـوری کوردسـتانە، لەسـەر مەرزی باکوری کوردسـتانە. چەمجوو وەک شار وابوو دوکانی لێبوو، ملازم خدر دەمانچەیەکی سمیسی ڕوبعی پێبوو لە پشـتی کردەوە، دایە شـەهید عەونی بۆی بفرۆشـێ، وابزانم پارەی پێ نەبـوو، شـەهید عەونی فرۆشـتی. ئەو دیمەنە بۆ من زۆر ئـازار بەخش بوو، کە بەرپرسـی هێزی سـەربازی ئێمە بوو، ئەو دەمانچە فرۆشتنەی ملازم خدر بەلای من وەک سـوکە ئاشـبەتاڵێک وابوو. ئێستا ملازم خدر بەپلەی فەریق لە فەلەک و وەزارەتی پێشـمەرگە دەوام دەکات، کە پێم وایە زۆر شایسـتەی لەوە زیاترە ئەو مرۆڤە تێکۆشەرە.

چەمجـوو چێشـتخانەی لێبـوو، بـەزۆری گۆشـتی بزنەکێـوی شـاخیان هەبوو، چویـن بۆ گوندی کەرۆ، لەوێ شـۆڕبوینەوە بەرەو لقی یەکـی پارتی دیموکراتی

کوردستان. ئەو سەفەرە چوار ڕۆژ و پێنج شەوی پێچوو تاگەیشتین. لەوێ لەیادمە نیوەڕۆیەک لەگەڵ ملازم خدر چوین بۆلای بەرپرسی لقی یەک (پ.د.ک) لەیادم نەماوە ناوی چی بوو، بەڵام پێشمەرگەیان زۆربوو، بەهێزترین لقی پارتی بوو. زۆر ڕێزی گرتین، ملازم خدریان باش دەناسی، لەگەڕانەوە بنەکەیەکی بچوکم بینی، نەفەرێکیان لەدار بەستا بوو، دیاربوو زیندانی کرابوو، پرسیم: ئەوانە چین؟ گوتیان: ئەوانە چوار پێنج کەسن پێیان دەڵێن پارتی کرێکاران. زۆرم پێ خۆش بوو بچمە لایان بزانم بۆچونیان چۆنە، بەلام لەبەر ملازم خدر نەمتوانی بچم. گەڕاینەوە بارەگای حیزبی شیوعی، تۆمە تۆماس بەرپرسی بوو، ناسراو بە ئەبو جەمیل.

ماوەی ساڵێک دەبوو ماڵ و منداڵم نەدیبوو، ئەوکات کە لێک دابڕاین لەگەڵ منداڵەکانم، لەناوچە ئازادکراوەکان دوو کوڕم هەبوو، خێزانیشم دووگیان بوو. هەواڵم هەبوو کوڕێکی ترمان بوە، بەڵام من نەمدیبوو نەشمدەزانی ناوی چیان لێناوە!! دوایی زانیم ناوی (جیهانگیر) بوو، کە باوکی شارۆچکەیەکیشی پێ نەدەگیرا.

باوکم ناردبوی دایکم و منداڵەکانی من بێن بۆ لامان. باوکم یادی بەخێر منەتی بەسەرمندا دەکرد کە لە بەر من ناردویە بەدوایاندا، بەڵام قازانجی خۆشی تێدابوو، چونکە دایکیشم هاتبوو. لەوێ یەک لەهاوڕێیانی پێشمەرگە بە ملازم خدری گوتبوو: حازم خێزان و منداڵی بۆ دێتە بارزان. ملازم خدر بانگی کردم زۆر لێم تورەبوو، پێی گوتم: ئەگەر چاوەڕوانی منداڵانت دەکرد بۆ لەگەڵ من هاتی؟ ئاخر ئەو ڕێگایە چوار ڕۆژی تر دەخایەنێ هەتا تۆ دەگەڕێیەوە، ئەوان هەر چاوەڕوانی تۆ بکەن؟ ڕاستیەکەی خۆشەویستیم بۆ ملازم خدر تایبەت بوو. بەزۆری ئەو ڕۆژە ئێمەی بەرێکردەوە بۆ بارزان، ماڵئاواییمان لێکرد. بەرێکەوتین ئەمجارە نەچوینەوە گوندی هلوریا. لە سیدا پێیان گوتین: بڕۆنەوە تێل و شنگێل، لەچیای شیرین ئاوا بن بۆ بارزان، زۆر نزیک ترەو ئەمشەوە لە سیدا ماینەوە، ڕۆژی دوایی بەرێکەوتین، بۆ نوێژی شێوان گەیشتینە بارزان، کەچوومە لای باوکم و دایکم و منداڵەکانی خۆم، هەمویان زۆر خەمبار و مات بوون. دڵم ترسا زانیم شتێک ڕویداوە. باوکم پێی گوتم: کوڕە بچوکەکەتان مردوە. گوتم: کوردستان سەلامەت. پێم وابوو شتێکی گەورە ڕوی داوە ئەوە هیچ نییە.

رۆژانــە لەســەر چیای پێرس تــۆپ باران دەکراین، بــەڵام دەمانزانی رۆژێ چەند گولە تۆپ دەهاوێژن، شەش دانە، ئەگەر زیادی بکردبایە دەگەیشتە دوازدە دانە، هەموو ڕۆژێ بەم شێوەیە دووبارە دەبوەوە. بارزان هەندێ ئەشکەوتی دەستکردی زەمانی خوا لێخۆشبوو مەلا مستەفای لێبوو، کە ئەوکات دروستکرابوون، بۆ ژن و منداڵەکانــم قایــم بوو. دایکم گەڕایەوە لەگەڵ منداڵەکانم بۆ گوندی کلێســەی کۆیە.

لــەو هاوینــە دوای گرتنــی بێتواتــەو فەرهودکردنی لەلایەن هێزەکانــی یەکێتی. هاوینــی ١٩٨٤ پاش گرتنی بێتواتە، لەکۆبوونەوەیەک لەمێرگەپان مام جەلال بە ئامادەبوان دەڵێ: ئەو لەشــکرەی من هەمە لەشــکری ڕزگاری کوردســتان نییە، لەشکری هۆلاکۆیە، بەرپرس هەبوە سەلاجە و مجەمیدەی بەپشتی خۆی هێناوە. مــام جەلال ڕاســتی دەکــرد، لە بێتواتە ماڵــی یەکێتیەکان و شــەهیدی یەکێتی پێشــی ماڵە جاشــەکان تالان کران، لەلایەن پێشمەرگە و بەرپرسەکانی یەکێتی. لەکتێبی ( لەهەواری یادەوەریەکانمدا) لاپەڕە (٢٥٢) ی حاجی مەمۆ باســی ئەو تالانە دەکات.

# پەلامارێك لە پێناوی مانەوەدا

پێشــمەرگەیەکی لقی خۆشــناوەتی، لەبرا مەسیحیەکانی شەقڵاوە، بەناوی جۆن، لە پێشــمەرگایەتی بەناوی هێمن، لەشــەڕی قەراســنج بەشــداربوو. ئەو هێزەی حیزبی شــیوعی و سۆسیالیســت هەر چوار دەورەیان دەگیرێ، ئەو شــوێنە زۆر بێ ئاوە، ئێســتاش ئەگەر یەک زۆر تینوبێ دەڵێن: لە قەراســنج لێی قەوماوە. لەوکاتــە یەکێتی لەگفتوگۆدابوو لەگەڵ حکومەتی بەعس.

ئــەو ڕۆژە چوار پێشــمەرگە لەتینوان خنــکان، یەکیان عەرەب بوو خەڵکی حلە بــوو، بــرای نەورۆز کچێکی پێشــمەرگە بوو. لەو شــەڕە زۆر لە پێشــمەرگەکانی حیزبی شــیوعی میــزی خۆیان خواردبــوەوە، زۆریان لە ژیان مــاون. لە گوندی تەوســکە هەشــت پێشــمەرگە چوبوون بۆ ئــاو خواردنەوە، لەکاتــی دەمیان بە ئاوەکەوە نابوو، پێشــمەرگەکانی یەکێتی گولەبارانیان کردبوون، هەر هەشــتیان

شــەهیدکردن، شــەهیدەکان چواریان عەرەب بوون، وەک: ( لالە حەمە و چەند پێشــمەرگەیەکی تر). زۆرجار لەکاتی منداڵی ئەگەر ئاژەڵێک سەگێک پشیلەیەک لەکاتی ئاوخواردنەوە بمانویستبایە بەردێکی بۆ بهاوێژین، دایکم دەیگوت: گوناهە رۆڵــە لێیگــەڕێ ئاوەکــەی بخوا، ئەو بــرا کوژانە دەبێ چۆن و کــێ ئاوا پەمپی دابــن ئەوەنــدە بەدڵرەقی و بێویژدانانە لەکاتــی ئاوخواردنەوە، برای خۆیان یان هەر مرۆڤێک بدەنە بەر دەســترێژی گوللە و گوماوەکان لەخوێن ســور بکەن؟!! ئەو دێرە شــیعرەی ( ســهراب ســپهری) شاعیری فارســیم هاتەوە یاد کە دەڵێ: (جۆگەلەکــە قوڕاوی مەکــەن، کۆترێک لەخوارەوە ئــاو دەخواتەوە). بەڵام دیل کوژەکان نەک هەر قوڕاوی بەڵکو خوێناویشیان کرد. جێگای باسە کە تۆپەکانی یەکێتــی لەســەری ڕەش تۆپبارانــی قەراســنجی کردبوو، لەســەر تاتی مزگەوت شــەش کەسی شەهیدکرد، هەر شەش هاوڵاتی خەڵکی قەراسنج بوون.

کە دەچوینە هەر گوندێک، هاوڕێ هێمن دارلاســتیکی پێبوو، دوو سێ چۆلەکەی دەکوشــت و نانــی وەردەگرت، بەشیشــکە تفەنگ دەیبرژانــدن و دەیخوارد، کەم وابوو لە ماڵان دابەش بێت، بۆی گێڕامەوە (ئێســتا لە ژیاندا ماوە لەشــەقڵاوەیە) کاتــێ زۆر تینــو دەبــێ لەو شــەڕە نەگریســە لــە هاوڕێیان دادەبــڕێ، گوێی لە دەنگی بۆق دەبێ، دەزانێ ئەو شــوێنە ئاوی لێیە. دەچێتە ســەر ئاوەکە تێر ئاو دەخواتەوە، پاشان لەکەلێنی شاخێک دەخەوێ. بەیانی لەدەنگی پێشمەرگەکانی یەکێتی خەبەری دەبێتەوە کە لەسەر چەک و غەنیمە کۆکردنەوە هەرایان دەبێ. لەوکاتەی هێمن هەڵدەســتێتە ســەرپێ، هاوار دەکەن: ئەوەتا شیوعیەک لێرەیە، هێمــن تفەنگەکــەی ڕاوەســتاوەو جوتەی کردوە، دەیگــرن، تفەنگ و ڕەختەکەی لێوەردەگرن.

دەیبەنە لای شــەوکەتی حاجی موشــیر، ئەویش دەڵــێ: زانیاریتان لێوەرگرت؟ دەڵێن: بەلێ. لەوکاتەدا ئیڤایەکی ســەربازی حکومەت نان و کەبابیان بۆ دێنێ. هێمــن گوێــی لێ دەبــێ، دەڵێ: بیبــەن گوللە بارانــی بکــەن. هێمنیش دەڵێ: مــادام گوللــە بارانم دەکەن و دەمکوژن، نــان و کەبابێکیش بدەن بە من بیخۆم. کــە نانەکــە دەخوا شــەوکەتی حاجی مشــیر ئیشــارە بۆ ئامر کەرتێــک بەناوی ئەحمەد جەمیل دەکات، تا بیبات بیکوژێ. دەیباتە ناو چەمێک لەنزیک خۆیان، پێــش ئــەوەی تەقەی لێبــکات، هێمن چەقۆیەکی پێ دەبێ چەقۆیەک لەقایشــی

تفەنگەکەی ئەحمەد جەمیل دەدا و تفەنگی لەشانی دەبێتەوە، تفەنگ دەکەوێتە دەستی هێمن، قایشی تفەنگ لەدەستی ئەحمەد جەمیل دەبێت، بەو شێوەیە پەلاماری نارنجۆکەکەی قەدی ئەحمەد جەمیل دەدا و پەنجەی لەناو هەڵقەی داوێ، دەڵێ: هەردووکمان بمرین، یان بەرم دەدەی؟ لە قایشەکەی دەردێنێ، نارنجۆک و تفەنگ لەدەستی ئەحمەد جەمیل نامێنێ و هێمن ڕادەکاو هەرچەندی بەدوایدا دەگەڕێن نایگرنەوە، هێمن دەڵێ: چاوم لێبوو لە ئەحمەد جەمیلیان دەدا دەیانگوت: نەتوانیوە دیلێکی مەسیحی بکوژی؟!! تۆ چۆن ئامر کەرتێکی!! هێمن نەجاتی دەبێت. جێگای باسە ئەحمەد جەمیل لە ١٩٩٥/٩/١٥ لەشەڕی براکوژی لەگەڵ پارتی کوژرا.

# دیوێکی تری شەڕی قەراسنج

لەتەمموزی ١٩٨٤هێزێکی حیزبی شیوعی و سۆسیالیست لە بادینان بەرێکەوتن بەرەو چیای سەفین، کە هەردی برام لەگەڵ ئەو هێزەدابوو. کاتێک پێشمەرگەکانی یەکێتی پێدەزانن هێزیان بۆ کۆدەکەنەوە، کە ئەوکات یەکێتی مفاوەزاتی هەبوو لەگەڵ بەعس. بەئاسانی دەیانتوانی هێز کۆبکەنەوە بەناو شەقڵاوەو شارەکاندا. ئەو ڕۆژە لەگەڵ هێزەکەی جود بەرە ورِوو دەبنەوە، لەدەوروبەری قەراسنج تا ئێوارە شەڕ دەبێ. هەندێک لە پێشمەرگەکانی جود ئەو ڕۆژە لە تینوان دەخنکێن.

بۆ بەیانی دەوریان دەگرن، لەوکاتە دەبن بەچەند گروپێکی پەرتەوازە، لەبەر تینوێتی و بێ ئاوی. شەڕ دەست پێدەکات، هەندێکیان لەتینوان خۆیان تەسلیم بەیەکێتی دەکەن، هەندێکیان تەسلیم بە ڕژێم دەبن، وەک: بەکر جۆلا بە برینداری، سادق واتە کەریم قادر مەخموری، شاخەوانی مام غەریب، دلاوەر خزمی مەلا عومەر، کوڕێکی سۆسیالیست و چەند پێشمەرگەیەکی تر کە بەداخەوە ناویان نازانم. ئەوانەی تەسلیم بە ڕژێم بوون هەموویان بەربوون، فەهدی برای چەتۆ سەحەریش لەگەڵ ئەوان بوو، ژمارەیان یازدە پێشمەرگەبوو. بەڵام حکومەتی بەعس بەو هەموو دڕندەییەوە نەیکوشتن. شەوی پێشووتر

مــام کاوێــس لەگەڵ حەڤدە پێشــمەرگە، هەڵکەوت و شــێخ لەتیــف و کرێکار و هــەردی و چەند پێشــمەرگەیەکی تر لە کەمینەکــەی لای حوجران دەدەن، بەرە و لای تەوســکە دەربازدەبن. ئەوانەی مابوونەوە نەشــارەزا بوون، یەکێتی هەموو ســەر ئاوەکانیان لێ دەگرن، بەو گەرمایە بێ ئاو زۆر پەرێشــان دەبن بەناچاری هەندێکیان تەســلیم بە یەکێتی دەبن، کە شــەهید ســەلمان و جەبار کوڕی ئەبو جەبار و ئەبو لەیلا و مەهدی، بەداخەوە ناوی ئەوانی تر نازانم. ئەوانەی خۆیان ڕادەســتی پێشــمەرگەکانی یەکێتی کرد، بە قۆڵ بەســتراوی هەمویان گوللەباران کــردن، ئەوانەی خۆیان تەســلیمی بەعس کرد نەکــوژران!! هاورێیان: لالە حەمە و ئازاد عەرەب چەند پێشــمەرگەیەکی تر لەســەر گۆماوێــک گوللەباران دەکەن، ناهێڵن ئاو بخۆنەوە. ئێســتاش چوار لە شــەهیدەکان گۆڕیان لە تەوسکەیە، لەو ڕۆژە فایلدارەکان ڕوی بەعســیان کردە کافوور.

یــەک لە بەرپرســە ســەربازیەکانی یەکێتــی کە خۆی کارەکتەری ئەو شــەڕەبوو بەنــاوی شــەهید ڕێبــاز لە کتێبەکەی بەنــاوی (قەندیل بەغــدای هەژاند) لاپەڕە (٢٦٠ـ ٢٦١) ڕاســتگۆیانە ئاوا بۆمان دەگێرێتەوە:

(شــەو لە پشــتی گۆڕە شــێر مابنەوە، بەیانــی داوایان کرد لــە نزیک حوجران کۆبوونەوە بکەین من و کاک شاخەوان درەنگ بە کۆبوونەوەکە ڕاگەیشتین وەکو گەیشــتینە شوێنی کۆبوونەوەکە ئەو کارەساتە دڵتەزێنەمان دیت:

لەبناری ســەفین پێنج پێشــمەرگەی حیزبی شیوعی بەدیل گیرابوون کە چاوم بە دیلەکان کەوت زۆر بەزەییم بەواندا هات..چۆن ئەوانە هاتوون بۆ شۆڕش تووشی چ وەزعێک بوون.. ڕەنگیان زەرد هەڵگەرابوو لێویان ووشک بوو، چەند ڕۆژ بوو نانیــان نەخواردبــوو، چاویان لە بــێ خەوی پووت ببوو، چڵکــن و ڕیش هاتوو، بەڵام لەدەروون گەش.. ســیمای پێشــمەرگەیەتیان پێــوە دیاربوو..کۆبوونەوەی لێپرسراوانی ئێمە دەستی پێکردبوو کە وێرا گەیشتین هاتە سەر باسی دیلەکان، من هەروام دەزانی ڕەنگە بڕیاری ئازادکردنیان بدرێ، چونکە هەر ئەوە باشترین هەڵسوکەوتە لەگەڵ برا پێشمەرگەی هاوسەنگەری خۆت با بیروباوەری جیاوازیش بێت، کاک شــەوکەتی حاجی موشــیر سەرپەرشــتی کۆبوونەوەکەی کرد، لە پڕ قســەیەکم گوێ لێ بوو کە هەرگیز نەمدەویســت گوێم لێ بێ، برادەرێک باشــتر بڵێــم نەزانێــک ووتی» با ســەرف و ســونیان بکەیــن«. لەناو پێشــمەرگە ئەو

قسەیە» با بیان کوژین» لێک دەدراوە. بەراستی تاسام چۆن ئەو کورە جوانانە دەکوژرێــن بــێ ئەوەی ڕەچاوی هەق و عەدالەت بکــرێ...!!؟ دیل دەکوژرێ بێ ئەوەی ویژدان بجولێ. هەولمدا ئەو قســەیە بە جدی وەرنەگیرێ بێ ســوود بوو، هەنــدێ مەســئول ئەوەندە گەمژە و گێل بــوون، ئەوەندە دژی بەرژەوەندی گەل بــوون ئەوەنــدە بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاو دەکرد بۆ ئــەوەی تەنیا خەڵک بزانێ پیاو کوژن دیلیان دەکوشــت تا پلە و پایەی پێ وەربگرن.

ئەو پێنج مەزڵومە شەهید کران و لاشەکانیان فرێ دران، بۆ مێژوو دەڵێم: کاک مەلا خدر لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی هەولێر بە منی گوت: با پەسەند نەکەین زۆر دڵگیر بوو هیچمان لەدەست نەهات بەناچاری ملمان شۆر کرد چوینە گوندی حوجران.

یەکێــک لەوانــە بەناوی (ابــو احرار) پێــش ئەنجامدانی ئەو تاوانە کاک ســابیر ڕەســوڵ لێی پرســی ناوی ڕاســتت چی یە؟ ووتی ابو احرار؟ گوتی: ڕاســتم پێ بڵــێ ناوی ڕاســتی خۆت چی یــە؟ گوتی: هەر ابو احرار، بەعســیەکانیش هەروا تەسەروف لەگەڵ دیل دەکەن!!

چوینــە حوجــران لەنــاکاو بوە تەقە کە خەبــەر هات ووتیــان برادەرێک دیلێکی گرتبوو ئەمری کوشــتنی دەرچوو بوو ئەویش ویســتبوی لە ناوچەکە ڕمی بکات ئەو دیلە ڕومانەی هەڵکێشــا و چەکەکەی لە پێشــمەرگەکە ســاند و هەڵات، من ئەو ڕووداوەم زۆر پێ خۆش بوو دەمگوت بەڵکو ئەو کەســانە هۆشــیان دێتەوە بــەر خۆیان و چیتر دیل ناکوژن....!!؟.

بۆ نیوەرۆ چوینە شەقڵاوە لەوێ دووبارە هەندێ هەڵسوکەوتی برادەرانی خۆمان دیــت بەرامبەر امــر لیوا (عمید تحســین) کوردێکی بادینی بوو هەموو ڕەوشــتی پێشمەرگایەتیم لە پێش چاو ڕەش بوو، لە پاشان چوینە هیران لەوێ بۆ ئێوارە هێزەکەی ئێمەیان ناردەوە حوجران هەســتی خۆتان ڕابگرن بزانن لە حوجران چ منالێکی کورد پەیدا بوو..!؟

ئێــوارە لــە ماڵــە جووتیارێکــی هەژاری حوجران کۆنە دۆســتی کاک شــاخەوان تەوزیع بوین بۆ نان خواردن.

پــاش ئــەوەی مەلای گوند بانگی دا و (فتار) کراوە چونکە ڕەمەزان بوو کە دنیا تاریــک هەڵگــەرا منالێکی (٩- ١٠) ســاڵ تەمەنی دەبوو کــە کوڕی ماڵەکە بوو،

وە ژوور کـەوت مـن لێم پرسـی: لە کـوێ بوی؟ دایکی چاوی لـێ زەق کردەوە منداڵەکـەی ترسـاند هـەر دایکی لە جیاتـی وەڵامی داوە ووتی لـە ماڵی مامی بوو..!! زۆرم پێ سـەیر بوو ووتم خوشـکە بۆ منداڵەکە دەترسـێنی؟ ووتی نا بەخـوا..!! لەماڵـی مامی بوو مناڵەکە بە ڕقەوە سـەیری من و کاک شـاخەوانی دەکرد، زانیم شـتێک هەیە لێم پرسـیەوە ووتم کاکی خۆم بە کاکی خۆت نەگوت لـە کوێنـدەر بـوی؟ زۆر بـە تورەییەوە ووتی لـەو چیایە بووم، ووتم باشـە بۆ بـەو ئێـوارە درەنگە چیـت دەکرد لەو چیایـە؟ ووتی من بە تەنیـا نەبووم زۆر خەڵک لەوێ بوون..!! لێم پرسـی چیتان دەکرد؟ دیسـان زۆر زۆر بەتورەییەوە وەڵامی دامەوە گووتی شـەهیدەکانمان شـاردەوە...گوتم شەهیدی چی؟ گووتی شـیوعیەکان ئێوە بەدیلی ڕەمیتان کردن...

بەجارێ شـەرمەزار بوومەوە لە ویژدانی خۆم...کاک شـاخەوان گووتی: ڕاسـت نی یە ئێمە دیلمان نەکوشـتوە. مناڵەکە گریا و گوتی: عەیبە بۆ ئێوە ئێسـتاش قۆڵیان بەستراوە، لەبەر گریان هیچی تری پێ نەووترا. لەماڵەوە چوە دەرەوە و گوتی: جاش لە ئێوە باشـترە!! بەدوای دا ڕۆیشتم ماچم کردوو هێنامەوە، گوتم قسـەکانی تۆ ڕاسـتە ئێمە دیلمان کوشـت، ئێمە ترسـنۆک و بێ ویژدانین بەڵام کاکە ئێمەش وەکو تۆ بێ دەسـەڵات بوین.

تۆ مناڵی بۆ دوارۆژ ئەو کارەساتە لەبەر ئاگردان بۆ مناڵانی کورد بگێرەوە، دایک و باوکی مناڵەکە زۆر ترسان نەوەک ئێمە تۆڵەی ئەو قسە هەق و ڕەقانەیان لێ وەربگرینەوە، چونکە لە پیاوی بێ ویژدان هەموو شـتێک دەوەشـێتەوە..!! کە هەموو ئەو ڕووداوانەم دیت کە ویژدانم جووڵا کە مێشکم هەموو ئەو کارەساتانەی هەڵنەگـرت بڕیارمـدا هەر لەوێ وەعـدم دا ئەگەر هەلم بـۆ هەڵکەوت دەبێ ئەو ڕووداوانـە وەکو خۆی بگێرمەوە، ئەوا ئێسـتا تەنیا وەعدەکەی خۆم دەگەیەنمە جێ هیچی ترنا؟)

ڕۆحـت شـاد کاک ڕێباز بـۆ گەیاندنـی ئەو ڕاسـپاردەیە بەداخەوە خۆشـت بە یاسای(سـەرف و سـون) (بەتاوانـی پێشـمەرگەبوون) لـە ١٩٩٤/٥/٧ بەدیلی شەهید کرای.

لەداهێنانی سـەرکردەکانمان، بەدەسـتی بکوژانی سـەعید ئێلچی و دکتۆر شوان و سـلێمانی موعینـی و ماڵی حەمەد اغای مێرگەسـۆر و یـازدە خوێندکارەکەی

زاخۆ و سەردەشــت و ویداد و هەشــتا گەریلای ناو هەولێر و سەدان شوێن بزرو، بەندیخانــەی ڕایــەت و ئاکــرێ و هــەزاران تێکۆشــەری تر بەدەســتی دیل کوژە دێرینــەکان شــەهید کران. بەداخەوە ئەوانەی بەندیخانــەی ڕایەت و ئاکرێ وەک خوشکی دکتۆر شوان گوتەنی: (گۆڕێکیان نییە کە کەسوکاریان بچێتە سەری).
هەوڵ دەدەم بە نۆرەی خۆم دیوە شــاراوەکانی تراژیدیای شــەڕی قەراســنج بۆ نەوەکانــی داهاتوو بنوســمەوە، بۆ ئەوەی پەنــد و عیبرەتی لێ وەرگرن، هەرگیز دەســت بۆ تاوانی ئاوەها نەبەن و کەپویان لە بۆنکردنی نزیک نەکەن.
لەهاوینــی ١٩٩١ لــەدوای ڕاپەڕین و کــۆڕە و، لە دەوروبەری قەسروماکۆســان، جارێکــی تــر بە بەکرجولا شــاد بوومەوە. لە دوو ڕۆژ پێش شــەڕی قەراســنج، هەشــت ســاڵ دەبوو نەمدیبوو. لــەدوای یەکتر لە ئامێزگرتن و هەواڵ پرســینی یەکتــری، لە بن کەپرەکەی دانیشــتین. کەوتینــە تەتڵەکردنی ئەو ڕۆژانەی لێک دابراین و سەرەخۆشــی (هاوکار)ی کوڕە چواردە ســاڵەکەی، کەوا ڕژێمی بەعس گوللەبارانــی کــرد، لــە بەهــاری ١٩٨٩. وە تەختکردنی ماڵەکەی بە شــۆفەڵ و دوورخســتنەوەی بــۆ ســەماوە و ئەو هەموو کارەســاتەی بەســەر ئــەو خێزانە تێکۆشــەرە داهاتبوو، لەو ماوەی لێک دابرانەمان. هاتینە ســەر شەڕی قەراسنج و تەســلیم بوونــی بە ڕژێمی بەعس. گوتم: هاوڕێ بەکــر، پێت وانەبوو لە نێوان تەســلیم بوون بە پێشــمەرگەکانی یەکێتی و ڕژێمی بەعس، گوللەی براکان نەرم تربوو؟!! گوتی: حازم، من کە تەسلیم بە ڕژێمی بەعس بوومەوە، هەڵبژاردن بوو لە نێوان دوو جۆری مردن. بە ئومێدی ئەوە نەبووم لەهیچ کام لەو دوانە گیانی سالم دەرببەم، بەڵام بیرم کردەوە: ئەگەر پێشمەرگەکانی یەکێتی وەکو هاوڕێیە شــەهیدەکانم گوللە بارانم بکەن، کەســوکارم بەشەرمەوە دەبوایە بڵێن: لەشەڕی براکان شــەهید بوو!! بەڵام ئەگەر بەعس بمکوژێ ئەوە کەسوکارم بە شانازیەوە باســم دەکەن. بیرم کردەوە کە بە درێژایی ژیانم، هەمیشــە دەردەســەری بووم بۆیان، با ئەگەر بۆ دوایین جاریش بێ شــانازی بەشــەهید بوونمەوە بکەن.
لەدوای ئەو دیدارە من چووم بۆ ســەری ســەفین، لەسەر لوتکەی سەفینە شێتی خۆشــناوان، دۆش داماوم، بیرەوەری ڕۆژانی تاڵ وەک پشتێن لەخۆی لول داوم. پێکەنینم ژەنگی گرتوە، لە قەراســنج و لە حوجران، دۆڵ بە دۆڵی ئەو ســەفینە دوو دەنــگ تێکــەڵ بــە یــەک بوینە. دەنگی دەســت ڕێژی گوللەی غــەدر لە بۆ

مــردن، لەگــەڵ دەنگی ئــازاد عەرەب بۆ ئاو بۆ ژیــان. دوو تابلۆ دێنە بەرچاوم: یەکیــان حەجــاج بە جامانە و جلی کوردی، یەکیان ڕیشــە ســپیە خوێناویەکەی لالە حەمە بۆ قومێ ئاو. هەر منداڵە حوجرانیەکە قەڵەمێکی دایە دەستم هاواری کــرد: ئەگــەر تــۆش وەک دیل کوژەکان ترســنۆک نیت، بۆم بنوســە: لە بناری ئەو ســەفینە پۆلێک ڕێبواری ئازادی لەگەڵ عیســا لە خاچ دران. دەی بنوســە، ئاخــۆ ئــەو تــەور زێنانە لە کوورەی چ مەنجەنیقێک بەمەســەد و هەســانی کامە قەســاب، دەمە زەرد و ســاو درابێ، بۆ کوفارەی خوێنی گەردنی براکان؟!! ئەو منداڵە بلیمەتە حوجرانیە هاواری کرد: دەی بنوســە لەو ئێوارە و لەو بەربانگی ڕەمەزانە، دیل کوژەکان بە خواردنی پزدان و ولاشــی دایکیان فتاریان کردەوە. ئێســتاش لغاوەیان بە خوێنە، ئێستاش کەڵبەیان بەخوێنە.

## بخنکێی دەتکوژم!!

ڕۆژێکیــان هەواڵێکمــان بۆ هــات، گوایە ڕژێم دەیــەوێ لەخەتی گونــدی هلوریا و شــنێ هێــرش بــکات. دوو مەفرەزەیان ڕێکخســت لەلایەن حیزبی شــیوعی و سۆسیالیســت. بەهــەردوو لا نزیکــەی ســی پێشــمەرگە بــوون. مەفرەزەکــەی سۆسیالیســت بە بەرپرســیاریەتی شــەهید دکتۆر ڕەشــید، مەفرەزەکەی حیزبی شیوعی من بەرپرسیاری بووم. لەوناوە بازرگانی جۆراوجۆر دەکرا، جەلەبی ئاژەڵ و تۆچا و گەلێ شتی تر. بڕیاردرا: ئێمە گومرک وەربگرین ئەگەر لەرێگای خۆمان بینیمانــن. لــەم بەری گوندی شــنێ بەکەڵەک پەڕینەوە بــۆ نێو گوند. لە دوای نان خواردنی نیوەڕۆ لە گوندەکە دابەش بوین، دوو، دوو چوینە پشــتی گوندی، سەرقەراغی زێیەکە، هەریەکە لە بن بەردێک دانیشتین. پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو زســتانان دەچووەوە، هاوینان دەهاتەوە ڕیزی پێشــمەرگە!! ئەوەندە ســادە بــوو، گومانــی هیچمان لــێ نەدەکرد. بەهاری ١٩٨٣ لە ســپی ڕێزی خەیلانیان، کەرێک و تفەنگێکی بەناوێ دادابوو، ئاو بردبوی. ئەو پێشــمەرگەیە ناوی شــێخ زادە بوو، دەمانگوت: لەوەتەی ئەو کەرو تفەنگەی بەناوی سپی ڕێزی خەیلانیان داداوە، بە زســتانان پێشــمەرگایەتی لە شێخ زادە نایەت. بۆیە زستانان تەسلیم

دەبێتــەوە. شــێخ زادە یەکێکــی قەڵــەوە بوو، خــۆی ڕووت کــردەوە، چوە ناو ئاوەکە مەلە بکات، مەلەشی چاک نەدەزانی. منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، زۆرم پێگوت: شــێخ زادە دەخنکێی یان پێشــمەرگەیەک بە خنکاندن دەدەی. شــێخ زادە هەر بەردەوام بوو، لێی تووڕەبووم، سوێندم خوارد تفەنگم سوارکرد، گوتم: بەخوێنی شــەهیدان ( گەورەترین ســوێندی پێشمەرگە بوو)، بخنکێی دەتکوژم.

هەموو دەســتیان کرد بە پێکەنین، گوتیان: ئەگەر خنکا چۆن دەیکوژی؟!!

لەو کێشمەکێشــەی شــێخ زادە تەواو نەببوین، قافڵە ئێســترێک هاتن بۆ ســەر زێیەکە، هەمویان باریان پێ بوو. بۆمان دەرکەوت بارەکەیان تۆچایە. بارەکانیان داگــرت بۆ ئــەوەی بەکەڵەک بیپەڕێننەوە ئەوبەری ئاوەکە. ســێ پیاویان لەگەڵ بــوو لەگــەڵ خاوەن ولاغەکان، کرێبارچی بوون. یەکیان لەســەرەوە بەتفەنگێکی برنــۆی وەســەت لەبن دارێک دانیشــت لەســەرەوەی ئێمە، وەک بۆ شــەڕ خۆی ئامــادە بکات، دیاربــوو خاوەنی بارەکان بوو، لەگــەڵ دوو پیاوەکەی لای ئێمە.

ئێمــەش پێمــان گوتــن: دەبــێ گومرگ بدەن بە شــۆڕش. ئەوەی لای ســەرەوە قیژاندی: پێشــی بارەکان بەردەن ئێوە چین؟!! پێمان گوت: ئێمە سۆسیالیســت و شــیوعین. گوتــی: گومــرگ نــادەم. کاروانچیەکانی لای من و شــەهید دکتۆر ڕەشید گوتیان: کاکە با کارەساتێک نەقەومێنێ، ئەوە کەرەپیاوە ئێوە نایناسن، با دەست نەوەشێنێ!!

لەکوردەواری کە بەیەکێکیان دەگوت: کەرە پیاو، واتە: بە عەنتەری ئیشی خۆی کردوە، دەســت وەشــێنە، شــەڕانییە، دەســت دا نادات، ئازایە. منیش زۆر بەو قســەیە تورەبووم گوتم: ئەوە کەرەپیاوە؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: نەخێر ئەوە کەر نییــە، ئێمە کەرین، ئەگــەر کەر نەبوینایە لەدەشــتی دزەییاتی هەولێرەوە چۆن دەگەیشــتینە ئێرە؟!! هاوارم کردێ: کورە وەرە خوارێ. گوتمە پێشــمەرگەکان، یاللە لێی بەســەرکەون. پێشــمەرگە لێی ئەولاو ئەولا بوون، هێنایانە خوارێ، بێ ئــەوەی یەک تەقە بــکات. هێنایانە لای ئێمە، گوتم: ناڵێم ئەوە عاقڵە!! ئەی بۆ دەڵێــن: کەرەپیاوە دەســت نادات؟!! پێم گــوت: دەی هەرچی زوە ئەو گومرگە بــدە. گومرگیــان لێوەرگرت. گوتی: وەرەقەم بدەنێ نەوەکو لەولاوە دوو نەفەری تر گومرگم بکەن. پێم گوت: ئێمە ئەو هەموو پێشــمەرگەین، ســەر لوتکەت لێ گرتبوین، چۆن دوو پێشــمەرگە تۆ گومرگ دەکەنەوە؟!! لەو مەفرەزە هاوبەشە،

دکتۆر ڕەشـــید باســـی چۆنییەتی بوون بە پێشـــمەرگەی خۆی بۆ گێڕامەوە، کە ئەویــش چیرۆکێکی تایبەتە پڕە لە گیانبازی کوردانە.

ڕۆیشتین بەرەو گوندی هلوریا، لەڕێگاکەدا کەونە ئاشێکی لێ بوو، پێش بگەینە کەونــە ئاشــەکە پێشــمەرگەیەکی سۆسیالیســت لەگەڵ دکتۆر ڕەشــید، بەناوی ســلێمانە ڕەش، بی کەی ســی پێ بوو، کەوێکی گەورەی کوشــت، برژاندی. دوو ســێ دار چنــاری لێبــوو، بەژیانم دارچنــاری وا گەورەم نەدیــوە، لەگوندی بلێی خەلیفــان دارچنــاری لێبــوو، ناوی کلــۆر بــوو کردبویانە حەمام، ئــاوی بەناودا دەڕۆیــی، بــەڵام ئاوا گەورە نەبــوو، ئەگەر چوار کەس دەســتی یەکتریان گرتبا لەو دارە نەدەســوڕایەوە. ئەوکات پێم گوتــن: کاک دکتۆر بچینەوە هەولێر ئەوە بگێرینەوە باوەر دەکەن؟!!

پێش بگەینە گوندی هلوریا، بەشەهید دکتۆر ڕەشیدم گوت: لەو گوندە دۆستێکی چاکم هەیە، پێشــتر لەگەڵ ملازم خدر ناسیومە، پیاوێکی وشیارو کوردپەروەرە، دەچینە لای ئەو. پێی دەڵێین: بەیانی نەفەر بنێرێ بۆ دێرەلوک. تا بزانین ڕژێم جموجۆڵی هەیە یان نا؟ هەروا بوو لەسەر پارەی خۆی نەفەری بەڕێکرد، هاتەوە گوتــی: هیــچ لە گۆڕێ نییــە. ئێمە یەک دوو ڕۆژ لەو ناوە جەولەمان کرد، دوایی بەکاک عەبدولمەجیدمان گوت: ئەگەر شــتێ لەرژێم زاندرا بە نیازی کۆکردنەوەی هێز ئاگادارمان بکات، ئەویش ئامادەیی خۆی نیشاندا، ئێمەش گەڕاینەوە بارزان.

# پەرژینی مەزاری نەمران لەبارزان

ڕۆژێکیان باوکم بەخۆی و ئامۆزاو براکانم و چەند پێشــمەرگەیەکی تر، خەریکی نوێکردنەوەی چەپەری دەورەی ئەو گۆڕســتانە بوون. چەپەری نەمابوو، ئاژەڵی ئەو خەڵکەی، یەکە، یەکە لەپاش چونی ئێمە بۆ بارزان دەهاتن بۆ ئەوێ، لەگەڵ چەند باربەرێکی بارەگاکانی ئێمە و سۆسیالیست دەچونە سەر ئەو گۆڕانە. باوکم گوتی: شتێکی جوان نییە، ئێمە لێرەبین و ئەو گۆڕستانەش ئاوابێ پەرژین بێت، بــا پەرژینــی بکەینەوە. بۆیە هاوڕێ عەزیز مەحەمەد ســکرتێری یەکەمی حیزبی شــیوعی، زۆر سوپاســی باوکمی کرد، گوتی: بەراســتی کارێکی زۆر چاکت کرد

مــام عەلــی. هاوڕێ عەزیز مەحەمــەد گوتی: مام عەلی، ئەو گۆڕەیان دەناســم، زۆر برادەرم بوو، ( بەنوســینی ســەر قەبرەکە ناسیەوە). ئێستا ئەو گۆڕستانە، بــە گۆڕســتانی نەمران ناونراوە لــە بارزان. ئەو پەرژیــن چاکردنەوەیە گەر ئێمە نەبوینایە، حەوت پشتی پێ دەژیا!!

بۆ زانین: ئەوکات مەزاری خوا لێخۆشــبوو مەلا مســتەفا و کاک ئیدریس لەوێ نەبــوو. لــە بــارزان خەیری گوتی: هــاوڕێ ئەبو حیکمەت دەڵــێ: هاوڕێ حازمم بــۆ بانــگ بکە. منیش چووم بۆ لای هاوڕێ ئەبــو حیکمەت. گوتی: ئەوە پارەت بدەمێ، (لەماڵی شــێخ لەتیف هاوڕێی پێشمەرگایەتیم بوو، ماڵی بە شێوەیەکی کاتی لەخانوی شــێخ عوســمان بارزانی بوو)، ژنێک لە دەشتی هەولێرەوە هاتوە ببێــت بــە پێشــمەرگە، قایلی بکە بچێتــەوە ماڵی خۆی، پارەی کرێی ڕێگاشــی بدەرێ. منیش چووم بۆ ماڵی شــێخ لەتیف، ئەوکات ســەید خەجیج (خوا لێی خۆش بێ) خێزانی بوو. ســڵاوم کرد، ئەو ژنە تەوقەیەکی پێشــمەرگانەی لەگەڵ کردم. ســەیری ڕوخســاریم کــرد، ژنێکی گەنج، تەمەن بیســت و پێنج ســاڵێک دەبوو، پاکەتی جگەرەی دەرهێنا، جگەرەیەکی دامێ، بەڵام کە جگەرەکێشــانی ئــەوم چــاو لێدەکرد، خۆم لەبەرچاوی دەکەوت، ئەو دووکەڵەی وا هەڵدەمیســی هیچی بەزایە نەدەچوو. پشــتی دەســت و باسکی چەند دڵێکی بەتیری قودرەتێ پێکراو لەسەر هەڵکەندرا بوو، بە چەند پیتێکی ئینگلیزی و چەند ئاخ و ئۆفێک، دەســتەکانی نەخشــێندرابوو، گوللەیەکی بەزنجیرێک لەملی کردبوو وەک مەدالیا شۆڕببوەوە نێوان مەمکە نیوە دیارەکانی

. ســەری پەنجەکانــی دەســتی و پێــی بەخەنە، ڕەنگــی بن کــراس و دەرپێیە بەســیمەکەی لەژێر کراســە ڕەشــە تەنکەکەی بەجوانی دەبینــدرا. مێیایەتی لە ڕوخســاری دەتکایەوە. هەتا بڵێی گفت و لفت خۆش، لێزان لەســەرنج ڕاکێشانی بەرامبــەر. لێــم پرســی: چۆنە هاتــوی بۆ ئێــرە؟ گوتی: هاتــوم وەک ئێوە ببم بەپێشــمەرگە. هاوڕێیانی پێشــمەرگە لەخوارەوە واتە: (لە قەراج و کەندێناوە و دەشــتی هەولێر) دەناســم. منیش گوتم: ناوی چەند هاوڕێیەکم پێ بڵێ؟ گوتی: هاوڕێ (ک، س، م س.،......). گوتم: بەســە گورگەکانت هەموو ژمارد، ئێســتا حاڵــی بــووم. بــەڵام ئێمە پێشــمەرگە وەرناگریــن، ئازووقە و خــواردن لێرە بە زەحمەت وەگیر دەکەوێ، دەبێ بڕۆیەوە بۆ هەولێر. کرێی ڕێگاشت دەدەمێ پێی

بچیەوە هەولێر. هاوڕێ شێخ لەتیف دەیگوت: خۆ لە چۆڵەوانیان لێی نەقەوماوە، نانێـک هــەر دەبێ بیخوا، هەتا نانێکم هەبێ لەگەڵی کەرت دەکەم، ئەگەر ئێرەی پێ خۆش بێ ئەوا ماڵ و حاڵی خۆیەتی. هەتا بە من و خوا لێخۆش بوو ســەید خەجیــج ڕازیمــان کرد بڕوا، قیر ســپی بوو. ئەو ژنە چوبوەوە دەشــتی هەولێر، لەوێ بۆ هاوڕێیانی گێڕابوەوە: پێشمەرگەیەک بەناوی حازم گوتویە بەسە حاڵی بووم، گورگەکانت هەموو ژمارد. ئەوانیش گوتبویان: بەراســتی لە نەبویەوە خوا تۆی داوەتەوە، پێمان ســەیرە هاوڕێ حازم و هاوڕێ شــێخ لەتیف چۆن تۆیان نەکردۆتە پێشــمەرگە و دڵیان هاتوە ئاوا بە ســوک و سانایی بەڕێت بکەنەوە!!

هاویــن بــوو، بارەگای لقی هەولێــر چەند کەپرێکیان لەســەر کانییەکی ڕۆژئاوای بــارزان کردبــوو. هەر یەکەیان کەونــە دەرگا، یاخود بە دار شــوێنێکی لەزەوی بەرزتریان بە قەدەر ئەوەی مارو و دووپشکی نەگاتێ، دروست کردبوو بۆ خەوتن. هەردیش دەرگایەکی کردبوە شوێنی خەوتن، مەترێک لە زەوی بەرزتر بوو. ڕۆژی پێشــوو خارە خولە و چەنــد هاوڕێیەک لەگەڵ پیاوێک تۆزێــک دەمەقاڵەیان لێ پەیدا ببوو، ناوی هەمزە بوو، پاش ماوەیەک لەگەلی بالندە جاشــە ڕێکانییەکان کوشتیان.

شەوێ بۆتانی ئامۆزام (حەرەس) پاسەوان دەبێ، خەو زۆری بۆ دێنی، بۆرژاوە دەســت دەداتە تفەنگەکەی دەڵێ: کێی زەلام؟ یەک ســەلیە دەســترێژی گوللە لەهەردی دەکات کە لەپێش بۆتان لەســەر شــوێنی خۆی خەوتوە، کاتێ هەردی لەخەو ڕادەپەڕێ بۆتان گوتی: دەســتی بەمل و ســنگی خۆی داهێنا بۆ ئەوەی بزانــێ چەنــد گوللەی پێ کەوتوە، دەڵێ: بۆتان دایکت گام، واتە (کوشــتمت)، لەوکاتــە خــارە خولــە وا دەزانێ کابرای ڕۆژی پێشــوە هاتۆتە ســەریان دەڵێ: نەڕۆی خۆڕی هەر لەو کاتە مام ئەســعەد کە بەهاوڕێ (گژۆ) ناســرا بوو، لەلای هێسترەکان دەگەڕێتەوە، تۆزێک زمانی دەگرێ لەقسەکردن، دەڵێتە خارەخولەی: ( ئەگەل لەگەلە منتە کولە خۆمانین). ئەوکاتە خارە خولە دەزانێ بۆتان تەقەی لەهەردی کردوە، دەڵێ: ئەوە ئێوەن یەکترتان کوشــت ســەگبابینە؟! دوو ســێ گوللــە بــە لێــوی دەرگای ژێــر خەوتنی هــەردی کەوتبوو، زۆر ســەیر بوو هیچ گوللەیەک بەهەردی نەکەوتبوو.

بارزان ناوچەیەکی زۆر قایم بوو بۆ پێشــمەرگە. لەپشــتەوە، چیای شیرین و سێ

لای تـری ناوچەکـە ئاوە.ەگەلی باڵندە لەلای ڕاسـت، ڕوباری چامە و شـێروان مـەزن، بەگەلـی سـولێ و ڕێزان دا دێتە خـوارێ. لەلای چەپ لە پێشـەوە زێی بادینان. تەنها بارەگاکانی حیزبی شـیوعی و سۆسیالیستی لێبوو.

بەحوکمـی ئـەوەی مـن کوڕە جوتیـار بـووم، پەیوەندیـم لەگـەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیـە باش بـوو. مەفرەزەیەکیان دامێ، دکتۆرەیەکـی ئافرەتی تێدابوو، زۆر بەڕێزو سـەنگین بوو. کچی یەکێک لە شـێخە عەرەبـەکان بوو. ئەو دکتۆرە زۆر خۆشەویسـت بوو لەناوچەکە، بەناوی: دکتۆرە سـاهرە. بەنیازی چارەسەرکردنی خەڵـک و پەیوەنـدی توندوتۆڵکردن لەگەڵ خەڵک لەزێـی بادینان لەخوار ڕێزان بەکەڵەک هەر سـێ، سـێ پەرینـەوە. بە گوندەکاندا دەگەڕایـن. لەیادمە ڕۆژێک کابرایەک هاتبوو بۆ لای دکتۆرە ساهیرە دەیگوت: دەبێ ئێستا دەرزیم لێ بدەن و عیلاجم بدەنێ.

دکتۆرەش هەر پێی دەگوت چیتە؟ کوێت دێشێ؟دەیگوت: هیچ جێگام نایەشێت، ئێستا تەندروستیم زۆر باشە، بەڵام دەترسم لەدوای ئێوە نەخۆش بکەوم، کەس نییە عیلاجم بکات، ئێوەش دەڕۆنەوە بارزان، بۆیە پێم چاکە ئێستا پێش ئەوەی نەخۆش بکەوم دەرزی و حەب و شڕوب و هەرچی هەتانە لێم بەکاربێنن. ئەگەر دکتۆرە ساهیرە حاڵی بوو، چونکە تۆزێک کوردی دەزانی، هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین، بەراسـتی کابرایەکی زۆر سەیربوو.

ئەو مەفرەزانەی حیزبی شیوعی دەیناردن بۆ خوارەوە، زۆربەی هەرە زۆری لەسەر دەستی یەکێتی کۆمەڵکوژ دەکران، وە ئەو مەفرەزانەش کە حیزبی سۆسیالیست دەیناردن زۆربەی هەرە زۆری دەبوون بەیەکێتی وەک ( عەبدوڵا بۆر، مام غەفور، عەریف عەلی، بورهان بلەیی، ...هتد) ئەوانە زۆربەیان بەرپرسـی هەرێم بوون و هەر یەکەیان شەسـت بۆ حەفتا پێشـمەرگەیان لەگەڵ بوو. پارتیش ڕۆیشـتنەوە بـۆ ئێـران، بۆیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەی جود لاواز دەبوو، یەکێتی بەهێز دەبوو، بەرەی جودیان بەسـەر ئێمەدا بەجێهێشـت. کەسیان خاوەنداریان لەوبەرە شەق و شـڕە نەکرد، هەتا سەری ئێمەی خوارد. یەکێتی گفتوگۆی لەگەڵ ڕژێم دەست پێکرد، خۆی تەرخان کرد بۆ پاکتاوی حیزبی شـیوعی.

لەپاش شـەڕی قرناقە و پشت ئاشـان، یەکێتی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی بەعس، ئێمە ڕۆژ تا ئێوارە گوێمان هەڵدەخسـت بۆ بڵاوکراوەیەک لەو بارەیەوە،

بـەلام حکومـەت هەر بە دوو وشـە باسـی نەکرد، سـاڵی ١٩٨٤ لە زۆر شـوێن سـەرهەڵدان و نارەزایەتـی دروسـت بـوو، بەتایبەتـی لەزانکـۆی سـلێمانی. چاکـم لەبیـرە: یەکێتی بەگێرەشـێوێن و تێکـدەری گفتوگۆ، باسـی کردن. ئەو خۆپیشاندانە لەسەر لەبەرکردنی جلی (جەیشی شەعبی) بوو لەزانکۆی سلێمانی، ئـەو هەڵوێسـتەی یەکێتی یەک لـە هۆکارەکانی ڕەوایەتی دروسـت بوونی ئاڵای شـۆڕش بـوو، کە حاجی مەمـۆ و زۆر لەوانـە هاتنە لای ئێمە لـە ڕێزان، بەڵام پێشـمەرگەکانی یەکێتـی لەسـەر قوتابیانـی زانکـۆی سـلێمانی شـەڕیان کرد. بەپێچەوانەی ڕاگەیاندنی یەکێتی، ئەوانەی کۆمەڵەبوون بەتایبەتی ئاڵای شـۆڕش لەپشت قوتابیان بوون.

مـن وەکو پێشـمەرگەیەک زۆر پێـی دڵتەنگ بووم، لەجیاتی پاڵپشـتی کردنیان بەو شـێوەیە باسـی خەڵکی ناڕازی بکرێ، کە خۆپیشـاندان بکـەن. لە میانەی گفت و گۆی یەکێتی و بەعس، مام جەلال بە گۆڤارێکی کوێتی ڕاگەیاند: سەدام حوسێن (حكم ليس خ سم) واتە سەدام ناوبژی کارە نەک دوژمن، ئەوە تەنانەت یەکێتیەکانیشی نیگەران کرد.

## ئەحمەدۆك

ئەوکاتـەی بارەگاکانمان لە بارزان بوو، کادیری جوتیارانی هەڵکەوتوی دەشـتی هەولێـر، هـاوڕێ مەلا نەفتە لەوێ بوو. لەگەڵ باوکم و مەلاجەلال و مام ئەحمەد دیلـە و، چەنـد بەرێزێکـی تر لەیەک خانوو دەژیان. لەبەرئـەوەی بە منداڵی من لەبەردەستی هاوڕێ مەلا نەفتە گەورە ببووم، هەرگیز بە حازم بانگی نە دەکردم، چونکە ئەو ناوەم لە پێشـمەرگایەتی بـۆ داندرا بوو. هەتا دەنگی تێدابوو بانگی دەکردم: کـورە ئەحمەدۆک، وەرە. زۆرجار هاوڕێیان ڕەخنەیان لێدەگرت، پێیان دەگوت: بۆ ئاوا بانگی هاوڕێ حازم دەکەی؟ بەڵام من لەزەتی سـەدو یەک شـتم لـەو ئەحمەدۆکەی هاوڕێ مـەلا نەفتە دەبینی. جارێکیان باوکم و هاوڕێ کانەبی و هاوڕێ سـالار، پێشـمەرگەیەکی سۆسیالیستیان فێرکردبوو لەپێش هاوڕێ مەلا نەفتە، بڵێ: گۆرانی حەسـەن زیرەک خۆش نییە. ئەویش نەیدەزانی هاوڕێ مەلا

موریـدی دەنگی حەسـەن زیرەکـەو لەگەڵ گۆرانیەکانی جـەزم دەبێ. ئەو کوڕە هەر ئەوەندەی خۆش بوو کە بابم و کانەبی سـەری باسـی حەسەن زیرەکیان بۆ کـردەوە، گوتی: من گۆرانیەکانی حەسـەن زیرەکـم پێ خۆش نییە. هاوڕێ مەلا گوتی: پێم سەیرە تۆ بۆچی و چۆن بویتە پێشمەرگە؟!! ئەوەی حەسەن زیرەکی پێ خۆش نەبێ پێشـمەرگایەتی پێ ناکرێ، رۆڵە تۆ هەستی شۆڕشگێڕیت نییە، ئەگەر نا چۆن حەسـەن زیرەکت پێ خۆش نابێ!! ئیدی بوو بە پێکەنین.

# یەکێتی داوای ڕێکەوتنی کرد

بارەگاکانمـان لـە بارزان بـوون، کانەبی گەورە ئـەوکات فەرماندەی سـەربازی بەتالیۆنی پێنج بوو، من و شەهید عەونی و چەند برادەرێکی تری ئاگادار کردەوە، کەوا شـاندێکی یەکێتی دێت بۆ بارزان، بۆ ئەوەی ڕێکەوتنێک مۆر بکەن، لەگەڵ حیزبـی شـیوعی. شـاندی یەکێتی پێکهاتبوو لـە: ئازاد هەورامـی، حەمەباقی، مەحمـود موکری، هونەرمەند فەرەیدون دارتاش. وەفدی دانوسـتانکاری حیزبی شـیوعی پێکهاتبوو لـە: ئەبوحیکمەت، ئەبو فاروق. ئێمە وەک پێشـمەرگە هەر ئەوەندەمـان لەسـەربوو، پێشـوازی و بەدرەقەیان بکەین، ئەگەر نـا نە لەکاتی کۆبوونـەوە، نـە لەدوای کۆبوونەوە، هیچیان بـە ئێمە نەدەگوت. من بە بۆچونی خـۆم، پێم وابـوو یەکێتی دەیویسـت بەجیا لەگەڵ حیزبی شـیوعی ڕێکەوتنێک بـکات و پارتـی پەراوێـز بکەن. پارتیش نە کەسـیان لەوناوە هەبـوو، نە وەک ئێمە هەر ڕۆژەو توشـی شـەڕێکی نەخوازراو دەبوون لەگـەڵ یەکێتی. بەڵکو لە ئێـران خەریکی خۆ بەخێوکردن بوون، بۆیە ئەو شـەڕەی پێشـمەرگەکانی ئێمە توشـی دەبوین، لە بەرژەوەندی پارتی بوو. وەک لەسـەرەوە باسم کردوە ئەگەر پێشمەرگەی پارتی لە ناوچەی بارزان هەبوایە، بۆ باوکم دەچوو گۆڕستانی بارزان چیلـە بکاتەوە؟!! بۆیە پارتـی هەموو هەوڵی خۆی دەدا، ئەو ڕێکەوتنە نەکرێ. لەهەمـان کات ئێمـە باجەکەمان دەدا. پارتی نەدەهات، لەگەڵ ئێمە پێشـمەرگە بـەرێ بکات بۆ دەشـتی هەولێـرو کۆیە و بەڕانەتی و قـەراج و کەندێناوە. بۆیە نەدەهاتە دانوستان، ئەوەی دەگوزەرا بەدڵی پارتی بوو، بەڵام بەدەستی نەبوو.

حیزبی شیوعیش بەدەنوک پێوە ببو. ئێستاش لە بیرمە شەهید عەونی زۆر تووڕە ببوو لە ئەبوفاروق کە لەپێش دوکانەکانی بارزان خەریکی بەرێکردنی وەفدەکەی یەکێتی بوو، ئێمەش تۆزێک لەدوور وەستابوین. هەتا ئەو وەفدەی بەرێکرد، خەریکی داخستنی دوگمەی لای سەرەوەی کراسەکەی بوو، کە دەیویست چڵکی پشت ملی کراسەکەی بشارێتەوە. پێم وابوو وەفدەکە گەیشتبوە بلێ و ڕێزان، ئێستاش ئەو دوگمەی بۆ دانەخرا، شەهید عەونی دەیگوت: دەڵێم بچم بۆی داخەم.

# سەختی ژیانی بارزانییەکان

ڕۆژێکیان دەچووم بۆ بارەگای قاتم، بەرپرسەکەی خوا لێخۆشبوو ئەبو سیروان بوو، دەمانچەیەکی بەقەدەوە بوو. منیش کوڕە گەورەکەم تەمەنی شەش بۆ حەوت ساڵان بوو، لەگەڵم بوو. کە چاوی بە ئەبوسیروان کەوت، گوتی: بابە ئەوە بەرپرسی ئێوەیە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئەی بۆ ئێوە ئەو چەکە گەورانەتان پێیە؟ ئەوەش بەرپرسە ئەو چەکە بچوکەی پێیە؟!! وایدەزانی ئەوەی بەرپرس بوو، دەبێ بەگوێرەی بەرپرسیارێتی چەکەکەشی گەورە بێ.

لەناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی، لەروی پێشمەرگایەتی بەرپرسیاریەتی بەگوێرەی شارەزایی سەربازی نەبوو، بۆ نمونە: یەکێکیان دەکرد بە بەرپرسی سەربازی چەند بەتالیۆنێک، کە نەیدەزانی کلاشینکۆف پاک بکاتەوەو لەسەریەکی دەربێنێ و خڕی بکاتەوە سەریەک.

چەند دەمانچەیەکی نوێمان لە قامیشلۆ بەدەست گەیشتبوو، یەکێکیان لای ئەو بەرپرسە سەربازیە بوو کە بەرپرسی هەموو پێشمەرگەی ناوچەی هەولێربوو. بەزۆری تەقەیەکمان پێکرد!! گوتی: جارێکی تریش تەقەیەکی ترم کردوە. لەگەڵ شەهید عەونی سەیری یەکتریمان کرد پێکەنین، گوتم: عەونی بەراستی پەرۆشی خۆمانمە!! بەرپرسی سەربازی لەو جۆرەمان هەبێ، لەسەر بنەمای پلەی حیزبی بەرپرسی سەربازی دابنرێ نەزانێ تەقە بکات؟!! بەپێچەوانەوە بەرپرسە سەربازیەکانی یەکێتی لەریزی پێشەوەی شەڕەکان بەشداربوون و شەهیدیش دەبوون، بۆ نمونە: چەندان ئەندامی مەکتەبی سیاسی لەشەڕەکانیان

شــەهید بــوون، ئێمە ملازم خدرمــان هەبوو، ئەویش ناچارکرا بچێتەوە ســوریا.
ئێمە بەرپرســە ســەربازیەکانی وەک ئامر بەتالیۆن و ســەرلق و ســەر پەلەکان هەموو پیاوی ســەربازی و ئازابوون، بەڵام بەرپرســە ســەربازیە باڵاکان، لەسەر بنەمای حیزبی دادەندران کە ســەربازی نەبوون، لەسەربازی شتێکیان نەدەزانی، هەرچەندە سیاسی بوون و خەباتگێربوون.
رۆژێکیان برادەرانی سۆسیالیســت کە بەناو دەیانناســم لەنزیک گۆرستانی بارزان بەسەر لاشەی بەرازێکدا کەوتبوون، گۆشتەکەیان هێنابووەوە بۆ بارەگای خۆیان، لاشەکەشــی لەوێ بەجێمابوو. ئەو کارە زۆر بەســەر حیزبی شــیوعی شکایەوە، لەتەواوی ناوچەکە بڵاوبووەوە. گوایە شــیوعیەکان بەرازێکیان خواردوە.
وردە، وردە خەڵک لەژێر دەسەڵاتی بەعس بەتایبەت ژنە بارزانییەکان دەهاتنەوە ناوچەکە، کە پیاوەکانیان گیرابوون، وە هەندێکیان لەدەست رژێم دەرباز ببوون.
ئێمــە بەگوێرەی پێویســت یارمەتیمان دەدان، ئەو شــێرە ژنانــە بە کەنگرۆک و قــەزوان و زۆر شــتی لــەو بابەتە خۆیان دەژیانــد و منداڵەکانیان گەورە دەکرد.
جــاری واهەبوو چەندین بەڵێنیان دەدایــە منداڵەکانیان، کە فڵان جلی بۆ بکرن، وە یا فڵان پێڵاوی بۆ بکرێ بەپارەی کەنگرۆک و قەزوان، بەلام بەیەک تۆپباران ئەوهەمــوو خەونــە جوانــەی منداڵەکانی ئــەو ناوچەیە، دەبوونە بڵقی ســەرئاو.
هەرچــی کەنگرۆک و قەزوان هەیە دەســوتا، تەنها ســوتماکێکی رەشــی لەپاش خۆی بەجێ دەهێشــت. هەروەک مێژوی بەعسیەکان.

# راوچیەکی خراپ نەبووم

کۆتایــی پایــزی ١٩٨٤ لــە بــارزان، جارجارە دەچوومــە چیای شــیرین بۆ راو.
شەهید کانەبی گچکە کە خەڵکی یەک گوندبوین و منداڵی یەک قوتابخانە بوین، هەمــوو جارێ دەیگــوت: هەواڵم هەیە بزنەکێــوی زۆر راو دەکەی، بەلام جارێک ئێمــەت بانــگ نەکرد. بۆیــە بریارماندا مــن و کانەبی و هەڵکەوت و ســیامەندی حەمەدەگەورە و پێشــمەرگەیەکی تر کــە ناوەکەیم لەیاد نەماوە، بچین بۆ چیای شــیرین بــۆ راوکــردن. هەریەکــەی پەتۆیەک و نــان و خواردنی هــەر پێنجمان

لەگـەڵ شـەکرو چا لە وڵاخێکی بـارەگای خۆمان بارکرد. دووربیـن و تفەنگمان دەسـتدایە، بـۆ دوای نیوەڕۆ بەڕێکەوتین، من شـارەزا بووم. لەو ئەشـکەوتەی دەکەوێتە سەرەوەی گوندی هۆستان، گەلی سولێ، (ئەشکەوتێکی زۆر گەورەیە) شـتەکانمان دابەزاند، من گوتم: دەڕۆم، شـوێنێکی زۆر عاسـی و هەڵدێر هەبوو زۆرجـار بزنەکێویم لێ دەبینی. هاوڕێیانیـش هەریەکەی بۆ لایەک دابەش بوون، هـاوڕێ هەڵکـەوت و هاوڕێ سـیامەندو یەکێکی تر، هـاوڕێ کانەبی گچکە لەبەر وڵاخەکە و شتومەکەکە لە ئەشکەوت مایەوە. لای ئێوارە بەدووربین سەیرم کرد، دوو سـێ بزنەکێوی هاتنە خوار لە ترۆپکی چیای شـیرین. کە نزیک بوونەوە من لەبەرئەوەی نەمبینن هەندێک لاولاوەم لەسەرم پێچابوو، سێرەم لە یەکیان گرت، پەنجەم لە پەلەپیتکەدا، پێکام. بەلام کەوتە شوێنێکی ئەوەندە ئاستەم و هەڵدێر بەتەنیا هێنانەوەی ئەسـتەم بوو، بۆیە بانگی هاوڕێ سیامەندو ئەوانی ترم کرد. هاتن بەهەزار پێچ و پەنا هەتا ئەو توشتیرەمان هێنایەوە. لە ئەشکەوت بردمانە لای هاوڕێ کانەبی، گوتی: با نیوەی ئێسـتا بکەینە ئاوگۆشـت، واتە تەشـریب. نیوەکـەی تری بەیانی دەیبرژێنین. گەڕاین، کۆنە مەنجەڵێک کە لە بەر پیسـی، هێندەی دەسـتم ئەستورببوو!! هاوڕێ سـیامەندو هەڵکەوت بەخیزو ورتکەبەردو قوڕاو شوشـتیان. ئاوی گۆشـتمان خواردو لە ئەشکەوت لێی خەوتین تا بەیانی. بۆ بەیانی، ڕۆیشـتین بۆ شـوێنێک کە هەر بۆ خۆمان ناومان لێنابوو ملەحوشتر، وەک ملەحوشـتر وابوو، کانییەکی زۆر خۆشـی لێبوو، بارگەو بنەمان لێخسـت، بەشیشـکە تفەنگ کەوتینە گۆشت برژاندن، هەتا کۆتا پشکی گۆشت.

بـارەگای لقی قەرەچوغ، لەخوار گوندی هۆسـتان بـوو، زۆرجار کە دەچووم بۆ ڕاو، بەلای هاوڕێیانی قەرەچوغدا تێپەڕدەبووم. ڕۆژێکی زۆر سـارد بوو، خەریک بـوو بەفـر ببارێ، هاوڕێیانی قەرەچـوغ بەتایبەتی هاوڕێیانـی عەرەب، گوتیان: هـاوڕێ حـازم، ئەمـڕۆ هەرچی کوشـتت بۆ ئێمەیـە. لەبەختی ئـەوان هەر زوو بەرازێکـی زۆر گەورەم کوشـت، بەفر دەسـتی بەکرێوە کردبـوو. گەڕامەوە لای بـارەگا، گوتم: هاوڕێیان وەرن، سـیامەندی حەمەدەگـەورەو ئەبو احرارو ئێزۆو دوو سـێ هاوڕێی تر لەگەڵم هاتن، بۆ ئەوەی شـوێنی بەرازەکەیان نیشان بدەم. بەفر دەباری، هەر زوو ئێزۆی برای ئەبوحەیات ورگی لێ فڕێدا، لەگەڵ سیامەندو هاوڕێیـان هێنایانـەوە. لەلای چێشـتخانە لەژێر بەفریان نا، دوایی زانیم سـەرو

پێشیان خواردبوو. چایەکی گەرمم لە بارەگای قەرەچوغ خواردو ڕۆیشتم، لەبەر بەفربارین بەپەلە خۆم گەیاندەوە ماڵ.

لقی قەرەچوغ مەفرەزەیەکیان بەڕێکردبوو بۆ دەشــتی قەراج و کەندێناوە، یەک لەو پێشمەرگە قارەمانانە شەهید گیڤارا بوو. سێ مانگ دەبوو لەخوارەوە بوون، کــە ئەوکات دەبوایە خۆیان لەشــەڕی حکومــەت و یەکێتی بپارێزن، ئەوەش زۆر ســەخت بوو. بۆیە هەمیشــە توشی زیانی زۆر دەبوون. گەڕانەوە، شەهید گیڤارا ئاراســی کوڕمی زۆر خۆشدەویســت، هاوینی پێشوی لە یاد نەچوو بوو، ئاراسی کــوڕم منــداڵ بوو، بەهۆی مێشــوولەوە چی بەســەرهاتبوو، ئەو شــوێنەی ئێمە مێشــوولەی بەناوبانگ بوو. گیڤارا، لەدەشــتی هەولێــرەوە کوللەیەکی بۆ ئاراس کڕیبــوو، لەناو کۆڵەپشــتەکەی نابــوو بۆی هێنایەوە، دەیگــوت: منداڵە بەرگەی مێشوولە ناگرێ.

# ناپاکی مەمۆ

مامەند ئیســماعیل (داڵداغانی) ناســراو بە مەمۆ، لەســاڵی حەفتاکان کادیرێکی حیزبــی شــیوعی بوو. کــە هێرش کرایە ســەر حیــزب دیارە خۆی فرۆشــتبوو. ســەرکردایەتی حیزب شــتیان لەســەری هەبوو، بەڵام ئێمە هیچمان لەو بارەیەوە نەدەزانی. لە هاوینی ١٩٨٢ ڕۆژێک لەگوندی (نێرەگین)ی دەشــتی کۆیە بینیم، لەگەڵ سۆسیالیســت بوو. شەهیدان قالەی مەلا سابیری (تەتەراوەی) ناسراو بە بێکەس، (لە شۆڕشــی ئەیلول کادیری پارتی بوو، لەناوچەکەی ئێمە). پاشــان لەهەولێر شوێن بزر کرا تاوەکو ئێستا. لەگەڵ جەمال شینە ( کەدوایی لە سێدارە درا). دوای چاکوچۆنی، مەمۆ گوتی: لەگەڵ سۆسیالیســت پێشــمەرگەم، دوایی نازانــم چی لــێ بەســەرهات، نەمبینییەوە. هەتا لە بارزان ســێ چوار گیســکی کڕیبوو دەعوەتێکی گەورەی هاوڕێیانی کرد، من قەت نەمبینیوە کەســێک بیەوێ ببێتە پێشمەرگە دەعوەت بکات!! (دەمانچەیەکی چواردەخۆری مخابەراتی لەبەر پشــت بــوو، بەس ڕەفیــق حیزبیەکان لــەو جــۆرە دەمانچانەیان پێبــوو). ئەبو حیکمەت زۆر نابەرپرســیارانە کە پێشــینەی ئەو خائینەی چاک دەزانی، کردیە

بەرپرسی گواستنەوەی هاوڕێیان، لەناو هەولێر بۆ دەرەوەی شارو بەپێچەوانەوە.
لەوکاتەدا: عەباس مەحەمەد سەرلق، بڕیار سەرپەل، داود سەرپەل، سەرباز سەردەستە، عادل، دڵشاد، دلۆڤان، فکرەت.
لەپایزی ١٩٨٤ کۆی گشتی بیست و چوار پێشمەرگە لەناو شاری هەولێربوون، بۆ چالاکی گیان بازانە کە ئەوانە هەموویان پێشمەرگەی شەڕی دەستەویەخەبوون، بژاردەی بەتالیۆنی (پێنج) و کەرتی هەولێر بوون. کەسیان نەبوو لەدەیان چالاکی بەشداری نەکردبێ. مەمۆ کرابوو بە بەرپرسی گواستنەوەیان لەهەولێر، بۆ ناوچەکانی ژێردەستی پێشمەرگە. ڕۆژێک مەمۆ پەیوەندیان پێوە دەکات و پێیان ڕادەگەیەنێت، دەبێ بیانگوازێتەوە بۆ بارەگاکانی حیزب لە شاخ، ماڵێک لە (حەی عەدالە)، ماڵی (حسێن زیل)چۆڵ دەکەن بۆ ئەم پیلانە گڵاوە. شوفێری تاکسیەکە شەربەتی بێ هۆشکەر ئامادە دەکات، ئەوشۆفێرە ئەفسەرێکی دیاری دائیرەی ئەمن بوە، بەناوی نەقیب عەبدوڵلا. یەک، یەک دەیانگوازێتەوە بۆ ئەو ماڵە. لەوێ شەربەتی بێهۆشکەریان دەداتێ، هەر کە بێهۆشبوون، ڕایان کێشاون بۆ ژوورێکی تر. چونەتەوە دوای پێشمەرگەیەکی تر، بەم شێوەیەهێناویانن. تا دوا کەسیان تەسلیم بە دائیرەی ئەمن دەکەن. زۆربەیان لە سێدارە دران. ئێمە بەو پۆلە شەهیدە، گورزێکی گورچکبڕمان بەرکەوت، هەموویان دۆست و برای زۆر خۆشەویستم بوون. کاریگەری ڕۆحیی لەسەر من دانا، مەگەر گۆڕ ئەوانەم لە بیر بباتەوە.
لەکاتێکدا کە ئەو شەربەتە بێهۆشکەرە دەخۆنەوە، هاوڕێیەکی عەرەب بەناوی (فکرەت) یەکسەر دەڵێ: ئەو شەربەتە بێهۆشکەرە، لەتامی شەربەتەکە دەزانێت، دەڵێ: ڕیفاق مخەدر!! ڕادەکات بەسەر دیوار ئاودیو دەبێ، دەچێتە ماڵێک لە هۆش خۆی دەچێت، ئەو ماڵە نازانن مەسەلە چیە، بێ ئاگا یەکسەر پۆلیس ئاگادار دەکەنەوە، پۆلیس دەیبەنە نەخۆشخانە، کاتێ بە ئاگا دێتەوە، پۆلیس بەسەر سەریەوە وەستاون. لەوکاتە دائیرەی ئەمن هەموو پۆلیس ئاگادار دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هەڵاتوەکە بدۆزنەوە.
بەو شێوەیە مەمۆی ناپاک و ئەمنەکان دەگەنە نەخۆشخانە، هاوڕێ فکرەت دەستگیر دەکەن، (کە خەڵکی سەورەی بەغدا بوو، هاتبوو ببوو بە پێشمەرگە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە شەرەف و کەرامەتی مەمۆ بکات کە نەی بوو؟). کاتێ

فکرەت هاواری کرد بوو ڕیفاق مخەدر، یەکسەر سەربازو عادل دەستیان دابوە چەکەکانیان و تەقەیان لە ئەمنەکان کردبوو، دوو ئەمنیان بە سزای گەل گەیاند، بەڵام بەداخەوە ئەو دوو قارەمانە گیانبازە شەهید دەبن. پاشان نۆرەی عەباس مەحەمەد چۆمە زەردەرەیی دێت، هاوڕێ عەباس سەرلقی ئێمە بوو لەدەشتی هەولێر، هاوڕێ عەباس پیاوێکی زۆر ئازا و لەخۆبوردوو بوو، کە چاوی بەو شوێنە کەوتبوو لەحەی عەداله گومانی پەیداکردبوو، نەچووبوە ژوورەوە شەربەتەکە بخوا، لەدەرەوە مابوەوە هەندێک جوڵەی نائاسایی بینیبوو. بۆیە ئەمنەکان تەقەی لێ دەکەن، ئەویش تەقەیان لێدەکاتەوە و شەهید دەبێت. ئەو پۆلە پێشمەرگەیە پاش چل و هەشت کاتژمێر، هەمویان دەبەنە بەغداو لەدادگای بەناو شۆڕش (محكمه السوره) سزای لەسێدارەدانیان بەسەردا دەسەپێنن.

دەگێڕنەوە کە شەهید داود، تفی لە عەواد بەندەر کردوە، زۆری جنێو بە عەواد خۆی و سەدام داوە. شایەنی باسە تەنها پێنج کەسیان سزای زیندانی هەتا هەتایی دران. دوایی بەر لێبوردنی گشتی کەوتن ئازاد کران. دوای چەند مانگێک مەمۆ بەرپرسی ڕێکخستنی حیزبی شیوعی خالیدی نانەواو پێشمەرگەی لقی خۆشناوەتی هاوڕێ هەڵۆ بەگرتن دەدا، لە دائیرەی ئەمنی هەولێر، پاش ئەشکەنجەدانێکی زۆر لەگەڵ چواردە پێشمەرگەی لەسەرەوە ناومان هێنان لەسێدارە دران. دوایی مەمۆ لەبازگەی کانی قرژاڵە پێشمەرگە، ساڵح مەحەمەد دەستگیر دەکات و تەسلیمی ئەمنی دەکەن. پاش ماوەیەک مەمۆ دەزانێ کادیری حیزبی شیوعی پێشڕەو بەڕانەتی کە دوو برای شەهید بوون لە ماڵی عوسمانە سور خۆی حەشار داوە بۆ کاری حیزبی. مەفرەزەیەکی ئەمن دەباتە سەری و پاش شەڕکردن، دوو ئەمن دەکوژرێ، پێشرەو شەهید دەبێ و عوسمانە سور ڕادەکا دەربازی دەبێ.

جێگەی باسە شەهید و قوربانییەکانی دەستی مەمۆی ناپاک، هێشتا هەموی بەوردی نەزاندراوە، زۆر شت بەنهێنی ماوەتەوە، ئەوەبوو دوای هەژدە ساڵ، تەرمی پیرۆزی یازدە شەهید لە گۆڕستانی ئەبوغرێب دۆزرانەوە.

# چاوەڕوانییەکی بێزارکەر

لەبارزان ئەگەر خێزانی پێشمەرگەیەک لەشارەوە هاتبایە، ئەو هاوڕێیە چەند کەسێکی نزیک لەخۆی و خانەوادەکەی بانگ دەکرد، بۆ ژەمە خواردنێک. کە لەشار لەگەڵ خۆیان دەهێنا، ماوەیەک بوو ئەمیرەی خێزانی هاوڕێ کانەبی هاتبوو، لەگەڵ خێزانی هاوڕێ هەڵمەت، لەخانویەک پێکەوەبوون. چەند ڕۆژێک بوو، وەرزی هاوین بوو، هاوڕێ مەلا نەفتە خێزانی بە ناوی هەیبەت هاتبوە لای.
یەکەم ڕۆژ بوو بە باوکم و چەند هاوڕێیەکی تری گوتبو: بۆ نان خواردنی ئێوارە لەلای من بن، لەو خانوەی هاوڕێ کانەبی تێدابوو، برادەرەکانی هاوڕێ مەلا نەفتە بریتی بوون لە: باوکم و کانەبی و هەڵکەوت و هاوڕێ سالارو چەند کەسی تر، بەمنیشی گوت: کورە ئەحمەدۆک ئەتوش وەرە. هاوڕێ مەلا نەفتە لەمێژبوو هەیبەتی نەبینیبوو، زۆریشی خۆش دەویست، بەخۆشەویستی هێنابوی. شوان بوو،کاتێک حەزی لێکردبوو، باوکی هاوڕێ مەلا ناوی حاجی برایم بوە، بۆیە هاوڕێ مەلا بەگۆرانی گوتبوی: (بۆم بڵێنە حاجی برایمی بێ بگاتە مەڕومالی.. لەبەرچاوی هەیبەتی دەستم ناگرێ گۆپالی). لەپاش نان خواردن، لەسەربان دانیشتبوین، پلیکانی لەژوورەوە بوو بۆ سەربان. باوکم و هاوڕێ کانەبی و هاوڕێ سالار تەگبیریان کردبوو، درەنگ هەڵبستن. هەر لەدوای نان خواردن، هاوڕێ مەلا هەڵدەستا بە پلیکانەکان دەچوە خوارەوە لای ژنەکان، دوو سێ قسەی لەگەڵ هەیبەتی هاوسەری دەکردو دەهاتەوە سەرەوە، وەک پێمان بڵێ: تێرتان خوارد، دە هەڵسن، بڕۆن، بۆم چۆڵ بکەن. بەڵام، باوکم و هاوڕێ سالارو هاوڕێ کانەبی و هەڵکەوت چەند برادەرێکی تر، سەیری یەکتریان دەکردو پێدەکەنین، ئەو بابەتەی باسیان دەکرد دوورو درێژیان دەکرد، وەک کەس چاوەڕێی هیچ نەبێ. ئەو ژنانەی لەخوارەوەبوون هەمویان جلیان ڕەش بوو، بە هەیبەتیشەوە. ئەگەر سەیری ڕوخسارت نەکردبانایە لەیەک دەچون. باوکم ڕوی لەهاوڕێ کانەبی کرد، ڕووداوێکی ناو کۆمەڵگای کوردی بۆ گێڕایەوە: گوایا لەگوندێک کوڕێک دڵی بەکچێکەوە بوە، چۆتەماڵی باوکی ئەو کچە. لەکوردەواری، کوڕ پێی خۆشە لەبەرچاوی ئەو کچەی خۆشی دەوێ، ئازایەتیەک بنوێنێ، لەچاپوکی

و تەڕدەسـتی بوێری و زۆر شـتی تر. لەکاتێک لەسـەر سـەکۆی ناو حەوشـە دانیشـتبوون، یەکێ هاوار دەکا، دەڵێ: بگەنێ گۆلکەڕەش مردار دەبێ. هەر بە بیسـتنی ئەو هەواڵە، کوڕە دەڵـێ: کێردێکم بدەنێ. کچە گورج کێردی (چەقۆ) ی بۆ دێنێ. ئەویش ڕادەکات شتێکی ڕەش لەوێ کەوتوە، خشت سەری دەبڕێ. کاتێک دەستی دەشواو دڵ خۆشە، کە نەیهێشتوە گۆلک مرداربێ، دەچن فانۆس دەبەن. سـەیر دەکەن، گۆلک مرداربوەو جاشـکێکی ڕەشی لەجیاتی گۆلک سەر بڕیوە!! بۆیە باوکم گوتی: کاکە با بڕۆین، هەتا هاوڕێ مەلا لەخوارەوە جاشـکی سـەر نەبڕیوە و گۆلک مردارنەبوە، دوایی ئێوە زەرەر دەکەن.

هاوڕێ مەلا نەفتە کادیری خۆراگرو کۆڵنەدەری جوتیاری دەشتی هەولێر، ناوێک زۆربەی جوتیارانی دەشـتی هەولێر پێی ئاشـنان، قسە لەڕوو خاوەن هەڵوێستی تایبەت بەخۆی.

بۆنمونـە: لـەدوای شۆڕشـی گەلانی ئێـران، کاتێک بارەگاکان لەخـڕی ناوزەنگ سـنوری دەسـتکردی (ئێران- عێراق) بوون، ڕۆژنامەنوسـێکی بیانی ڕوو دەکاتە کەپرە بچکۆلەکەی هاوڕێ مەلا نەفتە، پرسـیاری لێ دەکات: ڕات چیە بەرامبەر شۆڕشی گەلانی ئێران و دەستبەسەراگرتنی لەلایەن ئاخوندەکانی ئێران؟ هاوڕێ مەلا دەڵێ: دەتوانم بڵێم (فاشـیەت و دیکتاتۆری لە ئێران لەدایک بوو). پاشان بوو بە هەڵڵا لەلایەن بەرپرسـانی حیزبی شـیوعی، پێی دەڵێن: چۆن دەبێ ئاوا وەڵامـی ئەو ڕۆژنامەنوسـە بیانییـە بدەیتەوە؟!! ئەوە هەڵوێسـتی حیزب نییە. هـاوڕێ مـەلا دەڵێ: ئەوە هەڵوێسـتی خـودی خۆمە نەک حیزب، هەرواشـم بە ڕۆژنامەنوسەکە گوتوە.

کە من کەسـێکی سـەربەخۆم، لە ڕادەربڕینی خۆم. دوارۆژ دیاری دەکات چی بەسـەر حیزبی تودەو چەپەکانی ئێران دا دەهێنن.

کـە ئێمە چوینە خوارەوە، دیاربـوو هەیبەت بەهاوڕێ مەلای دەگوت: دوو ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە، هاوڕێ مەلاش دەیگوت: هێشـتا (بسـم اللەمان نەکردوە) ئەتۆ لـۆ مردنـم نیشـان دەدەی؟!! دوو ڕۆژ تـەواو بـوو هـاوڕێ مەلا کێچـی کەوتە کەوڵـی. هاوڕێیـان دەیانگـوت: هـاوڕێ مەلا چۆنـی؟ دەیگوت: (گـووم) چۆنم هەبلان دەگەڕێتەوە بەجێم دێڵێ. یەک ئۆتۆمبێل هەبوو کە دەهاتە بارزان، ناوی شـۆفێرەکە فاریح بوو، بەیانی باشم لەهاوڕێ مەلا کرد، گوتی: وەرە ئەحمەدۆک

فەرمانت پێ دەکەم، ئەتۆ چ کادیرێکی سەربازی هەی عەمرت نەمێنێ، بە کانەبی و هەڵکەوت بەتۆشـــەوە نەتوانن ئەو شۆفێرە تەمبێ بکەن، هەبلانی لەگەڵ خۆی نەباتـــەوە!! یـــان ئۆتۆمبێلی لێ پەنچەر بکەن، ئەو سـمێڵانەی تۆم پێوەبێ خۆم لە زەلامی تورە بکەم، دەبێ میزی بەخۆیدا بکات. بەو دەســـتانە تۆم پەروەردە کـردوە، ئەوەندەم لـێ بکە، بە کانەبی و هەڵکـەوت و زۆر لەهاوڕێیانی دەگوت: مەهێڵن ئەو ئۆتۆمبێلە هەیبەتێ بەرێتەوە شـاری.

## سیاسەتی حیزبێ مە

لـەدەرەوەی بـارزان کەپرمـان کردبوو، هاوڕێ کانەبی و حاجـی جەمال و چەند برادەرێکی تر لەکەپری ئێمە دانیشـتبوون. کاتێک مارێک بەسـەر کۆشی هاوڕێ کانەبی دا ڕۆیشـت، ئەویش وایزانی تەزبێحەکەی لێ دەدزن، بەهەردوو دەسـتی مارەکـەی گرت، ئەگەر هاڕانـدی و فڕێیدا، باوکم گوتی: کەپرەکەی بگرن لەگەڵ خـۆی نەیبا، ئاخر کانەبی بەهەیکەل بوو، بەڵام زۆر لەمار دەترسـا، مارەکەمان کوشت.

لقـی (پشـدەر- بیتوێـن)، پیاوی زۆر ئازای تێدابوو، یـەک لەوانە هاوڕێ (خ م) پیاوێکـی کەتـەی باڵابەرز، وەک پیاوی ئاسـنین. سـەرێکی بچـوک، دوو چاوی بریقـەدار وەک چاوی پڵنگ، سـمێڵێکی وەک (لینچۆن)ی نـاو دراما کۆریەکان، دەتگـوت: دەسـکە کەوەرن کـە بەنی پێ بەسـتنەکەی لێبۆتـەوەو هەر چڵەی بەلایەکدا بڵاوبوە. جارجار دەسـتێکی بە سـمێڵی دادێنا، بۆ ئەوەی نەچێتە ناو دەمـی و بـۆ لای گوێیەکانی دەبردەوە، هەر کاتێک هێسـتری بـارەگای کورتان بکردایـە، کاتێـک ناو تەنگەی توند دەکرد، یان کەژیەکە دەپسـا، کە پێی پێوە دەنا، یان یەک (سـەبەتە تەرسـی) بەو هێسترە دەکرد!! دار نەبوو خۆی لەبەر بگرێ، کە بیوری دەست دەدایە، هێندەی بڵێی یەک و دوو باری هێستری تەواو دەکـرد. هەر مـۆرە دارێکی گرێگرێی بزمـارداری، کە چەندیـن دارکەر هەوڵیان لەگەڵ دابوو بۆیان نەشـکابوو، شـوێنی بیورەکانیان لەسـەر دارەکە بەجێمابوو، داری وا هەبوو، هی زەمانی شـێخ ئەحمەدی بارزانی بوو کە ئێمە بە (خ م)مان

دەگوت: دارێک لەفلان شوێن هەیە بەکەس نەشکاوە. دەیگوت: بەس پێم نیشان بدەن. داری وا هەبوو، سێ بۆ چوار باری هێستری لێ پەیدا دەکرد. ڕۆژێک چونەوە ناوچەکەی خۆیان، هاوڕێ (خ م)و هاوڕێ (ح) بەمۆڵەت دەچنەوە ماڵ، بۆ سەردانی ماڵ و منداڵیان. لە گەڕانەوە (خ م) دەڵێ: وا چاکە چالاکیەک بکەین، بەخوا حیزب کەیفی پێ ساز دەبێ کاتێک بەو چالاکیە بزانێ. دیارە هەردووکیان بڕیار دەدەن ئەو چالاکیە بکەن. دەچنە سەر شەقامی قیرتاو کراو، بازگە دادەنێن. ئۆتۆمبێلێکی زۆر ڕادەگرن، کەس نازانێ هەر ئەو دوو کەسەن یان زۆرترن. کاتێک ژمارەی خەڵکەکە زۆر دەبێ و لەهەردوولاوە ڕێگا دەگرن، ئەو دەڵێ: تۆ قسەیان بۆ بکە. ئەوی تر دەڵێ: نا تۆ قسەیان بۆ بکە. ناچار هاوڕێ (ح) دەچێتە سەر بەردێک وەک پاڵەوانی فلمەکان دەستێک بە سمێڵی دادێنێ، بۆ ئەوەی بەری قسەکانی نەگرێ. تفەنگ لەناو لەپی دەستی و دەبێتە حاکمی ئەو ناوە، دەنەڕێنێ و دەڵێ: خزمینە دەزانن ئێمە کێین؟ ئەوانیش دەڵێن: نە بەخوای. دەڵێ: ئێمە (جەماحەتی حیزبی شوحین) ئێمە سیاسەتی حیزبی خۆن، پێ ڕاستە، ئەوەی سیاسەتی حیزبێ مەی پێ ڕاستە پێڵاوی سەرچاوی دە کاکی خۆی، ئەوەی سیاسەتی حیزبێ مەی پێ ڕاست نییە، لە فسێ دایەی بەم، (ح) پێشێیان بەرهەڵدە با برۆن. دەبێتە هۆڕن لێدان و بای بای بۆ (ح) بەم شێوەیە کۆتایی بە چالاکیەکە دێنن.

هەر لقی پشدەر: ئەوکاتە زۆرمان پێویست بە چەکی بیکەیسی بوو، ئەوەی لە قامشلۆ دەگەڕایەوە باشووری کوردستان، هەموو کەس لەبەرگرانی (قورسی) خۆی لە هەڵگرتنی بیکەیسی نەدەدا، برادەرانی پشدەر گوتبویان: ئەوەی بیکەیسی نەیەنێتەوە کوردستان (دەیگێین). ئەوەی نەیدەهێنایەوە، دەمانگوت: ڕەوانەی لقی پشدەری بکەن بۆ دادگایی کردن.

بارەگاکانمان لە بارزان بوو، ماڵی هاوڕێ ئەبو جەنانیش کە هاوڕێیەکی عەنکاوە بوو، پیاوێکی ڕەوشت جوان، خەبات جوان، ئەندامی لەشولاری جوان، گفتولفتی جوان، کە قسەی دەکرد زۆرم حەز دەکرد سەیری زاری بکەم. ڕۆژێک بەرازێکم کوشتبوو چووم بە ئەبو جەنانم گوت: هاوڕێ، یەکانەکی زۆر گەورەو قەڵەوم کوشتوە، وەرە نیشانت بدەم ئێوە چەند ماڵە مەسیحیەک لێرەن بە ئاینی ئێوە حەلاڵە، بەراز خواردن کە گۆشت لێرە دەست ناکەوێ. ئەبوجەنان گوتی: هاوڕێ

حــازم، زۆر سوپاســت دەکەم، بەڵام من هەتا لەو شــوێنەی بین گۆشــتی بەراز ناخۆم، چونکە کەس نازانێ من مەســیحیم، دەڵێن: شــیوعیەکان بەرازیان خوارد بۆیە نامەوێ ناوبانگی حیزب بزڕێنم، ئەو هەڵوێســتەی هاوڕێ ئەبو جەنانم قەت لە یاد ناچێ.

لە بارزان بڕیاردرا جەژنی نەورۆز ئاهەنگێکی خنجیلانە سازبکەین، بۆ پێشمەرگە و بارزانییەکانی گوندەکانی دەوروبەر، وە هەندێک لە زێباریەکانی هەرنێ و هۆکێ ئامادەبــوون، لە ڕۆژئاوای بارزان ســەر ڕێــگای گوندی (هەمدولــلا) گۆڕەپانێک لــەو بانــوە هەبوو. هەندێــک دارمان چەقاند بەتانیمان لێهەڵواســی وەک شــانۆ دروســتمان کــرد. چەنــد بەتانییەکمان کردە پەردە، خەڵکێکــی زۆر ئامادەبوون بەخێزانــەوە. باوکــم و مەلا جەلال و کانەبی گەورە و مەحەمەد وەســتا و بەندە و چەند کەســێک لەلای یەکتر دانیشــتبوین. کاتێک هاوڕێیەکی بەرپرس، زۆر بە هەیبــەت (خۆی قەبارەی زۆر گەورە بوو)، پــەردە لادرا وتار بخوێنێتەوە، ئاخر ئەو هاوڕێیە بە قەد ســێ کەس دەبوو. مەحەمەد وەســتا گوتی: (لەناو گیاندارو دڕندەی وەحشــی، نێرە ورچێکیان چوە سەر کورسی) بوو بەیەک پێکەنین. ئەو هاوڕێیە لەخۆی کەوتە گومان، ئێستاشــی لەگەڵ بێ نازانم چی گوت!!

چەند ڕۆژ دوای ئەو ئاهەنگە کە شانۆگەری و گۆرانی خۆشی تێدا پێشکەش کرا، مــن و هــاوڕێ عەونــی بڕیارماندا بچینە ڕاوە کەو. من کەوتمە لای ئەو شــوێنەی ئاهەنگەکــەی لێکرابوو، بەڵام هیچی لێ نەمابوو، تەنها چوار دارە چەقێندراوەکە مابــوەوە. مــن بــۆ پارێزی کــەوان، زۆر بە ئەســپایی هەنگاوم دەنــا. بینیمم لە بەینی دارەکان پێشــمەرگەیەکی سۆسیالیست دیاربوو، زۆری حەز دەکرد ئەویش لەپێــش ئەو جەماوەرە گۆرانی بڵێ، ئەو دەرفەتەی بۆ نەرەخســابوو. بەخەیاڵی خــۆی ئــەو خەڵکە هەر لەو شــوێنە دانیشــتوون و تەماشــای زاری ئەو دەکەن، چــۆن گۆرانــی دەچــڕێ. نەیدەزانی من لە پاش پشــتی لەگەڵ دارێکی شــانۆکە خۆم جوت کردوە!! یەک دوو مەقامی تایەر تۆفیقی گوت، خۆشــی گوت. منیش لێم خۆش دا هات، گوێی بۆ شــل بکەم. بەڵام جار نا جارێک بەهەردوو دەســتی ئامــاژەی بــۆ خەڵکەکە دەکرد، دانیشــن هێنــدە چەپڵە لێ مــەدەن. دیاربوو لە خەیاڵدانی ئەو پێشــمەرگەیە خەڵکەکــە داوای دووبارەیان لێ دەکرد، کۆخەیەک دوان بۆ ئەوەی ســافی بکات و دەنگی بێنێتە ســەر شەســت. دەستی بە گۆرانی

كردەوە، منیش سەیرم كرد هاوڕێ عەونی لە من دەگەڕێ بەرەو لای من دەهات. بەناچاری هەتا دەنگم تێدابوو،گوتم: دووبارە، دووبارە، دووبارە......دووبارە. ئەو بەڕێزە تاكوو ئەم دواییانەش هەر بە (برای بابم) وەك تایەر تۆفیق دەڵێ، ناوی دەركرد. گوتی: هاوڕێ حازم لەمێژە لێرەی؟ گوتم: لەسەرەتای ئاهەنگەكەوە لێرەم. گوتی: توخوا پێشمەرگەم لێ تێمەگەینن. هاوڕێ عەونی دەیگوت: من و هاوڕێ حازم وەك جەماوەر دادەنیشین، تۆش گۆرانیمان بۆ بڵێ، ملی نەدەدا. لەبەر خۆی دەیگوت: كەس نا هاوڕێ عەونی و هاوڕێ حازم؟!! بەخوای هەموو پێشمەرگەم لێ تێدەگەیەنن. ئەو بەڕێزە ئێستا لە ئەوروپایە، بۆ نوسینی ئەو بابەتە سۆراخیم كرد، بەناوی (د)، هیوادارم جارێكی تر لە ئامێزی بگرم و داوای لێبوردنی لێ بكەم و چاوە گەشە پڕ ئومێدەكانی ماچ بكەم، تا لەژیان ماوم. ئێستاش خۆی زۆر زیاتر لە ئێمە ئەو باسەی گێڕاوەتەوە، بۆیە ڕێ بەخۆم دەدەم لێرە یاداشتی بكەم.

## ناپاكی جەلیل

جەلیل كەم ئەندام بوو، دەستێكی نەبوو. لەخانەوادەیەكی شیوعی بوون، برایەكی شەهیدببوو لەگەڵ حیزبی شیوعی. جەلیل كەوتبووە داوی مخابەراتی عێراقی، چەند ڕێكخستنێكی حیزبی شیوعی بەگرتن و پاكتاوكردندا بوو، كاتێك كە حیزب بەمەی زانی درەنگ بوو. وەك جارانی پێشوو هاتەوە بۆ ڕێزان بۆ نێچیرێكی تر. لەبیرمە من و خەیری و چەند برادەرێكی تر، سەیری ناو ئۆتۆمبێلی جەلیلمان كرد دەمانگوت: جێگای گومانە ئەو هەموو وێسكی و فستق و میوەی بۆ ئەبو حیكمەت و بەرپرسەكان هێناوە، چۆن لە بازگەی ڕژێم نەیانگرتوە؟!! لە كۆتاییدا حیزب گرتی، دایك و خوشك و باوكی هەڵوێستی زۆر مەردانەیان هەبوو، گوتیان: ئەگەر شتی لەسەر ئاشكرابوو چی لێ دەكەن ئێمە ڕازین، شەكوای بۆ ناكەین. ناوی بنەماڵەكەمان لەكەدار بكات، دوایی سزای خۆی وەرگرت، پاش داننان بە هەموو تاوانەكان.

# لە قوم نیشتینەوە

ڕۆژێک پیاوێکی ڕەش ئەسمەر، تەمەنی نزیک لەپەنجاساڵیمان لێ پەیدابوو، من لە پێشــودا ئەو پیاوەم بینیبوو، دەمزانی خێزانێکی شــیوعین، بەڵام نەدەهاتەوە یادم. گوتیان: ئەوە مام (ع)ـە، باوکی هاوڕێ (م) کوڕەکەی پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو دەستگەرم بوو، هەموو چالاکیەک لەپێشەوە جێگای دەگرت. ئینجا هاتەوە یادم کەوا ئەم پیاوە بۆ خۆشــی ئازابوو. بەڵام کێشــەیەکی هەبوو،کێشەکەشــی ئەوەبــوو: درۆی گــەورەی دەکــرد. حیزب کاتی خــۆی زۆری هەوڵدابوو، درۆیان تــەرک بــکا، بــۆی تەرک نەکرابــوو، بۆیە حیــزب دەری کردبوو، هەر بەدۆســت مابــوەوە. درۆیەکانــی زۆر بە ئاشــکرا دەکرد، بۆ نمونە، دەیگوت: لە شۆڕشــی ئەیلــول تەقــەم لە فڕۆکە کردوە، بۆم گەڕاوەتەوە ڕەمــی لێکردوم، ئەوەتا کونی شــەرواڵەکەم دیــارە. ڕۆژانە ئاســۆی برام و چەنــد هاوڕێیەکی تــر دەیانبرد بۆ ســەرکانی نزیک بارەگا، بەســەرهاتی دروســتکراوی خۆی بۆ دەگێڕانەوە. هەتا کاتــی نان خــواردن، شــەرمیان لێی شــکابوو. ڕۆژێک لەگەڵ هــاوڕێ کانەبی و چەنــد برادەرێکی تر دانیشــتبوین، مام (ع) هات، گوتــی: کۆبوونەوەتان نییە؟ هاوڕێ کانەبی گوتی: نەخێر، بەڵام بۆ ئەو هەموو قسە خۆشانە بۆ ئەو گەنجانە دەگێڕیەوە، بۆ ئێمەشی باس ناکەی؟!! گوتی: جەماعەت بەسەری ئێوە ڕەبیەک هەبوو زەمانی مەلا مستەفاش بەکەس نەگیرابوو، بڕنۆیەکم دەستدایە بە دووربین تەماشــام کــرد حەفتا کەســی تێدابوو، گوتــم: کوڕم (م) تۆ لەبــەرەوە، منیش لەســەرەوە هێرش دەکەین. کاتێک هێرشــمان کرد لە بــارەگای لیوا تۆپبارانیان کردین، تۆپێک لەنێوان هەردوو قاچم وە عەرزی کەوت، فڕێیدامە تاقی ئاسمان. لە ئاســمان ئەوەندە زاڵ بووم لەســەریان، یەک پاکەت فیشەکی بڕنۆم بە نیشان هاویشــتنێ، لە تەپلی ســەرم دابوون، هەر پێنجیان لەمەڵاشــویان هاتبوە دەر، کاتێک گەیشتمەوە سەر زەوی هێرشم کردە سەر ڕەبیەکە، بە سەلیە بۆی چووم غغــرررررر.... . لەو کاتە ئاســۆی برام گوتی: مــام (ع) تۆ بڕنۆت پێ بوو، خۆ بڕنۆ سەلیەی نییە؟!! تورەبوو، گوتی: خوێڕی من دەڵێم: دامە سەلیە واتە دامە سەلیە. لەگەڵ ئەو بە درۆ خستنەوەی ئاسۆی تۆزێک شڵەژا، لەبیری چووبوەوە

کە ڕەبیەکە حەفتا کەسی تێدایە، گوتی: بەشەڕەفم هەشتا کەسمان بەدیل گرت، کوژراو برینداریش هەڵاتن.
ئێستا لەدوای چل ساڵ، دەزانم مام (ع) چ زوڵمێکی گەورەی لێکراوە کەوا لەسەر درۆکردن حیزبی شیوعی دەری کردبوو، ئەگەر ئێستابوایە بە دڵنیایی یان بەرپرسێکی باڵا یان سکرتێری حیزبێک دەبوو.
مام (ع) گوتی: لە پردێ (ئالتوون کۆپری)، زێ بەناو شاردا تێپەڕ دەبێ، ژنێکی زۆر جوانی پڕەدیی لەوبەری دیاربوو، هەموو گیانی زێڕ بوو، گوتم: ئەگەر من (ع) بم، ئەمشەو ئەو هەموو زێڕەت لێ دەدزم !! کە شەو داهات لەسەر زێ جلوبەرگم داکەند، بەردێکم لەسەر جلەکانم دانا بە مەلەوانی پەڕیمەوە ئەوبەری زێ. کاتێک چوومە سەربان ئەو ژنە لەگەڵ پیاوەکەی لەسەربان خەوتبوو، زێڕەکانی لەبەر دەستبازی، لەناو سەبەتەیەک لە ژوور سەری دانابوو، بە چەنگان هەموم لە باخەڵم کرد. ئاسۆی برام گوتی: مام (ع) خۆ ڕووت بوی، چیت لەبەر نەبوو؟!! هاوڕێ کانەبی گوتی: با فانیلەیەکی لەبەر مابوو. گوتیان: ئاخر هەر ئەو زێڕە دەکەوێتە خوارەوە!! لەبیرمە شەهید عەونی گوتی: قایشێکی لەسەر بەستبوو، بە هەر هەموومان بۆمان تەواوکرد.
دیارە ماوەیەک مام (ع) بەگەڵ لەشکری ئیسلامی کەوتبوو، سەر بە ئێران بوون، یەک لە هاوڕێیان گوتی: مام (ع)، ئەو ماوەیەی لەگەڵ ئیسلامیەکان بوی چۆنت بەسەربرد؟ گوتی: ڕۆژێک لەلای قەسری شیرین، لەگەڵ سوپای عێراق بوو بەشەڕمان، هێزی عێراق زۆر بوو. پاسدارەکانی لەگەڵ من بوون، توانای بەرگریان نەما. هەرچەندەی پاڕانەوە، من گوتم: پاشەکشە ناکەم، ئێوە بڕۆن، چەندجار هێزی عێراقیم شکاند، ئەو هەموو جەنازەم لێ دەخستن!! کاتێک پاسدارەکان چووبوونەوە تاران، ئیمام خومەینی گوتبوی: ئەدی (مام ع)؟ پاسدارەکان گوتبویان: مام (ع) شەهید بوو. ئیمام خومەینی لەخەمی من خەوی لێ ناکەوێ، لە باخچەکەی پیاسە دەکات، هەست ڕادەگرێ بانگی پاسەوانەکان دەکات، دەڵێ: هەها گوێتان لە تەقەی ئەو تفەنگەیە؟ بەخوای مام (ع) ماوە، لەناو سەد تفەنگدا من دەنگی تفەنگی مام (ع) دەناسمەوە!! خێراکەن هەتا بە کیمیا لێیان نەداوە، هەلیکۆپتەرێکم بۆ بێنن.
مام (ع) گوتی: من لەگەرمەی شەڕدام هەلیکۆپتەرێک هاتە سەر سەرم، تفەنگم

ڕوو لە ئاسـمان کرد ویستم بیتەقێنم.
بـە بڵندگـۆ ئیمـام خومەینی گوتی: کورە مام (ع) شـێتە نەکەی، منم. ئیمام دابەزی بە پلیکانی فڕۆکە، دەسـتی لەسـەر شانم دانا، گوتی: بەسە کاری خۆت کرد، خەڵکی تاران چاوەڕوانی تۆن، پێشوازیت لێ بکەن. بەسوێندو کەلام والله ڕازی کردم، لەگەڵی بڕۆم. سـواری هەلیکۆپتەربووم. لەڕێگا دەسـتم لە گێرێکی فڕۆکەکەدا خەریک بوو بنیشـێ، ئەفسـەرە (خەلەبانەکە) گوتی: مام (ع) کاتی ئەو شـۆخیانە نییە!! کاتێک گەیشـتمە سەر شاری تاران چ ببینم! ئاخر دەڵێن: تاران سـەد ملیۆنە، هەموی لە پێشـوازی من بوون، دوو سـێ خول سـوڕاینەوە لەسـەر تاران لەبەر حەشامات یەک شوێن نەبوو بنیشینەوە، هەر هەموی بەیەک دەنگ دەیانگوت مام (ع) مام (ع) ، بەناچاری لە قوم نیشـتینەوە.
پیرەمێردێکی ترهەبوو، لەگەڵ شەهید کانەبی گچکە دەچوین بۆ لای دادەنیشتین. وردە، وردە باسوخواسـمان لەگـەڵ دەکـردەوە، دەیگـوت: گەنج بـووم، ئاغای گونـدی کچێکی زۆر جوانی قەیرەی هەبوو، ڕیشـم تاشـی خۆم بۆن خۆشـکرد، شـەوێ دەسـتمدا تفەنگێ، لێیان بەسەربانی کەوتم، دەیوسـت باسی تێکهاڵانی بـکات لەگەڵ ئەو کچە جوانە، دەمگوت: کافری، پیاوکوشـتن و ئاوخواردنەوەت پێ وەک یەکە!! دەیگوت:
یـەک پاکـەت فیشـەکم لە ئاغایدا کوشـتم. یان دەیگـوت: زۆرم ڕق لە پیاوێک بوو جاسوسـی بەسـەر منەوە کردبوو، سـوێندم خوارد دەبێ بیکوژم. شـەوێ دەرگام لە ڕێسمەبرد، تفەنگم لەناو گۆلمێ دابوو، پێش ئەوەی تەقەی لە کابرای بکات، دەمگوت: حەتمەن کچەکەیت خۆشویسـتوە؟!! دەیگوت: بەئەسـپایی ئەو کچە جوانەم لەخەو هەڵسـاند دەسـتم لە ملی کرد. سوکانی درۆیەکانی کەوتبوە دەسـتی من، هەروەک یاری ئەتاری بکەم!!

# ئەو ئەسپە گونی دوێنێی نییە

لەبارزان بوین، باوکم لەگەڵ تەحسـینی ئامۆزام و هاواری برام، بەلای ماڵەکانی مام تەها و مەحەمەد ڕەشید (لەنزیک بارزان، یەک دوو خانوی خراپیان دروست کردبـوو) تێپـەڕ دەبـن. چەند ڕۆژێک بوو مـام تەها، ئەسـپێکی کەوێتی تۆکمە و گـەورەی کڕیبوو. باوکیشـم زۆر کەیفی بە ئەسـپی چاک دەهـات، باوکم هەر ئەوەندەی گوتبوو: ئەو ئەسـپە خراپ نییە. ڕۆژی دوایی تەحسـین چوو بو لێی کڕیبوو، تەحسـین ئەسـپێکی تریشی هەبوو، ئێمەش پێمان خۆش نەبوو، پێمان دەگوت: ئاخر تۆی پێشمەرگە دوو ئەسپت بۆچیە؟! باوکم دەستی بە نێوچاوانی ئەسـپەکە دادەهێنـا و (قەشاویشـی) دەکـرد و دەیلاواندەوە. بۆ ئـەوەی ڕام و دەسـتەمۆی بکات، لەپێش ئەسـپەکە وەسـتابوو، تەحسـین بەمنی گوت: پێت چۆنە؟ منیش هەر دەمویسـت لەبەرچاوی بخەم، بۆ ئەوەی بیفرۆشێتەوە، گوتم: ئەو ئەسـپە، ئەوەی دوێنێ بەمام تەهای بوو، ئەوە هەو نییە، فێڵیان لێکردوی. گوتـی: بـە چی دەزانی؟ منیـش نەمزانی چی بڵێم، گوتم: ئەو ئەسـپەی دوێنێ گونی هێندەی سـەری تۆ بوو، ئەوە هیچ گونی دیار نییە!! ( ئەسـپ جاری وا هەیە گونی هەڵدەکێشـێتەوە). تەحسـین کە ئەوەی بیست یەکسەر دەستی بردە ناو گەڵی ئەسپەکە بۆ ئەوەی دەستی لە گونی بکوتێ. ئەسپ چەنگەبازی باوکم بوو، خەریک بوو بیکوژێ. هاواریکرد: ئەوە چیت لێکرد وەحشی؟!! تەحسین بە منگەمنگەوە، گوتی: مامە، حازم دەڵێ: ئەوە گونی خۆی نییە فێڵیان لێکردوی. باوکم هێندەی تر تورەبوو، گوتی: هەی نەدیتکەی بێئەقڵ، نازانی ئەسـپ گونی هەڵدەکێشـێتەوە؟ خۆ سەیارە نییە لێیان گۆڕی بێ.

ئەبو حیکمەت لەدوای تەحسینی نارد، لەگەڵ ئاسۆی برام و چەند پێشمەرگەیەکی تر بە مەفرەزە بچن بۆ لای لێلکان و خواکوڕک، فیشـەک و تەقەمەنی بێنن، بە فەرماندەیی تەحسـین. دوو وڵاغی مەقەڕو پێنج سەد دیناری دابوە تەحسین، تا لەڕێگا هێسـترێک بکڕێ، بۆ ئەوەی سـێبار فیشەک بێنن. کاتێک تەحسین لەلای زێتێ و بێرۆخ و ئێدلبێ، دەڵێ: هێستر دەکرم، خەڵکی گوندی هێسترێکی سپی پیـری بۆ دێنن، ددانی نەمابوو، ئێسـکی شـەویلاکی وەک چەقـۆی تەنک ببوو،

قۆڵتی پشـــتی چاوی مســـتەجۆیەکی دەگرت، (ئەوانە هەموی نیشانەی پیرین). بـــەڵام تەحســـین کە پارەکـــەی دەداتێ، چەنـــد هەنگاوێـــک دەڕواو دەگەڕێتەوە، دەڵـــێ: وا نەزانن ناشـــیمە، هێســـتر نەبـــێ دەیهێنمەوە. ئەوانیش دەڵێن: باشـــە ئەگەر هێستر نەبوو بیهێنەوە.
من و موحسین یاسین و مەحەمەدحەلاق، لەسەرەوەی گەلی سولێ بزنەکێویەکمان ڕاوکردبوو، بە پشـــتێن هەڵمان دەکێشا بۆ شـــوێنێکی گۆڕ. قافڵەی ئێسترەکانی تەحســـین بەخـــوار ئێمـــە تێپەڕبـــوون بۆ بـــارزان، تەقەیان بە ئاســـماندا دەکرد. تەحسین دەستوری دابوو، هەندێک تەقە بکەن، وەک ئاماژەیەک بۆ گەڕانەوەیان بەســـەرکەوتویی، ئەو شاخە هەر هاشەی دەهات.

# شێخ گوتی: دەستوری خۆیان ناگۆڕن

لەبـــارزان (لەناو خانوەکانی ماڵی بارزانـــی) هەندێک بارەگا، لەڕێزانیش هەندێک بـــارەگا دانـــدرا. بەڵام پێش ئەوەی ئێمە بچینە بـــارزان ئەو ناوە (محەرەمە)بوو، مەبەســـت ناوچـــەی قەدەغەکراوبوو. لەو ســـاڵەدا ئەنفالی بارزانییـــەکان کرابوو، تەنهـــا ژن و منـــداڵ مابوونەوە، ڕۆژانە چەنـــد پیرەژنێک پەیدا دەبوون. لە ڕێزان ئێمە پێشـــوازیمان لێ دەکردن. بڕیاری حیزبی شیوعی بوو کە یارمەتیان بدەین، هـــەر کوێیان بوێ پارەی ســـەیارەیان بۆ ســـەرف بکەین. بـــۆ گوندەکانی دەوری بـــارزان، بازێ، هۆســـتان، هەمدوللا، پرێســـە... . لەســـەروی بـــارزان، ماڵی مام تەها و مەحەمەد ڕەشـــید و ئەحمەد ڕەشـــید و سەمیر ڕەشید هەبوو. ئەو هەموو خانوە لەناو بارزان چۆڵ بوو، هیچ بارزانییەک هیچ ژنێکی بارزانی لێقەوماو بۆی نەبوو لە شـــوێنی بنەماڵەی بارزانی نیشـــتەجێ بێ. بەناچاری لەدەرەوەی بارزان کوڵبەیەکـــی بچووکیان دروســـت دەکرد، خۆیـــان و منداڵەکانیان تێـــدا بپارێزن، ئێمەش هەمیشـــە هێســـترەکانی بارەگا و پێشـــمەرگەکان لەخزمەتیان دابوین بۆ گواســـتنەوەو چـــاو ســـاغیان. ناو بـــارزان، تەنها ماڵـــی برایەکی عەلی شـــەعبان لەنـــاو کۆنـــە مەخفەری پۆلیســـی بارزان بوو، بەنـــاوی ســـەعید، مەڕداربوو. من بەژیانـــم مەڕی وا گەورەم نەبینیبوو. مەڕەکانی ســـەعیدی برای عەلی شـــەعبان،

وەک بەرانی خەڵکی ئاسـایی وابوون، چونکە عەلی شـەعبان هەموی بەدانسـقە هێنابـوو. تەنهـا لە شـیناوێ و مەنگوڕایەتی ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان، ئەو جۆرە مەڕانەم بەم دواییە بینی. کاتێک ئێمە یارمەتی ژنە بارزانییەکانمان دەدا، پارتی و بارزانییەکان کەسیان لەو ناوچەیە نەبوون. بەهەموو قورسایی خۆیان، لەدیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ سوپای پاسداران لەشەڕی براکوژی دابوون، لەدژی حیزبی دیموکراتی ئێران، تەنها سـەعید شـەعبانی مەڕدار نەبێ. دوای سـاڵێک یـەک لەکوڕە شـێخەکان لە بارزان پەیدابوو بـە دوازدە چەکدارەوە، جیهازی بێ تەلیان پێبوو لە ئێرانەوە هاتبوون.

لەو سەروبەندەدا، لەگوندی هەمدوللا پیاوێک بەناوی هەمزە، پێشمەرگەی پارتی بـوو، هاموشـۆی جەمجوی دەکرد، بـۆ کڕینی کەلوپەلی تورکـی. وەک پەردەو شـتی تر، لەگەلی باڵندە کەوتە کەمینی جاشـەکانی ڕێکانی، شەهید بوو، ژن و منداڵەکانی بێ سەرپەرشت مانەوە.

تازە کەمێک بوو، مەلا عەباس بەرپرسـی پارتی هاتبوو، لەگەڵ ئاغۆک ( دوایی ئاغۆک لە ماسـی گرتن بەنارنجۆک گیانی لەدەسـتدا). پارتـی لە تۆڵەی هەمزە کەلەکوانێکیـان هێنـا شـەوێ بە بریندارى کوشـتیان. گوایە دەسـتی هەبوە لە هەواڵی زانیاری لەسـەر هاموشـۆی هەمزە. تەرمەکەیان لەناو داربیەکانی ڕێزان فرێـداو تۆزێک خۆڵیان بەسـەردا کرد. هاوڕێیان، بینیبویـان. بە پارتیان گوت: ئەو جەنازەیە سـەگی لە گژ بوە، بۆ نەتان شـاردۆتەوە؟!! ئاغۆک، خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو بەڵام ئەو چەند کەسـەی تر تازە هاتبوونە ناوچەکە.

ئەو کوڕە شـێخە بارزانییە، لەجیاتی سوپاسـکردنمان کە یارمەتی کەسـوکاری ئەوانمان داوە، ڕۆژانە دەچوە سـەر بارەگاکانی حیزبی شـیوعی و سۆسیالیست، دەیگـوت: بـۆ بارەگاتان لەنـاو بارزان دانـاوە؟!! لەکاتێکدا ئێمە بە پێشـنیارو ئاگاداری کاک مەسـعود بارزانی لەوێ بوین. لەدوای شـکانمان لە قڕناقە و پشت ئاشـانی دوەم، کە بەرەی جود و یەکێتی کار ئەکتەری بوون. لە شانسـی ئێمە بێ ئەوەی بزانین، ئەو خانوەی ئێمەی تێدابوین خانوی خودی شـێخ عوسـمان بارزانی بوو. خانوەکە تۆزێک لاچەپ بوو، لەدەرەوەی بارزان خانوێکی دوو نهۆمی گـەورە نزیکەی دوازدە ژوورێک دەبوو. خانەوادەی ئەو پێشـمەرگانەی تێدابوو: موحسـین یاسـین (ئێستا کارگێڕی مەڵبەندی سێی یەکێتیە) ، مەحەمەد وەستا

ڕواندزی، جەنگی ئامۆزام، تەحسـینی ئامۆزام، حاجی ئامۆزام، و خێزانی خۆم، چەند خێزانێکی تر. ئێمە پێمان وابوو، ئەگەر ئەو کوڕە شـێخە بێتە لای ئێمە، ڕەنگە قسـەی ناخۆش بکات، چونکە ئەگەر خانوەکانی بارزان دانیشتن لەناویان تـاوان بێ، ئێمە کە لەخانوی شـێخ عوسـمان بارزانی نیشـتەجێین، تاوانەکەی دوو هێندەیـە!! بۆیـە من بە براو ئامۆزاکانم گوت: جوان خۆتان ببەسـتن ئەمرۆ یـان سـبەی، دێت بۆ لای ئێمـەش. بۆ ئەوەی سـەیری خانوەکانیان بکەن. زۆر ڕێزیـان لـێ بگرن هیوادارم کـە ئێمە ئاوا ببینێت، خوێندنـەوەی بۆمان هەبێ و قسـەی ناخۆش لەبەرچاوی خێزانەکانمان نەکات، ناچار بەکاری نەخوازراو ببین. بـەڵام کـە هات زۆر بەڕێزبـوو، پاش نیوەڕۆیەک لەناو دارەکانـی پێش خانوەکە بـە هەلۆ، هەلۆ ی بێتەلەکانی دەسـتیان پەیدابوون. ئێمـە نەچوینە دەرەوە بۆ پێشـوازیان، ئەوان بـەژن و منداڵەکانی ئێمەیان گـوت: یارمەتی هەیە میوانتان بین؟ بە ئێمەیان ڕاگەیاند، چوینە دەرەوە فەرمووماں لێکردن، هاتنە سـەرەوە، هەندێکیـان دانەدەنیشـتن وەک ڕێز بۆ کوڕی شـێخ. گوتمان: دانیشـن. شـێخ فەرموی: دانیشـن. جەنگی ئامۆزام شـەربەتی گێڕا، لەلای دەرگا دەسـتیپێکرد، کەس زاتی نەدەکرد لە پێش شـێخ شـەربەت یان جگەرە هەڵگرێ، بەلام شـێخ گوتی: هەڵگرن، ئەوانە شـیوعین دەسـتوری خۆیان بۆ ئێمە تێک نادەن!!

ئینجا شـەربەتیان هەڵگرت. شێخ سـەیری دارودیواری کرد، گوتی: تەنها ئێوە خانوەکانتان بەجوانی ڕاگرتوە، منیش دەمویسـت ناراسـتەوخۆ پێی بڵێم: پێش ئێمە سـوپای عێراقی بەعسـی تێدابوو. باش نییە ئێمەی پێشـمەرگە و ئەندامی بـەرەی جـود لێرەبیـن؟!! بۆیە گوتم: یا شـێخ ئەو دیوارانە شـتی ناشایسـتە بەخانەوادەی ئێوەی لێ نوسـرابوو لە لایەن بەعسـیەکان، ئێمە هەمووماں پاک کردۆتەوە، سوپاسـی کردین. شێخ گوتی: با بچینە دەرەوە هەندێک وێنە لەگەڵ ئێوە بگرین، ئێوە خانوەکانی ئێمە و دار فستەقەکانتان جوان پاراستوە، دەست خۆشـیتان لێ دەکـەم. زۆری وێنە لەگەڵ گرتین، بەڵام تاوەکو ئێسـتا هیچ لەم وێنانەی بۆ نەناردینەوە.

ڕۆژی دوایـی، هـاوڕێ موحسـین یاسـین و مەحەمـەد وەسـتا و مـن و جەنگی لە (بیرکابەسـتری) واری خوا لێخۆشـبوو مەلا مسـتەفای بارزانی، لەسەر چیای شیرین، ئاگرمان کردبوەوە چایمان دێم کردبوو. شێخ و چەکدارەکانی پەیدابوون،

دەیانویست بگەڕێنەوە ئێران. شێخ سڵاوی کرد، دیاربوو ئێمەی ناسیەوە کە ڕۆژی پێشوو لای ئێمەبوە، گوتی: ئەوە چی دەکەن لێرە؟ گوتمان: لە ڕاوی ئاژەڵی کێوین، گۆشتێک بۆ منداڵەکانمان بەرینەوە. گوتی: کوا چیتان کوشتوە؟ گوتمان: نەخێر، ئێستا پێش ئێوە هاتوین. چایان خواردەوە، هەڵە نەبم دوو پاکەتە جگەرەی ڕۆسمەنیان بۆ بە جێهێشتین. ماڵئاواییان کرد بەرەو ئێران، ئێمەش بە ڕێزەوە بەرێمان کردن، شایانی باسە شێخ زۆر بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئێمەدا کرد.

## برسیەتی و تۆپ و تەیارە، خەنەبەندانی ژیانی ئێمە بوو

ڕۆژێک خاڵم قادر، (قادر عەزیزی پارتی) لەگەڵ بێستونی کوڕی و عەلی خوارزای و کەریم لەبارزان پەیدا بوون. ماوەی چەند ڕۆژێک لەلای ئێمە مانەوە. ئەوکات بەشێوەیەکی کاتی خێزانم و منداڵەکانم لەلا بوون. خاڵم قادر، لەماڵی ئێمە چاوی بەحوسێنی فاتمە خانێ کەوت، ئەوکات چەکداری حکوومەت بوو، باوکی کاک عەلی حوسێن. دیاربوو حوسێنی فاتمە خانێ ئێمەی نەدەناسی نیگەران بوو، بەڵام خاڵم قادر گوتی: دڵنیابە ئەوانە خوارزای منن، ئینجا ئەوانە پێشمەرگەی شیوعین، دوورن لە جاسوسی، جێگای متمانەن. ئەگەر نا لێرە تۆم نەدەبینی. بەیانی کە بەرێم کردەوە زۆر دڵنیای کردم، ئەگەر هەر ئیشێکم هەبێ لەناو شار یارمەتیم دەدات. بەراستی دایکم کە دەهات بۆ بارزان یان کافێ، بەلای ماڵی حوسێنی فاتمە خانێدا دەهات، بۆیە ئێستاش کاک عەلی حوسێنی پارتی، بەر لەهەر شتێک کە من یان هەردی ببینێ پرسیاری دایکم دەکات و دەڵێت: پور بەدیعە چۆنە؟ ئەوەی قەت لەبیرم ناچێتەوە دایکم دەیگوت: کاک حوسێن هەموو جارێ یەک تفی لە لولەی تفەنگەکەی دەکرد، دەیگوت: دەستی ئەو خێزانە زۆرەم براوە.

دوای چەند ڕۆژێک زانیمان، خاڵم بۆ خوارزێنی حەسیبەی خوشکم هاتبوو. ئەو کات ماڵی لەئێران، لە شارۆچکەی پیرانشەهر بوو. ئێمەش ناردمان بەدوای

دایکـم، حەسـیبەی لەگەڵ خـۆی هێنا. ئـەوەی هەتاکو ئێسـتا دەمکولێنێتەوە ئەوەیـە: خوشـکی خەڵک کە مێرد دەکات، مەڕاسـیم و ئاهەنـگ و خەنەبەندان و زێـڕو جلکڕیـن و شـای و هەڵپەڕکێی بۆدەکرێ. بەداخەوە ئێمەی پێشـمەرگە بێبەری بوین لەوشـتانە، تەنها یەک جووت ئەدیداسـمان بۆ کڕی، کە پێشمەرگە ئەوکات لەپێی دەکرد. بەگەڵ خاڵمماندا، بەسـواری ئەسپ بۆ ئێران بەرێکەوتن، ڕێـگای چەنـد شـەو ڕۆژێک بـوو. پاش چەنـد مانگێـک زانیمان بەسـەلامەتی گەیشـتونەتەوە. ئەوەشـم لەیاد ناچێت، خاڵم قادر پێشـمەرگەیەکی لای باوکم بەجێهێشـت،. تابنێرن ماڵ و منداڵی بۆ بێت، لەناوچەی بارزان نیشـتەجێ بن. ئەویـش کەریمـی حاجی خدری خاڵم بـوو، پێشـمەرگەیەکی زۆر چالاکی پارتی بوو، زۆر دڵسۆزو لەخۆبوردەو ئازابوو. لای ئێمە مایەوەو ماڵ و منداڵی بۆ هات. کەپرێکمان بۆ دروسـت کرد، کەریم تەلێکی درێژی لەوبەری دۆڵەکە بۆ ئەوبەری لـەدار بەڕوەکان بەسـتبوو، تەلێکی تری لەناوەندی شـۆڕکردبووەوە، بە ئالیاری ڕادیۆکەی بەسـتبووەوە. بۆ ئەوەی گوێی لەرادیۆی پارتی دیموکراتی کوردسـتان بێت.

ڕۆژێکیان لەسـەر گازی پشـت درێژببوو، ئێسـتا دەزانم چ هەسـتێکی دڵسۆزی و کوردانـەی لەناخـدا بوو. شـەهیدبوونی خۆی بەدەنگێکی بـەرز دەخوێندەوە، دەیگوت: دەسـتەیەک لە پێشـمەرگە ئازاو چاونەترسـەکانی پارتی، هێرشـێکی (.... دانەیـان) کردە سـەر مۆڵگەی دوژمن، لەپاش شـەڕێکی یـەک کاتژمێری دەسـتە و یەخـە توانیان دەسـت بەسـەر دامـودەزگای ئەو مۆڵگەیـە دابگرن. (لەدوای خوێندنەوەی هەموو دەسـتکەوتەکان، هاتە سەر زیانی پێشمەرگەکان). وا حەماس گرتبوی دەتگوت لەناو ڕەبیەکەی ڕژێمەوە قسـە دەکات! بەدەنگێکی بـەرز، تۆنـی دەنگـی خۆی گۆڕی، زۆر گـڕو خەمناک، گوتی: ئەو داسـتانە بێ وێنەیە بەخوێنی پێشمەرگەیەکی قارەمانی گەلەکەمان تۆمارکرا، بەناوی کەریمی حاجـی خـدر، کەلە بەرواری ئەوەندە بوو بە پێشـمەرگە، مێژوی ژیان و لەدایک بوون و پاشان هەزار سڵاو لەگیانی پاکی کەریمی حاجی خدری هەمیشە زیندوو، پێشمەرگەی قارەمانی گەلەکەمان.

هیچ ئاگای لەوەنەبوو، وا نوقمی دڵسـۆزی بۆ خاک ببوو، منیش لەناکاو هاوارم کرد: هەستە بەخوای هەتا ئێمە لێرەبین، مەگەر بەساوار خواردن بمرین! هاتەوە

هـۆش خـۆی، زۆر پێکەنین. ئێسـتا شـوکر لە ژیانـدا ماوە، جێگـری لیوایە لە پارتـی، دووجاریش بریندارببوە. ئینجـا دەیگوت: نابێ خەڵکم تێبگەیەنی، گوتم: ئەمـن قسـەی خۆش لەکـەس پەنا نادەم، ئەگەر زەرەری خۆشـم بێـت تکایە. شـایانی باسـە کەریم بەدرێژایی شـەڕی داعش لە ڕیزی پێشەوەی سەنگەرەکان بوو لە بەرەی مەخمور.

گوندی هۆسـتان، ماڵی خواجـەو چەند ماڵێکی تربوون. لەخوارەوەی هۆسـتان دۆڵێک هەبوو، کەپری هاوینەیان لێ دروست کردبوو، بەڵام ماری زۆر کوشندەی لێبـوو. شـەوێکیان لەگـەڵ منداڵەکانم لەکەپـری هاوینە خەوتبویـن، لەدەنگی کیفـەو خشـەی گەڵا وشـکەکانی کەپرەکە خەبـەرم بوەوە، لایتەکـەم هەڵکرد، بینیم: مارێکی بۆری زۆر ترسـناک و کوشـندە لای سـەرینەکەمانە. بە ئەسپایی بانگـی نایلـەی خێزانم کرد، هەر کە گوتم: لەسـەرخۆ بـا پێتەوە نەدا مارە لای سـەرینەکەمان، نازانـم چۆن ئەو دوو منداڵەی فراند بـۆ دەرەوە! چونکە ڕۆژانە ئـەو دوو منداڵەی لەبن پیلی خـۆی دەناو غارە بۆ کونە تەیارە. لەبەر تۆپباران ئەوەنـدە کارامە بوو لـە ڕفاندنی منداڵەکان، بەیەک چرکە لە مەترسـی مارەکە دووری خسـتنەوە. دارێکم دەسـت داێ، بەدەسـتەکەی تـرم لایتەکەم ڕاگرت، مارەکـەم کوشـت. بەیانی کە ڕۆژ بـوەوە، ئینجا لە مارەکە دەترسـاین ئەوەندە ژەهراوی بوو.

ئەو دوو منداڵە بە مانگ و سـاڵ نەیاندەزانی تامی کێک و شـیرینی و چوکلات چیە! تەنها ئەگەر دەچووم بۆ شاخ، بۆ ڕاوی بزنەکێوی یان کەو، لەڕێگا کرۆسک یـان گێـوژم لە گیرفانەکانم دەکرد، بۆم دەهێنانـەوە. لەجێگەی هەموو یارییەکی منداڵانە،وەک: پاسـکیل و ئۆتۆمبێل و تفەنگ و شـتی منداڵان، تەنها کۆنە پشت بەسـتێکی سـەربازی (نیتـاق) حەبلێکم تێخسـتبوو، بۆمـان کردبوونە جۆلانە، لەژێـر داربەڕوێکـی گەورە لەلای کونەتەیارەکە. ئامـۆژگاری ئەو دوو منداڵە زۆر ئاسـانتر بـوو لە منداڵانی تر، منداڵی ئاسـایی دەبێ بڵێـی: خاوێن بە، دەفتەرو کتێبەکانـت مەدڕێنە، مامۆسـتات خـۆش بوێ، قوتابخانەت خـۆش بوێت، دزی مەکە، لەشەقام جوان سەیر بکە ئینجا بپەڕەوە. کەچی ئەو دوو منداڵەی ئێمە، تەنهـا پێمان دەگوتـن: لەکونە تەیارە دوور مەکەونەوە، ئەوانیش زۆرچاک فێری ئـەو دوو وشـەیە ببوون، لەبـاری کرداریش چاکیان دەزانـی لەگەڵ یەکەم گرمە

لەنـــاو کونەکە ئامادە دەبوون تا تۆپ باران تەواو دەبوو.
ڕۆژێــک دوو فڕۆکەی جەنگی دەوریێکیان بەســەر بارزان لێــدا، کاتژمێرنۆو نیوی بەیانی بوو. ئێمە لەفڕۆکەی جەنگی نەدەترســاین، (مەبەستم لە فڕۆکەی سیخۆ بوو)، ئەوەی لە ئێمەی دەدا تەنها هەلیکۆپتەرو پیلاتۆز بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە زۆر بەخراپی بۆردومانی کردین. خۆشــبەختانە زیانی گیانی نەبوو، کانییەکی گەورە لقی هەولێری لەســەر بوو، دوو ساروخی لێدا، کانییەکە وشکی کرد، لەدوای ئەو بۆردومانە. چەند ڕۆژێکیش دواتر ئەو زەویە هەر دەسوتا. لەو بۆردومانە ئاسۆی برام، تاکو ئێستاش گوێی گرانە.
مام ڕەسوەســوری مێوژێ، کەلە بارەگای بەتالیۆنی ۳۱ لە ئیروان بوو، ئاوهێنان بــۆ بارەگایەکــە بەزەحمەت بــوو. هاوڕێیانی شــیوعی لەهەموان زیاتــر ددانیان دەشوشــت. مام ڕەســو زۆری ڕق لە ددان شوشتن بوو، لەبەر ئەوەی ئاویان زۆر بــەکار دێنا. مام ڕەســو ناوێکــی تایبەتی بۆ ئەو دەســتهێنان و بردنەی لەکاتی فلّچە لەددان خشــاندن دانابوو. پێم وایە ئەو ناوەی لە (دەســتپەڕ) وەرگرتبوو، بۆیــە بەیانییــەک، گوتی: باوکــم ئاو چۆن بەشــمان دەکات، لەکاتێکدا هاوڕێیان بەگشتی خەریکی (دەمپەڕ)ن، من یەکەم جار بو گوێم لەو دەستەواژە سێکسیە بێ (دەمپەڕ).
مــام ڕەســووە ســوور ماینێکی هەبوو، دیســان بەیانییەکــی زۆر زوو هاوڕێ مام سەعید تورکمانباغی و باوکم، واتە هاوڕێ عەلی کوتک و هاوڕێ مەحمود حاجی نــادر لەســەربانی بارەگا بوون. مام ڕەســو لەخــوار بارەگا بەســەر دەکەوتەوە لای هاوڕێیان، دوو ســێ کوتە پەتکی بەدەســتەوە بوو، لە توڕەییان پڕیشــکی دەئاوێشــتن، چەند ســوور بوو هێندەی دی سور هەڵگەرا بوو. باوکم گوتی: مام ڕەســو چی ڕوی داوە لەخوارەوە، بۆ وا توڕەی؟!!
گوتی: بەسەری ئێوە ماینەکەیان بەرداوە پەتەکەیان کوت کوت کردوە، خوا بکا ئەگەر زا دووعا بکەن هەر جوانوی بێ، هێندەی دەچن بۆ لای قەت باوەڕ ناکەم جوانوی بێ!! باش بوو ماینەکەی مام ڕەسوی جوانوی بوو، بەڵام موی برژانگی زەردێکــی نارنجــی بوو، بۆیە هاوڕێ عەلی حاجی نادر دەیگوت: مام ڕەســو ئەو جوانوە زۆر بە تۆ دەچێ!! مام ڕەسوش کورتی نەدەهێنا ناراستەوخۆ دەیگوت: هــاوڕێ عەلی مــن پیاوێکی وردم بەڵام ئەو جوانوە لاقــی زۆر درێژن!! (چونکە

شــەهید عەلی حاجی پیاوێکی زۆر کەڵەگەت بوو.

## ژیان بۆ ماڵ و منداڵمان دۆزەخ ئاسابوو

شــێخ مەحەمەد خالید بارزانی، حیزبێکی دروســت کردبوو بەناوی حیزب اللەی شۆڕشگێڕ، بۆ ئەوەی ئەگەر بەرەی جود بڕیاریدا کە پارتی تێیدا ئەندام بوو بەدڵی ئێران نەبوو، لەرێگای حیزب الله، کارەکانیان و هاتوچۆی پێشمەرگەکانیان ڕێک بخــەن. ڕۆژێکیــان نامەیەکمــان بۆهات، هەمان نامەش بۆ سۆسیالیســت لەلایەن شــێخ مەحەمەد خالید بارزانی ناردرابوو، نامەکەی حیزبی شــیوعی لەسەرەوەی نوســرابوو(لقد جــائ الهــق وزهق الباتل) بەگەیشــتنی ئەو نامەیــە دەبێ بارزان چــۆڵ بکەن، چونکە شــوێنێکی پیرۆزەو هیچ ماوەتان لەبەردەســت نییە بۆ خۆ دواخســتن. نامەی سۆسیالیســت نوســرابوو (ســلام علی من یتبع الهدی) دەبێ بارزان چۆڵ بکەن بۆ ماوەی دیاریکراو، نامەی ئەوان هێمن تربوو، دیاربوو ڕادەی کافری ئەوان کەمتربوو؟! بەلای شــێخەوە هێشــتا سۆسیالیســت جیانەببوونەوە بەڵام ئامادەکاری جیابوونەوە هەســتی پێدەکرا.

لەو ڕۆژەدا ئەو نامەیە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، چونکە لەگەڵ ڕژێم لەشەڕدابوین لەگەڵ یەکێتی ئاشتی نەکرابوو، یەکترمان دەکوشت. سۆسیالیست لەسەروبەندی لێــک جیابوونەوەبــوون باڵی کاک ڕەســوڵ مامەند و کاک قــادر عەزیز، کە ئێمە چوینە بارزان لەســەر دیواری خانوەکان لەهەر ژوورەی چەند یادگاری ســەربازو سیخوڕەکانی بەعس دەبیندرا، لەژێرەوەیان ئیمزای عەبودو خەلەف و سەلبوخ و قەیس و چەندین ناوی عەرەبی دەبیندرا، کە خەڵکی ناوەراست و باشوری عێراق بوون. هەموو ئەوانەمان ڕەشــکردەوە، کەبەدژی شۆڕشــی کورد نوسرابوون. پێم وانەبــوو ئێمە شــایانی دەرکــردن بین. ئێمــە بارزانمان ئاوەدان کردەوە، شــێخ مەحەمــەد خالید لە شــنۆو کاک مەســعود لە ڕاژان بوو، کەســیان لە باشــوری کوردستان نەبوون.

بارودۆخی سۆسیالیســت زۆر خراپ بوو، لەبەرجیابوونەوە، لەو ئان و ســاتە زۆر ناخــۆش بــوو ئەو هەمــوو بارەگایە چۆڵ بکرێ و بگوێزینــەوە، لەو کاتەدا بەرێز

سـەید کاکە و خوا لێخۆشـبوو مامۆسـتا ئەمیـن، ئەندامانی مەکتەبی سیاسـی سۆسیالیسـت لەوێ بوون، لەگەڵ باوکم لەئەشـکەوتی ڕۆژهەڵاتی بارزان، چوینە لای سـەید کاکە، زۆر نارەزایەتی نیشـاندا لەسـەر ئەو نامەیەی شێخ مەحەمەد خالیـد بارزانی، کەوتە سـەرزەمی ماڵـی بارزانی و گوتی: ئەوە بـێ بەڵێنییەی لەگەڵ ئێمە و سۆسیالیست دەیکەن. بۆیە کە سەید کاکە بوەوە بە پارتی توشی شۆک بووم. خوایە سیاسیەکانی وڵاتی قەزاوقەدەر بۆ دەبێ هێندە دووڕوو و بێ هەڵوێست بن بەرامبەر بەڵێنەکانیان.

لەبیرمە باسی پیاوێکی بارزانی بۆ باوکم گێرایەوە، کە گوایە ژوورێکی بۆ میوان دروسـت کردوە، (بارزانـی) پێی زانیوە، بانگی کـردوە پێیگوتوە: وات لێهاتوە دیوەخان دروسـت بکەی؟ ژوورەکەی پێ تێک داوەو ڕوخاندویەتی.

بەناچـاری لەگـەڵ برادەرانی سۆسیالیسـت لە بارزان وە دەرکەوتین، دەسـتمان کرد بە دروسـت کردنی بارەگای تازە لەو دۆڵ و شـیوانەی دەوروبەری بارزان، سـەر لەنوێ بارەگامان دروست کردنەوە، من ناردم منداڵەکانم هاتن، کولبەیەکم لەنزیک بارەگای خۆمان دروسـت کرد، لەگەڵ باوکم و منداڵەکان لەوێ دەژیاین، بـراو ئامۆزاکانـم هەندێکیان لەگەڵ ئێمە منداڵیان هاتـن، هەریەکەی کولبەیەکی بچوکـی دروسـتکرد، هەندێکمان لەبارەگاکان ماینـەوەو وەزعی خانەوادەی ئێمە شـازبوو، کەسمان نەمابوو لەشارەکان ژن و منداڵەکان بگرێتە خۆی. هەموومان پێشـمەرگەبوین، بۆیـە ماوە ماوە لەشـاخ دەهاتنە لامان، لەگـەڵ ئێمە دەژیان. هەرچەندە بۆ ئێمە ژیانی بارەگای پێشمەرگە خۆشترو بێ سەرئێشەتربوو، بەڵام ناچاربویـن ئەوماوە ئێواران زوو نانمان دەخـوارد، چونکە نەوت نەبوو لەفانۆس و لامپـای بکەیـن بـۆ ڕووناکی، هـەر بەڕووناکی نانی ئێوارەمـان دەخوارد هەتا دەنوستین یەکترمان نەدەبینی.

قسـەمان لەگـەڵ یەکتـر دەکردبەتاریکـی. بەیانـی دەچویـن بۆ ڕاو بـۆ ئەوەی حەیوانێکـی کێـوی ڕاو بکەین بـۆ منداڵەکان، ئەو نـاوە بزنەکێوی و کەوی زۆر بـوو، چەند سـاڵ بوو ناوچەی قەدەغەکراو بوو، لـە لایەن ڕژێمی بەعس. ڕۆژانە چەنـد گولـە تۆپێکی بۆ دەناردیـن، بەڵام کونەتەیارەمان لێدابـوو بۆ منداڵەکان دەچوونـە ناو ئەو کونانە لەکاتی تۆپباران، بەراسـتی ژیانێکی زۆر سـەخت بوو بۆ ژن و منداڵ.

ئەوەندە لە ژیانی شارو خۆحەشاردان لەپیاوەکانی ڕژێم ترسابوون، تۆپبارانیان پێ چاکتر بوو.
کـوڕە گەورەکەم، تەمەنی شـەش بۆ حەوت سـاڵ بوو، بـۆی گێڕامەوە: دایکی ئەوەنـدەی پـێ گوتبو: ئەمن و ئیسـتخبارات و پۆلیس دەمانگرن، وای زانی بوو ئـەوەی قـات و ڕیباتـی لەبەربێ ئەمنـەو دەیانگرێ!! ڕۆژێکیان لەلای شـەقامی باتـە، ئۆتۆمبێلێـک لێی دەدا لەهۆش خۆی دەچـێ. کاتێک دێتەوە هۆش خۆی، چەند ئەفەندیەک بەقات و ڕیبات لەسەر سەری وەستاون، زۆر دەترسێ یەکسەر بیردەکاتـەوە، چـۆن هەڵبێ لەدەسـتیان. بەنـاو هەموانـدا ڕادەکات، ئەوانیش بەدوایـەوە، هەتا دەیبەنەوە لای ماڵەوە، دەبینن دەچێتە چ ماڵێک.
دەچـن بـە دوایـدا، کاتێک دایکـی دەبینێ ئـەو ئەفەندیانە بـەدوای ئاراس دا ڕادەکـەن، دەڵێ: ئەو ڕۆژەی من لێی دەترسـام ئەو ڕۆژەیە بەخوای دەمانگرن، سەلامی لێ دەکەن، دەڵێن: خوشکە ئێمە لەو کوڕەی تۆمان داوە بە ئۆتۆمبێل، هاتویـن بیبەینە لای دکتـۆر، چونکە خراپمان لێ داوە، ڕەنگە ئازاری هەبێ یان شوێنێکی شکا بێت.
ئەویـش بـێ ئەوەی ئاراس بپشـکنێ، دەڵێ: کاکـە بەخوای هیچـی نییە، ئێوە بڕۆن بەدوای کاری خۆتان، کاتێک ئاراس دەپشـکنێ دەبینێ، دەسـتی گردەبڕ شـکاوە. ناوێرن بیبەنە نەخۆشخانە، دەیبەنە لای بەیتار دەستی دەگرنەوە، هەر لەبەرئـەوەی لەنەخۆشـخانە نەڵێن ئەی باوکـی لەکوێیە؟!! دایکی ئاراس دەڵێ: ئەوەندە خەمی گرتنی خۆمانم نەبوو، ئەوەندەی خەمی گرتنی ئەو زاوایەمان بوو (ئەو ماڵە خزمەم بوو، کە لەلایان بوو)چونکە زۆر دەترسـا، ڕۆژ نەبوو خەبەری گرتنی چەند ژنە پێشـمەرگەیەکم بۆ نەهێنێتەوە، قەت دەسـتی خاڵی نەبوو لەو خەبەرانە، ناهەقی نەبوو ڕژێمێکی دڕندە بوو، تەڕو وشـکی بەیەکەوە دەسوتاند، بۆیـە ناچاربوون زوو ئەوێ بەجێ بهێڵن.

# بارزانمان چۆڵ کرد

کە شێخ مەحەمەد خالید لەسەری کردین بارزان چۆل بکەین، لەدەرەوەی بارزان بارەگامان دروست کرد، بەم پایزە کەوتبوینە گواستنەوە. لە دەرەوەی بارزان، نزیک گوندی هۆستان، چەند خانوێکی بچووکمان دروست کرد، بەحاڵ سەرمان لە ناوی ڕاست دەبوەوە، هێندە نزم بوون. بارەگای عەلی حاجی نادر لە ڕێزان بوو. شۆفێرێک پیکەبێکی لابوو، ڕۆژانە ئیشمان پێدەکرد بەکرێ. کاری ئازووقە یان گواستنەوەی ژنە بارزانییەکان، یا هەرشتێکی تر. هەفتەیەک دەبوو ملازم عەلی پارتی، بارەگایەکی لە ڕێزان دانا بوو، پێشمەرگەیەکی ئێمە بەناوی ڕێبوار، خەڵکی هەولێر بوو. لەگەڵ هاوڕێیان تورە ببوو، چووبوە لای ملازم عەلی ببوە پێشمەرگەی پارتی. ڕۆژێک ملازم عەلی بانگی دەکا، دەڵێ: وەرە کورە، برۆ چایێکم بۆ بێنە. ئەویش فێری شتی وا نەکرابوو!! گوتبوی: خۆ من خەفەر نیم و خزمەتکاری تۆ نیم، ئەوە بە من ناکرێ!! ملازم عەلیش دەڵێ: دەنا منیش بەرپرسی حیزبی شیوعی نیم قاپم بەدەستەوە بێ تۆبەی نیسکێنەی بگرم، ئەگەر نەگوڕێی من و تۆ ناگونجێین، ڕێبوار هاتەوە لای ئێمە.

ملازم عەلی، خۆشحاڵ نەبوو لە غیابی ئەوان ئێمە لەو ناوچەیە پەیوەندی توندوتۆڵمان لەگەڵ بارزانی و زێباریەکان لەهەرنێ و ئالکان و چواربۆت و سەران و پرێسە هەیە، کە بە کۆنە میراتی پارتی دەزانی. کەوتە هاندانی خەڵکی سەر بە پارتی، یەک لەوانە شۆفێری ئەو پیکەبەی کە کاری بۆ دەکردین بەناوی (فاریج) بۆیە شەهید عەلی حاجی گرتی، تا بزانێت بۆ کاربۆ ئێمە ناکات؟!! ئەو ڕۆژە داوای لێکرابوو، دوو ژنە بارزانی بەرێ بۆ بارزان، ئەویش گوتبوی: چیتر کاری ئێوە ناکەم، من پارتیم. هاوڕێ عەلی دەستوری دابوو بیگرن. لەکاتێکدا ملازم عەلی هەواڵی گرتنی فاریج دەبیستێ، هەڵدەکوتێتە سەر بارەگای عەلی حاجی، بەڵام پێشمەرگەکانی لقی بیتوێن کە عەلی حاجی فەرماندەی بوو، دەوریان دەگرن و عەلی حاجی زۆریان جنێو پێدەدا، دەڵێ: ئەوە چەند ساڵە ئێوە لە کەرەج و ڕاژان کەوتون، چەند ساڵە ئێمە ئێرە دەپارێزین، ئێستا

هاتــوون خەڵکمــان لێ هان بدەن؟ ئەم شــەو دەبێ فاریج لەبــەر ئاوی ئەو زێیە بنێـم. وا دەکەم هــاواری بگاتە بارەگاکەی جەنابــت، ئینجا تۆ وەرە بەری بدە. هێندەی نەخایاند ملازم عەلی و چەکدارەکانی گەڕانەوە بۆ ئێران. لەدوای شەڕی خواکــوڕک، ملازم عەلــی کرا بەزەعیم، دیــارە هەرچی دەچــوەوە ئێران کۆڵێک ڕاپۆرتی لەســەر حیزبی شــیوعی و سۆسیالیست دەنوسی، بۆیە ئەمجارە لەپاش دروســتکردنی ئەو هەموو بارەگایە لەدەرەوەی بارزان لەدیوی ئێرانەوە نامە هات بۆ حیزبی شیوعی و سۆسیالیست، دەبێ لەوبەری زێی بادینان واتە لەبەری لای بارزان هەتا شــانەدەر، کەستان لەوبەرە نەمێنێ، حیزبی شیوعی و سۆسیالیست هــەر زوو ڕازی بــوون، عەلی حاجی نادر نارازی بوو، گوتی: من نارۆم.

بــا پارتی بێت بەشــەڕ دەرم بــکات، چەند ڕۆژ بوو حیــزب هەوڵی دەدا، هاوڕێ عەلی ڕازی بکات. ئێوارە بوو شەهید عەلی حاجی هاتە لای باوکم لە ماڵی ئێمە لەخوار گوندی هۆســتان، دەیگوت: مام عەلی من ئەوە بەرەی جودە (......)، بــە بێ شــەڕ لێــرە نارۆم هەمــوو نەهامەتی ئێمــە بەهۆی ئەوبــەرە جودەیە کە ســەرکردایەتی حیزبی شیوعی بەسەرماندا فەرزی کردوە.

هــاوڕێ عەلی دەیگوت: پارتی ئەوەی لەبیرچۆتەوە کە لەزســتانی ١٩٨١- ١٩٨٢ دوو ســەد پێشــمەرگەی پارتی لە قرناقە و پشت ئاشــان لەبەر بارینی بەفرێکی زۆر، ڕێگەی گەڕانەوەی ئێران بەسترابوو، نەشیان دەویست وەک پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی بچنە خوارەوە بۆ دەشتی کۆیە و دەشتی هەولێر، لە بارەگاکانی حیزبــی شــیوعی وەک میــوان خزمەتکرابــوون، هەتاوەکو بەهــارێ. کە حیزبی شــیوعی کێشــەی ئازوقەی بۆ پەیدا ببوو، تاوەکو ئەو دوو ســەد میوانە بەخێو بکات.

بەناچــاری ئەو هەمــوو بارەگایەمان چۆڵکرد بە ئەمری حیــزب، پەرینەوە بەری لای زێباریــەکان، بــۆ هەرنــێ و هۆکــێ و چواربــۆت و گەلــی پڵنــگان و بانێی ســەرانێی و نەپاخێ و بیرکەکۆرو کافێ. لەکافێ نیشــتەجێ بوین، گوندی کاک ڕەزا ئاغــای زێباریان. ســەیرە لە ئەرزو ئاســمان لەدەســت پارتــی و یەکێتی و حکومەتــی بەعس و شــێخ مەحەمەد خالید بارزانی لەدەشــتی هەولێرو قەراج و کەندێناوەو بەستی شەرغە، بگەیە کافێ و چیای گارە. لەو کوردستانە گەورەیە شــوێنێک بۆ ئێمە نەبێ پێشــمەرگایەتی تێدا بکەین، دەبێ ئەو پێشــمەرگەیەی

بەرگــەی ئــەو ڕۆژگارەی گرتبێ چ مرۆڤێکی جــۆری بێ لەروی خۆراگری و باوەر بە مافەرەواکانی گەلەکەمان!! لەحیزبی شــیوعی و سۆسیالیست کە هەندێک لەو تێکۆشــەرانەی سۆسیالیســت بوون بە ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، زۆربەیان برادەری خۆشەویســتم بوون، لە کورە هەرە ئازاو خوێندەوارەکانی سۆسیالیست بوون.

ڕۆژێک بابی هاوڕێ کاوە چاوشین، مام حەسەن هاتبوو، سەردانی هاوڕێ کاوەی کوڕی بکات. ئەوکاتە بارەگا لە گەلیەکی زۆر تەنگەبەربوو لەکافێ، ئەو شــوێنە وەک کونە با، بای زۆر دەگرتەوە، مام حەسەن دەڵێ: باشە پێم ناڵێن بەتەمای چیــن لێرە چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: چۆن ئێمە دەمانەوێ حکومەتی عێراق بروخێنین. ئەویش دەڵێ: بەراســتی شــوێنێکی باشــتان لێگرتوە، هەر لێرە لای بــای لــێ بگــرن مەیەڵــن بای بۆ بچــێ حکومەت بەخــۆی دەروخێ. دیــارە مام حەسەنیش تێمانگەیشتبوو!!!

## هار نیم، هاریان کردووم

هێشــتا لــە بــارزان و دەوروبــەری بوین، لەخانوەکەی شــێخ عوســمان بارزانی. باوکم چوو بۆ لای برادەرانی سۆسیالیســت، لای ســەید کاکە و مامۆســتا ئەمین ئەندامانی ســەرکردایەتی سۆسیالیســت. لەوێ چاوی بــە حەریف عەلی (ژمارە یەک) کەوتبوو، خزمایەتیمان هەبوو، ڕۆژی پێشوو لە زێوەو ماشکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوە بارزان. حەریف عەلی بە باوکمی گوتبو: مام عەلی، دوو ســبەی میوانی ئێــوەم، (ڕۆژێــک مۆڵەتــی دابوینێ.) گوتبــوی: دەڵێن حازمی کــوڕە گەورەت، حەیوانــی کێــوی زۆر دەکــوژێ، با بەیانی لە شانســی ئێمە بچێ بــۆ ڕاو. باوکم گوتبوی: باشــە بەڵام ئەگەر هیچی ڕاو نەکرد، دەبێ شــیوی بێ گۆشــت بخۆن، لەبەرئەوەی لێرە هیچ دەست ناکەوێ.

بۆبەیانی، هێشــتا شــەوی مابوو، چووم بۆ چیای شیرین، شوێنێکی زۆر حاسێی هەبوو، چووم لە میلی واتە ڕوانگە، دانیشتم تا ڕووناک داهات. چەند بزنە کێویەک هاتــن بەدووربیــن ســەیرم دەکردن، نزیک بوونــەوە، کام بزنە کێــوی لەهەموان

گەورەتربوو تەقەم لێکرد، پێکام. ئەوم لێگێڕانەوە، چووم سەرمبڕی، لە پشتی خۆم هەڵدا، بەپەلە گەڕامەوە لەگەڵ خێزانم کەوڵمان کرد و باوکم گوتی: هەر هەمووی لێ نێن، ڕەنگە زۆربن. حەریف عەلی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست هاتن.

دوای ڕاپەرین لە سۆران بینیم، گوتی: کەی دەعوەتێکی وەکو بارزانمان بۆ ساز دەکەی؟ بەلام بەداخەوە بۆی نەکرا بێت سەری نایەوە کۆچی دوایی کرد.

لەبارزان بەرێکەوتین بچینە کافێ، ژمارەمان سێ پێشمەرگە دەبوو. لەگوندی شنێ، بە کەڵەک سێ کەس، سێ کەس.. پەڕینەوە. چوینە گوندی چواربۆت نانمان خوارد، بەگەلی پڵنگان هەڵگەڕاین چوینە گوندی بانێ، کەوا بەسەر هەردوو لای کافێ و گەلی پڵنگانێ دا دەڕوانێت. شوێنێکی بەرز بەردەوام بایەکی فێنکی لێ هەڵدەکات، ئێمەش وەک مێروولە یەک لەدوای یەک بەمەودای دە مەترێک دەرۆیشتین بەناو گوندی بانێ. لەکاتێکدا ئەو خەڵکە چاویان بە ئێمە کەوت لەسەر بانەکانیان سەیری یەک بەیەکی ئێمەیان دەکرد، دەبوایە بە بەردەمی ئەواندا تێپەڕبین. لەبیرمە باوکم لەپێش ئێمە بەچەند مەترێک دەرۆیشت، ژنێکی بەتەمەن گوتی: ئاخر ئەو گەنجانە قەیدی ناکات بوون بە پێشمەرگە، بەلام ئەو پیرە ئاخر شەڕە بۆ هاربوە بەدەشتێ کەوتوە؟!! باوکم بەچاکی گوێی لێ بوو، گەڕایەوە دواوەو گوتی: دایکم بە خوای من هار نیم، خودا ئەوەی بگرێ، هاری کردووم. مەبەستی سەدام حوسێن بوو.

تازە لە پشتی کافێ لەگەلی (خەڵک) خەریکی دروستکردنی بارەگا بوین، هەندێک خەریکی بەرد شکاندن بوون و هەندێک دەمانکێشایەوە، دوو وەستامان هەبوو، یەکێکیان وەستا جەنگی، ئەوی تریان شەهید بلە، هەردووکیان زۆر بەدەست بوون لەدیوارکردن. هاوڕێ کەڕە لەسەرەتای حەفتاکان لەلای بەرسرین و حافز، کە بارەگای حیزبی شیوعی لێ بوە، بوە بە شیوعی، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک نانیان دەکرد. وەک مێش هەنگوین کەسمان بێکار نەبوو، تەنانەت هاوڕێ ئەبو سیروانیش جار ناجار سۆندەی ئاوەکەی بۆ دەگواستینەوە بۆ قوڕ گرتنەوە. پێشمەرگە کرێکارەکان بریتی بوون لە: کانەبی گەورە، مام خدر، موحسین یاسین، خەیری، شێخ لەتیف، هەڵکەوت، مام عەلی ڕەزگە، غەریب، توانا، ئەبودڵشاد، دارا، حاجی دەهام، خارەخولە، دکتۆر زەکی کە لە فەلسەفە

دکتۆرای هەبوو، دکتۆرە ساهیرە و دکتۆر سادق، هەردی و حاجی، عەونی و شێروان، بەندە و هاوار.. . داوای لێبوردن دەکەم کە ناکرێ ناوی ئەو هەموو پێشمەرگەیە بنوسم ئەگەرنا نامەوێ دەوری هیچ لەو تێکۆشەرانە فەرامۆش بکەم، وەک ئەبوخالید (جلی بۆمان دەدووری).
ئەوەی کە ڕۆژێک سەرنجی هەموومانی ڕاکێشا، ڕۆژانی عاشورا بوو، هاوڕێیەکی عەرەب بەرپرسی سیاسی لقی کۆیە بوو، ناوی ملازم کەریم بوو. هەمیشە ڕادیۆی پێبوو، لەوکاتەی هاواری بەرام بارێک چروی هێنا گوتی: هاوڕێ ملازم کەریم لەو کەندەی پشتی بارەگا ڕادیۆی بە بناگوێیەوە ناوە بەکوڵ دەگریێ!! ئێمەش گوتمان: ڕەنگە هاوڕێیان لەخوارەوە توشی شەڕ هاتبن، شەهیدمان هەبێ بۆیە ملازم کەریم دەگریێ. بۆ دڵنیابوون بە پەلە هەڵکشاین بۆ لای ملازم کەریم، کەچوین بۆ لای، دیاربوو لە ڕادیۆکەی شینی (حەسەن و حوسێن) بوو، هاوڕێ لەگەڵی جەزم ببوو، بە کوڵ دەگریا. بەراستی بۆ من جێگای سەرسوڕمان بوو، بەرپرسێکی سیاسی حیزبی شیوعی، ئاوا بە کوڵ لەناو گەلی خەڵک لە کافێ بۆ حەسەن و حوسێن بگریت!! خوایە دەبوو ئەگەر لەناو شین گێڕان بایە لە گەڕەکی سەورەی بەغدا یان نەجەف وکەربەلا، چۆن خۆی لەخوێن هەڵکێشابا و بە دە کەس ساکین نەبووبا؟!! ئەو هاوڕێیە و چەند هاوڕێیەکی تر، چونکە ئێمە ڕەچاوی باری کۆمەڵایەتی ناوچەکەمان دەکرد، بە ئێمەیان دەگوت: (هەدۆلە عەشایەر)واتە،ئەوانە خێڵەکین..!! بەڵام بەراستی بۆ خۆیان (خۆش مسەقەف) (خۆش مارکسی)بوون!!

# کارەساتی کوردان نابڕێتەوە

ڕۆژی ١٩٨٥/٦/٩ ، هەشت فڕۆکەی جەنگی ڕژێم هێرشیان کردەسەر ئۆردوگای زێوە لە ئێران. پەنابەرانی کوردی تێدا نیشتەجێ بوون. بەخەستی بۆردومانیان کرد. لەو هێرشە دڕندانەیە (سێ سەد و سێزدە) هاوڵاتی شەهیدبوون و (سێ سەد و حەفتاوسێ) هاوڵاتی تر، برینداربوون.
بارەگای بەتالیۆنی ٣١ ی ئایار لە ئیروان بوو، لەخوار ڕێزان. موحسین یاسین

فەرماندەی بەتالیۆن بوو. لەو ئان و ساتەدا بەپیلانی ڕژێم و نۆکەرەکانی، خانوی گوندەکانیان هەڵدەوەشاندەوە، دارو کەلوپەلەکانیان دەبرد بۆ دینارتە و ئاکرێ. لەوێ زۆربەیان دەبوونە جاش و لەشارەکان نیشتەجێ دەبوون. بۆیە هاوڕێ ملازم جەمال کە سەرلق بوو، ئەرکدارکرا لەگەڵ شەش پێشمەرگە بچنە گوندی سوسێ و سەرکەندار، بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەو خانوانە هەڵبوەشێن. ملازم جەمال خەڵکی گوندەکانی کۆکردبوەوە قسەی بۆ کردبوون، پێی ڕاگەیاندبوون، ئەگەر بۆ خۆشیان دەڕۆن کێشە نییە، بەڵام ڕێگاتان پێ نادەین خانوەکان بروخێنن. چونکە ڕۆژێک دادێ خۆتان دەگەڕێنەوە ناو ئەم خانوانە. لەناوچەکە بلاوبوەوە، ملازم جەمالێک هاتوە خولی سەربازی ئەفسەری لە یەمەن تەواو کردوە، بۆیە ڕژێم کەوتە پیلان دانان بۆ تیرۆرکردنی ملازم جەمال.

ڕۆژێک لەدینارتە ڕژێم ناپاکێک دەنێرێ بۆ ئەوەی ملازم جەمال تیرۆر بکات. کاتێک ملازم جەمال ئەو کەسە دەبینێ چەکی پێیە، بە پێشمەرگەکان دەڵێ: چەکی بکەن. ئەوانیش چەکەکەی لێوەردەگرن، پاشان ئەو ناپاکە ناسنامەی پارتی دیموکراتی کوردستان دەردێنێ، دەڵێ: من پارتیم. ئەوانیش بەرێزەوە چەکەکەی دەدەنەوە. پێشمەرگەکان دەبنە دوو بەش هەر لەناو گوندی سەرکەندار، ملازم جەمال و سەید گوڵ دەیانەوێ بچنە ماڵێک، ئەو ناپاکە دەستڕێژی گوللەیان لێ دەکا و هەردووکیان شەهید دەکات و ڕادەکاتەوە مۆڵگەکانی ڕژێم لە دینارتە. چوار پێشمەرگەکەی تر، دەبینن هەردووکیان شەهیدبوینە. (شایانی باسە ئەو ناپاکە تیرۆریستە پێشمەرگە کوژە، ئێستا کادیری پێشکەوتوی پارتیە لە دینارتە، ناوی مەشات نەقەبی یە)، بەداخەوە کە هەمیشە حیزبی شیوعی خۆی بەداکۆکی کەری سەرسەختی یاسا دەزانێ، ئەو ڕۆژە کە پێشمەرگە گەرمە برین بوون لە گوندی سەرکەندار، کوڕو باوکێکی بێ تاوانیان گوللە باران کردبوو.

هێزێکی (سەد) کەسی بەفەرماندەیی شەهید عەلی حاجی نادر بەرێکەوتن بەگەلی بێخمە بەرەو دەشتی حەریر. دوای ئێوارەیەک دەچنە گوندی هەنارە، شەو لەوێ بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەبن. کاتژمێر شەشی بەیانی پاسەوانی سەرگردەکان توشی شەڕێکی دەستە و یەخە دەبن لەگەڵ هێزەکانی ڕژێم. هاوڕێ عەلی حاجی نادر، لەبڵندگۆی مزگەوتی هەنارە بانگەواز دەکات، بۆ ئەوەی خەڵکی گوند لە گوندەکە دەربکەون، تاوەکو توشی زەرەرو زیان نەبن.

شـەڕ بەردەوام دەبێ، لەسـەری ڕەش لەڕێگای هەولێر- کۆیە و ڕێگای شـەقڵاوە گەماڕۆ دەدرێن، تاوەکو کاتژمێر حەوتی ئێوارە. شەڕێکی قارەمانانە، داستانێکی بێ وێنە، بەخوێنی ئاڵی یەک پێشمەرگە بەناوی ئەبو شەهلا، لەبرایانی عەرەب، وە برینداربوونی هەشـت پێشمەرگە، تۆمار کرا.

چەنـدان فڕۆکەی سـەمتی و دەیان تانک و تۆپـی دوورهاوێژ و هێزی تایبەت و جاش بەسـەر شۆری گەڕانەوە. داوای لێبوردن دەکەم کە هەقی خۆییم نەداوەتە داسـتانەکانی پێشـمەرگە، بەتایبەتی شـەڕی هەنارە. هەر بەپەلە نوسـیوومن، بـەدوای وردەکاریـدا نەگـەراوم. هەروەکـو گـوێ فڕکانێـی کاتـی منداڵی وەک بەدوامەوە بن هەی بمگرن و لێم بستێنن یان دەربازی بکەم. بۆ ئەوەی بەدەردی داستانی هەندرێن نەبرێن لە حاڵی حازر هەر ئەوەندەم لەدەست هاتوە، هیوادارم خەڵکانی بەشدار بوی ناو ڕووداوەکان ڕۆژێک زۆر لەو باسەی منی چاکتر بنوسن هەتاوەکو لە ژیان ماون.

لـەو ئان و سـاتەدا کە بارەگای جێگیرمان هەبوو، دەیانویسـت ڕێکخسـتنەکان زیندوو بکەنەوە، ئەوەی ئەندامە بەجیا، ئەوەی دۆسـتە بەجیا، لەناو ڕێکخسـتن جێگـە بگرێ. ئەوەبـوو هەندێک پیرمان لەگەڵ بوون، وەک: مام ڕۆسـتەم، مام ئەحمـەد، مام نەعمان (برای شـەهید مام کاوێـس)، کە خەڵکی پێبازۆک بوون. بەمام نەعمانیان گوتبو: ئێوە لە بازنەی دۆسـتانن. ئەویش گوتبوی: بابەکەیفی حیـزب بێـت، من هەر خۆم بە شـیوعی دەزانـم، ئینجا حەز دەکـەن لە بازنەی دوژمنانـم دابنێن، بە بڕیاری حیزب ڕازیم.

مەفرەزەیەکمان کرد بۆ سەر کەنداڵ و سوسێ و ئەو ناوچەیەی هەردوو دیوی چیای کۆلیس. لەسـەرکەند چوینـە ماڵێک وادیاربوو لە عەشـیرەتی هاوڕێ نەجمەدین مامۆبـوو، (مـام نەجمەدین تێکۆشـەرێکی نەفـەس درێژبوو، باوکی شـەهیدی قارەمان فرسـەت). دوای نان خواردن گوتی: ئێوە پێشمەرگەی شیوعین؟

گوتمان: بەڵێ.

گوتی: نەجمەدین مامۆ، مەزنێ ئێوەیە؟

گوتمان: بەڵێ.

گوتـی: مرۆیەکی ئی پـە حەرەکەتە، پـە ویقارە،حولەمایـە ..، (گوایە زانایە).

گوتی پێم خۆشـە مقاشەنەی بکەین!! (مەبەستی مناقەشە بوو).

گوتمان: فەرموو کەرەم کە.

گوتـــی: هەنــگ (واتە ئێوە) جووت نینـــە؟ بۆ پێتان دەڵێن: بـــەرەی جووت؟!! پارتی، شـــیوعی، سۆسیالیست، هەنگ سێ کەتن جووت نینە.

منیش گوتم: پاســۆکمان لەگەڵە دەبینە چوار.

گوتـــی: خودێ خەبەری تۆیە. دیاربوو جود بە جووت حاڵی ببوو.

لەگەڕانەوەمـــان بۆ ئیروان بارەگای بەتالیۆنـــی ٣١ی ئایار لە بێ تەلی بارەگاکە، هەواڵێکـــی ئەوەندە گورچک برمان بیســـت، ئەویش شـــەهید بوونی عەلی حاجی نادربـــوو، لە گۆڕەشـــێر، گـــۆڕی شـــێران لـــە ١٩٨٦/٦/٢٠ وەک مەحمود حاجی گوتەنی (بەســـەری کا عەلـــی) هەتا ئەو ڕۆژەی ســـەری خۆم لەبـــەردی ئەلحەدی گۆڕەکـــەم نەدەم، هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە.

هەمیشە ئەم ڕۆژەم دێتەوەیاد،کە کاک عەلی بەتفەنگە برتۆیەکەی هەڵدەکوتێتە ســـەر مۆڵگـــەی بەعس لـــە چوارقوڕنـــە. لەو ڕۆژە مـــن دڵنیابـــووم گوللە هەموو کەســـێک دەبڕێت (عەلی حاجیش). ئای شـــەڕی براکان چەند شەرماوەرە، کێیان نەکوشـــت؟ کام حـــەرام مـــا بۆنی نەکـــەن، کام گۆماو ما بەخوێنی یەک ســـوری نەکەن!! نەخشـــەی کام داگیرکەر ماوە بەدڵســـۆزی جێبەجێی نەکەن؟!! من کەم پێشـــمەرگەم بینیـــوە ئەوەندە بە پڵنگ بچێت، شـــەهید جەمـــال هەر حەوتویەک لـــەدوای شـــەهیدبوونی کاک عەلی شـــەهید بوو، چونکە شـــەهید جەمال تفەنگی ســـوارکرد خـــۆی بکـــوژێ، لەداخی شـــەهیدبوونی عەلی حاجـــی، دەیگوت: ئەمن ناتوانـــم لەدوای عەلـــی حاجی ژیان بکەم، بەزۆری تفەنگیان لەدەســـت دەرهێنا، ئەوەبوو پاش حەوت ڕۆژ شـــەهید بوو، لەپێشەوە باسم کردوە. حەوت ڕۆژ تەنها حەوت ڕۆژ لەدوای کاک عەلی ژیا.

# خوا خێری حیزبی شیوعی بنوسێ
# مەلای چاکیان لەگەڵە

ئــەو ڕۆژانــەی بارەگاکانمان، لەبــەری گارە بوون لە کافێ. بــارەگای بەتالیۆنی ٣١ی ئایاریــش لــە ئیروان بوو، کــە دەکەوێتە بەرامبەر ڕێــزان. کاتێک لە کافێ دەمانویســت بچینە ئیروان یان بــە پێچەوانەوە، دەبوایە ئەو گوندانە تێپەڕێنین: چواربــۆت، بانــێ، هەرنــێ، هۆکێ و چەنــد گوندێکی تر کە دەکەونە ســەر ئەو ڕێگایە.

ڕۆژێــک مەفرەزەیەکی دە کەســی بە گوندی هەرنێدا، دەیانــەوێ تێپەڕن دەچنە مزگەوتی هەرنێ بۆ ئەوەی پشویەک بدەن. دەبینن جەنازەی مردوێک لە مزگەوت درێژکراوە، ئامادەکراوە بۆ ناشــتن. بەڵام لەبەرئەوەی مەلایەکیان دەست ناکەوێ (تەڵقیــن)ی بدات، ئەو جەنازەیان ڕاگرتوە نایانەوێ بــێ تەڵقین بینێژن، نەبادا لەکاتــی لێکۆڵینــەوەی مەلایکەتــەکان زمانی تێک بهاڵێ و خراپی بۆ بنوســن و بەرێی بکەن بۆ دۆزەخ.

هاوڕێیانی پێشمەرگە،کە دەبینن ئەو جەنازەیە بە هۆکاری تەڵقین نەدان دوواخراوە و ئەگەر لەوە زیاتر دووا بخرێ بۆگەن دەکا، بۆ تەندروســتی زیندوەکان خراپە. بەناچــاری بەهــاوڕێ خەیــری عێراقی (یەک لە بــرا مەســیحیەکانی عەنکاوەیە، تەمەنی زۆری پێشــمەرگایەتیمان بەیەکەوە بەرێکرد، شــوکر ئێستا لە ژیان ماوە لە عەنکاوە نیشتەجێیە)، دەڵێن: مەلا خەیری بۆ ئەو جەنازەیە تەڵقین نادەن؟!! ئەویش دەســت نوێژ هەڵدەگرێ و یەک تەڵقینی مســتەهەقی دەدا، ئاخر خەیری دیان عەرەبیەکەی زۆر باشــە. هاوڕێیان جەنازەکەیان لەگەڵ بەخاک دەســپێرن، خەڵکی گوند سوپاسی حیزبی شیوعی دەکەن کە مەلای ئاوا چاکی لە ڕیزەکانی پێشمەرگەیە.

هەر ئەو ســاڵە هێشــتا لە بــارزان دەریان نەکردبویــن، (ئەوکاتەی خاڵم قادر و بێستونی کوڕی هاتن بۆ خوازبێنی حەسیبەی خوشکم)، بەڵام لە بارزان مەلامان دەست نەکەوت مارەی بکەن، بەدوای مەلا عەباس ی پارتی دا چوین، کە چەند

ڕۆژێــک بوو بارەگای لە ڕێزان دانابوو، هات حەســیبەی خوشــکمی لە بێســتون مارەکرد، بەم شێوەیە لە پێشمەرگایەتی بێ مەلایەتیمان پێوە دیار نەبوو لەبەر مەلا عەباس و خەیری مەسیحی.

## ئیدی منداڵێك نەماوە ئەم جلوبەرگانە لەبەربکات

هۆکاری چاو لەدەست دانی هاوڕێ سەعید بولقامیشی بەم شێوەیە بوو: هاوینی ۱۹۸٥لەبارزان مەفرەزەیەک لە پێشــمەرگەکانی لقی بیتوێن، بەفەرماندەیی عەلی حاجی نادر، چونە خوارەوە بۆ لای گوندەکانی ڕەزگەو ســەرکەند، لەوێ لەگەڵ هێزێکی یەکێتی توشــی شەڕهاتن. لەوشــەڕە هاوڕێ سەعید بولقامیشی ئاربیجی لەلای ســەری بە بەردێک دەکەوێ بە ســاچمەیەک کە بەچاوی کەوتبوو بریندار دەبێت. لەدواییدا چاوێکی بەتەواوی لەدەســتدا. پاش ماوەیەک ناردیان بۆ ئێران بۆ چارەســەر. لەو ماوەی کە سەعید لە ئێران بوو

بــۆ چارەســەری چــاوی، بــاوک و دایــک و خێزانــی و منداڵەکانــی لــە ڕەنیبی لەبۆلقامیش خەریکی کەســابەتی توتن بوون. هەلیکۆپتەرە شەڕکەرەکانی ڕژێمی بەعس بەســەر ئاســمانی بولقامیش خەریکی ڕاوە کورد دەبن، ماڵی ســەعید کە چاویان بەو هەموو هەلیکۆپتەرە دەکەوێت، لە ترسان ڕادەکەنە ناو قوڵتی توتن، کە ســەری ئاوەڵایە، هەلیکۆپتەرەکان وەک پیشــەی هەمیشەییان موشەک باران و گوللەبارانیان دەکەن، بەداخەوە پور زارای دایکی سەعید کە یەک لەژنە هەرە میهرەبانەکانی گوندی بۆلقامیش بوو، شــەهید دەبێت، هاوسەری سەعید بەناوی خەجیج کە لەوکاتە دووگیان بوو شەهید دەبێت، کوڕێکی سەعید بەناوی هاوکار تەمەن ســێ ســاڵ شەهید دەبێت، کوڕیکی تری ســەعید بەناوی ئاکۆ بەسەختی بریندار دەبێت. بەڵام هەتا ســەعید گەڕایەوە، بارەگاکانمان گواســتەوە بۆ کافێ لە ۱۹۸٥/۷/٥ بارزانمان بەجێهێشــت بەرەو کافێ.

تــازە لــەو گەلیەی خوار کافێ بارەگامان خســتبوو، ســەعید و چەند هاوڕێیەکی تــر پەیدابوون کــە لە ئێران گەڕابوونەوە، ســەعید هەرچەندە چاوێکی بەتەواوی لەدەستدابوو، بەڵام لەوپەڕی ورەو خۆڕاگری دابوو، هەروەک پیشەی هەمیشەیی

خۆی. هەر پێدەکەنی لەگەڵ پێشمەرگەکان، ئەوەی ئەو ڕۆژە هەموومانی گریاند و ئـازاری ڕوحـی داین ئەوەبوو: سـەعید بێ خەبەر لـەوەی ماڵەوەیان هەمویان تیاچـون، جلوبەرگـی لەئێران بۆ منداڵەکانـی هێنابوو، لەڕێـگا جلەکان لەکاتی پەڕینـەوە لەزێـی بادینـان تەڕ ببوون، دیار بوو سـەعید زۆر دڵـی بەو دیاریانە خۆش بوو، خەریکی هەڵخسـتن و وشـکردنەوەی جلەکان بوو، نەیدەزانی ئیدی کەسـێک نەماوە ئەو جلوبەرگانە لەبەر بکات، بەراسـتی دیمەنێکی ئازاربەخش و دڵتەزێن بوو، هەتا دەمرم ئەو دیمەنەی سەعیدم لەبیر ناچێ کە جلەکانی بەسەر بەردەکان بڵاوکردبوەوە، لە میمۆری مێشـکم هەرگیز ناسڕدرێتەوە.

ئەبو حیکمەت و باوکم و چەند هاوڕێیەکی بەتەمەن، لەگەڵ سـەعید دانیشـتن، نایەتـەوە یـادم چـۆن ئـەو هەواڵەیان پـێ ڕاگەیاند. ئـەوەی ڕاسـتی بێ، من بەشـبەحاڵی خـۆم ئەو جورئەتەم نەبوو لەو مەجلیسـە دابنیشـم و ئەو هەواڵە گورچک بڕە بە هاوڕێ سـەعید ڕابگەیەنم.

## قاپ و کەوچکیان گلاو نەدەکرد

لەبەرواری ١٠/١١/ ١٩٨٥ لەخواکورک، کۆنگرەی چواری حیزبی شیوعی بەسترا. دروشـمی سـەرەکی حیزب (ایقاف الحرب فورا) دەسـتبەجێ ڕاوەسـتانی شەڕ، (مەبەسـت شـەڕی عێراق و ئێران بوو)، ڕەنگە لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە شـتی چـاک بێت، بەڵام بە هەموو پێـوەرەکان زۆرمان زەرەر بوو، لە بیرمە باوکم زۆر بەو دروشـمە ناڕازی بوو، دەیگوت: وەک ئەوە وایە دوو دەوڵەتە داگیرکەرەکە، واتـە ئێـران و عێـراق دوو ئاغای دژ بە جوتیاربن، هەردوو ئاغاکە شـەڕیان بێ، جوتیـارە هەژارەکان بکەونە نێوانیان، بڵێن: ئێوە چی تر لەیەکتر مەدەن، وەرن بەهەردووکتان لە ئێمە بدەن.

دوایی بینیمان لەدوای ڕاوەسـتانی شـەڕی عێراق و ئێران، ئێمەیان چۆن لەسنور ئاوا کرد. جا باوکم لە ناوزەنگ و لەتۆکان وە بەدرێژی ڕێگا، کە پاشەکشـەمان دەکرد بۆ سـنوری ئێـران، لەبەرخۆیەوە هـەر دەیگوت (ایقـاف الحرب فورا)!!

دەبیخۆن دەی. دەیگوت: چەندم هاوار کرد من لەگەڵ ئەو شیعارەی نیمە، ئێستاش کاک زرار جۆلا و کاک قادر عەزیز دەیگێرنەوە.
کۆنگرە، پێش پێکهاتن و ڕاوەستانی شەڕی نێوان ئێران و عێراق بوو، ئەوکات لەکافێ بوین، لەدوای بەستنی کۆنگرە، ئەبو یوسف بە بەرپرسی کۆمیتەی هەرێم دیاری کرا، کە ئەو هاوڕێیە نە باوەڕی بە مافی ڕەوای گەلی کورد هەبوو، نە کوردیشی دەزانی، لەکاتێکدا زۆر تێکۆشەری کوردمان هەبوو، ببێتە بەرپرسی هەرێمی کوردستانی حیزبی شیوعی، زۆر لەوبەرێزە شایستەتربوون.
ئەوگوندانەی بۆی چوین: هەرنێ، هۆکێ، چواربۆت بوو، لەمزگەوتی چواربۆت ماینەوە. ئەو هەموو بارەگا و کەلوپەلانەمان لە وڵاغەکان بارکردبوو، کە چوینە ئەو ناوچەیە زۆربەی ماڵەکان لەدوای ئێمە قاپ و کەوچکیان گڵاو دەکرد، ئێمەیان پێ گڵاو بوو. لەخوار گوندی کافێ باروبنەمان خست. ڕۆژی دوایی ئاغای کافێ، ناوی ڕەزا بوو، زێباری بوو، دەعوەتی هاوڕێیانی کرد. ئەبو حیکمەت منیشی لەگەڵ خۆی برد وەک پێشمەرگەیەگ، لەو گوندە وشکە، دەعوەتێکی شارستانیانەیان سازکردبوو. ئەوەی ڕاستی بێت، کاک شیمال برای کاک ڕەزا پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، بەرپرسیاریەتی هەبوو، خانەوادەیەکی تێکۆشەر بوون، خزمی کاک وشیار زێباری بوون، دوای ماوەیەک لەگەڵ باوکم لەماڵی کاک ڕەزا چاومان بە کاک وشیار زێباری کەوت.
کاک ڕەزاو شیمال خاڵوانی کاک مەسعودن، کاک وشیار لە کەرەج و ڕاژان هاتبوو لقەکانی پارتی بەسەر بکاتەوە، بەرپرسی پاسەوانەکانی، ناوی شەهید مەلا حەسەن بوو، ئێمە بۆ خاتری بینینی مەلا حەسەن چوبوین.
بەراستی ناوچەکە بۆ ئێمە نامۆ بوو، دۆشکەمان لەسەر گردی دانابوو، هەر کە نۆبەی لای دۆشکەمان بەردەکەوت مردن بوو، مێشوولەی ئەوەندە زۆربوو، جۆرێکی تایبەتی هەبوو هەتا بەیانی نەدەخەوتین. لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیە وردە وردە ڕادەهاتین، ئەو نامۆییەمان دەشکاند لەگەڵ جوتیارەکان، لەگەڵ باوکم و ئامۆزاکانم برنجمان لەگەڵ دروێنە دەکردن، لە زۆر کاروبار یارمەتیمان دەدان، بەجۆرێک تێکەڵ ببوین، ئیدی قاپ و کەوچکیان گڵاو نەدەکرد.
لەو ناوچەیە پارتی گەل هەبوو، کە شەهید سامی عبدالرحمان سەرپەرشتی دەکرد، بەڵام لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان ئازار دەدران و یاساغ بوون،

دوو کادیریـــان کــە یەکێکیان ناوی هۆشـــەنگ بوو لەگەڵ خــۆم بردمن بۆ کافیّ، چونکە لەرێگا دەبوایە بڵێم پێشمەرگەی ئێمەن، واتە شیوعین، بۆ ئەوەی پارتی نەیانگـرن. بەڵام سـەباح هاریکی هەبوو کادیرێکـی زۆر چالاکی پارتی گەل بوو، زۆریـان ئەشـکەنجە و ئەزیەت دەدا، نـاوە ناوە دەهاتــە بارەگاکانی ئێمە خۆی لێیان دەشـاردەوە ( وابزانم گیراو کوژرا). بەراستی سەیر بوو، ئەو هەموو پارتە لە کوردستان هەموی دوژمنی یەکتربوو.
برادەرانی حیزبی زەحمەتکێشـانی کوردسـتان، بەسەرپەرشتی کاک قادر عەزیز لــەویّ بوون، لەپشـتی کافیّ، لــەو دۆڵە بارەگایـان دانابوو، زۆربەیـان کادیری خوێندەوار و دڵسـۆزی رێگای کوردایەتی بوون، بەراستی رۆحە سیاسیەکەی ناو سۆسیالیسـتی جاران بوون، رۆژێکیان پارتی دیموکراتی کوردسـتان کە هێزێکی زۆر نابەرابـەر بـوون، دەوریان گرتن و چەکەکانیان بردن. پێشـتر شـەهید قادر مستەفا کە بەرپرسی هەرێم بوو، پێشمەرگەیەکی سەرەتاییەکان بوو، لە ناکۆکی نێـوان ئـەو دوو باڵــەی ناو سۆسیالیسـت لە گوندی ئالکان شـەهید کرا، کە لە پێشــەوە ئاماژەم بەدەوری ئەو پیاوە تێکۆشەرە کردوە، ناوێکی گەشی مەفرەزە ســەرەتاییەکانی دەشـتی کۆیە و دەشـتی هەولێـر بوو، شـەهیدبوونی زیانێکی گەورە بوو.
کاک کاروان ئاکرەیی کە ئێستا لە ریزەکانی پارتی، کاردەکات، ئەوکات کادیرێکی حیزبـی شـیوعی بـوو لەناوچەکە، هەوڵــی دەدا، بەخەڵکەکەمان ئاشـنا بکات. ئێمــە مەفرەزەیەکمــان برد بۆ لای یــەک ماڵەو بەری گارەو دێـرەش هەتا نزیک ئامێـدی. خەڵــک لەوناوچەیــە کاک کاروانیان چاک دەناسـی، دابــەش بوین لە گوندی دێرەش، لەو ماڵەی ئێمەی لیّ بوین، بوک و خەسـو شـەرێکی گەرمیان بـوو، شـەڕەکە لەسـەر نۆبەتــە گاڕان بوو، بەڵام یەک وشـەی حاڵــی نەبووم. کوڕێکی گەنج هاتەوە ماڵەکەی کەوا ئێمەی لێبوو، دەسـتی هەڵبەسـترا بوو، لە کوڕەم پرسـی: ئەوە دەسـتت چیەتی؟ گوتی: (تبلێت منیّ بەرانی تێشت) هەر ناوە ناوە دووپاتم دەکردەوە، حاڵی نەبووم هەر ئەو رستەی پێشوی بۆ دووپات و سیّ پات دەکردمەوە. ئاخری بێزار بوو دەستی کردەوە، دیتم پەنجەی گەورەی مێخەکــە (مـوەی) لێهاتــوە، بە پەنجەی گــەورە دەڵێت: تبلێـت بەرانی چونکە لەچـاو پەنجەکانی تر وەک بەران وایە.

ڕۆژی دوایی چوین بۆ ناو باغێکی سێوان لەبەرامبەر ئامێدی، دەکەوێتە باشوری ئامێدی، ئەو ڕۆژە دوو کادیری حیزبی شیوعی لەئامێدی هاتنە لامان، بەداخەوە ناوەکانیانم لەیاد نییە، باســی بارودۆخی ناوچەکەیان بۆ کردین.

# گەڕان بەدوای سەربازێکی هەڵاتوودا

ئەوکاتــەی بارەگای هەرێمی کوردســتانی حیزبی شــیوعی لەکافێ بوو، لە گەلی توبــا. من و شــەهید عەونی، هەردووکمان ســەرپەل بوین و بەرپرســیاریەتیمان وەرنەدەگــرت، لــە حیزب غــەزری بوین. منداڵمــان هاتبوون، لەنزیــک بارەگای حیــزب کەپرمان کردبوو. چوین ســەرێک لەهاوڕێیــان بدەین لە بارەگای هەرێمی کوردســتان، لەوسەروبەندە شــەڕی فاو لەخواروی عێراق تازە ڕویدابوو، لەنێوان عێراق و ئێران. باســی ئەوەیان دەکرد،گوایە: وەزیری دەرەوەی ڕوســیا، لەکاتی ســەردانی بۆ بەســرە، چــاوی بەو کاولکاریــە کەوتوە، گریاوە !! من و شــەهید عەونیــش، بەجوت گوتمان: بریا خوێن لەچاوی هاتبایە، ئەوە بۆ نەوتی بەســرە گریــاوە. ئەگەر لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە بایە دەبوو، بۆ عەبادانی ئێرانیش دوو سێ فرمێسکی هەڵرشتایە.

بوو بە گفتوگۆ، گوایە: ئێمە (ئومەمی نین) لەگەڵ سیاســەتی حیزب نین. گوتم: ئاخــر ئــەو فڕۆکە و تۆپانەی ڕۆژانە موشــەک بارانمان دەکەن هەموی ڕوســین، بچم لە چوار دەوری مەقەڕ پارچە ســاروخە ڕوســیەکانتان بۆ بێنم؟!! گوتیان: ئەگەر ڕوسیاش نەیداتێ، ئەوا ئەمریکا دەیداتێ، باشترە نزیکایەتی لەگەڵ ڕوسیا هەبێ. بە تورەبوون ڕۆیشــتین، پاشــان ڕاپۆرتیان لەسەر ئێمە نوسیبوو کە ئێمە زیاد لە پێویســت کەوتوینەتە ژێر کاریگەری ناسیۆنالیســتی، سیاســەتی حیزب هــەزم ناکەین. جێگای داخە ئەوانەی لەو ڕۆژە لە بارەگای هەرێمی کوردســتانی حیزبی شــیوعی بوون و مناقەشــەیان لەگەڵ ئێمە دەکرد، دوو یان ســێیان نەبێ هەر هەمویان بوونە پارتی و هەموشــیان ئێســتا لەراگەیاندنی پارتی کار دەکەن و حیزبی شــیوعیان بەجێهێشت، ئێستا موزایەدەی نەتەوەپەروەری و کوردایەتی

بەسەر ئێمەدا دەکەن. بەداخەوە شەهید عەونی پاش ئەنفالەکان لە سێدارە درا.
مــن و ئامۆزایەکـم بەنـاوی جەنگـی، لەگـەڵ مەفرەزەیەکـی لقـی قەرەچوغ بە بەرپرسیاریەتی ئەبو احلام و مەفرەزەیەکی لقی هەولێر بەبەرپرسیاریەتی شەهید مـلازم برِوا، خۆمان ئامادەکرد بۆ خوارەوە، بەڵام ئێمە لەگەڵ هاورِێ موحسـین دەشـتی هەر سـێکمان هەتا خوارەوە لەگەڵیان دەرِۆیشتین، دەبایە من وجەنگی ئامۆزام، بچینە ناو هەولێر بۆ هەندێ کاری پێویسـت.
لەکافێ بەرێکەوتین بۆ نانی نیوەرِۆ گەیشـتینە بانێ، بۆ رِۆژی دوایی گەیشـتینە بارەگای بەتالیۆنی ٣١ لە ئیروان، لەوێ رِۆژی دواتر مەفرەزەیەکی خۆشناوەتی، بەبەرپرسـیاریەتی موحسـین یاسـین بەگەڵمـان کەوتـن، بۆ گوندی سوسـێ و سـەرکەندار. لەوێ ملمـان لەبەر چیای کۆلیس نا، کە هەورازێکی زۆر سـەختە، بەسـەرکەوتین بـۆ گونـدی بیـە، سـەرئاوی بێخمە. نزیکـی شـەو کەڵەکەکان بەکارکەوتن بۆ پەرینەوەمان. لەگەڵی بێخمە بۆ بەری ئامۆکان بەو شەوە ساردە، مەتارەکانمـان بـۆ پرِکردنـەوە، دا بە زیرەک کەمال (ئێسـتا رِۆژنامەنووسـێکی نـاودارە و راوێـژکاری حکومەتـی هەرێمـە)، لەپرِ نوقمی بـن ئاوەکە بوو، بەس سـەری مابـوو تەرِ بێ ئـاو لەهەموو گیانی دەتکایـەوە، مەخزەنەکانی پرِ لە ئاو ببوون، لەسـەر لمەکەی لێواری ئاوەکەبوو، مەتارەکانی پرِ ئاو دەکرد دەیخستنە ناو جامانەکەی کە لە شانی کردبوو، هەتا زیاتر گران دەبوو، ئەو زیاتر رِۆدەچوو. جەنگی لە ئاوەکە دەری هێنا، خەریک بوو ئەویش نقوم بێ، بەوشـەوە ئەوەندە پێکەنین، نازانم ئەو کورِە چۆن ئەوشـەوە رِەق هەڵنەهات لەسـەرمان. ملمان نا بەرەو بابەگیسـک لەسـەر کانی رِەشـان، رِووناکیمان لێداهات، هاورِێ موحسین گوتی: چوار پاسـەوان دابنێن لەسـەر شـاخەکە، بەڵام کانی رِەشـان شوێنێکی رِووتـە، نزیکەی هەشـتا پێشـمەرگە دەبوین، لەو شـوێنە نزیکەلـە رِژێم ئەگەر ئاشـکرا ببایـن، هەموومان تێ دەچویـن. لای کاتژمێر یازدەی پێش نیوەرِۆ بوو، پاسـەوانەکان بانگیان کرد بڵاوبن، دوازدە ئۆتۆمبێلی رِژێم هاتن، ئەوان گوتیان: دوازدە، بـەڵام هـاورِێ موحسـین بـە دوازدە فرِۆکە حاڵی بوو، بـە دوو خولەک هەریەکە جێگای خۆمان گرت، چونکە پێشـوتریش هەر نیمچە دابەش بوونێکمان کردبـوو، دوایـی ئۆتۆمبێلـەکان هاتن بۆ سـەر کەندو رِەزگەو بابەگیسـک، ئێمە لەسـەر تەپۆلکە شـاخێک بوین، پاڵم بە بەردێکی وەک کێلی گۆرِسـتان دابوو،

بەدووربیــن ســەیرم دەکــرد. لەناکاو زۆر لەنزیک خۆم ئەفســەرێکی ڕژێم و پێنج ســەرباز هاتنە ناو دووربینەکەم، لەســەرخۆ دووربینەکەم دانا، زۆر نزیک بوون، ســەیرێکی دیوی لای مەرزان و کەلەکینیان کرد. هاوڕێ موحســین گوتی: کەس تەقــە نــەکا هەتا پێمان لــێ دەنێن!! هەندێ لەبــرادەران پێیان وابــوو ئێمەیان بینیــوە، دوودڵ بــوون بێن بۆ لای ئێمە یان بە پێچەوانەوە. تۆزێک ڕاوەســتان، بەرەو لای بابەگیسک شۆڕبوونەوە، ئەگەر بۆ لای ئێمە هاتبان ئەو شەش کەسە، کەســیان دەرنەدەچوو، بەڵام ئاشــکرابوونمان تێچونی ئێمــەش بوو، دوای پاش نیــوەڕۆ هێزەکــە گەڕایەوە. دەرکەوت، لەدوای ســەربازێکی هەڵاتوو دەگەڕان کە لە برا ئێزیدیەکان بوو، لەخزمەتی ســەربازی هەڵاتبوو. بۆ ئێوارە چوینە گوندی ڕەزگــە، نانــی ئێوارەمان لەوێ خوارد، پاســەوانمان دانا، بەیانی شــەوی مابوو لەگوند وەردەرکەوتین بەرەو ئەو شــاخەی پشتی زێبارۆک.

## کونە مشکمان کرد بە تەوالێت

مــن و هــاوڕێ مــەلا عومــەرو پێشــمەرگەیەکی تــر، لام وایــە عەولا پــۆلا بوو. لەماڵــی هــاوڕێ عەلی ڕەزگە دابەش ببوین، یەک شوشــە مرەبای هەنجیریان بۆ دانابوین. مەلا عومەر گوتی: نامانەوێ لەگەڵ خۆمانی ببەین، قوڕسە کەس پێی هەڵناگیــرێ. لەنــاکاو مەلا عومــەر چوە دەرەوە، منیش شوشــە مرەباکەم لەناو کۆڵەپشــتەکەی هاوڕێ مەلا عومەر شاردەوە. لەبەرئەوەی مەلاعومەر کادیر بوو، کۆڵەپشتەکەی پڕ بوو لە بڵاوکراوەی حیزب. دەترسام بەم کارەم بزانێ و قسەم پــێ بڵێ، چونکە زۆر دۆســتی بابم بــوو. کاتژمێر چــواری بەرەبەیان لە گوندی ڕەزگە دەرکەوتین، بەرەو شــاخی پشــتی زێبارۆک. کاتێک ڕووناک داهات، ئێمە گەیشــتینە سەرشــاخ، خوا خوام بوو کۆڵەپشــتەکەی دابنێ، بۆ ئەوەی شوشــە مرەباکــە دەربێنم و لەناو کۆڵەپشــتەکەی خۆمی بئاخنم. بەهیچ شــێوەیەک ئەو کۆڵەپشــتەی دا نەدەنــا، لەبەر بڵاوکراوەکان، زۆری ئــاگا لێبوو، بۆ دەوروبەری شــەمامک دەیبردن. پێمگوت: هاوڕێ، تفەنگ و کۆڵەپشــتەکەت دانێ، دوو ســێ

چیلکــە دارم بــۆ بێنــە، تۆ چی تر مەکە، مــن نان و چا بــۆ هەردووکمان حازر دەکەم، تۆ دانیشە.
گوتی: باشــە. کۆڵەپشــت و تفەنگەکەی دانا، چوو دار بێنێ، بەخێرایی شوشــە مرەباکــەم دەرهێنا لەناو کۆڵەپشــتەکەی خۆم دانا، بە بنە مەتارە چام بۆ خۆم و هاوڕێ مەلاعومەر ســازکرد. ئەگەر شوشــە مرەبام دەرهێنا، مەلا عومەر زۆری پێ ســەیر بوو، دەیگوت: هەتیوە تۆ زۆر نەوسنی ئەگەر نا ئەو شوشە قورسەت چــۆن بــەو هــەورازە هەڵگرت؟!! نانمان خــوارد، دەم نا دەمێــک دەیگوت: پێم بڵێ چۆنت ئەو شوشــە مرەبایە هەڵگرت؟!! دەهاتە ســەر زمانم بڵێم بخۆ، خوا دەزانێ کێ پێوەی ماندوو بوە، بەڵام زۆر دەترســام بزانێ و لێم زویر بێ، هەتا ئێســتا بۆم نەگێراوەتەوە، چونکە لەســاڵی ١٩٩٠ ەوە لە دانیمارک دەژی، ئەگەر بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە بزانێ. نانی نیوەڕۆشــمان بەو مرەبا هەنجیرە خوارد، بــەڵام ئەوکاتــی لە گەڕانەوەمان بە ملازم هەژارو چەند برادەرێکی ترم گوت.
پاش نیوەڕۆ شــەش پێشــمەرگەی یەکێتی بەقەڵاتی دوین دا هاتنە دیوی ڕەزگە، لــەلای پانکانەوە ڕاهاتن. لەخوارەوەی زێبارۆک لەگەڵ لقی قەرەچوغ، بۆ ماوەی نیــو کاتژمێر بوو بە تەقە، ســێ پێشــمەرگەی یەکێتی برینداربــوون، کەرێکیان کــوژرا، هاوەنێــک و گێرســەیەک و تاخمێک لەســەر پشــتی کەرەکــە بوو، لقی قەرەچوغ هێنایان. بۆ شــەوێ چوینە گوندی ســەرکەند، جاشی ڕژێم بوون، شەو لە ڕەبیەکانی ئەوان پاسەوانیمان دەکرد، ئەوان لەماڵی خۆیان خەوتبوون. ئەو گونــدە دوژمنایەتیان لەگــەڵ یەکێتی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئێمە و سۆسیالیســت وەک برا بوون.
ئــەو ڕۆژو شــەوە زۆریــان خزمەت کردیــن، چونکــە زۆر لەو هاوەنــەی یەکێتی ترســابوون، پیــرەکان دەیانگوت: ترســمان نەما مادام ئێوە ئــەو مەترەلۆزەتان لێگرتن.
بەیانی ڕۆیشــتین بۆ دیوی پانکان، لەوکەندو شیوانە، خۆمان حەشاردا تا تاریک داهات. نهێنی شەومان دانا، بەڕێ کەوتین، دوو دوو لەلای خانزاد لەخوار مەسیف لــە ڕێــگا پەڕینەوە، بــەڵام لەقەڵاتەکەی خانــزاد ڕەبیەکی تێدابوو، ســەگی زۆر دڕیان هەبوو، هەستی ئێمەیان کردبوو، زۆریان بە بی کەی سی، تەقە لێکردین. ئێمە وەڵاممان نەدانەوە، هەمووومان پەڕینەوە، شــەوی مابوو گەیشــتینە پشــتی

هەناره، بەرامبەر ســەری ڕەش، لەوێ هەریەک لەبن تەڕاشـێک، ئاودرێک خۆمان بوارد، وەک گیانداره کێویەکان هەتا تاریک داهاتەوە کەس بۆی نەبوو جموجۆڵ بکات. تاریک داهات، چوینە دۆڵی خانێ. هەندێ ڕەشـماڵی لێبوو، لەوێ نانمان خوارد. تۆزێ سەرمام ببوو، دوو بەستە حەبی (فلوئاوت)م لەناو کۆڵەپشتەکەی بوو. دەرمهێنا حەبێک بخۆم، پیاوی ماڵەکە لەتەنیشـتم دانیشـتبوو، گوتی: ئەو حەبـە هــی چیە؟ گوتم: ســەرمابوون و هەڵامــەت، گوتی: حەبێکـم بدەیە. هەر ئەوەندە خۆش بوو حەبێکم دابەو، ئیدی وەک جگەره پێشکەشـکردن بەناو ئەو ڕەشــماڵە لەژن و پیاو دەیانگێرا یەک حەبیان نەهێشــت. بەیەک چرکە هەردوو بەسـتەکە تەواو بـــوو. خوا حافیزیمان کرد. لە شـــاڕێی هەولێر- کۆیە پەڕینەوە، بە شەرەبۆتدا تێپەڕی

ن، لەگونـدی حاجی وســو ماینەوە، ڕۆژی دوایی چوینــە گوندی پونگینە، چوار چــوار دابەشــبوین، لەبەرئــەوەی لەناکاو ئەگــەر یەکێتی بهاتبایە بــۆ گوندەکە، ئــەوا دەبــوو لێـک بدەین، بۆیــە یەک دەبوو بە پاســەوان ســێیەکەی تر نانمان دەخــوارد. هەرچەنـدی لێیان دەپرســین: ئێوە چین؟ دەمانگوت: پێشــمەرگەی یەکێتی. باوەڕیان نەدەکرد، چونکە ئەوان بە ئۆتۆمبێل دەگەڕان و خاوێن بوون، ئێمەش هەموو گیانمان ئارەقە و تۆزو پیسی بوو، وە فیشەکی زیادیمان زۆر پێ بوو. لەوێ لە لقی قەرەچوغ جیابوونەوە، لەیادم چوو، لقی خۆشناوەتیش لێمان جیابوونەوە، ئێمە لەگەڵ لقی هەولێر ماینەوە. دەچوینە هەر گوندێک پڕ بوو لە یەکێتی، لەوکاتەدا هێشتا گوندی ئیلنجاخ و گەڕەشێخان نەروخێندرابوون، شایانی نوســینە: هەتــا لقی قەرەچوغ لــە پونگینە لە ئێمە جیانەبوونــەوە، ئەبوئەحلام چاوساغ و دەستکێشمان بوو، من شەرمم دەکرد، هاوڕێ ئەبوئەحلام کە خەڵکی بەغدایــە چاوســاغمان بێ، ئێمە کــوڕی ناوچەکەبین ڕێدەر نەبەیــن بۆیە، گوتم: هاوڕێیان، لە گۆمەگرو هەتا لەشاڕێی هەولێر- کەرکوک دەپەڕینەوە، من شارەزام و پێــش دەکەوم. شــەوانە گلۆپــی گوندەکان زۆر نزیک دیــار دەکەن. چوومەوە نێوان زوورگی شێخ سمایل و ئیلنجاخ، لەوێش بەلای شاخی گاوانان و گۆڕستانی گەڕەشــێخان. لــەلای مزگــەوت هەندێک ئۆتۆمبێلــی یەکێتی دیاربــوو، نازانم چ هاوڕێیەک بوو، دەمنا دەم لە پشــتەوە شــەیالەی تاخمەکەی دەگرتم، دەیگوت: هــاوڕێ حازم زۆر لە گوندی نزیک بویــەوە، تۆ دڵنیای ڕێگات هەڵە نەکردوە؟!!

نە جارێک و نە دوو. منیش تورە بووم، گوتم: کاکە ئەو گردە بەرزەی لای گردی مهندسـی دەبینی؟ بەمنداڵی ڕەنگە بیسـت شەروارم لە خشخشۆکەی دڕاندبێ و سـەد شـەقم خوارد بێ لەسەر دڕاندنی شـەروارەکان. تۆ بە من دەڵێی: ڕێگات هەڵـە کـردوە؟!! گەیشـتینە قەراغ شـاڕێی هەولێر- کەرکوک. بـاش بوو کەمین نەبوو، بەپەلە بە غاردان لەشـاڕێی کەرکوک هەولێر پەڕینەوە.
گەیشـتینە گونـدی قازیخانە شـەو نەمابـوو، چوینە ماڵی مام عەلـی. کوڕێکی لەسـەر حیزبی شـیوعی لەسـێدارە درابوو، بەناوی شـەهید ڕەزا. ئێمە بیست و پێنج پێشمەرگە دەبوین، نان و ماستێکی بەپەلەیان داینێ، پێمان گوتن: چیمان لـێ دەکـەن؟ گوتیان: لەنـاو گوندی، خانوێکی چـۆڵ هەیە کلیلی بـە ئێمەیە، خێراکـەن هەتـا ڕووناک دانەهاتوە بچـن بۆ ئەوێ، دەرگاتان لەسـەر دادەخەین هەتـا ڕۆژی دوایـی شـەو دێتەوە، بۆتان نییە نان و ئاویـش باس بکەن، یان بۆ سـەرئاو گرتن بێنە دەرەوە، بەڵکو دەبێ دان بەخۆتاندا بگرن. ژنەکان گوتیان: ئێمە دەبین بە پاسـەوان، هەر شتێک بوو ئاگادارتان دەکەینەوە. لەکاتی چوونە ژوورەوەمانـدا، هاوڕێ موحسـین دەشـتی بەکۆنە پەتۆیەک، شـوونی پێیەکانی خۆمانی ڕادەماڵی، بۆئەوەی ونیان بکات. (قازیخانە کەوتۆتە دەشتی هەولێر لە نێوان شـاڕێی، مەخمور- هەولێر، وە کەرکوک هەولێر).
دەرگایان لەسـەر داخسـتین، ئێمە ئەوەندە هیلاک بوین، پێنج خولەکی نەخایاند هەمـوی خەوی لێکەوت، ئەوەی پرخـەی دەهات ئاگادار دەکرایەوە، یان وەرمان دەگێڕا سـەر تەنیشـت. کاتژمێر نۆی بەیانی بوو، ئەوەنـدەم میز دەهات، لەبەر ژانی سـکم خەبەرم بووەوە. دوو ژوور بوو، هەردووک تێکدابوو، گەڕام فانوسێکی گـەورە بەسـنگێک وە کرابوو، هێنامە خوارەوە، یەک قەتـرە نەوتی تێدا نەبوو، پڕم کرد لە میز. سـەرم دەبەسـتەوە و دۆخینم بەدەسـتەوەبوو، وەختێک مچە بەخەبـەر هـات، (مچـە عەدەد بی کەی سـی بـوو)، گوتی: ئـەوە چیت کرد؟ گوتـم: مەترسـە، هیچم نەکردوە. من لەگەڵ مچـەی گاڵتەم هەبوو، زۆرم خۆش دەویسـت. گوتی: ئـەوە میزت کرد؟ گوتم: بەڵێ. گوتـی: لەکوێ؟ گوتم: لەناو ئـەو فانۆسـە. گوتـی: پڕبوو؟ گوتم: زیادیـش بوو. گوتی: لەکـوێ میز بکەم؟ گوتم: هیچ شـوێنێک نییە، گەڕا لای سـەری هاوڕێیەک کونە مشـکێکی دیتەوە، یەک یەک هاوڕێیان بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەو کونە مشکە میزیان کرد. ئێمە لەوە

دەترسـاین، لەو دیو لەماڵێکی تر کانی دەربێ، بەس شـوکر هیچ خەبەر نەبوو. بەهەزار دەردە سـەر ئەو ڕۆژەشمان کردە شەو. هاتینە دەرەوە، لەدوو سێ ماڵ شیوی چاکیان ئامادەکردبوو، نانی چاکمان خوارد. بەتایبەتی ماڵی مام عەلی و مـام عەزیز. مام عەزیز یەک لە پیاوە تێکۆشـەرەکانی گوندی قازیخانە و لەگەڵ ئێمـە پێشـمەرگەبوو، هەموو جـارێ باوکم گاڵتەی لەگـەڵ دەکرد دەیگوت: مام عەزیز لە سۆبەی نزیک مەبە با ڕیخۆڵە نایلۆنەکانت نەتاوێتەوە. مام عەزیز چەند ڕیخۆڵەیەکـی نایلۆن بوو بەو حاڵەش لە ئێمە چالاکتر بوو.

# دایکی شوکر

بەرێکەوتیـن بـەرەو جدیدەی لـەکان، ماڵە خزمێکی ئێمە لـەوێ هەبوو. من و جەنگی دابڕاین لە مەفرەزە، شـەوی دوەممان بوو لەو ماڵە خزمە، نیوەشەو بوو ئەگەر پێشـمەرگەکانی یەکێتی دەرگایان لـەو ماڵە گرت، باوکی خانەخوێیەکەی ئێمەیـان ڕاپێچا بۆ مزگەوت، گوتیان: ئەو پێشـمەرگە شـیوعیانە چیان لێهات؟ ئێمـە لـە ژوورێکی تـر بوین، نەهاتن بۆ لای ئێمە. هەسـتاین خۆمان بەسـتەوە دەرکەوتیـن بەرەو گوندی ئەسـحابەلەک. لەوێش ماڵـە خزمێکمان هەبوو، زۆرم بـاوەر پێیان هەبـوو. ڕومان لەماڵی مام مەحمود کرد لە گوندی ئەسـحابەلەک. لەدەرگامانـدا، زۆر خۆشـحاڵ بوون. ئەوەی ڕاسـتی بێ ئـەو خزمەی خۆمان لە گونـدی جدیـدە، لـە پێشـمەرگایەتی ناوی سـۆران بوو، ناوی خـۆی خدر بوو، لەگەڵمان هات تاوەکو ماڵی مام مەحمود. کوڕێکی زۆر ئازا و زیرەک بوو. ماڵی مام مەحمود یەک ژووریان هەبوو، حەساریان نەبوو، بەرامبەر ژوورەکەی خۆیان هۆڵێکـی ئاژەڵی لێ بوو، یەک گۆلکی تێدا بەسـترابوەوە، هەرچەندی هەوڵیاندا ئێمـە لەگـەڵ ئەوان لـەو ژوورە بنوین، بەڵام قەبولّم نەکرد، پێـم گوتن: بەیانی خەڵکـی نـاو گوندی دێن بـۆ ماڵی ئێوە، با کەس ئێمـە نەبینێت، ئێمە دەچینە لای ئـەو گۆلکـە دەخەوین. بەزۆری چوینە لای گۆلکەکە، قەسـەرمان ڕاخسـت لبادمان لەسـەر ڕاخسـت لێی خەوتین. بەیانی لە بەدبەختی ئێمە منداڵی ئاوایی پشـیلەیەکیان تەنـگاو کرد بـوو، هەموو منداڵـی گوندی بەدوای ئەو پشـیلەوە

بـوون، نازانم چ تاوانێکـی کردبوو، دوایی گوتیان: جوجکەی خواردوە. پشـیلە چاوی دابوە ئەو هۆڵەی ئێمەی لێبوو، جەنگی بە هەردوو دەسـتی قەسـەری لە کولانەکان دەنا. پشـیلەکە، کە قەسـەری بە دەموچاوی کەوت گەڕایەوە بۆ ناو گونـدی. مـام مەحمود کوڕێکی هەبوو بە ناوی شـوکر. شـوکر خوێندەوار بوو، دوایـی بـوو بـە کارمەند. دایکی شـوکرم حاڵی کردبوو: کـە خواردنی نیوەڕۆی بـۆ هێنایـن لەناو ئەو تەشـتە دایبنێ کـە ئالیکی گۆلکەکـەی هەموو ڕۆژێ پێ دێنێ. دایکی شـوکر بەحسـاب پاسـەوانی ئێمەبوو، ئەگەر شـتێ لە گوند نزیک دەبوەوە، کە مەترسـی لێ بکرێ خەبەردارمـان بکاتەوە. بەڵام ئەو هەتا دەنگی تێـدا بوو هاواری دەکرد: مەترسـن ئـەوە ماتۆڕی زراعەیە هاتـوە مانگای ماڵی فلانی کەل دەدەن، واتە چای دەکەن. ئەوجارە هاواری دەکرد: ئەوە ئۆتۆمبێلی مامۆسـتاکانی قوتابخانەیـە هیـچ نییـە!! ئەوجارە هاواری دەکـرد: ئەو گرەگرە هیـچ نییـە ئۆتۆمبێلی حەمیدیە دێتەوە ناو گوند!! چـاک بوو گوندەکە بڵاوبوو، ئەگەر نا هەرچی گوێی لەدایکی شـوکر بوایە بۆی ئاشـکرا دەبوو کە پێشمەرگە یـان پیـاوی قاچاغ لەماڵەکەی ئەوان هەیە و ئەویان کردوە بە پاسـەوان. گوتم: جەنگـی، خـودا بکا ئـەو ڕۆژەمان لێ بکاتەوە شـەوو دنیا تاریـک بێ، خۆمان لەدەست ئەو ژنە نەجات بدەین.

لەوکاتەدا دەمگوت: حەسـەن زیرەک ڕاست دەکات، دەڵێ: شەو قەڵای مێردانە، زۆرم حـەز دەکرد شـەو بێتەوە. ئەو ژنە ئێمەی هێندەی شـوکری کوڕی خۆش دەویسـت، بەڵام شێوەی پاسـەوانی نەدەزانی، تاریک داهاتەوە ماڵ ئاوایمان لە گۆلکەکە کرد، چوینە ژووری دانیشتن پێمان گوتن: نانی بەیانی و نیوەڕۆمان بۆ دابنێن، شـەوی بمێنێ ئێمە دەڕۆین بۆ بناری زورگە زراو، لەوێ خۆمان حەشـار دەدەین، هەتا نوێژی شـێوان، دوایی دێینەوە.

زۆریان پێ ناخۆش بوو، بەلام بەقسـەی ئەوانم نەکرد. کاتژمێرێکی شـەو مابوو دەرکەوتین، لەبناری زورگەزراو خۆمان حەشار دەدا تا ئێوارە هەڵنەدەستاینەوە سەرپێ. کە شەو دادەهات بەرەو ماڵی مام مەحمود دەکەوتینەوە ڕێ بۆ ماوەی شـەش ڕۆژ. دوایـی موحسـین هات لەگـەڵ ئەو ڕۆیشـتین بۆ گونـدی هێلەوە. موحسـین ماڵی لەوێ بوو، شـوێنێکی دروسـت کردبوو لەناو دیوار، جێگای سێ بـۆ چوار کەس دەبوەوە، هەر کە هەسـتمان بەخەتەر بکردایە دەچوینە ناو ئەو

کونەی دروســتی کردبوو، ئێمە دەبوایە بچینە ناو هەولێر، ماوەی پازدە ڕۆژ لەو ناوچەیە ماینەوە. هاوڕێ موحســین پێی خۆش بوو ئێمە لەگەڵ ئەو بمێنینەوە. ڕۆژێــک پێشــمەرگەی یەکێتی بەگونــدی هێلەوەیان وەرکــرد، ئێمەش چوینە ناو کونە فیرارەکەی هاوڕێ موحسین دەشتی. لە نێوان موحسین دەشتی و یاسینی برای نهێنییەک هەبوو، ئەگەر یاسین زوڕنای سەر چیایی لێ بدا، ئەوە لە کونەکە وەرە دەرەوە!! ئەو ڕۆژە دوو پێشــمەرگەی یەکێتی لەماڵی کاک یاســین بوون، داوایان کردبوو بە زوڕناکەی حەیرانێکی ســەر چیایان بۆ لێ بدا، کاتێک گوێمان لە زوڕنای بوو، ویستمان بێینە دەرەوە، باش بوو خوشکە عەتیە فریامان کەوت، ئەگــەر نا، ئەو ماڵەمان دەکردە مزگەوتی گەرەوان.

# چوینە ناو هەولێر

هەر ڕۆژەی لە گوندێک و هەر ڕۆژەی لە ماڵێک دەشــاردراینەوە، بەراســتی لەو ڕۆژگارە ئــەوەی پێشــمەرگەی لەماڵــی خۆی حەشــار دابایە، جەرگــی هێندەی ساجێک بوو، چونکە پێزانینی بچووکترین شت لەلایەن ڕژێمەوە، مانای سەروماڵ تێدا چوونی ئەو کەسە بوو. لە گوندی عەلیاوە چوینە ماڵی برایم پاشا، ( ماڵی ئەو بەرێزە بۆ هەموو پێشمەرگەیەک کراوە بوو، هەرچەندە بەخۆی سۆسیالیست بوو، بەڵام لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی وەک برایم پاشــا کەم بوو) لە گوندی ماســتاوە لەماڵــی کاک ســەباح ماینــەوە، بەخــۆی و خێزانە بەرێزەکــەی، هەرگیز ماڵیان چــۆڵ نەبوو لە پێشــمەرگە، داوامان لێکــرد ئایا دەتوانێ بمان با بۆ ناو هەولێر؟ ئامادەیی خۆی نیشانداو، گوتی: سەری من لەسەری ئێوە زیاتر نییە و دەتانبەم. بەراســتی پاداشتی ئەم گیانبازیەی ســەباح بەکەس نادرێتەوە. سەباح مریشکی دەفرۆشــت، پیکەبێکــی تۆیۆتــای هەبوو، هەمیشــە پڕبوو لە قەفەزە مریشــک. کاک ســەباحم نــارد بۆ لای ماڵی خزمێکم بەناوی هــادی (خوا لێی خۆش بێ)، بــۆ ئــەوەی بزانم ئامادەیی هەیە بچینە ماڵەکــەی یان نا. کە هاتەوە پێی گوتم: دەڵێــت بیانهێنە خۆ ئێمە لە چاوی ئەوان زیاترنین.

بەیانییەک، پێش ڕووناک دابێت، لبادێکی لەناو پیکەب ڕاخست، ئێمە هەردووکمان

لەســەر لبادەکە درێژ بوین، قەفەزی مریشکەکانی لەسەر ئێمە بارکرد. ڕۆژهەڵات لەگوندی ماستاوە بەڕێکەوتین بۆ هەولێر. ئاگام لێبوو، گەیشتینە بازگەی مەخمور-هەولێر، (بە تاسـەکەی بازگە زانیم)، گوێم لێبوو بەعەرەبی ئەمنەکەی بازگەکە گوتی: (اتلع)بـڕۆ. لای کارگەی نەسـیج ڕایگرت، هاتـە خوارەوە دەیگوت: قەفەز ئێرە کارگەی نەسـیجە، بەخوای پارەی چاک دەکەن، دەڵێم ڕاسـت بازۆم بۆ ناو دائیرەی ئەمن. ئێمەش نەماندەزانی کوێیە، نوقەمان نەدەکرد. جەنگی دەیگوت: مەگەر نەیەمە دەرێ!! سـواری پیکابەکەی بوەوە، ڕۆیشت بۆ مەنتکاوە بۆ ماڵی کاک هـادی، ئەو چـاوەڕوان بوو، دەرگای دەرەوەی کردبـوەوە ئۆتۆمبێلەکەمان چوە ژوورەوە. دەسـتیان کرد بە دابەزاندنی قەفەزە مریشـکەکان. ئێمە هاتینە خـوارەوە و چوینــە ژوورەوە. کوڕێکی هەبوو کــە چاوی بەو تفەنگ و ڕەختانەی ئێمە کەوت، گوتی: ئیلاو بیلا تفەنگم دەوێت. کاک سەباح خواحافیزی کرد. کاک هادی ئۆتۆمبێلێکی بەڕازیلی تەکسی هەبوو، چوو تفەنگ و دەمانچەی منداڵان بۆ کوڕەکــەی بکـڕێ، هێندەی نەخایاند هاتەوە، بــەڵام ئەو کوڕە تفەنگ و دەمانچە نایلۆنەکــەی شـکاندن، هەتــا دەنگی تێدابـوو دەیگوت: ئەوە تفەنگـی منداڵانە مــن ئــەوەم ناوێ، تفەنگــی وەکو ئەو مامانەم دەوێ کە لەو ژوورە دانیشـتوون، هی ئەوان تفەنگی بەراسـتیە. کاک هادی بلۆکی هێنا لەناو حەمام شـوێنێکمان دروست کرد کە جێگای چوار کەس دەبوەوە، دەرگاکەی ئاوێنەیەکی گەورەی لێ هەڵواسـی، کەس نەیدەزانی ئەوە دەرگایە. ڕۆژێکیان ژنی دراوسێکەیان هاتبوو، دەیگوت: حەمامەکەتان زۆر خۆشە هەر پیاوی دەوێ شتی وای لێ بکات و.. لەو قسە گاڵتەو گەپانەی دەکرد، کە ژن لەگەڵ یەکتری دەیکەن، ژنی ماڵەکە خزمی خۆمــان بــوو، کچی مــام مەحمود بوو، ئەو دەیزانی ئێمە گوێمان لەو قسـانەیە، بەڵام ژنی ماڵەکەی دراوسێیان نەیدەزانی دوو پیاو لەوێیەو گوێیان لەو قسانەیە، بەکەیفی خۆی قسەی دەکرد.

ڕۆژێکیــان، خوشــکی گەورەمــان حاجی گوڵان (خوا لێی خۆشــبێت) خوشـکی جەنگی و ئامۆزای گەورەی من، لەوماڵەی ئێمەی لێ بوین، لای خوشـکە سـافیە دەگریا، دەیگوت: قەت خەبەریان نازانی؟ خۆمان لێ ئاشکرا نەکرد، هەر چەندە نێوانمان تەنها یەک دەرگای داربوو!!

لەماڵــی کاک هــادی چاومان بە هەندێ برادەری باوەڕپێکراو کەوت، وەک: خالید

شینه و یاسین یابه و هیدایەت و چەند کەسێکی تر. لەدواییدا گوڵانی ئامۆزاشمان بینــی. دوایی چویــن بۆ ماڵی خاڵم، ماوەی دوو مانــگ لەهەولێر ماینەوە، بەڵام برا باوەڕی بە برا نەدەکرد، ڕۆژێکی زۆر تەنگ بوو، ئێمە فێری خۆشـاردنەوەی ناو شـار نەبوین، بەراسـتی پێشـمەرگایەتی شـاخ سەد هێندە خۆشـتربوو، لە خۆشاردنەوەی ناوشار.

## چۆن لەناوهەولێر دەرباز بوین

پـاش دوو مانــگ مانەوەمـان لەناو هەولێـر، هەوڵماندا لەهەولێـر دەربچین. ئەو کات کەناڵــی دەوری هەولێـر تەواو کرا بوو، کەمیـن زۆر دەردەچوو. خزمێکمان ئۆتۆمبێلـی بارهەڵگـری پێبوو، بەناوی هیدایــەت. ، زۆر ڕۆژان خواردەمەنی بۆ ســەربازگەی ڕوانــدز بار دەکرد. ڕۆژێک ڕۆنی قوتی یــەک کیلۆیی لەناو کارتۆن، بار کردبوو بۆ سەربازگەی ڕواندز. لەدوامان نارد، ناوەندی بۆدی بارهەڵگرەکەی چـۆڵ کـرد، ئێمە چوینە ئەو کەلێنە و دەرگایەکی هاویشـتە سـەر ئێمە و ڕۆنی لەســەر بارکردەوە، گوتی: ئەگەر ئاشــکرا بوین هەرچی هاتەسەر ئۆتۆمبێل ئێوە بیکوژن، منیش پێ لەگاز دەنێم، ڕادەکەین لەگەڵ ئێوە دەبم بە پێشمەرگە. پێم گوتبوو: لە باسـرمە ڕەت بوی ڕابگرە، بەس بەمەرجێک تاریک داهاتبێ، چونکە هەمــوی ســەربازگە بوو. لەهەمــوو بازگەکان ئــاگام لێبوو، تاســەی لێبوو، یان گوێـم لە ئەمنەکان دەبوو بەزمانی عەرەبــی دەیانگوت (اتلع)برۆ. دەمەوئێوارە، لەچایخانــەی باســرمە ڕایگرت. لەدوای کاتژمێر چـوارو نیوی ئێوارە، دوو ئیڤا و یــەک مودەڕەعە دەگەڕانەوە بۆ ســپیلک، ســەربازگەیەکی گــەورەی لێبوو، هەر ئۆتۆمبێلێکــی حکومی لــە ڕێگا بایە، لەگەڵ خۆیان دەیانبــرد. ئەو بارهەڵگرەی کاک هیدایەت حکومی بوو، بارەکەشــی بۆ ســەربازگەی ڕواندز بوو، بۆیە لەدوای ئۆتۆمبێلەکــەی ئێمــە ڕایانگرت، داوای شــۆفێریان کــرد، کاک هیدایەت چوو بۆ لایــان، پێیان گوت: بۆ ناڕۆی وەخت درەنگــە، ئۆتۆمبێلەکەت حکومیە بارەکەت بۆ سەربازگەیە ناترسی تێکدەرەکان (موخەریب)، ئۆتۆمبێلەکەت بسوتێنن؟!! بێ

خەبــەر لەوەی دوو (موخەریب)رژێم گوتەنی، لەنــاو ئۆتۆمبێلەکەن !! لەوەڵامدا گوتی: ئۆتۆمبێلەکەم زۆر تەواو نییە. گوتیان: با ڕاتبکێشــین؟ گوتی: پێویســت ناکا، وردە وردە پێی دەڕۆم. هیدایەت بەڕێ کەوت، ئەوانیش لەتەنیشتمان ڕەت بوون و بەپێشکەوتن. بەڵام ئەگەر هیدایەت بڕۆیشتایە بۆ ئێمە دوور دەکەوتەوە، ئەگەر نا هێشتا تاریک دانەهاتبوو، ئێمە دابەزێنێ. تاریک داهات، بارهەڵگرەکەی ڕاگرت، ڕۆنەکەی لەسەر ئێمە لابردو دەرگاکەی هەڵگرت، گوتی: بە ئازایی خۆتان فڕێــدەن. هــەر زوو خۆمان فڕێدا، گوتــم: تۆ بڕۆ، دوور بکــەوە. پەنجا مەترێک لەڕێگــەی ســەرەکی دوور نەکەوتینــەوە، ســەیرمان کرد، بەرامبەرمان ســیاجی بەخۆڵ دروســتکراوی ســەربازگەیەکی (جەیشی شــەعبی)ە. لە ئۆتۆمبێلەکانیان زانیمــان، چونکــە ئۆتۆمبێلی (جەیشــی شــەعبی) هەموی هینۆی ســپی بوون. دووربینێکــی ئەڵمانی زۆر چاکم پێبوو، دانیشــتین پێشــخۆمان تەماشــا دەکرد، هەڵدەســتاینە سەرپێ دەڕۆیشتین، هەتا ئەو شــوێنەی تەماشامانکردبوو، ئینجا دادەنیشــتینەوە، دووبارە بە دووربین تەماشــای پێش خۆمان دەکرد. لەحانوتی ناو ســەربازگە بۆنی یەک مەحکەرۆنی زۆر خۆش دەهات، گوێمان لێب
وو، بانگی یەکتریان دەکرد. بەهەزارحاڵ ئەو سەربازگەیەمان ڕەتکرد و بەناویاندا تێپەریــن. وە نەبــێ لە ئازایەتیمان بێ، بەڵام تووش ببوین، بەخواســتی خۆمان نەبــوو. لە دوایین ســاتر دەرباز بویــن، پێڵاوەکانمان ئەوەنــدەی قوڕی گرتبوو، ببوە پێڵاوی ئەحەی کڕتۆ.

خۆمــان لەروبــاری قاســمیە دا، پەڕینەوە ئەوبــەر، دەمانویســت بچینە گوندی مــەرزان، لــەوێ بۆ گونــدی کەلەکینی فەرحــان ئاغا، هەمویان چەکــداری ڕژێم بــوون، پێــش ئەوەی بچیــن ئاگادارمــان دەکردنــەوە. ئێمــە هەردووکمان، بەم شــەوە ئەنگوستەچاوە، شــارەزای ناوچەکە نەبوین، ئەمەش گرفت بوو، ڕێگامان گرتەبەرو چووینە گوندێک، دیاربوو لەســەر تەپۆلکەیەک بوو. ئەو شــوێنەی ئێمە بۆی ســەرکەوتین، نەمانزانی ئەو گوندە پێشمەرگە قبوڵ ناکەن، دوایی گوتیان: ئــەوە پــردە بەردینەیە دوژمنایەتیــان هەیە!! بەجەنگیم گوت: تــۆ لەپەنای ئەو عارەبانە و تراکتۆرە دامەزرێ، من لە دەرگا دەدەم، ئەگەر چونە سەربان با من لێرە عاســێ نەبم، لەژێر دەســتی ئەوان، بەڵکو تۆ شــتێ بکەی تا دەرباز دەبم. لەدەرگامــدا، کیلۆنــی دەرگام داگرت داخرابوو، لەژوورەوە گوتیان: کێیە؟ گوتم:

خۆمانیــن پێشــمەرگەین، دیاربــوو لەژوورەوە خەریکی خۆبەســتن بوون. دەنگی ڕەخت و چەک دەهات، خۆیان ئامادە دەکرد، گوتیان: پێشمەرگەی چی بەژیانی پێشــمەرگە نەهاتۆتــە ئەو گوندە، با ماڵی (ئامرســریە) ئــاگادار بکەین. گوتم: پێویســت نــاکات ئێمە ڕێگامان هەڵەکــردوە دەمانەوێ بچینە مــەرزان. گوتیان: مــەرزان دوورە لێــرەوە. پیرەژنێــک لــە ژوورەوە هــەر دەیگوت: بابــم یەخەمان بەردەن ئێمە چەکداری حکومەتین، حکومەت بزانێ لەسێدارەمان دەدا، دەرگایان نەکردەوە، هەر بەقســە وەســفی ڕێــگای مەرزانیان بۆ کردیــن، وایاندەزانی ئێمە زۆریــن. هەر خوا خوایان بــوو لەیەخەیان ببینەوە، ئێمەش لەخوامان دەویســت توشــی هیچ نەبین، چونکە دوو پێشمەرگە بوین.

# شێرەژنێك لەخۆی گرتین

ڕۆیشــتین بەرەو گونــدی مەرزان، شــەومان درەنگ کرد. بەکانــی و مزگەوتەکە زانیمــان گونــدی مەرزانە، چونکە لە چونە خوارەوە جارێک مەرزانمان بینی بوو. یەکێک فانۆســی بەدەســتەوە بوو ســەر لە مەڕی بدات، هەر کە گوتمان: کاکە. ڕایکــرد بۆ ژوورەوە، وەڵامی نەداینــەوە، تۆزێکی تر چاوەڕوان بوین، ناو گوندی زۆر ساردبوو هەموو گیانمان ئارەقە و قوڕ بوو، دەتگوت: قوڕە برنجمان کردوە. پیاوێــک هاتــە دەرەوە بــۆ میزکــردن، هەرکە هەســتی ئێمەی کــرد، بەچەکەوە ئێمەی بینی، یەکســەر خۆی بەژووریدا کرد، نەمانهێشت میزەکەی بکات. چوینە ناوەنــدی گونــد، خانوەکان هەموی دوو قات بوو، لەبنــەوە مانگا و ئاژەڵی تری تێدابــوو، لەســەرەوە بۆ خۆیان دادەنیشــتن. تــۆزێ لەو ژێرخانــە چاوەڕوانمان کرد، بەڵام هاڵاوی هەناســەی ئەو ڕەشــە وڵاخانە گەرم بــوو. چاوەڕوانی، لەوێ تــۆزێ ئەهوەنتــر بــوو، نەک لە دەرەوە. بــەڵام کێ خوا بە نســیبی دەکات لەو شــوێنە گەرمە ڕاکشــێ!! ئێمە لە ئەســحابە لەک لە خزمەت ئەو گۆلکەی دایکی شــوکر فێری زمانی پێکەوەژیان بووین لەگەڵ گۆلکان. چاوەڕوان بوین، گوتمان: ئەوجــارە ئەوەی بێتــە دەرەوە توند دەیگرین، هەتا لەگەڵــی دەچینە ژوورەوە. لەنــاکاو پیاوێــک هاتــە دەرەوە، ئێمــە لەبەر بێڵایــی خــوارەوەی ئەوبوین، ئەو

لەسـەرەوەی ئێمـە بوو، تفەنگەکەی بەشـانییەوە بوو، دانیشـت بـۆ میزکردن. خەریـک بـوو میـز بە ئێمەدا بـکات، وازمان لـێ هێنا تا میزەکـەی تەواو کرد، لەنـاکاو لەژێرەوە، گوتمان: کاکە؟ نەیزانی بە بیسـتنی ئەو وشـەیە نە تفەنگی لەشـان بێنێتە خوارێ، نە دۆخینەکەی ببەسـتێتەوە، گوتی: ئێوە.. ئێوە، چین لـەو ژێرخانەی ئێمـە؟!! منیش لایتێکم پێ بوو لایتەکەم لەخۆماندا، گوتم: ئێمە ئەوەینـە دەمانبینـی، براکەی لـە ژوورەوە هاتە دەرەوە، دایکـی هاتە دەرەوە، گوتم: کاکە ئێمە ئەو دوو پێشـمەرگەین، ڕێگامان هەڵەکردوە، زۆر سوپاسـتان دەکەیـن ئەگـەر ماوەمان پێ بـدەن خۆمان گەرم بکەینـەوە، تۆزێک نان بخۆین دەڕۆین، ئێمە نامانەوێ ئێوە تووشـی دەردەسـەری بکەین. گوتیان: کاکە ئێمە چەکـداری حکومەتین، ناتوانین لەماڵی خۆمان ئێوە ڕابگرین. دایکیان شـێرەژن بوو، گوتی: فەرموون وەرنە سـەرەوە، خۆی لەکوڕەکانی تورە کرد. سەرکەوتین لـەژوورەوە ئێمە لای سـەرەوە، ئـەو دوو چەکدارەش لەلای خـوارەوە تفەنگیان لەسەر کۆشیان دانابوو، ئامادە. نانیان هێنا، هەرچەندە ئێمە ئەو خواردنەی کە لەهەولێرەوە گوڵانی ئامۆزام بۆی دانابوین لەلامان بوو، بۆیە گوتمان خواردنمان لایە، لەبەر ئەو سـۆبە گەرمە نانمان خوارد، شـەو زۆر درەنگ ببوو، وردە وردە باوەڕیـان کرد کە ئێمە نیازی خراپمـان لەگەڵ ئەوان نییە. لەو کاتەدا من زیاتر قسەم دەکرد، جەنگی ئامۆزام لەمن بچوکتر بوو، ڕووم لە پیرەژنەکە کرد، گوتم: زۆر هیلاکیـن ئەگـەر بەگەورەیی خۆتان دەرفەتمان بـدەن تۆزێک دەخەوین، وە ئەگەر لەلاتان گرانە دەڕۆین، بەڵام هەر تاریک بێت پێش ئەوەی ڕووناک بێتەوە خەبەرمان بکەوە، گوندەکە بەجێدەهێڵین دەچینە ئەو شـاخە. پیرەژنەکە گوتیە کوڕەکان: بڕۆنە ئەو ژوورەی ئەولا با ئەوانە لێرە بخەون. زۆرم تکا لەژنەکە کرد، پێش ڕووناکی دابدا خەبەرمان بکاتەوە.

دارێکمـان بـەدەرگاوە نـا، لـەژوورەوە نوسـتین. هەردووکمان دەتگـوت حەبی ڤالیۆممـان خـواردوە، کاتێ خەبەرم بـوەوە لە دەلاقە بچوکەکـە ڕۆژ لەژوورێی دەدا. بانگـی جەنگیـم کـرد، گوتم: هەسـتە فرۆشـراوین بەخۆمـان نەزانیوە!! لەدەنگـی ڕەخـت بەسـتن و چرکەی تفەنگـەکان، پیرەژن بە ئەسـپایی، گوتی: ڕۆڵـە خۆتـان ئاڵۆزمەکەن، من پاسـەوانم. بەخوا خەوتـان ئەوەندە خۆش بوو دڵم نەهات بانگتان بکەم!! زۆر لە پیرەژنەکە تورەبوین، بەڵام ئەو زۆر شـارەزاو

کارامەبوو، گوتی: ڕۆڵە تفەنگەکانتان لولەی لەسەرێ بکەن، بەشانتان دا بدەن با قۆنداغەی دیار نەبێ چونکە تفەنگی جاشان زۆربەی قۆنداغدارە، هی ئێوە بێ قۆنداغە، ئێستا لەگەڵ گاڕانی گوندی لەناو مانگایەکان بڕۆن تا لەو ڕەبیەی سەر گوندەکە بزر دەبن، خۆتان ئاڵۆز مەکەن. ئەو فەرماندە شارەزایە چی پێ گوتین بەقسەی ئەومان کرد، تا لەگوندی دەرکەوتین. بەراستی ژنێکی زۆر میهرەبان و کارامە بوو، هەتا مردن قەرزاری ئەوین.

## ما برا ئەتو مرۆی

ئەو ڕۆژەمان لەکەندو دۆڵەکان بردە سەر، بۆ ئێوارە ڕۆژی مابوو، چوینە گوندی کەلەکین. فەرحان ئاغا لەوێ بوو، بۆ ئەو شەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی لقی هەولێر یەکترمان گرتەوە. ملازم هەژار بەرپرسی لق بوو، گەیشتینە ماڵێکی کەڵەکین، مام عەزیزی باوکی هاوڕێ جوتیار سیاسی و وشیار، لەو ماڵە لەسەر بەرماڵی نوێژ بوو، هاتبوو بۆ دیدەنی هەردوو کوڕە پێشمەرگەکەی، ئەوە بوو بۆ شەوەکەی هاتنە کەڵەکین. لەدوای یەکتر لە ئامێزگرتن، ملازم هەژار ڕوی لە من و جەنگی کرد گوتی: بەتەمای کوێن؟ گوتمان: دەڕۆین بۆ بێخمە، لەوێشەوە بۆ کافێ. ملازم هەژار گوتی: من دوو پێشمەرگەی وەک تۆو جەنگی، لەدار دەتاشم لەرۆژێکی وەکو ئەمڕۆ کەوا هێزمان بۆکۆدەکرێتەوە بێنە سەرمان، چۆن دەتوانن بەجێمان بێلن؟ بەڵام ملازم هەژار باشترین و کاریگەرترین بیانوی هێنایەوە کە بیر لە ڕۆیشتن نەکەینەوە. پاش چەند ڕۆژ لە گەڕان لەو ناوچەیە لە ئاوی بێخمە پەڕینەوە بەرەوگوندی بیە، دوایی لەچیای کۆلیس چوینە خوارێ بەرەو سەرکەندارو سوسێ، لەرێگا ملازم هەژار گوتی: برادەران ماندوون با لەگوندی سوسێ ژەمە گۆشتێکیان بۆ بکرین. گەیشتینە گوندەکە، ملازم هەژار بە خەڵکی گوت: کێ مریشک و کەڵەشێری فرۆشتنی هەیە، بیهێنێ لێی دەکرین. کابرایەک کەڵەشێرێکی هێنا بەراستی گەورە بوو، دایە دەست من، هەردوو قاچم گرتبوو بەدەستەوە، ئەوان بە کەڵەشێر دەڵێن (دیقل) گوتی: ئەو دیقلەی من بەشی پێنج پێشمەرگە دەکات. منیش ویستم، بازاڕی بشکێنم، گوتم: بەخوا من

بەتەنیــا دەتوانــم بیخۆم. گوتی: جا برا ئەتۆ مرۆی، دەڵێی جوانەگای؟!! منیش لەلایــەک پێکەنینــم بە بــێ ئەقڵی ئەو دەهات، لەلایەک زۆری لێ پەســت بووم. خەریک بووم کەڵەشێرەکەی لە بنا گوێی بدەم، ملازم هەژار توند دەستی گرتم، پێــی گــوت: تۆ بۆ ئەوەندە بێ ئەقڵی نازانی قســە بکــەی؟ دیاربوو زانی چاکی نەگوتــوە، گوتــی: بەخوا من کەرم گوێی نادەمێ دەبــێ لێم ببورن. ملازم هەژار ئێســتا دانیشــتوی دانیمارکە، هەر کە من ببینێ دەڵێ: ما برا ئەتو مرۆی ئەبێی جوانــەگای؟ یان دەڵێ: دەڵێم کەڵەبابێکی لەبن گوێی بدەم.

ڕۆژی دوایی بەڕێکەوتین بۆ بارەگای بەتالیۆنی ٣١ لەگوندی ئیروان، شــەو لەوێ ماینەوە. پاش دوو ڕۆژ بەڕێکەوتین بەرەو ناوچەی کافێ، چوینە گوندی ئالکان. نیــوەڕۆ چــووم بۆ ماڵی مام عەلی زێباری، ئاشــنایەتیم لەگــەڵ پەیدا کردبوون، ماڵێکی زۆر بە خزمەت بوون، گەورە کچێکیان هەبوو بەناوی حەلێ، وەک پیاوان وابوو قەت بێ نان خواردن نەیدەهێشــت پێشــمەرگە لەو ماڵە بڕوات. (ئەو ماڵە مەڕداربــوون وەزعیان باش بوو، ژووری میوانانیان هەبوو. ئەو ماڵەم نەبینییەوە هەتا ســاڵی ١٩٩٢ لــە کۆمەڵگای زۆرەملێی جەژنیــکان، لەخانوێکی خراپ، زۆر دەســت کورت ببوون، خەریکی ماڵ بارکردن بــوون دەچونەوە ناوچەی بادینان، بۆ گوندەکەی خۆیان. بەداخەوە مەڕوماڵاتیان نەمابوو، خۆزگەم دەخواست قەت نەمدیبانایــەوە، چونکە هیچم بۆیان پێ نەدەکرا).

پاش نیوەڕۆ ڕۆیشتین بۆ هەرنێ، هۆکێ، چواربۆت، گەلی پڵنگان، بەسەرکەوتین بۆ گوندی بانێ و شۆڕبوینەوە گوندی سەرانێ و بیرکەکۆرو کافێ، گەیشتینەوە بــارەگای قاتعــی هەولێر. لەوکاتــەی کە لەهەولێر دەرچویــن منداڵەکانم و دایکم گوتیــان: وەزعمــان زۆر خراپە، لەلای ماڵی کوڕە خاڵێکم بەناوی وەســتا عەزیز لەقاتی سەرەوە ژوورێکی دابوونێ. وەستا عەزیز کوڕە خاڵمە، بەڵام هەر دەڵێی خوا دروستی کردوە بۆ یارمەتیدانی خزمەکان، بەخۆی و سەبری خێزانی، سەبری ژنێکی مەشرەف خۆش و دەم بەپێکەنینە، هەتا ئێستا من ئەو خوشکە بەڕێزەم نەبینیوە بە تووڕەیی. بەڵام وەزعیان باش نەبوو لەترســی گرتن و دروســتکردنی بەڵایەکی گەورە بۆ وەســتا عەزیز، بەڵێنم پێدان هەر کە بەســەلامەتی بگەمەوە بارەگای قاتعی هەولێر، بەدوایاندا دەنێرم، بێن لەوێ لەنزیک بارەگا بژین. حاڵیان حاڵی ئەو پێشمەرگانەی ئەوێ. ئەوەبوو پاش ماوەیەک دنیا هەوای گۆڕا، دایکم

و منداڵەکانم هاتن. دوو کەپرمان دروســت کرد، لەخوار کافێ ســەر بورکێ لای ماڵی تەمەرو حاجی سەلمان. ئەوەی ڕاستی بێ ماڵی شەهید عەونی و کاک زرار جـۆلاو باوکم و ســورەو شــەهید حاجی و جەنگی و بەخـۆم و چەند هاوڕێیەکی تــر لەو نــاوە کەپرمان کردبوو بــۆ منداڵەکانمان. بەراســتی ئازووقە پەیداکردن گرفتێکی گەورە بوو. ئەوەی لەهەموو شتێک زیاتر ئازاری دەدام، لەکیس چونی خوێندنی کوڕە گەورەکەم بوو بەناوی ئاراس. ئازووقە زۆر کەم بوو، نەماندەزانی چـۆن وابکەین، ئەو ژن و منداڵانە لەبرســان نەمرن. ناچــار خەڵکمان دەنارد بۆ ناوچەکانی ژێردەســتی ڕژێم، تا هەندێک ئازووقەمان بۆ بهێنن.

## ئەگەر خوا قبوڵی بکات،
## کەس لەخۆمان بەشیوعی تر نازانین

لەوکاتــە پارتی دیموکراتی کوردســتان و پارتی گــەل نێوانیان زۆر ناخۆش بوو. پارتی گەل، لە بادینان قاچاغ بوون وەکو تلیاک، بۆیە منیان تەکلیف کرد، لەگەڵ چوونمــان بــە منداڵەوە بۆکافێ، لــە ئالکان بۆ ناوچەی کافێ دوو پێشــمەرگەی پارتــی گەلیــان تەســلیمی من کرد. لەگەڵ مــاڵ و منداڵەکانی خــۆم بیانبەم بۆ کافێ. ســکرتێری پارتی گەل، شەهید ســامی عبدالرحمان بوو، ئەو پێشمەرگانە یەکێکیان ناوی شــڤان بوو، پێم وایە ئێســتا لە ژیاندا ماوە. جارێکی تریش دوو پێشمەرگەی پارتی گەلم، لەگەڵ خۆم برد بۆ کافێ، یەکیان ناوی هۆشەنگ بوو. خەڵکــی ئەونــاوە شــیوعیان بە بێ دیــن و گاور دەزانی، کە دروێنــەی برنجیان دەبــوو، باوکــم پاڵەی چاک بوو، دەیگــوت: کوڕینە بابچینــە یارمەتیان، لەگەڵ جەنگــی و هاوار زۆرجــار ئێمەش یارمەتی ئەو خەڵکەمان دەدا، بۆیە دەیانگوت: بەخوای ماڵی مام عەلی شــیوعی نین.

باوکــم دەیگــوت: ئەگەر خــوا لێمان قبوڵ بکات، کەس لەخۆمان بەشــیوعی تر نازانیــن. ئەوکات کادیری حیزبی شــیوعی لەو ناوچەیە گەنجێکی ســوورەی موو زەردی چاوشــین بوو، کاروان ئاکرەیی ناوبوو، لەو ناوچەیە کادیر بوو، ئێســتا

بەرپرسی کەناڵی ئاسمانی کوردستان تیڤییەو، پارتیە. پێشمەرگایەتی زۆر دەرویشانە و دڵسۆزانە دەکرد، زۆر ئێمەی ئاشنای خەڵکی ناوچەکە کرد، من بەزۆری لەگەڵ تەمەرو هیرۆ برادەر بووم، چونکە لەتەمەنی خۆم بوون. دوو سێ ئەسپی جاشەکانی سرێشمەم هێنابوو، بۆ ئەوەی ماڵ و منداڵەکانم سوار بن، لەکاتی هێرشی حکومەت بۆ ئەوەی پێی دەرباز بن. ئەوەی خێزانداربوو، خێزانی هێنا بۆ کافێ، چەند ئەسپێکی هێنابوو هەموی لەو دەشت و شاخە کێوی ببوون، بەزەحمەت بۆمان دەگیران.

تشرینی یەکەمی١٩٨٦ بەیانی ڕێکەوتنی یەکێتی و شیوعی ڕاگەیەندرا.

لەپاش چەند دانیشتنێکی حیزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، پێکهاتن کە ئاشت ببنەوە. بچینەوە ئەو شوێنانەی ژێر قەڵەمرەوی یەکێتی. یەکەمجار چەند مەفرەزەیەکی بچوک، دوایی بارەگای لقەکان، پاشان هاتە سەر بارەگای قاتعی هەولێر. وردە وردە لەناوچەی کافێ بارەگاکانمان چۆڵ دەکرد، بەرەو دەشتی هەولێر و دۆڵی بالیسان. لەیادمە بەیانی بوو مەفرەزەیەکی گەورەی یەکێتی هاتن بۆ کافێ، بچنە ناوچەی ئامێدی، پێم وابوو ڕزگار عەلی بەرپرسیان بوو، لەبەردەمی ئێمە ڕەت بوون.

خوێنەری بەڕێز ڕەنگە زۆر ماندوو بوبیت لەگەڵ ئەو هەموو ڕۆیشتنەی ئێمە، بەڵام باوەڕت بێت، وەک دەڵێن: ئەو هەموو، ڕێ ڕۆیشتنە لەدەستی ئێمەو خواستی ئێمە نەبوو، ئەوە بڕیاری حیزب بوو هەمیشە. ئەگەر ئۆتۆمبێل بوینایە یەک فلسی قەڵپمان نەدەکرد، چونکە سیمی کیلۆمەترمان دەپسا، هێندەی لەسەری بڕۆین، ئۆباڵمان بەملی حیزب.

## ناپاکی فەتاح کتکەیی

فەتاح قادر ناسراو بە فەتاح کتکەیی. سەرەتای مانگی دوی١٩٨٦ مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعی دەستگیری دەکەن، بەتاوانی سیخوڕی و پەیوەندی بە ئەمن و جاسوسی بەسەر جموجۆڵی پێشمەرگە. لەسەرەتای دەستگیرکردنەکەی زۆر

موکرِبوون لەســەر گوللەباران کردنی، بــەڵام ژن برایەکی دەبێتە کەفیلی بەناوی عەدنان دوبزی (پێشــمەرگەی دانیشتوی یەکێتی بوو). بۆیە گوللەبارانی ناکەن. لەبــەر ئەو کەســەی دەبێتە دەســتەبەر (کەفیلی) لەگەڵ پێنج پێشــمەرگە وەک زیندانــی ڕەوانەی دەکەن بۆ بارەگای بەتالیۆن، لەگەلی بێخمە. زۆر هیلاک دەبن چونکــە ئــەو ڕێگایە هەتا دەگاتــە گەلی بێخمە، زۆر دوورە. بــۆ ئەم ئەرکە ئەو پێشــمەرگانە ڕەوانە کرابوون: مەجید حســن ناســراو بە بروســک، احمد عەرەب خەڵکــی ناســریە، بەشــار حمدامین حــەلاق، (برای شــەهید مەحەمەد حەلاق)، شــێروان، ســەفین هەولێری. لەگەلی بێخمە دەخەون، پێشمەرگە پاسەوانەکەش، خەوی لێ دەکەوێ. فەتاح کتکەیی تاوانبار فرســەت دێنێ، تفەنگی پێشــمەرگە پاســەوانەکە دەست دەداتێ و هەرپێنج پێشــمەرگەکە شەهید دەکا و هەڵدێ بۆ ناو ڕژێم. لەوێ مەفرەزەی تایبەتی دەدەنێ (مەفرەزە خا ســە) پاشــان حیزبی شــیوعی عەدنان دوبزی دەستەبەری (کەفیل)ی فەتاح کتکەیی گوللە باران کرد. شایانی باسە عەدنان مامۆستا بوو لە گوندێک، لە ئاڵای شۆڕش نزیک بوو، هەر ئەوەش هۆکاری دانیشــتنی بوو لەیەکێتی.

بەداخەوە کە بەرەی کوردســتانی و دوایی دەســەڵاتی پارتی و یەکێتی هەڵســان بە داڵدەدانی هەموو کوردکوژو ناپاکەکانی کوردستان، بەسەر خۆیاندا دابەشیان کردن، ئەوەبوو فەتاح کتکەیی لەدوای نۆزدە ساڵ فەرمانڕەوایی پارتی و یەکێتی لە ٢٠١٠/٣/٦ لەگوندی کتکە مرد.

# شەهید کۆچەر..وانەیەك بۆ جوامێری

مامۆســتا ناســیح ناســراو بــە هاوڕێ کۆچــەر، هــەر لەکۆتایی حەفتــاکان ئێمە ئاشــنایەتیمان لەگەڵ ئەو بنەماڵە تێکۆشــەرە هەبوو. لەسەرەتای هەشتاکانیش لەبەســتی شــەرغە و دەشــتی کۆیەو دۆڵی خۆشــناوەتی، لەگەڵ هاوڕێ کۆچەر بەیەکەوە بوین. ئەو لەبەشــی ڕێکخســتنی ناو شاری هەولێر کاری دەکرد، منیش لەبەشــی سەربازی. زۆرجار هەتا بێســتانە، یان بنەسڵاوەو دارەتوو لەگەڵ ئێمە دەهــات، هــەر وەک کادیرەکانــی تر لــەوێ دەچوونە ناو شــاری هەولێر. هاوڕێ

کۆچــەر لەماڵی مەحەمەد شــەریف دەبێ، لەهەولێــر. لەوێ چاوی بە عەلی برای مامۆســتا بەڵێن و، ئەحمەد عەزیزو، عەبدوڵا شــاخی، بە (عەبدوڵا مقاول ناســرا بــوو) دەکــەوێ. دیــارە پێشــتر بڕیاریان وابوە، کــەوا کەمتر خەڵــک ببینن، بۆ پاراســتنی خۆیان و ڕێکخســتنەکان. بۆ ئەوەی مەترسی لەسەر ژیانیان دروست نەبی. هاوڕێ کۆچەر، بێ خەبەرە لەوەی کەوا عەبدوڵلا شاخی بەڵێنی بە ئەمنی هەولێر داوە، کۆچەر بباتە ماڵی خۆیان و ڕادەستی ئەمنی بکات. هاوڕێ کۆچەر بەپێشــنیارەکەی عەبدوڵــلا شــاخی ڕازی دەبــێ و دەچێتە ماڵی ئــەوان. گوایە ماڵی ئەوان پارێزراوترە. مامۆســتا ڕەوەند و هاوڕێ ئارامی برای شــەهید داود، پێــش ئــەوەی هاوڕێ کۆچەر بگوازنەوە بۆ ماڵی عەبدوڵلا شــاخی، دەچنە ماڵی دایکی ســیامەندی حەمەدە گەورە، کاک ســیامەند پێشــمەرگەبوو لەگەڵ ئێمە. پێــش لەیەک دابڕانیان لەماڵی ســابیری قادر قومــری کۆدەبنەوە. دوایی بڵاوەی لــێ دەکــەن. لەوکات هــاوڕێ کۆچەر لەماڵی عەبدوڵلا شــاخی دەبــێ، عەبدوڵلا بەفرســەتی دەزانــێ، دەڵــێ: من دەچم بۆ ماڵــی خەزورم. مامــی لەلای هاوڕێ کۆچەر بەجێ دێڵێ، بەخۆی و منداڵەکانی ماڵ چۆڵ دەکەن. وەک چۆن بەڵێنی بــە ئەمن دابوو دەچێ ئاگاداریان دەکاتەوە.

شــەوی ١٨/١٧ـ ٥ـ ١٩٨٥ کاتژمێردوازدەو نیوی شەو دائیرەی ئەمنی هەولێر بە یارمەتی و چاو ساغی سەیدۆ و جاشەکانی، کە مەفرەزە خا سە بوو، دەوری ئەو ماڵە دەگرن، لەگەڕەکی جمهوری (کە دەکەوێتە پشت ئامادەیی خنسا). کاتێک هــاوڕێ کۆچەر هەســت دەکات بەو درەنگە جموجۆڵــی گوماناوی لەچوار دەوری ئەو ماڵە هەیە، دەزانێ ئامادەکاری بۆ گرتنی هەیە بە زیندویی. بۆیە کۆڵەپشت و دەمانچە و نارنجۆکەکەی دەســت دەداتی. لەوکاتە ئەمنەکان و جاشەکان دێنە نــاو حەوشــە. هاوڕێ کۆچەر تەقەیــان لێ دەکات، دوو ئەمــن دەکوژێ و چەند جاشــێکی ســەیدۆ بریندار دەبن. هــەر لەو کاتە، مامی عەبدوڵلا شــاخی دەڵێ: تەقــە مەکە تەســلیمت دەکەین و دوایی ئازاد دەبیــت. لەوکاتەدا نازاندرێ کەوا هــاوڕێ کۆچــەر دەیکوژێ یاخود بەدەســترێژی گوللــەی دەرەوە کوژراوە. مامی عەبدوڵــلا مقاول دەکوژرێ، هاوڕێ کۆچەر بەســەریان دەکەوێ، تەقە لە ئەمن و جاشــەکان دەکات لەســەریان، هەموو ئەو کاخەزو نهێنیانە دەسوتێنێ کەوا لای بــوون. نارنجۆکێکی پێبوو، بەڵام بەداخەوە، ئێمە زۆرجار ســۆندەیەکمان بەقەد

دوو سێ سانتیم دەبری لەنارنجۆکەکەمان هەڵدەکێشا کە دەکەوتە لای هەڵقەی ئەمانەتەکەی. وەک دەگێڕنەوە.: کاتێک، ئەمن و جاشەکان لەناو باخچەی ئەو ماڵە گردبوونەتەوە، نارنجۆکەکە هەڵدەداتە ناویان. بەڵام لەیادی دەچێ ئەو پارچە سۆندەیە لە ئەمانەتەکەی بکاتەوە، ئەگەر نا بەو نارنجۆکە زۆری لێ دەکوشتن. کاتێک چاویان بەو نارنجۆکە دەکەوێت، دەزانن لە لێواری مەرگ گەڕاونەتەوە بۆیە دەچنە دەرەوە. ناوێرن بەهیچ شێوەیەک لەهاوڕێ کۆچەر نزیک ببنەوە. لەو شەڕە هەلیکۆپتەریش هەڵسابوو بۆ بەشداریکردن و هەڵدانی تەنویر بۆ ڕووناکردنەوەی ئەو کۆشک و خانوەی شەهید کۆچەری تێدابوو. شەهید کۆچەر لە کاتژمێر دوازدەو نیوی شەو، هەتا حەوتی بەیانی لەسەر ئەو بانە بوە. نامەیەکی نوسیوە، لە یەخەی قاتەکەی ئاخنیوە. پاش وەرگرتنەوەی تەرمەکەی گەیشتۆتە دەستی دکتۆر بژاری برای، ئێستا بەرێزیان لە وڵاتی کەنەدایە.

تاوەکو بەیانی دنیا بەتەواوەتی ڕووناک دا هاتبوو، ئینجا وێرابوون بەسەربان بکەون، بچنە سەر شەهید کۆچەر، تا کاتژمێر حەوتی بەیانی لەدەرەوەی ئەو ماڵە مابوونەوە. هاوڕێ کۆچەر کە فیشەکی تەواو دەبێ دوا گوللە دەنێ بەسەری بەرزی. ئەوەی ڕاستی بێ ئەو زانیاریانە لەگەڵ وەرگرتنەوەی جەنازەی شەهید کۆچەر، لەلایەن مستەشار عومەر حەسەن وەرگیراوە، لەرێگای چەند خزمێکی شەهید کۆچەر کە ناسیاوەتی و برادەرایەتیان لەگەڵ عومەر حەسەن هەبوو. دوا فیشەک خۆی پێ دەکوژێ، زۆرجار شەهید کۆچەر دەیگوت: گوللەیەک بهێڵنەوە بۆ ئەوەی بەسەری خۆتانەوەی بنێن، دیارە ئەو لەسەر خۆی ئەمەی جێبەجێ کردو بەڵێنەکەی خۆی گەیاندە جێ.

هەر ئەم سەیدۆ جاشە لەهاوینی ١٩٨٣ لەماڵی مام ڕەحمانی نێرەگین شەهید وەیسی شەهید کرد. سەیدۆ تا لەژیان مابوو، خانەنشینی یەکێتی بوو پلەی لەشەهیدان کۆچەر و وەیسی زیاتربوو، بێ گومانم ئێستاش مووچەکەی زیاترە لەمووچەی ئەوان.

**دەقی نامەکەی شەهید هاوڕێ کۆچەر:**

برام دکتۆر چاوە ڕەشەکانت ماچ دەکەم..

خۆشەویستم، ئەوجارە دەمرم و هیچ ناترسم. بۆیە بەوپەڕی مەعنەویەت و

هۆشەوە ئەم شتانە دەنوسم. چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم، ئومێدەوارم لەمەودوا تۆ مام و براو باوک بیت بۆ منداڵەکان. دەستی دایک و باوکم ماچ دەکەم، ئومێدەوارم خزمەتیان بکەی. من تاوانبارم بەرامبەریان هەست بە تاوان دەکەم بەرامبەر بە هەمووتان هەست بە تاوان دەکەم بەرامبەر منداڵەکانم کە نەمتوانی ژیانی خۆشیان بۆ دابین بکەم. مل کەچی خێزانی بە وەفاو دەست ڕەنگین دایکی ڕزگارم. مل کەچی تۆی ماندوو بلیمەت و ڕەنگ زەردم، تۆی جگە لەخەفەتی من و دایک و باوک و منداڵەکان زیاتر هیچمان نەبوە بۆت. بەلام من سەربەرزم بەوەی خیانەتم لەگەڵ گەلەکەم نەکردوو شەرەفی شیوعیەتیم پاراست. من هیچ ماڵ و سامانێکم بۆ ئێوە بەجێنەهێشتوە جگەلە خەفەت و فرمێسک، بەڵام لەهەمان کات سەربەرزی و پاکیم بەجێهێشتوە.
من کە ئەوانەی نزیکی منن بۆ تۆ لە شوێنی منن بەتایبەتی مامۆستا گۆران و هاوڕێ سەفەر. ئومێدەوارم منداڵەکان پەروەردە بکەیت و نەهێڵی هەست بە بێ باوکی بکەن، بۆ ئاگاداری هاوڕێیان من هەموو وەرەقە و ناوو پارەم سووتاند جگەلەو پارچە کاخەزە ئەگەر بەدەستت گەیشت هیچی ترم بەجێ نەهێشتوە.
چاوەکانت ماچ دەکەم و کاتژمێریش سێو نۆزدە دەقیقەی شەوە لە سێو بیستو یەک دەقیقە، دوا فیشەکم بۆ خۆمە، ئیتر دووبارە چاوەکانت ماچ دەکەم

**گوڵچەر**

**١٧و١٨/٥/١٩٨٥**

# داستانه بێ کۆتاییەکان

زستانی سالّی ١٩٨٦، بارەگاکانمان لەکافێ بوو، چەند کادیرو پێشمەرگەی قارەمانی لقەکانی بەڕانەتی و قەرەچوغ و هەولێر دابەزین، بۆ دەشتی کاکی بەکاکی هەولێرو قەراج و کەندێناوە. بۆ چالاکی لەدژی ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس. ئەوەبوو سالّی ١٩٨٦، بیست و چوار پێشمەرگەی قارەمانی حیزبی شیوعی کە پێکهاتبوون لە، لقی بەڕانەتی و قەرەچوغ و هەولێر بە تێکەلاّوی لەگەلّ چەند کادیرێک، یەکێک لەوانە موحسین دەشتی، بەرەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٦/١١/١٣ لەگوندی هێلەوە، کاتژمێر حەوت و هەژدە دەقیقە بەهێزێکی زەبەلاحی جاش و گاردی تایبەتی سوپای عێراقی ئەوکات، دەوریان دەگیرێ و شەڕ دەستپێدەکات. لەهەر چوار دەوری گوندی هێلەوە ئەو پۆلە پێشمەرگەیە دابەش دەبن. بەلّێنی ڕادەست نەبوون و بەرگری بەیەکتری دەدەن. دوو بەشداربوی ئەو داستانە پڕلە قارەمانێتیە، کە یەکێکیان هاوڕێ موحسین دەشتیە، وردەکاری ئەو داستانەیان بۆ گێڕامەوە. (لەدوای ئەو داستانەش بەیەکەوە پێشمەرگەبوین). شەڕی دەستەویەخە و مالّ بەمالّ دەکەن. سەرەتا حەوت ئۆتۆمبێلی پڕ لەجاش وجەیش دەسوتێنن، پاشان هێزە تایبەتەکان شەڕی نارنجۆک دەکەن.

لەم شەڕەدا عادل عەرەب، کە بە عادل شەبەک ناسرابوو، لەگەلّ سمکۆ ڕواندزی و پێشرەو (ناوی خۆی ممتاز بوو، خەلّکی گوندی عەزە بوو) سەرکەوتی خدر کاکیل ( باوکیشی لەشەڕی قرناقەوپشت ئاشان شەهیدببوو)، شەهید دەبن. هەرچەندە سەرکەوت هەتا ئاودەلۆک و ئەسحابەلەک بە بریندای دەمێنێ، بەداخەوە لەوێ شەهید دەبێ.

واتە چوار شەهید و زیاتر لە دوازدە بریندار کە بەداخەوە ناوی هەمویان نازانم، شەهیدی قارەمان بلە لەو شەڕەدا بریندار دەبێ، لەگەلّ شەمالّ، سەردار شێرە، ڕزگار گردعازەبانی و هاوار، کامەران خەلّکی گوندی جمکەو بن بێرزو چەندانی تر. زیانی دوژمن ئەوەی بەچاو بینراوە حەوت ئۆتۆمبێلی سوتابوو لەگەلّ چەندین ئالیاتی سەربازی، ئەو ڕۆژە هەلیکۆپتەرەکان تەنها فریای گواستنەوەی

کوژراو و بریندارەکانیان کەوتبوون، لە زۆر لای گوندەکە شـەڕی دەستەویەخەی نارنجۆک کراوبوو، ژمارەیەکی زۆر گاردی تایبەت و جاش کوژران و برینداربوون. کە تاریک دادێ بەزەبری ئاڕ.پی.جی و تفەنگی دەستیان بۆ لای زورگەزراو ڕێگا دەکەنەوە، دڕ بە هێزی دوژمن دەدەن، ئەو داسـتانە کەم وێنەیە تۆمار دەکەن.

# مردن، یان کوشتن؟

بارەگامـان لەگەلی خەڵـک، لەکافێ بوو، دکتۆرێک لـە هاوڕێیانی عەرەب، هاتە بـارەگای هەولێری حیزبی شـیوعی. هەر زوو خەڵکـی کافێ و گوندەکانی دوورو نزیک بەناوی دکتۆر عامر ئاشـنابوون. چەندین کەسـی لەمردن ڕزگارکرد، یەک لەوانە ژنێکی ماڵی ڕەزا و شـیمال کە خاڵوانی کاک مەسـعود بازرانین.

لەبیرمە ویسـتبویان دیاریەکی پێشـکەش بکەن، کەچی ڕازی نەببوو، ئەو دیاریە قبـوڵ بـکات. دوایـی ئاژەڵێکیان بۆ بارەگا نارد بۆ سـەربڕین. دکتۆر عامر کەم وابوو بتوانێ وەک ئێمە لە بارەگا دابنیشێ. بۆ دکتۆر شەوو ڕۆژ، سەرما وگەرما، باران و هەتاو، جیاوازی نەبوو. ئەو ئاشـقی چارەسـەری نەخۆشـەکان بوو. هەر کـە خەبەریـان پێدەدا لەبەری گارەی، یان دەشـتەزێ، یان زێبارەتی، دەسـتی دەدایـە باولـە پزیشـکیەکەو دوو پێشـمەرگە بەدوایەوە. یـەک ڕۆژ گوێمان لێ نەبوو، بڵێ: ئەو گوندە دوورە، یان ماندووم!! نەشتەرگەری بۆ باوکی (جبرایل) لەکافێ بەسەرکەوتویی ئەنجامدا. ڕۆژێک لەدوای دکتۆر هاتن لە (چەمی شریت) و(چەمـی چالـێ) کە دەکەوێتە خـوار گەلیەکی زۆر هەڵدێـر و بەرپێ ناخۆش، بەنـاوی گەلـی (نیبێ)، گوتیان: ژنێکمان نەخۆشـە. دکتۆر لەگەڵیان ڕۆیشـت. کاتێک چاوی بە نەخۆشەکە دەکەوێ کە منداڵی دەبێ، پێیان دەڵێ: بەزووترین کات دەبـێ نەشـتەرگەری بۆ بکـەم و ڕزگاری بکەم، دەبێ بچنـە دەرەوە تەنها یەک ژن بمێنێتەوە لەلای من. ئەوانیش قبوڵ ناکەن، دەڵێن: ئەوە بێ شەڕعیە، ئیسـلام و داب و نەریـت ڕێگا نادات، پیاو چارەسـەری ژن بـکات!! دکتۆر زۆر دەسـتە و دامێنیان دەبێ ڕێگای بدەن ئەو نەخۆشـە لەمردن ڕزگار بکات، بەڵام بێ سـود دەبێ. دکتۆر دەڵێ: من لێرە ناڕۆم تاوەکو چارەسـەری نەکەم. بەڵام

ڕێگای پێ نادەن، دەڵێن: وەرە دەرەوە لەو ژوورە. دکتۆریش دەڵێ: من دڵنیام ژنەکە و منداڵەکەی دەمرن ئەگەر ئێوە نەهێڵن ڕزگاریان بکەم. لەژووری ژنەکە دەری دەکەن. پێیان دەڵێ: لێم گەڕێن لەو هەیوانە دابنشیم بەڵکو ڕای خۆتان بگۆڕن و ڕێگام پێبدەن لەمردن ڕزگاری بکەم. ئەگەر نا من لێرە نارۆم، دەمێنمەوە تاوەکو دەمرێ.

بەداخەوە مل نادەن، دکتۆر عامر چارەسەری بکات. تاوەکو ژنەکە و منداڵەکەی دەمرن. بوونە قوربانی کەللەوشکی خەڵکانێکی ناو کۆمەڵگای کوردی. لەبیرمە، دکتۆر عامر هاتەوە باولە پزیشکیەکەی فڕێدا. زۆر نیگەران بوو بەو ڕووداوە، دەیگوت: (ریفاق هزا قتل عمدی) هاوڕێیان، ئەوە کوشتنی بە ئەنقەستە. ئایا ئەوە (مردنە یان کوشتن)؟!!

ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە زۆر لەو دکتۆرە خۆبەخشانەمان لەگەڵ بوون، بەڵام بەداخەوە لە قڕناقە و پشت ئاشان زۆریان بەدیلی لەلایەن یەکێتی گوللە باران کران. ئەوانەی لەو کوشتارگایە ڕزگاریان ببوو، وە یا لەو کاتە لەوێ نەبوون و بەخت یاوەریان بوو، وەک: دکتۆر سادق و دکتۆرە ساهیرە و چەندانی تر، کە خەڵکی باشووری کوردستان و پێشمەرگەی لایەنەکان شاهیدیان بۆ دەدەن، کەوا چ خزمەتێکیان بە نەخۆش و بریندارەکانی هەموو لایەنەکان کرد، بەبێ جیاوازی. دکتۆر غەفار کە ئێستا لە نەخۆشخانەی ڕزگاری لەهەولێر خزمەت دەکات، ناسراوە بە دکتۆر سەردار ڕواندزی. داوای لێبووردن دەکەم کە ناوی زۆریانم لە یاد نییە، بمبوورن لە ناو نەهێنانیان.

## هاوینی ١٩٨٦ گەلی خەڵك لەکافێ

بارەگاکانمان لەگەلی خەڵک بوو لە کافێ، لەگەڵ شەهید عەونی و جەنگی ئامۆزام و هاواری برام لەکافێ، بەڕێ کەوتین. لەسەر بورکێ چەند باربەرێکمان برد، بۆ ئەوەی بچین لە چەم شریت و چەمی چالێ، لەخوار کافێ بە گەلی (نیبێ) دا تێپەردەبێت،گەلیەکی زۆر سەختە. ئەو ناوە هەندێک لە دانیشتوانی برا مەسیحیەکانن، (لەکوردەواری پێیان دەڵێن، دیان). لەچەم شریت چووین

بـۆ ماڵێـک، لەو ناوچەیە خەڵک لەبەر میوان هەڵنەدەسـتانە سـەر پێیان، هەر بەدانیشـتنەوە دەیانگوت: فەرموو. ئێمە چوینە ماڵێک باربەرەکانمان بەسـتەوە لـەدەرەوە، ژوورێک لە پێشـەوە بوو دووربوو لـە ژووری ژن و منداڵ. زیاتر ئەو ژوورانە بۆ میوان بەکاردێت، بەتایبەتی پێشـمەرگە و خەڵکی نەناسـراو. گوتیان بڕۆنـە ژوورەوە. لـە ژوورەوە گەنجێکـی تەمەن بیسـت و پێنج بۆ سـی سـاڵ، لەسـەر گازی پشـتێ ڕاکشابوو. سڵاومان کرد، وەڵامی داینەوە گوتی: فەرموون. لەبەرئەوەی لەلای دەرگاکە ڕاکشـابوو، ناچار بوین یەک بەیەک بەسـەر ورگی دا بازبدەین، چوین دانیشتین.

هەربـە ڕاکشـان بەخێرهاتنـی کردین، لێمان پرسـی: خەڵکی ئێـرەی؟ گوتی: نەخێر. هەڵاتوی سـەربازیم لە ئەلقوشـەوە ڕامکردوە، خەڵکی ئێرە خزمی منن، بۆیە لێرەم. گوتم: بەراستی زۆر زوو فێری نەریتی ئێرە بویت. ئێمە دەبایە هەتا لای عەسـر چاوەڕوانی ئەوکەسانە بکەین کە دەچوونە گوندەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێـم، بـۆ ئەوەی چەند بـارە ئازووقەیەک بێنن وەک شـەکروبرنج و ڕۆن، لێیان بکڕین و بۆ کافێ بگەڕێینەوە. بۆیە دەمانویسـت ئەوکاتە بەگوێرەی زانیاری ئەو برادەرە بەسەر بەرین. شەهید عەونی و جەنگی، قاچیان بەدیوار هەڵپەساردبوو، جـار جار قاچیان دێنایە نزیک ورگـی ئەو برادەرە، ئەویش دەیگوت: کاکە ئەوە چ جۆرە خۆ ڕاکشـانێکە؟!! شـەهید عەونی گوتی: ئەو ڕاکشانە سۆسیالیستیە، لەبەرئەوەی سۆسیالیست بە پیادە زۆر دەڕۆن، خوێنی لەشیان هەموی دادەبەزێ، بۆ ئەوەی خوێنەکە لە قاچەکانمان بچێتەوە لای سـەرمان، ئاوا قاچمان بەدیوار هەڵدەپەسـێرین. کابرا گوتی: خودێ خەبەری تەیە.

پاش نیوەڕۆ ئەو کابرایە بێزاری کردین هەندەی پرسـیاری سـەقەتمان لێبکات، نەماندەزانـی چۆن لـە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە. دەم نـا دەمێک، دەیگوت: ئێوە تفەنگچی نین، دەنا نیشـانانێمان دەکرد بزانین کاممان لێ دەدەین!!

لای ئێوارە، ئەوانەی چوبوون بۆ ئازوقە گەڕانەوە، وڵاغەکانیان ڕاگرت، بارەکانیان خسـت. هەندێک شـەکرو برنج و ڕۆن و پێداویسـتیمان لێکڕین. دەمانویسـت لە وڵاغەکانی باربکەین، بەڵام ئەو کابرایەی پێشـوو، هەر دەیگوت: دەبێ تفەنگانێم لەگـەڵ بکەن. شـەهید عەونی کاخەزێکی لەشوشـە سـاردیەک پێچـا بۆ ئەوەی باش دیار بێ، دایە دەسـتی کابراو گوتی: بڕۆ داینێ، با تفەنگانێ بکەین.گوتی:

لەکوێی دابنێم؟ شــەهید عەونی، گردێکــی زۆر دووری دیاری کرد. منیش گوتم: ئــەو گردە نزیکــە، گردێکی زۆر دوورتــرم دیاری کرد، نەک شوشــەکە مرۆڤیش دیار نەدەبوو!! گوتی: ئەوە زۆر دوورە!! گوتم: لەوێ نەبێ من فیشــەک خەســار ناکەم. کابرا بەڕێکەوت بۆ دانانی نیشانەکە. قەناسیش نەدەگەیشتە ئەو شوێنە، ئێمــەش بارەکانمان بارکــرد گەڕاینەوە، ڕەنگە زۆر دوای ئێمــە گەڕابێتەوە، بەو حاڵە لە کۆڵ خۆمان کردەوە.

لەگەڕانەوە بە گەلی ســەختی نییێ، دەبوایــە هەریەکەمان توند کلکی وڵاغەکەی پێــش خۆمــان بگرین، بۆ ئــەوەی هەڵنەدێرێ، چونکە ئەو شــاخە وەک پلیکان وابوو، وڵاغ هەڵدەدێرا. گەیشــتینە ئەو شــوێنەی کەوا وڵاغێکی مەقەڕ ئێسترێکی ڕەش بــوو بەبــارە شــەکرەوە لەگەلی نییــێ هەڵدێرابوو، کەوتبوە نــاو ڕوبارێ. وڵاغەکــە مردبوو، شــەکرەکەش بەئاوێدا چوبوو. ئەو پێشــمەرگەی لەگەڵیدا بوو شــارەزایی نەبوو، کــە دەبێ لەو پلیکانانە کلکی وڵاغەکــە بگرێ هەتا خوارەوە. بۆیــە هــەردی دەیگــوت: هەقە حیزب ســندوقێک تۆچاش لە ڕوبــارێ بکات، بۆ ئــەوەی چایەکە تەواو بکات لەخوارەوە بیخۆنەوە.

# ناپاکی بەرامبەر دوو پێشمەرگە

زســتانی ١٩٨٧ لەکافــێ، بــەری گارە، هەندێک بارەگامان مابــوو، لەگەڵ چەند بارەگایەکی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان اتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، کاک زرار جۆلاو مەریەمی خێزانی، لەسەر بورکێ، لەشوێنەکانی ئێمە نیشتەجێ ببوون. بەفرێکی زۆر کەوتبوو، ڕۆژێک دوو پێشمەرگەی سۆسیالیست اتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، وڵاخەکەی کاک زرار جۆلا دەبەن، بارێک خواردەمەنی پێ بگوازنەوە. بارەگاکەیــان لە ســەروی کافێ بــوو، لای گەلی توبا. لەوســەروبەندە کابرایەکی ئەو ناوچەیە گیرابوو، بەناوی: ســدقی هاریکی. دامودەزگا جاسوسیەکانی ڕژێم، ســدقیان گرتبوو، بەهاوکاری لەگەڵ (لەتۆ زێبا

ری)ســەرۆک جاش. بەکەسوکاری سدقیان گوتبوو: بڕۆن دوو پێشمەرگە بکوژن، ســدقیتان بــۆ بەر دەدەین. دوو ناپاکی ویژدان مــردوو، یەکێکیان ناوی تاهیر و

ئــەوی تر خالید، لەناو ســپیندارەکانی کافێ خۆیــان مەڵاس دەدەن. کاتێک ئەو دوو پێشــمەرگەیە بەناوەکانی سەربەســت و ســەرهەنگ، دەگەنە لای ئەوان، بێ ئاگا لەوەی بۆیان لە بۆسەدان. ئاخر ئەو شوێنە چەندان کاتژمێر ڕێ لە ناوچەی دوژمن دووربوو.

تەقەیــان لێ دەکەن هەردووکیان شــەهید دەکەن. تەرمی هەردووکیان دەکەوێتە ســەر بەفــر. کاتێــک وڵاخەکەی کاک زرار جــۆڵا دەچێتەوە مــاڵ، مەریەم خانی هاوســەری دەبینێ شــوێنی گولله و خوێن بە کورتان و جەستەی وڵاخەکەوەیە و هەڵاتوە بۆ ماڵەوە. مەریەم بانگی تەمەر دەکات (ماڵی تەمەرو حاجی ســەلمان لەســەر بورکێ لای ماڵی زرار جۆڵا بوو)، کاک تەمەر بەســەر بەفردا، شوێن پێی وڵاخەکە دەکەوێ، دەبینێ هەردوو پێشــمەرگە کە گیانیان لەدەســت داوە. ئەو دوو خۆفرۆشە دەچنەوە لای لەتۆ زێباری و ڕژێم. گاڵتەیان پێ دەکەن، سدقیان بۆ بەر نادەن. لە دواییدا خالید لەســاڵرۆژی شــەهیدبوونی ئەو دوو پێشمەرگەیە لەهەمــان ڕۆژ لەبەفر خنکا، تاهیریــش لەبەر دوژمنداری کوژرا. تەنها ئەو مێژوە پڕ لە شــەرمەزاریەیان بۆ خۆیان و کەسوکاریان بەجێهێشت.

# شەهید سەفەر، کێوێك لە مۆراڵ

دەشــتی کاکــی بــە کاکی قەراج و کەندێنــاوە و مرکییە و بازاڕگــە و قەرەچوغ، ســەفەر لە هەر کەســێکی تر باشــتر دەناســن. ڕێژەیەکی زۆر لە بەها ئەخلاقی و ویژدانــی و جوامێــری نــاو کۆمەڵگای کوردی لە مرۆڤێکدا دەدرەوشــایەوە. لە خۆڕاگــری و بەگژداچوونەوەی جەللادەکانی بەعس کە بەزیندویی مرۆڤیان کەوڵ دەکرد، کتومت شێخ عەلی بەرزنجی بوو. لە دیسپلین و ڕاپەڕاندنی کاری نهێنی و وشــیار کردنەوەی کۆمەڵگا و ئاشــناکردنیان بە مافە ڕەواکانیان پڕاوپڕ بوو لە هەڵسوکەوتی جەمال حەیدەریانە.

هــاوڕێ ســەفەر ناســراو بە ســالار لــە، ١٩٨٦/١٠/١٧ کاتێک دەیەوێــت بچێتە شــاری هەولێــر، لەگــەڵ مــەلا عومەری خەڵکــی دووســتەپە، بــە ئۆتۆمبێلێکی جێــب لــە خەندەقی لەتیفاوە، کوتک و ســنگی لەگــەڵ پیاوەکانی بەعس بەرەو

ڕوو دەبنــەوە. هــاوڕێ ســالار دەمانچەکەی دەردێنێ، کاک عومــەر ئۆتۆمبێلەکە دەسوڕێنێتەوە بۆ ئەوەی دەرباز بن. بەڵام جێبەکە لەناو وەرد دەوەستێ، هاوڕێ ســالار دەڵێ تەمەننام دەکرد هیچ هەژارێک بەمنەوە گرفتار نەبێ. دەمانچەکەی فــڕێ دەداتە نــاو ئۆتۆمبێلەکە. ئەمنەکان دەیانگرن. دەڵێ: جوتیارین. یەک لەو زۆڵە کوردانەی کە جاش بوە، ســەری لە بن گوێی ئەمنەکە دەنێ و پێی دەڵێ: ئەوە ســەفەر کادیرە. دەســتیان دەبەســتن لــە ســندووقی کرۆنەیەکیان داوێن. هاوڕێ ســالار، لەنێو سندووقەکە دەستی دەکاتەوە، دوو هەزار دیناری سویسری بۆ ماڵە شــەهیدەکان پێ دەبێ، هەزار دیناری دەداتە کاک عومەرو، پێی دەڵێ: مــن دەکــوژن، بەڵام تۆ ئەگەر ئەوەی من پێت دەڵێــم ئەوە بڵێی، ئازاد دەکرێی و ناتکــوژن. بڵێ: نایناســم، بەزەبــری دەمانچە منی ڕفانــدوە. کاک عومەر هەر ئەوەی هاوڕێ سالار پێی دەڵێ زیاتر ناڵێت. دواى ماوەیەک لە لێکۆڵینەوە، مەلا عومەر ئازاد دەکرێ.

شێوازی ئەشکەنجەدانی هاوڕێ سەفەر لەهەولێر دەنگی دایەوە. گوایە شانێکیان دەرهێناوە، ئەمنەکان لەســەر مێزی شــەڕابی یانەکانی شــەوانە باسیان کردوە، کە ئەو مرۆڤە چەند خۆراگربوە. ١٩٨٧/١/١٣ لەژێر ئەشــکەنجەدا شەهید بوو.

ســاڵی ١٩٩١ لەدوای ڕاپەڕین، هەر بابا بوو لەدوای جەنازەی کەســوکاری خۆی دەگــەڕا، بەتایبەتــی مەعمەل قیــر. پیاوێک پێیان دەڵێ: دوێنــێ ئەو قەبرەمان هەڵدایــەوە مرۆڤێکــی بە هەیکەلە، لەناو نایلۆن شــانی دەرهاتوە، کاتێک دەچن دەبینن هاوڕێ ســالارە. کاخەزێکی لە ســیمی پاکەت لە گیرفان بوە، بەداخەوە کوالیتــی بۆ خوێندنەوە زۆر باش نییــە، لای کوڕەکانییەتی، بۆ حەیدەری کوڕی نوســیوە: دوو هەزار دیناری ماڵی شــەهیدانم لابوە، بمبورن نەمتوانی بیگەیەنم.

هەڵوێســتە شیعرێکم بۆ شەهید سالار نوسی، کۆپلەیەکم لێرە داناوە:

**بەوری، چاو تروســکەداری، مەملەکەتی گەنم و هەتاو**
**تیشــە شاخەکەی بازارگەی بەپێوە ماو و نە ڕووخاو**
**کاتێک دەســتیان لێکردیەوە، تۆ پێت گوتن:**
**دەســتێک کەمە بۆ نیشتمان، ها بیکۆڵن گلێنەی چاو..**

# لەماوەی پێنج ساڵ
# دووجار تەلەفزیۆنم بینی

لەکافیێ کۆبوونەوەیەکی فراوان کرا. ئەبو سـیروان سەرپەرشـتی دەکرد. هاوڕێ موحسـین و هـاوڕێ کانەبـی و مام خدر ڕوسـی، ئەبو ڕاسـتی، (باوکم) عەلی کوتـک و چەنـد هاوڕێیەکی تر بەشـداربوون. کۆبوونەوەیەکی سـەربازی فراوان بوو. هاوڕێ موحسین یاسین لەگەڵ هاوڕێ مام خدر ڕوسی قسەکانیان یەکانگیر نەبـوون. مام خـدر مرۆڤێکی هێدی و ئارام بوو، کەم وابوە مام خدر بە توڕەیی ببیندرێت، پیاوێکی زۆر لێبوردەیە. ئێمە خۆمان ساز دەکرد بگەڕێینەوە دەشتی هەولێر و ناوچەی بالیسـان، بەفەرماندەیی موحسـین یاسـین. هاوڕێ موحسـین زۆر توڕە بوو، هەڵسایە سەرچۆکان دەستی لەسەر ناتۆیەکەی دانا، ڕوی لە مام خدر کردو گوتی: هەی..هەی..هەی، خدر. باوکم و ئەبو ڕاسـتی دەسـتیان کرد بە پێکەنین.

من هەتا ئەو ڕۆژە نەمدەزانی خدرایەتی ئەوەندە شـتێکی خراپە!!

وای لێهات ئێمە لە مەفرەزەیەکی سی بۆ چل کەس، کە هاوڕێ موحسین یاسین و چەند بەرپرسـی تێدا بوو، بەرێکەوتین. دۆشـکە و چەکی قورسیشمان پێبوو. لەکافیێ وە بۆ سەرانە و بانێ و چاربۆت و هەرنێ و ئاڵکان و بارەگای بەتالیۆنی ٣١ لە ئیروان. شـەو لەوێ ماینەوە، ڕۆژی دواتر بەرەو سوسـێ و سەرکەندار لە گوندی سوسـێ دابەش بوین، من و پێشـمەرگەیەک چوین بۆ ماڵێک، کوڕی ئەو ماڵـە هەردی برامی دەناسـی، کە هاتەوە ماڵ، هەر لـەدوورەوە بەدەم داگرتنی بارەدارو بیورەکەی کە لەسەر پشتی ئێسترەکەی بوو، ئێمەش لەژوورەوە بەرامبەر دەرگای دەرەوە دانیشـتبوین، گوتی: ئای هـەردی بەخێربێی ئەوە بۆ ماوەیەکە دیار نەماوی، وامزانی شەهید بوی؟!! هاتە ژوورەوە من وامنەکرد تەریق بێتەوە، زۆر بەگەرمـی چـاک و چۆنیـم لەگەڵ کرد و وەڵامم دایەوە. هەر بۆ خۆی گوتی: بەخـوای تـۆ هەردی نیت. گوتم: ڕاسـتە هەردی برامە. پـاش ماوەیەک، گوتی: بەخـوای تـۆ هەردی. منیش گوتم: ڕاسـتە هەردیم. دوایی هـەر بۆخۆی گوتی:

نەخێر بەخوای هەردی نیت، هەردی قەت وا بەرەحەتی لەشـوێنێک دانانیشـێ!! ئەگەر هەردی بای، ئێستا باگردانت لەسەریان دەگێڕاو گاڵتەت لەگەڵ پیرەژنانی ئاوایی دەکرد.

دوای نیـوەڕۆ بارەکانمان لە ئێسـترەکان بارکردو بەرێکەوتیـن، ملمان بە چیای کۆلیسـەوە نا، کەم چیای وا ڕک لە کوردسـتان هەیە. تا بەسەرکەوتین بۆ دیوی ئاکرێ، لە بەرامبەر زێ، لە بناری چیا، چوین بۆ ئەشکەوتێ، باروبنەمان خست. بۆ شـەوێ کەڵەکوانەکانمان دابین کرد، بە چەند کاروانێک چەکە قورسـەکانمان لەگەڵ کورتانی ئێسترەکان پەڕاندەوە ئەوبەر. هەندێک لە پێشمەرگەکان بەچەند کەرەتـێ لـە زێ پەڕینـەوە ئەوبـەر، دوایی ئێسـترەکانمان بەمەلـە بەزێیەکەدا پەڕینـەوە ئەوبەر، بارەکانمان بارکردەوە بەرەو گوندی بابەگیسـک. باران دایدا، هەموو گیانمان تەڕبوو. گەیشـتینە بابەگیسـک دنیا هەورو باران بوو، هەور زگی بـە زەویەوە نابوو. لەگوندی بابەگیسـک سـۆبای داریان بۆ داخسـتین، خۆمان وشـک کردەوە، دەبوو بچینە باسـرمە. بۆ شەوی دوایی چوین بۆ باسرمە، بەڵام تـەواوی ئـەو ڕۆژە باران بۆ یەک چرکە کەلێنی نەدا، تەنها ددانمان وشـک بوو، شـوێنی وشـکمان نەبوو، هێشـتا تاریکی شـەو مابـوو لە باسـترمە دەرچوین. باسـترمە زۆر خـۆش بوو، کارەبا و تەلەفزیـۆن هەبوو، بەش بەحاڵی خۆم پێنج سـاڵ دەبوو تەلەفزیۆنـم نەبینیبوو!! تەنها جارێکی تر،کـە لەناو هەولێر خۆمان حەشـاردا بـوو لەماڵی خزمەکانـم. واتا لەماوەی پێنج سـاڵ دووجار تەلەفزیۆنم بینیبوو. کە ڕۆژ هەڵات ئێمە زۆر لە باسـترمە دوورکەوتبوینەوە بەرەو زینەتیر، لەوێشەوە بەرەو دۆڵی بالیسان.

مەودایەکـی مابـوو بگەینـە زینەتیر (ئەو چەند شـەو و ڕۆژە بـاران بوو، بەبێ پسانەوە)، موحسین یاسین گوتی: کورە بۆ ڕاناوەستن پیاو میزێکی بکا؟ منیش پێم گوت: میزکردن ڕاوەسـتانی بۆچیە!! گوتی: ئەی چۆن، چەند ڕۆژە تۆ چۆن میـز دەکەیـت؟! گوتم: برا گیـان من هەندێکی بەو ڕانەم ئـەوی تر بە ڕانەکەی تـرم دا دەکەم، هەتا ناو کەوشـەکانم گەرم دەکاتەوە، بـاران بۆخۆی هەر پاکم دەکاتەوە. موحسـین یاسین گوتی: بەخوای تەگبیری چاکە.

لەپایـزی سـاڵی ١٩٨٧ کوڕێکمان بـوو، لەوکاتەدا لەناو کەپـر دەژیاین. ناومان

نـا زێبـار، چونكە ئـەو ناوچەیە زێبارەتی بـوو. لەدوای دە ڕۆژ بـۆ چوارقورنە ڕەوانـم كردن بۆلای پورزایەكانـم. لەوكاتەدا لەشـەڕێكی قارەمانانەی بێوێنەدا، ئامر كەرتێكی یەكێتی بەناوی دەشـتی مهندس شەهید بوو. مەلا ئاری و شەهید عەزیزی پورزام، ناویان لە زێبار گۆڕی، كردیان بە دەشـتی.

# بیركردنت پشكۆیەكەو،كاول بوونت تراژیدیا

گەیشـتینە گوندی ئەشـكەوتە. بارەگای قاتعی هەولێر. باوكم و برا و ئامۆزاكانم زۆریـان لەوێ بـوون، پێش ئێمە چوبوون بۆئەوێ. هەواڵێكمـان بۆهاتبوو گوایە لە ١٩٨٧/٥/٢٣ گوندەكەی ئێمە و چەند گوندێكی دراوسێی گوندەكەمانیان، بە شـۆفەڵ خاپوور كردوە. ڕاسـتە كاولكردنی هەر گوندێكی كوردستان ئازاربەخش بـوو، بـەڵام كاولكردنی (گەڕەشـێخان) ئازارێكی تایبەت بـوو. تەمەنی گەنجیم لـەو گوندە بەسـەر بردبـوو. زۆر لەمێژ بوو گوندەكەی خۆمـان و ئەو گوندانەی بەسـتی شـەرغەم نەبینی بوو. ئەوكاتە گوندەكەی ئێمە و دراوسێ گوندەكەمان، خاپووركرابـوو. بەڵام زۆرم پێ خۆش بوو لەدەشـتی هەولێـر جەولەیەک بكەم، بەتایبەتـی، گوندەكەی خۆمان بەخاپوریش بێ ببینمەوە.

سـەدان یادگاری تاڵ و شـیرینم لەو گوندە خۆشەویستە هەبوو. چوینە بەستی شـەرغە بـارەگای بەتالیۆن. شـەوێک بڕیارمدا ئەگـەر بۆ نیـو كاتژمێریش بێ، گونـدە كاولكراوەكەمـان ببینـم. لەشـەوێكی مانگەشـەوی زۆر ڕوونـاک، مانگ و ئەسـتێرە دەدرەوشـانەوە، لەسـەر لا دیوارێكـی یـەک مەتری، كـەوا لەپاش كاولكردن و داشـۆرانی بارانەكان مابوەوە، دانیشـتم بیرم دەكردەوە، هاوڕێكانم، دراوسـێكانمان، دەبـێ لەكوێ بژین؟ كێ مابێ،؟ كـێ مردبێ؟ بەو نیو كاتژمێرە شـریتی تەمەنی ڕابردووم وەبیرهاتنەوە، هەر هەموشـم شەن و كەو كرد، چونكە هاوڕێیەكانـم لەگونـدی ایلنجاغ بەجێ مابوون، من هەر بەتەنها ڕۆیشـتم، دەبایە زوو بگەڕێمەوە لایان، بەویژدانێكی بریندارو دڵێكی پڕ ئومێد بەدوارۆژ. چەكەكەم كـردە شـانم، بـەرەو گوندی ایلنجاغ كەوتمـە ڕێ. (ایلنجاغیـش تەنها دوو ماڵ بەفیراری هاتبوونەوە) .

لەو ماوە کورتەی ئەو شەوە، کە لەسەر ئەو مەترە دیوارەی گوندە کاولکراوەکەمان دانیشتبووم، کاتێک میمۆری مێشکم، بیست ساڵ ڕابردوی لەو گوندە بە وێنەو دەنگ لێدایەوە، خەیاڵی ئەو چەند ساڵەمی لەخۆی لول دا. هەموو ڕۆژێک لە دەنگی فەندی مام قادری خەبەرمان دەبوەوە، یەک بەخۆی هاواری دەکرد: کوره لوقە وەرە کاوجۆی بۆ ئەو بەرانانە بێنە. هاواری ڕەسوڵ قولی کە دەیگوت: وەرن ئەو سەیارە هەڵنابێتەوە پاڵی پێوەنێن، هەتا لە گەریمان شۆڕ نەکردبایەوە هەڵنەدەبو.

دووکەڵ سەری گوندی دادەپۆشت، لەسەر سەکۆی کۆنە دیوەخانی شێخ مەحەمەد ئاغا، لە پێنج شەش قۆڵ دامە دا دەبەستړا. لەولاوە قیژەی جەمیلە قۆرو، دەنگی بانگدانی مەلا کەریم و، تۆزی پیکابی سەلیم سەعیدی پۆریجە و، گرەی ماتۆڕی شەهید یاسینی مامم، کاتێک لەرێگای سێنارە شۆڕ دەبوەوە، شەڕی (ک.ت) لەگەڵ بڵباسەکان، کاتێک بلەی مەحەمەد زەبلا و هاواری دەکردە مـن: کوڕی عەلی کوتکی، برۆ تاژی باوکت بێنە بچینە ڕاوێ. خۆ ئامادەکردنی باوکم و عەزیزی حەمەد عەلی و حەیدەرو ساقەی کەچەڵی و عەلی پلکە فاتم و حەسەنی برای، کاتێک تاژیەکانیان ڕست دەکرد تا بچن بۆ ڕاو.

حوسەی حەسەن نۆبەتدار دەبوە لای بلەی مەحەمەد زەبلا وی، برهانی عەلی کوێخا قادر، دەبوە لای من، پاش شەڕکردن هەر زوو ئاشت دەبوینەوە. کاتێک بۆ چۆلەکە کوشتن بەلای ماڵی عومەری پلکە هەمین، تێپەڕ دەبوین، گوێمان لە گریانێکی بەکوڵ و بەسۆز دەبوو کە عومەر ئەو ساڵە جوانە مەرگ ببوو.

نەزاهیری مام ڕەسوڵ و هەمزەو عەباس و نە بەکری حەمەدی مام شێخە و نە خدری مەحمود کەر خراپ و نە سیامەند و ئەحمەدی قادر تەرجان و نەجەوهەری مەحەمەدە قەش و نەشەهید کەریم و شەهید واحیدی عەلی کوتک و نە عەواسی فەندی و نە حەسۆی مام یاسین، کاتێک بانگی دەکرد: ئەحمەد ئەو تاپرەی باوکت بێنە بچینە گردی نیسکان، بۆ ڕاوکردنی کۆترەکانی سمایلە باشەی میرەکانی. لەوکاتەی یەکەم بارانی پایز دەباری، بۆنی بارانی یەکەمی ساڵ، لە (پاش جۆخینی) گەرە شێخان و خۆڵ و خاکی تەڕ بوو، بە لوتمدا تێدەپەڕی، هەموو خانە هەستیارەکانی بۆن کردنم تژی دەبوون.

ئەو قەرەباڵغیەی سەر تانکی ئاوی گوندەکەمان، هەمیشە سی بۆ چل کچ و

ژنی لەســەربوو، بۆ کێشـانەوەی ئاو بـۆ ماڵەکانیان. نــە چاوەڕوانی ئەو کچەی کە ڕۆحم لەگەڵی هاتوچۆی دەکرد لەکاتی گەڕانەوەی لەســەر تانکی بۆ ماڵەوەو بەپێچەوانــەوەش، کە لە پاش ســێ ســاڵ خۆشەویســتی، یاســاغ بوو دەســتم بەدەســتی بکەوێ نەبادا وەکو (ن) بیکوژن. ئەو حەیرانەی باوکم وەبیر هاتەوە کە دەیگوت: (ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنە ســەفینی، لەسەری هەورە لەبنی هەتاوە، بەژنێ باریک دوونێ ئێوارێ لەڕێێ ســەراوێ چەندە شـیرن بوو، سوکە ئاوڕەکی داوە، گەلــی بــرادەران حەکیمەکی بە متمانەم لۆ بینن، برینێ کەون و نوم لێکڕا کولاوە). ڕەنگە هۆکارە ســەرەکیەکەی ئەو پێک نەگەیشــتنە، ترسنۆکی من بوو بێت.

ئەوکاتە گوندەکەمان چەند ئۆتۆمبێلێکی لێبوو، وەک: زراری مســتەفا، عەواســی فەندی، سەدیقی حەکیمی، ڕەسوڵ قولی.

ئەو دیمەنەی کە مەڕی ماڵی حەســەنی قادری و برایەکانی لە گردی مهندســی، ئــەو مێگەلــە مەڕە لەو گردە دەئالا، یەک لەدوای یەک شــۆڕ دەبوەوە بۆ ســەر کـۆل و بیــری ئــاودان، نە زەرەی نێرەکــەری دۆلابی بە ڕاکێشــانی دەولکی ئاو کاتێــک عوســمانە ڕەشــی بــرای ســەلیمی مام برایمــی، فیکەی یــەک ڕۆژە ڕێ دەڕۆیــی، ئێســترەکانی ئــاو دەدا. کاتێک مام حەمەڕەشــید بــە کوچکە بەردان ڕاوەدوی بیلال و عەونی کوڕی دەنا، دەیگوت: یەک ئیشــم بۆ ناکەن، کاوڕەکان ئــاو نادەن. کاتێک پلکــە قەدریە دەیگوت: لێیان گــەڕێ بەخۆم ئاویان دەدەم. بەشەهید کانەبی دەگوت: تۆ گەورەتری برۆ بزانە باوکت چی دەوێ؟ ئەو هەموو ئەســپ و ئێســترە لەپێش ماڵی حەســەنی ناڵبەند کۆ دەبوونەوە، لەگوندەکانی دەوروبــەر دەیانهێنــان بــۆ ناڵکردن. کاتێــک حاجی حەکیم و مــام عەلی کوێخا قــادر لەکارگەی لبادی باوکــم، دەیانگوت: ئەحمەد، برۆ یەک جام ئاوی کوندەی شــەوێ ســارد بێنە. زاهیری مام ڕەسوڵی لەگەڵ عەلی ڕەوشەن پێک نەدەهاتن، ئیســماعیلی عوســمانە کەڕی، وەرەقەی کۆبوونەوەکانی حیزبی دەدایە باوکم کە خوێندەوارێکی باش بوو، باوکم دەیگوت: بابچینە ماڵی عوســمانی برای دەروێش عەلی. کاتێک وەســتا عەولا و وەســتا عوسمانی مام شێخە لە موسڵ دەگەڕانەوە لــە کارکردنــێ. کاتێک حاجی باپیر، بە بن دیوارەکان دا دەڕۆیشــت، بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی پیس نەبێ بۆ ســەکۆی دیوەخانێ. کاتێک شــاییمان دەکرد، زراری

خدر قاوەچی گۆرانی بۆ دەگوتین.
کاتێک، لەساتی باران باریندا ئەو کەندەی پێش ماڵان کۆلاوکۆل دەهات، هەموو خەڵکی گەڕەشێخان لەدیاری دەوەستان، ئێمەی منداڵیش بەجلی تەڕەوە لەدیاری هەڵدەلەرزین. کاتێک سەگەکانی ماڵی حەسەنی مام قادری، لەگەڵ سەگەکانی ماڵی سەلیمی مام برایمی بەشەڕ دەهاتن. کاتێک لەگەڵ خەسرۆ عەولای، باراشمان دەبردە دۆڵەبەکرە، لەگردی مهندس خشخشۆکەمان دەکرد. کاتێک دەیان ناردم، یەک دەسک تور لە باخچەی ماڵی شێخ جەلال بکرم. کاتێک دەچوومە دوکانی مام عومەری برای عوسمان نەخشینی، کاتێک باوکم دەیگوت: برۆ بانگی کەریمی حەمەشێخە و خدری مام عومەر کەپو سۆری بکە، بێنە ماڵی ئێمە بۆ نان خواردن. کاتێک مام ڕەزا قوڕە بەرازە لە کوڕەکان تووڕە دەبوو قیژەی دەهات، سەباح دەیگوت: باوکم زۆر تووڕە بووە. کاتێک ئەحمەد دێوانە دەچوو بۆ کرێکاری بۆ کەرکوک، کاتێک دێوەرە دەهاتە ناو گوندو خەڵکی لێ کۆ دەبوونەوە، کاتێک جەوهەری مام مەولودی لە دوڕیانی بەدیار دەکەوت لەخوێندن دەگەڕایەوە. کاتێک دەچوین مزگێنی بدەینە پلکە شوکرییەی، موحسین یاسین لەفەلەستین فیدایی بوو دەگەڕایەوە گەڕەشێخان. کاتێک تراکتۆری ماڵی حەمەدی ستیلەی، جوتی دەکرد. فاقمان دادەنایەوە بۆ ڕیشۆڵەگرتن. کاتێک تایەری مام سمایل و قوشەی مام عەزیزی خەریکی گێڕانەوەی ئەو نوکتەیە بوون کە قوشە بە باوکی کردوە. کاتێک عەولای کەریمی لەسەر نەجاتی کوڕی بەخارە ئەحمەدی دەگوت: نەجاتی من زۆر فەقیرە ئەگەر شەڕی پێ نەفرۆشن شەڕ ناکات. تراکتۆرە نوێیەکەی ئەحمەدی حەمەد مەلای هاتەوە گوندی، کاتێک ماڵی سەلیم گۆرانی بەیەک ڕۆژ دوو بوکیان هێنا. کاتێک حەسەنی مام مەولودی بە تفەنگە برنۆیەکەی دەهاتە ماڵمان. کاتێک برایم تەرجان، چەند کاوڕێکی لەلای ماڵی حەمکۆی ڕادەگرت. کاتێک ئەو هەموو گەورە کوڕە بێ ژنە لەماڵی عەلەی حەمەسالح بوون، وەلی و مەحەمەد ڕەحمان و... . کاتێک ژنانی گوندەکەمان بۆ دوعا دەچوونە ماڵی شێخ تەها.
هەموو یادەوەریەکانم لە میمۆری مێشکم لێدایەوە.
غەریبی و یادەوەری ئەو خەڵکە خۆشەویستەی ناوم هێناون، سەراپا هەست و

نەستی داگرتبووم، وا لە ناو ئەو بیرەوەریانەدا قووڵ ببوومەوە، هەر دەتگوت ئەو ڕۆژانەیە کە لە گەڕەشێخان دەژیام، کە چاوەڕوانی هاوڕێکانم لەگوندی ایلنجاخ وەبیرهاتەوە، ڕاچڵەکیم، لەناو خەونی بیرەوەریەکانم هەستامە سەرپێ.

# ئەو غرووره ساویلکەیەم نەبوایە،
# تێربۆی دەگریام

ڕۆژێک باوکم گوتی: خۆتان ئامادەبکەن، من و ئەردەلان و هاوار دەچینە ڕۆژهەڵاتی کۆیە. هەندێک خزمان لەوێ هەبوون، بەناوی کاکەسور و تەحسینی ئامۆزام. بەومەبەستە هەر چوارمان مەفرەزەیەک بکەین بۆ ئەو ناوە، تا چاومان پێیان بکەویتەوە، ئەوانە زۆر بە ماڵ و خێزانەکانی ئێمەوە ماندوو بوون، بچین سوپاسێکیان بکەین. هەر چوارمان لەبەستی شەرغە لەگوندی بەلەبان بەرێکەوتین، بۆ شەوێ چوینە گوندی سماقە، بەیانی هەستاین بۆ ئێوارە گەیشتینە ڕێگەی کۆیە- تەق تەق. پەڕینەوە بۆ گوندی باغەجنێر، شەوێ لەوێ ماینەوە. پاشان چوین بۆ گوندی بۆگد، نانی ئێوارەمان خوارد، بەرێکەوتین بۆ ڕەنی کانی بی، ماڵی کاکەسور لەوێ بوو. پرسیارمان کرد: ماڵی کاکەسورمان دۆزیەوە. حەوشەیان نەبوو، بانگمان کرد: ماڵێ.. ماڵێ، نەخەوتون؟ کاکە سور گوتی: کاکی خۆم فەرموون. کە چوینە ژوورەوە نەیناسینەوە، دانیشتین ئینجا چراکەی گەش کردەوە، گوتی: ئەوە ئێوەن؟!! دەستی کرد بەماچ کردنمان، ئەویش وەک پێی بڵێین: دواجارە یەکتر نابینینەوە، هەرواش بوو. (داخی بەجەرگم ئەنفال کرا) کاکە سور، لەناوچەکە پیاوێکی بەناوبانگ بوو. برا بچوکی ناسرو عبدولباقی بوو، بەڵام ئەو لەبەر لێهاتویی برا گەورەی هەموو گوندی کڵێسە بوو، هیچ حیزبێک نەبوو لەناوچەکە ڕێزێکی تایبەتی بۆ کاکە سور دانەنێ. هەتا دەست هەڵێنی کەڵەگەت، پیاوێکی گفت و لفت خۆش، هەتا خوا حەز دەکا بەخشندە.

بەیانی چوومە سەرئاو هەتا هاتمەوە، ویستم ڕەختەکەم لەپشت ببەستمەوە ( ڕەختەکەم زۆر کۆن ببو) ڕەختەکەم لەوێ نەما بوو، پێم گوتن: کوا ڕەختەکەم؟

هـاواری بـرام گوتی: کاکەسـور ڕەختی خـۆی بۆ تۆ داناوە. لەسـەرگەڵوو بۆی دروسـت کرابـوو، مەخزەنەکانی منی لەناو ڕەختەکە نابـوو. گەلێک گوتم: کاکە لەپشتی من هەر خراپ دەبێ، ئەوە بۆ تۆ جوانە، بەلاش بوو لەگەڵ کاکە سور. گوتـی: بەخـوای دەبێ بیبەسـتی. ئەوەبوو لەپشـتم بوو هەتا بەشـەڕ ئاودیوی ئێرانیـان کردین، لەبارەگای ناوزەنگ بەجێما لای هاوڕێیان. هەرڕۆژەی لای ماڵی خزمێک نانیان سـاز دەکرد، شـەوانیش لەماڵی تەحسـینی ئامۆزام دەماینەوە، کە لە پێشـمەرگایەتی دانیشـتبوو کەڵەکی دەگێڕا بۆ پەڕینەوەی خەڵک، بژێوی مـاڵ و منداڵیـان پێ دابین دەکـرد، هەندێ جاریش دەچوە (سـەفرەو زەنون) کەوا شـوێنێکی بازرگانی بوو لەسـنوری ڕۆژهەلات، بەداخەوە ئەو خەڵکە چاکە زۆربەیـان ئەنفال کران، ئیتر یەکتریمان نەبینییەوە.

ئەوەی زۆر ئازاری ویژدانی دام لە پاش ئاوارەبوونمان بۆ ئێران و ڕاپەڕینی ١٩٩١ :کـە گەڕاینەوە، پرسـیاری ماڵی کاکەسـورم لە خزمەکانم کـرد. ئەو ماڵەی کە دیوەخانی پێشـمەرگەی هەموو لایەنەکان بوو، خەڵک لەماڵی کاکەسـور تێرنانی دەخوارد، خەمخۆری هەموو گوندی کلێسە و هەموو گوندەکانی دەوروبەری بوو. گوتیـان: ماڵیـان لە باداوانە، براژنە مەلیح فەڕاشـە لە نەخۆشـخانەی ڕزگاری. ئەگـەر دەتـەوێ بیبینی، وەرە بـا بڕۆین بـۆ نەخۆشـخانەی ڕزگاری لەهەولێر. چویـن بـۆ لای، هۆڵێکی گـەورە، کە براژنە مەلیح پاکی دەکـردەوە، لەدوورەوە گوتیـان: ئەوە براژنە مەلیحەیە، (کاشـیەکانی پـاک دەکردەوە). دیمەنێکی زۆر بـە ئازاربـوو، چونکە ئەو قۆڵ و مەچەکانەی براژنە مەلیـح، هەر بە کەوگیرەوە جوان بوو، کاتێک نان و چێشـتی بۆ میوانەکانی کاکەسـور ئامادە دەکرد، نەک سڕینەوەی کاشی نەخۆشخانە!!

ئەگـەر پێـم عەیـب نەبوایە، یەک بـە خۆم لە برا ڕۆم دەدا. ئـەو ڕۆژگارە بۆ وا زاڵمـە؟!! کابانی گـەورە ماڵێ، بەهیچ پێوەرێک بۆ پاک کەرەوەی نەخۆشـخانە نابێـت. ڕێـزی تایبەتیم بۆ پاکەرەوەی نەخۆشـخانەکان هەیـە، کارەکەیان بەرز دەنرخێنم. ئێسـتا خەریکی نوسـینی ئەو چەند دێرەم، دەمەوێ فرمێسـکەکانم دەفتەرەکـەم تەڕ نەکا، باوەڕ بکـەن، دڵم وا پڕبوە قەتماغەی برینی ئەنفالەکانم کولاوەتەوە. بەهەرحاڵ غیرەتم دابەرخۆم هەنگاوم نا بەرەو ڕوی براژنە مەلیحە، سـڵاوم لێکرد، ماسـیحەکەی ڕاگرت. پاش هەواڵپرسی و تەوقەکردن، (ژنی ئەو

ناوچەیــە مامــە ڕەزایین (هەقە)ن، ئــازادن لەتەوقەکردن)، ئێمەش کەســوکاری یەکتربویــن، کورســیەکی داری درێــژی لێبوو، بــۆ چاوەڕوانی نەخۆشــەکان، بۆ مــاوەی دە خولەکێــک لای دانیشــتم، لەناخــەوە دەکــوڵام، گوتــم: دوایی دێمە ماڵــەوە، دەمــەوێ فاخیریــش ببینــم (تاقانەی کاکەســور و دایکی بــوو)، خوا حافیزیــم کرد. ئەوە قەترەیەکە لە دەریای خەمی ئەنفال.

بــا بێمەوە ســەر باســەکەم، بۆ چەنــد ڕۆژێک لــە کلێســە و بۆلقامیش و ڕەنی کانــی بــی ماینەوە. باوکم گوتی: دەبێ بەگوندی قزلو دا بگەڕێینەوە. مامۆســتا ســەلاح لەوێیە ســەرێکی لێدەدەین. (مامۆستا ســەلاح کوڕی حاجی عارفی کوڕە پــوری باوکم بوو. دوای ئەنجامدانی خۆپیشــاندانێک لەکەرکوک گیرابوو، زۆریان ئەشــکەنجە دابــوو، باری دەروونــی تێکچووبوو، لەگــەڵ ژن و دوو منداڵی لەوێ دانیشــتبوو، ناســرا بوو بە، ســەلاح مزاهەرە). گوندی قزلو مامەڕەزاین (هەقە) ن باشــترین خەڵکی ناوچەکەن، لەروی ڕۆشــنبیری و مافی ژن و ... چوین بۆ گونــدی قزلــو، باران کەلێنی نــەدا بۆ یەک چرکە. بەجلی تــەڕو قوڕاوی خۆمان کرد بە گوندی قزلو. پرســیارمان کرد لە ماڵی ســەلاح کەرکوکی، گوتیان: بڵێن ســەلاح مزاهەرە. گوتمان: بەڵێ. گەنجێک پێشــمان کەوت، چوینە ماڵی سەلاح. چاوی بە ئێمە کەوت توشــی سەرسوڕمان بوو!!

ئێمە لەناوچەی ئامێدی و، ئەو لە گەرمێن، دەستمان کرد بە ملی یەک، بە باوکمی دەگوت: خاڵە. گوتی: خاڵە، قەت باوەڕم نەدەکرد یەکتر ببینینەوە!! ڕەنگە ئەو شەوە چەند جار باسی گرتن و ئازاردانی خۆی بۆ کردبین، کەڵەشێرێکی گەورەی خۆماڵی بۆ ســەربڕین. هیچمان نەبوو پێی بخەوین، بۆیە من و هاوارو ئەردەلان، دەچوینە ماڵی دراوســێیەکەیان بۆ خەوتن، باران کەلێنی نەدەدا بڕۆین. ســەلاح زۆری پــێ خــۆش بوو نەڕۆین، لەبەرئــەوەی دەمێک بوو یەکتریمــان نەبینیبوو، خواحافیزیمــان لێکرد. بۆ جاری کۆتایی بــوو بینیمان، بەداخەوە ئەویش ئەنفال کرا.

بــەو بارانــە ملــی ڕێگامــان گرت، بــۆ دەشــتی هەولێــر. دوای دوو ڕۆژ ڕێکردن گەیشــتینە گونــدی ســێگرتکان، (ئێســتا ناحیەیە) لەوێوە بەرەو بــارەگای لقی هەولێر لە دۆڵێک، لە گوندی بەلەبان. ئەو ڕۆژە هاوڕێیان چووبوونە ناو هەولێر. تاوانبارێکیــان هێنابــوو، چەند کەســێک بە کورتەک و شــەڕواڵی مرادخانییەوە،

بەجلوبەرگ و ورگ و گیپاڵیان دیاربوو خوا پێداون و خەڵکی شارن، بەدوای ئەو گیراوە کەوتبوون بۆ ئەوەی بەری بدەن، گولکێکی گەورەیان لە بەلەبان کڕیبوو بۆ بارەگایان هێنابوو، گۆشت و برنج کلاشەی دەکرد. پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ، دەستی بەناو ئەو تاوانبارەیان گرت، لەگەڵ خۆیان بردیانەوە، دوایی زانیمان چەند هەزار دینارێکیان بەجێهێشتبوو بۆ بارەگا، دیاربوو هەر بایی ئەوەندە تاوانباربوو!!

## پێنج برای شەهید

پێشمەرگەی، شیوعی، یەکێتی، سۆسیالیست، پاسۆک، هەمیشە ئامادەییان هەبوو. ئەو حیزبەی بەهیچ شێوەیەک ئامادەیی نەبوو، جگە لەناوچەی بادینان، پێشمەرگەی پارتی بوو. تەنها جارێک بۆ ماوەیەکی کورت (گوڵ وباخ، فەرماندەیەکی پارتی بوو) لەگەڵ مەفرەزەیەکی هەشت کەسی هاتنە خوارەوە، بە خێرایی گەڕانەوە. جارێکیش حاجی دۆشاو لەگەڵ دوو پێشمەرگە هاتن و ئەوانیش هەر زوو گەڕانەوە ئێران. پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان خەڵکی زۆرباشی تێدابوو، بەداخەوە حیزبەکان نەیانتوانی پەروەردەمان بکەن، بەکارمان بێنن لەبەرژەوەندی کوردوکوردستان و پێشخستنی کۆمەڵگای کوردەواری. بۆ یەکسانی و خۆشەویستی خاک ڕامان بێنن. بەو هەموو حیزبە تاکە پێشمەرگەیەکی نەخوێندەواریان فێری خوێندەواری نەکرد!!
نەیانتوانی هێزێکی پارێزەری کوردی لەو کەرەستە خامە دروست بکەن، کەوا خاکی خۆشبوێت، خەڵکی وا هەبوو دە ساڵ بوو پێشمەرگە بوو بەو هەموو سەختیە، کەچی تێیان نەگەیاند بۆ پێشمەرگەیە؟!! شتێک بۆ خوا بڵێم: تەنها لە بارەگاکانی حیزبی شیوعی جارجار کتاب دەست دەکەوت، ئەگەر نا لەهەموو بارەگای حیزبەکان بەحیزبی شیوعیشەوە کۆنکان، تاوڵە، دۆمینە، شەترەنج، دامە، هەبوو.
ئەگەر فکری چەپیم بەسەردا زاڵ نەبایە و لەژێر کاریگەری هەستی نەتەوایەتی و مەزڵومی گەلەکەم و، تێکەڵاو لەگەڵ هەندێک کاریگەری کۆمەڵگا، بەناوی

ترسـنۆکی و بەزین نەبوایە، سەدجار تفەنگەکەم دەشکاندو سەرم هەڵدەگرت بۆ شوێنێکی دوور. بۆ ئەوەی ئەو هەموو کەم تەرخەمی و ناپاکی و بەکارهێندرانی حیزبەکان نەبینم لەلایەن داگیرکەرانی کوردسـتان.

لە بارەگای شـەهید بلە، لە سـماقوڵی. دوو سـێ تاوانباریـان هێنابوو، یەکیان بەنـاوی (ر)، دیاربوو بەرپرسـێکی گەورەی بەعس بـوو. حکومەتی بەعس زۆر بەدوای دەنگوباسـی (ر) بوو، زۆر مەبەسـتیان بوو ڕزگاری بکەن، بەڵام دادگای شـۆڕش حوکمی گوللە بارانکردنی (ر) دا، بەسزای گەل گەیەندرا.

یەکێکـی تریان، کوردبوو بـە غەرامەی مالی ئازاد کرا، تەنها یەکێک لەزیندانەکە مابووەوە، بەڵام بۆ پێشـمەرگەکان چ یەک کەس زیندانی بێ یان دە کەس، هەر دەبوایـە خاڵێکی پاسـەوانی بـۆ دابندرێ. بەو شـێوەیە پێشـمەرگەکان دەبوو پاسـەوانی زیاتر بگرن (کاتژمێری پاسەوانی، خاڵی پاساوانی زیاتر دەبوو، بۆیە دەیانگـوت: باشـە ئەوەیان بۆ ئازاد ناکـەن؟، بەتەنها ماوەتـەوە!! هاوڕێیانیش دەیانگـوت: ئاخـر دەمانـەوێ زیاتر زانیاری لەسـەر کۆبکەینـەوە ئینجا بڕیاری لەسەر حوکمەکەی بدەین. پێشمەرگەکانیش دەیانگوت: هەیهو، هەیهو، دە مادام وایە با ئەمشەو گوللە بارانی بکەین، ئەوان دەیانویست بەهەر شێوەیەک بێ ئەو خاڵە پاسـەوانییە بەناوی زیندان نەمێنێت، بەڵکو کەمتر پاسەوانی بگرن. ئینجا چ بـە بەرەڵاکردنی بێت یان گوللە بارانکردنی.

هاوڕێیـان دەیانگوت: لە نێـوان ئازادکردن و گوللەباران کردن هیچ حوکمێکی تر نییـە؟!! یان ئێوە دەتانەوێ لەکۆڵ خۆتانی بکەنەوە؟!!

لـەدوای گفتوگـۆی یەکێتـی و بەعـس، دژبەیەکی فکـری لەناو یەکێتی سـەری هەڵدا، زۆرم لێ دەناسـین یەک لەوانە حاجی مەمۆ، ناویان ئاڵای شـۆڕش بوو، بەسـەرکردایەتی مەلا بەختیار، کە لەلای یەکێتـی زیندانی کرا. ئەو جیابوونەوە وەک جیابوونەوەکانی ئێسـتای حیزبەکانی باشـور نەبوو لەسـەر مالیەی حیزب و پـارە بێـت!! دەتوانـم بڵێم: لەسـەر دژ بەیەکـی فکری بو. یەکێتـی لەئان و سـاتی گوللە بارانکردنی مەلا بەختیاربوو، حیزبە کوردسـتانییەکانی باشـور زۆر هەوڵیاندا یەکێتی پاشـگەزبکەنەوە. ئەوە بوو هەوڵەکانیان سەری گرت. ئەوەش بۆ هەوڵی بەرەی کوردستانی دەگەڕێتەوە.

گەراینەوە بۆ (ئەشـکەوتەی) دۆڵی بالیسان: لەڕێگا لەسماقوڵی بارەگای ئێمەی

لێبـوو، بۆتانـی ئامۆزام لەوێ بوو، لەگەڵ هاوڕێ شـەهید بلە، (لەکەرکوک دوو برای شەهیدبوون، ڕاوێژو برایەکی تری). بلە بەرپرسی ئەوێ بوو، کوڕێکی ڕەش ئەسـمەری وەک تەشی بادراو، هەتا بڵێی ئازا لە گوللەی نەدەگەرایەوە، حسابی بۆ مردن نەدەکرد. بلە تازە ژنی هێنابوو، منیش زۆرم خۆش دەویست، یەکەمجار کە بوە پێشـمەرگە، هاتە لای ئێمە، لە مەلەکان لەگەڵ یەکێتی لەشـەڕدا بوین، ئەوکات بلە هات بۆ پێشـمەرگایەتی، هەر زوو دەیویسـت ئازایەتی خۆی نیشـان بـدا، ناوە ناوە دەیگوت: بۆ هێـرش نەکەین؟!! ئەوکات هاوڕێ خەیری و هاوڕێ شـێخ لەتیف لەگەڵ ئێمەبوون، دەیانگـوت: ئاگاداری ئەو کوڕە نەبین، خۆی بە کوشـتن دەدا. لەبەر ئەو ئازایەتیە بوو بە فەرماندەیەکی سـەربازی، بارەگای لە سـماقولی بوو. بەبۆنەی ژن هێنانی هیچم شـک نەدەبرد پێشکەشی بلەی بکەم، مـلازم هەزار کامێرایەکی بۆ هێنابووم کە لەروسـیا گەرایـەوە. منیش کامێراکەم پێشکەشـی بلەی کرد بەبۆنەی ژن هێنانی. بەداخەوە یەکترمان نەبینییەوە، زۆر بەداخـەوە لەو بنەماڵەیە، پێنج برا هەر هەموویان شـەهید بوون، هەموویان بوونە سـەربازی ون، هەزار دروود بۆ گیانی پاکیان.

# بەم زووانە حوشترلە دۆڵی بالیسان دەبینم

بارەگامان لە ئەشـکەوتەو لەکانی تەلان بوو لە چیای هەورێ. دەمەو ئێوارەیەک لەگەڵ هاوڕێ موحسـین یاسـین لەسە گابەردێک لەپشـتی چیوەی حاجی بەدیع دانیشـتبوین. لەبەرئەوەی هاوڕێ موحسـین پیاوێکی بـەورە و خۆ ڕاگربوو، من هەموو قسەی دڵی خۆم بۆ دەکرد، (ئێستا لە ژیان ماوە ئەندام مەڵبەندی سێی یەکێتیە). تەماشـای دۆڵی بالیسـانمان دەکرد،کەوا بـارەگای هەموو حیزبەکانی لێبوو، هاوڕێ موحسین گوتی: چۆن لەو وەزعەی دەگەی؟ گوتم: عەونی گوتەنی، پێم وایە بەمزوانە حوشتری لەو بالیسانەی دەبینم!! سەریان لەدوای یەکتر ناوەو یەک پێشمەرگەی لێ نییە تەقەیەکی بکات. کە چوینە ئێران و ئێستاش، هاوڕێ موحسین دەگێڕێتەوە دەڵێ: چۆن دەتانزانی؟!!

هاوڕێ کانەبی گوتی: هاوڕێ حازم، خۆت ببەستە، دەچینە لای برادەرانی پارتی،

لەپشــتی شێخ وەســانان لە دەرەدار. لە ئەشکەوتە بارەگامان بەجێهێشت بەرەو شــێخ وەســانان بەرێکەوتین. لە ڕێگا مامۆســتا ســەیفەدینمان بینی. ئەوکاتە، فەرماندەی تۆپخانەی یەکێتی بوو لە خەتێ، گوتی: ئەوە بۆ کوێ؟ هاوڕێ کانەبی گوتی: ســەرێکی برادەرانی پارتی دەدەین. دیار بوو مامۆستا سەیفەدینیش پێی ســەیر بوو کــە بارەگایان لەوێ دانابــێ، منیش گوتم: مامۆســتا بەخوای منیش پێم موعجیزەیە، بەڵام لەســەربازی یاســایەک هەیە دەڵێ: جێبەجێ بکە پاشــان گفتوگۆ بکە، بۆیە کە هاوڕێ کانەبی گوتی یەکســەر خۆم بەســت و ئامادەبووم، خواحافیزیمان لە مامۆستا کرد.

ئەگەر چوین، لەسەر تەپۆلکەیەک خێوەتێکی سێ بەچواری زۆر بچوک، ئەوەندە بــە ســادەیی بەنەکانــی بەســترابوو، بۆ ڕۆژێکیــش بێت خەڵک باشــتر خێوەت هەڵــدەدا، دیاربــوو زۆر کاتیبــوو. بارزانــی مەلا خالید و شــێخەڵلا و گەر هەڵە نەبم مەلا مەحەمەد و دوو ســێ پێشمەرگەی تری لێبوون. زۆریان بەخێرهێناین، دیاربــوو زۆر بــێ ئومێد بــوون. ماڵ و منداڵیان لە ئێران بەجێهێشــتبوو، هاوڕێ کانەبی هەروەک پیشــەی هەمیشــەیی خۆی کردی بە گاڵتە، گوتی: ئەوە چەند ســاڵە ئێــوە نەهاتونەتــە خوارێ ئێســتا ئێمە خەریکــە لەکارەکــەی دەبینەوە، بــەو ئاخیــرەی بــۆ هاتوون؟!! مــاڵ و منداڵتان بەجێهێشــتوە لە ئێــران!! کاک بارزان گوتی: من نەخۆشــم دەبێت بگەڕێمەوە ئێران. ئەوانیش هەر بۆ پێکەنین دەیانگوت: نابێ بڕۆی، کوێت دێشــێ؟ کاک بارزان دەیگوت: کاکە ئێرانم دێشــێ ئێــوە بــۆ تێمناگەن!! بوو بە پێکەنین. چایەکی بــە چڕە دووکەڵمان خواردەوە. زۆر سوپاســیان کردین بۆ ئەو سەردانە.

لەرێــگا هــاوڕێ کانەبی گوتی: باوەر ناکەم لێــرە بمێننەوە، ڕەنگە بگەڕێنەوە بۆ ئێــران. منیــش گوتم: وای لێ حاڵی بوومە. هاوڕێ کانەبی گوتی: چۆن دەزانی؟ گوتــم: بەنــی خێوەتەکەیان زۆر شــل بوو، ئەگەر تەماشــای هەڵدانی خێوەتەکە بکــەی دەزانــی بــۆ ڕۆژێک خەڵــک خێوەت ئاوا هەڵنــادا، نە خۆڵێکیان لەســەر دامێنەکانــی ڕۆ کــردوە، نە بەردێک، کە بای دێ خێــوەت لایەکی هەڵدەداتەوە. هــاوڕێ کانەبــی زۆر پێکەنی، گوتی: بەراســتی تێبینییەکی جوانە، ئەوەبوو دوو ڕۆژ دواتــر خەبەرمان بۆهات نەخێوەت ماوە نە ئاگردان.

ماوەیەک ببوە وێردی سەر زمانی هەموو پێشمەرگە، کە لەشەڕی قەندیلی دوەم،

لەسـەر گۆمی سـەری سـەکران کاک ئیدریـس بارزانی بە ملازم خـدر و هەموو ئەوانەی گوت کە لەبەرەی جود بوون، بەڵێنی دا، پێنج سەد پێشمەرگە بنێرێتە خـوارەوە، بـەلام چەند سـاڵ و مانگـی پێچوو ئەو هێزە هـەر نەهاتە خوارەوە، بۆیـە کە پێشـمەرگە یـاری دۆمینەیان دەکـرد، ئەگەر یەکێـک زۆر دواکەوتبایە لەهاتنەخـوارەوەی پولێکـی دۆمینە، پێیان دەگوت: کاکـە دە وەرە خوارێ خۆ نەبوی بە پێشمەرگەی پارتی!!

ئەوکات پارتی لەشـەڕێکی قورسـدا بوو بە پاڵپشتی سـوپای پاسداران لە دژی دیموکراتـی ئێـران، زۆر شـوێنیان لـە دیموکـرات گرتبوو، بۆیە ئێمـە کە بەناو خاکی ئێران هاموشـۆمان دەکرد زۆر دەترسـاین بکەوینە بـەر پەلاماری حیزبی دیموکـرات، چونکـە وایاندەزانی ئێمەش قیادە موەقەتەیـن. لەپاش هەوڵدانێکی زۆری هەموو لایەنەکان تواندرا ئەو شـەڕە ڕابگیرێ، بەڵام سـوپای پاسـداران و پارتی توانیان دیموکرات لە کوردسـتانی ڕۆژهەڵات وەدەربنێن.

# شەهیدبوونی پێشڕەو

سـەرەتای مانگـی ١٠/١٩٨٧ ، مـن و باوکـم و هاوار و ئـەردەلان، لەگەڵ چەند پێشـمەرگەیەکی تر لە گوندی ئەشـکەوتەی دۆڵی بالیسـان بەرێکەوتین، بەرەو چیای هەورێ. لەوێوە بەرەو سـماقوڵی، پاشـان بەرەو حاجی وسـوو بەسـتی شـەرغە، کـە بـارەگای بەتالیۆنی پێنج و لقـی هەولێر بارەگاکانیـان لەبەرامبەر گوندی بەلەبان بوو. لەبەرئەوەی باوکم بەردی گورچیلەی هەبوو، ئەو ڕێگایەمان کـردە ڕێگای دوو ڕۆژ. کە گەیشـتین، هاوڕێیانی بەرپرس و پێشـمەرگەکان زۆر خۆشحاڵبوون، چونکە ماوەیەکی زۆربوو یەکترمان نەبینی بوو. زۆر دڵخۆش بوین بـە بینینیان. لەوانـە، خارە خولەو ملازم هەژارو زۆر هاوڕێـی تر. بۆ یەکەمجار گەنجێکـی باڵابـەرزم لەگـەڵ هـەردی بینی، دەتگـوت دووانەن، پۆشـتە لەروی سـەربازی. بەیەکتریان ناسـاندین، چونکـە ئێمە لەبەری گارە بویـن لەبادینان. گوتیـان: ئـەوە هاورێ چەتۆیـە، برای شـەهید بڕیار. من لەگەڵ شـەهید بڕیار هەتـا دابەزی بـۆ ناو هەولێر بەیەکەوەبوین، پاشـان بەهـۆی ناپاکیەکەی مەمۆ

گیراو شــەهیدکرا. بەراســتی ئەو پێشــمەرگانەی ئەوکات جۆرێک بوون. لەدوای یــەک دوو ڕۆژ، نیوەڕۆیەک لەســەر نــان خواردن بویــن، دوو هەلیکۆپتەر هاتن. دابەشــبوین، ئاسۆی برام دوو ئاڕ.پی.جی بەرەو ئاسمان گرتە هەلیکۆپتەرەکان، یەکێکیــان لەبەردەمی هەلیکۆپتەرەکە تەقیــەوە، بەناو دووکەڵەکەی تێپەر بوو، هەلیکۆپتــەرەکان هەڵاتــن، هەندێک پێشــمەرگەی سۆسیالیســت هاواریان کرد: پێیکــەوت، ئافەریــن. ئێمە بەنیــازی لای ڕۆژهەڵاتی کۆیە بویــن. بەڵام ئەوەندە تامــەزرۆی بینینــی ئــەو پێشــمەرگانە و ناوچەکە بوین، چونکە بەهۆی شــەڕی براکوژی لە ســەرەتای هەشتاکانەوە لەدەشتی هەولێر دوورکەوتبوینەوە، بەهۆی پاوانخــوازی و باڵادەســتی یەکێتی لــەو ناوچەیە، هاوڕێیان مــلازم هەژارو خارە خولە و شــەهید بلەو زۆرانی تر، گوتیان:

ئێوارە دەرۆین بۆ بنەسلاوەو دارەتوو، بۆ هەندێک کاری پێویست، تۆش وەرە. زۆرم پێ خۆش بوو، بە پێنج ئۆتۆمبێل بەرێکەوتین، هاوڕێ ملازم هەژار، گوتی: هاوڕێ حازم تۆ لەگەڵ مامۆستا گۆران لە پێشەوەی ئەو ئیڤایە سواربن. چوینە بنەســلاوە، پێش ئــەوەی بگەینە ناو بنەســلاوە، بەکرێگیراوەکانی ڕژێمی بەعس هەندێک تەقەیان لێکردین، یەک دوو ئارپیگیان بەســەردا تەقاندین، هیچ زیانێکی نەبوو. چوینە ناو بنەسلاوە. پێشمەرگەیەک بەناوی پێشرەو خەڵکی قورشاغلوبوو، ماڵیــان لە بنەســلاوەبوو. هــاوڕێ دێدەوان و خولەو، چەنــد هاوتەمەنێکی خۆی گاڵتەیــان لەگــەڵ دەکرد، دەیانگوت: خوشــکت زۆرە، دەبێ خوشــکێکت بدەی بــە دێدەوان. نزیک بە نیوەی شــەو لــەلای ئۆتۆمبێلەکان کۆبوینــەوە، بەنیازی گەڕانەوە بۆ بارەگاکانمان لەبەســتی شەرغە.

دووبارە من و مامۆستا گۆران، لەیادم نەماوە کێی تر لەپێشەوە لەگەڵ ئێمە بوو، چونکە پێشــەوەی ئیڤا گەورەیە. مەلا ئاشــتی ئیڤاکەی لێدەخوڕی، (بەداخەوە مەلا ئاشتی لەگەڵ کانەبی گچکە لە ناپاکیەکەی سەلاح شینە و تاقمەکەی شەهید بوو). پشــتەوەی ئیڤاکە پڕ لە پێشــمەرگەبوو، دوو پێشمەرگەی سۆسیالیستیش لەگەڵ ئێمە گەڕانەوە، ئۆتۆمبێلیان پێ نەبوو، ئەوانیش لەناو ئیڤاکە سواربوون. من و مامۆستا گۆران تفەنگەکانمان لەپێش خۆمان وەک لە ئامێز گرتبێت، لوولەی لەســەر شــانمان بەرەو پشــتەوە، بەڵام مامۆســتا گۆران گەمەی بە ئەمنییەتی تفەنگەکــەی دەکرد، لەنــاکاو گوللەیەک بــە بناگوێی هەردووکمــان تێپەڕبوو بۆ

پشــتەوە، دیاربــوو هەر لەگەڵ شــریقەی تفەنگی مامۆســتا گۆران لــەدواوە بوو بــە هەرا. گوللەکە بەر ســەری پێشــڕەو کەوتبوو، کە پێــش نیوکاتژمێر دایک و خوشــکەکانی لەگەڵی هاتن تا ســواری ئیڤایان کرد. هەر ئەو گوللەیە بەر شانی هاوڕێ ســەفین مورتکە کەوتبوو، لەگەڵ دەســتی پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست، ناولەپــی کون کردبــوو. هاوڕێ دێدەوان لایتی لێ دا، بینی پێشــڕەو تەواو بوە، هــاوڕێ خولــە کە خوێنــی گەرمی بەر دەموچــاوی کەوتبوو خۆی لــە ئیڤا فڕێ دابــوو، بۆ ئەوەی دەســت بکاتەوە. وای زانیبوولە کەمیــن لێمان دراوە، تفەنگی مامۆســتا گۆرانمان فیشــەک لێدەرهێنا و بەســتامانەوە، (چەتۆ بۆنی لوولەکەی کرد،گوتی: ئەو تفەنگە تەقەی پێکراوە). بە جەنازەی شەهید پێشڕەوەوە بەرەو گوندی ئۆمەرەســۆر بــە ڕێکەوتین. لەگوند ئامێری گــۆڕ هەڵکەندنمان وەرگرت، دنیا ڕووناک داهاتبوو گۆڕمان تەواو کرد، شەهید پێشڕەومان ناشت، شەهید بلە چوو لەدوای دایک و خوشکەکانی تا پێیان ڕابگەیەنی،کەوا پێشڕەو شەهید بوە.

# کیمیابارانکردنی هەڵەبجە

لە دوای گرتنی هەڵەبجەی شــەهید لەلایەن یەکێتی و ســوپای پاســداران، چەند ڕۆژێــک پێــش جەژنی نــەورۆز، ئێمە خۆمــان ئامادە دەکرد بــۆ جەژنی نەورۆز، شــەوی ١٩٨٨/٣/١٦ هەواڵێکی دڵتەزێنمان پێ گەیشــت، کــە کیمیابارانکردنی هەڵەبجەبوو، هەموومانی توشــی شــۆک کرد، قەت باوەڕمان نەدەکرد ڕژێم پەنا بباتــە بەر ئەو شــێوازە دڕندانــە گەورەیە، بۆیە بڕیــار درا جەژنی نەورۆزی ئەو ســاڵە نەکەینەوە. ئەو کاتە لە بەســتی شــەرغە بوین، لای بــارەگای بەتالیۆنی پێنــج، ئاخر شــین گێڕان بۆ شــارێک ، پێنــج هەزار پەپولەی بــێ گوناهی تێدا هەڵوەرا لەگەڵ دە هەزار بریندار!! ئاســان نەبوو. باراندنی تەمی مردن بەســەر شــارێک کە لەدوای خۆی زیندەوەریشــی بەجێ نەهێشــت. تەنها بەهارێکی ڕەش وەک مێــژوی بەعســیەکان جێما. ئەو کاتە زلهێــزەکان، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، مافــی مــرۆڤ، یوئێن، موســوڵمانانی جیهان، ویژدانی هــەر هەمویان لەخەوێکی قوڵدابــوون و چاویــان نوقانــد و گوێیان کەڕکــرد. بریماکۆف گوتــی: هەڵەبجە

کیمیـا باران نەکـراوە!! (لەوکاتە وەزیـری دەرەوەی ڕوسـیابوو). دوای گرتنی کوێـت لەلایەن سـەدامەوە، خەبەریان بوەوە، دانیان نا کـە هەڵەبجە کیمیاباران کراوە. بەراستی شەرمێکی گەورەیە، بۆ بەرژەوەندی خوازانی جیهان، گەلێک بە بەرچـاوی جیهان قڕ بکرێ و بێدەنگ بن.

## ئەنفال

جێگای باسـە، شـەڕی عێراقـ ئێران وەستێندرا. عێراق دەستی کراوەبوو، هەموو هێزەکانـی لـەدژی پێشـمەرگە بەکاربێنێ، بۆیە پێشـبینی دەکـرا بارەگاکانمان بچێتەوە سـەر سـنورەکان. ئەوەبوو لە ١٢ی ئایاری ١٩٨٨ بەرەی کوردسـتانی لەنێـوان یەکێتی، پارتی، شـیوعی، سۆسیالیسـت، زەحمەتکێشـان، پاسـۆک، دروسـت بـوو. لە زۆر بەرەکانی تر تا ئەندازەیەک باشـتر بـوو، ئێمە مێژویەکی درێژمان هەیە لەو بارەیەوە هەتا شەقی داگیرکەران نەمان کات بەیەک، نابین بە یەک. لە ١٩٨٨/٧/١٩ شـەڕی خواکورک دەستی پێکرد، هێزەکانی پارتی لەوێ بوون، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی حیزبی شیوعی کە لەو شەڕە پێشمەرگەیەکی حیزبی شـیوعی شـەهید بوو، بەناوی مام عەلی. دوای چەند ڕۆژ بەرگری، هێزی دوژمن زۆر نابەرابەربوو، بۆیە پاشەکشـە کرا بـەرەو ئێران. لە خواکورک پارتی بەرگریەکی زۆر باشـی کرد. کاک مەسـعود بارزانی خۆی، بەکردەیی لەوشـەڕە سەرپەرشتی دەکرد.

هاوکات ماوەی حەوت مانگ پرۆسەی بەدناوی ئەنفال بەردەوامبوو، لە ١٩٨٨/٢/٢٣ تاوەکو ١٩٨٨/٩/١. بە هەشـت قۆناغ بەعس دەسـتیکرد بە پاکتاوکردنی گەلی کـورد، تاوانەکانـی بەعس بۆ توانەوەی گەلی کـورد لەبۆتەی عەرەبدا، بەهەموو شـێوازەکانی دڕندەیی ڕویدا، ئەم کۆمەڵکوژی و زیندەبەچاڵکردنەی گەلی کورد لە سەدەی بیست، کەم وێنەبوو. مەحاڵە مرۆڤایەتی دڕندەیی بەمجۆرە بەخۆیەوە ببینێتـەوە. حەوت قۆناغـی ئەنفال زۆرینەی ناوچەکانی ژێر دەسـەڵاتی یەکێتی گرتـەوە، بەتایبەتـی گەرمیـان و ڕۆژهەڵاتی کۆیە. قۆناغـی کۆتایی، ناوچەکانی بادینانـی گرتـەوە کە پارتی تێیدا باڵادەسـت بوو. بـەڵام حیزبەکانی تری وەکو

شـیوعی، سۆسیالیست، پاسۆک، پارتی گەل، زەحمەتكێشان لەهەردوو ناوچەكە هەبوون، بۆیە ئەو هاوڕێیانەی لەبادینان بوون بەرەو توركیا بەڕێكەوتن، بەگەلی باڵنـدەو چەمجو. یەک لەوانە مام خدر ڕووسـی كـە فەرماندە بوو، دكتۆر بژاری برای شـەهید كۆچەر و ئەردەلانی ئامۆزام و بۆتانی لقی خۆشناوەتی،كە خەڵكی مورتكەیـە و چەنـد هاوڕێیەكی تر، وەک خارە خولە و كاروانی حاجی عەبۆو زۆر هاوڕێی تر كە ناویان نازانم.

# گوندی سەران
# ئاوێتە بوونی خەڵك و پێشمەرگە

بارەگامان لە ئەشـكەوتەی دۆڵی بالیسان بوو، بارەگایەكیشمان لە پشتی چیوە، لەسـەر شـاخی هەورێ. هەتا دەهات بارەكە گرژتر دەبوو. ڕژێم هێرش لە دوای هێرشـی دەكردە سەر ناوچەكانی ژێردەستی پێشـمەرگە. سەركردایەتی یەكێتی لەسـەرگەڵوو بەرگەڵـو گیـرا بـوو، لـە قۆڵی لای ئێمـە لە بەنە بـاوی و دۆڵی سـماقوڵی شـەڕ بەردەوام بوو. هاوڕێ شـوان بەكر بانگی كردم، گوتی: هاوڕێ حازم تۆ لەگەڵ هاوڕێ كارۆخ و چواردە پێشمەرگەی تر، (تالب و مستەفاوەستاو زۆزگ و دڵشـاد و سەفین (لە ڕاگەیاندن كاری دەكرد) و عبدالقادری برای هاوڕێ كارۆخ .. لەبەرئـەوەی مـن چەنـد مانگێک دەبوو لەبـەری گارە و ناوچەی كافێ هاتبوومـە دۆڵی بالیسـان و بارەگای ئەشـكەوتەو، كانـی تەلانی چیای هەورێ، هەموو پێشمەرگەكانم نەدەناسی، بەتایبەتی ئەو گەنجانەی لەدوای ساڵی ١٩٨٣ ببوونە پێشـمەرگە. ئەو چواردە پێشمەرگە تێكەڵاو بوون، هەمویان پێشمەرگەی لقـی هەولێر نەبوون، بۆیە پـڕ بەدڵ داوای لێبوردن لەوانە دەكەم كە ناوم لەیاد نەماون.)

دەچـن بـۆ دۆڵـی ئاكۆیـان، ئـەو تایـپ و دەزگای چاپە و چەند شـتێكی تر، دەبـەن بـۆ ئەوێ. دوو خێمە ببـەن، چەندی بۆتان كرا ئازووقـە بكڕن دایبنێن، وەک بارەگایەكی پشـتەوە بۆ كاتی پاشەكشـە. لەناوچەی بالیسـان بەڕێكەوتین بـۆ دۆڵـی ئاكۆیان، لەوێ لەخوار كانی كـەوان بارەگایەكی كاتیمان دانا، دەمان

نــارد لە ڕوانــدز ئازووقەمان دەکڕی. تــا ڕۆژێک خەبەرمان بۆهــات، گوایە ڕژێم هێزو تۆپخانەی هێناوە بۆ لای حافیز و نیازی هێرشی هەیە بۆ هەندرێن و زینی ســەران. دوای نیوەڕۆ بوو، دوو فڕۆکەی جەنگی هاتن، لەپشــت گوندی ســەران لەناو ڕەزان چەند ســاروخێکی کیمیاوی بەردایەوە. هەر زوو زانیمان کیمیاوییە، جوانەگایەکی گەورەی کوشــتبوو، برادەرانی یەکێتی قیناعی کیمیاویان هەبوو لە ئێــران وەریانگرتبوو، بەڵام ئێمە کەســمان قیناعمان پــێ نەبوو، تەنها مام خدر ڕوســی دانەیەکی لابوو، مامۆستا ســەیفەدین ی یەکێتی دابویێ. بە هاوڕێیانمان گــوت: بــا جەمەدانییەکانیان تەڕکەن لە لوتی خۆیان بپێچن، ئەوەی ڕاســتی بێ جێگای ساروخەکان مەودای لەگەڵ ئێمە هەبوو، بایەکی بەهێزیش دەهات، بەڵام ئێمــە نیگــەران بوین نەوەکو فڕۆکەکان دووبارە بگەڕێنــەوە. بەپەلە جێگاکەمان جێهێشت بەرەو بەرزایی. ئێوارە گەڕاینەوە، لەکانی کەوان دانیشتین، هەرچەندە ئەو ناوچە پێشمەرگەی تری تێدابوو، ئێمە تازە چوو بوین بۆ ئەوێ، بەڵام ئەوان لە شەڕێکی دەستەویەخەو خوێناویدا بوون.

لە هەڵەموند و ســەری جوانەگا تەنها بەرگری میللی مابوون، کەســەر بەیەکێتی بــوون. مــن و هــاوڕێ کارۆخ بەرپرســیاریەتیمان هەبوو، بۆیە دەبــوو یەکێکمان بچیــن بــۆ زینی ســەران بــۆ بەرگری. ئــەوی ترمان ئەو شــتانە حەشــار بدەین لەبارەگا دووریان بخەینەوە، بۆیە من بڕیارمدا بچمە زینی ســەران لەگەڵ دوازدە پێشــمەرگەی قارەمــان. ئێمە، هــاوڕێ کارۆخ و برادەرێکی ترمان بەجێهێشــت، بۆ ئەوەی ئەو تایبو شــتانە، لەکونە شــاخەکان حەشــاربدەن. هەرچەندە هاوڕێ کارۆخ گوتــی: مــن دێم بۆ زینی ســەران، بــەڵام ئەوەی بەهــاوڕێ کارۆخ دەکرا بەکــەس نەدەکــرا، چونکە شــاخەوانێکی باش بــوو. ئێمە شــەو بەرێکەوتین بۆ ســەران، چونکــە ئەگەر ڕژێــم بهاتایە تەنها لە زینی ســەران و هەندرێن دەهات، دوایەکــەش هــەروا دەرچوو. کە گەیشــتینە گوندی ســەران چویــن بۆ مزگەوت، چاویــان بــە ئێمە کەوت زۆر پێ خۆشــحاڵ بوون، گوتم: کێ بەرپرســی بەرگری میللیە؟ گوتیان: کاک شــێخ فاروق، ئێســتا دێت بۆ لاتان (شــێخ فاروق، ئێستا دانیشــتوی شــارۆچکەی خەلیفانە)، هــات بۆ لامان. پێم گوت: کاکە شــێخ پێم خۆشــە دانیشین تەگبیرەک بکەین، چونکە ژمارەمان دوازدە پێشمەرگەیە، نازانم ئێــوە چەنــدن، بەڵام تۆ شــارەزاتری لەناوچەکــە چونکە گوندەکــە هی ئێوەیە، ئەگــەر بتوانیــن دەبێ ئەو شــەو جێــگای خۆمان بگرین. شــێخ فــاروق گوتی:

سەرەتا، هەتا هەندرێن نەگرن، نایەن بۆ خوارێ، دووریش نییە لەهەردوو قۆڵەوە بێن، بەتایبەتی مۆرکە سۆران لەبەرنامەی هێزی دوژمن دایە پێش هەر شوێنێکی تر، ( دەکاتە لوتکەی هەندرێن). بۆیە شێخ فاروق لەگەڵ چەند برادەرێکی ئێمە و چەند برادەرێکی بەرگری، بەڵام چ بەرگری، بەراستی پێشمەرگەی زۆر ئازاو شاخەوان، چاو نەترس و خۆبەخش بوون. من و چەند پێشمەرگەیەک و چەند بەرگری گوندی سەران لە زینی سەران ماینەوە، بەیانی نەدابوو تاریک بوو، ئەوشەوە کەس نە نوستبوو، هەر ڕێگامان بریبوو. سەنگەرمان دروستکرد، گوتم: ئێوە دوو، دوو.. بنون، من پاسەوان دەبم. هێشتا تەواو ڕووناک دا نەهاتبوو، گوێم لەدەنگی بەرد دەبوو، لەبەرپێی (قوات خا سە) و جاشەکان بەردەبوەوە. کە ڕووناک داهات لەسەر ئەو ملەی کە پێی دەڵێن: بەستە ڕێواس، بە دووربین دەبینران، وەک مێرووله ملیان نابوو بەتەک گوندی کەڵێتە، بەرەو هەندرێن، بەرەو مۆرکە سۆران، ئەو قۆڵەی شێخ فاروق و برادەرانی لێبوو. برادەرانم ئاگادار کردەوە، نەجوڵێن و ئامادەبن، هەندێکیان بەرەو ئێمە دەهاتن، بەڵام پێش ئەوانەی لای ئێمە بگەن، ئەوانی لای شێخ فاروق و تالب گەیشتن، لە هەڵاتنی جاش و جەیش هەستێکی زۆر خۆشمان بۆ پەیدابوو. ئەوانەی لای شێخ فاروق و تالب و برادەران زوتر گەیشتن، لێیان دان، سەربەرەو ژێر هەڵاتن. برا نەبوە خاوەنی برای، ئامر سریەک لای ئەوان کەوتبوو بە بریندارێ، کاتێک چوونە سەری تەقەی کرد، برادەرێکی بریندار کرد، گولەیەکی لە بناگوێی دابوو. شوکر سەرچیغ بوو، ناوی ڕەحمان سەرانەیی بوو. ئێسکی نەگرتبوو. دوایی ئامر سریەکەیان کوشت و تفەنگەکەیان هێنا. بریندارەکەمان ناردە خوارەوە. ئەو قۆڵەی دەیانویست بۆ لای ئێمە بێن، لەگەڵ شکانی ئەوانی تر، خڕبوونەوە بەرەو گوندی کەڵێتە، ئاراستەکەی خۆیان گۆڕی. بە عەفارۆف هەندێک دوورە تەقەمان لێکردن و هەڵاتن. لەژیانی پێشمەرگایەتی، پێم وانییە هیچ شتێک هێندەی دیمەنی هەڵاتنی دووژمنەکەت لەزەت بەخش بێ و هیچ ئازارێکیش ژانی شکانی پێشمەرگەی نییە.

لەوێش پێشمەرگەی یەکێتی لێیان دان، ئەفسەرێکیان کوشت. هاوەنێکیان گرت. دوایی موحسین گوللەیەکی بەسکی کەوت لەپشتی هاتبوە دەر. هەلیکۆپتەر هات، من بۆ یەکەمجار ئەو جۆرە هەلیکۆپتەرەم بینی، ڕەمی دەکردو دەنگی لەهەموو شتێ ڕەقترو ناخۆشتر بوو، بەڵام جێگامان قایم بوو. جەیش و جاشەکان

دەچــوون بەرەو خانەقــاو وەرتێ و ئەو گوندانە کە هێزی سۆسیالیســتی لێبوو، لەلای ئێمە بێ ئومێدبوون، لەبەر ئەوەی شــوێنێکی زۆر ســەخت و ئاستەم بوو. نەشیان دەزانی ژمارەمان ئاوا کەمە، بەراستی ئەو شوێنە واتە مۆرکە سۆران لە هەندرێن و زینی ســەران بەلانی کەم سەد پێشمەرگەی دەوێت بیپارێزێ.

پێشــمەرگەکانی یەکێتــی لە شــەڕێکی بــێ وێنەدابوون، لە هەڵەموند و ســەری جوانەگاو زۆر شوێنی تر، شاخی کارۆخ تەنها یەک پێشمەرگەشی لێ نەبوو، ڕژێم هــەر ڕۆژەو شــوێنێکی دەگرت، هەر لــە خانەقاو زارگەلی و وەرتێ و شــاخەکانی دەوری وەرتێ. هەر شوێنێکیان دەگرت ئاگرێکی بە دووکەڵی گەورەیان دەکردەوە، ئەوە نیشــانەی نێوان پیادەو هەلیکۆپتەر بوو. بە برادەرانم گوت: هەندێک گوێنی و تەڕاش کۆ بکەینەوە، ئەگەر هێرشیان هێنا دووکەڵێکی گەورە دروست دەکەین، بــۆ ئــەوەی هەلیکۆپتەرەکان فریو بدەین، نەتوانن ئامانجەکانیان بپێکن. ڕۆژانە لە هەڵەمونــد و ســەری جوانەگا، دەتگوت: کارگەی قیری لــێ کار دەکا، دووکەڵ وا دەچوە ئاســمان هەر کەســێک بیبینیایە دەیگوت: کەسی لێ نەماوە. کە هێرشیان دەکــرد پێشــمەرگە لە بن بەردان ئاگر بارانیان دەکــردن ناچار دەگەڕانەوە دواوە، کەلاکیــان لێ بەجێ دەما، ئەوەی زیاتــر وورەی ئێمەی بەرز دەکردەوە ئەو خەڵکە قارەمانەی گوندی سەران بوو کە داوایان دەکرد بچن بۆ یەک کاتژمێر تەماتەکانیان ئــاو بــدەن، زوو دەگەڕانەوە لامان، واتە دەســتێک تفەنگ و ئەوەی تر خاکەناس. ئێوارەیەک مەلا ئەحمەدی وەرتی لەگەڵ ســێ چوار پێشــمەرگە پەیدا بوون، نانی ئێــوارەی لای ئێمــە خــوارد، من یەکــەم جاربوو بــە خزمەتی بگــەم، تەنها ناوم بیستبوو. پرسیاری کردبوو: کێ لێرە بەرپرسە؟ ئاماژەیان بۆ من کردبوو، گوتی: هــاوڕێ حازم هەر کەســێکی وەرتــی و زارگەلی بەلای ئێوەدا هــات چەکی بکەن. گوتم: مامۆستا شەڕ بە قەناعەت دەکرێ نەک بەزۆر، دەمزانی شەڕێکی نابەرابەرە ئەگەر نا خەڵک شەڕ دەکات.

کاک ئەبــو خەلــەف لەگــەرەوان بوو، لــە برادەرانی یەکێتی بوو، ئێســتا ئەندامی مەڵبەنــدی هەشــتی ڕاپەڕینــە، لەســەر فیشــەک و گوللە ئارپێچــی و چەک بوو. نامەیەکم بۆ نارد، وەڵامی دامەوەو باری ئێســترێکی فیشــەک و گوللە ئارپێچی بۆ ناردین، هەتا دەهات گەمارۆ لەناوچەکە تەنگتر دەبوەوە، ئەوەی بارە فیشەکەکەی بــۆ هێنایــن، عومــەری مام شــوان بــوو. دوای نیوەڕۆ بــوو، لە بن چیــای کارۆخ هەندێک جاش دەیانویســت ســەرکەون و نەیان دەوێرا، ئاگریان هەڵکردبوو چایان

دەچـوون بەرەو خانەقـاو وەرتێ و ئەو گوندانە کە هێزی سۆسیالیسـتی لێبوو، لەلای ئێمە بێ ئومێدبوون، لەبەر ئەوەی شـوێنێکی زۆر سـەخت و ئاستەم بوو. نەشیان دەزانی ژمارەمان ئاوا کەمە، بەراستی ئەو شوێنە واتە مۆرکە سۆران لە هەندرێن و زینی سـەران بەلانی کەم سەد پێشمەرگەی دەوێت بیپارێزێ.

پێشـمەرگەکانی یەکێتـی لە شـەڕێکی بـێ وێنەدابوون، لە هەڵەموند و سـەری جوانەگاو زۆر شوێنی تر، شاخی کارۆخ تەنها یەک پێشمەرگەشی لێ نەبوو، ڕژێم هـەر ڕۆژەو شـوێنێکی دەگرت، هەر لـە خانەقاو زارگەلی و وەرتێ و شـاخەکانی دەوری وەرتێ. هەر شوێنێکیان دەگرت ئاگرێکی بە دووکەڵی گەورەیان دەکردەوە، ئەوە نیشـانەی نێوان پیادەو هەلیکۆپتەر بوو. بە برادەرانم گوت: هەندێک گوێنی و تەڕاش کۆ بکەینەوە، ئەگەر هێرشیان هێنا دووکەڵێکی گەورە دروست دەکەین، بـۆ ئـەوەی هەلیکۆپتەرەکان فریو بدەین، نەتوانن ئامانجەکانیان بپێکن. ڕۆژانە لە هەڵەمونـد و سـەری جوانەگا، دەتگوت: کارگەی قیری لـێ کار دەکا، دووکەڵ وا دەچوە ئاسـمان هەر کەسـێک بیبینیایە دەیگوت: کەسی لێ نەماوە. کە هێرشیان دەکـرد پێشـمەرگە لە بن بەردان ئاگر بارانیان دەکـردن ناچار دەگەڕانەوە دواوە، کەلاکیـان لێ بەجێ دەما، ئەوەی زیاتـر وورەی ئێمەی بەرز دەکردەوە ئەو خەڵکە قارەمانەی گوندی سەران بوو کە داوایان دەکرد بچن بۆ یەک کاتژمێر تەماتەکانیان ئـاو بـدەن، زوو دەگەڕانەوە لامان، واتە دەسـتێک تفەنگ و ئەوەی تر خاکەناس.
ئێوارەیەک مەلا ئەحمەدی وەرتی لەگەڵ سـێ چوار پێشـمەرگە پەیدا بوون، نانی ئێـوارەی لای ئێمـە خـوارد، من یەکـەم جاربوو بـە خزمەتی بگـەم، تەنها ناوم بیستبوو. پرسیاری کردبوو: کێ لێرە بەرپرسە؟ ئاماژەیان بۆ من کردبوو، گوتی: هـاوڕێ حازم هەر کەسـێکی وەرتـی و زارگەلی بەلای ئێوەدا هـات چەکی بکەن. گوتم: مامۆستا شەڕ بە قەناعەت دەکرێ نەک بەزۆر، دەمزانی شەڕێکی نابەرابەرە ئەگەر نا خەڵک شەڕ دەکات.

کاک ئەبـو خەلـەف لەگـەرەوان بوو، لـە برادەرانی یەکێتی بوو، ئێسـتا ئەندامی مەڵبەنـدی هەشـتی ڕاپەڕینـە، لەسـەر فیشـەک و گوللە ئارپێچـی و چەک بوو. نامەیەکم بۆ نارد، وەڵامی دامەوەو باری ئێسـترێکی فیشـەک و گوللە ئارپێچی بۆ ناردین، هەتا دەهات گەمارۆ لەناوچەکە تەنگتر دەبوەوە، ئەوەی بارە فیشەکەکەی بـۆ هێنایـن، عومـەری مام شـوان بـوو. دوای نیوەڕۆ بـوو، لە بن چیـای کارۆخ هەندێک جاش دەیانویسـت سـەرکەون و نەیان دەوێرا، ئاگریان هەڵکردبوو چایان

لێ دەنا. بە کاک عەزیز سـەرانەیی و برادەرێکی خۆمان پێم وایە مسـتەفا وەسـتا بـوو، گـوت: برۆن لەسـەر کارۆخ هەندێـک تەقەیان لێ بکەن، بۆ ئـەوەی وابزانن کارۆخ پڕ لە پێشمەرگەیە، زاتی ئەوە نەکەن بەسەرکەون. کاک عەزیز پێڵاوەکانی دڕابـوو، پێڵاوێکمان بە ئامانەت وەرگرت، ئەگـەر گەڕایەوە بیداتەوە خاوەنەکەی. چوون بەسـەرکەوتن، هەندێک دوورە تەقەیان لێکردن. بەدووربین سەیرم کرد ئەو جاشـانە وەک ئێستا نا ئێسـتا لەپشتەوە بیانگرن ڕایان دەکرد بەرەو خوار. دوو برادەرم نارد بۆ دۆڵی بالیسان بارەگای قاتم، بۆ ئەوەی دکتۆرێک بێنن، دکتۆرێک زۆر گرنـگ بوو بۆ ئێمەو خەڵکی سـەران. ڕۆژی دوایی دکتۆر سـیامەندیان هێنا. (بەداخەوە ئەو دکتۆرە پاش چەند ڕۆژێک لەلای بەرەکە چووبوون بۆ لای شەقڵاوە بۆ کەمین، لەسـەر مارێکی کوشـندە دانیشـتبوو، مارەکە پێوەی داو شەهید بوو، دکتۆر سـیامەند بەرەگەز کوردی فەیلی بوو). نازانم دکتۆری تەواو کردبوو یاخود نا، بەڵام کاری ئێمەی ڕاهی دەکرد. دوای پازدە بۆ بیسـت ڕۆژێک، هیلاک ببوین، تیپێکـی یەکێتی هات، ئێمەیان گۆڕی. لەکاتی گۆڕینمان هەر ئێمەی پێشـمەرگە، لەگەڵ چەند کەسـێکی سـەران مابوین، ئەوانی تر هەمویان لەهەوڵی ڕزگارکردنی ماڵ و منداڵیان دابوون، بەرەو دۆڵە ڕەقە لای سوار ئاغا. ڕۆژگارێکی زۆر ناخۆش بـوو. هاتینـە خـوارەوە، بۆ کانی کـەوان. ئەو دۆڵە، هەر ژێـر بەردێک و ماڵێکی بـێ خاوەنـی لـێ بەجێمابوو، مریشـک دوازدە جوجکـەی لەبەر بوو لەو دەشـتە دەخولایەوە، گوێلک، کاوڕ، گیسـک، سـەگ، لانکەی خاڵـی، نوێن...هتد. هەموی تەنیاو بەجێماو. بەراسـتی کارەسـات بوو. ئەو دۆڵە بۆنی خوێنی لێدەهات. بەڵام کە چاوم بەو تیپە کەوت زانیم، لە سەرگەڵوو بەرگەڵووەوە بە شکان لەدوای شکان گەیشـتونەتە زینی سـەران، کەسـیان پێڵاویان لەپێ نەمابوو. لە ڕووخسـاریان دیاربـوو توانـای بەرگریان نەماوە، خەڵکەکە ڕوی لەناوچەی دەسـەڵاتی سـوارا ئاغـا کـرد بۆ خۆ پاراسـتن و دەربازی مـاڵ و منداڵیان. شـەوێ لەگوندی بلێ مایـنـەوە، بەیانـی برادەرانـم بانگکرد، بۆ نیوەڕۆ گەیشـتینەوە بارەگا لە گوندی ئەشکەوتە، من ڕۆیشتم بۆ کانی تەلان. هاوڕێ شوان و ئەبوتالب لەوێ بوون، لە ڕادیـۆی یەکێتـی گوێیان لەدەوری ئەو بەرگریەی زینی سـەران ببوو، کە حیزبی شـیوعی لەگەڵ بەرگری میللی سـەران ئەنجامی داوە، هاوڕێ شوان دەستخۆشی کرد، منیش باسـی شـەڕەکەم بۆ گێڕانەوە. ئەبوتالب هیچ خۆشـحاڵ نەبوو بەو بەرگریە، گوتم: چەکمان دەستکەوت هەبوو، بەڵام دام بە بەرگری میللی گوندی

سەران، بۆ چارەسەری بریندارەکان بیفرۆشن. هەستم دەکرد ئەگەر لەبەر هاوڕێ شوان نەبوایە ئەبوتالب ڕەنگە بەسەرەڕۆ تاوانباری بکردبامایە. هەستم دەکرد بەچاوێکی زۆر دوژمنکارانە سەیرم دەکا، خەندەیەکی دوژمنکارانەی بۆ کردم. ڕۆژی دوایی خۆمان شۆرد و جلمان شۆردو پشوێکمان دا. ملازم شوان گوتی: دەبێ لەگەڵ هاوڕێ پۆلا بچن بۆ بەنی هەریر، لای کەپکی حەمەد ئاغا. (هاوڕێ پۆلا، دوای ماوەیەک نێردرایەوە ناو شاری سلێمانی بۆ کاری ڕێکخستن، بەداخەوە لەگەڕەکی (ڕیعایە) خۆفرۆشێک هەواڵی لێدەدات و لەئەنجامی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هێزەکانی ڕژێم، بەبریندار لەلای ڕژێم دەستگیرکرا، کەس تەمای نەبوو بەزیندویی بمێنێتەوە، بەڵام بەرێکەوت بەر لێبوردنێک کەوت، ئێستا ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی (چاک)ە لە ئەوروپا، بە پۆڵای زیندان دەناسرێ. برای شەهید ملازم بڕوایە، هەمیشە لەسەنگەری گەلە). لەگەڵ هاوڕێ پۆلاو سێزدە پێشمەرگەدا چوین بۆ بەنی هەریر.

ئەو بەرپرسی یەکەم و من جێگری. هەر ڕۆژەی یەک پێشمەرگە بە ئێستر دەچوە خوارێ، دوو بەرمیل ئاوی گەرمی دێنا بۆ خواردنەوەو چا لێنان، پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو بەناوی زۆزک، حەفارۆفێکمان پێدابوو، دەیگوت: ئامۆزایەکم لەگەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی بوو شەهید بوە. ئەو ڕۆژانە هەتا دە جاشان لێرە شەهید نەکەم نارۆم. ئەو واتێگەیشتبوو، ئەوەی بە گوللەی بکوژرێ پێی دەگوترێت شەهید!! وەک بزانێ لەدوای سی و دووساڵ حکومەتی هەرێم و حیزبەکان جاشیش بەشەهید ناو دەبەن!! لەدوای کیمیابارانی هەڵەبجە ڕژێمی بەعس لەبەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی هەندێک تەقیەی دەکرد، بەچڕی کیمیابارانی کوردستانی نەدەکرد، بەشێوەیەکی پچڕ، پچڕ گوندەکانی کیمیاباران دەکرد. لە بادینان کیمیای لە بارەگای کەرتی بادینانی حیزبی شیوعی دابوو، هاوڕێ موحسین یاسین هاواری کردبوو: کیمیاییە. چەند هاوڕێیەک پێیان گوتبوو: بۆ هاوڕێیان دەترسێنی؟ هاوڕێ موحسین تورە ببوو، گوتبوی: کەوابێ دیارە من دەترسم؟!! چوو بوە شوێنی موشەکەکە، ئەو هەموو خۆڵەمێشەی کیمیای بەسەری خۆیدا کردبوو، بۆ ئەوەی نیشان بدا کە لە مردن ناترسێ. بە کردەوەش هەر وابوو. هەر لەو ماوەیە لە بێرۆ و توتمێ و خەتێی دۆڵی بالیسان بە کیمیا لێیدا، پێشمەرگەیەکی یەکێتی (خۆشناو بوو) بەسواری هێستر دەگەڕایەوە گوندی خەتێ، بە بەرکەوت، هێسترەکە

مرد، بەڵام پێشـمەرگەکە سـەلامەت بوو. هەردی و هاوڕێیان بە پێشـمەرگەکەیان دەگـوت: ئەوە چ کیمیایەکە هێسـتری بکوژێ خۆشـناوێکی پێ نەکوژرێ؟!! بێ تەلمان دەکردەوە، کاک کۆسرەت قسەی لەگەڵ سەفین مەلا قەرە دەکرد، سەفین لەسـەری جوانـەگای بوو. ئەو ورەو گیانبازیەی هەڵوێسـتی سـەفین مەلا قەرەم قەت لە یاد ناچێت، دەیگوت: کاک کۆسرەت، ئێمە بەزیندویی لەسەری جوانەگای ناڕۆین، ئەگەر جوانەگا لەژێرمان هەڵێت. ئەوەی ڕاستی بێ کاک سەفین لەشەڕی ناوخۆشـدا زۆری خۆ لەشـەڕی حیزبی شیوعی دەپاراست. هاوڕێ ئەبو ئەحلام لە قەراج و کەندێناوەو قەرەچوغ فەرماندەی هێزی لقی قەرەچوغ بوو، کاک سـەفین یش لەهەمان ناوچە سەرتیپ بوو لە یەکێتی. پەیوەندی لەگەڵ ئەبو ئەحلام باش بوو، لەشەڕی یەکتر خۆیان دەپاراست.



ئەو نامە بەدەسـتچنراوەی پۆڵای زیندان کە بۆ دایک و باوکی نووسـیبووی

# ترس و ئاگرو برسێتی

ئەگەر تۆزێک بگەڕێمەوە دواوە، کە شەڕی قڕناقە و پشت ئاشانی دوەم دەستی پێکـرد، رادیـۆی یەکێتـی یەک بەخـۆی هاواری دەکـرد و بە ئێمـەی دەگوت: (ڕەزمەندەگانی موسڵمانی ئێرانی) لەکاتێکدا لە سێلوێ و هەمزاوە بۆ کۆنەلاجان و بەردەپان ئامادە نەبوین سواری ماشێنی سوپای پاسداران ببین، لە بەردەپان ئامـادە نەبویـن ئـەو ڕێگایە بگریـن کە پاسـدارانی ئێران و هەندێـک لە پارتی پێیـدا دەچـوون بۆ حاجی ئۆمەران، پارتیەکان چاوسـاغی سـوپای پاسـداران بـوون، ئێمـە رازی نەبویـن کە مەلا مەحەمـەد چەند پاسـدارێکی لەگەڵ بوو تا ڕەوانیـان نەکاتـەوە لەگەڵ ئێمـە نەیەتە خوار، بەو حاڵـەش یەکێتی بە ئێمەی دەگوت: (رەزمەندە). هاوینی ١٩٨٧ لەگەڵ چەند پێشـمەرگەیەک، لەدەرەشـیر بەسـەردەکەوتم، چەند پێشـمەرگەیەکی یەکێتی لەپێشـەوەو کۆمەڵە پاسدارێک پەدوایانـدا دەهاتنەخـوارەوە، منیـش هەر لە ڕادیۆ گوێم لەو وشـەیە ببوو بۆیە گوتـم: ( شـنە وەندگانـی عەزین)واتـە: (گوێگرانـی ئەزیـز) یاخـوا بەخێربێن سـەرچاوی فەرهاد سـەنگاوی و دەمامی خۆتان. بۆیە کردیان بە پێکەنین. یەک لە پێشـمەرگەکانی یەکێتیم دەناسـی خەڵکی دیبەگەبوو، ناوەکەم لەیاد نەماوە، گوتـم: خـۆ ئێمە یەک پاسـدارمان لەگەڵ نەبوو بە ئێمەتـان دەگوت: ڕەزمەند. ئێستا ئێوە شایانی چین ئەو چەواشە و دیماگۆگیەتە هەتا کەی بڕەکا؟ گوتی: بەخـوای مـن فەرمانم پێکراوە بیان بەم بۆگوندی خەتێ ( مەڵبەندی سـێی لێ بوو)، دوای ماوەیەک لەگەڵ پاسـداران لەنەوتی کەرکوکیاندا.

هەتـا دەهات شـوێنە ئازادکراوەکانمان لەدەسـت دەدا، ڕۆژێـک نامەیەک هات، بەپەلە بگەمەوە بارەگای ئەشـکەوتە. دابەزیم گەیشـتمە ئەشکەوتە. ئەبوتاڵب، بەرپرسـی هەمـوو هێزەکانـی هەولێربوو، داوای لە تاڵـب دەرگەڵەیی دەکرد کە ژمارەیـەک هاوڕێی بەسـاڵاچوی نەخۆش بگەیەنێتە قەندیـل و دەربازیان بکات،

ئەویش لە هەندرێن و زینی سەران و هەموو ئەرکەکان لەگەڵ ئێمەبوو، بەراستی ماندوو بوو، دەیگوت: من ناتوانم ماندووم شارەزای ئەو ڕێگایەش نیم. ئەبوتاڵب دەیگـوت: ئەگەر نەچی (ئەجەردەک من الســلاح) واتە: چەکت دەکەم!! ئەگەر دیسـپلینی حیزبــی نەبوایە، ئەبوتاڵب ئەو پیــاوە نەبوو تاڵبی پێ چەک بکرێت. ئەبووتاڵبی دەکرد بە پۆری خوراو. برادەران، ملازم شوان و ئەبوو تالب، پێیان گوتم: ئەوانەی خێزاندارن دەتوانن بەدوای ماڵ و منداڵیان بنێرن، دوور نییە ئێمە بچینە دۆڵە کۆگەو گوێزێی سەر سنور، ناوزەنگ و نۆکان، لەوانەیە دابڕانێکی درێژ ڕووبدا. منیش گوتم: ئەوا چەند ڕۆژە خەڵک دەڕوا، نە ئێستریک، نە گوێدرێژێک لەو دۆڵە نەماوە منداڵی پێ بگوازمەوە ســەر ســنوری ئێران، باشتر وایە بەخۆم چیم بەســەر بێ، با منداڵەکانم جێلەق نەکەم، سوپاسـیانکردم، گوتیان: کەواتە ئیشــمان پێتە. گوتم: فەرمون. گوتیان: هەندێک خەڵکی بەســاڵاچوو نەخۆش و پەکەوتەمان هەیە، تۆ شــارەزای دەبێ بیانبەی بۆ لای پشــت ئاشــان و قەندیل دەربازیان بکەی. گوتم: بەمەرجێک دەچم، تاڵب سزا نەدرێ. پارەی حەیوانێکیان دامێ تا لەرێگا بۆیان ســەرببرم و گۆشــتێک بخۆین بۆ ئەوەی بتوانن ڕێبکەن، بە دوو ڕۆژ هەموویانم گەیاندە قەندیل. ئێمە (وەک ماڵی عەلی کوتک) بە باوکمەوە دوازدە بــراو ئامۆزا بوین، کەس هەواڵی ئەوی تری نەدەزانی.

بە مامۆســتا لەشـکر بابەم گوت: بە باوکم بڵێ: حازم ســەلامەتە خەمی منیان نەبــێ. چونکــە باوکم و هاواری برام و حاجــی و جەنگی و بۆتانی ئامۆزام لەلای دۆڵەکۆگــە بوون، من و هەردی و ئاســۆی برام لەخــوارەوە بوین، بەڵام هەریەک لەشوێنێک.

لەودیوی کونەکۆتر بە کۆپتەرە شـکاوەکە ناســرابوو، لای گۆمی کرمە ســوران، دوو ڕەشــماڵی مــەڕداری لێبوو، مەڕێکی قەڵەوم کڕی ســەرمانبڕی بەبێ ئێوەی خوێنــەر ناخۆش گۆشــتێکی چاکمان خوارد. لەوێ بەرێکەوتین بۆ گۆڕ تســوێ، بارەگایەک لەوێ بوو بۆ نوێژی شــێوان گەیشتین، بەیانی گوتم: من دەگەڕێمەوە لای پشــت ئاشان، تاکوو چارەی منداڵەکانم بکەم. بەتەنها چوومە پشت ئاشان. لە ماڵی حاجی مینە لامدا، برسیم بوو نانیان بۆ هێنام. ئەو ڕۆژانە کەس بەرەو خوار نەدەرۆیشــت، هەرچی هەبوو بەرەو سنوری ئێران خۆی هەڵدەکوتا، مەگەر یەکێک بیویستبایە تەسلیم بەرژێم ببێتەوە. بۆیە حاجی مینە گوتی: تێرنان بخۆ

دوایــی ســبەی خەبەرمــان لێ بدە بە گرتنمان بدە!! پێم ســەیر بوو، گوتم: مام حاجــی تــۆ چۆن لە من حاڵی؟ گوتی: ئەوە نییە بــەو تفەنگە جوانەوە دەتەوێ بچیەوە ناو ڕژێم؟!! پێم گوت: ئەگەر هێندە کوردێکی دڵسۆزیت بچۆ منداڵەکانم لە چوارقوڕنە بۆ بێنە، دوو ســەد دیناریشــت دەدەمێ، هەتا نەچمەوە ناو ڕژێم. گوتــی: زۆر باشــە. پێکهاتین لەگەڵ حاجی مینە، بەدوو ســەد دینارو تەســلیم نەبوونەوە. نامەیەکم بۆ نوســی و وێنەیەکی خۆم لەناو نامەکە هاوێشــت و دەقو نوشتم کرد، وەک دوعای مەلا عەلی کەڵەکێ. گوتی: لەماڵی ئێمە چاوەڕوان بە، ســبەی بە منداڵەکانتەوە لێرەم. منیش بەڵێنمدا تەسلیم نەبمەوە.

بــۆ ئێــوارە، ئەو ماڵەی ســەروی ماڵی حاجی مینە، پیرەژنێک دووپشــک بەپای وەدا بــوو، هاواری دەکرد، لەســەربان پیاســەی دەکرد، ناوە ناوە دادەنیشــت، پێــی خــۆی ڕادەژاند و ســەردولکەی دەگوت، من ماوەی نیــو کاتژمێر زیاتر بوو بــەو پیرەژنە پێدەکەنیم. لەپڕ غەڵبەغەڵب پەیدابوو، خێزانێکی پێشــمەرگەبوون دەرۆیشــتن بۆ ئێران، پێش ئەوەی بزانم چین و کێن، دەســتم بۆ تفەنگەکەم برد کە لەپێش دەمی خۆم دانابوو.

دووپشکەک بەپەنچەی وەدام، ئاگری لەچاوم هەڵستاند، گوتم: پورێ دووپشک بەمنیشــی وەدا. لەلایــەک زۆر ئــازاری هەبوو، لەلایەک دکتــۆر و دەرزی نەبوو، حاجــی ژن پەڕۆکێکــی بەنەوتــی لێ پێچاو ئایەت لکورســی لــێ خوێند. گوتی: کــوڕم خەمت نەبــێ عەزیاش پێوەت بدا ئەو ئایەتە لکورســیە تــا بەیانی کاری خۆی دەکا. بەڵام پێم ناخۆش نەبوو، چونکە ئازارەکەی نەیدەهێشــت خەوم لێ بکەوێ، لەبەرئەوەی بەتەنیا بووم نەمدەویســت بنووم، حەزم دەکرد وشــیاربم. هەتــا لای بەیانــی لەگــەڵ پیرەژن پیاســەمان کرد. بەیانــی بەحاجی ژنم گوت: تۆزێک دەنووم، وریا بە ئەگەر شــتێک بوو، خەبەرم بکەوە. گوتی: باشــە ڕۆڵە بنــوو خەمت نەبێ من حەرەس دەبم.

کاتژمێــر یازدەی پێــش نیوەڕۆ ، لەدەنگی گریانی منداڵێک بە ئاگا هاتم، منداڵە پێشــمەرگە بوو لەسواری وڵاغ کەوتبوە خوارێ، وابزانم دەستی شکابوو، بەخۆی و دایکــی دەگریــان، داوای نانیــان لــە ماڵەکە کرد، نانیان پێدان و ڕۆیشــتن بۆ ئێــران. جــا وەرە لەفکری ئەوەدا بووم خێزانی من (ژنێک و چوار منداڵ)، دەبێ من چەند بریندارم هەبێ هەتا دەگەنە دەستم!! دوای نیوەڕۆ دەوروبەری عەسر،

حاجـی مینە پەیدابوو، بەگورجی دەڕۆیی و ئاوڕی لەدوای خۆی دەدایەوە، وەک یەکێـک لەپشــتەوە بیەوێ بیگرێ!! کەســی لەگەڵ نەبوو. ســڵاوی کرد، گوتم: ئــەوە چیــت لە دوە، بۆ وا پەشــۆکاوی؟ گوتی: هیچم لــەدوا نییە، بەڵام بەیانی دەگەنە ئێرە. منیش وامزانی ژن ومنداڵی من دەڵێ، گوتم: ئەی بۆ لەگەڵ خۆت نەهێنان!! گوتی: کورە خۆ منداڵی تۆ ناڵێم، جەیشی ڕژێم دەڵێم. گوتی: لەگەڵ شـێخەی پوررزات هەتا کورتەکمان هێنان، بەســەرکەوتین بازگەی سەربازی تازە داندرا بوو، حکومەت هاتە کورتەک.

بــەزۆری پــارەی ئۆتۆمبێلــم داوە مام حاجی و بەرەو گۆڕتســوێ هەڵکشــام بە ڕەبەنی. ڕۆژی دواتر هاتمە سورەدێ، لای بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران. زندانێکیان لەوێ بوو، بەرپرســی زیندان کاک برایم لاجانی بوو، (ئێســتا لــە نەرویجــە). چوومــە لای، زۆر ڕێــزی لێگرتــم. گوتم: دەمــەوێ ژن و منداڵم لەچوارقوڕنــە بــۆ نەجات بــدەن. گوتی: ئەوەی بە ئێمە بکــرێ بەچاوان. بانگی پێشــمەرگەیەکی کرد بەناوی مەحەمەدی حاجی قادر خەڵکی خانێ بوو، دیاربوو کاک مەحەمــەد بــۆ کڕینی کەلوپــەل و خواردنی زیندانەکە، ئــەو ڕۆژانە دەچوە ڕانییە.

نامەیەکــم دایــە، چاوەڕوانی کاک مەحەمەدمان کــرد، ڕۆژی دوایی ڕژێم هێرش و تۆپبارانــی دەســتپێکرد لەرێــگای خیزی و گۆڕتســوی. پێشــمەرگەیەکی لای سلێمانیم لەگەڵ هات، (هاوڕێی شیوعی بوو، بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە)، کرێــکار گوتــی: با لەگەڵ تۆ بی. بەکاک برایمم گوت: ئەگەر عەســکەر هاتن دوو شــەڕواڵی وەک زیندانییەکانمــان بدەنێ، تفەنگەکانمــان با لای ئێوە بێ دەچینە نــاو زیندانییــەکان، وا دەزانــن گیــراوی ئێوەین. گوتــی: بەخوا دڵــم نایە لەناو زیندانتــان بکــەم لەگەڵ ئەو پاســدارو جاسوســانە. گوتم: کەواتــە نەوەکو لەو جاشانەی لەگەڵ ڕژێمن بمان ناسن، ئێمە دەڕۆین لە گۆڕتسوێ بارەگامان هەیە، ئەگەر کاک مەحەمەد هاتەوە خەبەرێکمان بدەنێ. گەڕاینەوە بەرەو گۆڕتســوێ، بەیانی بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆز بوو، سەربازانی ڕژێم ئەو ناوەیان هەموو سوتاند، نازانــم لەبەر چ هۆیەک بوو کاک مەحەمەد منداڵەکانی منی بۆ دەرنەچوو، لەبەر جاشــان. هۆکاری هەرە ســەرەکی جاشــایەتی بەو ڕێژە زۆرە شەڕی ناوخۆ و بێ ئومێدکردنــی گــەل بــوو، لەلایەن ســەرکردەکانمان کە بۆ لــە ئەرزدانی یەکتری

سڵیان لەهیچ ناپاکیەک نەدەکردەوە.
ناچار بە نائومێدی ڕۆیشتم بۆ کانی ساوێن، لەوێ بەرەو دۆڵەکۆگە، شەوێ لە ڕەزگەو مارە دوو مامەوە. ڕۆژی دوایی چوومە دۆڵەکۆگە. ئەوکات دەیانگوت: ژمارەی چەکداری کورد لەناو ڕژێم (باشترە بڵێم: جاش) سێ سەد هەزار کەسە. ژمارەی پێشمەرگەش خۆی لە (٩٠٠٠) نۆ هەزار کەس دەدا، ئەوە بەرای زۆر کەس مەزەندە کرابوو، لەسای سێبەری ئەو حکومەتە کوردیە ویژدان کرە هەموومان پێکەوە خانەنشینین!! من کە موچە وەردەگرم دەڵێم: زەمانی مەحەمەدی مەهدیە!! گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە.
ئەو ناپاکیە شۆر ببوەوە خوارەوە بۆ ناو پێشمەرگەش، پێش ئەوەی بڕۆم بۆ ڕەزگە و مارەدوو، دۆڵە کۆگە. لە بەستەمەلە بارەگایەکی پشدەر لەوێ بوو بۆ ئەوەی چاوەڕوانی کاک مەحەمەدی حاجی قادری دیموکرات زیاتر بکەم، تا منداڵەکانم بێنێ، چووم بۆ ئەو بارەگایە. ئەوەی لەبیرم بێ هاوڕێ حەسەن خدر و حەمەشەرەف و حەمەدەمین و چەند هاوڕێیەکی تر بوون، دیاربوو هێزەکانی ڕژێم لەقوڵی لای کانی ساوێن دەیانویست هێرش بکەن، لە کوزینە و ئەو بنارە هەمووی بە هێزی دوژمن مۆڵ درابوو.
هاوڕێیان لەگەڵ تیپێکی یەکێتی لەهەماهەنگی دابوون، هێزێک بنێرن بۆ کانی ساوێن لەوێ لە ئەرک دا بن. بارەگای بەستەمەلە لەو دۆڵە تەنگەبەرە لەبەرهاشەی ئاو ئاگات لەهیچ نەدەبوو، منیش گوتم: دەچم لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە بۆ کانی ساوێن. گوتیان: تۆ میوانی لێرە پشوو بدە. بەڵام هەرچووم لەگەڵیان، لەوێ کەس لەکەس ئەمین نەبوو، ئەو بابەتە تەنها لەبەرئەو چەند دێرەی دوایی دەنوسم. دوو هێزی جیاواز شیوعی و یەکێتی یەکترمان چاک نەدەناسی لەوان ڕۆژگارە ڕەشەکانی کە ئەوەندە لەدوژمن نەدەترساین ئەوەندەی لەهاوسەنگەرەکەی خۆمان دەترساین، لەخەوێ بمانکوژی بۆ ڕەشکردنەوەی ڕوی خۆی لەلایەن ڕژێم، بەناچاری ئێمە ئەرکی پاسەوانیمان لەگەڵ ئەو برادەرانەی یەکێتی بەهاوبەشی دەگرت! لەناو پاسەوانی ئێمە لەبەینی خۆمان پاسەوانێکی ترمان بەنهێنی دانابوو، ئەو چەند ڕۆژە بارتەقای هەموو ساڵانی پێشمەرگایەتی بوو، لە سێبەری خۆمان دەرەوینەوە. پاسەوانی لەناو پاسەوانی.

# دەتانەوێ بەرەڵامان بکەن؟!

پێشمەرگە و خەڵک بەرەڵاکردنەکەی ئەبو فاروق . کەسێک نەتوانێت کراسەکەی خۆی خاوێن ڕاگرێت، کوا شایانی ئەوەیە سەرکێشی و فەرماندەیی ئەو هەموو کەڵە پیاوەی قاڵبوی نێو کوورەی خەباتی پێشمەرگایەتی بکات؟!! سەیری هەر یەکێکیانم دەکرد کۆڵێک خۆراگری بەکۆڵەوەبوو.

ڕۆیشتم بەرەو گوێزێ، برادەران هەموو لەوێ بوون، کاک مەحمودی حاجی نادر یادی بەخێر لەوێ بوو. دوای نیوەڕۆیەک، لەسەر مێرگێ دانیشتین، کۆبوینەو. هاوڕێ ئەبو فاروق ئەندامی مەکتەبی سیاسی قسەی بۆ کردین، لەجیاتی ورەو تین وەبەر برادەرانی پێشمەرگەوە بنێ، دیاربوو نیازیان وا بوو خەڵک کەمبێتەوە، هەندێک برۆنەوە لەماڵی خۆیان دابنشین، ئەوانەی زۆر ترسی ڕژێمیان لەسەر نییە تەسلیم ببنەوە. پێشمەرگەیەک بەناوی حاجی دهام (کە زۆر دڵسۆزو پیاوێکی زۆر سادەو عاتیفی بوو)، هەڵسایە سەرپێ هەر ئەوەندەی گوت: دەتانەوێ بەرەڵامان بکەن؟!! ئەمن...............بم، ئیتر دەستی کرد بە گریان، هیچی تری نەگوت. کاک مەحمودی حاجی نادر، لە وتەکانی ئەبو فاروق نارەزایی خۆی دەربڕی. بڕیارمدا من نەچمەوە ناو ڕژێم، لەبەر تەشک و دامەنی حیزب نییە کە ناچمەوە، بەڵکو لەبەر کەسایەتی خۆمە. لەبەر ئەوەم نییە خەڵک بڵێن پێشمەرگەیەکی حیزبی شیوعی تەسلیم بەرژێم بۆتەوە، لەبەرئەوەمە زۆرم نانی خەڵک خواردوەو زۆر خزمەکانم هیلاک کردوە بە منداڵەکانمەوە. لەو چرکەساتە هەموو شەهیدان عەباس، داود، بڕیار، کەریم، فرسەت، سالار، ئیسماعیل، گەیلان، بەکر تەلانی، عەلی حاجی، کۆچەرو دەیانی تر هاواریان کرد ئەی ئێمە ؟!! هێندەم قسەی گەورە لە ماڵان کردوە، لەباسی کوردایەتی و شۆڕشگێری هیچم تێدا نەهێشتۆتەوە، من چی بەوانە بڵێم؟ هەر هەمویان هاواریان کرد تەسلیم مەبە.

ڕۆژی دوایی ژمارەیەکی کەم لە پێشمەرگە تفەنگ و ڕەختەکانیان بەجێهێشت، بەنابەدڵی بەرەو خوار بوونەوە.

ڕۆژێکیان لەسەر بارەگاکانی ئێمە لای (چەکوچ وسادر)، بوو بە تەقەی بیکەیسی،

بەسەرکەوتین، هاوڕێ سەلیمەسور بەرپرسی ئەو ناوە بوو، گوتی: ئەوە دووباڵی ناو حیزبی دیموکراتی ئێرانن، کەوتونەتە گیانی یەکتر. بابچین بەهەر نرخێک بێ، بکەوینە نێوانیان. هاوڕێ سەلیم زۆری جنێو پێدان، پێمان گوتن: ئێوە قەت وانەتان لە ئێمە وەرنەگرت؟!! ئەو وتەی مام هەژارم هاتەوە یاد، کەلەپێشەکی چوارینەکانی خەیامی نەیشاپووری، دەڵی: حەفتاو دوو تیرە لە ئیسلام هەبوە، هەرهەمویان یەکتریان بە کافر زانیوە.

# ناپاکی سەلاح شینە

سەلاح شینە کوڕی شینەی گوندی دۆڵەبەکرەی دراوسێی گوندەکەی ئێمەبوو، نێوان گەرەشێخان و دۆڵەبەکرە بیست و پێنج خولەکە، بۆ ئاشی ئاردی دەچوینە ئەو گوندە، باوکی مەڕداربوو، سەلاح پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، پلە یەک لەدوای یەکەکانی پێشمەرگایەتی بڕی، تا گەیشتە جێگری سەرتیپی دەشتی هەولێر. هەرچەندە سەلاح شینە کێشەی هەبوو لەگەڵ چەند بەرپرسێکی یەکێتی، بەڵام لەدەستپێکی ئەنفال، گرتنی سەرگەڵوو بەرگەڵوو ورەی ڕوخابوو، بۆیە پەنای بردە بەر پەیوەندی ناپاکی لەگەڵ ڕژێم. دائیرەی ئەمن پێیان گوتبوو: ئەگەر هەندێ پێشمەرگە بکوژی یان بەزیندویی ڕادەستیان بکەیت، لە ڕابردووت خۆش دەبین. سەلاح شینە بەو مەرجانەی دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم ڕازی بوو، بەڵێنی دابوو چەند فەرماندەیەکی پێشمەرگە بەزیندویی تەسلیم بکات یان بیانکوژێ. شەوی ٩- ١٠/٦/ ١٩٨٨ لەگوندی پڵینگەی سەر بە قوشتەپە، دەگاتە چوار پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بێ ئەوەی بزانن کە نیازی خراپە، ئاخر کێ پێشبینی ئەوە دەکات جێگری تیپ خیانەت بکات؟!! ئەو پێشمەرگانە بریتی بوون لە: دکتۆر عادل، کەمال، ڕزگار گردعازەبانی دەسترێژی گوللەیان لێ دەکا و شەهیدیان دەکات، سەعدی دارەخورمایی ناسراو بە هاوڕێ هەندرێن بریندار دەبی. ئێمە بێ ئاگا لەو درندانە کە گورگن لەپێستی مەڕدان، بۆ خۆم لەناو ئەو ڕووداوانە ژیانم دەکرد، وە زۆر لە شەهیدەکان برادەری گیانی بەگیانی من بوون لە پێشمەرگایەتی، بەڵام بۆ مێژوی شەهیدبوونەکانیان،

زانیاریـــم لەکتێبەکـــەی برای بەڕێزم دەرسـیم دیبگەیی وەرگرت، کە دانەیەکی بۆ ناردبووم، بەناوی (ئینســکلۆپیدیای تاوانبارانی ئەنفال و کوردۆسایدکردنی گەلی باشـوری کوردســتان) بڕوانە لاپەرە ٣٠٢، ٣٠٣، ٣٠٤، ٣٠٥، ناوی هەموو شەهید و بریندارەکانی دەســتی ســەلاح شـینە و تاقمەکەی تێدایە، کە من زۆری برادەر و هاوڕێــی منداڵی و قوتابخانە و پێشــمەرگایەتیمی تێدایــە، وەک دکتۆر عادل، کانەبی گچکە، بلە، مەلا ئاشتی، حاجی، ئازاد مەلا ئۆمەر و زۆرانی تر کە داوای لێبــوردن دەکــەم ئەگەر نا ئەوانەی یەکێتیش هەمان ئازارو ژانیان هەیە بۆ من.

جێگای باســە ســەلاح شـینە تەنها نەبوو، بەلکوو ئەوکەســانەی لەگەڵ بوون: نوری قادر دەرویش ناســراو بە نورەی قالــە باریکە، خەڵکی گوندی دۆڵەبەکرە، ( ئێستا پلەی عەمیدە لەهێزەکانی پاسەوانی هەولێر سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردســتان)، ســمکۆ بلّباس (ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی یەکێتیە)، مەحەمەد حوســێن (دوایی کوژرا). لەنزیک گوندی گەڕەبەشــەی ســەر بەقوشتەپە دەگاتە هاوڕێ و برای دڵســۆزم هاوڕێ کانەبی حەمەڕەشید کە خەڵکی گوندی ئێمەبوو، هاوڕێی منداڵیم ناسراو بە کانەبی گچکە، لەگەڵ مەلا ئاشتی دەبن. سەلاح شینە و تاقمەکــەی بەفێل قۆڵبەســتیان دەکەن و بەدیــاری دەیاندەنە دائیرەی ئەمنی هەولێر، لەوێ شــەهید دەکرێن. لەهەمانکاتدا خزمێکی ڕائید جەلال پێشــمەرگەی قارەمانی یەکێتی ناسراو بە حاجی دووشیوانی (دیبەگە) شەهید دەکەن، سەلاح شــینە و تاقمەکــەی بەشــەهید حاجــی دەڵێــن: یــان دەبێ لەگەڵ ئێمــە بی بۆ پێشــمەرگە کوشــتن یان دەتکوژین. شــەهید حاجــی مــردن هەڵدەبژێرێ، بۆیە دەیکوژن.

ڕۆژی دواتر ســەلاح شینە و تاقمەکەی لەگۆڕستانی قولتەپە دەستڕێژی گوللە لە سێ پێشمەرگەی قارەمانی حیزبی شیوعی دەکەن بەناوەکانی، کرمانج، (خەڵکی دووگرتکانی قوشتەپە بوو) موخلس عەولاّ ناسراو بە سالار، هێرش . کە کرمانج و ســالار توانیان بە برینداری خۆیان دەرباز بکەن، بەلام بەداخەوە ڕۆژی دواتر هــاوڕێ کرمانج لەبەر ســەختی برینەکەی شــەهید بوو. بــەلام هاوڕێ هێرش بێ زیان دەرچوو. سەلاح شینە و تاقمەکەی شەو و ڕۆژیان نابوە سەریەک بۆ ڕاوی پێشمەرگە .

دواتر لە گوندی ئۆمەرەسور دەستگیرکردنی ئەسعەدە کەڕە و شەهیدکردنی چەند پێشمەرگەیەکی تر لەشوێنی جیاجیا، وەک ئازاد مەلا ئۆمەر برای شەهیدی قارەمان شەهید ڕەفیقی هاوڕێم ناسراو بە وەیسی، مەحەمەد مام قادر ڕەسوڵ بسکۆر بەبرینداری دەرباز بوو، کەچی بەداخەوە دواتر لە ئەشکەوتێک شەهید بوو، شەهیدکردنی مەحەمەد مام قادر مەنتک ناسراو بە وەستا مەحەمەد.

دواتر سەلاح شینەو تاقمە خوێنڕێژەکەی مەفرەزەی خاسەیان درایە، بەشەو ڕۆژ کەمینیان لەبەستی شەرغە دادەنا، یان دەوری ماڵی ئەو پێشمەرگانەی کە گومان دەکرا بچنەوە ماڵەوە، یان بەگرتن دانی براو کەسوکاری پێشمەرگە، لەهیچ ناپاکیەک سڵیان نەدەکردەوە. پاشان زانیمان سەلاح شینە گوتویەتی:

ئەوەی جارێک لە پێشمەرگایەتی جەمەدانی بۆ شوشتبم، بە گرتنی دەدەم.

ئەوانەی کە دەناسران لەناو تاقمەکەی سەلاح شینە دۆڵە بەکرەیی، وەک ئەسکەندەر عەبدولا، وەلی عومەر ڕەسوڵ، سەباح، سمکۆ قادر بلباس، نوری قادر باریکە و چەندان جاشی تری هەمان مەفرەزە، شەوی ١٨- ١٩/ ٧/ ١٩٨٨ لەبەستی شەرغە گوندی میرکە بارەگای حیزبی شوعیان داگیرکرد، شەش پێشمەرگەی یەکێتیان لەهەمان شەو دەستگیرکرد، ڕادەستی ئەمنی هەولێریان کردن، گوایە لەشەڕ گیراون، ناوەکانیان: ئەحمەد حەمید، دڵشاد حەمید عمر، حەمەدەمین ئەحمەد حەمەدەمین، مەحەمەد حەمە ساڵح قادر، مەحەمەد مەولود عومەر، یونس عەبدولا ئۆمەر..کە هەمویان خەڵکی سێگرتکان بوون، ئەو شەش پێشمەرگە قارەمانە بەیەک ڕۆژ لە سێدارەدران.

سەلاح شینەو جاشەکانی ١٩٨٨/٧/٢٤ لەنزیک گوندی کانی بزرە، چوار پێشمەرگەی تری یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە خەڵکی کەرکوک بوون، ڕادەستی بەعس دەکەن.

(بەگوێرەی بەڵگەنامەکان ئەو چوار پێشمەرگەی یەکێتی و نۆ کەسی خەڵکی ڕەواندز بەیەکەوە هەر سێزدەیان لەسێدارەدراون ناوی هەمویان نوسراوە لە کتێبەکەی برای بەڕێزم دەرسیم دیبەگەیی بەناوی: ئینسکلۆپیدیای تاوانبارانی ئەنفال و کوردۆسایدکردنی گەلی باشوری کوردستان).

سەلاح شینەو تاقمەکەی هەموو جارێک بەجلو بەرگی پێشمەرگانە تاوانیان کردوەو بەم جۆرە خۆیان گۆڕیوە. لە گوندی بیرەجنەی سەر بە شارۆچکەی

قوشتەپە دوو پێشمەرگەی قارەمانی حیزبی شیوعی شەهید دەکەن، هەژار منارەیی و بلەی فەرماندە، قارەمانی شەڕی دەستەویەخە. لە پێشوتر باسی قارەمانێتی بلەم کردوە برای شەهید ڕاوێژو دوو برای تر، هەزار سڵاو لە گیانی پاکیان. دوای ئەو ڕۆژە دوو کوڕی عەزیز قەمبەری کە هەڵاتوی سەربازی بوون، ڕادەستی ئەمن کرد تاوەکو ئێستا بێ سەرو شوێنن. سەلاح شینەو تاقمەکەی پێشمەرگەی ئازای یەکێتی تیپی (٨٦) دەشتی هەولێر ڕۆستەم عەلی سۆر قۆڕیتانی قۆڵبەست دەکەن، دەیخەنە ناو گونییەک و دواتر شەهیدی دەکەن کە باوکی و چەند برایەکی لەڕێگای ڕزگاری کوردستان شەهید ببوون. من سەعیدی عەلی سۆر و برایەکانیم لە گۆمەشین ناسی، هاوینی ١٩٨٢. لەنێوان گوندی میرەکان و کەردز، پێشمەرگەی یەکێتی یاسین کەریم، برای مامۆستا تەحسین و موحسین کەریم پێشمەرگەی تیپی (٨٦) دەشتی هەولێر دەکەوێتە بەر دەستڕێژی گوللەی سەلاح و تاقمەکەی، لە ئەنجامدا یاسین شەهید دەبێ و دوو پێشمەرگەی تریش بریندار دەبن، یەکێکیان ناوی فەتاح بوو، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی پارتی ،ڕەسول جەلال خەڵکی گوندی سۆفی برایم.

سەلاح شینە دواتر لە ڕێکەوتی ١٩٨٩/٣/٥ بەدەستی چەکدارێک بەناوی: ئەکرەمی جەمیل کەریم ئاغای کۆڕێ سەرۆک جاشی فەوجی سوک کوژرا. سەلاح شینە لە لایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراقەوە بەهۆی بەشداریکردنی لە ئەنفالەکاندا، فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەرچوە بە ژمارە (٢٩٣).

## فەیروزە، داستانی نەتەوەیەك

کاتێک ئێمە لە کافێ بەڕێ کەوتین، ئەردەلانی ئامۆزام بەجێ ما. بڕیار وابوو لەگەڵ چەند گەنجێکی پێشمەرگە ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێن بۆ خوێندن. ئەنفالی بەسەرداهات نە پرژان برۆن. بۆیە ڕۆیشتبوون بۆ گەلی باڵندە. باوکم گوتی: ئامانەتی مام خدر ڕووسیم داوە، دڵنیام دەیپارێزی. کە ئەردەلانم بینییەوە، بەم شێوەیە، ئەو داستانەی بۆ گێڕامەوە: لەڕۆژەکانی مانگی هەشتی ١٩٨٨ دا کە ڕووداوەکانی شاڵاوی ئەنفالی بەدناو هەموو کوردستانی تەنی بوو، لەبناری چیای

گارە، لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە لەگوندی کافێ بەنیازی پەڕینەوەمان بەرەو سنوری سوریا، بڕیار بوو بەڕێ بکەوین. بەڵام بەهۆی شاڵاوی کۆتا ئەنفالی ژمارە هەشت لەو مانگەدا دەستی پێکرد، بۆ سەر ناوچەی بادینان. بەهۆی ئەوە، ڕێرەوی ڕۆیشتنمان گۆڕاو هەر لەوێوە بڕیار درا کەبەرەو ناوچەی خواکورک و لۆلان و سنورەکانی لەگەڵ ئێران، بە تێپەڕبوون بەناوچەی سیدەکان و شێروان مەزن و دەشتی بەرازگردا بەڕێ بکەوین، کە ناوچەی بارزانیش لەگەڵیاندا دەکەوێتە یەکەم وێستگەمان لەدوای گوندی بانێ، کە دوا گوندی ناوچەی کافێ بوو. بەڵام بەهۆی بوونی مۆڵگەی سەربازی مەحکەم و جێگیربوەکانی چیای پێرس، گوندی هەرنێی بناری، ڕێڕەوی کاروانی مەفرەزەکەمان لەگوندی بانێوە بەرەو ڕاستی گەلی باڵندە بەڕێ بکەوین، ئەڵبەتە مەفرەزەکەمان لە کۆمەڵێک پێشمەرگەی تێکەڵی مەڵبەندەکانی سلێمانی و کەرکوک و زیاترینیان مەڵبەندی هەولێر پێکهاتبوو.

ژمارەمان خۆی لەنزیکەی چل پێشمەرگە دەبوو، زۆربەمان لەو پێشمەرگانە بوین کەوا بڕیاری حیزب درابوو بۆ خوێندن بەرەو هەندەران بڕوات. بەڵام لەبەر بەربەستی ڕێگای سنورەکانی سوریا هەموو مەبەستەکانی گۆڕی و مەسەلەی چوونە هەندەران لەلای هەموان تا ڕادەیەک کاڵ ببوەوە. لەدوای ڕۆیشتنی چەندان کاتژمێر گەیشتینە سەر زێی بادینان لەخواروی شارۆچکەی شیلادزێ. دوای ئەوەی لەگوندی بانێ بەرێکەوتین، چوینە گوندێکی تر ناوەکەی نایەتەوە یادم، کەوتبوە سەروی بەرزایی گەلیەکی زۆر ئاستەم، نزیکەی دوو کاتژمێر دوور بوو لەگوندی بانێ. شەوێک لەو گەلیە ماینەوە، پێش نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ، تاوەکو ئێوارە لەژێر سێبەری داربەڕوو دار قەزوان کاتمان بەڕێ کرد. لەو گوندە پرس و تەکبیری پەڕینەوەمان لەئاوی زێی بادینان کە نیو کاتژمێر دووری بوو، تاوتوێ کرابوو.

بۆ دڵنیابوونمان، ڕێ نیشاندەرمان بەپارە گرتبوو بۆ ئەوەی ڕێگامان نیشان بدا. کە ڕۆژ ئاوا بوو شۆڕبوینەوە بۆ سەر ئاوی زێ و پەڕینەوە بە کەڵەک، هێشتا دونیا تاریکایی داینەگرتبوو، دوای پەڕینەوەمان لەزێ بۆ ماوەی دوو کاتژمێر ڕۆیشتین گەیشتینە یەکێک لە گوندەکانی گەلی باڵندە، بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نییە، هەڵە نەبم ناوی سیتە بوو. تاوەکو بەرەبەیان دونیا کش و

مات بوو، پێش ئەوەی دونیا ڕووناک بێ تۆپباران دەستی پێکرد، وەک ئەوەی خەبەریان لێ دابین و هێزی دوژمنمان بهێننە سەر، ئەڵبەتە لەگەڵ تەقینەوەی تۆپەکان بۆنی میوەی ڕزیو و سیر کەوتە ناو لووتمان، ڕاستەوخۆ سەرجەم هاوڕێیانی مەفرەزەکەمان و خەڵکی گوندەکەش زاندرا ئەمە کیمیاویە. خێرا بەرەو بەرزاییەکانی دەوروپشتی گوندەکە سەرکەوتین، ڕانەوەستاین تاوەکو ئاوایی کلکەی کۆتایی چیای شیرین بوین. لەوێ ڕانەوەستاین هەتا گوندی تێلێ کە کەوتۆتە دۆڵێکی چڕی پڕ لە دارو ڕوبارێکی بچووکی ئاوی چیا و شوێنێکی زۆر دڵگیر و فێنک، لەوێ گیرساینەوە، خواردنمان دروست کرد. بەرێکەوت لەوێ یەکتریمان بینی لەگەڵ برادەرانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان ئیتیجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، بەر لە ئێمە لەگەڵ برادەرانی پارتی لە لیژنەی ناوچەی بەری گارە، کەوا بەرپرسەکانیان پێک هاتبوو لە: ئاغا ڕەزا زێباری کە خزمی بنەماڵەی بارزانی و ئەرشەد زێباری بوو، وەک ئاغای ناوچەی بەری گارە و شیمالی برای کە بەرپرسی لیژنەی ناوچەی پارتی بوو.

شەوێک لەوێ بوین، بۆ ڕۆژی دوایی تاوەکو پێش ڕۆژئاوا، تۆپ باران دەوروپشتی ئەوێشی گرتەوە، پاشان مەفرەزەیەکی هاوبەشیان لەهەر سێ لایەن پێکهێنا کە نزیکەی چل پێشمەرگە دەبوین، منیش یەکێکیان بووم لەبەشی حیزبی ئێمە (مام تالێ) کەسایەتیەکی ناسراوی لای گوندی کافێ، وەکو بەرپرسێکی پارتی بە بەرپرسی یەکەمی مەفرەزەکە دەست نیشانکراو بەرێکەوتین بەرەو سەر ڕوباری (چەم جوو). شەوەکەی تاوەکو بەیانی نەخەوتین هەر بەرێگاوە بوین بەناو ئاگرو دوکەڵی پووش و پەلاشی ئاکامی تۆپ باراندا ڕۆیشتین بەناو گەلیی و ڕوبارەکەوە، بەم شێوەیە بەرێگاوەبوین بەرەو سەر شاخێک، بەلای ڕۆژهەلات، دەیڕوانییە (دەشتی هێرتێ و ناوچەی سیدەکان و خوا کورک)، بەلای ڕۆژئاواش دۆڵی ڕوباری چەم جوو، کە ئێمەی پێدا تێدەپەرین. تاوەکو بەری بەیان ئێمە بەناو دۆڵەکە هەر بەرێوەبوین، تا گەیشتینە سەروی دۆڵێک کە ڕێگاکەی بەرەو ناوچەی سیدەکان ئاراستە دەکرد. بینیمان پێشمان گیراوەو دەنگی گرەو نەڕەی زرێپۆش و ئۆتۆمبێلی سەربازی لەدوورەوە تێکەڵ بە تارمایی تەپ و تۆزو ڕووناکی گزنگی ڕۆژهەلات ببوو، لەدوای ئەوەی بەدووربین جووڵەی سەربازی دوژمن بەروونی دیاربوون، بێ ئومێدبوین لەوەی کە تێپەڕ

بوونمان ئەستەمە، بڕیار درا هەر بەرێگاکەی خۆمان بەرەو خوارەوە شۆڕببینەوە بۆ ناو ئەو دۆڵەی کە بەشەو پێیدا بەسەرکەوتبوین. لەگەڵ گەڕانەوەو هاتنە خوارەوەماندا وەک ئەوەی بەو ڕێگایەدا تێنەپەڕیبین، هەر بەتەواوی پڕ ببوو لەو خەڵک و دێهاتیانەی سەرجەم گوندەکانی ئەو ناوچانە کەوا پێدەچوو هەر بە لێشاو بەدوای ئێمەدا هاتبوون و لە دۆڵەکە گیرسابوونەوە. لەسەر چەقی ڕێگاکەدا خەوتبوون و چاوەڕێی خۆرهەڵات و دڵنیاکردنی ڕێگاکە بوون لەلایەن ئێمەوە بۆ ئەوەی بەڕێ بکەون.

دوای ئەوەی گەیشتینەوە سەر ڕوبارەکە بە مەبەستی پەڕینەوە، دەزگایەک هەبوو پێیان دەگوت: )داقەرست(، لە سیمێکی تەلبەندی ئەستوور پێکهاتبوو، ڕایەڵەی هەردوو سەری ڕووبارەکە توند لەهەردوولا قایم کرابوو، پارچەیەکی تریشی بەجیا لەرێگەی دوو خڕیلە (بۆربەرین)ی ئاسن لەسەر داندرابوو، زۆر بە ئاسانی جووڵەی پێ دەکرا، پارچەکە شۆڕ کرابوەوە بە مەترێک لەخوارەوەی وەکو سندووقێک بە قایش و دار، شوێنی دوو سەرنشینی بۆ دروست کرابوو. تاوەکوو کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ ئێمە توانیمان دوو دوو بپەڕینەوە بەری لای چەم جوو. لە لێواری ئاوەکە چەند دوکانێک بەقوڕ دروست کرابوون وەکو فرۆشگا. ژوورێک و هەیوانێک لە پێشەوە لە چەشنی شوێنێکی گەشتیاری سادە بۆ خەڵکی ناوچەکە دروست کرابوو. لەهەموو شتێک سەیرتر ئەوەبوو: دەچووینە هەر گوندێک و هەر ماڵێک، دەرگای سەرجەمیان بە والآیی جێ هێشترابوو!! لەبەر لێشاوی خەڵک و هاتنیان فرۆشگاکانیش بەهەمان شێوە دەرگایان بە والآیی بەجێ هێڵدرابوو. بۆ ئەوەی خەڵک سوودی لەکەلوپەلەکانی ببینێت.

تاوەکو دوای نیوەڕۆ هاوڕێیانی تریش، لەگوندی تێلێ لەگەڵ هێزەکانی تر، لە شەوی ڕابردوو لێیان دابڕابوین لەناویاندا هاوڕێ مام خدر ڕوسی و هاوڕێ ئەبو دڵشاد، چەند هاوڕێیەکی پێشمەرگەی مەفرەزەکەمان، هاوکات لەگەڵ ئەوان هەڤاڵانی سۆسیالیست کاک قادر عەزیزو کاک بەهمەن و چەند برادەرو هێزێکی شەست پێشمەرگەییان لەگەڵدا بوو، هەروەها هەڤاڵانی پارتیش، ئاغا ڕەزاو شیمالی برای و هێزێکی لیژنەی ناوچەی بەری گارەو ئاکرێی پارتی، ژمارەکەیان نازانم چەند دەبوون، بۆ پەڕینەوە هاتنە سەر ئاوەکە. بەڕیز لەگەڵ لێشاوی خەڵکی ناوچەکان خەریکی پەڕینەوە بوون بە ئامێری داقەرست. بەم شێوەیە

تاوەکـو نزیـک بـە ئێوارە کاری پەڕینـەوەی ئەوان هەر بەردەوام بوو. سـەرەتا هاوڕێیانی ئێمە و برادەرانی سۆسیالیسـت گەیشـتنە بەری لای ئێمە، ڕاستەوخۆ هێزێکی هاوبەشـی ئێمە و برادەرانی سۆسیالیسـت ڕێکخرا بۆ پاسـەوانیکردن و خواردن و نان ئامادەکردن، لەو گوندەی کە لەسـەروی دۆڵەکەی ئێمەی تێدابو، تاوەکـو دونیـا بەرەو خۆرئاوا بـوون دەچوو، لەناکاو دەنگـی تەقینەوەو بینینی دوکەڵێک لەسـەر ئاسمانی دۆڵەکە، دوکەڵی ئارپی.جی بوو (ئینفلاق) لەسەرەوە کردو بوو بە دەستڕێژو تەقەیەکی چڕ لەگوندەکەی سەرەوە. لەلایەن هاوڕێیانەوە بڕیاردرا: تێکڕامان بەرەو شـوێنی دەنگی تەقەکان بەڕێ بکەوین و سـەر ئاوەکە بەجێبهێڵیـن، کەوا بەردەوام خەڵک خەریکی پەڕینەوە بوون.

نزیکەی بیسـتو پێنج بۆ سـی خولەک سەرکەوتین و گەیشـتینە گوندەکە، شەڕ لەسـەر لوتکە بەرزەکانی دەورووپشـتی گوندەکە بەردەوام بوو. کە گەیشـتینە خانوەکانـی گوندەکـە، بینیمان برادەران نان و خواردنیان سـازو ئامادەکردبوو، دەسـتیان لێ هەڵگرتبوو، بەجێیان هێشـتبوو بەرەو سـەروی گوندەکە بۆ شـەڕ ڕۆیشـتبوون. دونیـا تاریـک داهاتبوو، لەگـەڵ هاوڕێ مام خدر ڕوسـی و چەند پێشـمەرگەیەک ڕاوەسـتابوین لەشـوێنێکی کەمێک ڕاسـتایی لە باغێکی بچووک دەچوو، لەپەنای تاشـەبەردێکی زل. تەماشـای ڕەوتی تەقەکان و شـەڕەکەمان دەکرد، بۆ ئەوەی لێی تێبگەین.

لـەو دەمەدا چەند تارماییەک بەرەو لای ئێمە دەهاتن. دەنگمان دان: ئێوەکێن، نهێنی شـەوتان بڵێن؟ دەرچوو، سـێ چوار پێشمەرگەی خۆمان بوون. گەیشتنە لامان، لەوانە هاوڕێ سـەنگەری مەلا نەفتەمـان بینی، گوتیان: کەمێک بریندارە بـەوردە سـاچمەی ئینفلاقی ئارپێجـی. تفەنگێکی زیادو بێ تەلێکی سـەربازیان بەدەسـتەوەبوو. گوتیان: بەدەستەویەخە توشی چەند سەربازێک بوین و دەست ڕێژمان لێکردن، کوشـتمانن، ئەو دەسـتکەوتانەمان لەشەڕەکە هەبوو. ئێمە لەم قسـانە بوین، لەناکاو تەقینەوەیەک دەنگی هات، یەک ڕاسـت لە تاشەبەردەکەی پەنـای ئێمـە تەقیەوە. دڵنیـام ئەگەر ئەو بـەردە نەبوایە، لەوانەبوو کەسـمان بـە سـاغی دەربازمان نەدەبوو. لـەدوای تەقینەوەکە بە مـام خدرمان گوت: وا پێدەچێ دوژمن لە ئێمە نزیکە، با هێرش بکەینە شـوێنی سـەرچاوەی تەقەکان. لەگەڵ هەڵپەی حەماسـەت و بەدەم گۆرانی (هێزی پێشـمەرگە نابەزن، هەموو

شۆڕشگێڕن ئەمرۆ) خۆم لەریزی پێشەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم بینییەوە، هەر بە پێوە بەیەکەوە دەست ڕێژێکی زۆرمانکرد و بەرەو چرە دارێک ڕۆیشتین، کەوا پێدەچوو گۆڕستانی گوندەکە بێ، تاوەکو نزیک ئەو شوێنە بەتەقەیەکی زۆرەوە چوین، بەڵام هیچ بەر پەرچێکمان نەبینی و شوێنەکە دارستانێکی بەرزو زۆر تاریک بوو، هیچمان لێ دیار نەبوو. کە دڵنیابوین هیچ دەنگ و جموجۆڵێک نەما، گەڕاینەوە لای برادەران. مام خدر ڕوسی، داوای لێکردم کە لەگەڵ هاوڕێیەکی تر بچمەوە خوارەوە، بە کاک قادر عەزیزو ئاغا ڕەزاو شیمال ڕابگەینم: ڕێگاکە ئارامەو دوژمن شکاوەو نەیانتوانیوە ئەو ڕێگایەمان لێ دابخەن. من لەلام ناخۆش بوو دوور بکەومەوە لەشەڕەکە و هاوڕێیانیشم، گوتم: تکایە مام خدر یەکێکی تر با بچێ ئەو کارە ئەنجام بدا، من حەز دەکەم لێرە لەگەڵتدا بمێنمەوە. لەلایەکی تر، من هەرگیز قسەی مام خدرم نەدەشکاند، ئەویش منی زۆر خۆش دەویست و دەیگوت: ئەتۆ ئەمانەتی منی، ئەگەر هەر شتێکت بەسەربێت من شەرمەزاری مام عەلی مامت و خانەوادەکەتان دەبم. بۆیە لەو ساتەدا هەستم کرد مام خدر دەیەوێ لەشەڕەکە دوورم بخاتەوە. کەمێک بە نارەحەتیەوە پێی گوتم: یەکەم شت ئەتۆ ئەوان دەناسی، پاشانیش دەبێ گوێ ڕایەڵی من بی، مەگەر من وەکو مامت عەلی نیم؟ دەستی لە ملی کردم، بە ئەسپایی پێی گوتم: ئەوە بڕیارەو دەبێ جێبەجێی بکەی. بەو هاوڕێیانەی تری گوت: کێ لەگەڵی دەڕوا؟ کەس دەنگی لێوە نەهات. هەر بەخۆی گوتی: هاوڕێ بۆتان تۆ لەگەڵ ئەردەلان پێکەوە بڕۆن، یەکتری بەجێ مەهێڵن. ئێمەش بەرێکەوتین بۆ ئەوەی بەرەو خوارەوەی دۆڵەکە و سەر ئەو ڕوبارەی کە سەر لەبەیانی تەواوی ڕۆژەکە لەوێ بوین.

لەگەڵ هاتنە خوارەوەمان بە دە خولەک، بینیمان کاک قادر عەزیزو برادەرانی سۆسیالیست خەریک بوون بەرەو گوندەکە سەردەکەوتن، نزیکیان بوومەوە پێم گوتن: هاوڕێ مام خدر ئێمەی ناردەوە خوارەوە بۆ ئەوەی پێتان بڵێم: ڕێگاکە ئارامە و باری شەڕەکەش لەبەرژەوەندی خۆمانە، کۆنترۆڵی لەدەست پێشمەرگەیە. گوتیشم: ئەدی کاک ڕەزاو شیمال کوان؟ گوتیان: پێمان وایە هێشتا لەخوارەوەن. لەو برادەرانە تێپەڕین، دوای دە خولەکی تر بەخێرایی گەیشتینە سەر ڕوبارەکەو خانوی فرۆشگایەکان. بەدەم هاوارکردنەوە بانگی

ڕەزاو شـیمالی برایـم کـرد، کەچی هەسـت و خوسـت لەو نـاوە نەمابوو. وەک ئـەوەی بڵێی کەسـی لێ نەمابێ، ئەو شـوێنە سـەر لەبەیانی جمـەی دەهات و خەڵکێکـی زۆری لێبـوو، کەچی وەکو ئەوەی شـوێنەکە بۆردومان کرابێ، تەنها پاشماوەی دوکەڵ و شورەی دەنگی ئاوی ڕوبارەکە دەنگی دەهات. بێ دەنگیەکی سـامناک باڵی بەسەر ئەو شـوێنە هەڵکێشابوو. بەدەم هاواری کاک ڕەزا و کاک شـیمال: ئێوە لەکوێن ئێمە پێشـمەرگەین... بەرەو لای ڕاستی شوێنەکە چوین، کـەس نەبـوو، هاتینــەوە لای دەسـتە چەپ. بینیـم، لەژێر هەیوانـی یەکێک لە فرۆشـگایەکان، تارماییـک دەجوڵێتـەوە، بەدەم هاوارێکەوە گوتـم: ئەوە کێیە، ئەتۆ کێی؟ دەسـتمان لەسـەر میلـی تفەنگەکانمان بوو. لەگەڵ ئاراسـتەکردنی بەرەو تارماییەکە چوومە پێش و دەنگی نووزانەوەی منداڵێکم بە ئەسپایی هاتە بـەر گـوێ، لێی چوومە پێش بینیم کچێکی تەمەن پێنج شـەش سـاڵان، بەدەم هەڵگڵۆفاندنـی چاوەکانی بەنزگرەیەکی هێدییەوە دەنووزێتەوە!! پێم گوت: ئەوە چ دەکەی لێرە؟ بۆ بەتەنیای؟!!کوانێ کەسـوکارت؟!! بێ وەڵام بوو.

بەحەپەسـاویەوە سەیری منی دەکرد، منیش دەسـتم بەسەری داهێنا دڵنەواییم دایـەوە، گوتم: مەترسـە ئێمـە لەگەڵ خۆمانت دەبەینەوە لای کەسـوکارت. لەو دەمـە هـاوڕێ ئازاد ئەحمەد ناسـراو بـە بۆتان، هاتە لامان گوتـی: ئەوە چیە؟ گوتم: وا پێ دەچێت لەخەودا ماوەتەوەو کەسـوکاری بەجێیان هێشـتوە. دەبێ لەگـەڵ خۆمان بیبەین، بەڵکو کەسـوکاری لەگەڵ ئەو خەڵکـەی لەپێش ئێمەدا ڕۆیشـتوون. گوتم: هاوڕێ ئاگایەکت لێی بێ مەتارەی ئاوەکەشتم بدەرێ دەچمە سەرئاوەکە، لەگەڵ ئەوەی خۆم پڕیان دەکەمەوە بۆ ئەوەی بێ ئاو نەبین. چوومە سـەر ئاوەکەو بایەکی فێنک لەگەڵ تەوژمی ئاوە سـازگارەکەی ڕووبارەکە خۆی بەمندا خشـاند، لەگەڵ گەرمایی لەشـم بەو ئارەقەیەی کردبووم، تەزوەکی سارد سـەرتاپای لەشـی داگرتم. بەخێرایی مەتارەکانم پڕکردن و چوومەوە لای هاوڕێ بۆتان و، کچە جێماوەکە. ڕوانیمان بێ هودەیە کەس لەو شوێنە نەماوە، هاوڕێ بۆتان دەسـتی ئـەو کچۆڵەی گرتوو، بـەرەو گوندەکە سـەرکەوتینەوە. کەمێک ڕۆیشـتین کچەکـە هێـدی هێدی خەواڵوی خـەو بەریداو لە نـووزە نووز کەوت، بـەڵام بۆ ئـەوەی بەخێرایی بگەینەوە بـرادەران، هاوڕێ بۆتـان گوتی: وا بزانم لەپشـتێی بکەم باشـترە. بەمنی گوت: هاوڕێ دەتوانی تفەنگەکەم بۆ هەڵگری،

تاوەکـو ئـەو کچە لە کۆڵەپشـتی خۆم بکـەم؟ منیش تفەنگەکـەم لێ وەرگرت. کچەکـەی بە پشـتە کۆڵە هەڵگرت، تاوەکو گەیشـتینەوە ناو گوندەکە. لەسـەر ڕێچکـەی گوندەکە هاوڕێیان وەسـتابوون، لەو لاشـیانەوە کۆمەڵێک دێهاتیەکان کە ژمارەیان: دوو سەد کەسێک دەبوو، لەسەر ڕێگاکە هەڵکورمابوون، چاوەڕێی ڕەوشـەکەیان دەکـرد. گەیشـتینە لای هاوڕێیان، مام خدر بـەرەو پیرمان هات، لەگەڵ هاوڕێ ئەبوو دڵشاد پرسیان: چی بوو، چیتان کرد، ئاغا ڕەزاو شیمال تان بینین؟ گوتم: نەخێر، هیچ کەسـمان نەبینی، تەنها ئەو کچە بچوکە بەجێمابوو، ئەویشـمان لەگەڵ خۆمان هێنا. یەکێک لەو هاوڕێیانە گوتی: ئەدی کەسـوکاری کوانـێ؟ ئێمـە چۆن دەتوانین لەگەڵ خۆمانی ببەین؟ لـەو دەمەدا هاوڕێ بۆتان بەدەنگێکـی پڕ لە سـۆزەوە گوتی: هـاوڕێ مام خدر، ئەگـەر یەکێک چەکەکەم بـۆ هەڵگـرێ من بەرپرسـیارێتی ئەو کچە لە ئەسـتۆ دەگرم، تاوەکو ڕادەسـتی کەسـوکاری دەکەمەوە، بەم شێوەیە هەموانی بێ دەنگ کرد.

کات نزیکـەی نۆو نیوی شـەو بوو، بەو خەڵکەمـان ڕاگەیاند کە لەوێ چاوەڕوان بـوون، ئێمـە بە سـەر شـاخ هەڵدەگەڕێین. ئەگـەر دەتوانـن وەرن لەگەڵماندا، ئەگـەر ناشـتوانن ئێمە بەجێتـان دەهێڵین، کەسـمان لەگەڵ نەهـات و ئێمەش ئەو گوندەمان بەجێهێشـت و بەکوێرە ڕێگایەک، کە شـوێن پێی مەڕو بزن بوو، زۆر سـەختی پێوە دیار بوو، ماوەی بیسـت خولەکێک بە ڕێگاکە سـەرکەوتین، ئێسـترێکمان پێ بوو لەناکاو هەڵدێراو لە شـاخەکە کەوتە خوارەوە، لەشوێنێکدا گیرسـایەوە. بەخێرایـی چویـن ئـەو کەلوپەلـە گرنگانەی کە لێی بـار کرابوون پێمان هەڵدەگیرا هێنامان و ئێسـترەکەمان ڕاست کردەوەو بەجێمانهێشت، بەڵام بەداخەوە لە پەلوپۆ کەوتبوو لاشـەی دوچاری شکان هاتبوو.

بەدرێژایی شەو، بەبێ ئەوەی بخەوین بەرێوەبوین بەرەو سنوری باکوور (تورکیا)، نزیک کاتژمێر پێنجی بەیانی گەیشـتینە سـەر شـاخێکی چڕی کوێستانی. وا پێ دەچـوو لەزسـتاندا بەفـری زۆری لێ بکەوێ. شـاخەکە کۆمەڵـە بەردێکی دڕی ڕەش هەڵگەرابوو، لەوێ دانیشـتین لەبەر هیلاکی و شـەکەتی زۆرمان، هەر یەک لـە کەلێنێکدا خـەوی لێکەوت. تاوەکـو لەگەڵ گەرمای تیشـکی ڕۆژ خەبەرمان بـوەوە. هاوڕێیەکـی عـەرەب، بەناوی ئەبو خلود، شـارەزایی زۆری لەسـەر بێ تەلـی پەیوەنـدی کردن هەبوو، هەندێک دەسـتکاری شـەپۆلەکانی بێ تەلەکەی

کرد، یەکڕاســت چوە سەر شــەپۆلی سەرکردایەتی ســەربازی دوژمن. سەبارەت بە شــەڕەکەی شــەوی پێشــوو بەدوورودرێژی دیاربوو بە ڕاپۆرتێک باســیان لە کوشــتنی ســێ ســەربازو ون بوونی چەکەکانیان و، بێ تەلی ڕێنماییەکەی تۆپ بارانکردن (بتاريه المدفعيه) ڕاگەیاند.

ســەر لەبەیانییەکــەی نزیــک بە کاتژمێــر نۆ لەخــەو بێداربوینــەوە، هەریەکەی کۆڵەپشــتێکمان پێبــوو، (پێمــان دەگــوت: (عەلیجە) بۆ خــواردن و کەلوپەلی تاکەکەســی تایبەتــی زۆر باش بــوو)، کە لەبارەگای گوندی کافــێ بەرێکەوتین، هەنــدێ ئازووقە هەبوو لەبەشــی کۆگای دارایی بارەگاکــە، هەریەکەی قوتویەک گۆشــتی مانــگا کە وێنــەی ســەری مانگایەکی لەســەر بوو، لەگــەڵ هەریەکەی کیلۆیــەک شــیری تۆزی نیــدۆ، لەگەڵ کەمێک شــەکر کە لەناو کیســەی نایلۆن کرابوون، دابەشی سەریان کردبوین. لەڕێگا، کە برسی دەبوین لەگەڵ بسکویت و لوقم و توخمی کوولەکە کە لە فرۆشگا لە گوندی کافێ دەیان فرۆشت کڕیبوومان.

بــۆ ئــەو بەیانییەش بەهەمان شــێوە، ئەو مەتارانەی پێمــان بوون (فافۆن) بوو، ژێرێکــی لەگەڵــدا بوو، بۆ زۆر شــت بەســود بوو، شــیرە تۆزەکە لەگەڵ شــەکر هەروەهــا لەگەڵ ئاودا تێکەڵمان دەکرد، تاموچێژێکی زۆر خۆشــی دەداو بۆ هێز و تاقەت و ڕۆیشــتینیش بەکەڵک و بەسود بوو.

هــەر بەیانییەکــەی کۆمەڵێــک لەهاوڕێیــان ڕەوانەی ئەو گوندانــەی ئەوێ کران، نزیکی ئەو شوێنەی، پشوومان لێیدا بوو، بۆ ئەوەی پاسەوانی سەر بەرزاییەکانی دەوروپشــت دابنێیــن. کات نزیکــی نیوەڕۆبوو، خۆمان کۆکــردەوەو بەرەو خوار شاخەکە هاتینە خوارەوە، نزیک بە سی خولەک گەیشتینە گوندەکە، زۆر نزیکی سنووری باکوور (تورکیا) بوو. لەوێ خواردن و نانمان دروست کرد لە کەلوپەلی خانــوو ماڵەکان کە هەموو شــتێک بــە واڵایی بەجێ هێڵدارابوون. لەناویشــیاندا لــە باخچەکانیاندا تەماتەو باینجان و کولەکە هەبوو، لێمان کردنەوەو لەشــێوەی شــلە ( تەشــریب) چەند مەنجەڵێکــی بچوکمان هێناو هەر چەند پێشــمەرگەیەک دابەش بوین بۆ دروســتکردن و ئامادەکردنی خواردن، پاشانیش خواردنی.

دیمەنێکــی ســەرنج ڕاکێش ئەوەبوو، کیژۆڵە بچووکە بەجــێ ماوەکە، لەگەڵماندا بوو بە بەشێک لە ئێمەو هەموو شتێکی لەگەڵ هاوڕێ بۆتان تێکەڵ بوو، لەگەڵ ئــەو نەبوایــە خواردنی نەدەخــوارد. تەنها لەگــەڵ ئەویش قســەی دەکرد، هەر

لەرێگــەی ئەویشــەوە زانیمان ناوی (فەیروزە) یــە. بۆتان، بۆ ئەو دایک و باوک و براو خوشک بوو.

لــەدوای نیــوەڕۆ و پشــودانێکی بــاش و نــان خواردنمان، گوێ بیســتی دەنگی هەلیکۆپتــەر بویــن، پاشــان وردە وردە دەنگــی تۆپبــاران دەســتی پێکرد بۆ ناوچەکانــی دەوروبەر. پاش ئەوەی ئەو گوندانەمان بەجێهێشــت گەیشــتینە ناو دۆڵێکــی قووڵ کە هەر دوولای شــاخ بوو، خوارەوەشــی چەم بــوو. جۆگەیەکی تەنکی ئاو، بەهێمنی بەناو چەمەکەدا دەهات، گوتیان: ئێســتا ئێمە لەناو خاکی تورکیــا داین، شــەو لــەوێ کە چەند ماڵێکــی تێدابوو لەو دۆڵــە و دابەش بوین مانەوە، شــوێنەکە کەمێک ساردبوو، پێدەچوو کوێستان بێ.

بــۆ بەیانــی لەدۆڵەکــە تێپەرین، لــەدەم ڕوبارێــک کۆبوینەوە لەگــەڵ کۆمەڵێک لەهاوڕێیانــی مەڵبەندی بادینان و پێشــمەرگەی لایەنەکانیتر. هەر لەوێ بڕیاردرا کــە ئــەوەی نەخۆش و پەککەوتــە بێ، بــا چەکەکانیان دابنێــن لەگەڵ خەڵکی گوندەکان بەرەو ئۆردوگاکانی شــارۆچکەی گەڤەر برۆن. لەناویاندا هاوڕێ بۆتان و فەیروزەی کچۆڵەی هاوڕێ، لەگەڵ خەڵکەکە ڕۆیشــتن. دوای ئەوەی لە یەکێک لــە ئۆردوگاکانی شــاری گەڤەر نیشــتەجێ بــوون، بۆ ماوەی نزیــک بە مانگێک فەیروزەی هاوڕێیە بچکۆلانە نوێیەکەمان کە هۆگری بۆتانمان ببوو، بەکەسوکاری خۆی شــادبوەوە. لەلایەن کەسوکارەکەیەوە گەلێک سوپاسگوزاری هاوڕێ بۆتان ببــوون. فەیروزەی کچیانــی بۆ لەمەرگ ڕزگارکردبوون. ئێمەش لەدوای دابڕانمان لەو هاوڕێ و برادەرانە، توانیمان خۆمان بگەیەنینە ناوچەکانی شــەمدینان بەناو خاکــی تورکیادا، تاوەکو ناوچەی مەرگەوەڕی ئێران بڕۆین و بگەینەوە گوێزێ ی ســەر سنوری باشــورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان. ئەوەتا ئێستاش هەر هەمووما ن لە گوێــزێ و دۆڵەکۆگە کۆبوینەوە چاوەڕوانی چارەنوس دەکەین.

# دایکێکی مەزن

لەسـاڵانی پێشمەرگایەتی بەشێرەژنێک ئاشنابووم، کە لەناو کوردا کەم وێنەبوو. یەکەمجار لە هاوینی سـاڵی ١٩٨٢، لەهیران و نازەنین، شـەڕەفی ئەوەم پێ بڕا، لەماڵی حەسەن کاکە، چاوم پێی بکەوێ. ئێمە چەند پێشمەرگەیەک بوین، وەک دایکی خۆمان، هەموومانی ماچ کرد، وەک مەحەمەدو بەشـداری کوڕی لەئامێزی گرتین.

مرۆڤ شـەرمی لەدڵسـۆزی و میهرەبانی ئەو شـێرەژنە دەکرد، هەر چەندە من یەکـەم جـارم بوو دەیبینـم، بەڵام کەم وابـوە ئەوەندە لـەزەت لەبینینی دایکم بکەم. لەدەشـتی کۆیە و دۆڵی سـماقوڵی و مەلەکان و دۆڵی ڕۆسـتێ و بارزان و هەمـوو ئەو شـوێنانەی کە بۆی دەچوین، ئەو ژنە بـە دوامانەوە بوو. کەمجار هەبـوە یەک مەنجەڵ دۆڵمەی کۆیە و خواردنی بۆ ئێمە لەناو بەرامپیلەکەی گرێ نەدابێ.

کـەم کـەس هەبوو بەناوی (ئایشـەگوڵ) ئاشـنا نەبێ، نەک لەبەرئـەوەی دایکی مەحەمەد حەلاقە، بەڵکو لەبەر کەسـایەتی و تێکۆشانی خودی خۆی.

بەداخـەوە هاوینـی ١٩٨٨ هەواڵی دەسـتگیرکردنی، هەموومانـی تەزاند. لەناو هەولێردەسـتگیرکرا. لەناوەراسـتی مانگی ١٩٨٨/٨ گوللەباران کرا. لە مەعمەل قیـرِی هەولێـر گۆڕ غەریـب کرا. لەسـاڵی ١٩٩١ لەدوای ڕاپەریـن، تەرمەکەیان لـە مەعمـەل قیر دەرهێنا. کچەکـەی، بەکەواکەی بەری کە پێش شـەهیدکردنی لەبەری بوو ناسیەوە.

لەکۆیـە بەخـاک سـپێردرا. لەناو شـاری کۆیە پەیکـەری بۆ دروسـت کرا، زۆر شایانی لەوە زیاتر بوو بۆی بکرێ، بەڵام لەدوای ساڵێک پەیکەرەکەی ئایشەگوڵ بەدەستی چەند کەسێکی ویژدان مردوو بێ ڕەوشت شێوێندرا. بۆیە پەیکەرەکەی لابراو بوو بە سەربازی ون.

# ژیانێك چەشنی بەرد

لەگــەڵ مەحمودی حاجی نــادر بڕیارماندا بچینە لای نۆکان و نێوزەنگ، تا لەوێ بــارەگا دروســت بکــەن، یارمەتیان بدەیــن هەتــا منداڵەکانمان بۆ دێــت بچینە ئێــران. بەهەرحاڵ کاک مەحمود گوتی: دەڕۆین بۆ لای نێوزەنگ و نۆکان بارەگا دروســت دەکەین، ئەوکات بەهەر شــێوەیەک بێ بەدوای منداڵەکانماندا دەنێرین، تابێــن و بیــان بەیــن بۆ ئێــران، دابنیشــین. وەک ئەو هــەزاران خەڵکە. ڕۆژێک چوین بۆ دۆڵەکۆگە لەوێشــەوە بەرەو گۆڕەشــێر، دوایی قولە هەرمێ و زەڵێ و پاشــان نێوزەنگ و نۆکان، لەوێ شــوێنی بارەگامان دیاری کرد. ڕۆژانە خەریکی دروســتکردنی بــارەگا بوین، بە بەرد دروســتمان دەکرد. ڕۆژێــک لەگەڵ هاوڕێ مــلازم گۆران ( ئێســتا لەریزەکانی یەکێتــی عەمیدە لە تۆپخانە)، گۆران دەنگی زۆر خۆش بوو، بەتایبەت لە گۆرانی مامڵێ، من لەســەر دارێک چروم دەبڕی بۆ سەربانی بارەگا، ئەو لەژێر دارەکە دانیشتبوو گۆرانی دەگوت، منیش دەستم لە بن گوێم نابوو لە نزیک گوندی نۆکان، خەڵکەکە وایان دەزانی منم گۆرانی مامڵێ دەڵێــم. ڕۆژی دوایــی چووم بۆ نــۆکان لەناو گوند دەیانگوت: ئەوە پێشــمەرگە دەنگ خۆشەکەیە.

کە بارەگاکانمان دروســتکرد، من چووم بۆ ســونێ، ئــەوکات بارەگاکانی حیزبی دیموکراتــی ئێرانــی لێ بــوو، بازاریکی گەورەی قاچاغی لێ بوو، لەعێراق شــتی قاچــاغ دەهــات بۆ ســونێ، بــە پێچەوانەشــەوە. چاخانەیەکی بە حەســیری لێ دروســتکرابوو، ئەو ناوە پڕ بوو لە بارە خەنەو بنێشــتی کوردی و زۆر شتی تری وەک جگــەرەی ســۆمەر و بەغدا. چایەکم خــواردەوە، هەندێ قاچاغچی لێ بوو، گوتیــان: کاکــە ژن و منداڵــت لەخوارێــن؟ دەتەوێت بۆت بێنیــن؟ گوتم: بەڵێ. گوتیــان: لەکوێنە؟ گوتم: لــە چوارقوڕنەن. یەکێکیان، ئەنگوســتیلەیەکی زێڕی زۆر گــەورەی لــە پەنجەی دابوو، جگەرەی هەرە باشــی دەکێشــا، گوتی: کاکە ئــەو ڕێگایە پڕ لــە مینە (ئەڵغام) ڕۆژ نییە خەڵک نەکــوژرێ یان قاچی نەپەڕێ ڕاستی دەکرد، زۆرجار قاچاغچیەکان بۆ یەکتریان دادەنایەوە بۆ ئەوانەی لەدوای

خۆیـان دێــن. گوتی: کاکە بە هەزار دینار بۆت دێنین، ( ئەوکات دەیکردە ســەد گونییە برنج، یان باشترە بڵێین دوو دەمانچەی چواردە خۆر). لە ئێران ئەوکات ژن هێنــان هــەرزان بوو، منیش گوتم: بــە هەزار دینار ژنێکی نوێم بۆ دێنن، یان کۆنەکەی خۆم؟!! گوتیان: هەر ئەوەی خۆت. گوتم: کاکە ئەو پارەیە ژنی لۆک و نوێشــی پێ دێت، ئەو پارەیەم نییە.

لە چاخانەکەوە دەرکەوتم، کوڕێک هاتە تەنیشــتم گوتی: دیارە پێشمەرگەیەکی مانــدوو دیــاری، مــن بۆت دێنم، چەندی بە خۆت پێت چــاک بوو بمدەرێ. ناوی مینە بوو خەڵکی گەلوەڕەز بوو، منیش گوتم: شانســم بە ناوی مینە یان نییە، ئــەوی تر حاجیش بوو، مواســەفاتێکی لە تۆ زیاتر بــوو!! کاکە مینە گوتی: من دەیانهێنم، ڕەنگە چەند ڕۆژێکم پێ بچێ. نامەیەکم نوســی و دامە دەســتی. دوو ڕۆژی پێچوو، دووبارە هاتمەوە لە تۆکان بۆ ســونێ، شــەو چووم بۆ بەرقســلێ، تــا بەیانــی نەخەوتم، چونکــە دەوری کاتژمێر دوازدەی شــەو کۆمەڵە خەڵکێک هاتن، دوو جەنازەیان لەســەر شــان بوو، هێنایان بۆ بەرقسلێ، گوتیان: لە ڕێگا لایان داوە بەسەر مین کەوتوون، بزانن کێ دەیان ناسێ، بە لایت سەیرم کردن، نەمناسین.

دەتگــوت خەویــان لــێ کەوتــوە، تا گوێــم بەســنگیانەوە نەنا بــاوەڕم نەکرد، مــردوون. خەڵکی گوندی بەرقســلێ ســەیریان کــردن، دوو کــوڕی گەنج بوون، کارتــی بــاری کەســێتیان خەڵکی هەولێربــوون، زۆرم پەرۆش بــوون. نامەیەکم نــارد بۆ خوارەوە لەڕێگای قاچاغچیەکان، مینەیان دەناســی، نوســیبووم: کاکە ئەگەر نەگەیشــتیە شوێنە ترســناکەکە بیان گێڕەوە، منداڵەکانم مەهێنە با نەبم بە جێگەی لۆمەی خزم و کەســوکارم، یەکێکیان وە ســەر مین بکەوێ هەتا دنیا دنیایە لە دڵم دەرناچێ، با لێک دووربین باشــترە. ئەوکات ســاڵێک و دوو مانگ بــوو منداڵەکانــم نەبینیبوو، گەڕامەوە تۆکان بۆ بــارەگای خۆمان بێ ئومێدبووم لەهاتنــی منداڵەکانم، دوعام دەکرد خوا بکا نەیەن لەگەڵ مینە.

ڕۆژی دوایــی لەســەرەوەی تۆکان قاچاغچیــەک بانگی کرد، هاوڕێیــان حازمتان هەیــە؟ گوتــم: بەڵــێ، من حازمــم. چاوەڕوانــی هەواڵی ناخۆش بــووم. گوتی: منداڵــت هاتــوون وا لــە گەلــوەڕەزن، لای ماڵی مینە. بانگی هــەردی برام کرد، گوتم: ئێســترەکەی بارەگا بێنە. منیش ئەســپێکم هەبوو، هێنام، ڕۆیشــتین بۆ

شێنی، لەوێشەوە بەرەو گەلوەڕەز. کە چاوم بە منداڵان کەوت، هۆشەنگ لەسەر ولاغ کەوتبوو سەری شکا بوو، سەریان پێچابوو، لەبارەگای حیزبی دیموکراتی ئێران لەسونێ سەریان تیمار کردبوو، سەری بە لەفاف پێچرابوو دوریبویانەوە بەچەند تەقەڵێک، هێندەیان لەفافی سپی لێ پێچابوو، دەتگوت: ئیمام تابورە. هەڵمەت تەمەنی چوار ساڵ بوو، ماندووبوونم لێکردن، کوڕە بچوکەکەم دەشتی، تەمەنی ساڵێک و دوو مانگ بوو، لە تەمەنی دە ڕۆژیەوە نەمبینیبوەوە، بۆیە نەهاتەلام، نەی دەهێلاّ ماچی بکەم، نەیدەزانی مـن باوکی ئەوم، زیاتر بۆ لای هەردی برام دەچوو. مینە زۆر پیاوبوو گیسکی بۆ سەربڕی بوون، بەزۆری مینەم ڕازی کرد پارەم داێ. ڕۆیشتین بۆ نۆکان، دوو ڕۆژ لە نۆکان ماینەوە، ئەسپەکەو دەمانچەکەم فرۆشت، کە هەردووکیان موڵکی خۆم بوون، تەنها تفەنگەکەم پێمایەوە. لەگەڵ هەردی برام دەستی منداڵەکانمان گرت، هەندێک جلوبەرگی خۆیان پێبوو، چوین بۆ قاسمەڕەش. لەوێ خانوەک بۆ بارەگا دروستکرابوو، خۆڵ بوو لەناو ئەو خۆڵە لەگەڵ منداڵەکان دانیشتین. نیوەڕۆ لەبارەگای مەڵبەندی سێی یەکێتی خواردنیان بۆ هێناین. (شەهید کانەبی پورزای خێزانم بوو، ئەو نانی بۆ هێناین، لە پاسەوانەکانی کاک کۆسرەت بوو، لەهەولێر لە شەڕی ناوخۆ شەهید بوو).

قەرارگای سوپای پاسداران لەوێ بوو، بەرگەیان (واتە: مۆڵەتی چوونە ناو ئێران)یان بۆ دەکردین، وێنەی دەویست، وێنەگری لێ نەبوو، نەشدەبوو بچیە دیوی ئێران بێ مۆڵەت، هەردی برام وێنەی پێ نەبوو، پێشمەرگەیەکی یەکێتی، ڕیشدارێکی بالاّ بەرز بوو، زۆر بەهەردی دەچوو، نەمان دەناسی. بانگمان کرد دوو وێنەمان لێ قەرزکرد، بەرگەمان بۆ هەردیش دروست کرد، هەتا دوای چەند ساڵێکیش لە ئێران هەر کە ئێمەی دەبینی دەیگوت: دوو وێنە قەرزارن. پاش ڕاپەرین لەهەولێر بەهەردی گوتبوو: دوو وێنەکەم؟!! لای ئێوارە شابازێک پەیدا بوو، سوار بوین بەرەو ئالوەتان. دیاربوو ئەو ڕۆژە پولی چاکی بەو شابازە پەیدا کردبوو، لەنێوان قاسمەڕەش و ئالوەتان، بۆیە جار جار ئاغای شۆفێر هەتا دەنگی تێدا بوو دەیگوت: دەک لەبەر تەگەرت دەمرم، قوربانی ئەو ماتۆرو گێر بۆکسەت بم، هەی لەبەر ناڵەت دەمرم.

کەسمان نەدەناسی لە ئالوەتان، نوێژی شێوان چوینە ماڵێک، شەوێ ماینەوە.

بەیانی بێستونی کوڕە خاڵم کە زاواشم بوو، لەوێ پەیدابوو، ئۆتۆمبێلی پێ بوو، بەرێکەوتین بۆ شـارۆچکەی پیرانشـەهر. ماڵی خاڵم لە چیانە بوو، پێش بگەیتە پیرانشـەهر، چوین بۆ ماڵی ئەوان، شـەو لەوێ ماینـەوە. ڕۆژی دوایی گوتیان: لـە ئۆردوگای دێڵزێ دەبـێ خۆتان ناونووس بکەن، خێمەو سـۆبەتان دەدەنێ، ئـەوکات ئۆردوگای دێڵزێ جمەی دەهـات لە خەڵک. لەناو خێمە و قوڕو چڵپاو. خێمە و سۆبە نەما بوو، گوتیان: برۆن بۆ خۆتان شوێنێک پەیدا بکەن. بەناچاری گەڕاینەوە پیرانشەهر، لای ماڵی بێستون ی زاوام. بۆ بەیانی حەسیبەی خوشکم و نایلەی خێزانم، ڕەوانەی بازارکرد، بە سـێ هەزار تومەن زۆر لە شـتەکانی ناو ماڵیان کڕی و ژوورێکمان لە حەوشـەی کابرایەکی پیرانشەهر بەکرێ پەیدا کرد. کابـرا، کاری پاسـکیل چاک کردنـەوە بوو، بەناوی مەحەمـەد لەرزانە، پیاوێکی سـادەو هەژاربوو. ماوەی دوو مانگ تێپەڕی، باوکیشـم هات بۆ لای ئێمە. من و باوکـم و هـەردی و خێزانم و منداڵەکانم، لەیـەک ژوور دەژیاین. جاری واهەبوو، بە میوانی، پێشـمەرگەی بارەگاکانی سـەر سـنور دەهاتن. سەرین و دۆشەکمان نەبوو، دەبوایە هەر کەس پشـتێن و قەمسـەڵەکەی بکاتە سەرین ودۆشەگ. دوو بـرادەرم هەبـوو لە شـنۆ، یەکێکیان خالید غەریب (ئێسـتا لـە کەنەدایە)، وە سەمەد تیکالۆ (بەداخەوە شەهید بوو عەرەبەکانی قەراج شەهیدیان کرد)، هاتن بۆ لام، پێیان ڕاگەیاندم: هەر چەندی پارەت زۆر پێ بێ بەرگەی ساڵی دانیشتن ناگـری لـە ئێران. داوایـان لێکردم کاسـبی بکەم، پێم گوتن: مـن لە پاش ئەو هەموو پێشـمەرگایەتیە چی دەزانم بیکەم؟!! گوتیان: ئۆتۆمبێلێک بکڕە کاسبی پێبکـە. بـۆ ڕۆژی دوایی چوین بۆ نەغەدە، لە پێشـەنگای مەحەمەد بەر بەیارو عبدالرحمـان حاجـی عەلی. لەندرۆڤەرێکمان کڕی لـە مەهدی مام عەزیز خەڵکی گوندەکەی خۆمان بوو، پێشـمەرگەی پارتی بوو.

نێوانی ڕێگەی دووری و نزیکی گوندەکانم نەدەزانی، نرخیشم نەدەزانی، نەمدەزانی کرێـی ئۆتۆمبێـل چەندە بـۆ گوندەکان!! هاتمـەوە بۆ پیرانشـەهر. ناچار بووم لیسـتێکم کرد بەناوی هەموو گوندەکان و کرێیەکەی. چەند تومەن بوو هەمووم نوسـیبوو وەکو کاتب ناحیەی لای خۆمان، لەفلکەی سەردەشـت لە پیرانشـەهر ڕادەوەستام، وەک ماشێنەکانی تر. من شەرمم دەکرد بانگی نەفەر بکەم، ڕۆژ تا ئێوارە پارەی بەنزینەکەم کار نەدەکرد!! بۆ ماوەی هەفتەیەک هیچ کارم نەکرد.

یەکێک دەهات سـڵاوی دەکرد، دەیگوت: ئاغای ڕاننـدە بەچەند تومەن دەمبەی بۆ شەختان، یان هەنگەوێ؟ من جارێ لیستە بۆرم دەردێنا دەگەڕام لەناوی ئەو شوێنەی کە ئەو دەیگوت. کابرا دەرۆیشت بە تورەیی، دەیگوت: شوناسنامەم بۆ دەردێنێ کاکی عێراقی!! وردە وردە کارم دەستپێکرد، برا کوردەکانی ڕۆژهەڵات یارمەتیان دەدام. ئاشنایەتیم پەیدا بوو لەگەڵیان، بەڵام کە سەربازێک دەیگوت: ئاغا دەستی شما دەرد نەکونەت. گورج دەستم دێنایە ژوورەوە، وامدەزانی دەڵێ دەسـتت مەبە دەرەوە. کەچی مانای ئەوەبوو دەسـتت خۆش بێ، دادەبەزم. بۆ من ژیانێکی نوێ بوو، هەرچەند جاری دەمگوت: قاسمەڕەش، سەردەشت، هەموو شـریتی تەمەنی ڕابردووم بەیەک چرکە دەهاتەوە بەرچاو. بۆ ئێمەی پێشـمەرگە وەک لەئاسـمان کەوتبینە خوارەوە، شوێنێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، خەڵکەکەی زۆر پەیوەنـدی کۆمەڵایەتیـان بەهێزبوو، زۆر بە سـەبرو ئارام بوون، من زۆرجار دەمگوت: حەزرەتی ئەیوب خەڵکی ئێران بوە، بە پێچەوانەوە ئێمە تورەو توند. شـوێنێکی زۆر تەنـگ و بچووکمان هەبوو، ژوورێکی سـێ بە چوار. زۆرجار دوو سـێ میوانیشـمان هەبوو، وەک جگەرەی جمهوری لەسـەر تەنیشت ڕیز دەبوین. پاش سـاڵێک خانوێکی سـەر بە خۆمان بەکرێ دەسـت کەوت، دوو ژوور. ئیتر، باوکـم و هەردی لە ژوورێک، مـن و منداڵەکانم لە ژوورێک دەخەوتین. بەردەوام میوانمـان هەبوو، ئەو پێشـمەرگانەی لەنـۆکان و نێوزەنگ دەهاتنە شـارەکان، سـەرێکی ئێمەشیان دەدا، کە خۆشەویست بوون لامان.

## تێکشکان

بەداخەوە پایزی ١٩٨٨لەکاتی کشانەوەمان بۆ دیوی ئێران، وەکو لە پێشەوە باسم کـردوە، هەندێک خەڵکی هەلپەرسـت، ورەیان بەردەدا، لەریزی پێشـمەرگایەتی هەبـوو پەنای دەبردە بەر ناپاکی کە دەیان ویسـت بچنەوە ناو ڕژێم. بۆ ئەوەی ڕژێم لێیان ببورێ یان بۆ هەندێک دەستکەوتی ماددی هەڵدەستان بە تیرۆرکردنی هاوسـەنگەرەکانی خۆیـان. هەندێکی تر، دەیانویسـت جێگای خۆیـان لە ئێران خۆشـبکەن، پەنایان دەبردە بەر تیرۆرکردنی تێکۆشـەرێکی ڕۆژهەڵات، بۆ پارەو

ئیمتیـاز. یەک بەناوی (ب) پێشـمەرگەی یەکێتی بوو، پێشـمەرگەیەکی حیزبی دیموکراتـی ئێرانی تیرۆرکـرد، ئاودیوی ئێران بوو لەهاوینـی ١٩٨٨. بەداخەوە هەندێک لە پێشـمەرگەی لایەنەکان دۆسـتایەتیان دەکرد، ڕۆژێک لە پیرانشـەهر بـە (د.ح)و دوو سـێ برادەرم گـوت: ئێوە بۆ لەگەڵ فلان ڕادەوەسـتن؟ نازانن ئەوە چ ناپاکیەکی کردوە؟! لەوەڵامدا (د.ح) گوتی: مام جەلال دەڵێ: دەستێک ئەگـەر نەتتوانـی بیبڕی، دەبێ ماچی بکەی. لـەدوای ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ لە چوارقوڕنە هەمان (ب) بانگی کردم، گوتی: میوانم بە، لە ئێرانیش خۆت لە من لادەدا، دوێنـێ لای کاک کۆسـرەت بووم ئەو دەمانچەیەی دامـێ. گوتم: بەڵێنم داوە لای پورزایەکم میوانم.

ڕۆژێک گوتیان: لە مانگی سوری ئێرانی، لە پیرانشەهر ڕوون و ئازووقە دەدەن. هـەر بابـا بوو، چوین بۆ مانگی سـور. حەسـارێکی گەورەی هەبـوو. لەوێ زۆر کەسـم بینی پێشـمەرگە نەبوون، بەڵام کاتی خۆیماڵیان قۆناغی پێشـمەرگەی هەمـوو لایەنـەکان بـوو، خەڵکـی وام بینی، ڕۆژانە نانی بیسـت کەسـی دەدا، کەچی بۆ چەند غرام ڕۆنێک وەسـتا بوو، زۆرم پێ ناخۆش بوو، شـایەنی ئەوە نەبـوون ئاوا تێک بشـکێندرێن. هی وا هەبوو تەنەکەیەکی گەورەی بەدەسـتەوە بـوو، واش هەبـوو تونگەی نایلۆن. یەک لەوانە: لە پاش شـەڕی قڕناقەو پشـت ئاشـان نەمبینیبوەوە، لەوێ بینیم. حاجی ئەحمەد باوکی کاک خدر ، لە سـاڵی ١٩٨٣ مـن چـووم بـۆ ماڵیان، هەر پەلێـک بۆ چەند ماڵێک دابـەش ببوین، من لەگـەڵ بیسـت و پێنج پێشـمەرگە چوین بـۆ ماڵی مام حاجی، بـە مام حاجیم گوت: بەسـەر ماڵی خزمەکانی خۆت دابەشـمان بکە، بەڵام ڕازی نەبوو، گوتی: هەمووتان لەماڵی ئێمە دەبن. سـڵاوم لێ کرد، ڕۆژانە هێندەی پێشـمەرگە میوان دەبوون، ناوی منی لەبیر نەمابوو، میمۆری مێشـکی پڕ لەناو بوو. تەنەکەیەکی گەورەی شـازدە کیلۆیی بەدەسـتەوە بوو، ناویان خوێندەوە، تەنەکەکەی دانێ، چەنـد غرامێـک ڕۆنیان لەبنـی تەنەکەکە کرد. وەک هێلکەو ڕۆنـی تێدا بکەیت، گوتـی: ئـەوە تەنها بەشـی کیری من و قونـی ئێوە دەکات پێی چـەور بکەین. ترسـاین کارمەندەکە حاڵی بێ، لێمان شـێواند، گوتی: ئەوە چی دەڵێ؟ بۆمان پینە کرد، گوتمان: دەڵێ ڕۆنی قاز زۆرباشـە بۆ چەورکردنی دەسـت وقاچمان. بـاش بوو کارمەندەکە کوردی نەدەزانی، فارس بوو.

## پۆلێك شەهیدی جوامێر

بارەگاکانمـــان لـــە نۆکان و خـــڕی نێوزەنگ بوو، ئێمەی خێزانـــدار لەدیوی ئێران بویـــن. لەبەهـــاری ١٩٨٩، هەواڵێکی دڵ تەزێنمان لەهەولێـــرەوە بۆ هات: گرتنی هاوڕێی زۆر خۆشەویستم حاجی بەختیارو خوشکەکەی، خاتون مریەم، هاوکاری کوڕی شـــەهید بەکر جۆلاو، تەهای برای شـــەهید هەنـــگاو و، جوتیار تۆپزاوەیی کەرکـــوک. بەداخەوە، لـــە ١٩٨٩/٤/٢٤ لە دائیـــرەی ئەمنی هەولێـــر گوللەباران کران. حاجی بەختیار لەگەڵ خوشکەکەی لەماڵی خۆیان لەهەولێر دەستگیرکران و لەگەڵ ئەوانەی لە سەرەوە ناوم هێناون، بە بێ دادگا شەهیدکران، دوای (١٥) پازدە ڕۆژ لە گرتنیان. لەدوای ڕاپەرینەکەی ساڵی ١٩٩١ تەرمەکانیان لەمەعمەل قیر دەرهێنرانەوە.

هـــاوکات کە ئەوانەیان شـــەهیدکرد، مـــاڵ و منداڵ و کەســـوکاریان دوورخرانەوە بـــۆ ســـەماوە، خانوەکانیان خاپوور کـــرا بە شـــۆفڵ. زۆر خەمباربووم بۆ حاجی بەختیـــار، چونکە لە ڕۆژانی ســـەخت بەیەکەوە بویـــن، بەتایبەتی لە کەمینەکەی بەســـتی شەرغەو دەشتی کۆیەو مەلەکان و...هتد.

## دیارە حازم وەزعی باشە!!

جەژنی قوربانی ســـاڵی ١٩٨٩ ، ئۆتۆمبێلێکی لەندرۆڤەرم هەبوو. لە پیرانشـــەهر لەگـــەڵ مەکتەبـــی پەیوەندیەکانی پارتی و سۆسیالیســـت و یەکێتـــی، پەیوەندیم زۆر باش بوو. پەیوەندیەکانی پارتی عبدالرحمان عەلی کوردە (بە عبدالرحمانی موهەندس ناســـراوە)، لەگەڵ خەلیل (بە خەلیلە ڕەش ناســـراوە)، یەکێتی، نیاز کاکـــەرەش و نـــەوزاد کاکـــەرەش و مســـعود (کە کاتی خۆی و ئێســـتاش لەگەڵ بەڕێز فوئاد مەعســـومە). نمایندەی سۆسیالیستیش، عبدالرحمانی حاجی کۆدۆی قـــەلادزێ! بـــوو. شـــتێک بۆ خوا بڵێـــم: زۆر ڕێزی باوکم و من و هـــەردی برام و

مەحمودی حاجی نادریان دەگرت. کاری ئێمەیان پشــت گوێ نەدەخست، منیش ئۆتۆمبێلەکەم لەخزمەتیان بوو. کاک نەوزادو نیازو مەســعود، گوتیان: بۆ نایەی بچینــە جەژنانــەی کاک کۆســرەت لە مەهاباد، خۆ تۆ لە پێش، پێشــمەرگایەتی کاک کۆســرەت لە ســایلۆی هەولێر دەناســی؟ گوتم: باشــە دەچیــن. چوین بۆ مەهاباد، بۆماڵی کاک کۆســرەت. لە دوو ســێ نەفەر زیاتری لێ نەبوو، ئەوانیش شــەهید شاخەوان (مەحەمەد عەباس) و مامۆستا ســەیفەدین، جەژنانەمان کرد دانیشتین. کاک کۆسرەت ڕوی لەمن کرد گوتی: ئەرێ تۆ هەر زوو ونبوی، چیت بەســەرهات؟! گوتم: هاتمە دەرەوە بووم بە پێشــمەرگە، (چونکە من ســاڵێک و چەند مانگێ پێش کاک کۆســرەت بووم بە پێشــمەرگە). گوتی: لەکام تیپی؟ گوتم: من لە تیپان نیم، لەگەڵ حیزبی شیوعی بووم بە پێشمەرگە. گوتی: هیچ جیــاوازی نییــە. نیوەڕۆ لەماڵی کاک کۆســرەت نانمان خــوارد، نانێکی هەروەک بارەگاکانی پێشــمەرگەو ژوورەکانیش بە کۆمباری زۆر خراپ ڕاخرابوون، دیاربوو هــی خــاوەن خانوەکە بوو، کــە بەکرێی دابوە کاک کۆســرەت. خۆزگە هەر ئاوا بمابانایــەوە. چوینە ماڵی مامۆســتا نازم دەباغ ( ئێســتا لــە پەیوەندیەکانە لە تــاران)، فەرشــێکی تەورێزی نمرە یــەک ڕاخرابوو، منداڵێکی کــچ، تەمەنی دوو بۆ ســێ ســاڵ دەبوو، خرخاڵێکی ئاڵتونی لەپێدابوو، لەســەر فەرشــەکە دەهات و دەچوو، ئێمە ســەیری یەکمان دەکرد، بەڕاســتی بە ماڵە پێشــمەرگەو ئاوارە نەدەچوو. دوایی چوینە ماڵی شــەهید عبدالرزاق، دوو پەتۆی سەربازی بارەگای لەیــەک دروی بــوو لــە جیاتــی فەرش، زۆر لە ماڵــی ئێمە مانــان کاول تر بوو. شەهید عبدالرزاق لەماڵ نەبوو، خێزانی و خولەی برای لەوێ بوون، بەم شێوەیە لەدوای جەژنانە لە مەهاباد گەڕاینەوە بۆ پیرانشــەهر.

لە ئێران ڕۆژی عاشورا، پێکەنین و گۆرانی قەدەغە بوو، منیش ئەوکاتە کەسواری ماشــێن دەبووم گۆڕانیەکم دەخســتە ســەر تەســجیل، بۆ ئەوەی لێم تێک نەچێ و بمگــرن، بەکــرەی گۆڕانیە کوردیەکانــم هەڵگرتبوو (نــازم غەزالیم) لێ دەدا، وایاندەزانی شــینی حەسەن و حوسێنە، دەیانگوت: بارەک الله.

ئێوارەیەک لەسەردەشت گەڕامەوە، نەفەرم بەکرێ بردبوو، هاوڕێ کەریم ئەحمەد و مەلا حەسەن و کانەبی گەورەو هاوکارو چەند برادەرێکی تر، میوانی ئێمەبوون.

نایلەی هاوسەرم، نەیدەتوانی نانی چاک ساز بکات، ناچار پرسیم چیمان هەیە؟ گوتــی: برنجە ســورە. منیــش ئەو میوانانەم زۆر خۆش دەویســت، لەگەڵ باوکم و هەردی دانیشــتبوون، چووم کەبابم بۆ هێنان. لەجیاتی گۆشــت لەســەر برنجە ســورەمان دانــا. ئــەوکات یارمەتــی ئێمە لەلای حیزبی شــیوعی هەشــت هەزار تمەن بوو، کە گەڕانەوە بۆ تۆکان یەکســەر یارمەتی منیان بڕی بوو، بە بیانوی ئــەوەی گوتبویــان: حازم ئەگەر وەزعی باش نەبێ چــۆن کەبابی بۆ ئەو هەموو پێشــمەرگەیە پێ دەکرێ؟!! ئەگەر دەمزانی برنجەسورەکەشم نەدەدانێ، دەبوایە بــەس نــان و پیازیــان بدەمێ. هاوڕێ مەحمــود حاجی نادر کە ئەوەی بیســت، زۆری پێ ناخۆش بوو، چوو بوە تۆکان زۆر لۆمەی کردبوون، یارمەتیەکەی منی لــێ وەرگرتبوون، پێــی گوتبوون: ئاخر ئەو پیاوە لەدەمــی ماڵ و منداڵی خۆی گرتۆتەوە بۆ ئێوە کەبابی کڕیوە، ئەگەر نا بۆ خۆی برنجە ســورەی دەخوارد.

ئێمــەی ئــاوارە بۆ هەموو بۆنــەکان هاوکاری یەکتــر بویــن، بەتایبەتی ئەوانەی ماشــێنمان هەبوو. ڕۆژێک گوتیان: مام جەلال دەگەڕێتەوە. ئێمە بەبێ جیاوازی چوین بۆ پێشــوازی، لەلای کارخانەی قەندی پیرانشــەهر، بەڕیز وەســتاین. مام جەلال هات، بەڕیز تەوقەی لەگەڵ کردین، پاشــان بەدرەقەمان کرد، چوە ماڵی شێخ مستەفای زینوێ، کاک کامەرانی کوڕی شێخ مستەفا، زۆری هەوڵدا لەماڵی ئەوان نان بخۆم، بەڵام من ڕۆیشــتم ئەرکم تەواو بوو.

چوومەوە فەلەکەی سەردەشت، کاک نامیق سوارە لەدوام دەگەڕا. چاوم بە کاک نامیق کەوت، گوتی: جاســم خەیلانی لەگەڵ ســێ پێشــمەرگەی تر لە بادیناوێ چاوەڕێت دەکەن. (هاوڕێ جاسم خەیلانی یەک لەو بەرپرسە پارتیزانانە بوو کە بەجێ مابوو لەباشــور). چووم بۆ بادیناوێ، کاک جاســم و سێ هاوڕێیەکە لەوێ بوون، هەواڵی یەکترمان پرســی، ناوەکانم وەرگرت. گەڕامەوە خانێ، برای بەڕێز کاک عبدالرحمــان موهەنــدس و کاک خلیــل زوو بەرگەیان بۆ کردم بۆ ئەو چوار هاوڕێیە. گەڕامەوە لایان بەرگەکانم دانێ. چەکیان پێ بوو، چوینەوە ماڵی ئێمە. هاوڕێ جاســم ئەو شــەوە هەموو بارودۆخی باشوری بۆ گێشکە و سەلەند کردم. بەیانــی لەگــەڵ ماشــێنی برادەرێک بەڕێم کردن بۆ سەردەشــت و قاســمەڕەش، بەڵام لەسەردەشــت هاوڕێ جاســم و سێ پێشــمەرگەکە گیرا بوون. پاسدارەکان گوتبویــان: بەرگەکانتــان تــەواوە بەڵام ئێــوە ڕوومەتتــان هەتاوگازبــوە، ئێوە

پێشمەرگەی دیموکراتن، باش بوو دکتۆر کەریم کۆیی بەری دابوون. ئاخر دکتۆر کەریم ئەوەندە ناسرابوو، جارێک مام جەلالیان گرتبوو هەتا نەیگوتبوو نیروی دکتۆر کەریمم، مام جەلالیان نەناسی بوو، نیروی ئەوم مانای ( پێشمەرگەی ئەوم). گوتبویان: مادام نیروی دکتۆری برۆ.

# کاتێك مرۆڤ هەرەس دێنێ

لەسەرەتای ١٩٩٠ دەنگۆی ئەوە بلاوبوەوە لەناو پێشمەرگە پەناهەندەکانی رۆژهەلاتی کوردستان، چوار سەرتیپی یەکێتی بە تەمان دەستێک بوەشێنن لەسەرکردایەتی یەکێتی. بۆ رازیکردنی حکومەتی عێراق و تەسلیم بوونەوەیان بە رژێم. هەر چواریانم دەناسین سێ سەرتیپ دەست بەسەرکران لە قاسمەرەش، یەکێکیشیان بەتفەنگەوە رۆیشت بۆ قەندیل. من تازە ماشێنێکی جێبم کڕیبوو کارم پێ دەکرد، لە فلکەی سەردەشت وەستابووم، لەگەڵ چەند شۆفێرێکی عێراقی، زۆربەیان یەکێتی بوون. عومەری برای عەولابۆر هات، گوتی: کاك حازم، چوینە لای زۆربەی شۆفێرەکانی کەوا یەکێتین، کەسیان ئامادە نییە لەگەڵمان بێت بۆ گۆڕی دیلانان لە قەندیل، ئەگەر تۆ لەگەڵمان بێی. گوتم: ئەو رێگایە زۆر هەورازە و ناخۆشە مەگەر مێک زەمینی پاسداران بگاتە گۆڕی دیلانان، ناتوانم بێم. گەرایەوە ئەوبەری شەقامەکە، بینیم چوە لای عەزەی داودی و جەمال کەریم و نیاز کاکەرەش، بەوانی گوتبوو: کاك حازمیش نایەت لەگەڵمان. جەمال کەریم گوتبوی: من دەچم هەوڵی لەگەڵ دەدەم. جەمال کەریم هاتە لای من، گوتی: برادەرێکی خۆشەویستت ژیانی لە مەترسی دا بێت لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک، ماشێنەکەت لە برادەرەکەت خۆشتر دەوێت؟ گوتم: نەخێر. گوتی: کەوایە با برۆین، ژیانی مەزهەر کەریم و چوار پێشمەرگەی تر لە مەترسی دایە. بانگی عەزەی داودی و ئەوانی تری کرد گوتی: وەرن با برۆین. لەرێگا عەزەی داودی گوتی: هاورێ حازم ئەگەر ئەو سەرتیپەی بەچەکەوە رۆیشتوە بگاتە ئەو پێنج پێشمەرگەیە کە عەولا بۆر بەرپرسیانە، دەیانکوژێ. بۆیە ئەو چاکەی تۆ لە بیر ناکەین. لەو هەموو یەکێتیە کەس لەگەڵمان نەهات.

گوتم: ڕاسـتە، مـن لەپێش هەموویان لەبەر گیانی مەزهـەر هاتووم، بەڵام گیانی هـەر پێشـمەرگەیەک لـەلای من بەهـادارە. چوینە گـۆڕی دیلانان لـە قەد ئەو شـاخە گۆڕێکی وەکو گۆڕەپانی گۆڵێن، ناوەکەی پڕ بە پێسـتی خۆیەتی. لەوێ عومەرو جەمال ڕۆیشـتن، لای ئێوارە هاتنەوە، سـۆراغیان کردبوون. سەرتیپەکە نەیبینیبـوون، وەڵامیـان بۆ ناردبوون ئەگەر ئەو سـەرتیپەیان دیت، باوەڕی پێ نەکەن دەچێتەوە ناو ڕژێم. گەڕاینەوە بادیناوێ و پیرانشـەهر.

# دەچمە مزگەوتی سور

برادەرێکی خۆشەویسـتم، پێشـمەرگەی یەکێتی بوو، بەنـاوی (ج)، بانگی کرد: کاک حازم وەرە، ئەو سـەروبەندە لە پیرانشـەهر بوین، گوتم: بۆ کوێ؟ گوتی: پورزایەکـم ژنێکـی زۆر جوانـی هێناوە، بابچیـن پیرۆزبایی لـێ بکەین. ئێمەش بەیەکـەوە چویـن پیرۆزباییمـان لێکـرد. ژن چ ژن، مێـوژی ڕەشـی بخواردبایە لەگەردنـی دیاربوو، لەسـەرچاوی کوێرت دانا با ڕوونـی دەکردەوە، لەگەڵ (ج) بەسەرسـوڕمانەوە سـەیری یەکتریمـان دەکرد، ماڵ ئاواییمـان کرد، گوتم: (ج) وەرە، بزانـم ئەو پورزایەت ئەو حۆریەی لەکوێ هێناوە؟!! گوتی: کاتێک (س)ی پـورزام، لـە مەهاباد، خەریکی کرێکاری بوە، هەموو ڕۆژێ لە مزگەوتی ناو بازار (پێی دەگوترێ مزگەوتی سور)، دوای تەواوبوونی کارەکەی لەو مزگەوتە دەست و پێی دەشۆرێ و پشوێک دەدات، چونکە سەڵت بوە. لەشانسی (س) کابرایەک لـە ژنەکـەی تورە دەبێ و شـەڕیان دەبێ، لـە دەمی دەردەچێ تـەڵاق دەخوا، (ئەو سـوێندە ڕۆژانە لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان هەمیشـە لە سـەر زارانە، بۆیە مـن پێـم دەگوتن: برایانـی ڕۆژهەڵات ئەوەندەی تەڵاق دەخـۆن، ئەگەر ئەوەندە گوڵەبـەرۆژە بخـۆن، پیاڵەی گوڵەبەرۆژە دەبێتە هەزار تمەن)، بەڵام ئەو کابرایە لەخـۆی گـەورە دەکات و دەچێتە مزگەوتی سـور، لەوێ مەلا دەڵێ: دەبێ مارە بەجاشـی بکەیتەوە. ئەویش دەڵێ: هەموو مەهاباد من دەناسێ، شتی وا ناکەم. مامۆسـتا دەڵـێ: کابرایەکـی عێراقی هەموو ڕۆژێ دێ لێرە پشـوو دەدا لەدوای کرێـکاری، هەر بینا ئێسـتا پەیدابـوو، لەوی مارە دەکەین، با شـەوێک لەگەڵی بخـەوێ، دوایـی بۆت تەڵاق بداتەوە، لەتۆی مـارە دەکەمەوە. مێردی (ن) ڕازی دەبێ. کاتێک (س) دەچێتە مزگەوت ماندوو هیلاک، ئەوەی بیری لێ نەکاتەوە،

ئەو خۆشــبەختیەیە. مــەلا بانگی دەکات و پێی دەڵــێ: داواکاریەکم لێت هەیە، لەراهــی خودا، دەبێ ڕازی بی. ئەویش گــەورە کوڕ دوو برای لەخۆی گەورەتری لــە پێــش ماوە ژن بێنن، ئەوەندە تینوی هاوســەرگیریە مەگەر خوا بزانێ، ڕازی دەبێ. دەڵێن: بەیانی دەبێ لێرە بۆ مێردی یەکەمی تەلاق بدەیەوە، مەلا (ن) لە (س) مارە دەکات. (ن) و (س) بەرێ دەکەون بۆ ئەو ژوورە ساردوسڕەی (س) بەکرێــی گرتوە. (س) لە پێشــەوە (ن) بەدوایەوە، ئەو شــەوە تا مەلا بانگدان تێک دەهاڵێن. (ن) دەڵێ: بەهیچ شێوەیەک نابێ تەڵاقم بدەیەوە، لەگەڵ تاریک و ڕوون ڕایانکردبوو بۆ پیرانشــەهر، ئێســتا ئەوە ســی ســاڵە ژن و مێردن. من هەموو جارێک بە نایلەی هاوســەرم دەگوت: واملێمەکە بچم بۆمزگەوتی ســوور

# لەترسی ژیان لەزەتم لەژیان نەکرد

حیزبــی شــیوعی بڕیاریــدا: لەرێــگای یەکێتی ســۆڤیەت خەڵکی خــۆی بنێرێتە دەرەوە، کاک ســەرۆ قادر بەرێی دەکردن. زۆر جار بە هەردی برامیان دەگوت: وەرە لەگــەڵ ئــەم وەجبە برۆ. هەردی دەیگوت: ئەگــەر کەس نەمێنێ لە ئێران، لە مێرگەچەکۆ دەبمە شــوان، ناچم بۆ دەرەوە، واتە (وڵاتی سێیەم). زۆر خەڵک لەجێی خۆی بوو، کە ناردیان. و زۆر خەڵکی لابەلاو غەیری پێشــمەرگەو غەیری شیوعی لەلایەن هەندێ خەڵکی بێ ویژدان برێ کران بۆ دەرەوە، لەسەر حسابی حیزبی شیوعی. بەڵام ئێمە هەر تۆبەمان نەهات لە چاوەڕوانی دابوین. منداڵەکانم نــاردە قوتابخانــە، ئــاراس گەورە بوو، چی وا لــە مامۆســتاکان بچوکتر نەبوو، هەڵمەت و دەشتی باش بوون، دەشتی ساڵێکی مابوو، ئاراس و هەڵمەت چوون بۆ خوێندن. ئەوەی شــایانی باســە لەو کەسانەی دەمناسین دوو کوڕی (ب.خ) لەســەر حســابی حیزب و خوێنی شەهیدان ناردران بۆ دەرەوە، دەیانگوت: (ب) یەک تۆزێ ماوە ببێت بە شیوعی. ئەو کاتە هەڵە نەبم ئەندامی لقی دوی پارتی بوو لە نەغەدە. من ناکۆک نەبووم لەگەڵ هەناردنی هەر گەنجێک لەهەر لایەنێک، بــەڵام ئێمــە و خەڵکــی زۆر مافدارتر هەبویــن کە هەقمان بەســەر ئەو حیزبەوە هەبوو. لەپێش هەر کەسێکی تر.

زۆرم پــێ خــۆش بوو وەک کوردی ڕۆژهەڵات زاراوەی ئەوان قســە بکەم، زۆریان

وشــەی (ئەســقەزا) بەکاردەهێنا، منیــش فێری ببووم. ناوە ناوە ئەســقەزایەکم ڕادە ئاڵانــد. کەم وابوو ئەو شــوێنانەی ئەســقەزام بۆ بەکاردێنا، ( ئەســقەزا)ی بویستبا!! (ئەسقەزا واتە بەڕێکەوت).

نەورۆزی ئەو ساڵە، هێرۆخان هات بۆ ئۆردوگای دیڵزێ. قاتێکی خاکی لەبەربوو، جامانــەی لــە ملــی بوو، کامێرا ڤیدیۆکەی لەســەر شــانی بوو. وێنــەی خەڵکی دەگــرت. خەڵکەکــە، پێشــمەرگەو ئاوارەی دیــوی ئێران بویــن. ڕۆژانی نەورۆزو یادی هەڵەبجەو یادەکان ئەوانەی ماشــێنمان هەبوو، خۆبەخشانە کارمان دەکرد. شــەقی زەمانــە هەموومانی وەک بــرا لێکردبوو، ڕۆژێک دەچوومە سەردەشــت، شــەش نەفــەرم پێبوو، لەڕێگا ســێ تایــەم پەنچەربوو، هەرجــارەی لایێک، وە هەر یەکەی لەشــوێنێک، یەکەمیان زاپاسەکەی (ســپێر) خۆم تێخســت. دوەم لە برادەرێکی وەک ڕۆژهەڵاتی دەڵێن: عێراقی، وەرگرت، کە ئەویش لەوخەتە کاری دەکرد. ســێیەم تایەم لەشەهید حوســێن بەستەستێنی (یادی بەخێر) وەرگرت، زۆر بــێ تاقــەت و تورەبووم، تفێکم لە ئۆتۆمبێلەکە کرد و بەردێکم پێدا کێشــا، گوتــم: ئــەوەی لەگەڵ ئەو حیزبــە بێت، بەژیانی نە ژنی جــوان و نە ئۆتۆمبێلی چاکــی دەبێ. نەفەرەکانم لەنســێی دارێک دانیشــتبوون، لەقەراغ ڕێگا، گوتیان: ئاغای ڕاننده توخوا تۆ لەگەڵ چ حیزبێکی؟ گوتم: بەخوای پێتان ناڵێم، چونکە ئــەوەی سیاســەتی کردبێ دەزانــێ چ حیزبێک دەڵێم و کام حیــزب ئەندامەکانی لەچەرمەسەری دەژین.

ئەو خانوانەی بەکرێم دەگرتن، ئەوەندەیان کێچ تێدابوو، نەدەبوایە کراسی سپی لەبــەر بکــەی، هەموی دەبوە خوێــن. خەومان لێ نەدەکەوت، ئــەوە نییە کورد دەڵێ (کێچ کەوتۆتە کەوڵی حەجمینی نییە)؟!! ئەوەندەم دەرمان کێچ کڕیبوو، دەمزانــی کامــە دەرمان بــاش دەکوژێ!! دوو دەرمان فرۆشــی کێچ و مشــک و مێروولە هەبوو لە پیرانشــەهر، هەردووکیانم زۆر چاک دەناســی، موشتەری لەمن چاکتریــان نەبوو، بەرێزان حەمەدە گەورەو هەمزە کوێربوون.

زســتان بــوو، یەکەم بەفر بــاری، نەفەرم بۆ ئالوەتان بارکــرد، لەڕێگا چەندجار خەریک بوو ماشێنەکەم وەرگەڕێ، لەو زیاتر هیچ شتێکم نەبوو، بژێوی منداڵەکانی پــێ دابیــن بکــەم. نەفەرەکان یەکێکی زۆر شــارەزایان لەگەڵ بــوو، پێی گوتم:

جەنابــت ئێراقــی؟ گوتم: بەڵێ. گوتــی: کاکە ئێرە گەرمێن نییە، کوێســتانێکی سەختە دەبێ چوار زنجیرت پێ بێ، لەتەگەرەکانی وەرپێچی لەکاتی بەفرکەوتن. بەهــەزار هەوڵ و تەقەلا هەتا گەیشــتمەوە پیرانشــەهر نەفەرەکانــم لە خدراوێ دانا. شــەوێ ئەوەندە بەفر باریبوو، دەبوایە ســەربان و حەوشە پاک بکەینەوە، پشــتەوەی خانــوی ئێمە ماڵی خاڵە حەمەبوو، ســەربانم پاک کردەوە بۆ ســەر خیابانێ بەفرم فڕێ دەدایە خوارێ، خاڵە حەمەش نەبادا من ناشوکری بکەم بەو بەفربارینــە دەیگوت: ئەوە بەرەکەتە ئــەوە غەنیمەتە خوا نایدا بەهەموو کەس. منیش دوو ســێ بێڵە بەفرم فڕێدا حەوشــەکەی. خاڵە حەمە هاواری کرد: کاک حازم ئەوە چی دەکەی، فرێی مەدە حەوشــەی ئێمە. منیش گوتم: خاڵە حەمە بەشە بەرەکەتی خۆم دەدەم بە ئێوە، من مردم هێندەی ئەو بەرەکەتە فرێبدەم.
ڕۆژێک چووم بۆ لای وایەرمەن، ئۆتۆمبێلەکەم هەڵنەدەبوەوە، وەستایەکە گوتی: کاکــە ماشــێنەکەت باتریەکە (شــاژ) ناکاتەوە، بوو بە پێکەنیــن، منیش وامزانی لەگەڵ ژاژی خواردنییەتی، گوتم: بەخوای لە پێشمەرگایەتیش ڕقم لە ژاژی بوو. ئینجــا گوتی: کاکە لەگەڵ ژاژی خواردنم نییە.
ڕۆژێک چووم ڕۆنی ئیستاپ بکرم، نەمزانی لە عێراق ڕادێت، ئەوەندە گران بوو، گوتــم: کاکــە ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ کیســە خوێنێک کیســە خوێنەکە لە قوتیە ڕۆن ئیستاپەکە هەرزانترە.
بەراســتی ژیاندنی هەشــت ســەر خێزان لە ئێران، مبارەزەیە لەگەڵ دێوو درنج، هەرچەندی هەوڵم دەدا ژیان هێندە ســەخت بوو (لەترســی ژیان لەزەتم لەژیان نەکرد) هیچ زســتانێک بە ئێستاشــەوە بەکەیفی خۆم گەرم نەبوومەتەوە،لە دوو وڵاتی خاوەن نەوتی بێ شومار!!
هەتــا دەهــات پەیوەندی کۆمەڵایەتیــم لەگەڵ خەڵکی چاکتر دەبــوو، خەڵکێکی زۆرم دەناســی، زۆربەیــان لــە پیاوە چاکەکان بوون و هەندێکیان کۆنە سیاســی بــوون لەحیزبــی تــودەو دیموکرات و کۆنگــرەی چوارو کۆمەڵە. بــەڵام هەندێک کەسی کەمیشم دەناسی خراپ و جاسوس بوون، تەمەنام دەکرد شریت بوونایەو بمســریبوونایەوە، یەکێکی ترم لەســەر تۆمار بکردبوونایە، خۆزگەم دەخواســت هەر نەم ناسیبان.

# عەفوی خەنە

ڕژێمی بەعس ناوە ناوە لێبوردنی دەردەکرد، هەر جارەی کۆمەڵێک لە خۆشەویستان لەریزەکانی پێشمەرگە کەم دەبوونەوە. زۆربەی ئەوانە لەریزەکانی یەکێتی و سۆسیالیست و پارتی بوون، خەڵکی هاولاتیشی تێدابوو، پێشمەرگەی حیزبی شیوعی کەمتر دەچوونەوە. بەڵام ئەوانیشی تێداهەبوو بەگوێرەی خۆی و قەبارەی خۆی. بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، چوونکە زۆربەیان ناسیاو و برادەرمان بوون. جێگای داخە تفەنگی ئەوانەی تەسلیم دەبوونەوە لەلایەن هەندێ بەرپرسی قاچاغچی دەبران بۆ زێوەی مەرگەوەڕ دەفرۆشان، بەتایبەتی بەرپرسانی یەکێتی و سۆسیالیست. وەک ئەوەی بەژیانیان پێویستیان بەچەک نەبێتەوە.

ڕۆژانە گوێمان لە ڕادیۆی بەغدا دەگرت، ناوە.. ناوە، لێبوردنی گشتی دەردەکرد. بەڵام بۆ ئەوەی ویژدانم ئاسودە بێت لە نوسینەکەم، مەکتەبی سیاسی هەموو حیزبەکان پێیان خۆش بوو. ڕێگریان لەکەس نەدەکرد، بگرە دەیان گوت: ئەوەی بتوانێ خۆی بپارێزێ کێشە نییە بگەڕێتەوە. بە تەواوی دەستیان لەسوکانی شۆڕش بەردابوو، وەکو کەشتی چارۆگەدار بەگەردەلولی بسپێری. زۆربەیان ئەو پارەی خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، خواردیان. هەتا گەیشتە چەکی تایبەتی خۆیان و زێڕی ژن و منداڵەکانیان، بە نمونە: برادەرێکی زۆر خۆشەویستم بڕیاریدا بگەڕێتەوە، پێم گوت: من بەو ماشێنە ماڵی خۆم و ماڵی تۆش دەژیێنم مەڕۆ. گوتی: حازم، من کاتێک پێشمەرگەیەکی هاوڕێم لە قاسمەڕەش دێتە پیرانشەهر بۆ لای دکتۆر، نەتوانم فەرموی لێ بکەم، کە لە پێشمەرگایەتی پارووی خۆمان لەزاری یەکتر ناوە، لەیەک مەتارە قومە ئاوی یەکترمان خواردۆتەوە.

بۆیە دەچمەوە، بەعس بشم کوژێ هەر دەڕۆم. خالید غەریب و سەمەد تیکالۆ لە شارۆچکەی شنۆ بوون، لەدوکانی وەستا سەعدوڵای فیتەر، گوتیان: کاک حازم، کەمال دەچێتەوە، تۆش هەوڵی لەگەڵ بدە با تەسلیم نەبێتەوە. منیش بەش بەحاڵی خۆم هەوڵمدا کە تەسلیم نەبێتەوە، بەڵام ئەو دیاربوو بڕیاری کۆتایی

دابــوو، هەر بەدەم گۆرانی گوتنــەوە حاڵی کردم. (گۆرانیەکەی تاهیری خەلیلی باوبــوو، ڕۆژانە دەمــان گوتەوە، کە دەڵــێ: لەقەندیلی ســەربەرزەوە..) کەمال دەیگوت: ( لەقەندیلی ســەربەرزەوە سەدام بشــمگێ دەچمەوە). ئەوەی ڕاستی بێ،کەمــال بازگەی کەرکوک هەولێری تەســلیم بــە یەکێتی کرد بوو لەرابردوودا، زۆر لــە ئەمنــەکان لەو بازگەیە کوژرابوون. نازانم چۆن جورئەتی کرد بچێتەوە!!

هــەر لێبوردنێــک چەند کەســێکمان لێ کەم دەبووەوە، بــەڵام لێبوردنی دوایی لە هەمویــان کاریگەرتــر بــوو، پێش گرتنی کوێــت لەلایەن ســەدامی خوێنرێژەوە. لێبوردنــی (خەنە)ی، ئەو ئیمتیازەی لەگەڵ بوو: هەر کەســێک تەســلیم بێتەوە دەتوانــێ چەنــد بارێک خەنە لە ئێــران لەگەڵ خۆی بەرێتــەوە، کە قازانجەکەی هەتا ســێ هەزار دیناری سویســری دەڕۆیشت. ئەو لێبوردنە خەڵکی زۆر لێ کەم کردینــەوە. لە لێبوردنەکانی تر کاریگەرتر بوو.

بۆیە دەیانگوت: عەفوی خەنەی.

مــن و باوکــم و کاک مەحمــودی حاجی نادرو هەردی لەماڵی ئێمە لەپیرانشــەهر دانیشتبووین. کاک مەحمود و هەردی برام، بڕیاریان دا دوکانی میوە فرۆشی دابنێن. ئەوان لەسیاســەت و پێشــمەرگایەتی زیاتر هیچی تریــان نەدەزانی. دوکانێکیان لەفلکەی سەردەشــت دانا، پێشــمەرگەی هەموو لایەنەکان دەچوونە لایان، بەڵام هەرچی دەچوە لایان، کام شوتی گەورەیە و کام میوە چاکە لە پێشیان دادەنا!! نایلەی هاوسەرم، براژنە بەلقیس، (خێزانی کاک مەحموود) ئەگەر داوای میوەیان دەکرد، کام میوە باشــە هەردی و کاک مەحمــود هەڵیاندەبژارد، وەک لەدوکانی تر میوە بکڕن، نەک دوکانی خۆیان!! ئەو دوکانە، پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان ڕویان تێدەکرد، زیاتر بەبارەگای ســەربازی دەچوو نەک میوەفرۆشــی. ژن هەر نەیدەتوانــی بچــێ میوە بکــڕێ، لەبەر پیــاوان. کاتێک بەخۆیــان زانی لەجیاتی قازانج مایە نەمابوو، میوەی پێ بکڕن. بەناچاری بارەگای بەرەی کوردستانیمان کۆکردەوەو بەرەی کوردســتانی بارەگایەکی کەم بوەوە لە ئێران.

مــادام باســی بــەرەی کوردســتانیم وەبیرهاتەوە، ئــەوەش بڵێم باشــە: بەرەی کوردســتانی کۆبوونەوەیەکی کرد، بڕیاردرا، گومرگ بەم شــێوەیەدابەش بکەن: لە ٣٥٪ بۆ هەریەک لە پارتی و یەکێتی، لە ١٠٪ بۆ حیزبی شــیوعی، لە ٥٪ بۆ هەریەک لە سۆسیالیســت و پارتی گەل.

# ئەحمۆ مرۆیەکی مەزن

ئەوکاتەیماڵمان لە پیرانشەهر بوو، باوکم گوتی: دەچین بۆ ماڵی کاک تەمەر، (لە بادینان دراوسێ بوین، لەگەڵ ئەحمۆ باورکی کە پێشمەرگەیەکی قارەمانی پارتی بوو، هەشت جار بریندار ببوو)، لە بارزان ئابادی شارۆچکەی شنۆن. تەمەر کچێکی سوتاوە با بچین سەرێکیان لێ بدەین. من و باوکم و هەردی و منداڵەکانم و نایلەی هاوسەرم، سواری ماشێن بوین. شارەزای بارزان ئابادبووم لە شنۆ. گەیشتین، بە پرسیار ماڵی تەمەرمان دۆزیەوە، کاتێک بەژوورکەوتین تەمەرو خێزانەکەی شاگەشکە بوون بە بینینی ئێمە، چونکە چەند ساڵێک بوو یەکترمان نەبینیبوو، نەماندەزانی کێ ماوە، کێ شەهید بوە؟!!

تەمەر، بەدوای ئەحمۆ باورکی نارد. ئەحمۆ، باوکمی زۆر خۆشدەویست، بۆیە منداڵێکی ناو نابوو (مام عەلی)، هەر کەسەو چیرۆکی دەربازبوونی خۆمان گێڕایەوە، بەڵام چیرۆکی ئەحمۆ باورکی پێشمەرگە، تراژیدیا بوو. گێڕایەوە: کەهێزی دوژمنیان لێ نزیک بۆتەوە، لەناوچەی بارزان. بەسەر چیای شیرین کەوتوون، لەقەد چیای شیرین منداڵێکی لەبرسان مردوە، لەبەرئەوەی هێزی دوژمن زۆر نزیک بوە، نەپرژابوون بیشارنەوە، تەنها لەژێر بەردان، سەنگەبەردی کردبوو.

پاشان چیای هۆرێ دێت دوای گوندی تێل و شنگێل. گوتی: کە بەچیای هۆرێ هەڵگەڕاین دوژمن گەیشتە چیای شیرین، (واتە بەشوێن پێی ئەوان). لەسەرچیای هۆرێ منداڵی دوەمی دەمرێ لە برسان و ماندوێتی، ئەویش لەژێر بەردان، سەنگەبەرد دەکات. بەڕاستی دڵتەزێن بوو. لێم پرسی: کاک ئەحمۆ ئەو منداڵانە گەورەبوون؟ بە کرمانجی گوتی: (بەلێ، بەرمن دەچونە ڕێکێ)، واتە: لەپێش من دەرۆیشتن. هەزار سڵاو لە ئەحمۆ باورکیەکانی کوردستانی گەورە...

# شیوعی و ژن کڕین

ڕۆژێـک ئەبو تـاراو دایکی تارا، کە پێشـمەرگەی حیزبی شـیوعی بوون، پێیان گوتم: هاوڕێ حازم، حەمە یوسف زۆر هاوڕێیەکی تەنهایە، تەمەنی گەورەیە کەس ژنی ناداتێ، تۆ ماشـێنت هەیە، وا چاکە بچینە شـاری ورمێ، ژنێکی لەناو یەک لـەو هۆزانـەی ئەوێ بۆ بکڕین. (چونکە ئەوکات لەناو ئەو هۆزە ژن دەفرۆشـرا، هەقیان بەسەر تەمەن و خوێندەواری و جوانی و ڕەزامەندی کچەکە نەبوو، کە لە سەر پارەکە پێک هاتن کار تەواوە). هەتا ئێوارە لە ورمێ سوڕاینەوە، مام بەکر سەرسپیشمان لەگەڵ بوو، بەڵام ژنمان بۆ کاک حەمەیوسف دەست نەکەوت. من و ئەبو تاراو دایکی تاراو حەمەیوسـف و مام بەکر، گەڕاینەوە بەدەسـتی خاڵی بـۆ پیرانشـەهر. بڕیارماندا: کـۆڵ نەدەین جاری داهاتوو هەتـا ژنی بۆ نەکڕین، نەگەڕێینەوە. بەڵام لەبەد شانسـی حەمەیوسـف هێنـدەی پێنەچوو، ئەبو تاراو دایکی تارا سـەفەریان کرد بۆ سـوید (ئێسـتا لەوێ نیشـتەجێن). خۆشیەکەی لەوەدایە ئاخر شـیوعی و ژن کڕین؟!! سـێ چوار ناسـیاوم لە ئێران لەگەڵمان بوون، ژنی ئەو هۆزەیان کڕیبوو، زۆر ژنی چاک دەرچوون، ئێستاش لایان ماوە، هەریەک کۆڵێ منداڵی هەیە، زۆر بێ کێشەن. چونکە کە فرۆشان، مافی ئەوەیان نییـە دانەنیشـن لای ئـەو پیاوە، هـی وا هەیە هەر بە سـەفەریش بۆ لای ماڵی باوکی ناچێتەوە. فرۆشراو وەرناگیرێتەوە.

من، هاوڕێ حەمە یوسـفم لە گوێزێ ناسـی، لە بن نسـێی بەردێک دانیشـتبوو، بەدیـار قەفـەزی کەوەکانـی، تالیشـکی دەدانێ، هـەر لەو لای حەمە یوسـف، قاچاغچییەک لەناو تەشـتێک وێسـکی دەدا بە ئەسـپەکەی بۆ ئەوەی سەرخۆش بـێ، کە بارەکەی وێسـکی بوو، گوتم: هاوڕێ ئـەوە لێرە چی ڕوو دەدا؟ هاوڕێ حەمەیوسـف گوتی: لە فسـێیان بەم، بەترێیان هەڵمیزم، ئەسـپی سـەرخۆش دەکەن. کاتێک لەورمێ گەڕاینەوە، گوتم: هاوڕێ حەمەیوسـف ژنێکت هەر دەبێ بـۆ پەیـدا بکەین، حەمەیوسف گوتی: هاوڕێ نەش بێ، کێشـەنییە، لەفسـێی ژنـێ بـەم، گوتم: هاوڕێ، بۆ ناکرێ لەشـوێنێکی تری بەری، لەجیاتی لەفسـێی

بـەری؟!! (بەداخــەوە لەدوای ڕاپەڕیــن بە هەڵە کوژرا لە جیاتــی دوژمندارێک، لەگوندی گرتک سپیانی قەڵادزێ، چوە لای کوڕە تاقانە شەهیدەکەی، بەداخەوە کەسیان نەمان).

## عەبدە خەوە

ئەو ڕۆژانەی جێبێکی لاندرۆڤەرم هەبوو لە ئێران، ڕێگای پیرانشــەهر بە بەفر بۆ ئالوەتان و قاســمەڕەش گیرابوو، ناچار بەلای سەردەشــتدا سەفەرمان دەکرد بۆ قاســمەڕەش. لە گەڕانەوەم لەسەردەشــت بۆ پیرانشــەهر، پیاوێکی پیرو قەڵەو، گۆچانێــک بەدەســتەوە، دیاربــوو ئەویــش عێراقیــە، هاتــە لام. دەیزانی منیش عێراقیم.

چەنــد فیشــەکێکی دەمانچــەی پێبــوو، دە فیشــەکێک دەبوو. لەنــاو پەڕۆکێک گرێیدابــوو، گوتــی: منیــش دێم بــۆ پیرانشــەهر، ماڵم لە نەغەدەیــە، بەڵام ئەو فیشــەکانەم بۆ بشــارەوە. منیش لەبەر موە ســپیەکانی شەرمم کرد، بڵێم: بۆت ناشــارمەوە. لەلای من لە پێشەوە دانیشــت، نەفەرم تەواو نەببوو، سەرخەوێکی قووڵی شــکاند، لە ڕێگا بەســەر شــان و ملی مندا دەکەوت، خەوتبوو بەناچاری بــۆ ئــەوەی بــە خەبەر بێ، هۆڕینم لــێ دەدا، یان ئۆتۆمبێلەکــەم دەجوڵاند بەم لاو ئــەولادا، ڕاســت و چەپم دەکرد، هەڵدەســتا. کەچی هــەرزوو دەخەوتەوە!! بەژیانــم خەوخۆشــی وام نەبینیبــوو، لەمیراوێ لەقاوەخانــەی مەحەمەد لاهوتی ڕامگــرت، یــەک برێکــم گرت خەریک بوو ســەری لە شوشــەکە بچێتــە دەرەوە، بەخەبەرم هێنا. کە دابەزیم قادر شــێرەو چەند برادەرێکی تر لەوێ وەســتابوون، سڵاوم کرد، گوتیان: ها حازم هەولێری بۆ وا تووڕەی؟ گوتم: کاکە توشی بەڵای خــۆم هاتــووم، (ئێمە گوێمان لێببوو، چەند ســاڵ بوو ئەگەر یەکێ زوو بخەوتبا دەیانگــوت: دەڵێــی عەبــدە خەوەیە) گوتــم: کاکە بەزۆری گەیشــتومە میراوێ، پیاوێک لەتەنیشــتم لەپێشــەوە سواربوە، بەهیچ خەبەری نابێتەوە، وەک دەڵێن: دەڵێــی عەبدە خەوەیە!! قادر چوو ســەیری کرد، پێکەنــی و گوتی: کورە ئەوە خۆیەتی. توومەز خۆی عەبدە خەوەی ڕاســتی بوو!!

# گرتنی کوێت

بەیانییەک، نیاز کاکەڕەش لەپیرانشەهر لەفلکەی سەردەشت، هاتە پێش ماشێنەکەم هاواری کرد: ڕایگرە. ڕامگرت، هاتە سەرەوە لەناو ماشێنەکە دانیشت، گوتی: کاک ئەحمەد، نەتزانیوە بزن نانی شوانی خواردوە؟! دوو نەفەرم هەبوو بچم بۆ سەردەشت، خێرا گوتی: کاک ئەحمەد ئەو دوو نەفەرە بدە ماشێنێکی تر، با بڕۆین بۆ دەفتەری پەیوەندیەکان، ئێمە چیتر لێرە نابین. گوتم: چی بوە؟ گوتی: سەدام کوێتی گرت. نەفەرەکانمان دابەزاند، ڕۆیشتین بۆ دەفتەری پەیوەندیەکان. ئەو ڕۆژە هەرچی پێشمەرگەو ئاوارەی ئێران هەبوو، موژدەی بەوی تر دەدا، بەئومێدی ئەوەی سەرکێشی سەدام ببێتە هۆی گەڕانەوەمان. هەریەک بەجۆرێ لێکدانەوەی بۆ دەکرد، من دڵم بە پیرانشەهر ئاوی نەخواردەوە، چووم بۆ نەغەدە. لەوێ شەهید فاقەو کاک بەکرە سورو شەهید کەمال و عەباسی برای و زۆر لەو پێشمەرگانە، هەریەک بەجۆرێ لێکدانەوەو ئەنجامی ئەو هەڵەیەی سەدامی دەکرد. (ئەوەی لە ڕێگەی بەڵگەنامە ڕەسمیەکانم وەک شوناسنامە منی دەناسی، هەر بە ئەحمەد بانگی دەکردم، چونکە من لە پێشمەرگایەتی ناوم بوو بە حازم. هەتا ئێستاش، کاتێک بە ئەحمەد بانگم دەکەن، قوراغ و چاشمیش دەبم) لەیادمە ئەوکات بەکرە سور لێکدانەوەی لەوانی تر چاکتر بوو، گوتیان: حازم تۆ چی دەڵێی؟ گوتم: لەگەڵ بۆچوونەکانی کاک بەکرم. گوتیان: ئەو بۆچوونانەی کاک بەکر شیوعیانەیە بۆیە پێت چاکە.

سەرێکی ماڵی مەحەمەدی حەسەن دەڵگەییم دا، کە لەحیزبی شیوعی بوون، سەری ماڵی کاک سەرۆ قادر و کەریم وەلیم دا، ئەو ڕۆژە دەتگوت ژەهرە ماسیم خواردوە، دەخولامەوە زۆر بێ بەرنامە، دەمویست ئەوەی پێشمەرگەو کادیری هەموو حیزبەکانە بەیەک ڕۆژ هەمویان ببینم و پێشبینییەکانیان بزانم. بەلای بۆنگای مەحەمەد بەربەیاردا سوڕامەوە، مام خورشید شێرەو مام عبدالرحمان حاجی عەلی لەوێ بوون، سەرێکی ماڵی کاک مەهدی مام عەزیزم دا (کە

خەڵکی گوندەکەی خۆمان بوو، ئێستا کارگێری لقی دوە).
ڕۆژانە لە کەناڵە ڕادیۆییەکان دەمانبیست، ئەو هێزە تاڵانچیە چیان بەکوێت دەکرد، بەفەرهود کوێتیان گواستەوە. فەرهەنگی تاڵان زیاتر ڕەگی داکوتا لەعێراق، بەمانای وشە کوێتیان تاڵان کرد. چەندین ساڵە کە (فەرهود) بۆتە ناسنامەی بەعس و نەتەوەپەرستەکانی عەرەب. و ڕۆژانە گوێمان لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن دەگرت، تا بزانین ئەمریکا چی دەکا، لەگەڵ هاوپەیمانەکانی. کە لەکوێت بەرژەوەندیەکانی کەوتبوە بەر هەڕەشە، بۆ ئامادەکردنی پشتگیری زیاتری کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. هەرچی سەدام لە ساڵانی پێشوو بە ئاگاداری ئەمریکا کردبوی هەموی هێنایەوە بەرباس و سەرمێز. لەسەر کوتی برا شیعیەکان و کوشتاری دووجەیل و دەرکردنی کوردە فەیلیەکان، لەسێدارەدانی چەند سەرمایەدارێکی عێراقی و دەستگرتن بەسەر ماڵ و موڵکیان و ئەنفالی کوردان و کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو زۆر لە تاوانەکانی تری سەدام. ئەوکاتە چەند کەسێک بوین لەماڵی ئێمە، گوێمان بۆ ڕادیۆ شل کردبوو، گوتم: بەراستی ئەو زل هێزانە ئێمەیان پێ گەمژەیە، ئەمریکا لەدوای چەند ساڵ کیمیابارانکردنی هەڵەبجە دیارە ئەو دوای نیوەڕۆیە زانیویەتی، گەلێک بەناوی کورد هەیەو سەدام حوسێن جینۆسایدی کردوە!! ئەوکات بۆ ورتە لەدەمیان نەدەهات؟!! ئێستا لەکوێت بەرژەوەندیان کەوتۆتە بەر هەڕەشە، پرس و کەیسی هەڵەبجەیان هاتۆتەوە بیر. کاتی خۆی وەزیری دەرەوەی ڕوسیا هەر نکۆڵی دەکرد هەڵەبجە کیمیاباران کرابێ، فرمێسکی بۆ نەوتی بەسرە دەڕشت.
ڕۆژ بەڕۆژ دەمان ژمارد، ئاخۆ کەی هێزی هاوپەیمانەکان لە ڕژێمی سەدام دێنە دەست؟ ئەوەبوو مۆڵەتیان بۆ دانا کە لە کوێت بکشێتەوە، ئەویش ئەوەندە مەغرور و ملهوڕ بوو، نەدەکشایەوە، ئەو مۆڵەتەی بۆیان دانابوو کۆتایی هات.
دواتر کاتژمێر یەکی شەو لە ١٨/١٧ـ ١ـ ١٩٩١ لەهێزەکانی سەدام درا. هێزی هاوپەیمانەکان لەکوێت لێیاندا، ئەو شەوە تا لێیان دا نەخەوتم، نەمزانی کەی خەوم لێکەوتبوو، بەڵام هەردی برام لە ژوورەکەی خۆی خەوتبوو. کە خەبەرم بووەوە، دنیا تاریک بوو، بەس هەردی لەناو جێگای خۆی نەمابوو، ڕادیۆیەکەی هەر کاری دەکرد، یەکسەر چوو بوو بۆ قاسمەڕەش، ئەو شەوە باوەڕ ناکەم هیچ ئاوارەیەک لە ئێران خەوتبێ. من ماشێنەکەم لێ بەلا بوو، بەیانی ئەوەی

ماشــێنەکەم لــێ کڕیبــوو، چووم بۆم بــردەوە، گوتم: چەنــدم دەدەیتێ خۆت و ویژدانت، پێم فرۆشــت. زۆرم خەرجی لێکردبوو بەڵام هەر بەنرخی پێشوو دامێ. هەرچەندە کەس ڕێنمایی نەدابوینێ، بەڵام دەمانزانی شتێک ڕوودەدا بە قازانجی گەلی کورد وئاوارەکانی ئێران.

# ئێمەش پێشکەوتوین!!

لەســونێ، من و مەحەمەد ئەبو شــوارب، پێشــمەرگەیەکی حیزبــی دیموکراتمان دەناســی، خەڵکی ڕکاوێ بوو، بەداخەوە لەدوای ئەو دیدارە شــەهید بوو. بۆی گێڕامەوە: لەگوێزێ دوو ڕۆژنامەنوســی فەرەنسیان پێ سپاردوە، بۆ لای سونێ. گوتی: دوو نەفەری ســورەی چاوشــین و کەتە زەلام، لەسەر کانی دانیشتین ئاو بخۆینــەوە، دەســت و دەموچاومان بشــۆین. زۆرمان ئارەق کردبــوو، یەکێکیان تڕێکی بەردا!! کەســەیرم کردن هەر خۆشــیان لێ نەکردە خاوەنی، هێندەی پێ نەچوو ئەوەی تر دوو تڕی لەســەر یەک کەند، بێ ئەوەی خۆی شــلوێ بکات!! منیــش بیــرم کردەوە، خوایە ئەگەر منیش تڕێک نەکەنم، تۆ بڵێی بەدواکەوتووم نەزانــن و زیانــی بۆ گەلی کورد نەبێ؟!! بەدەم دەســت شــۆردن لــە کانییەکە، تڕێکی زۆر لەوانم گەورەتر کەندو خۆم نەکردە خاوەنی، بەخاتری ئەوەی نەوەکو بڵێن: کورد دواکەوتوە!! منیش گوتم: ئەگەر تۆش نەبوو بی ڕووداوێکی خۆشە، ســوێندی خوارد کە لەخۆی ڕویداوەو زۆر کەس دەزانێ.

ئەوکاتەی ماشێنم هەبوو، زۆرجار کەلە قاسمەڕەش دەگەڕامەوە، بۆ پیرانشەهر، ئێواران شێتەکانی پیرانشەهرم سواری ماشێن دەکرد، دەورێکی ناو شارم پێ لێ دەدان، دوایــی یەک بەیەک دامدەبەزاندن لە گەڕەکەکانی خۆیان، ڕەســوو قادرو برا تۆفیق و پەروێزو چەندانی تر، بەڵام هەرچی دادەبەزی ئەوانی تر دەیانگوت: ئاغــای ڕاننده، ئەوە زۆر شــێتە جارێکی تر ســواری مەکــە. هەتا تەواو دەبوون هــەر هەمویان ئەوانی تری پێ شــێت بــوو، تەنها لەخۆیان ڕازی بوون، وەک ئەو حیزبانەی باشوری کوردستان.

# ڕاپەڕین

لەچوارقورنە ٣/٤ (حەمەشـێت) ڕێگای ناو شـاری بەسـت بـەڕووی هاتوچۆدا، ئاسـۆی بـرام و خەڵـک و پورزایەکانم، بۆیـان گێڕاینەوە: دەسـتپێکی ڕاپەڕین لـە ڕانییـە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ چەخماخـەی لێدرا. تا هەموو شاروشـارۆچکەکانی گرتەوە. وەکو سەرەتا چەند مەفرەزەیەک بەڕێکران. ئێمە لەگەڵ یەکەم مەفرەزە بەڕێ نەکراین، دوایی کۆبوینەوە لە نۆکان، ئەوانەی مابوینەوە هەندێک لە شنۆو نەغەدەو هەندێک لە پیرانشەهر یەکتریمان گرتەوە، بوینە پازدە کەسێک، لەوانە شـێخ لەتیفم لەیادە. چوینە قاسـمەڕەش بۆ بارەگای حیزب. بەڵام نە تفەنگێکی لێمابـوو، نەکەس ئاراسـتەی کردیـن، چی بکەین. بەرەو سـونێ بەڕێ کەوتین. بەپیـادە هاتینە سـەر ڕێـگای قەڵادزێ، بەرەو خـوار لەلای سـەید ئەحمەدان، سـواری تراکتـۆر بوین بـۆ قەڵادزێ، وێرانـەو کاولکرابوو، هەمـوی ڕوخێنرابوو، دوایی لە قەڵادزێ لەدواوەی پیکابێک سـواربوین بۆ ڕانییە.

لەوێـوە چـووم بۆ چوارقورنە. شـێخ لەتیـف و هەندێک لـەو برادەرانە، چوون بـۆ هەولێـر. مـن پێم باش بوو، ئەگەر بۆ یەک کاتژمێریـش بێت چاوم بە دایکم بکەوێت، ( چوار سـاڵ و نیو بوو نەمبینیبوو، لەماڵی پورزایەکانم بوو لەگەڕەکی بۆڵیان). ئەگەر نا ماڵی دایکم پێ نەدەزانی. هەموو خەڵکیش نەیاندەزانی دایکم خاوەنـی ئەو هەموو کوڕەیەو هەموو پێشـمەرگەن. هەروایان دەزانی پیرەژنێکی بێکەسـەو لای پورزایەکانم بەتایبەتی شـەهید عەزیز گیرسـاوەتەوە. هەرچەندە لەگـەڵ مـەلا ئـاری پورزام نامـە گۆڕینەوەمان هەبـوو، ئەو لە ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵە بوو، ئێسـتاش هەمووجارێک بەچاوی دادەدەمـەوە بۆ پێکەنین، دەڵێم: ئـەو نامانـەی بـۆ منت دەنارد، دەتگوت: مایەی شـانازین کـە خۆڕاگرن، هەزار پێهەڵدانی تر سەری ئێمەت کرد بە قوڕ، نەتهێشت بۆ خۆمان تەسلیم ببینەوە!!

بـا لـە باسـەکەم لا نـەدەم، پێش من هـەردی بـەلای دایکـم دا تێپەڕیبوو. لە گەڕەکی بۆڵیان، پرسیاری ماڵی شەهید عزیزم کرد. منداڵی گەڕەک، چاویان بە

من کەوت، پێشـم کەوتن، من و یەک دوو پێشـمەرگەی تر بە دوایانەوە، لەگەڵ پورزایەکانـم یەکترمان بینی و یەکترمان ماچ کرد، منداڵەکان زانیان منیش یەک لە کوڕەکانی پور بەدیعەم، چەند ماڵێک لەسەرووتربوو، ڕایان کرد گوتیان: پور بەدیعە مزگێنی، کوڕێکی تریشت هاتەوە. هەموو کەسوکاری ناو گەڕەکی بۆڵیان دەوریان لێداین، هەستێکی زۆر خۆشم هەبوو، مۆڵەتم لەدایکم وەرگرت، ئەوکات بەڕێکەوتیـن بۆ هەولێر. کاتێک گەیشـتینە هەولێر، چوین بۆ بارەگای بەتالیۆنی پێنـج، کانەبـی گەورە لەوێ بوو، لە نەقابەی کرێـکاران. ئەوەی لە حەفتاکان و هەشـتاکان نەمانبینیبوو، لە دەوری ئەو بارەگایە بوو.

دەتوانـم بڵێـم: بارەگای هیـچ یەک لە پارتی و یەکێتی هێنـدەی ئەو بارەگایەی حیزبی شـیوعی خەڵکی لێ کۆنەببوەوە، ئەوەی لە دەورانی عەبدولکەریم قاسم، دوو ڕۆژی شیوعیایەتی کردبوو، هاتبوو بۆ ئەوێ. ئەوکاتە حیزبی شیوعی ژمارە بوو، بەڵام بەهۆی ناکارامەیی و کورتبینی و بێ باوەڕی بەخۆیو جەماوەرەکەی، سـەرکردایەتی پەککەوتوی حیزبی شـیوعی، ئەو خەڵکە وردە وردە بەرەڵا کرا. نەیـان توانـی خاوەنـداری لێ بکەن بەرێکخسـتنی بکەن. دابەش بوون بەسـەر حیزبەکانی تر، بەتایبەتی پارتی و یەکێتی، بۆ نمونە: ئەگەر کۆنە شیوعیەکانت لەراگەیاندنی پارتی دەرهێنابا کەم کەسیان دەمایەوە شت بنوسێ، (سەرۆ قادر) بوو بە بەرپرسی ڕاگەیاندنی پارتی، (بەدران ئەحمەد) بەرپرسی دەزگای ئاراس، (کاروان ئاکرەیـی) بەرپرسـی تەلەفزیۆنی کوردسـتان تیڤـی، کاروان ڕەواندزی کاروان عەبدوڵا، گۆران، ئاسـۆکەریم، بەشـدار، مەحەمەد خدر، سەرداروو زۆرانی تر. حیزبی شـیوعی ئێسـتا وای بەسـەرهاتوە ناتوانێ یەک کورسـی پەرلەمانی بەدەسـت بێنێ!! من ئێسـتا پێی دەڵێم: (مەفقەس) جێگای تروکاندنی جوجکە بـۆ حیزبەکانی تر و پارتی و یەکێتی.

لەدەسـتپێکی ڕاپەڕین، باوکم لەگەڵ چەند بەرێزێک ئەندامی بەرەی کوردستانی بـوو لە شـارۆچکەی چوارقوڕنە، دەوری کاریگـەری هەبوو لە ڕاپەڕین و هاندانی خەڵک. لەو ڕۆژگارەدا ئەوەی گرنگی پێ نەدرا: ئەو فایل و ئەوراقانە بوون، کە لەنـاو دامودەزگا داپڵۆسـێنەرەکانی بەعس پەرش و بـڵاو بوونەوە، بۆ ژێر پێی خەڵـک. ئەوانـەی پیاوی بەعس بوون، دیکۆمێنتی ترسـناکیان لـەو فەرمانگانە هەبـوو، دەیان سـوتاند، بۆ ئـەوەی لەناوی ببـەن. ئەو بەرەی کوردسـتانییەم

وەک کۆکردنــەوەی چەند حیزبێکی سیاســی نەدەبینی، بەڵکــو زیاتر بە بەرەی (ســەرۆک عەشــیرەتەکانی کوردستان) تەنها تەماشــاکەری ڕووداوەکان دەچوو، نــەک بڕیــاردەری سیاســی و ڕێکخەری. باوەر بکەن زۆر کــەس لەناو دامودەزگا داپڵۆســێنەرەکانی بەعــس بــەدوای دەمانچەیەک، ســۆپایەک، تەلەفزیۆنێک دا، بەمنیشــەوە دەگەڕایــن، لەکاتێکدا ڕەنگە دە جــاران پێمان لەو فایلانە نابێ، کە یــان باوکــی یان برایەکی لەســەر زانیاری و ناوی هەواڵدەرەکــەی تێدا بێ، کەوا ئەوانی لەســەر لەســێدارە دراوە، واتا بەبێ ئاگایانە فایلی لەســێدارەدانی باوکی بەرپێ دەداو هەڵینەدەگرتەوە!!

لەبیرمە لەچوارقوڕنە و گەلێک شــوێنی تر، بەرەی کوردســتانی بانگەوازی کرد بۆ کۆکردنەوەی فیشــەک و تەقەمەنی و ئازووقە بۆ پێشــمەرگە، کە لەبەرەکانی پێشــەوە لەبەرامبــەر هێزی ڕژێم بــوون، باوکم گوتی: پیرەژنــی وا هەبوو بڕێک فیشــەک یان ئازووقەی بۆ بارەگای بەرەی کوردستانی دەهێنا تەسلیمی دەستی ئێمەی دەکرد. دەیگوت: ڕۆڵە ئەوە کورەکەم لە ڕۆژی ڕاپەڕین هێنابووی. بەڵام لــەو دەرگایــەوە وەردەگیرا، لە دەرگای پشــتەوە دەڕۆیشــت. نازانم بۆ کوێ؟!! باوکــم گوتــی: من واز لەو بەرەیە نەهێنم عەیبدار دەبم. لەزنجیرەی ڕووداوەکانی ڕۆژانی ڕاپەڕین، ئەوەی وەک یادەوەریەکی بەسوێ دەمکولێنێتەوە: مام عومەری باوکــی هەردوو شــەهید (حاجــی بەختیارو مریــەم) لەوکاتــەی زۆربەی خەڵک خەریکــی پاتــاڵ کۆکردنەوە بــوون، مام عومەر خۆی و قازمە و خاکەناســەکەی دەســتی، خەریکی هەڵدانەوەی گۆڕی جگەر گۆشــەکانی بوو کە بەدەســتی ڕژێم لەســێدارە دران. لەئەنجامــی هەڵدانــەوەی چەند گۆڕێک پارچەیەک لە کراســی مریەمی دۆزیبوەوە.

## حازم چاودێری دەکردم

چەنــد ڕۆژێــک بــوو هەولێــر ئــازاد کرابــوو، ١٥/ ٣/ ١٩٩١ ، لەپێــش بارەگای حیزبی شــیوعی، نەقابەی کرێکاران وەســتابوین، لەگەڵ چەند برادەرێکی کۆن، کــە دەمێــک بوو یەکترمان نەبینیبوو. گەنجێکی ڕەش ئەســمەر، من لەهەر کوێ

ڕادەوەستام دەهاتە بەردەمم، زۆر لێی کەوتمە گومان، بۆیە ویستم پێش ئەوەی شتێکم بەرامبەر بکات، ئێمە دەستی لێ بوەشێنین. بەسرتە بە یەکێک لە خزمەکانم گوت: چاودێری ئەو گەنجە بکە، دڵنیام چاودێری من دەکات. ئەویش گوتی: ئەوە نایناسی؟!! گوتم: نەخێر. گوتی: ئەوە حازمی خوارزاتە، کوڕی سافیەی خوشکت، دیاربوو ئەویش گوێی لێ بوو کە من زانیم ئەوە کێیە، ماچم کرد. ئاخر من یازدە ساڵ دەبوو نەمبینیبوو، ئەوکات تەمەنی شەش بۆ حەوت ساڵان دەبوو. گوتی: خاڵە نامناسی؟ گوتم: کوڕم بەخوای نەمناسی. گوتی: هەر دەمویست هەڵێکم بۆ بڕەخسێ پێت بڵێم، بەڵام تۆ هەر لەگەڵ برادەرە دێرینەکانت سەرقاڵ بوی. پێم گوت: ماڵتان لەکوێیە؟ (دەمویست سافیەی خوشکم ببینم) گوتی: ماڵمان لە ئۆردوگای تۆپزاوایە لەسەر ڕێی کەلەک، دوورە با بۆ ڕۆژێکی تر بێ ئێوە ئێستا سەرقاڵن.

# بەشەوێك بوون بە مەلاژن

لە مانگی سێی/ ١٩٩١ لەدوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی خەڵکی باشور و ئازادکردنی شاری هەولێر، هەردی برام و کۆسرەت و هەژار شیوعی و شۆڕش و چەند پێشمەرگەیەکی تر، دوو ئۆتۆمبێلی پڕ لە پێشمەرگە، شەوو ڕۆژیان خستبوە سەریەک، وەک چاوێشە بەدوای ناپاکەکانی وەک مەمۆ و خائینەکان و ئەنفالچیەکاندا دەگەڕان، لەهەولێر و دەوروبەری. کاتێک لەگەڕەکی (گوێ مەدەێ)ی هەولێر، کۆسرەت دەڵێ: هەردی ئەوە ماڵی خوشکتە، بۆ سڵاوێکیان لێناکەی؟ هەردیش دەڵێ: کامەیانە؟ کۆسرەت دەڵێ: زولێخا. هەردی دەڵێ: باشە بەڵام بەشەرتێک کەس نەڵێ ئەوە هەردی براتە.

ئەوە دە ساڵە نەمدیوە، بزانن دەمناسێتەوە؟!!

کاتێک ئەو هەموو چەکدارە وە ژوور دەکەون، مامۆژنم (ڕوقیا)ش لەوێ دەبێ، لەدوای سڵاوکردن، بەگومانەوە سەیری پەنا دەرگا و بن سندوق و پەنا پەردە دەکەن، وەک لە گومانلێکراوێک وەیا تاوانبارێک بگەڕێن. مامۆژنم دەڵێ: کوڕم ئەوە لەچی دەگەڕێن، ئێمە کاسبی ماڵی خۆمانین؟!! زولێخای خوشکم دەڵێ:

کاکە ئێوە ڕەنگە بەهەڵە هاتبنە ماڵی ئێمە. هەردیش دەڵێ: نەخێر زۆر دروستە، هاتوینە ئەو ماڵەی کە بۆمان دەست نیشان کراوە، ئێوە خۆفرۆشن پیاوی بەعسن. کوا پیاوت لە کوێیە ئەو خائینە؟ زولێخای خوشکم دەکەوێتە پاڕانەوە، دەڵێ: کاکە بەخوای ئێمە ئەوە چەند ساڵە لەبەر ڕژێمی بەعس خۆمان دەشارینەوە، چونکە کەسوکارم هەموو پێشمەرگەن. برای بەڕێز، ئەتۆ من ناناسی. من، باوکم و چوار برا و پێنج ئامۆزام پێشمەرگەن، دوو برام شەهیدە، جگە لە مامەکانم و ئامۆزای ئەنفالم، ئەوە دە ساڵە باوک و براو ئامۆزاکانم نەمبینیوە. هەردی دەڵێ: ئەوە هەموی بۆ فریودانی ئێمەیە، ئەگەر کەسوکارت پێشمەرگەبوونایە ئێستا یەکیان لێرە دەبوو!! ئەو قسانە نایخوا هەر من دەزانم چۆن تەمێتان دەکەم.

کۆسرەت و هەژار چیتر بەرگەی ئازاردانی زولێخا ناگرن، پێی دەڵێن: قسەکانت هەموی ڕاستن بەلام یەک لە براکانت لەو ژوورە لەگەڵ ئێمەیە بزانین دەیناسیەوە؟ ئەویش بەپەلە خولێک بەچاوی لێدەدا، لەگەڵ پرمەی گریان پەلاماری کۆسرەت دەدا و لە ئامێزی دەگرێ، دەکەوێتە ماچکردن و بۆنکردنی دەڵێ: بە قوربانت بم سەلیم (ئاسۆ) دە ساڵە نەمبینیوی بویتە پێشمەرگەیەکی چەند جوان. پێشمەرگەکان دەڵێن: بەخوای ئەوە برای تۆ نییە، (زولەیخا ناهەق نەبوو چونکە شەهید کۆسرەت ڕوخساری لە ئاسۆی برام دەچوو) ئاماژە بۆ هەردی دەکەن، ئەو جارەیان هەردی ماچ دەکات دەڵێ: ئیسماعیل ( هەردی) بە قوربانت بم، پاشان بردەران دەڵێن: هەردی دەستت کەشف بوو، ئەوە چەند ساڵە چما ئیسماعیلی خۆت لە ئێمە کردۆتە هەردی؟!! ئەو ناوە مۆدێرنە کوردیەت لەخۆت ناوە!!

مەلا چەندان ساڵ دەخوێنێ لەدوای ماندووبوونێکی زۆر مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرێ، ئەوکاتە پێی دەگوترێ مەلا. بەڵام ژن لەدوای یەک شەو خەوتن لەگەڵ مەلا، بۆ بەیانی بێ ماندوبوون ڕاستەوخۆ دەبێتە مەلاژن. لێرەش هەر لەدوای ڕاپەڕین، بە قودرەتی قادر، ئەو هەموو ئەنفالچی و خائین و خۆفرۆشانە ڕاستەوخۆ بوون بە پێشمەرگە!!.

# ئەوە منم تەرمی تۆ دەبینم؟!

لەگەڵ هەردی برام و شەهید کۆسرەت و یەحیا، هاوڕێ ئەبو فاروقمان برد بۆ کەرکوک. گەیشتینە ڕەحیماوە، لاشەی ئەو هەموو ئەمن و پیاوانەی بەعس لەسەر ئەو شەقامانە کەوتبوو. لەبارەگای هاوڕێ سەعدون (یادی بەخێر، پاش ٢٠٠٣ لەبەغدا بەدەستی تیرۆریستان شەهیدکرا)، کە ئەو ڕۆژە گولەیەکی بە قۆڵی کەوتبوو، بریندابوو، بەلام ئامادە نەبوو دابنیشێ. لە بارەگا بەخێرهاتنی کردین، ئەبو فاروقمان تەسلیمی سەعدون کرد. لەسەرجادە چەند تەرمێک کەوتبوو یەکێکیان پەتێکی بە پایەوە بوو، کابرایەکی پیر هات، نایلۆنێکی بەدەستەوە بوو، تەماتەی کریبوو بۆ ماڵەوە، ئەو پیاوە پیرە دووجار لەدەوری ئەو تەرمە سورایەوە، چاوەڕوانی ئەوەبووم وەک پیرێکی بە بەزەیی لۆمەی پێشمەرگە بکات. بەڵام بە پێچەوانەوە قەت لەیادم ناچێ، ڕوی لە ئاسمان کرد، سوپاسی خوای کردو دەست خۆشی لە پێشمەرگە کرد، گوتی: شوکر بۆ خوا ئەوە منم تەرمی تۆ لەژێر پێی کوڕە کوردان دەبینم؟!! منیش لێم پرسی: مامە ئەوە دەناسی ؟ گوتی: جا کوڕم خەڵکی ڕەحیماوە هەیە ئەو تاوانبارە نەگریسە نەناسێ؟ بۆ کەس خاوەن ناموسی خۆی بوو لەدەست ئەو سەگە پیسە؟!! دیارە ئەو پیاوە پیرە، پێی وابوو پێشمەرگە زیادەڕۆیی لە بەسزا گەیاندنی ئەو تاوانبارە نەکردووە، بەڵام لە گرتنی شاری کۆیە، هەردی و قەندیل و بەشداری برازای هاوڕێ کەریم احمد و دڵشادی لقی کۆیە و وەستا جەوهەر و گەنجێکی شاری کۆیە. کە چووبوونە ناو شاری کۆیە، لە نزیک گردی (قەمبەرگاوان) لەسەر شارێگەی کۆیە هەولێر، ئیڤایەکی سوپای عێراقی، بەرەو ناوشاری کۆیە دێت. ئەفسەرێک و سەربازێکی تێدابووە، کە دەستڕێژی گولەی لێدەکەن، ئەفسەرەکە دەکوژن و سەربازەکە بریندار دەبێت. وەستا جەوهەر، دەمانچە لە قەدی ئەفسەرەکە دەکاتەوە. سەربازە برینندارەکە دەڵێت: دوور بکەونەوە، بارەکەمان فیشەک و تەقەمەنییە. لە سەربازگەی موسڵ بارمان کردووە، لەو کاتەی لە موسڵ بەڕێکەوتووین، ئەو ئەفسەرەی کوشتتان، هەرچی جنێوو قسەی ناشیرین هەیە، بە سەدام و بە ڕژێمەکەی گوتوە، تا ئێوە دەستڕێژی گوللەتان لێکردین. لە ئیڤایەکە دوور دەکەونەوە، ئیڤاکە گڕ دەگرێت. وەک برێشکە دەست بە تەقینەوە دەکات، هەردی گوتی: لە خوار گردی قەمبەرگاوان، بیست

و پێنج جاش ،بەرەو گوندی هەرمۆتە هەڵدەهاتن، تەقەمان لێکردن، خەڵکی کۆیە گوتیان: ئەوە قاسم ئاغا بوو، لەگەڵ جاشەکانی هەڵدەهات. ئەوەی ڕاستی بێت، لە ڕاپەڕین زۆر کەس کوژرا، گوناهەکانی بارتەقای ئەوە نەبوو لەسەری بکوژرێت، لە هەمان کات، خەڵکێک داڵدە دراو و دەربازیش بوو، گوناهەکانی بای ئەوە بوو دە جار لەسەری بکوژرێت. لە کەرکوکی مامەڕیشەو شێخ عەلی بەرزنجی و ئەرپاو سەدان شەهیدی گومناو.

ئەو ڕۆژە بەبێ جیاوازی هەر دەستە چەکدارێکی کوردم دەبینی، فرمێسکی شادی بەچاوەکانم دەهاتە خوارەوە. ئۆخەی ئەوە کوردە کەرکوکی گێڕاوەتەوە باوەشی کوردستان، ئەگەر بشکوژرێین هیچ نییە. ڕۆیشتین بۆ لای خاسە، دوو پێشمەرگەی ڕیشدار کە دیاربوو برایانی ئیسلامی بوون، سۆندەیەکی ئاویان دوولا کردبوەوە، لە ئۆتۆمبێلێکی ئۆزمۆبیلیان ( شۆفرلێت) خستبوو. دوو دەمانچەی چواردە خۆرم دەست کەوتبوو، ئەو ڕۆژە وتیان: یەکێ لەو دەمانچانەمان بدەیێ ئەو ئۆتۆمبیلە نوێیەت دەدەینێ، من ڕازی نەبووم. پێم وابوو هەرچی دەست کەوتوو ئۆتۆمبێلە بەرەی کوردستانی کۆی دەکاتەوە، بەسەر داموودەزگاکانی حکومەت دابەشی دەکاتەوە، نەمزانی هەر بابایە بۆخۆی دەیبا، لێپێچینەوە ناکرێ لەگەڵ کەس. بەزۆری شەهید کۆسرەت دوو تایەی نوێی بۆ ئۆتۆمبێلەکەی بارەگا هێنا،کە هاتین شەهید وەستا یونس کە پێشمەرگەیەکی قارەمانی پارتی بوو لە مەنتکاوە وەستابوو، ئێمەی بینی چاک و چۆنیمان کرد، گوتی: بڕۆن. بەشەهید کۆسرەتم گوت: بریا ئەو دوو تایەت نەهێنابایە، من وامدەزانی عەیبێکی زۆر گەورەمان کردوە، بەراستی زۆر بە پێچەوانە لەبەرەی کوردستانی تێگەیشتبووم.

## هەردی برام بەسەختی بریندار بوو

گەڕاینەوە هەولێر، بە باوکم و هەردیم گوت: من دەگەڕێمەوە ئێران، ماڵەکەم دەفرۆشم و منداڵەکانم دێنمەوە. کە چوومەوە دیوی ئێران، شارۆچکەی پیرانشەهر، دوای دوو سێ ڕۆژ گوتیان: هێزەکانی سەدام هێرشیان کردوە بۆ کەرکوک و داگیریان کردۆتەوە. دیاربوو ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ سەدام

هەڵکردبـوو، بۆیە دەسـتم ڕاگـرت لەهێنانەوەی ماڵەکـەم و منداڵەکانم. چونکە پێیان ڕاگەیاندم: هەردی برام زۆر بە سەختی برینداربوە. باران بەخوڕ دەباری، لە خیابانی ئیمام لە پیرانشـەهر کولێرە فرۆشـێکی لێبوو، ناوی مەشهەدی وەلی بـوو، نیـو فـەردە کولێرەم کڕی، لەپشـتی خۆم هەڵدا بۆ حاجـی ئۆمەران. کە گەیشـتمە حاجـی ئۆمـەران، دەتگوت ڕۆژی حەشـرە، ئەوخەڵکـە هەموی لەناو سـیمی سـنورو دەرەوەی کۆبۆتـەوە. گەیشـتمە ئەودیوی سـنوور، بینیم یەک خەرمـان تفەنـگ و ڕەختی لـێ هەڵدراوەتەوە. گەڕام بۆ ئـەوەی ڕەختەیەک پڕ فیشـەک بـێ و بە پشـتم بکات، تفەنگێک و ڕەختێکم دەسـت دایـە. یەکێک لە چەکـدارەکان بانگی کرد: ئەوە بۆ دەسـتکاری ئـەو چەکانە دەکەی؟ منیش پێم گـوت: تفەنگێـک دەبەم. گوتی: نابی. پێم گوت: ئەوە مـن دەیبەم، تۆ مەهێڵە خەڵـک بەرەو ئێـران ڕا بکا. من بەرەو ناوەوە دەڕۆم برام بەسـەختی بریندارە، دەچـم دەربازی دەکـەم. دیاربوو بەرپرسـی کۆکردنەوەی چەکەکانـو دزینیان، منی دەناسـی، لە پێشـمەرگەکەی خوڕی، گوتی: لێی گەڕێ ئەوە هاوڕێ حازمە پێشـمەرگەیە هەرچـی دەیـەوێ با بیبا. گوتـم: تەنها ئەو تفەنگـەو ئەو ڕەختە بـە پشـتم دەکا دەیبەم. ڕۆیشـتم بەرەو خـوار، لەڕێگا لای ئـازادی، هەڵکەوت م لەگـەڵ ماڵ و منداڵەکەی بینی (هاوڕێی خۆشەویسـتی پێشـمەرگایەتیم بوو)، یەکتریمـان لەئامێـز گرت، گوتم: هـەردی برام چۆنە؟ مـاوە؟ لەکوێیە؟ گوتی: سەلامەتە هەردوو قاچی گوللەی بیکەیسی پێکەوتوە، بەڵام لە زمان درێژی خۆی نەکەوتـوە. گوتم: برسـیتان نییە؟ گوتی: نەخێر، بـەڵام لەدەموچاوی کچەکانم خوێنـدەوە کـە زۆریان برسـیە، چونکە هەڵکەوت زۆر شـەرم بەخـۆو بەحیرس بـوو، نەیگـوت: برسـیمانە. منیش چەنـد کولێرەیەکم دانێ، گوتـم: مەیدەن بە هەڵکـەوت، چونکـە دەڵێ برسـیمان نییە. خۆم بـە ئۆتۆمبێلێکی سـەلاحەدین هەڵواسـی هەتـا دیانا. ئەو کـۆڕەوە ملیۆنییەی گەلی کورد هەسـتی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی جوڵاند. ئەوەبوو لەدوای بەرگری و شـەڕی کۆڕێ، بەعس نەیتوانی لەهەندێک شـارو ناوچـە کوردیـەکان بمێنێتەوە، بەناچاری پاشەکشـەی کرد و هێزەکانی بەرەی کوردسـتانی شوێنیان گرتەوە.

کەلە هەردی برام دڵنیا بووم شەهید نەبوە، بەڕێکراوە بۆ چارەسەر لەئێران، لەبەر دایکم و باوکم چووم بۆ چوارقوڕنە. کە گەیشتم خەڵکێکی کەم لەچوارقوڕنە مابوو،

لەگەڵ کۆڕەوەکە ڕۆیشتبوون، من و پورزایەکانم و دایکم و باوکم و ئاسۆی برام ڕۆیشــتین بۆ قەســریێ، بەدوو ڕۆژ گەیشتین بۆ قەسریێ. هێندە ئۆتۆمبێل لە ڕێگا زۆر بــوو، جاری واهەبــوو بەدوو کاتژمێر، یەک مەتر دەچوینە پێش. بەهەرحاڵ، باوکم و پورزایەکانم لەقەســریێ بەجێهێشت، ئامۆزایەکم بەناوی جەمیلە لەهەولێر هەڵاتبوون، لەگەڵ کافیەی هاوسەری مەحمودی مام سەلیم، لەڕێگای کۆیە ژانی منداڵبوونــی هاتبــویێ، تەنها دوو ژن بەتەنیا بەو شــەوە، منداڵەکەی ببوو، هیچ جلوبــەرگ نەبوو لەبــەری بکەن، کافیە چووبوو، هەندێک ئۆتۆمبێل لەقەراغ ڕێگا پەکیان کەوتبوو خاوەنەکانیان بەجێیان هێشــتبوو، بەرگە کوشــنەکانی دڕاندبوو هێنابــوی بــۆ منداڵەکە، هەر ئەم شــەوە منداڵەکەیان پێچابــوە وەو ملی ڕێگای کۆیەیان گرتبوو، مەڕومالاتی بەجێماوی دۆشی بوو بۆئەوەی بیدات بە کۆرپەکە. نازانم چ خێرخوازێ ســواری ئۆتۆمبێلی کردبوون، هەتا چوارقوڕنە. ئێســتا ئەو منداڵە تەمەنی (٢٧) ســاڵە، ناوی داســتانە. جەمیلەو کافیەشمان لەگەڵ بوون بــۆ قەســریێ، من گوتم: دەچمەوە دیــوی ئێران هەندێک ئاردوو شــتومەکتان بۆ دەنێرم. ڕەســوی پورزام گوتی: من دێم لەگەڵت، ئەوەبوو شــێخەو ڕەسو لەگەڵم هاتــن، هەندێک ئاردوو شــتومەکی پێویســتیان هێنا بۆ قەســریێ، منیش گوتم: دەچم چارەسەری هەردی برام دەکەم.

لــە دوای دوو ڕۆژ گــەڕان و ســوڕان بە نەخۆشــخانەکانی ورمــێ، گوتیان: کاتی جەنگــی عێراقــ ئێــران قوتابخانەیەکیان کردوە بە نەخۆشــخانە، لەنزیک ورمێ. ماشــێنێکم گرت بۆ ئەوێ، نەخۆشــخانەکەم دۆزیەوە، هەردی چاوی بە من کەوت شاگەشکە بوو، قەتم هەردی ئاوا بەو هەژاریە نەبینیبوو، زۆرم پێ ناخۆش بوو، گوتی: حازم، بەس نەجاتم بدە لێرە با هەردوو قاچم نەبڕنەوە. برایەکی ڕەسوو ئەحمەدی برایم هێرۆیش لەوێ بریندار بوو، ناوی مەحەمەد بوو، باش بوو دکتۆری ســەرەکی لەوێ نەبوو، ئەگەر نا قەتیان مۆڵەت پێ نەدەدام هەردی لەگەڵ خۆم بەرمــەوە. چوومــە لای کارمەندەکان، گوتیــان: نابێ ئەوە برینــدارە چۆن هەتا دکتۆر دەری نەکا لە نەخۆشــخانە بڕوا؟!! چوومەلای بەڕێوەبەری پەرستارەکان، گوتــی: عێراقــی؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئەی فارســی چــۆن دەزانی؟ گوتم: ئەوە چەند ســاڵێکە ماڵم لە پیرانشــەهرە. تەماشــای کاتژمێرەکەی دەستی دەکردم، گوتــی: ئەو کاتژمێرەت لەکوێ کڕیوە؟ منیش لە دەســتم کردەوە گوتم: فەرموو

ئاغا قابیلی نییە. برێک سـەیری ئەولاوئەولای کرد گوتی: نابی. گوتم: ئیمکانی نییـە لێـم وەرنەگـری نیگەران دەبم. زوو خسـتیە گیرفانی. من ئاسـودە بووم، دەستی کرد بە نوسینی مەرەخەسی هەردی، بەڵام گوتی: لەسەر بەرپرسیارێتی خـۆت دەبـێ وا ژۆی بکـەی. هەردیش واژۆی بکات، هەرچـی زوە واژۆمان کرد. گوتـی: با دکتۆر نەیەتەوە کێشـەتان بۆ دروسـت بـکات. کاخەزەکەم وەرگرت، هەردیان لەگەڵ هەڵگرتم بۆ ناو ماشێنەکە، کە چاوەڕوانی دەکردم لەبەر دەرگا، کاتێک هەردیمان خسـتە ناو ماشـێنەکە، پەرسـتارێک بەراکردن دەهات، گوتی: بوەستن. گوتم: چی بوە؟ گوتی: ئەو کراسەی بیمارستان دەبێ لەبەر بکاتەوە. هەرچەنـدی گوتم: چەندتان پـارە دەوێ با بەڕوتی نەخۆش نەبێ، بەڵام هەردی هەر زوو کراسـەکەی لەبـەر خۆی داکەند، دایە پەرسـتارەکە، بەرووتی مایەوە، تەنها یەک شـۆرتی لەبەربوو. شـۆفێرەکە هەندێک پەڕۆپاڵـی پێبوو، گوتی: ها لە خۆتی وەربگرە، بەو شـێوەیە شـەو گەیشـتینەوە پیرانشـەهر. بەیانی بردم بـۆ مەهابـاد، لای ماڵـی کاک مەحمود چیرە (بـرادەری زۆر خۆشەویسـتمانە) لەگـەڵ کاک مەحمود چوین بۆ بیمارسـتانی گەورەی مەهابـاد. دیار بوو هەموو دکتۆرەکانی دەناسـی، بۆیان دەرمان کرد، لە گەچیان گرت. دوو شـەقرەی بن پیلمـان بۆ کڕی، لەگەڵ کراسـێکی شـۆڕ، ئەو شـەوە لای ماڵـی کاک مەحمود ماینەوە.

دوای ماوەیـەک هاتوچـۆی دکتۆرو میوانـداری، لەبەر بریـنـداری هەردی ئەوەی ئێمـەی دەناسـی دەهاتە لامان، چـووم بۆ نەغەدە ماڵی کاک سـەرۆ قادر، مام قـادری حیزبـی شـیوعی و چەنـد هاوڕێیەکی تر لـەوێ بوون، هەڵـە نەبم مەلا حەسـەنیش لەوێ بوو، کاک سـەرۆ قادر گوتی: حازم بەخۆی هەردی چارەسەر کـردوە پارەی دکتۆرو مەسـرەفی بـۆ ڕەت بکەنەوە. هاوڕێیان گوتیان: شـتێک بنوسـە چیتان خەرج کردوە، وە پێویستی بە چ هەیە. منیش نوسیم، قاتێکیشم نوسـیبوو کـە بۆی بە دروین بـدەم، هاوڕێیان گوتیان: ئـەی قاتەکەی خۆی؟!! منیـش پێکەنیـم گوتـم: لەکاتـی برینداربوونی لەو شـوێنەی دکتـۆر برینەکانی پێچـاوە، لـەوێ بەجـێ ماوە، ئاخـر قاتێک گوللەی بیکەیسـی پـێ بکەوێ، لە قوشـتەپە هەتـا هەولێر خوێنی پێدا برژێ کـوا بەکەڵک دەمێنێت؟!! زۆریان لێ

پەســت بووم، بەڵام ڕەچاوی تەمەن و برادەرایەتــی باوکم بێدەنگی کردم. بەس کاک ســەرۆ قــادر زۆری لەگەڵ گوتن: عەیب نییە ئاوا بــە هاوڕێ حازم دەڵێن؟ گەڕامەوە پیرانشــەهر، بەهەردیــم گوت: قاتەکەت لەکوێ فڕێــداوە حیزب داوای دەکاتــەوە!! گوتــی: خۆ قاتی خۆم بوو بە پارەی حیزب نەکڕابوو، ماوەیەک بوو بە هەردیم ڕادەبوارد، ناوە.. ناوە، دەمگوت: ئەوە دیسان داوای ئەو کۆنە قاتەی دەکەنەوە.

دوای ماوەیــەک هەردی تەندروســتی باشــتر بــوو، ئارامی نەما بــوو، دەیگوت: دەچمــەوە بــارەگای حیــزب، هەردیمــان بــردەوە چوینە بــارەگا لە شــەقڵاوە، بەتالیۆنــی پێنج، شــەهید کۆســرەت لەوێ بوو. هەردی بە شــەهید کۆســرەتی گوتبــو: ئۆتۆمبێلەکانمــان لەکوێن پیاســەیەکی پێ بکەین؟ کۆســرەت گوتبوی: هەردوو ئۆتۆمبێلەکانیان فرۆشتوە. هەر بە بیستنی ئەو فرۆشتنە هەردی هەزارو یەک جنێوی ناشیرینی پێدابوون، گوایە ئەوانیش گوتویانە: بۆ ماڵە شەهیدانمان فرۆشــتوە، ئاخر ئێمەش خاوەنی پێنج شــەهید بوین، خۆ دەبوو ئەو شەهیدانەی ئێمــەش شــتێکیان بەرکەوتبایە؟!! بەڵام ڕاســتیان نەدەکرد، تەنهــا بۆ بێدەنگ کردنی هەردی بوو، لەوکاتە باوکم ناوی حەفتاکەســی لە خزم و برادەرانی خۆی لە شــیوعیە کۆنەکان نوســیبوو، بۆئەوەی هێزێک لە قوشــتەپە بکاتەوە. گوتی: وەرە بابچینە شــەقڵاوە، لای هاوڕێیان بۆ ئەو مەســەلەیە، منیش لەگەڵی چووم. هــاوڕێ مام قادرو مەلا حەســەن لەوێ بوون، باوکم بەنوســراو بــۆی ناردبوون، بۆیە گوتیان: مام عەلی پێشــنیارەکەت باشــە، بەس ئیمە چەکدار کۆناکەینەوە، ئەوانــەی خۆمــان لێ زیــادە، دەمانەوێ کەمیان بکەینــەوە. باوکم زۆر توڕەبوو، گوتــی: ئێــوە قەت بــە تەمای گەورەبــوون نین، هــەر بچوک دەبنــەوە. منیش گوتــم: بــۆ ئــەو کەمکردنەوەیــە یەکــەم کەس من بنوســن، من لەمێژە دەســتم لەئێوە شــۆردوە، بەلام ئەوکات دەیانگوت: پێشــمەرگایەتی پێ ناکرێ، ئێســتا کــە هەموو شــت تەواو بوە، منیش وەک فکرە لەگــەڵ خوێنمدایە، بەڵام بەژیانم لەگەڵ ئێوە کار ناکەم، بۆیە لەو ڕۆژەوە من نە لەگەڵ حیزبی شیوعی نە لەگەڵ هیچ ڕێکخراوێکی سیاســی پەیوەندی ڕێکخســتنم نییەو نەبوەو لەئایندەش باوەڕ ناکــەم هەمبێ. باوکــم گوتی: با بڕۆین. لەڕێگا گوتی: کوڕم هەتا دونیا دونیایە، کــە گوتت: حیزبی شــیوعی، واتە: ماڵی حاجی تاهیر، کــە گوتت: ماڵی حاجی

تاهیر، واتە: حیزبی شیوعی.. تازە لێمان نابێتەوە. گوتی: کورم چی بکەم، لەو باشورە کەسی لەوانە باشتر نادۆزمەوە، ئەگەر نا یەک ڕۆژ کارم لەگەڵ نەدەکردن، ناچارم دەبێ ڕایکێشم.

# دەرەنجامی کۆڕەو و بەرگری کۆڕێ

پێش سەردانەکەمان لەکاتی کۆڕەوەکەدا، ئەوەبوو هێزەکانی ڕژێم گەیشتنە کۆڕێ. لە شەقڵاوە هاوڕێ کەریم و مەلا حەسەن بەوردی باسی شەڕی کۆڕێیان بۆ گێڕاینەوە. (وەک هاوڕێ کەریم ئەحمەد لە کتێبی (ڕێڕەوی تێکۆشان) لاپەرە (٣٣٤) سێسەدو سی و چوار، باسی دەکات) دوایی بە ئامادەبوونی هاوڕێ کانەبی و باوکم، پێش نوسینی کتێبەکە لە شەقڵاوە گێڕایەوە: هاوڕێ کەریم دەچێتە لای ڕەسوڵ مامەند، پێی دەڵێ: بڕیاری بەرگریمان داوە، وەک بەرەی کوردستانی، ئێوە چەند پێشمەرگەتان هەیە بۆ بەرگری کردن؟ دەڵێ: هەشتا پێشمەرگە. هاوڕێ کەریم دەڵێ: ئێمەش شەست پێشمەرگەمان ئامادەیە، کانەبی گەورە فەرماندەییان دەکات. دەچێتە لای کاک مەسعود، لێی دەپرسێ: چەند پێشمەرگەی پارتی ئامادەیە؟ کاک مەسعود لە وەڵامدا دەڵێ: دوازدە پێشمەرگەم لەگەڵە، بەڵام ئەگەر بچینە شەڕ، کەسم لەگەڵ نامێنێ، بەتەنها دەمێنمەوە، هەر هەمویان بەجێم دەهێڵن. ئەوەبوو هێزەکانی بەرەی کوردستانی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی بزوتنەوەی ئیسلامی، هێرشی ڕژێمیان ڕاگرت. بە سوتاندنی چەند تانک و ئۆتۆمبێلی ڕژێم لەنێوان حوجران و شەقڵاوە. لەدوای کۆڕەوە ملیۆنییەکە، ڕژێمی بەعس نەیتوانی لەهەولێرو سلێمانی فەرمانڕەوایەتی بکات، کشایەوە بۆ شێراوەو پردێ و لەلای سلێمانیش بۆ بانی مەقان، بەو شێوەیە فەرمانڕەوایەتی کەوتەوە دەستی هێزە کوردستانییەکان، بەتایبەتی پارتی و یەکێتی. دیاربوو ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی ڕێگایان دا سەدام، بە هەلیکۆپتەرو دەبابە بمانکوژێ، بەڵام بە فڕۆکەی جەنگی قەدەغەیە بمانکوژێ؟ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی خەتی (٣٦) سی وشەشیان دانا بۆ پارێزگاری کورد، بەناوی ناوچەی دژە فڕین.

لــە ١٩٩٢/٥/١٩ هەڵبژاردنــی یەکــەم خولی پەرلەمانی کوردســتان بەریوەچوو، بڕیاریانــدا: هەر حیزبێک لەســەدا حــەوت نەهێنێ، نابێ بەشــداری لە حکومەت بــکات. دواتر هەردوو حیزبی فەرمانڕەوا، کەوتنە ڕاکێشــانی حیزبە بچوکەکان و هەندێک حیزبی تری شاگرد ئۆغڵانیشیان دروست کرد. وەک مریشک هەر لایە و چەند جوجکەی لەبەربوو بۆ گەرمکردنی دیوەخانەکانیان. ســکرتێری وەهام پێ شک دێت، لە مۆبایل نازانێ!! سکرتێری وا هەیە، هەتا چەند چەک و جبەخانەی لەماڵەوەیەتــی بەگــەل وگیپاڵی خۆیەوە نەکات، وێنە ناگرێ !! ســکرتێر هەیە، بــەس خــۆی نییە!! ســکرتێری وا هەیــە، ژن و منداڵەکەی دەنگــی پێ نادات!! وایان لەو باشــوری کوردســتانە کردوە، بوون بە سکرتێر زۆر لە پیشەی فیتەری ئاســانترە. ســکرتێری وا هەیــە، ڕۆژ تا ئێــوارە بەدوای......یــە، دەجار بانگی بکەی هۆشــی تــۆی نییە، مەگەر جامانەی بۆ ڕاوەشــێنی، هەتــا دەنگت تێدایە بانگــی بکــەی لەدوای......بکەیتەوە. جا لەوەی خۆشــتر هەمویــان ئۆتۆمبێلی نمرە یەکیان بۆ دەکڕن لەســەر قووتی ئەو خەڵکە هەژارە. هیچ دوژمنێکی کورد نەیتوانیوە کۆمەڵگای کوردی ئاوا ســەقەت بکات.

## باش بوو شاخەکانی کوردستان تایەیان لەژێر نەبوو

دەســتپێکی تاڵان کردن و ئاودیوکردنی کوردستان بۆ ئێران.

لەهاوڕێ مەلا حەســەنم بیســت، یەکەمجار کە ئەو شەریکەی سەدی بێخمە، کاک مەسعودو مام جەلال فرۆشتویانە بەماڵی عومەرو حوسێن ئاغای سورچی، بەڕێی بــکات بــۆ ئێران بەیەک ملیــۆن دیناری سویســری، نیوەی بۆ پارتــی و نیوەی تــری بۆ یەکێتــی، ئەوەبوو ئەوانیش گواســتیانەوە بۆ ئێران، نیــوەی مەکائینی کوردستانیان لەگەڵی ئاودیوکرد. بێخمە ئاوی شیرینی کوردستانی دابین دەکرد. دوایی شــاری یاری کە ئەوکات گەورەترین شــاری یاری کوردســتان بوو لەســەر ڕێگای عەنکاوە، فرۆشتیانە ئێران، ئەوەبوو بۆ ماوەی دوو هەفتە خەڵکی چۆمان ڕێگایــان نــەدا ئاودیوی بکەن. دوایی هەر ئاودیویان کرد. باوەڕ بکەن ئەگەر ئەو چیایانــەی کوردســتان تایەیــان هەبوایە یەک چیاش نەدەمــا، هەموو چیاکانیان

دەفرۆشتە ئێران، بە خەڵکیان دەگوت: ژیانی بیابان خۆشترە لەناو ئەو شاخانە کـە بەرچـاوی ئێوەیان گرتوە، بـۆ خۆشـگوزەرانی و دواڕۆژی منداڵەکانتان ئەو شـاخانە دەفرۆشـین، بۆ ئەوەی منداڵەکانتان بەئاسودەیی تۆپێنی تێدا بکەن!! ئێمە ئێسـتا زۆر بە سـادەیی و ئاسـایی باسـی فرۆشـتن و تاڵانکردنی بەنداوی بێخمـە دەکەین، بەڵام لە سـاڵانی داهاتوو زیانەکانـی تاڵانکردنی بەنداوەکە دیار دەکەوێـت، دەتوانـم بڵێم: هیچی لە ناپاکی نیشـتمانی کەمتـر نییە. لە داهاتوو گرنگـی بەنـداوی بێخمـە بەدیار دەکەوێ، کە ئاوی شـیرینی کوردسـتان دابین دەکات، کارەبای لێ بەرهەم دەهات، سەدان شوێنی گەشتوگوزاری تێدا فەراهەم دەبوو. بەداخەوە بەرپرسـی کورت بین و هەڵپەرسـت باکی بە خاک و نیشتمان و کاری سـتراتیجی نییە، زۆر جار دەڵێم: خۆزگە دوو بۆ سـێ ساڵی تر ڕاپەڕین نەکرابایـە، بەڵکو تا ئەوکاتە تەواوی کارەکانی بەنداوەکە تەواو دەبوو.
جێگای باسە ئەوەش بخەینەڕوو، پارەی هەموو خاڵە سنوریەکان کۆ دەکرایەوە، دوایـی بەسـەر حیزبەکانـی ناو بەرەی کوردسـتانی دابەش دەکـرا، نازانم بە چ پێوەرێـک بوو، تەنها ئەوەی مایەی نیگەرانـی حیزبەکان بوو، گومرگی ئیبراهیم خەلیل بوو لەدهۆک، کە یەک فلسی نەدەگەڕایەوە، وەک هاوڕێ مەلا حەسەنیش لە کتێبی (٥٩ سـاڵ تێکۆشان) لەلاپەرە (١٠٣) سەدوسێ ئاماژەی پێکردوە.

# دیسان شەڕی خۆبەخۆ

لەمانگـی ١٠ی ١٩٩٢ بـەداواکاری دەوڵەتی تورکی داگیرکەر، نەخشـە بۆ لێدانی پارتی کرێکارانی کوردسـتان (پەکەکە) کێشـرا. پارتی و یەکێتی لەناو خەڵکی باشـور وایان ئـەو خەڵکە گۆش کـرد، گوایە پەکەکە ڕێـگای هێنانی ئازووقەی گرتوە. ئاخر ڕێگای ئازووقە لەسیدەکان و خواکورکە یان لە ئیبراهیم خەلیل؟!! بەفیتی داگیرکەرانی کوردستان، ئاشێکی خوێنیان بۆ گەنجانی کورد لەهەر دوولا دانـا، بۆ ئەوەیان دەکرێ لەخۆیان بپرسـی چەندیـان پارە وەرگرتوە لەدەوڵەتی تورکی داگیرکەر؟ چەند گەنجی کوردیان بەکوشـتندا؟ چەند ژنیان بێوەژن کردو چەند منداڵیان هەتیو کرد؟

# هاوڕێ حازم ئەوە تۆی؟

پایــزی ١٩٩٢ ماڵــم لە پیرانشــەهربوو، لەدیوی ئێران. عەزیــزی پوورزام و عەوڵا کونــدە، لــە ماڵــی ئێمــە میوان بــوون. دەبوایــە بچین بــۆ مەهابــاد، لای مەلا مەحمــودی ئــازش، لە مامەڵە لەگەڵمان شــەریک بوو. چوینــە مەهاباد لە ماڵی مەلا مەحمود، عەزیزی پوورزام گوتی: دەبێ بچینە ســەر گۆڕی حەســەن زیرەک لەســەر ناڵەشــکێن، لەشــاری بۆکان. ئەگەر گەڕاینەوە، ڕۆژێک مەجلیسێک ساز دەکەیــن لەگــەڵ ئیبراهیمی قادری هونەرمەندو گۆرانی بێژ لە خزمەت مامۆســتا ماملێ. ڕۆژی دوایی، کاک ئیبراهیمی قادری هاتە ماڵی مەلا مەحمود، تا ڕۆژێک دیاری بکەن بۆ ئەو مەجلیســە. من گوتم: ســەردانی گۆڕی حەســەن زیرەک من ڕێکــی دەخــەم، بەڵام بۆ ئاغــای ماملێ و برایمی قادری ئــەوە بە کاک مەحمود دەکرێ، مامۆستاش گوتی:

کە گەڕاینەوە، من ئەو مەجلیسە ڕێک دەخەم. ئەوەبوو من جارێکی تر چوبوومە خزمەتی ئاغای ماملێ، ماڵی لای چوارڕای مەولەوی بوو، کاک ئیبراهیمی قادری تەلەفۆنی لەگەڵ ئاغای ماملێ کرد، ماملێ ڕۆژی پێشوو چووبوە خانەقای شێخی بورهان، ئەو کات کەم کەس دە هەزار تومەنی بە کەوش دەدا، ماملێ کەوشێکی دە هەزار تومەنی کڕی بوو، لە خانەقای شــێخی بورهان کەوشــەکەیان لێ دزی بــوو، بۆیــە ئیبراهیمی قــادری گوتی: ئاغای ماملێ ئەو هەموو ســاڵە هاتوچۆی مەیخانــەت کرد، جارێک کەوشــیان لــێ نەدزی، یەک جار تۆبــەت کرد چوی بۆ خانەقاو زیارەت، ئەو کەوشەیان لێ دزی!! بوو بە پێکەنین. هەر ئەوکاتە چوینە ســەر گۆڕی قازی مەحەمەد و مامۆســتا هێمن و هەژار لە مەهاباد، وێنەمان گرت لەســەر گۆڕیان تەنها گۆڕی قازی نەبێ.

بــۆ دوای نیوەڕۆ بڕیارماندا بچینە ســەر گۆڕی حەســەن زیرەک، بەڵام من پێش نیوەڕۆ بۆ یەک کاتژمێر مۆڵەتم خواســت، تا بچم ســەردانێکی ماڵی برای بەڕێزم کاک مەحمــود چیرە بکەم کە خانەوادەیەکی چەپ و تودەی بوون، هەمیشــە لە ســەنگەری تێکۆشــان بوون. کاتێک هاتمەوە ماڵی مەلا مەحمود، وەک پیشــەی

هەمیشـەیی بە جەفەنگ دەیگوت: حەتمەن کاک حازم چۆتە ماڵی کۆمەنیستان، ئەو باسـە درێژەی کێشـا. چوین لەناو بازاڕ ماشـێنێک بگرین بۆ بۆکان، سـەر گۆڕی حەسەن زیرەک. کامێرای وێنەگرتنمان برد، دەستمان لە تاکسیەک ڕاگرت، لەگەڵـی ڕێکەوتیـن بمانبـات و بمانگەڕێنێتـەوە مەهاباد. عـەولا و عەزیزو مەلا مەحمود لە پشـتەوە سـواربوون، من و کوڕەکەی کاک مەلا مەحمود لە پێشەوە لای شـوفێر، من لە تەنیشـت شـۆفێر سـوار ببووم. کاک مەلا مەحمود بەهیچ شـێوەیەک سـەنەگەی لەسـەرم هەڵنەدەگرت، هەر دەیگوت: ئەو کۆمەنیسـت و چەپانـە لـە جەهەنەمیش یەکتر دەدۆزنـەوە. لە نێوان مەهابـاد و بۆکان لەلای گونـدی بەردە مێش، ئەو شـۆفێرە سـەیرێکی منی کردو لەناکا و ماشـێنەکەی قـەراغ کـرد و ڕایگـرت، گوتی: هاوڕێ حـازم، کورە ئەوە خۆتـی؟!! بەیەکتری دانوسـاین، گوتـم: تۆ کێی؟ گوتی: مـن مەلا عەلی مەنگـوڕی تودەییم، بازاڕی مـەلا مەحمـود خۆش بوو. هەر چەندی گوتـم: کاکە ئێمە لە بارزان و خواکورک و لـۆلان و دەشـتی حەیات لە هەشـتاکان بەیەکەوە بوین، بـەلام مەلا مەحمود هـەر دەیگـوت: ئەگەر پلان نەبێ لەو هەموو تاکسـیەی مەهاباد بۆ ئەو تودەییە ڕادەگـری؟!! زۆرمان وێنە لەسـەر گۆڕی حەسـەن زیرەک گـرت وەک یادگاری، گەڕاینەوە، بەداخەوە نازانم لەبەر چ هۆیەک بوو ئەو مەجلیسـەی خزمەت ماملێ ساز نەکرا.

## ئەستێرەی سوور

لەگەڕەکـی فەرهەنگیـان لەپیرانشـەهر، کاک برایـم ئاکشی (مامۆسـتا بـوو)، نەشـتەرگەری بۆ کرا لە تاران. منیش چووم بۆ هەواڵپرسـینی، لە ژوورەوە کاک مەلاخالیـدی شـاعیرو چەند بەڕێزێکی تر دانیشـتبوون، برایەکـی کاک جەعفەر ئاغای میریسـێ، کە دەکەوێتە سەروی دۆڵی ئافانی مەنگوڕایەتی مەهاباد، لەوێ ئامادەبوو. ئەویش بۆ هەواڵ پرسـینی کاک برایم ئاکشـی هاتبوو، چاکوچۆنیمان کرد، گوتم: کاک جەعفەری برات دەناسـم، شـەوێک میوانی دیوەخانەکەی بوینە زۆر ڕێزی لێ گرتوین. باسی دۆستایەتی خۆی و ئەبوتارای واتە مەلا مەحەمەدی

جوانڕۆی بۆ کردوین، کاک برایم و مەلا خالیدیش منیان بەو پیاوە ناساند کەناوی (حەســەن ئاغا) بوو. باســی شــۆڕش و کۆماری مەهاباد و هۆکاری ڕوخانی ئەو کۆمارەیان تاوتوێ دەکرد. مەلا خالید و مامۆستا برایم، تا ڕادەیەک بەلایەنداری چــەپ دادەشــکانەوە، بۆیە کاک حەســەن دەیگــوت: هــۆکاری ڕوخانی کۆماری مەهابــاد ئەوەبــوو لەجیاتی نزیــک بوونەوە لە ئەمەریکا، قــازی خۆی لەیەکێتی ســۆڤیەت نزیک کردەوە، بەحساب ئەســتێرەی سور داکۆکیمان لێ دەکات، ئێمە بەهۆی ئەســتێرەی ســور کۆمارەکەمان فرۆشــراو لەناو برا، ئەگەر ئەمەریکا لە جێگای ســۆڤیەت بوایە وامان بەســەردا نەدەهات. ئەوانیش لە بەرامبەردا، مەلا خالید و کاک برایم هۆکارەکەیان دەخســتە ئەســتۆی ســاوایی و کەم ئەزموونی کــوردو ناپاکی هەندێک ئاغاو ســەرۆک عەشــیرەتەکان و دەســت تێکەڵکردنیان لەگەڵ شــای ئێران. ناپاکی لەقازی و ئینجا هەڵوێســتی ڕوسیاش. کاک حەسەن زیاتــر لــە ڕوی چینایەتیەکە، کە لــە بنەماڵەیەکی فیوداڵ بــوو، دەیڕوانییە ئەو ڕووداوە. چونکــە هەر دەیگوت: هۆکار ئەســتێرە ســورەکە بــوو، ئەگەر ئەمریکا لەجێــگای ڕوســیا بوایە کۆمــار نەدەڕووخا، کاک برایم گوتــی: کاک حازم کۆنە شیوعیە تۆزێک خاتری بگرن.

منیش گوتم: کورد هەتا بە تەمای ئەو وڵاتە زلهێزە بێ ویژدان و بەرژەوەندپەرست و دژە مرۆڤانــە بێــت، ئاکامەکــەی لە ڕوخانــی کۆمارو ڕێکەوتننامــەی جەزائیر چاکتــر نابێ، مــن هیچ جیاوازیەک نابینــم لەنێوان بەرژەوەندخــوازی ئەمریکا و ڕوســیا. خۆ شۆڕشی باشوری کوردستان ســرف ئەمریکی و تەنانەت ئیسرائیلی و شاهەنشــایی بــوو، کــە بەرژەوەندی هاتە پێشــەوە چۆن بە پیلانــی جەزائیر تواندیانەوە، پایدۆســتی لێکرا؟!! خۆ لە شۆڕشــی باشــور ئەســتێرە سوری لێ نەبوو؟!! من داکۆکی لە ڕوســیا ناکەم، ئەو زەمان گوزەشــت. بەڵام ڕوســیا لە هەمبەر قرچ و بڕی شــیوعیەکانی عێراق لەســەر دەســتی ســەدام هەر هەمووی بە قوربانی بەنداوی سەرســارو بۆڕی نەوتی ڕومێلەو پترۆکیمیاوی و فۆســفات و کڕینی چەکی ڕوســی و نەوتی عێراقی کرد. ورتەی لەدەمی نەهاتە دەر لەســەر پاکتاوی حیزبی شــیوعی بێ دەنگی هەڵبژارد. لەدوای هێرشــی بەعســیەکان بۆ سەر حیزبی شیوعی و ئەو هەموو گرتن و کوشتارەی کە لەدژی حیزبی شیوعی ئەنجامیاندا، کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی بۆ ســەدام حوسێن سازکرا، لێیان پرسی:

لەدوای هێرش بۆ ســەر حیزبی شـیوعی و کوشــتنی ئەندامەکانــی پەیوەندیتان لەگەڵ ڕوســیا تێک نەچوە؟ لەوەڵامدا سەدام گوتی: نەخێر، بەڵکو پەیوەندیمان لەگەڵ ڕوسیا لەهەر کاتێکی تر توندوتۆڵترەو ڕوسەکان ئەو کردەیان هەر لەگەڵ بــاس نەکردوین، بەڵکو ئاڵوگۆڕی بازرگانی زۆرمان مۆرکردوە.
من جیاوازی نابینم لە نێوان زلهێزەکانی دنیا، دەبێ ئێمە بۆ خۆمان لەسەر زەوی هەبیــن، ئەو زلهێزانە تاوەکو ئێســتا بازاڕیان لەســەر ئێمەکردوەو لەداهاتوشــدا دەیکــەن. دەبێ گەلەکەمان وا ڕابێنین هەرگیز بەتەمای هێزێک نەبێ لەپشــتەوە داکۆکی لێ بکات، جگە لەگەلی خۆمان. ئەوەی پێشــینان گوتویانە (تێکوشــەی بەتەمای دراوسێیان هەر وشکە).

# دروستکردنی پارتی کار

ڕۆژێک لەگەڵ مامۆســتا گۆران لە نەقابە لەبارەگای حیزبی شیوعی دانیشتبوین، گوتی: بابچینە دەرەوە، هەندێک قســە بکەین. گوتی: کاتی ئەوە هاتوە بڕیاری جیابوونــەوە لەحیزب بدەین، ڕێکخراوێکی کوردســتانی دروســت بکەین، تۆ ڕات چیــە؟ منیــش هەر ئەوەنــدەم گوت: بەشــەرتێک کلکی کەس نەبێت. مامۆســتا ســەیفەدینی یەکێتیم بینی، هەروا ســەرپێی گوتی: پشتگیری لەکوردستانییەکان بکــەی باشــە. بەڵام مــن پشــتگیریم لەهیچیــان نەدەکرد. دوای چەنــد مانگێک ١٩٩٣/١٠/٢٢ پارتی کاری ســەربەخۆیان دامەزراند، بەداخەوە بەس ســەربەخۆ نەبــوو، جگــە لەچەنــد کادیرێکی پاک و پێشــمەرگەی ئازا بە پێویســتی دەزانم لێــرە نــاوی هەندێکیان بێنم، چونکە ویژدانم ئاســودە نابێ لە ناســەربەخۆییان بگلێنم وەک: موحسین یاسین، شوکراللە، مامۆستا ڕەوەند، ئەبو دڵشاد، چەتۆ، هــەردی، ڕەفیق ســابیری شــاعیر، ملازم ڕابەر، مەحەمەد حــەلاق، ...زۆری تر، داوای لێبــوردن دەکــەم کە نــاوی هەموانم لەیاد نییە، ئەگــەر نا زۆریان لەهەرە کوڕە باشەکان بوون و ئێستاش شانازی بە برادەرایەتی هەموو ئەوانەوە دەکەم.
من هیواداربووم هەموو چەپەکانی باشور لەدەوری کۆبنەوە، کە دەڵێم سەربەخۆ نەبوو، مەبەســتم نەیانهێشــت ســەربەخۆ بمێنــێ، بەرپرســەکان هێندەیان لێک

کێشـاوە هـەر یەک بـۆ لای حیزبێـک، بەتایبەتی پارتـی و یەکێتـی، تاکو لەو کێشمەکێشـە لەدەسـتیان پچرا. ئەگەر نا ئەو پۆلە کادرو پێشـمەرگانەی لەگەڵ ئەو پارتەبوون، زۆر هەڵوێستی کوردانەی چەپڕەویان هەبوو، لەنزیکەوە هەمویان دەناسـم هەندێکیـان لەپێشـمەرگایەتی بەرپرسـم بوون. من کاتـی خۆی لەگەڵ مامۆسـتا گۆرانیش لەگەڵ زۆربەیان باسـی ئەوەم دەکرد کە ئومێدەوارم هەموو چەپەکانی کوردسـتان لە پارتی کار کۆببنەوە.

چەپەکانـی باشـور کـەم نەبـوون، ئەگەر کۆکەرەوەیـەک هەبوایە، بـۆ نمونە: زەحمەتکێشـان، ئاڵای شـۆڕش، هەندێک لەناو کۆمەڵـەی ڕەنجدەران و خەڵکی بـێ لایەنی چەپ و پێشـکەوتووخواز، بەداخەوە حیزبە سەردەسـتەکان کەوتنە بڵاوەپێکردنیـان، لەسـەرەتا دوو حیزبـی فەرمانـڕەوا یەکێتـی و پارتی کەوتنە لووشـدانی ئەو حیزبـە بچوکانـە، دوای ماوەیەک کەوتنە دروسـتکردنی حیزبی شـاگرد ئۆغلان بۆ گەرمکردنی دیوەخانەکانیان. ئێستا هەریەکەیان چەند حیزبی تایبـەت بەخۆیـان هەیە لەدەرەوەی پارتی و یەکێتـی. زۆر حیزبۆکە هەیە هەقە لـە تابلۆی پێش دەرگای بنوسـن بارەگای (فلان حیـزب) بۆ خاوەنەکەی پارتی یان یەکێتی.

ڕۆژێک سـەرێکم لە بارەگای پارتی کار دا، لە بەرامبەری منارەی شـێخی چۆلی، نـەک لەبەرئەوەی هـەردی برام لەوێ بـوو، بەڵکو لەبەرئەوانەی سـەرەوە ناوم بردن، برادەری خۆشەویسـتی پێشـمەرگایەتیم بوون. ئەبوحیکمەت سـەرۆکیان بوو، من نەمدەویسـت هیچ باسـی سیاسـەت و حیزبایەتی بکـەم، لەگێڕانەوەی قسـە خۆشـەکانی ڕۆژگاری پێشـمەرگایەتی زیاتـر، بەڵام ئەوکاتە مـن ماڵم لە ئێـران بوو، لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان. دوو تـۆن هەنگوینم بردبوو بۆ هەولێر بۆ فرۆشتن، لەوێشەوە هەندێک ئاسنەواڵەی ئۆتۆمبێلم کڕیبوو لەگەڵ خۆم ببەمەوە بـۆ ڕۆژهەڵات، بۆ ئەوەی سـێ منداڵـم دەیانخوێند بتوانم ژیانیـان دابین بکەم. یـەک لەو برادەرانەی ئـەوێ (.........) گوتی: لەگەڵ قاچاغچیەتی چۆنی؟ ئەو شـتومەکانەی من دەمکڕی و دەمفرۆشـت، گومرگی لێدەدراو بەشـێوەی یاسـایی دەمکـردن. بـەڵام دیاربوو ئەو بـرادەرە زۆری پێ ناخۆش بـوو، من دەتوانم خۆم بژێنم، بەم پرسیارە درێشەی لەگوێم وەردا، منیش لە وەڵامدا گوتم: بەخوای هیچ کاسـبیەک خێری نەماوە، ئێستا نان لەحیزبی بچوکدایە، ئەگەر سکرتێر لەگەڵت

ڕاست بێ. گوتیان: چۆن سکرتێر لەگەڵت ڕاست بێ، مەبەستت چیە؟ گوتم: بۆ نمونــە: ئەو ئەبــو حیکمەتەی ئێوە، بچێتە لای کاک مەســعود یان هەر کاکێکی تر، ئەگەر پێنج ســەد هەزار دیناری سویســری وەرگرت، هاتە دەرەوە بەڕاســتی بــە ئێوەی گوت، ئەوا بەشــی دەکەن. ئەگەر گوتی: ســێ ســەد هــەزار دینارم وەرگرتــوە، ئەوە ڕاســت نەبوو لەگەڵتان. لە بیرمە هــاوڕێ چەتۆ گوتی: هاوڕێ ئەبــو حیکمەت قەت ئەوە ناکا لەگــەڵ ئێمە. گوتم: جارێ ناوی هاوڕێیەکەی لێ بکــەوە، چونکــە ئەو هەڤاڵە لە پارتی، هەمویان مــاون زۆریان پێ ناخۆش بوو، ئەوەبوو بە پارتیاتی مرد.

# کە باوکم مرد
# نەیگوت کوڕم دوکانمان لە قەڵادزێ هەیە

لە شەوی ٢/٥/١٩٩٤، لەماڵی شەهید عەزیزی پورزام خەوتبووم، بوە غەڵبەغەڵب، بەخەبەر هاتم. خدری عیساو چەند برادەرێکی تر، گوتیان: هەستە قەوما. گوتم: چی قەوماوە؟ گوتیان: با بڕۆین بۆ قەڵادزێ، شەڕە لەگەڵ پارتی. کوڕی حەسۆ میرخــان داوای دوکانەکانی قەڵادزێ دەکاتەوە، منیش پەتۆکەم بەســەر خۆمدا، دادایەوە. گوتیان:

بــەو حاڵــەی چەنــد ســاڵت پێشــمەرگایەتی کــردوە؟!! گوتم: کــە باوکم مرد، نەیگــوت: کــوڕم دوکانمان لە قەڵادزێ هەیە، بۆیە نایەم. شــەڕێکی زۆر نەگریس و قێــزەون، لەنێــوان یەکێتــی و پارتــی دەســتیپێکرد. بە پاڵپشــتی داگیرکەران بەڕێوەدەچوو. پەنایان دەبردە بەر ناشــیرین ترین شــێوازی بێ ڕەوشتی بەرامبەر یەکتری، داگیرکەرانی دەوروبەر نەیاندەهێشت هیچیان بکەون. هەردوولایان ماڵ و موڵکی لایەنگرانی یەکتریان داگیردەکرد، زۆرجار خەڵکی دەوڵەمەندی بێ لایەنیش ســەرانەی لێ دەســەندرا. ئەو دابە زۆر بە کولتوری کوردەواری نامۆ بوو، زۆر لەو خەڵکانەی ئاوارە بوون لەهەردوولا دەیان بردن بۆ نیشتەجێکردنیان بە زۆرەملێ لە ماڵی لایەنگرانی لایەکەی تر. لەناو ماڵ و منداڵی ئەو دەبوایە ژیان بکات، بەمجۆرە

کە ئەوە مشتێکە لە خەروارێک، کاریان لەسەر بێ ڕەوشتی کۆمەڵگای کورد کرد تا بەو ڕۆژەی ئێستایان گەیاند.
لەوکاتـەدا، هێـزی سـەربازی و ئیمکانییەتـی مـاددی لای پارتـی بـوو، وەک موگناتیسـی نـاو ورتکە بزمـاران، زۆر لەحیزبە بچوکەکانی لەگـەڵ خۆی لولدا، وەک: سۆسیالیست، پارتی گەل، پاسۆک، ...هتد. زۆرجار لە یەکلایی کردنەوەی ململانێـی دوولایـەن، جوگرافیـا بڕیار دەدا، بـۆ نمونە: ئەگـەر ئیبراهیم خەلیل لەسـنوری پارتـی نەبوایە، کە دەرامەتێکی زەبەلاحی هەبـوو، ڕەنگە پارتی ئەو پارتیەی ئێسـتا نەبوایە. گولە ئار.پی.جی لە حاجیاوا دەکڕدرا، دەچووە کەپکی حەمەدئاغا، دووبارە دەهاتەوە حاجیاوا دەفرۆشـرایەوە، لەناو پارتیش بەهەمان شـێوە. لەناو ئەو شـەڕە ناپاکانە، ناپاکیان لەگەڵ حیزبەکانی خۆشیان دەکرد.

# شەهیدکردنی مەحەمەد حەلاق و هاوڕێکانی

ڕۆژی ١٩٩٥/١١/٢، ڕێـگای کۆیـە- هەولێـر، دادەخەن. نایەڵـن هاتوچۆ بمێنێ. بەنیـازی دانانی بۆسـەیەک بـۆ مەحەمەدحەلاق و دە پێشـمەرگەی پارتی کاری سـەربەخۆ، لەهەولێرەوە دەیانەوێ بگەڕێنەوە کۆیە. لەوکاتە قوتابیەکی زانکۆی سـەلاحەدین، بەناوی ژینۆ لەگەڵ خۆیان سـوار دەکەن بەنیازی یارمەتیدانی، تا کرێی ئۆتۆمبێل نەدا، سـاڵی ١٩٩٥ ساڵێکی پڕ زەحمەت و نەبوونی بوو. کاتێک دەگەنە ڕاستی تۆپزاوا، پێش ئەوەی بگەنە بازگەی تۆپزاوا، لە بۆسەیەکدا گولله بارانیان دەکەن، هەر دوازدەیان شـەهید دەبن، مخابن لەناویاندا ئەو قوتابیە کە ناوی ژینۆ بوو شـەهید دەبێ. برایەکی مەحەمەد حەلاق کە ناوی بەشـدار بوو لە بێخمە لە ناپاکیەکەی فەتاح کتکەیی شـەهید بوو، دایکی بەناوی ئایشـەگوڵ لە سـاڵی ١٩٨٨ گولله باران کرا، لە کارگەی قیر نێژرا.
ئەبو حیکمەت لە سـاڵی ٢٠٠٦ بەخۆی و حیزبەکەی چوونە ناو پارتی، وەک بۆ خۆی دەڵێ: بەهۆی لێک نزیکبوونی سیاسـەتی هەردوو حیزب، بڕیارماندا بچینە ناو پارتی، ئاخر چەپ و مارکسی و پارتی کوجا مەرحەبا؟!! خۆ کەلوپەلیان بۆ یەکتـر نابێ!! (ئەبو حیکمەت ٢٦ی ئەیلولی ٢٠٠٩ مرد).

خوێنەری بەڕێز هەرچەندی دەکەم و دەکرێنم، نامەوێ لاپەڕەکانی ئەو کتێبە بەو ڕووداوە قێزەونانە ڕەش بکەمەوە، زۆرم بیرکردەوە چۆن دەست بۆ نوسینیان ببەم، هاتە سەرم تەنها ئەو ڕۆژانە بنوسم کە یەکترمان تیا نەکوشت، ناپاکی نەتەوەیی و نیشتمانیمان تیا نەکرد، چونکە ئەو ڕۆژانە یەکجار کەم بوون، سەرانی کوردی باشور ئەو کردەوانەیان تیا ئەنجام نەدابێ، بۆیە نامەوێ بەتەواوی دەرخۆنەی سەر ئەو ناپاکیە قێزەونانە هەڵدەمەوە، نەبادا بەڕێزتان بەسەر کتێبەکەم دا بڕشێنەوە، بۆیە هەر جەولەی شەڕێک بە دوو دێڕ کۆتایی پێ دێنم.

لەدوای ڕاپەرین ١٩٩٢ یەکەم جەولەی شەڕی پارتی و یەکێتی لەدژی پەکەکە، شەڕی یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی، شەڕی پارتی و یەکێتی لە ١٩٩٤/٥/٢، شەڕی پارتی لەگەڵ پەکەکە ١٩٩٤، لە ١٦ی گوڵانی ١٩٩٧ لەناو شاری هەولێر، پارتی زیاتر لە هەشتا ئەندام و لایەنگرو گەریلای شەهید کرد، کە هەژدەیان بە دیلی لەیەک شوێن گوللە باران کرد، نۆ گەریلای برینداری لەناو نەخۆشخانە لەسەر تەختەکان شەهید کرد و زۆر ڕووداوی تری دڵتەزێن.. . یەکێتی، گیرانی بەڕێز ئۆجەلانی بەهەل زانی، کەوا شەنس یاوەریان بێ، پەکەکە لەسەر دەستی ئەوان پاکتاو بکرێ. ئەمجارەیان یەکێتی لە ٢٠٠٠/١٢/٤هێرشی سەر قەندیلی کرد، بوو بەشەڕ لەگەڵ پەکەکە، ٢٠٠٠/١٢/١٥ لەچوارقوڕنە بە هەلیکۆپتەری تورکیا یوز پاشا، حەسەن قەپلان، لەفرقەی چوارقوڕنە نیشتنەوە، دوو بەرپرسی میتی تورکیا بوون. مام جەلال پێشوازی لێکردن بەمام جەلالیان گوت: دەبێ بچی بۆ تورکیا. هەندێک چەکیان بەسەر بەرەکان دابەش کرد، هێزێکی تورکیا لە قەڵای چوارقوڕنە جێگیر بوو، بۆ سەرپەرشتی شەڕەکە و سەردانی بەرەکانی جەنگ، گەر دەتەوێ ڕاستی و وردەکاری زیاتر بزانی و نوسینەکەم پشت ڕاست بکەیتەوە، کتێبی (یادەوەرییەکان، مستەفا چاورەش) کە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیە، لەلاپەرەکانی (٣٥٥) سێ سەدو پەنجاوپێنج، هەتا لاپەرە (٣٧٤) سێ سەد و حەفتاو چوار، بەدرێژی باسی ئەو شەڕە دەکات، کە خۆی کارەکتەری بوە. ئەو کردانەی لەو سەردەمەدا ئەنجام دران، دەشێ دەیان کتێبی لەسەر بنوسرێ، بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو نەدەست بۆ ئەو کارە قێزەونانە بەرن، نە کەپوشیان لە بۆنکردنی وەها بۆ گەنێک نزیک بکەنەوە.

# بەزمی شەعبان

جەنگی ئامۆزام لەشارۆچکەی پیرانشەهری ڕۆژهەڵاتی کوردستان، دوکانی سەرتاشی هەبوو. ماوەی حەوت بۆ هەشت ساڵ دەبوو، خەڵک ڕویان تێدەکرد بۆ سەرتاشین، سەرتاشێکی ناسراو بوو. لەو سەردەمە شەڕی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی کۆتایی هاتبوو لە باشوری کوردستان، بەڵام لە سالارەو کێلێ وردە وردە شەڕ مابوو، کوڕێکی خەڵکی باشور، بە ناوی شەعبان، لەگەڵ ئیسلامیەکان بوو، لەگەڵ وەستا جەنگی هیچ ئەشیایان بۆ یەکتری نەدەبوو، لەروی فکری و سیاسی. شەعبان ماڵی هێنابوو بۆ پیرانشەهر، داوای لە وەستا جەنگی کردبوو، پێش دوکانەکەی بداتێ، لەسەر عارەبانە پاقلەو نۆک بفرۆشێ. ئەویش بەنیازی یارمەتیدانی، خاوەن ماڵ و منداڵ بوو، گوتبوی: خوا دەکات تۆ کاسبی دەکەی، وەرە لێرە ڕایبگرەو کاری خۆت بکە.

ماوەیەک بوو شەعبان لەوێ پاقلەو نۆکی دەفرۆشت. ڕۆژێک من لەلای ئەحمەدە سوری خەیات دانیشتبووم، کە دراوسێ دوکانی وەستا جەنگی بوو، لە پڕ بوو بە شەڕ، گوێم لێ بوو دەنگی الله اکبر، الله اکبر، دەچوە ئاسمان، تومەز شەعبان لەگەڵ یەکێک بەشەڕ هاتبوو!! وەستا جەنگی هاتە دەرەوە لە دوکانەکەی، گوتی: کاک شەعبان خۆ تۆ لە شەڕی بەدرو حونەین نیت لەگەڵ کافران، لە هەمبەر یەک شەڕ بکەن؟!! ئەو برایەش وەک تۆ موسوڵمانە، ئینجا من پێم ناکرێ هەموو ڕۆژێک سەری مشتەری بەنیوەچڵی بەجێ بهێڵم، بێم ناوبژی شەڕی تۆ بکەم، برام هەتا نوکە شمشێرێکمان پێ نەکەوتوە ئەو عارەبانە لەبەر دووکانەکەی من بگوێزەوە.

# دکتۆر مەولەوی

نایلەی هاوسەرم لەناکاو نەخۆش کەوت، بردمە لای دکتۆر، بەڵام بڕیارم دا دوای چەند ڕۆژێک، نیشانی دکتۆرێکی باشی بدەم. چوین بۆ مەهاباد، بۆ ماڵی

كاك مەحمـود چیـرە، وەک هەمیشــە كاك مەحمود زۆری بەخێرهێناین، باســی نەخۆشـیەكەم بۆ كرد، پەیوەندی بە دڵیەوە هەبوو، گوتی: دەیبەینە لای دكتۆر مەولەوی. دكتۆرێكی زۆر قسە خۆش و نوكتەچی بوو، من زۆرم لەبارەیەوە گوێ لێ ببوو، بۆ نمونە:

پیاوێک ژنەكەی بردبوە لای دكتۆر مەولەوی، ژنێكی قەدوباڵا چكۆلە، مێردەكەی پیاوێكی كەتەی وەک غول سەروفەسـاڵ ناشـیرین، ژنەكەی دەڵێ: دكتۆر پشتم زۆر دێشـێ، دوور لەتـۆ خەریكە پشـتم دەبێ بـە دوو لـەت. دكتۆریش دەڵێ: خوشـكم ئـەو پیاوە چی تۆیـە؟ ئەویش دەڵێ: ئـەوە مێردمە. (لـە ڕۆژهەڵات دەڵێـن (سـاحەبمە) خاوەنمـە) دكتۆر دەڵێ: خوشـكی خۆم، بـە خودای ئەوە مێردی منیش بێ لەگەڵم بخەوێ، پشـتم دێشـێ، ئەوە كەی مێردە تۆ كردووتە ئـەوە نەفرەجایە!! بۆیە كە چوینە لای دكتۆر مەولەوی، كاک مەحمود دەترسـا قسـەیەک بـكات، دكتۆر مەولەوی گوتـی: ئەوانە عێراقین؟ گوتـم: بەڵێ. بەڵام كاک مەحمـود هــەرزوو بـە دكتۆری گوت: ئـەوە كاک حازمە، تۆ نایناسـی لەو عێراقیانــە نییە كە تۆ تێبینیت لەسـەریان هەیە و مـەردووم ئازارن، كاک حازم وەک خۆمانــە. دكتۆر مەولــەوی پیاوێكی كورد پەروەربوو هەر كەسـێک لەدژی گەلەكەمان بوایە خۆشی لێ نەدەهات.

(ڕۆژێـک مـەلا و پێش نوێــژی خوتبەی هەینـی مەهاباد، ئەوكات ئەوەی سـەر بەویلایەتی فەقێ و جمهوری ئیسـلامی نەبوایـە، نەدەكرا بە وتارخوێنی هەینی. لەهەمـوو شـارە كوردیـەكان خوتبـەو وتـارەكان دەسـەڵاتدارانی ئێـران بۆیان دەنوسینەوە، ئەوان تەنها بۆیان هەبوو وەک توتی بیلێنەوە، بۆیە مەلای مەهاباد ڕۆژی هەینی لەسـەر مینبەری مزگەوت هێرشـی كردبوە سـەر پارتە كوردیەكان و چەپەكانـی ڕۆژهەڵاتـی كوردسـتان، وە تاریفكـردن و پێداهەڵدانـی جمهوری ئیسـلامی كەببـوە جێگای نیگەرانی خەڵكی نیشـتمانپەروەری شـاری مەهاباد، یەک لەوانە دكتۆر مەولەوی). چەند ڕۆژێک دوای ئەو وتارە مەلا نەخۆش دەبێ، دەچێتــە لای دكتـۆر مەولــەوی، لەگەڵ دوو پاسـداری پاسـەوان، دەڵێ: دكتۆر گەدەم دێشێ (مەعیدە). ئەویش دەرمانی بۆ دەنوسێ. دوایی مەلا دەڵێ: دكتۆر ئەدی بۆ پارێزی چی نەخۆم؟ دكتۆر مەولەوی دەڵێ: سەوزی مەخۆ، تورشیاتی مەخـۆ، بیبەری مەخۆ، ڕۆژی جومعان، لەسـەر مینبـەری مزگەوت هێندەی گوو

مەخۆ، چاک دەبیتەوە.
ڕۆژێــک پیاوێکی زۆر باڵابەرزی چوارشـانەی سـینگ شـێر، دەچێتە لای دکتۆر مەولــەوی، دکتــۆر ســەیری دەکات و ڕەچەتــەی بۆ دەنوســێ بــۆ دەرمانخانە، ناپرســێ ناوت چیە، لەخۆیەوە دەنوسێ: ڕۆستەم. کابرا کە دەچێتە دەرمانخانە کارمەندەکان هەر بانگ دەکەن ڕۆســتەم..کەس جواب ناداتەوە. کابراش دەڵێ: ئــەوە بۆ نۆبەی من نەهات؟ دەڵێــن: ناوت چیە؟ ئەویش ناوی خۆی دەڵێ، ئەو نــاوە ڕەچەتەی دکتۆری نییــە. دەڵێن: لای چ دکتۆرێک بوی؟ دەڵێ: مەولەوی. ئەوان کە تەماشای قەدو قیافەی دەکەن، پەنجە و قامکی وەک بەڕوی ئەستورە، دەڵێن: کاکە ئەو وای زانیوە ناوت ڕۆســتەمە. ئەوە هی تۆیە، پێی پێدەکەنن و ئەویــش پێــی ناخۆش دەبێت و دەچێتەوە لای دکتــۆر مەولەوی، دەڵێ: دکتۆر، ئــەو ڕەچەتەیــە هی منە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵــی. کابرا دەڵێت: ئاخر دکتۆر کەی من ناوم ڕۆســتەمە؟ بۆچی مەخســەرەم پێ دەکەی!! ئەویش دەڵێ: ســەگباب ئەتۆ بەراســتی ڕۆستەمی بەڵام باوکت نەیزانیوە ناوت لێ بنێت.

## کامێراکەم

نایلەی هاوسەرم گوتی: ئەگەر سەفەرێکی باشورمان پێ بکەیت، چاک دەبمەوە. منیش هەموو ســاڵێ جارێک بۆ دیوی عێراقم دەهێنانەوەو سەفەرم ڕێکدەخست. من هەموو جارێک لەخوار بالیســان و شــێخ وەسان، ئەو هەموو موشەکەی ڕژێم بەســەر ئێمەیدا باراندبوو، لە کاتی پێشمەرگایەتی، کۆکراوەتەوە. زۆرم مەبەست بــوو بۆ منداڵەکانم شــی بکەمەوەو وێنــە لەگەڵ ئەو پاشـماوانەدا بگرم. گوتم: ئــاراس کــوڕم، کامێــرای ڤیدیۆکە بهێنــە (کۆنەکەی هاواری برام کە لە ســوید هێنابــوەوە، بــۆ ئێمــەی جێ هێشــتبوو، تا ســودی لێوەربگرین) تــا وێنەی پێ بگرین. بەتایبەتی گۆڕســتانی شــەهیدانی دۆڵی بالیسان و ئەو هەموو موشەکەی لەسەر یەک داندراوە. چوین بۆ باشور، کە گەیشتینە ئەو شوێنە، لای پاشماوەی موشــەکەکان و گۆڕستانی شەهیدانی کیمیابارانی شێخ وەسانان، وێنەمان گرت. من بەقەدەر ئەو برە زانیاریەی هەمبوو لە دۆڵی بالیسان، لەکاتی ئەو کارەساتە،

بۆ منداڵەکانم دەگێڕایەوە: لەپشــتی چیوە، بارەگامان لەلای ئەو تیشــە شــاخە لەکانــی تــەلان بوو، لــە ئەشــکەوتە، بارەگامان لە فڵان شــوێن بــوو، بارەگای مەڵبەندی ســێ و مامۆســتا ســەیفەدین لە خەتێ و دەلاش و...، . بەو شێوەیە وێنەیەکــی ڕۆژانی خەباتم بۆ منداڵەکانم گێڕایەوە.

دوو سەد مەترێک لەدوای ئەم باسە، ڕایانگرتین. چەکدارەکانی یەکێتی کە زانیان ئێمە لە ئێرانەوە هاتوین زۆریان ئازاردابن، ســەیری هەر منداڵێکی خۆم دەکرد، بــە چاوەکانــی پێی دەگوتم: باوکە بــۆ ئەو ڕۆژە پێشــمەرگایەتیت کرد؟! کۆنە جاشــەکانی دوێنێ و یەکێتیەکانی ئەمڕۆ کامێراکەیان لێ ســتاندین!! دەیانگوت: دەبــێ گومرگــی بکەی!! دەمگوت: برام ئــەوە کۆنە هیماڵی خۆمە، چۆن دەبێ گومرگی بکەم؟!! ئەگەر وابێ من تەزبێحم پێیە، ســەعاتم لەدەســتە، پاڵتۆکەم دەبــێ هەمویــان گومرگ بکەم. بەڵام حاڵی بووم کە بەرپرســی بنکەکە کامێرای نەبوو، زۆری پێویست بەو کامێرایە بوو لێم بستێنێ. لەوکاتە ئۆتۆمبێلێک وەستا، بەرپرســەکە چوە لای، نەمزانی کێیە، دیاربوو منی ناســیبوو، کە گەڕایەوە لای ئێمــە، لەدوای دوو کاتژمێر گوتی: بڕۆ ها کامێراکەت.

ڕۆژێــک کابرایەک چەند قوتیە بیرەی پێ دەبێ بۆ خواردنەوەی خۆی، لەبازگەی یەکێتی دەڵێن: دەبێ گومرگی بکەی. ئەویش چەند هەنگاوێک دەگەڕێتەوە پاش، دەســت دەکات بەخواردنەوەی بیــرەکان، هەتا چۆڕیان لــێ دەبڕێ دەخواتەوە، دەڵێ: ئێســتا هەموی لەناو سکمە گومرگی بکەن.

## ئەو کچەی کردبوویان بە دووپشک

لــە ئــۆردوگای دێڵزێ لە ڕۆژهەڵات، مەحمود خەیلانــی بەبۆنەی چونی بۆ حەج، بانگهێشــتی نان خواردنــی ئێوارەخوانێکی بۆ چەند کەســێکی ئۆردوگای دێڵزێ ســازکردبوو، یەک لەوانە بەندە بوو. ژمارەمان ســی کەســێک دەبوو. دوای نان خواردن (م.ب) گوتی: وێنەیەکم لە پیرانشــەهر کڕیوە کە کچێکی گەنجی (خۆو ســەڵماس، کە دەکەوێتە باکوری ورمێ)، ســوکایەتی بــە قورئان کردوە، خوای گەورە کردویەتی بە دووپشــک!! تەنها ســەری کچە و جەستەی بوە بەدووپشک،

بەدایک و باوکی وەداوە هەردووکیانی کوشتوە. دیاربوو هەمویان لەگەڵ ماشالله ماشـالله، گوتیان: با منداڵێک بچێ ئەو وێنەیە لەماڵی (م.ب) بێنێ. وێنەکەیان هێنـا، بۆ ڕێکخسـتنی سـەیرکردنەکە گوتیان: لەیەکەم کەسـەوە لـەلای دەرگا باسـەیری بکات، بیدات بەئەوەی تەنیشـتی هەتا یەک بەیەک هەموومان سەیری دەکەین، کە وێنەکە گەیشـتە دەسـتی یەکەم کەس، ئەوەندە بەتاسـە بوون بۆ سـەیرکردنی، کەسـی وا هەبوو دوو کەسـی لەپێش مابوو، هەڵدەسـتایە سـەر چـۆکان بـۆ ئـەوەی تاوەکو نۆبەی دێ سـەیرێکی بکات بەدەسـت ئەوەی پێش خۆیەوە. نۆبە گەیشتە لای من، بە ئاماژە گوتم: بیدە ئەوەی دوای من، نامەوێ سەیری بکەم، ڕەتی کرد.

کەسـی واهەبـوو لەگەڵ ماشـالله دەیگوت: ان شـالله هەرچی نوێـژ ناکات ئاوا خـوا غەزەبی لێ بگرێ بیکات بەدووپشـک بە بەراز.. . حاجی ئەحمەد لە تەکم دانیشـتبوو، دەیگوت: ان شـالله هەرچی موسـوڵمان نییە ئاوای لێ بێت. منیش گوتـم: حاجـی ئەو دوعایە مەکە خۆ ئەوەی موسـوڵمان نییە ئاوای لێ بێت هەر هەمووما‌ن دەخۆن، خۆ ئێمەی موسـوڵمان یەکەی پێنج تا شـەش دووپشـکمان بەردەکەوێ پێمان وەدەن.

دوای ئەوەی هەر هەمویان سـەیریان کرد، ڕویان لە من کرد، گوتیان: باشـە تۆ بۆ سەیرت نەکرد؟ ڕای خۆتمان پێ بڵێ لەسەر ئەو وێنەیە، منیش گوتم: ئەوەی بە کۆمپیوتەر ئەو وێنەیەی دروست کردوە زیرەکە، پارەیەکی پێ کۆ دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی دەیکڕێ کاڵ فامە. گوتیان: تۆ باوەڕت نییە بەو شـتانە؟!! ئەگەر نا ئەوا لە سەلماسـە لای ورمێ.

منیش، گوتم: باشـە کامتان زۆری پێ وایە باوەڕدارەو بڕوای بەو وێنەیە هەیە، بەیانی ماشـێنێک دەبەین، دەچین بۆ خۆو سـەلماس، بزانین شـتی وا خورافی وجودی هەیە؟ ئەگەر هەبوو، پارەی ماشێن و خواردنی هەموان دەدەم، ئەگەرنا، ئێوە بەهەمووتان پارەکە بدەن. کەسیان نەیانوێرا ئەو گرەوە بکەن. پێم گوتن: کاکینە، ئەوە پەیوەندی بە ئاینەوە نییە، دەگەڕێتەوە سـەر کاڵفامی مرۆڤەکان.

## چیرۆکی سمکۆ، دەتوانی یەك ڕۆژ بەم جۆرە کورد بیت؟

لەساڵی ١٩٨٩ لە ئێران، هەموو ساڵێ یادی کیمیابارانی هەڵەبجە دەکرایەوە. یەکەم ساڵ لە پیرانشەهر لە سینەما پێشکەش کرا، بە سینەفزیۆنێک کە ئێمە یەکەم جار بوو بە ڤیدیۆ ئەو کارەساتە ببینین. ئێمە چەند کەسێکی ئاوارە، ماشێنمان هەبوو، بۆ یادەکانی نەورۆزو هەڵەبجەو زۆر شتی تریش، خۆبەخشانە خەڵکی خۆمان دەگواستەوە. ساڵی ١٩٩٠ یادی کیمیابارانی هەڵەبجە لە ورمێ کرایەوە، ئێمەش ئامادەبوین. کاتی نیشاندانی کارەساتەکەو ناڵەی بەرکەوتەکان، کوڕێکی تازە پێگەیشتوو، تەمەنی شازدە بۆ حەڤدە ساڵان دەبوو، یەک کەسمان لەنێوان بوو، زۆر بەکوڵ دەگریا، ئێمەش ویستمان دڵنەوایی بدەینەوە. دیاربوو خەڵکی دێهاتەکانی لای سەردەشت بوو، کاتی کیمیابارانی سەردەشت لەلایەن ڕژێمی بەعس، باوکی بەرکەوتبوو، گیانی لەدەست دابوو. ( بە ماشێنی کرێ هاتبوون، پێم گوتن: لە گەڕانەوە جێگای ئێوەش دەکەینەوە، لەگەڵ ئێمە وەرنەوە پول سەرف مەکەن).

لەرێگا زانیم ئەو کوڕە ناوی سمکۆیە، یەک دوو ساڵ دواتر دوای ڕاپەرین ئەو کوڕەم بینییەوە، گوتی: کاک حازم، ماڵمان هێناوەتە پیرانشەهر. (لەگەڵ براوبرازنی دەژیا) ماوەیەک نەمبینییەوە، بۆ پایز جارێکی تر بینیمەوە، لەبەرچاوم نزیکەی سی کیلۆی کەم کردبوو، وەک لە تەندوور وشک کرابێتەوە، هێندە کز ببوو، لوتت بگرتبایە ڕۆحی دەردەچوو، گوتم: سمکۆ گیان ئەوە لەکوێ وات بەسەرهاتوە؟ دەڵێی نەخۆش کەوتوی؟!! گوتی: نەخۆش نەکەوتووم، لەبەهارێوە لەهەمەدان لە کورەخانەم، ئێستا گەڕاومەتەوە. قەڵەو دەبمەوە هیچ نییە. (ئاخر کاری کورەخانە وەک زۆرخانە وایە، گاورکارە سێی شەو هەڵدەستن تا ئێوارە خشت دەبڕن) منیش گوتم: ماڵتان لە کام گەڕەکە؟ گوتی: لەکۆنەخانێ. گوتم: منیش لە کۆنەخانێم!! گوتی: ئەی ماشێنەکەت؟ گوتم: چیرۆکی دوورە، لەدوای ڕاپەرین خەریکی هێنانی جەلەب بووم، کە قەت کاری من نەبوە، من تەنها مەڕوبزن لەیەکتر جیادەکەمەوە. لەرێگای چەند برادەرێک

کە دیناربوو بە سێ تمەن (٣٨٢٠٠٠) دیناری سویسری زەرەرمان کرد، بۆیە من هیچم نەماوە، دەبێ سەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە. گوتم: ئەی تۆ؟ گوتی: پارەی ئەسپێکی چاکم هێناوەتەوە، ئەو ساڵ کاری پێ دەکەم، لەنێوان حاجی ئۆمەران و پیرانشەهر، خۆم تەکمیل دەکەم، ئەو کچەی کە زۆر خۆشم دەوێ زەماوەندی لەگەڵ دەکەم، دەبێ تۆش ئامادەبی. لەو ڕۆژەوە کە چاوم بەسمکۆ دەکەوت، دەمگوت: کەی ئەو کفتە و ترشەمان دەدەیتێ؟ دەیگوت: هێندەی پێشوی نەماوە. ئەو ئەسپەی ئەوەندە خۆش دەویست، هەموو ئومێدی ژیان و هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستەکەی لەسەر پشتی ئەو ئەسپە کۆکردبوەوە.

هەموو جارێک کە دەمبینی لە ئەسپەکەی دادەبەزی، لەدوای چاک و چۆنی دەستی بە لامل و نێوچاوانی ئەسپەکەی دادەهێنا و موروە شینەکانی ملی بۆ ڕێکدەخست، کە لەبەر چاوو زار لە ملی کردبوو، لەگەڵ قەشاویش، دەیگوت: دەبەرت مرم تاکە وەسیلەی ژیانی ئایندەی من..

ڕۆژێک گوتیان: ئەو شەو قاچاغچی کەوتونەتە کەمین، ئەسپێکی زۆریان لێ کوشتوون، یەک لەو ئەسپانەی کوژرابوو بە گوللەی پاسدارانی ئێران، ئەسپی کاکە سمکۆی ئومێد هەڵوەریو و عاشق بوو، ئەوەی بە ئارەقەی نێوچاوانی لەهەمەدان پەیدای کردبوو، کردیانە قوربانی چەند فیشەکێک. کاکە سمکۆم بینی زۆرم دڵنەوایی دایەوە، بەناچاری دەستی بە کرێکۆڵی کرد، بۆ زانیاری ئەو شتانەی ئەوان لە حاجی ئۆمەران دەیانهێنا، شتی قاچاغ نەبوو، بەلام چونکە بە ئیجازەی دەوڵەتی نەبوو پێیان دەگوتن: قاچاغچی (کرێ کۆڵ)، (کرێ کۆڵ بەو کەسە دەگوترێ کە بەپشتی خۆی لەجیاتی باربەرەکان شتومەک دەگوێزێتەوە، ڕۆژ نەبوو لێیان نەکوژرێ بە ئێستاشەوە، ئەمرۆ کە خەریکی نوسینی چیرۆکی سمکۆم، هەواڵی ئەوەم زانی چوار کرێکۆڵ لە پیرانشەهر کوژراون، زۆربەیان لەبەفر ڕەق دەبوونەوە، هەتا بەهارێ تەرمەکانیان نەدەدۆزرایەوە لەژێر بەفر، لەبیرمە حاجی برایمە سور باوکی کاک خالید، لەناو بەفر ڕەق هەلات، چێودار بوو چوینە سەرەخۆشی).

ڕۆژێک کاک سمکۆ کۆڵەکەی زۆر سەنگین بوە، پاسدار تەقەیان لێ دەکەن ئەوانیش هەڵدێن، سمکۆ لەبەرئەوەی زۆر بێ هێزو کز ببوو لە کورەخانە، بەسەر دەموچاویدا دەکەوێ، ددانی پێشەوەی دەشکێ. دەموچاوی لەخوێن

که دیناربوو به سێ تمەن (٣٨٢٠٠٠) دیناری سویسری زەرەرمان کرد، بۆیە من هیچم نەماوە، دەبێ سەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە. گوتم: ئەی تۆ؟ گوتی: پارەی ئەسپێکی چاکم هێناوەتەوە، ئەو ساڵ کاری پێ دەکەم، لەنێوان حاجی ئۆمەران و پیرانشەهر، خۆم تەکمیل دەکەم، ئەو کچەی که زۆر خۆشم دەوێ زەماوەندی لەگەڵ دەکەم، دەبێ تۆش ئامادەبی. لەو ڕۆژەوە که چاوم بەسمکۆ دەکەوت، دەمگوت: کەی ئەو کفتە و ترشەمان دەدەیتێ؟ دەیگوت: هێندەی پێشوی نەماوە. ئەو ئەسپەی ئەوەندە خۆش دەویست، هەموو ئومێدی ژیان و هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستەکەی لەسەر پشتی ئەو ئەسپە کۆکردبوەوە.

هەموو جارێک کە دەمبینی لە ئەسپەکەی دادەبەزی، لەدوای چاک و چۆنی دەستی بە لامل و نێوچاوانی ئەسپەکەی دادەهێنا و موروە شینەکانی ملی بۆ ڕێکدەخست، کە لەبەر چاوو زار لە ملی کردبوو، لەگەڵ قەشاویش، دەیگوت: دەبەرت مرم تاکە وەسیلەی ژیانی ئایندەی من.. .

ڕۆژێک گوتیان: ئەو شەو قاچاغچی کەوتونەتە کەمین، ئەسپێکی زۆریان لێ کوشتوون، یەک لەو ئەسپانەی کوژرابوو بە گوللەی پاسدارانی ئێران، ئەسپی کاکە سمکۆی ئومێد هەڵوەریو و عاشق بوو، ئەوەی بە ئارەقەی نێوچاوانی لەهەمەدان پەیدای کردبوو، کردیانە قوربانی چەند فیشەکێک. کاکە سمکۆم بینی زۆرم دڵنەوایی دایەوە، بەناچاری دەستی بە کرێکۆڵی کرد، بۆ زانیاری ئەو شتانەی ئەوان لە حاجی ئۆمەران دەیانهێنا، شتی قاچاغ نەبوو، بەلام چونکە بە ئیجازەی دەوڵەتی نەبوو پێیان دەگوتن: قاچاغچی (کرێ کۆڵ)، (کرێ کۆڵ بەو کەسە دەگوترێ کە بەپشتی خۆی لەجیاتی باربەرەکان شتومەک دەگوێزێتەوە، ڕۆژ نەبوو لێیان نەکوژرێ بە ئێستاشەوە، ئەمرۆ کە خەریکی نوسینی چیرۆکی سمکۆم، هەواڵی ئەوەم زانی چوار کرێکۆڵ لە پیرانشەهر کوژراون، زۆربەیان لەبەفر ڕەق دەبوونەوە، هەتا بەهارێ تەرمەکانیان نەدەدۆزرایەوە لەژێر بەفر، لەبیرمە حاجی برایمە سور باوکی کاک خالید، لەناو بەفر ڕەق هەلات، چێودار بوو چوینە سەرەخۆشی).

ڕۆژێک کاک سمکۆ کۆڵەکەی زۆر سەنگین بوە، پاسدار تەقەیان لێ دەکەن ئەوانیش هەڵدێن، سمکۆ لەبەرئەوەی زۆر بێ هێزو کز ببوو لە کورەخانە، بەسەر دەموچاویدا دەکەوێ، ددانی پێشەوەی دەشکێ. دەمووچاوی لەخوێن

سور دەبێ، یەکێکیان لێ دەکوژرێ دووانیش بریندار دەبن، (کوژراوەکە خەڵکی کارخانەو بریندارەکان خەڵکی مەهاباد بوون)، لەدوای چەند ڕۆژێک، کاکە سمکۆم بینی، نەمزانیبوو وای بەسەرهاتوە، کردم بە گاڵتە لەگەڵی، گوتم: تازە کچیش مێردت پێ ناکەن بەو دەموفلچەت. گوتی: کاک حازم، ئەو کچەی من خۆشم دەوێ ئەگەر چاوێکیشم کوێر بێ هەر مێردم پێدەکات، نەک ددان شکان. گوتی: ئەو کاسبیەی من دەیکەم وەک مارو پەیژە (زارومار) وایە، هێندەم نامێنێ سەرکەوم، لەناکاو دێمەوە لای بنی. دەبێ دووبارە دەست پێ بکەمەوە. لەکرێ کۆڵی بەردەوام بوو، هەموو جارێ دەیگوت: بەس پووڵی گواستنەوەو هاوسەرگیری ئەو کچەتیوەم دەست بکەوێ، چی تر ئەو کاسبیە ناکەم، ئەوەی ئێمە دەیکەین، کاری مرۆڤ نییە، لەهەموو جیهان ئەوە کاری ئەسپ و ئێسترە، ئێمە باجی کوردبوونمان دەدەین.

ڕۆژێک بایەکی ساردی وشکی هەڵکردبوو، چلوورە بە ساپیتەی خانوەکان هاتبوە خوار، لە فلکەی سەردەشت هەر بۆ خۆم هەستم دەکرد وژە وژی دار تێلەکانی بەرقی شار شینێک دەگێڕن، لەناکاو گوتیان: ئەم شەو دوو کوڕی گەنج، لە کرێ کۆڵی، لە بستوی شینکی لەسەروی کانی خوای، کەوتوونەتە کەمینی پاسدارو بەسیج، هەردووکیان کوژراون. لەناکاو لەکۆنەخانێ بوو بەشین وهاوار، یەک لەو دوو کرێکۆڵە، کاکە سمکۆی عاشقی پاک و بێگەردی کوردەواری و فەرهاد و کاکەمەم و سیامەندی کوردان، بەمجۆرە نەگەیشتە مەعشوقەکەی. لەبەر ئەستووری زوڵمی دەستی داگیرکاری و تاوان. ئەوکات گوتم: کوردبوون چەند بە ئازارە و باجی چەند قورسی دەوێ، زلهێزو دەسەڵاتدارانی دنیا ئەگەر بیانەوێ، ئازارەکانمان ئەزموون بکەن، با تاکە یەک ڕۆژ ببنە کورد.

## من زانیومە مەلا هەر زاری گورگی ببەستن!!

لەدێڵزێ دوو مزگەوتی لێبوو، مزگەوتێک بزوتنەوەی ئیسلامی نوێژیان لێ دەکرد، دەیانگوت: ئەگەر یەکێتی لێرە نوێژ بکەن، نوێژمان بە بەرناکەوێ. یەکێتیش بەهەمان شێوە. دوایی یەکێتی پارەیان کۆکردەوە مزگەوتێکی تایبەت

بە یەکێتیەکانیان دروستکرد. هەر کەسێک ئەگەر بهاتبایە ئۆردوگا، نەیدەزانی لەمزگەوتی کامیان نوێژ بکات گومرا نابێ و لە ڕیزی ئیمانداران دەژمێردرێ!! من هەمیشە دەمگوت: لەهەموی چاکتر ئەوەیە، هەتا ئەو دوو لایەنە بەشەڕ هاتوە بۆمان ساغ دەکەنەوە لەکام مزگەوت نوێژ بە بەر دەکەوێ، وا چاکە ئەو ماوەیە پیاو سەر بە فەززی خوای دانەگرێ و ببێتە تاریک و سەلات.

لە پیرانشەهر کوڕیکی حاجیاوام بینی، پێشتر لە ڕێگای پورزایەکانم ناسیبووم بەناوی (ع). پیاوێکی تەمەن (٤٠) ساڵی لەگەڵ دابوو، بەیەکتری ناساندین، ناوی (ر) بوو، گوتی: کاک حازم، خوشکێکم داوەتە ئەو پیاوە، ماڵی لە پیرانشەهرە، پێم خۆشە یەکتر بناسن. ئەوەبوو ڕۆژێک خۆی و خێزانی هاتن بۆ دێڵزێ، میوانی ئێمە بوون، ئێمەش بەگوێرەی توانا خزمەتمان کردن. لەو ڕۆژە بەدواوە، لەهەر شوێنێک یەکتریمان بینیبایە هەواڵ پرسی یەکترمان دەکرد. ڕۆژێک کاک (ر)م بینی لەگەڵ خێزانی، دەچوونە لای دکتۆر، منیش هەواڵم پرسین. (ر) گوتی: خێزانم نەخۆشەو دەیبەمە لای دکتۆر، بێ ئەوەی من لێی بپرسم، چوە ناو وردەکاری نەخۆشیەکەی، گوایە خوێن ڕێژی کردوە، لەکاتی سوڕی مانگانە خوێنەکەی نەوەستاوە.

خوا حافیزیمان لەیەکتر کرد، ئەوان بۆ لای دکتۆر، منیش بۆ فلکەی سەردەشت، بە مامەڵە و کەسابەت، سەرقاڵ بووم. لەدوای چەند ڕۆژێک کاک (ر)م بینییەوە، ئەوجارە بەتەنیا بوو، هەواڵی خێزانیم پرسی، گوتم: ئێستا تەندروستی چۆنە؟ یەکسەر چوە ناو وردەکاری نەخۆشیەکەی، گوتی: زۆر شوێنم پێکردوە، هەتا چوومەتە لای مەلاش نوشتەم بۆ کردوە، بەڵکو بەو نوشتەیە خوێنەکەی ڕابگرێ، بەڵام بێسودە. بەسەری تۆ ئێستاش (تکە)ی واتە دڵۆپەی هەر دەکا. منیش گوتم: من زانیومە مەلاکان زاری گورگی دەبەستن، بەڵام ئەوە یەک بە ژیانم بزانم، مەلا دەستکاری ئەو شوێنەی....ژنان بکەن و بیبەستن وەک زاری گورگی !! ئیدی نزای چاک بوونەوەم بۆ خێزانی کردو ماڵ ئاواییم لێکرد، گوتم: کاکە ئەوە ئیشی دکتۆرە نەک مەلا.

# بمزانیبایە چاویلکەم بۆ دێنای

ئێوارەیەک سێ ناسیاو (بۆرە خزم) هاتبوون، دەیانویست بڕۆن بۆ دەرەوەی وڵات، چاوەڕوانی قاچاغچیان دەکرد، کاتێ هاتنە ماڵی ئێمە، نیوکاتژمێری مابوو بۆ نان خواردن. لە نایلەی هاوسەرم پرسی: هیچمان هەیە؟ گوتی: برنجەسورە. منیش چووم، چەند شیش کەبابێکم هێنا لەسەر برنجەسورەکە دانێین. هەر سێکیان لە من بەتەمەن بچوکترو گەنج تر بوون، قەت لەقسەی من دڵگران نەدەبوون.

کاتێک کە دەچوومە باشور دەبوونە خاک و خۆڵ لەبەرپێم. منیش زۆرم خۆشدەویستن، وەک برادەرو هاوتەمەنی خۆم هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکردن. یەکێکیان تەنها کەبابەکانی دەخوارد، بەلای برنجەسورەدا نەدەچوو، لەکاتێکدا دەبێ بەپێخۆر بیخۆی.

یەکێکیان گوتی: (ی) ئەوە بۆ برنجەسورەی لەگەڵ ناخۆی؟ (ی) گوتی: من لەماڵەوەش برنجەسورەی ناخۆم، ئێستا برنجی سپی بوایە دەمخوارد. منیش لەدەمم دەرچوو گوتم: بمزانیبایە (عەینەکم) چاویلکەم بۆ دێنای، ئەوانیش وەک پیشەی هەمیشەییان دەیانزانی شتێک لەپشت ئەو عەینەکەوە هەیە، وازیان نەهێنا، دەم نا دەم دەیانگوت: دەبێ چیرۆکی ئەو چاویلکەیە بزانین، دوانەکەی تر دەیانەویست شتێک لەسەر (ی) پەیدا بێ بۆ پێ ڕابواردن و پێکەنین.

سفرەو نان هەڵگیرایەوە، چایان هێنا، گوتیان: کاک حازم ئێنجا بۆمان بگێڕەوە، منیش گوتم: برادەرێکم هەیە ناوی (حوسێنە شەلی میراوێ)یە، گوتی: ئەسپێکم هەبوو، فێربیبوو، تەنها وێنجەی شینی دەخوارد، کە وشک دەکرایەوە بۆ زستان وەک کا ورد دەکرا.

کاتێک وێنجەی گزرەمان نەما، ئەسپەکە کای سپی بەهیچ شێوەیەک نەدەخوارد، بیرمکردەوە چاویلکەیەکی سەوزم بۆ پەیدا کرد، پێم وابوو هی مەلەوانی بوو، لەچاوی ئەسپەکەم کرد، کایەکەم لەپێش دانا، هەر قەپاڵی لێی دەدا یەک کیلۆ کای هەڵدەگرت، بەنیازی وێنجەی گزرە، هەر زوو ئاخوڕی چۆڵکرد. هەموی

خــوارد. منیش ئەگــەر بمزانیبایە چاویلکەم بۆ (ی) دەهێنــا، بۆ ئەوەی ڕەنگی برنجــە ســورەکە بگــۆڕێ، لەپرمــەی پێکەنینیان دا، چایان لــە لوتی دەرپەڕی، ئێســتاش دەڵێن ئەو چاویلکەیەت بۆ فڵان پەیدا نەکرد؟!!

## لە ڕۆژهەڵات ئێستا لەمێژبوو خەوتبووم

لە پیرانشەهر بەڕێکەوتم بۆ هەولێر، ئەوکات دایکم و هەردی و تانییەی خوشکم، لــە دارەتوو بەیەکــەوە دەژیان. هاوین بوو، هەردی دراوســێیەکی هەبوو بەناوی ئەحمەد (جگە لە دراوسێیەتی خۆی بە خزمیش دەزانی). هەردی گوتی: شەوێک لەگەڵ ئەحمەد ســەردانی دوو ماڵمان کردبوو، شــەو درەنگ داهاتبوو، ئەحمەد قاچی کەوتبوە نێو چڵکاوێ، شــەڕواڵی پیس ببوو، لەماڵی هەردی دەیشواتەوە، دەڵــێ: کاک هەردی کەڵکی چ ماڵی ترمان نەما!!

ئــەو ئێوارەیــەی من گەیشــتمە دارەتــوو، لای ماڵی هەردی و دایکــم، دوای نان خواردن، ئەحمەد پەیدا بوو، لەناو فریز دانیشــتبوین زۆر ماندوو بوین، ئاخر لە پیرانشەهرەوە بۆ هەولێر زۆر دوورە. بەڵام کاک ئەحمەد وەک هەردی بۆی باس کــردم، کــە چوە ماڵێک تا بەخۆی لەو ماڵە خەوی لێ نەکەوێ ناڕوات. بەڵام من لەبیــرم نەمابوو. هەردی لەلامان دانەنیشــت گوتی: من دەخەوم. هەر بۆ ئەوەی کاک ئەحمەد هەڵبســتێ و بڕوا. باســی گوندەکەی خۆیان و دەوروبەری دەکرد. هەر هەموی لەگێشکەو سەلەند دا، هەروەک گێڕانەوەی ئەو نوسینانەی کە ئێستا من خەریکم دەیاننووســم، بە هەلەق و مەلەقی، جاری وایە لەســەری دەچمەوە بنــی و بــە پێچەوانــەوە. کاک ئەحمەدیش وەک من کەوتــە گیانی ڕووداوەکان و گێڕانەوەیان.

مــن تەنها ســەرم بــۆ دەلەقاند. لە ناکاوێک تفەنگەکەی دەســت دایە هەســتاوە ســەر پێیــان، منیش هەروەک هەمــوو خاوەن ماڵێک گوتم: بــۆ دەڕۆی خۆ زوە دانیشــتوی؟ گوتــی: وامزانــی تــۆ خــەوت دێ، مادام دادەنیشــمەوە، یەکســەر دانیشــتەوە. هــەردی لــە پەنای دیواری حەمــام کە منــی لێوەدیاربوو، بەس لە

ئەحمــەدی دیارنەبــوو، بە ئامــاژە تێی گەیانــدم زۆر لەو تەکلیفە نــا بەجێیەی مــن تورەبــوە، بە ئاماژە دەیگوت: هەتا مەلا بانگ دەدا دەبێ لەگەڵی دانیشــی. دایکم لەســەر قەرەوێڵەکەی نوســتبوو، لەبەردەمی ئێمە پرخەی دەهات، منیش دەمگوت: خۆزگەم بەخۆت، دەڵێی بەرخی تێر شــیرە، خەوی خۆشــە. ئەحمەد دەیگــوت: پلــە بەدیعە زوو دەنوێ. تانییە گوتــی: کاک حازم لەکوێ جێگات بۆ ڕابخەم؟ گوتم: لەسەربانی. دەمێک بوو جێگام بۆ ڕاخرابوو، گوتم: کاک ئەحمەد دەچمە ســەربان بزانم جێگای خەوتنەکەم چۆنە؟
چوومە ســەربان، دەمگوت: ئای چەند فێنکە ئەو جێگایە، چەند ســارد داهاتوە، کاک ئەحمــەد بەخــوا هەر زێنەتە لەســەری بنوی. بەڵام ئەحمــەد مێش میوانی نەبوو!! هاتمەوە خوارێ دانیشــتم، گوتی: کاک حازم لە ئێران بەچی خەریکی؟ منیــش گوتــم: لە ئێران ئێســتا لەمێژبــوو خەوتبووم. گوتی: ئاخر نیو ســەعات لەپێش ئێرەیە. ئەدی کاک هاوار لە ســوید چی دەکا؟ گوتم: کورە هەر دەنوێ. گوتی: ســوید زۆری فەرقە لەگەڵ ئێرە. گوتی: ئەدی ئاســۆی برات لەچوارقورنە چی دەکا؟ گوتم: چوارقورنە لەگەڵ ئێرە یەک کاتیان هەیە بەخوای ســێ چوار کاتژمێر دەبێ ئێســتا ئاسۆ خەوتوە. گوتی: ئەدی پورزایەکانت؟ گوتم: بەخوای ئێستا هەموویان حەوت زەمانە خەوتوون، لەچوارقورنە زەی ڕوح بە خەبەر نییە!! گوتم: کاک ئەحمەد کات ئێستا زۆر درەنگە، بەراست چەندی ماوە مەلای بەیانی بانگ بدات؟ لەناکاو گوتی: ئۆە، بەخوای شەومان درەنگ کرد، هەستاو ڕۆیشت.

## جەنابی تەگە

لەدێلزێ مینەبۆسێک (پاس)کە لەبەیانی تا ئێوارە لە نێوان دێلزێ و قەڵاتە ڕەش و ئۆردوگا، خەڵکی بۆ پیرانشــەهر دەگواســتەوەو بە پێچەوانەوەش. خاوەنەکەی کاک ڕەحیم و خەســرەوی کوڕی قادر خەســرەو بوون، لەو سەروبەندە مام قادر توشــی نەخۆشی شــێرپەنجە ببوو، زۆر دکتۆریان پێ کرد، هەوڵی چارەسەریان

دەدا. ڕۆژێک کاک ڕەحیم گوتی:
کاک حـازم، گوایـە لەهەولێر لـە کۆمەڵگای دارەتوو ( تەگەیەک) هەیە شـیری تێدایە نەخۆشـی شـێرپەنجە چاک دەکاتەوە، ئایا تۆ چی لە بارەیەوە دەزانی؟ منیش گوتم: تەنها لەخەڵکم بیسـتوە بە خزمەتی نەگەیشـتوم! هیچی لەبارەوە نازانم. دوای ماوەیەک کاک ڕەحیم گوتی: شـیری تەگەمان بۆ باوکم پەیدا کرد، دیاربـوو باوکیان بردبـوە دارەتوو لەهەولێر، دەیانگـوت: خەڵک هێندە ڕوی تێ دەکات وەبەرناکەوێ، قیمەتی ئەو تەگەیە زۆر چووبوە سـەرێ، هەزاران دۆلاری دەکـرد. هەتا پێنج هەزار دۆلار چووبوو!!
دوای ماوەیەک مام قادر کۆچی دوایی کرد. بەڵام ناوبانگی ئەو تەگەیە باشوری کوردسـتانی تێپەڕانـد، عێراقـی تێپەڕانـد، لە ئێـران خەڵک بـۆ خزمەتی تەگە دەچوونە دارەتوو، بۆیە ئەو تەگەیە پاسـەوانی چەکداری هەبوو، کە جاروبار بە فیزەوە پیاسـەیەکی دەرەوەی دەکرد، هەمیشـە دوو چەکداری لەدوا دەڕۆیشت. خزمێکمان دراوسێیان بوو دەیگوت: زۆر لە ژنی بەرپرس و کاربەدەستانی باڵای هەرێـم سـەردانی تەگەکە دەکەن. ئـەوەی بۆ من جێگای نیگەرانی بوو کەسـی وا هەبـوو هەر لەخۆیەوە هەزار سـوێندی دەخوارد کە شـیری تەگەکە، چەندان نەخۆشـی شـێرپەنجەی چاک کردۆتەوە. من پێنج کەسـم پێ شـک دەهات کە شیریشیان خوارد بوو بەڵام مردن.
بـە مۆبایـل قسـەم لەگەڵ خاوەنەکـەی کرد، زانیـاری دامێ، ڕەنگـی تەگەکە سـوری خورمایی بوو، سـاڵی ١٩٩٨ کاتێـک نەخۆش کەوتبـوو، بردبویانە لای دکتۆر، ئەو گوتبوی شـیری تێدایە، گوایە لە مسـرِ شتێکی لەو شێوەیە ڕویداوە نەخۆشـی شـێرپەنجەی پێ چاک بۆتەوە، بەو شێوەیە ئەو ناوبانگەی پەیداکرد. بەداخـەوە لەدوای تەگەی گۆرین، نازانم پاسـەوانەکانی بۆ کوێ گوازرانەوە بەو هەموو پێشـینەی خزمەتەوە. کە نۆ سـاڵ تەمەنی کرد. دوایی کرا بە قوربانی. خاوەنەکـەی گوتی: پاسـەوانەکانی تەگەکە خزمەکانی خۆمـان بوون، موچەیان هەبـوو، ئاسـۆی برام تەگەکەی بە دوو پاسـەوانەکەوە بینی بـوو کە هەنگاو بە هەنگاو بەدوایەوە بوون بە چەکەوە.

## ئەتۆ چیت پێ خۆشە ئەوە بخۆ

لەئۆردوگای دیڵزێ من جار جار سـیرم دەخوارد، لە ئێران سـیر زۆر دەخورێ، بـەڵام لـە کوردسـتان کەمتر، چوومە نـاو جێبێک بۆ ئەوەی بچمە پیرانشـەهر، دوو سـێ نەفەری تێدابوو، هەریەکە لەراسـتی خۆی گوتی: دەڵێی یەکێک سیری خـواردوە؟ منیـش تەبای ئەوان دەمگوت: دەبێ کێ بێ؟ لەناکاو کوڕێکی قەلاتە ڕەشێ کە قاچاخی حاجی ئۆمەرانی دەکردو وڵاخدار بوو، کوڕێکی زۆر باش بوو، زۆر ڕێزی منی دەگرت، بەس زۆر جار قسەی دەکرد لێی ورد نەدەبووەوە، گوتی: ئەوە کێ سـیری خواردوە، قەسـەم بەخواڵای ئەمن گووم پێ لە سیری خۆشترە. منیـش گوتـم: قـەت بێ دڵی خۆت مەکـە، بەمرۆڤ دەگۆڕێ، هەیە سـیری پێ خۆشە هەیە شتی تر. ئەتۆ چیت پێ خۆشە ئەوە بخۆ، بوو بە پێکەنین گوتیان: دەڵێی ئەتۆ سیرخۆرەکەی؟!!

## مەقەر یان پایەگا

خەڵکی پیرانشەهر لەبەرئەوەی شارۆچکەیەکی سەر سنورە، زۆربەی خەڵکەکەی خەریکـی کڕین و فرۆشـتن و ئالوگـۆڕی کاڵای عێراقی و ئێرانین، وەک: جگەرەو شـتومەکی کارەبایی و شووشەوات و... .هەندێکیان خەریکی کرێبار گواستنەوەن بۆ ئێران، بە پشـتی ئەسـپ و ئێسـترەکانیان، هەیە ئەسـپی پێ ناکڕێ بە لابار ئەسـپێک یان ئێسترێک وەردەگرێ، مانای نیوە کرێیە، لایەکی بارەکە بۆ خۆی، لایەکـی تر بۆ خاوەن ئەسـپەکە. خەڵکێکی تر کە توانـای هیچی نییە کرێکۆڵی دەکات بە پشـتی خۆی شت دەگوازێتەوە.

یـەک لە سـەرۆک جاشـەکانی پشـدەر بەناوی هەبـاس بایز کە لـە ١٩٨٩ هاتە ئێـران، کاری بـۆ جمهوری ئیسـلامی دەکرد. ( کاتی خـۆی برایەکی مام جەلال بەناوی شێخ حەمە ساڵح و خێزانەکەی و دوو کچی کوشتبوو لە گوندی کەلکان،

یەکێتی لەترسی سوپای پاسداران نەوێران دەستی بۆ ببەن) پەیوەندی تایبەتی بەدەر لەیەکێتی و پارتی لەگەڵ جمهوری ئیسلامی، یان باشترە بڵێم: سوپای پاسداران هەبوو، بەرگەی بۆ خەڵک دەکرد بۆ هاموشۆی عێراق، بەتایبەتی خەڵکی ئاکۆو پشدەر خەڵکێکی زۆر ڕویان لەدیوەخانەکەی دەکرد بۆ بەرگەی هاتوچۆ. لەدوای ڕاپەڕین بوو بە پارتی، بە ئاگاداری سوپای پاسداران و پارتی لە حاجی ئۆمەران لەدوو شوێنی سەرسنور (پەتک و هەورازی شینکی) بازگەی دانا، خەڵکی دوژمنداروو قاچاخچی ئەودیوو ئەم دیو، دەوریان لێدەدا. ئەو بازگانە وەک بیرە نەوت وابوون، هەموو خاوەن بارێک کە باربەری هەبوو( دوو هەزار) تومەن و کرێکۆڵ (هەزار تومەن)ی لێوەردەگیرا. خەڵکی ڕۆژهەڵات بەو ڕووتکردنە زۆر نارەحەت بوون، من زۆربەی پیاوەکانی هەباس بایزم دەناسی، دەمگوت: وەرن بۆم ساغبکەنەوە ئێوە ئەگەر لە ئێرانن دەڵێن: لەپایەگای سەرێ بوین. لەحاجی ئۆمەران دەڵێن: لە مەقەڕی سەرێ بوین. بزانم ئێوە پایەگاتان هەیە یان مەقەر؟!! پێدەکەنین و دەیانگوت: کاک حازم، شەرتی پوول پەیدا کردنە.

هەباس بایز دەچوو بۆ حەج، برادەرێکی منی لەگەڵ خۆی نوسیبوو، بێ ئەوەی لەبەرنامەی دابێ بچێتە حەج، هەموو جارێ پێم دەگوت: ئەتۆ بۆ حەج نابی، بەس خوا ئەوەی بگرێ تووشی کردی.

ڕۆژێک یەک لەو پیاوانەی هەباس بایز، لەسەر بەردێک دادەنیشێ لەخاڵی گومرگەکەیان لەسەرێ. یەک لەکاروانچییەکان لەخوارێ بەرەو ئەو هەورازە سەردەکەوێ، هێنکە برو پشوو سوار دەبێ، وڵاخی هەریەک بەلایەکدا دەڕوا، بۆی خڕنابنەوە. پیاوەکەی هەباس ئاغا بانگی دەکا، دەڵێ: وەرە لە وڵاخەکان بگەڕێ، دوو قسەی خۆشم بۆ بکە، ئەویش کە بەو پارەی لێی وەردەگرن، زۆر دڵگران دەبێ و ڕقی زۆر لێ هەڵدەگرێ دەڵێ: کاکە کیری تۆ بە قوزی دایکی من، قسە لەوەی خۆشتر؟!!

ڕۆژێک لەپایەگای شینکێ، لەسەر پارە، کوڕێکی پیرانشەهری (وا بزانم ناوی ئاکۆ بوو)، بەکێشە هاتبوو لەگەڵ پیاوەکانی هەباس بایز، تەقەیان لێکردوو کوشتیان. خەڵکی پیرانشەهرێ خۆپیشاندانیان کرد، هێرشیان کردە سەرماڵی. هەباس بایزو پیاوەکانی هەڵاتن، ماڵەکەیان وێران کرد، لەبەرئەوەی خەیلانییەکان

و زۆر لەپیاوەکانــی لەدێلــزێ بوون، دەیانویســت هێرش بکەنــە دێلزێش، کە لە پیرانشــەهر گەڕامــەوە دێلزێ، ماڵــی ئێمە پڕ بوو لە چەک و پارەو زێڕو هەرچی شتی بەنرخە. پیاوەکانی هەباس بایز هێنابویانە ماڵی ئێمە. بە نایلەی هاوسەرم گــوت: هــەر لێتان تێک نەچێ شــتەکانیان بگۆڕی و ئێمــە لەکەداری بین. دیارە ڕۆژێک (ز) و خێزانی هاتبوونە ئۆردوگا، کەس تەکلیفی نەکردن، ئەوانەی ڕۆژانە لە دیوەخانی هەباس بایز و لەپشــتەوەی پیکابەکەیان ســوار دەبوون بۆ حاجی ئۆمــەران، هــەر هەمویان ڕویان لێ وەرگێڕان. من بــە ژیانم نە دیوەخانەکەی نە بەرگە نە ســواری پیکابەکەیانم دیبوو، لەســەرجادە تەکلیفی نان خواردنم لە (ز) کــرد، هاتە ماڵی ئێمە کە دەیویســت بڕوا بــۆ دەرەوەی وڵات. پێش ئەو ڕووداوە بایز ئاغای نێوەژی، لەماڵی فەتاحی بایزە پوچی یەکترمان بینی، بۆ خۆ شیرین کردن لەلای هەباس بایز گوتبوی:

حازمێکی کۆنە شــیوعی گوتیتی: پەکەکە پیاوەکانی کاکەباســیان چەک کردوە، هەباس بایز بەو قســە زۆر نارەحەت ببوو، لەدوای وســوی کوێخا مینەی ســەر گەینێڵێن و حاجی مەحمود خەیلانی ناردبوو، گوتبوی: ئەو حازمە کۆنە شیوعیە کێیــە؟ ئەوانیــش برادەرم بوون هەتا توانیبویان باســی چاکــەی منیان کردبوو، کاک وســو پێی گوتم: وەرە با ڕۆژێک بچین بۆ دیوەخان، خۆت قســەی لەگەڵ بکە، گوتم: کاک وســو من خۆم دەناســم، کاکەباســێک پیاوی سوپای پاسداران هەموو مەقاماتی ئێرانی دەیناسن لە ئێران، لەعێراق پیاوی کاک مەسعود بارزانی هەمــوو ڕۆژێ دەچێتــە لای. چۆن مــن دەتوانم پەنجەی لەگــەڵ بگرم بەتایبەتی لەئێران، ئەگەر باوەڕدەکا شــتی وام نەگوتوە، بۆ چونە دیوەخانیش ئێســتا بێم دەڵێــن: لەترســان خۆی هاوێشــتە دیوەخانــی کاکەباس، بۆیە نایــەم باجەکەی هەرچی بێ. هەر ئاوایان بۆ گێڕابوەوە، ئەویش گوتبوی: دیارە خۆی پێ پیاوە، تــازە هیچــم لەبەر دڵی نەما. ڕۆژێک کامەرانی کوڕیم بینی، ئاخر کامەران لەروی کۆمەڵایەتی لەهەمویان چاکترە، گوتی: کاک حازم گوێی مەدێ، هەر کارێکیشت هەبــوو بەخــۆم بڵێ بۆت دەکەم. پاش خۆپیشــاندان و هێرشــکردنە ســەرماڵی هەباس بایز، پیاوەکانی کە دراوســێ و برادەرم بوون، پێیان گوتبوو: کاکەباس بەس باوەڕمان بەحازمی کۆنە شیوعی هەبوە کە ئەو شتانە لەماڵی ئەو دابنێین،

شتی ماڵی خۆیان بوو نەوەکو هی هەباس بایز، حاجی مەحمود خەیلانی گوتی: حازم، بە کاکەباسم گوتوە ئەوە برادەرەکەی من و ئەوەش پیاوەکانی تۆ.

## ئەو شریتە سێکسییە

ڕۆژێک سیروانی کوڕی خاڵم، داوای کرد، لە ئێرانەوە (بەکرەیەکی تەسجیل)ی لە ڕێگەی پۆستەوە بۆ ڕەوانەی سوید بکەم. لە گۆرانی و حەیرانەکانی حەسەن سیساوەیی. چووم بۆ پۆستەخانە، پێم گوتن: ئەو بەکرەی حەسەن سیساوەیی دەنێرم بۆ وڵاتی سوید. گوتیان: دەبێ بچی لە دائیرەی (ارشادی ئیسلامی) مۆری بکەی. چووم، داواکاریم نوسی لە (ارشادی ئیسلامی)، چەند ژوورێکم پێکرد، ئینجا بەکرەکەو داواکاریەکەیان گێڕایەوە، گوتیان: دوای دە ڕۆژی تر وەرەوە، ئەبێ لیژنەی فەتواو و هەڵسەنگاندن لەسەری بڕیار بدا. لەبەرئەوەی زۆربەیان فارس بوون، گوتیان: دەبێ تەرجەمەی بکەین، ڕستەی وای تێدا نەبێ ووروژێنەربێ و باسی ئافرەت بکات، ئەگەر بڕیاری لیژنەی فەتوای لەسەردرا، دەتوانی بینێری. دوای دە ڕۆژ چوومەوە گوتیان: لەسەری کۆنەبوینەتەوە، دوای دە ڕۆژی تر وەرەوە!! دوای ئەوەش چوومەوە، گوتیان: ئەو بەکرەیە حەرامە، باسی ئافرەت دەکات، لەکوێت هێناوە؟

دەستیان بەسەردا گرتبوو، گوتیان: دەبێ لیژنە تەلەفی بکات، ئەو بەکرەیە دژی شەرعی ئیسلامە. بیرم کردەوە ڕەنگە بەدحاڵی بوون هەبێ، منیش گوتم: بەکرەی من (شریتی زەفتە)واتە تەسجیل، نەک شریتی ڤیدیۆیی، چونکە ئەوان دەیانگوت: ئەو شریتە سێکسییە. منیش گوتم: شریتی من سێکسی نییە، من هەروام دەزانی بە هەڵە حاڵی بوون هەیە لەنێوان شریتەکەی من و یەکێکی تر. گوتیان: مەگەر ئەو شریتە هی تۆ نییە؟ لەسەری نوسرابوو تۆمارگای ئیخلاس، عەبدوڵا برادۆستی، حەسەن سیساوەیی. گوتم: بەڵێ. گوتیان: ئەوە باسی شوێنی حەرامی ئافرەت دەکات، دەڵێ مەمکی خڕە، منیش گوتم: مەگەر مەمکی ئافرەت خڕ نییە؟ خۆ چوار گۆشە نییە؟!! دوو مەلای ڕۆحانی ملە ئەستور دەتکوت پشیلەی چێشتخانەن، بەجووت لێیان قیڕاندم ( خەفەشود) واتە: بێ دەنگ . بە (برو بیروون) واتە: بڕۆ دەرێ. بەخوای سێ کووچەم بڕیبوو، هەر

ئـاورم دەدایــەوە، دەمگوت: چاك نەبوو نەیانگرتــم!! ئاخر، ئەوکاتە ئەگەر پیاو کراســی نیو قۆڵی لەبەر بایە، پۆلیس دەیگرت، ئەوەندەی گۆشــتەکەی لە قۆڵی دیــار بوایــە، بە بۆیەی دەرگاو پەنجەرە قۆڵیان بۆیــاخ دەکرد، بەو ڕەنگەی لەو کاتی لەبەردەستیاندا بایە.

## نە سودم هەیە نە زیان

هاوینی ١٩٩٢ لە پیرانشــەهر، دەمویســت پرســیاری عەولا کوندە بکەم، بزانم لە مــەرزی حاجــی ئۆمەران کەس نەیبینیوە؟ ماڵی (ڕەســو جەوزی) لەنزیک ماڵی ئێمە بوو، ڕۆژانە دەچوە مەرزی حاجی ئۆمەران، پێم باش بوو پرســیار لە کاك ڕەســو بکەم، لە دەرگای ماڵەکەیانمدا، گوتیان: فەرموو. بێ ئەوەی بزانن کێیە، وا دیار بوو چاوەڕوانی یەکێک بن، پەنجەرەی ماڵەکەیان زۆر نەوی و گەورەبوو. چوومە لای پەنجەرەکە، بەرپرسی ئیتلاعاتی پیرانشەهر (حاجی سەدرە) لەگەڵ ڕەســوجەوزی و ڕەحمــان پیرۆتی دانیشــتبوون. (ڕەحمان پیرۆتــی ئامر هێزی حیزبی دیموکرات بوو، لە پێشــوو لە پیرانشــەهر دانیشــتبوو، کاســبی کڕین و فرۆشــتنی ماشــێنی عێراقی دەکرد) لەبەر پەنجەرەکە سڵاوم کرد، بەخێرهاتنیان کــردم. پێش ئەوەی پرســیاری عەولا کوندە بکەم، کاك ڕەحمان و کاك ڕەســو ئەمنیان بە ئاغای ســەدرە ناســاند و زۆر بە باشی باسیان کردم، ئەویش سەری لەقاند، گوتی ( میشــنا سمش) دەیناسم، منیش گوتم:

ئاغای ســەدرە کە تۆ بەرپرســی ئۆرگانێکی هەســتیاری ئەو شــارەی، ئاساییە هەمــوو خەڵک تۆ بناســێ بە ئێرانی و عێراقــی پەناهەندەوە، بەلام تۆ چۆن من دەناســی؟ گوتی: ( شــما برای ما نا ســودی داری نەزری) واتە: تۆ بۆ ئێمە نە ســودت هەیە نە زەرەر. منیش گوتم: ئاغای ســەدرە، هەر یەکێ زەرەری نەبێ، واتــە: ئــەوە لەخۆیدا قازانجــەو مەنفەعەتە. ئاغای ســەدرە گوتی ( کومنیســت میدونــن چتــوری حرف مــی زنند)واتە: کۆمەنیســت دەزانن چۆن قســە بکەن و بدوێن.

گوتــم: مــن پەناهەندەم، هــەوڵ دەدەم ئەوەندەی لێــرەم، زەرەرم بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا نەبێ.. . پرسیم: کاك ڕەسو، کاك ڕەحمان، عەولا کوندەتان نەبینیوە

لەحاجی ئۆمەران؟

گوتیـان: بەڵێ بەیانی دێتە پیرانشـەهر، ئێمـەش داوای لاندگرۆزێکی یابانیمان کردوە، بۆمان دێنن بۆ ئاغای سـەدرە، بۆیە هاتوە لاندگرۆزێکی بۆ بکڕین. کاک ڕەحمان و کاک ڕەسو لەکڕینی ئۆتۆمبێل شەریک بوون، بەو شێوەیە ماڵ ئاواییم کرد، گوتم: بە کاک عەولا بڵێ: زوو بێتە پیرانشەهر موشتەری شتەکانیان هەیە. بەڵام هەسـتێکی خۆشـم هەبوو کەوا ئاغای سـەدرە بەو شـێوەیە منی ناسیوە، زەرەرم بـۆ کـەس نییە، تاوەکو ئازارم بدەن. (ئێسـتا کاک ڕەحمان پیرۆتی لە جەژنیکانە پێشـمەرگە و بەرپرسێکی حیزبی دیموکراتە).

# هەواڵ دەبێ گەرم بێت

لەئۆردوگای دێڵزێ، بەیانیان ماشێن بۆ پیرانشەهر کەم بوو، لەبەرئەوەی، زۆربەی خەڵکەکەی بەیانیان دەچوو بۆ پیرانشـەهر. ماشـێنێک وەسـتابوو لای دوکانی وەسـتا عەلی، یەک نەفەری دەویسـت، منیش دەرگام کردەوە ویسـتم سـواربم، وەستا عەلی بانگی کردم: کاک حازم، وەرە. نەدەکرا وەستا عەلی نادیدە بگرم، هەرچەندە دەمزانی شـوێنەکەم دەگیرێ، ماشێن بەجێمدێڵێ. چوومە لای وەستا عەلی، گوتم: فەرموو بۆ بانگت کردم؟ (لەو سەردەمە ئەمریکا و عێراق نێوانیان ناخۆش بوو لەسەر چەکی کۆکوژ.

دینـار لە هەڵکشـان و داکشـان دابـوو، من و کاک مەجیدی برای وەسـتاعەلی کریـن و فرۆشـتنی دینارمان دەکرد) وەسـتا عەلی گوتی: ئێسـتا دەنگوباسـی ڕادیـۆم گـوێ دا بویێ، ئەمریکا گەمارۆی زیاتر دەخاتە سـەر عێراق. منیش زۆر تورەبـووم، لەبەرئـەوەی ئەو هەواڵە ئەو گرنگییەی نەبوو، ماشـێن بەجێم بێڵێ. شەو ئەو هەواڵەم گوێ لێ گرتبوو، گوتم: وەستا عەلی جارێکی تر هەواڵ ئەگەر وەک ساواری گەرم هەڵمی لێ هەڵنەستا، بۆ منی مەگێڕەوە، برام من ئەو هەواڵە ساردوسـڕەم لە شـەوەوە گوێ لێبوە، هەواڵێکی کۆنە. ئێسـتاش وەسـتا عەلی دەڵـێ: هەواڵی گەرمم پێیە، بەڵام بۆت ناگێڕمەوە.

## قایمقام دەهۆڵ و زوڕنای دەکوتا

ئێمەی کورد خەریکی شـەڕکردن بوین لەگەڵ یەکتری، شـەڕێکی گەورە لەنێوان یەکێتـی و بزووتنەوەی ئیسـلامی ڕویدا، ئیسـلامیەکان لەنـاو کۆمیتەی یەکێتی لە ڕانییە، مەحەمەد سـوڵتان و چەند کەسـێکیان کوشـت، لەهـەردوولا کوژراو هەبوو، یەکێتیش هێرشـی کردە سـەر بارەگاکانیان لە بێتواتەو سەرئەشکەوتان، بارەگاکانیان گرتن، هێندە بە تامەزرۆییەوە ئەو شەڕەیان بەڕێوە دەبرد، دەتگوت سەدسـاڵە شـەڕی براکوژیان نەکردوە، زۆر بەجدی شـەڕیان دەکرد، لەوکاتەدا جەبار فەرمان سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد.

ڕۆژێک بەسـەفەر هاتمەوە بۆ باشـوری کوردستان، لەناو شاری ڕانییە بووم، بوو بەتەقە. پرسـیارمان کرد، گوتیان: هیچ نییە قایمقام دەگۆڕن، هەندێک تەقەی هەواییان بەسەردا کردوون. دوایی زانیمان کە بەڕێز(م.س) دەگۆڕن بە (خ.ق). ئـەوەی نوێیەکـە دەهـۆڵ و زوڕنـای هێنابوو، بۆ خۆشـی دەسـت بەکاربوونی، هەردووکیان لە یەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان بوون، پاسـەوانەکانی قایمقامی کـۆن تەقەیـان کردوە بەسـەر ئەوانـی تـردا. گوتویانە: ئەو دەهـۆڵ و زوڕنایە بیکوتێ، هەمووتان دەکوژین. نایەڵین کەستان دەرچێ. ئەو دەهۆڵ و زوڕنایە بۆ دژی ئێمەیە. لەباشور ببوە نەریت، هەر بەڕێوەبەرو قایمقام و مودیرناحیەیەک، ئەگـەر دەگۆڕا، هەموو فێنک کەرەوەو کورسـی و قەنەفەکانی دەبردەوە ماڵ بۆ خـۆی. دەیگـوت: بۆ من کڕاوە، بۆ کەسـی بەجێ ناهێڵم. سـەر لەنوێ تەواوی کەلوپەلەکان لەسەر پارەی خەڵک دەکڕدرایەوە.

## ناشێ بتەوێ خۆت بەگرتن بدەی

جێگای ئاماژە پێکردنە، پێش ژیانی پێشمەرگایەتیم لەفەرمانگە، ئەو سەردەمانەی کە شـۆفێری ئۆتۆمبیلی بارهەڵگربووم لە گواستنەوەو گەیاندن، کابرایەک لەگەڵ

ئێمــە لە فەرمانگــە فەرمانبەر بوو، بە ناوی ( س) خەڵکی لای دهۆک بوو، ڕۆژ نەبوو پەخەی من و خالید غەریب نەگرێ، دەیگوت: باشە ئێوە بۆ نابنە بەعسی؟ دیــارە ئێســتاش ئێوە شــیوعین! لەراســتیدا هیــچ پەیوەندیەکمان بــە حیزبی شــیوعیەوە نەمابــوو، بــەڵام ئــەو چڵکاوخۆرە ســیخوڕە، بــۆ ئافەرینێکی خۆی دەیویســت ئێمــە تووشــی دەردی ســەری و، هەتا بەرە و ڕوی مــەرگ بکاتەوە. زۆرجار لە پێشمەرگایەتی دوو کاتژمێر پاسەوانی شەوانم بە بیرکردنەوە لە (س) تەواودەکرد، چۆن ڕۆژێک دەســگیری بکەین، بەسزای ڕەوای گەلی بگەیەنین.

ســاڵ و مانگ تێپەڕین، دوای هەژدە ساڵ، فەرمانبەرێک لەگەڵ ئێمەبوو، بەناوی شێخ کامل، لە بازاڕی شێخەڵای هەولێر، چاوم بە شێخ کامل کەوت، پاش یەکتر لــە ئامێزکــردن، دوای ئەو هەموو ســاڵە یەکەم پرســیار، گوتم: ئەرێ (س) چی بەسەرهات لە ڕاپەڕین، نەکوژرا؟

گوتــی: بۆ دەپرســی؟ گوتم: خۆ تــۆ دەزانی چەندەی ئــازاری ڕۆحی من داوە، چەنــدەی ســیخوڕی بەســەر منەوە کــردوە؟ گوتــی: ئەگەر پێت بڵێــم چی لێ دەکەی؟ گوتم: هەرچی لە دەســتم بێ بەرامبەری دەیکەم. گوتی: ناشــێ بتەوێ خۆت بەگرتن بدەی؟!! گوتم: ئەتۆ پێم بڵێ؟ گوتی: کاکە ئێستا لای کاک (ف) کە بەرپرســێکی پارتی دیموکراتی کوردستانە، سکرتێری جەنابیانە، دەستی زۆر دەڕوا با نەتگرێ، ئەگەر بەقسەی شێخ کامل دەکەی، هەر باسی نەکەی بۆ خۆت چاکترە. شــێخ کامل ڕاســتی دەکرد، دیارە ئەو تاوانبارە بەر پارتی کەوتبوو.

## هێنانی دەستی دەرەکی

شــەوی٢٧/٧/١٩٩٦، یەکێتی، سوپای پاسدارانی ئێرانی هێنا بۆ بۆردومانکردنی بارەگاکانــی حیزبــی دیموکرات. بۆ ئەوەی خەڵک نەیانبینی، کارەبای ســلێمانی و ئــەو شــارانەی کوژاندەوە کە دەکەونە ســەر ڕێگای ئــەوان. لەگەڵ ئێران ڕێک کەوتبــوو، کــەوا ئەو هێزە بەســنوری قەڵەمڕەوی یەکێتــی دا بێت، بۆ گەڕانەوە بەســنوری پارتیدا بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لەو ناپاکیە نەتەوەییە، پارتی بکات بە

شــەریکی خۆی. ئەوەبوو، لەگەڕانەوە بەسنوری قەڵەمرەوی پارتی لەخەلیفان بۆ چەند کاتژمێرێک ئەو هێزەی ســوپای پاســداران ڕاگیرا. هەندێک فیلمی ڤیدیۆیی ئــەو هێــزە کەوتە دەســت پارتی، پاشــان ڕێگایــان دان بەســنوری قەڵەمرەوی پارتــی بەرێــگای هامڵتۆن و حاجی ئۆمەراندا گەڕانەوە بۆ ئێران. پارتی بۆ زیاتر تاوانبارکردنی یەکێتی، ئەو فیلمە ڤیدیۆییەی هێزەکەی سوپای پاسدارانی ئێرانی بــۆ ئەمریکیــەکان لێدایەوە. ئێران لە بەرامبەر ڕاگرتنــی ئەو هێزە لە خەلیفان و ئەو فیلمە ڤیدیۆییە، کەوتە گیانی کادیرانی پارتی لەئێران، بە تۆمەتی سیخوڕی ئیســرائیل و دژایەتــی لەگەڵ خــوا. لــە ١٩٩٦/٨/١حیزبی دیموکــرات، بەڵێنی ڕاگرتنی چالاکیەکانی دا.

لەئێــران، دامودەزگای ئیتلاعات، کەوتنە گرتنی هەندێک لەکادیرانی پارتی، یەک لەوانە (تەحســین ئەرگۆشــی)، بە ســیخوڕی کردن بۆ ئیســرائیل تۆمەتبارکرا، لــە ئــۆردوگای لاوێن مەلا ئەنوەر نهێلــی گیرا، (خەڵکی گوندی ڕەشــاوە بوو)، دوایی ئازاد کرا. لە پیرانشەهر، خەلیل کە لە پەیوەندیەکانی پارتی بوو، هەڵات دەربــاز بــوو، بــەڵام ئۆتۆمبێلەکەی لەندکرۆزێکی ڕەساســی بوو کەوتە دەســت ئیتلاعــات، هەتــا ئەو دواییانەش هەر مابوو لە دەســتی ئیتلاعات. من ئێســتاش بــاوەڕم نەبوو کەوا خەلیلی حاجی مەحمودی (لەنزیکەوە دەناســم) جاسوســی ئیســرائیل بێت، بەس ئەوانی ترم لە نزیکەوە نەدەناســی، وە باوەڕم وابوو تەنها مەســەلەیەکی سیاســی لەپشــت ئەم بابەتەوەیە. ڕاگەیاندنەکانی پارتی بیندراو، بیســتراو، نوســراو، هەر هەموی ماوەی دوو هەفتە زۆر بەتوندی ئەو ڕووداوەی ســەرلەبەر ڕەتدەکردەوە کە ئەوانە جاسوسی ئیسرائیل بن. تەحسین ئەرگوشی، لەژێر ئەشــکەنجە لەورمێ گیانی لەدەستدا، لەســەر ئەو ڕووداوە پەیوەندیەکانی پارتی لەهەموو شــارەکانی ئێــران داخرا، پارتی بــەردەوام پێداگیری دەکرد کە تەحســین لەژێر ئەشــکەنجەدا کوژراوە. فازل میرانی هاتە ئێران، بەنیازی چاک کردنــەوەی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئێــران، وەک لەبیری نەما بێ، ماوەی پازدە ڕۆژ هەموو ڕاگەیاندنەکانی پارتی دەیانگوت: ئەو کادیرەیان لەژێر ئەشــکەنجەدا گیانی لەدەســتداوە، بەشــێوەیەکی دڕندانە ئەو پەناهەندەیان شەهیدکردوە، کە بەراســتیش وابوو.. . فازل میرانی لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا فەرموی: بۆمان بە دیارکەوتوە کە تەحســین ئەرگوشی بەخۆی خۆی کوشتوە!!

# شکاندنی پەیکەرێکی شیاو

لەبەرامبەر نەقابەو هۆڵی میدیا، نازانم کێ میزاجی کوردایەتی هەڵدەستێ و پەیکەرێک بۆ گەورە نوسەر (موسا عەنتەر) دادەنێ. کە یەکەم کەس بوو لە باکوری کوردستان ڕادیۆی بۆ شۆڕشی ئەیلول ڕەوانە کرد. وادیارە دوای ماوەیەک سیخوڕو میتی تورک بەلای پەیکەری موسا عەنتەر تێپەردەبن، بە پارتی ڕادەگەیەنن هەتا جارێکی تر بەو ناوەدا دێنەوە، ئەو پەیکەرە لێرە نەمابێ. بەم شێوەیە، پەیکەری موسا عەنتەر لە پایتەختی هەرێمی کوردستان تیرۆرکرا، ئاسەواری بەجێ نەما.

لەو سەردەمەدا هەموو بازگەکانی پارتی ویەکێتی، تۆزێک جلی پۆشتەت لەبەربایە، دەیانگوت: شیرینی، من و جەنگی ئامۆزام دەگەڕاینەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. بینیمان لەخوار چۆمان یەکێک دوو تەنەکەی بەتاڵی بەدەستەوە بوو، تفەنگی بەشانیدادابوو، بە ڕاکردن هاتە سەرجادە، تەنەکەکانی دانا، کردی بەبازگە. ئێمەی ڕاگرت، لەنێو لەندگرۆزێکی سپیبوین، گوتی: شیرینی. جەنگیش کە پاکەتێک خورمای بۆ ڕێگای حاجی ئۆمەران - پیرانشەهر کڕیبوو، دوو دەنک خورمای دەستدایەو گوتی:

زارت بکەوە، زارت بکەوە، خورماکەی لەزاری کاکی خاوەن بازگەنا. خاوەن بازگە گوتی: کورە ئەوە کەی شیرینییە؟ جەنگیش گوتی: ئەگەر لەبەر جلەکانی ئێمەتە هەر ئەوەی لێدەوەشێتەوە. منیش ئەو دیمەنەم زۆر پێ ناخۆش بوو، کە پارتی و یەکێتی ئەو پەروەردە سەقەتەی کۆمەڵگا دەکەن، خۆم لێ توڕەکرد، گوتم: کێ بەتۆی گوتوە ئەو بازگەیە دابنێ؟

ئاخر تۆ لەبەرچاوی ئێمە لەماڵ هاتیەدەر، ئەو دوو تەنەکەت دانا!! گوتی: چوبوومەوە بۆ نان خواردن، کوڕەکانیش کەسیان لە ماڵەوە نەبوون، تابێن بۆ نان خواردن ئیزنم بدەن. گوتم: تۆبە دەستوری کێ ئەو بازگەت داناوە؟!! گوتی: کاکە ئێمەش فەقیری ماڵی خۆمانین، ئەوەتە لە پێشەوە، لەو پێچە حاجی عەولاش بازگەی لای ماڵی خۆی داناوە، ئێمەش بە کوردایەتی زۆر

ماندووبوینە، هەقی بازگەیەکمان لەو کوردستانە نییە؟ لەپشتەوە عەولای مام خدر گوتی: پێویست ناکا ئێستا تۆ بەچەندی نامانکوژی، لەقسەی ئەو کۆنە شیوعیانە گەڕێ، چەندت پارە دەوێ؟!!

## هەر بۆ ماڵی خۆم تۆپێکی گەورەم دەوێ

لەکاتی هێنانی پاسدار، لەلایەن یەکێتی و تیرۆرکردنی تێکۆشەرانی ڕۆژهەڵات لە باشور، ئەوکات ماڵمان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، باوەڕتان هەبێ لەشەرمی ئەو خەڵکە نەمان دەتوانی بێینە دەرەوە، ئەوەی منی لە نزیکەوە دەناسی، دەیگوت: باشە ئێوە بۆ لێرە نابن بە بەسیج، واتە: پاسدار؟!! بۆ ئەوەی ڕوی ڕاستەقینەتان بۆ گەل ئاشکرا بێت؟ پارتیش ببێتە جەندرمەی تورکیا. ئێوە بۆ سوئیستفادە لەناوی پیرۆزی پێشمەرگە دەکەن؟!

بەسەردان لەچوارقورنەبووم، لە ماڵی شەهید عەزیزی پورزام. خدری عیساو چەند کەسێکی تر، بە ئۆتۆمبێلێکی لاندگرۆزەر پەیدابوون، گوتیان: سوار بن، با بچینە مەیدانی حاجیاوا. (من لەمێژ بوو حەزم دەکرد، ئەو مەیدانە ببینم، زۆر باسیان دەکرد، گوایا هەموو جۆرە چەکێکی لێ دەکڕێ و دەفرۆشرێ) چووم لەگەڵیان. نەمدەزانی بەنیازن دۆشکەیەکی (١٢/٥) دوازدەو نیو بۆ شەڕی ناوخۆ بکڕن. گوتیان: پێمان خۆشە تۆش لێرە بوی، چوونکە پێشمەرگەی دێرینی، لە دۆشکە دەزانی.

گەیشتینە مەیدانی حاجیاوا، لەو مەیدانە هەر چ جۆرە چەک و تفاقێکی سەربازیت بویستبا پەیدا بوو، لەچەکی قورس و سووک. ئەوەندە شتی سەیری لێبوو، من بەژیانم نە لەسەربازی ڕژێم و، نە لە پێشمەرگایەتی نەمبینیبوو!! کابرایەکی بۆرەکەی بە بەژن و باڵا ورد پەیدا بوو، گوتی: فەرمون چیتان دەوێ؟ خدری عیسا گوتی: دۆشکەیەکمان دەوێ.

گوتی: فەرموون بابچینە ماڵەوە، هەرچی دەتانەوێ لەوێ هەیە. کاتێک چوینە ماڵەکەی، پڕ بوو لە دۆشکە، بەهەموو جۆرەکانی، تۆپ بەهەموو جۆرەکانی،

چەند سندوقی گەورەی پڕ لە فیشەک و نارنجۆک و ئار.پی.جی.. . دۆشکەیەکی (١٢/٥) ی نوێی لێبوو. باریان کرد، بردیان لەدەرەوەی حاجیاوا بۆ تاقیکردنەوە. چەند سەلیە دۆشکەیەکیان بەچیای (حاجیلە) وەنا، لەو شاخە دەنگی دەدایەوە. دوای تەقاندنی فیشـەکەکان، لەگەڵی پێکهاتن.

من هەر بۆ خۆشـی بەکابرام گوت: تۆزێک کارم پێتە، (وایزانی من بەرپرسـم)، زۆر بەگەرمـی گوتـی: فەرموو. گوتم: تۆپێکی نەمسـاوی ئاخیر گەورەم دەوێ، ئەوانـەی لـەدواوەی ئۆتۆمبێلی گەورە دەخرێت، هەر بۆ ماڵی خۆم پێویسـتمە، کاکە حەوت سـەر خێزانم تۆپێکم لەماڵەوە نییە!! گوتی: بەڕاسـتی ڕۆژی ئەوە نییـە پیـاو چەکی نەبێ. لەو قسـانە بوین خدرو عەزیزی پـورزام بانگیان کرد، گوتیـان: کاکە وەرە، لەوپیـاوە گەڕێ، ئەوە کۆنە شـیوعیە، پێت ڕادەبوێرێ!! ئـەو گوتـی: قەول وایە لە کەلار تۆپێکی نەمسـاویم بۆ بێنـن، بۆ ئەو برادەرەی دادەنێم، با سـەرم لێبداتەوە. پارەیان دایە کابراو ڕۆیشـتینەوە چوارقوڕنە. ئەو خەڵکە وا شـانی دابوە بەر ئەو شـەڕە نەگریسە، هەولێری گوتەنی، دەتگوت بۆ مزگەوتی دەکات.

بارەگای لقی یازدەی پارتی لە ڕانییە، بەردی بناغەکەشی، لەلایەن چەکدارەکانی یەکێتی دەرهێنرا. کردبویان بە مەیدانی ئاژەڵان. بۆ سـوکایەتی بەیەکتری کردن ئەوکارە ناشارسـتانی و نامرۆڤانەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد. لەبیرمە لەچوارقوڕنە ڕادیۆمـان کردبـوەوە، لەوێ ڕۆژێ ڕادیۆی لایەنەکەی تـر قەدەغە بوو، بەڵام من هەر چەند چرکەیەک دەمگۆڕی، لە پارتی بۆ یەکێتی و بە پێچەوانەوە، گوتیان: بۆ لەسەر یەکێتی لێی ناگەڕێی؟

ئەتـۆ پێـت وایـە کامیان ڕاسـت دەڵێن؟ لەبەرئـەوەی ئەوکات هەرچی وشـەی نەشـیاو و ناشـیرینە بەیەکتریـان دەگوت. گوتـم: هەردووکیان ڕاسـت دەڵێن، ئـەوەی بەیەکتـری دەڵێن زۆر ڕاسـتە، بەڵکو زۆر لەوەی زیاتـرن کە بەیەکتری دەڵێن، هەردوولا ڕاست دەکەن.. . منیش حەز دەکەم گوێم لەهەموو ڕاستیەکان بێت.

# نوێژ لەسەر نوێژی دەکرد

لەگەڵ خاڵە، بەشــەریکی (سی) کارتۆن جگەرەی وینستۆنمان کڕیبوو، قازانجی نەدەکــرد، کوڕێکمان لێ پەیدابوو، بەنــاوی (ع)، خانەوادەیەکی خراپ نەبوون، وەک خەڵک باسی دەکرد. بەقەرزی مانگێک پێمان فرۆشت. (بەو شێوەیە بڕێک قازانجــی دەکــرد). مانگ ڕۆیی، پارە نەبوو، دوو مانــگ ڕۆیی پارە نەبوو، خۆی لێدەشــاردینەوە. ئەوکاتە مۆبایل کەم بوو، بــەڵام (ع) مۆبایلی پێ بوو، چەندین جــار تەلەفۆنمــان دەکرد، هەڵی نەدەگرت. لەخیابانی ایمام، خاڵە پرســیاری لە ناســیاوێکی کرد، گوتی: (ع)نت نەبینیوە؟

گوتی: ئێستا لێرەوە ڕۆیشت. خاڵە گوتی: مۆبایلەکەی پێ بوو؟ (ئاخر مۆبایل خۆ شــتێکی هێندە گەورە نییە دیار بێ !!)، منیش گوتم: باوەڕ ناکەم گیرفانی گەڕابــێ!! وەرە بــا بڕۆیــن، ئەو ببوە ســوارو ئێمەش پیــادە. چوینە ماڵی (ع) دانیشــتین، باوکی بەرماڵێکی ســپی ڕاخســتبوو، کە زانی ئێمە بە دوای قەرزی خۆمان کەوتوین، نە نوێژێک و نەدوان، سەری لە سوجدە نەدەکردەوە. نەوەکوو قسەیەکمان لەگەڵ بکات.

ئەو کات ئێمەی ئاوارە بە کۆشــێک خێزانەوە ئەو بڕە پارەیەمان نەبوو، هەرچی هەڵســێ و هەندێکمان لێ بخوا. ئەو کاتەی مام ســەید خەریکی نوێژان بوو، من لەلای پەرتوکخانەی نێو جامخانەکە دانیشــتبووم. دەســتم بــرد، ناڵەی جودایی مامۆســتا هێمنــم دەرهێنــا. دیاربــوو نالی و قانع و گــۆران و مەولەوی و زۆرێک لەو کتێبانەی تێدابوو. کتێبەکانی پەشــارکەمال و عەزیز نەســین.. . مام سەید، بەلاچاوێک سەیری ئێمەی دەکرد.

لــەوە دڵنیابوو ئێمە نامانەوێ بڕۆیــن، دایدەکوتینەوە، هەتا کوڕەکەی دێتەوە، ســەلامی نوێژی دایەوە. پێم وابێ لەگەڵنجیەوە هەرچەند نوێژی چوو بوو هەموی قەلاکــردەوە، ڕوی لــە مــن کرد، گوتی: ئــەو کتێبانە هیچی کتێبــی دینی نییە، هەمــوی کتێبــی بێ دیــن و خوانەناس و حــەرام خۆرو قۆڵبڕانە. دەیویســت بە بیانوی ئەم کتێبانە سەرزەنشــتم بکات، منیش گوتم: خاڵ ســەید، خوێندنەوەی

ئــەو کتێبانــە گوناهی کەمترە لەوەی بێچوە گورگێک گەورە بکەی و بەری بدەیە ناو کۆمەڵگا، قووتی مندالآنی خەڵکی وەک من ئاوارە بخوا. بە تورەیی بەرماڵی پێچایەوە ڕۆیشت بۆ ژوورێکی تر.

## خێری قوربانی جوانەگا

لەپیرانشــەهر لە دوکانی مەلا عوسمان، حاجی مەلا ڕەسو و مەلا سەلمان و مەلا ڕەحمــان و زۆر مــەلای تر دانیشــتبوون، چەند ڕۆژی مابوو بــۆ جەژنی قوربان، ئەوەی مەلا نەبوو تەنها من و حاجی مەحەمەد شــێرزاد بوین. مەلایەکان باســی گەورەیــی قوربانــی کردنیان دەکــرد. دەیانزانی من ئەو توانایــەم نییە قوربانی بکەم، بەلام وەک دەڵێ: مەبەســتیان حاجی مەحەمەد بوو، کە دەوڵەمەند بوو، بــەس مەلاکانیش دەوڵەمەند بوون، تەنها مەلا ڕەحمان نەبێ، بۆیە دەیان گوت: هەرکەســێک جوانەگایەک بکاتە قوربانی، جوانەگایەکە چەند موی بەلەشیەوەیە، ئەوەندە گوناهت لەســەر ڕەش دەکاتەوە. مەحەمەد شێرزاد دەیزانی مەبەستیان ئــەوە، (بوکێ لەگەڵ تۆمە خەســوو گوێت لێبێــت) حاجی مەحەمەد گوتی: هەر ســێک تەلاقم کەوتبێ، ئەو قســە درۆیە. بەهەمویان ڕویــان تێکرد، ئەتۆ حاجی چۆن ئەو سوێندە دەخۆی؟!! گوتی: ئاخر لە ئێوە گوناهبارتر نییە، هەمووشتان قوربانیتان پێ دەکرێ، ئەگەر بزانن ئەو قســە ڕاســتە چــۆن دەهێڵن ئەو گوناه ڕەشــبوونەوەیە، وە بــەر مــن و حازمــی بکــەوێ؟!! بوو بە پێکەنیــن. (حاجی مەحەمەد لەو قسانەی زۆر دەکرد).

## دەبوو ئەولاد .......حەڵاڵ بوایە

هــەر کەســێک لە پیرانشــەهر بەدوای منــدا بگەڕابایــە، ســەرێکی دوکانی مەلا عوســمانی فەرش فرۆشــی دەدا، بڕێک جار من و مەلاو حاجی مەحەمەد شێرزاد کۆ دەبوینەوە (حاجی مەلا ڕەسوی فەتحی ڕاد)، گوتی: کاک حازم، پاش نوێژێ

دەچینە میراویێ، بۆ سـەردانی مەلا قادری ڕەش، (کاتی خۆی مەلا قادر، قازی حیزبی دیموکرات بوو، لەناوچەی سەردەشت).

مەلا قادر نەشتەرگەری بۆ کرابوو، گوتم: زۆرباشە منیش دێم، مامۆستا دەناسم و کاک (کەمـال)ی کوڕیشـی برادەرمـە. دوای نیـوەڕۆ کۆبوینەوە، مەلا ڕەسـو و مـەلا عوسـمان و کاک سـەلاح و بەنـدە. لەڕێگا، حاجی مەلاو مەلا عوسـمان گوتیان: کاک حازم، مەلا قادر بەسـەرهاتێکی خۆشـی هەیـە لەگەڵ کوڕەکەی، کـەوا ماڵـی خۆی کردوەو جیابۆتەوە، مەلا قادر بۆ ئێمەی ناگێڕێتەوە، تۆ داوای لـێ بکە بـۆت بگێڕێتەوە. گەیشـتینە میراویێ، چوینە ماڵی مـەلا قادری ڕەش، زۆری بە خێر هێناین، ئێمەش لە تەندروستیمان پرسی. چایان هێنا، ئەوان چای خۆیان خواردەوە، من چایەکەم هەر لەپێش بوو، مەلا قادری ڕەش گوتی: حازم عێراقـی، بـۆ چایەکەت ناخۆیەوە؟ منیش گوتم: داواکارییەکم هەیە، هەتا بەڵێنم پـێ نـەدەی چات ناخۆمـەوە. گوتی: تۆ بڵێ و من جێبەجێـی بکەم. (ئاخر لە کوردەواری میوان ئەگەر نەیەوێ نمەکی ماڵەکە بکات هەر داواکاریەکی هەبێ بۆی جێبەجێ دەکرێ، وەک مانگرتن وایە، بەداخەوە ئێستا دەسەڵاتداران ئەو نەریتە جوانەشـیان تێکشـکاند)، گوتم: مامۆسـتا دەبێ نەقلی جیابوونەوەو ماڵکردنی (کەمالی) کوڕت بۆ ئێمە بگێڕیەوە. گوتی: دەزانم کاری کامە (........)، ئەگەر نـا تۆی عێراقی لەکوێ بەوەت زانیوە؟!!

چایەکەت بخۆ، بۆتی دەگێڕمەوە. چایەکەم خوارد، مامۆسـتا گوتی: بەیانی بوو چوومـە مزگەوت، پێش بانگی نیـوەڕۆ دوو مەلای بەری گۆمانێ پەیدابوون، پێم گوتن: نیوەڕۆ کە نوێژمان تەواو کرد، خۆتان وون مەکەن، دەچینەوە ماڵی ئێمە بۆ نان خواردن. کاتێ هاتینەوە لەدیوەخان دانیشـتبوین، مەلاژن بە ئاماژەیەک بانگـی کـردم. مەلاژن گوتی: مەلا دەزانی کەمـال ماڵی خۆی کردوە؟!! منیش وامزانـی شـۆخیم لەگەڵ دەکات، بەڵام کـە ژوورەکەی کەمالم کـردەوە، تەنها چەنـد کارتۆنـی ژێر فەرشـانی لێ مابـوو، چۆڵی کردبوو. ئاخـر بەیانی لەماڵ بوو، بێ ئەوەی بە من بڵێ چۆن دەبێ ماڵی جیابکاتەوە!! هاتمەوە دیوەخان، هەر دووک مەلا گوتیان: مامۆسـتا شتێک ڕویداوە؟ هەرچەندی گوتم: هیچ ڕوی نەداوە، وەکو ئێسـتا مانیان گرت، کە حازم عێراقی چامان ناخواتەوە، منیش نەمدەزانـی کوڵی دڵم چـۆن دەربڕم، گوتم: مەلاینە، یاخوا لـەو ئیمامەی بەم

ئەگـەر عەولاد گانی حەڵاڵ نەکردوە. ئەو قسـە نا بەجێیـەم لەدەمی دەرپەڕی، ئەو دوو مەلایە دنیایان لەمن گەیاندوە، مادام حازم عێراقیش زانی، تازە هەموو دنیا پێی زانی.

# سوپەر سێکس

لـە پیرانشـەهر، لەگـەڵ مینەڕەش و سـەید عەزیـز بوینە شـەریک، کەلوپەلی ئۆتۆمبێل لەدیوی عێراق بۆ ئێران، لەوێشـەوە فەرش و کۆمبارو پەتۆ بۆ عێراق ببەین. سەید عەزیزو برایەکانی، ئەوەی تێکەڵاوی نەبن سیاسەتە، خۆشگوزەرانی و ژیانی سـەردەمە.. . کە خوا چەکوچی لە سـەید عەزیز داوە، تەنها بۆ کاسبی دروست کردوە. هەموو جۆرە کاسبیەکی دەکرد، تەنها قاچاغو خیلافکاری نەبێ. جەڵەب، ئاسـن، ورتکەنان، دینارو تومەن گۆڕینەوە. ڕادیۆیەکی بۆ من کڕیبوو، دەیگوت: ئەتۆ عارەبی دەزانی، بەس گوێبدە ئیخبارات، بزانە قەت ڕۆژێک باسی (٢٥) بیسـت و پێنـج دیناری ناکات؟ ( ئەوکات بە بڕیاری سـەدام ٢٥ دیناری لـە کارکەوتبوو، سـەید عەزیزیش زۆری ٢٥ دیناری هەبـوو) هەموو ڕۆژێ کە لە دێڵزێ دەچوومە پیرانشـەهر، هەتا دەگەیشـتمە فلکەی سەردەشـت، کە شوێنی کۆبوونەوەی پارە گۆڕەرەوەکان بوو، دوو سێ کەس دەیانگوت: سەید عەزیز زۆر بـە توندی لە دوات دەگەڕێ. کەسـەید عەزیزم دەبینـی، دەیگوت: ها چ خەبەر لە ٢٥یان نییە؟

تا وای لێهات ڕۆژێک گوتی: پێم وانییە تۆ عەرەبی بزانی، ئەگەر عەرەبیت زانیبا، ڕۆژێک دەتگوت: (سـەدامەتون قەرارەتون بیستوپێنجیەتون ئیعتیبارەتون) ئەوە کـەی عەرەبیە تۆ دەیزانی، ئەوەی من عەرەبی چاکە!!

سـەید عەزیـز دوو دوکانـی پـڕ لـە ورتکەنـان کردبـوو، ئەفسـەرێکی پادگانی پیرانشەهر ورتکەنانی سەربازگەی بۆ دێنا، جاری وا هەبوو کۆنە ئاسنی پادگانی پیرانشەهری لەژێر ورتکەنان بۆ دێنا.

سـاڵێک زیاتر بوو کۆڕەوەکەی باشـور ڕویدابوو، خەڵکی پیرانشـەهر بەکڕین و

فرۆشتنی تەلەفزیۆن و ڤیدیۆو ئەو شتانە خەریک بوون. ئەو ئەفسەرەی پادگانی پیرانشـــەهر، داوای لەسەید عەزیز کردبوو، بەکرەیەکی ڤیدیۆی (سوپەر سێکسی) بۆ پەیدا بکات. بێ ئەوەی ســەید عەزیز بزانێ ســوپەر سێکســی مانای چییە! کاکی ئەفسەر لەپارچە کارتۆنێک دەینوسێ و دەیداتە سەید عەزیز، سەید عەزیز دەیخاتــە گیرفانــی. بەچەنــد کەس دەڵێ کەســیان نایان بێ، دوایــی برادەرێک دەڵــێ: کە پەیدام کرد بۆت دێنم.

سەید عەزیز چونکە قازانج لەدەستی ئەو ئەفسەرە دەکات، زۆر بەجدی دەیەوێ بــۆی پەیــدا بکات. بــێ ئاگا لەوەی ئــەو بەکرەیە چــی تێدایە، ئــەو برادەرەی پێشــوو، سەید عەزیز بانگ دەکات، دەیباتە ناو ژووری ورتکەنانەکە، بەکرەکەی دەداتــێ، ســەید عەزیــز پارچە کارتۆنــی گیرفانی دەردێنێ، دەڵــێ: ئەوە نەبێ کــە جەنابی ئەفســەر نوســیویەتی بۆت دێنمەوە. ســەید عەزیز بەکــرەی ڤیدیۆ لەگیرفانی پاڵتۆی داوێت، هەتا ڕۆژێک ئەفسەر پەیدا بێ بیداتێ. شەوێک سەید عەزیز دەچێتە ماڵی مەلا خالید، کە ماڵیان لە کۆنەخانێ بوو. دەچێتە ژوورەوە. مەلایەکی خەڵکی سەردەشــت لەوێ میوان دەبێ، مەندیلی لەپێش خۆی داناوە، کۆنتــرۆڵ بەدەســتەوە، خەریکی تەماشــاکردنی بەکرەی ڤیدیۆ دەبــێ، لەوکاتە زۆر شــتێکی تــازە بوو لەپیرانشــەهر. لەناکاو زەنگی دەرگا لێــدەدا، مەلا خالید دەچێ بیکاتەوە، بەمەلای سەردەشــتێ و سەید عەزیز دەڵێ: ئێوە دانیشن ماڵی خۆتانە تا من دەگەڕێمەوە. لەوکاتە سەید عەزیز بەکرەی گیرفانی وەبیردێتەوە، دەڵێ: مامۆستا منیش بەکرەیەکم پێیە. مەلاش دەڵێ: بیخەسەری. کاتێ بەکرە پلەی دەکەن، چ دەبینن، ســەید عەزیز دەڵێ: مامۆســتا ئەوە چی ڕوودەدا ؟!! مامۆســتا دەڵێ: مەگەر نابینی، بە دوو نەفەر، نەفەرێک.......ن؟!! ســەید کێچ دەکەوێتە کەولی، دەڵێ: مامۆســتا تــۆ خاترجەمی ئەوە بەکرەی منە؟!! دەڵێ: بەڵی. دەڵێ: مامۆســتا بە خەڵەتیان داومێ من داوای بەکرەی ســوپەر سێکسم کــردوە، ئەوەش پارچە کارتۆنەکە. مامۆســتا دەڵێ: دروســت خۆیەتی، ئەوەیە سوپەرسێکســی، بەکرەیەکی زۆر زەریفە. ســەید عەزیز دەڵێ: مامۆســتا دەری بێنە. مامۆستا دەڵێ: هەتا هەموی چاو لێ نەکەم دەری ناهێنم. بەناچاری سەید عەزیز بەرماڵە نوێژی مەلای دەســت دەکەوێ، یەکسەر بەشاشەی تەلەفزیۆنی دا دەدا.

# پێخوستکردنی پیرۆزییەکان

پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ سەدام ڕێک کەوت، کە ھاوکاری بکات بۆ لێدانی یەکێتی و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی. ئەوەبوو لەبەرەبەیانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦ ھێرش کرایە سەر ھەولێر. لەچوار لاوە دوای بەرگریەکی کەم، لەبەرئەوەی ھێزەکان نابەرابەربوو، پارسەنگی ھێز گۆڕا. ھێزەکانی پارتی و بەعس بەیەکەوە، لەگەڵ تانکەکانی حکومەتی سەدام لەناو ھەولێر دەسوڕانەوە. شکۆی پەرلەمانیان شکاند. ئەو ڕۆژە خەڵکێکی زۆر لە ھێزە بەرھەڵستکارەکانی عێراقی و کوردستانی کوژران. لەکاتی کوشتاری چەندان کەس لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە ئەحمەد چەلەبی بوون، لە ٣١ی ئاب، نە داوایەک نە سکاڵایەک لەسەر پارتی تۆمار نەکرا، لەسەر کوژران و گرتنی ھاوڕێکانیان. گومان دەکرێ ئەحمەد چەلەبی و ھەموو ئەوانەی زەرەرمەندبوون بە پارە دەم کوت کرابن. لە ڕۆژی ٣١ی ئاب بارەگای مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی و چەند بارەگایەکی حیزبەکانی تر (فەرھود) تاڵان کرا.

لە میانەی شەڕی ناوخۆ، جێگای داخە لەسەر منارەی مزگەوتی خانەقا، حاجی لەقلەقێک ھەموو ساڵێ دەھاتەوە شوێنی خۆی، ببوە ھێمایەک بۆ ژینگەدۆستی ھەولێریەکان، بەدەستی چەتەکانی حیزب و فسۆس پاڵەوانەکانی حیزب ئەو حاجی لەقلەقە تیرۆرکرا. ھەولێریەکانی دڵگران کرد.

ڕۆژێک لایەنێکی بەشەڕ ھاتوەکان، ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی لایەنەکەی تر دەگرێ، شەش چەکداری لایەنی سەرکەوتوو دەچنە ماڵێک نان دەخۆن و پشو دەدەن. بەرپرسی ئەو شەش چەکدارە، چاوی بە فەرشەکەی ژێریان دەکەوێ، دەزانێ نرخی زۆرە، بۆیە بە چەکدارەکان دەڵێ: ئەو فەرشە بپێچنەوە. ئەوانیش فەرشەکە لول دەدەن، بەدیواری ماڵەکەی ھەڵدەپەسێرن. کابرای خاوەن ماڵ دەڵێ: ئەو فەرشە بۆ دەپێچنەوە؟ ئەویش دەڵێ: لەگەڵ خۆمان دەیبەین.

خاوەن ماڵ دەڵێ: کاکە سەلاجەو تەلەفزیۆن و هەموو شتی ناو ماڵم فرۆشتوە بۆ خەرجی منداڵەکانم، ئەوەی ماومانە تەنها ئەو فەرشەیە کە ئەمجارە بیفرۆشم. بە ئاردی بدەم بۆ منداڵەکانم.. . چەکدارەکە خۆی لێ تورە دەکات، دەڵێ: ئێمە ئیمڕۆ دوو شەهیدمان داوە، هەتا ئێرەمان ئازادکردوە، ئەگەر نا ئێوە هەر ژێر دەستەدەبوون، تۆ فەرشێکت لە ئێمە چاوە؟ دوایی یەکێک لەچەکدارەکان دەڵێ: ئەگەر زۆرت دڵ پێوەیە لێمان بکڕەوە؟!!

خاوەن ماڵ دەزانێ چارەی نییە، دەڵێ: باشە، ئەو فەرشەی خۆم بەچەند پێ دەفرۆشنەوە؟ چەکدارەکە دەڵێ: ئێستا ئەو فەرشە هی تۆ نییە و هی ئێمەیە، بە پێنج سەد دینار. خاوەن ماڵ دەڵێ: ناوەڵا، منیش فەقیرم بە دوو سەد دینار بمدەنێ. بەرپرسی چەکدارەکان هەڵدەستێتە سەرچۆکان و دەنەڕێنێ: هەی بێ ویژدان، ئەو فەرشە هی دووسەد دینارە؟!! ویژدانت هەڵدەگرێ لەدەستمان دەربێنی بەو نرخە؟!!

مام ساڵح پیاوێکی بێ زیان و بێوەی بوو بۆ دەوروبەری. ئۆتۆمبێلێکی خراپی هەبوو لە نێوان ڕانییە- چوارقورنە، کاری دەکرد. بەزۆری ئەوەندەی دەبینرا لەو ڕێگایە ڕۆژ نەبوو، ئۆتۆمبێلەکەی نەشکا بێ، مام ساڵح خەریکی چاککردنەوەی نەبێ. بژێوی ژیانی خێزانەکەی بەم ئۆتۆمبێلە دابین دەکرد، ئێستا لەژیاندا ماوە. زۆرجار دەیگێڕێتەوە: لەدوای ٣١ی ئاب، سێ چەکداری پارتی دەچنە ماڵەکەی، تەلەفزیۆنێکی باشی دەبێ، نان دەخۆن.

مام ساڵح زۆر بەخێرهاتنیان دەکات و ڕێزیان دەگرێ، کاتێک تێرنان دەخۆن، هەڵدەستن تەلەفزیۆنەکە لەگەڵ خۆیان دەبەن، بەڵام کاتێ لەدەرگای ماڵەکەیان دەچنە دەرەوە، یەکێکیان دەگەڕێتەوە بە مام ساڵح دەڵێ: ئەگەر تەلەفزیۆنەکە کار نەکا و هەرچیەکی هەبێ و پێمان نەڵێی بۆ خۆم دەزانم چیت لێ دەکەم. مام ساڵحیش وەک تاڵان نەکرابێ و ئەو تەلەفزیۆنەی پێ فرۆشتبێ، دەڵێ: بەو خوایە ئەوەندە شاشەی سافە مێرولەی ناکات. ئێستاش ئەوەی ئەو بەسەرهاتە بزانێ، دەڵێن: مام ساڵح شاشەی چۆنە؟ ئەویش دەڵێ: بەخوای مێرولەی ناکات. ساڵێک تێپەڕیوو، بەرێکەوت ڕۆژی ٣١ی ئابی ١٩٩٧ لەهەولێر سواری تاکسیەک

بووم، لەدارەتوو بۆ ناو شـار. کاتێـک لەبەنزینخانەی مەنتکاوە تێپەڕبوین لەلای کۆنە ماڵەکەی پارێزگاری هەولێری زەمانی بەعس، کە لە هەشـتاکان شەوێک بە ئار.پی.جی لێماندا بوو. من بیرەوەری ئەو هاوڕێیانەی شەهیدبوون، ئەو ڕۆژەیان نەدی بەئازادی لێرە تێپەڕبن، بیرەوەری ئەو شـەوە لەخۆی لول دابووم. لەناکاو تاکسـیەکە ئیسـتاپی بەتوندی گرت. من لەگەڵ وەستانی، بە ئاگا هاتمەوە. لای ماڵی دکتۆر ڕۆژ نوری شـاوێس، دۆڵ و زوڕنا دەیکوتا، ئەممان کوتان.. .گوتم: ئەوە ماڵی کێیە؟

شـۆفێرەکە گوتی: ماڵی دکتۆر ڕۆژە: گوتم: ئەوە دکتۆر ڕۆژ ژنی دوەم دێنێت؟ گوتـی: نـا بابە نـا، ئەوە یـادی ٣١ی ئابی سـاڵی ڕابـردوە. لەدوێنێـەوە ئەو دۆڵ و زوڕنایـە دەیکوتـێ. ئەوە دووڕۆژە ئەو ڕێگایـە گیراوە بەڕووی هاوڵاتیان، خـوا دەزانێ کەی دەیکەنـەوە. گوتم: ئەوە دەبابەکانی بەعـس و ئەنفالچیەکان هەولێریان بۆ پارتی گرتەوە، دوو ڕۆژ دۆڵ و زوڕنا دەکوتن، ئەگەر بەدەسـت و قامی چەکدارەکانی پارتی بگیرابایەوە، دەبێ چەند ڕۆژ دۆڵ و زوڕنا بیکوتابایە؟ ئاخر ئەو کاتە کەم کەس ملی لە چەقۆی کۆنە بەعسیەکانی ناو پارتی دەخشاندو ئاوا قسـە بکات، بۆیە کابرای شـۆفێر هەر سـەیری دەکردم. ڕانکو چۆغەیەکی مەرەزم لەبەر بوو، دەمانچەیەکی چواردە خۆرم لەبەر پشـت، دیکۆری دەرەوەم کتومت پارتیەکانی ناو هەولێر بوو. شـۆفێرەکە بەچاوان حاڵی کردم، دەیگوت: کاکی سـیخوڕ زۆر هەڵەی سـەرت بۆ بلەقێنم، لەزیندانی ئاکرێ خۆم بدۆزمەوەو شوێن بزربم، منداڵەکانم چاوەڕێم دەکەن.

لەلای بانکی ڕافیدێن لەناو بازاڕ، گوتم: دادەبەزم. شۆفێرەکە هەر خەنی بوو کە لەیەخەی دەبمەوە، ئەگەر پارەشـم نەدابایە، داوای نەدەکرد.

٣١ی ئـاب کە هێزەکانی سـەدام و پارتی، یەکێتیـان لەهەولێر دەرکرد، یەکێتی بەرگری پێنەکرا هەتا هەمویان بردنە سـەر سـنورەکانی ئێران، هاوسـەنگی هێز گۆڕا. یەکێتی کارتی کارەبای وێسـتگەی دووکانی دەرهێنا، بردی بۆ نێوزەنگ و قاسمەڕەش، ڕووناکی کارەباشیان کوژاندەوە، کاری قێزەونی وا ئەنجامدرا کە بۆ نوسـین ناشێ بیخەینە بەر دیدی بەڕێزتان.

# گوللە

کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ ماڵم لە دێڵزێ بوو، لەلای دووکانی مەلا عوسمانی فەرش فرۆش دانیشتبووم. زەنگی تەلەفۆن لێیدا، مەلا عوسمان گوتی: ئەوە تۆی دەوێ. منیش تەلەفۆنەکەم وەرگرت، مەلا ئاری پوورزام بوو، هەواڵی برینداریەکەیم پرسی (کە لە ٣١ی ئاب بریندارببوو، گوتی: حازم من لە نەغەدەم، لە نوسینگەی یەکێتی، لەگەڵ کاک ئەحمەد زرار، ئەویش بریندارە. بەڵام مامۆستا نازم دەباغ کە بەرپرسی پەیوەندیەکانی یەکێتیە لە ئێران، دەرمان دەکات، دەڵێ: جێگامان نییە بۆ ئێوە. گوتم: ئێستا دەگەمە لاتان.

هەرچەندە من دەمێک بوو دەمویست جارێک هەردی و مەلا ئاری بکەونە بەر دەستم بۆ ئەوەی تۆبەیان پێ بکەم لەو قسانەی بۆم هەڵدەبەستن، بەڵام کە ئەحمەد زراری لەگەڵ بوو، (چونکە یەکەم جار بوو بیبینم)، بۆیە هیچم بۆ نەکرا. پەیکانێکم گرت بۆ نەغەدە، بەنیو کاتژمێر گەیشتمە لایان. لەگەڵ خۆم هێنامنەوە بۆ پیرانشەهر. پێم باش بوو تۆزێک بە درەنگەوە بگەینەوە دێڵزێ، لەبەر ئەوانەی کە دەیان ناسین، بەتایبەتی ئەوانەی لە باشور یەکێتیەکی تۆخ بوون، خوێنیشیان سەوز بوو، لەدیوی رۆژهەڵاتیش پیاوی ئیتلاعات بوون. شەو لەماڵی ئێمە لە دێڵزێماینەوە، رۆژی دوایی دەمانویست بچینە مەهاباد، هەرچەندە ترسی بازگەی دارەلەکمان هەبوو، لە سەروی دەشتی شارویرانێ. بەڵام بە ئاسایی گەیشتینە مەهاباد، چوینە ماڵی کاک مەحمود چیرە. لەگەڵمان هات بۆ لای دکتۆر، ئیشاعەی مەلا و کاک ئەحمەدمان گرت. کچێک سەیری ئیشاعەکەی مەلای کرد، گوتی: ئەوە چیت قوت داوە؟ ئەویش گوتی: گوللە. کچەکە وای زانی شتێکی لە گەروی گیربوە. ئەو شەوە لە مەهاباد ماینەوە لای کاک مەحمود. پاشان سەردانی دکتۆری تەورێزیانکرد، بەڵام لەبەر هەستیاری برینەکانیان دکتۆر دەستکاری نەکرد، دواتر بەرێم کردنەوە بۆ سنوری کێلێ، بۆ باشور.

# مێش هەنگوینیش بە ئاگری حزب سووتا

کارەساتی ۳۱ ی ئاب ، لەلایەن پارتیەوە، ئەو کوشتارەی هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراقی زۆر دڵتەنگی کردم. کە ناوبانگی کورد بەو شێوە ناشیرین بکرێ و زاتی ئــەوە بکەن، قاتیلانی ئەنفال و هەڵەبجە بهێننەوە کوردســتان، تەنها لە پێناوی دەســەڵات، حەرەمی پەرلەمان ئەتک بکەن. لەماڵی شــەهید عەزیزی پوررزام لە چوارقورنە دانیشــتبوین، یەک دوو چەکداری یەکێتی هاتن، باســی گوندێکی لای هیــران و نازەنینیــان دەکرد، گوایە: یەک خانوو مێشــهەنگوینی ماڵی پارتیەکی ســوتاندوە، ئاخر تەمەنم بەو ڕۆژە گەیشــت، ئێســتاش مێشــهەنگوینی پارتی و یەکێتیــم بۆ لەیەکتــر جیاناکرێتەوە !! گوتم: نەدەکرا ڕەنگی ســەوزیان لێبدەی بیــان کەی بە یەکێتی؟!! گوتی: ئەو فکرەم نەکرد.

بەداخــەوە لەبەرامبەر ئەو هەموو ناپاکی نەتەوەیی و ئەخلاقی و نیشــتمانییەی، زۆر لە پارتە شــاگرد ئۆغلانەکان، هەروەک کاری هەمیشــەیی و بێ هەڵوێســتی لەبەرامبەر ڕووداوە گرنگەکانی وڵاتەکەمان. بەیانێکی شلەتێن، یان وتەبێژەکانیان دوو قســەی تەڕاوزی دەکرد کە لە ئاست نارەزایەتییەکانی خەڵک نەبوون.

ئەوەی ڕاستی بێ، ناوە ناوە ماندوو دەبوون لەشەڕ کردن، بە نێوانگیری هەندێ کەس دەیانویست گفتوگۆ بکەن، بەڵام وەک لە پێشەوە باسی ژن بەژنم کردبوو، کەس نەیدەویســت لەلای خوارەوە بێ، یان لەژێر قەڵەمڕەوی ئەویتر دابنیشــێ. لەبیرمە لەسەر پێشنیاری فەرەنسۆ حەریری زۆرجار بەناچاری مەیدانی ئاژەڵانیان لەنزیــک هەولێر دیــاری دەکرد، بۆ کۆبوونەوەی نێوانیان لەو مەیدانە دابنیشــن. چەندین کۆبوونەوەی چارەنوس ســاز لەمەیدانی ئاژەڵانی هەولێر بەڕێوەچوو.

ڕۆژێک لە ڕۆژهەڵات بەسەفەر هاتمەوە بۆ باشور، لەهەولێر لەماڵی خاڵوانەکانم، کە چوار پێنج ساڵ بوو نێوانیان ناخۆش بوو، وە قسەو هاموشۆیان لەگەڵ یەکتر نەبوو. حاجی عبداللەی خاڵم پیاوێکی زۆر لێبوردەو دڵ پاک بوو، نەخۆشــیەکی کوشــندەی هەبوو، خاڵۆژنم داوای لێکردم هەوڵ بدەم شــەڕەفی ئەوەم پێ ببرێ

پێکیـان بێنمەوە، بەڵام کەسـیان ئامادەنەبوون بچـن بۆ ماڵی ئەوەی تر، منیش گوتـم: باشــە وەکو پارتـی و یەکێتی لە مەیدانی ئاژەڵان کـۆ دەبینەوە. بوو بە پێکەنیـن، بـاش بوو لـە ماڵی خاڵم قــادر عەزیزی پارتی کۆبوینەوە، کێشـەکە چارەسەرکرا. پارتی و یەکێتی هیچ لێبوردنێکیان لەهەمبەر یەکتر نەبوو، ئەوەش لەنـاو تاک تاکی کورد ڕەنگی دابوەوە، لەوانە خاڵوانی منیش.

ئەوەی شـایانی باســە لەناو هەردوو هێزەکە، (واتە: پارتی و یەکێتی) پێوەر بۆ هەڵسـەنگاندنی فەرمانـدە و چەکدارەکانیان ئەوەبوو، کێ ئەو شـەڕە خۆکوژیە باشترو بێ بەزەییانەتر ئەنجام دەدا، کێ بە کۆمەڵ دیلی لایەکەی تر گوللەباران دەکا، کێ خەڵک شـوون بزرو بێ سەروشـوێن دەکا، کێ لەناو پارتی بیگوتایە: جەلالیەکان ئاوا و ئاوا لێ دەکەم، ئەوە کوڕی دڵسۆزی بارزانی و باوەڕ پێکراوی پارتـی بـوو، دەیانگوت: بەخوا پارتیەکی دڵسـۆزە. بەلایانەوە پێشـینە کێشـە نەبـوو، ئـەوەی لەناو یەکێتی بەپێچەوانەوە بیگوتایە: هەتا ئەو بنەماڵە ناپاک و کورد کوژەی ماڵی بارزانی بمێنێ، کورد قەت ئاسـودە نابێ، ئەوە جەلالی تەواو عەیاربوو، پێیان دەگوت: خوێنیشـی سـەوزە، کاریشیان بە پێشینەی ئەو کەسە نەبوو.

# خوێندنی منداڵەکانم

هەرچەنـد جـاری لە ڕۆژهـەڵات دەهاتمەوە بۆ باشـور، بەچەند ڕۆژێک هەسـتم دەکـرد مـن نامۆم بەو وڵاتـەی خۆم، هەرچی ناشـیرینی و نەفامـی هەیە، ئەو دوو حیزبە بەسـەر هاوڵاتیان هێنا بوو. شـەرمم دەکرد بڵێم: کوردی باشـورم. بەناچـاری لـە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتانماینەوە، بە ئومێدی ئارامبوونی باشـوری کوردسـتان و گەڕانەوەمـان، بـەڵام ڕۆژ لە ڕۆژ ناخۆشـتر دەبـوو. دڵی خۆمان بـەوە دەدایـەوە، کەوا چاک نییـە منداڵەکانمان لێرە دەخوێنـن. ڕۆژی یەکەمی تاقیکردنەوەی سـەری سـاڵ، ئەوەی بەگوتەی ئەوان عێراقی بـوو، لەقوتابخانە دەریان کرد. مافی ئەوەی نەبوو تاقیکردنەوە بکات. من، دوو کوڕم (هەڵمەت و دەشتی) لە پیرانشەهر دەیانخوێند، زۆر زیرەک بوون. هەردووکیان لە قوتابخانە

دەرکردن. چووم بۆ فەرمانداری، هەرچەندی کردم و گوتم، بێسود بوو. گوتیان: ئەوە دەستورە لە ئوستانەوە هاتوە. پێم گوتن: کافر دەڵێ بخوێنن، ئیسلام دەڵێ بخوێنن، کۆمۆنیست دەڵێ بخوێنن، بەس پێم بڵێن ئێوە لە کامەیانن؟!! بەدرێژایی ساڵ من بەدیار ئەو منداڵانەوە دانیشتوم، تا پێیان بخوێنم. ئێوە لەپاش نۆ مانگ سەختی و سەرماو خوێندن دەریان دەکەن؟ نایەڵن تاقیکردنەوە بکەن!! بێسود بوو، هەموو ڕۆژێ کتێب و جانتایان حازر دەکرد، لەبەر دەرگا ڕادەوەستان، منداڵانی هاوپۆلیان بە پێشماڵی ئێمە ڕەتدەبوون، دەیانگوت: ئێراقی بۆتان نییە بخوێنن، بۆ ناگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان، بۆتان نییە بێن بۆ قوتابخانە. کە بێ ئومێد دەبوون، دەهاتنەوە بۆ ژوورەوە جانتاکانیان دادەنا، بە خەمباری دادەنیشتن.

ئەوەم لەنێوچاوانی پارتی و یەکێتی دەزانی، ئەوساڵەیان لەکیس چوو، بۆ ساڵی ئاییندە، لەسنور بەسواری وڵاغ هێنامن بۆ هەولێر، لە دارەتوو لای دایکم لە قوتابخانە ناومان نوسین، لای هەردی برام و دایکم بەجێم هێشتن بۆ خوێندن. ئەو ساڵە چوار مانگیان خوێند. شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی وا توند بوو، برسێتی وا تەشەنەی کرد، خەڵک منداڵی خۆی لێ بەڵا بوو. لە پیرانشەهر هاتم بۆ باشوری کوردستان بۆ هەولێر، بەناچاری هەردوو منداڵەکەم هەڵگرت بۆ پیرانشەهر، بەلای دۆڵەتو و تۆکان بەسواری وڵاغ ، بەفر کەوتبوو گەڕامەوە بۆ دیوی ئێران. ئەو منداڵانە لە قوتابخانەکانی ئێران ئەوەندەیان پێ گوتبوون: ئێوە عێراقین نابێ بخوێنن. لەقوتابخانەکانی دارەتوی هەولێر، ئەوەندەیان پێگوتبوون: دوو منداڵە ئێرانیەکە. ئەوەندەیان بە فارسی خوێندبوو کوردیان باش نەبوو. ئەو بەستەزمانانە نەیاندەزانی خەڵکی کوێن و چارەنوس بەرەو کوێیان دەبات، عێراقین، یان ئێرانی؟!!

ساڵی دواتر مانگی (٩) ماڵم بارکرد بۆ ئۆردوگای دیلێژێ لە پیرانشەهر، گوتیان: ئەگەر بچن بۆ ئۆردوگای دیلێژێ، منداڵەکان دەتوانن بخوێنن. لەدوای ئەوەی دوو ساڵیان لەکیس چوو، بردمنە قوتابخانەی دیلێژی. ملیان لەخوێندن نا، هەریەکەم و دوەم دەبوون. کوڕە گەورەکەم ئاراس لەگەڵ هاوتەمەنەکانی دەستی بە کرێکاری و ڕەنگ کردنی خانووکرد، منداڵەکان خوێندن و منیش ڕۆژانە دەچووم بۆ پیرانشەهر بۆ ئەوەی بژێوی ژیانیان دابین بکەم.

ماوەیەک مامەڵەی هەنگوین و ماوەیەک ئاسنەواڵەو ماوەیەک فەرش و پەتوو....

هتــد، هەرچی بمانزانیبایە قازانج دەکات، دەمانکــڕی. ئۆردوگای دێڵزێ لەنێوان گوندی دێڵزێ و، قەڵاتەرەش بوو، هەر دوو گوندەکەی بەیەکەوەی بەســتبوەوە، لەگەڵ هەردوو گوندەکە تێکەڵ بەیەک ببوو، هەردوو گوندەکەکە کارەبای هەبوو، کەچی ئێمە لەبەر فانۆس و لامپا دادەنیشــتین، ژیانێکی هەتا بڵێی سەخت بوو، زۆربەی ســاڵێ لەوێ زســتانە، زســتان زۆر درێژە، ئەو ئۆردوگایە دەبوو بەیەک قــوڕ کــە زەلام لێ دەرنەدەچوو. لەیادمە گەنجێک بەناوی عومەر ســەرانەیی بەر حەفارە کەوت، گیانی لەدەســتدا. فەرماندار هات بۆ مزگەوت، چوونە پێشــوازی تاســەر شەقامی ســەرەکی، چەکمەیان بۆ برد لەپێی بکات، تا دەگاتە مزگەوت. لەبــەر قــوڕ ئۆتۆمبێــل دەرنەدەچــوو، ئەو خەڵکــە ئاوارەیە ڕۆژ تــا ئێوارە ئەو قوڕەی دەشــێلا، ئەو سوکایەتیەی بە ئێمە دەکرا، نەوەک خەڵکی ئاوارە، بەڵکو دیلــی جەنگیــش وا ڕەفتــاری لەگەڵ ناکــرێ. هەموی ئاکامی شــەڕی برا کوژی نێــوان پارتــی و یەکێتی بوو، ئەگینا خەڵک بۆ لەم شــوێنە دەمایەوە؟! نزیکەی ســێ ســەد ماڵێک دەبوین، هەمــوی دوژمنی بابەکوشــتەی یەکتر بــوو، ئەوەی پارتــی بوو، ئەوەی یەکێتی بوو، ئەوەی ئیســلامی بــوو، براکوژی دیوی هەرێم، ڕەنگی دابوەوە لەناو ئەو ئۆردوگایە. نەتدەزانی لەگەڵ کێ ڕاوەستی، بۆ ئەوەی ئەوەکەی تر مۆڕەت لێ نەکات، ڕقت لێ هەڵنەگرێ. یان شــەو، نامەی هەڕەشــە و فیشــەکت نەخاتە ناو ماڵ. لەیادمە ئێران لەســنورەکان، تفاقی شەڕی بۆ هەر ســێ لایەنەکە دەنارد بەنۆرە، بەڵام یەک فەردە ئارد قەدەغە بوو لەســنورەکان بۆ باشوری کوردستان، خەڵک دەیگوت: ئارد. ئەو دەیگوت: ها فیشەک. ئەوەی ئێران دەینارد بۆهەموو لایەنەکان بریتی بوو لە ســیخوڕ، فیشــەک، ئاڕ.پی.جی، دینــاری تەزویر، مەوادی هۆشــبەر...هتد، ســەرانی کورد بە سوپاســەوە لێیان وەردەگرتن.

بەداخەوە، ڕۆژێک پاسدارێکی ئێران هاتبوە سلێمانی، بەرێکەوت ئەو ڕۆژە باران باری، سەرکردایەتی یەکێتی دەیان فەرموو ئاغای فلان، باران و خێرو بەرەکەتی لەگەڵ خۆی هێنا. بۆیە ئێستاش خەڵک دەڵێن: ئەوکاتەی (ئاغای مەتەری) هات بۆ سلێمانی.

ڕۆژێــک کوڕێکــی ناســیاوم بینــی، نامەوێ نــاوی بێنــم، چونکە ئێســتا لەگەڵ ئیســلامیەکان نەماوە، مامەڵەی مەشــروبات دەکات. زۆرم هەوڵ لەگەڵ دا، بێتە

ماڵــی ئێمــە، بۆ نان خواردنــی ئێوارە، پێم گــوت: کێت لەگەڵە چەند کەســن، لەگــەڵ خــۆت بیانهێنــەوە نانتان بۆ ئامــادە دەکەین. گوتی: یــەک کوڕی خزمم لەگەڵە. (بەداخەوە لەو سەفەرە ئەو کوڕەی لەگەڵی بوو کوژرا، کۆمەڵێ خەڵک بوون لە بزوتنەوەی ئیســلامی، بەحاجی ئۆمەران هاتبوونە پیرانشــەهر، لەوێ لە پەیوەندیەکانی بزوتنەوە ئامادەکرابوون، کە بەڕێ بکرێن بۆ سەردەشــت، لەوێوە بۆ هێرش کردنە ســەر یەکێتی، لەناوچەی ســالارەو قەڵادزێ ). منیش چوومەوە مــاڵ ، گوتــم: نان و چێشــت ئامادە بکەن بۆ ئــەو دوو میوانە. زۆریان خزمەتی من کردبوو لە باشــوری کوردســتان، خۆم بە قەرزار دەزانی. کاتژمێرێکی مابوو بۆ نوێژی شــێوان، چوومەوە دەفتەری بزوتنەوەی ئیسلامی، پاسەوانەکە گوتی: کێت دەوێ؟ گوتم: کاک (ب)م بۆ بانگ بکە. هات، پێم گوت: بانگی هاوڕێکەت بکــە، بــا بڕۆین بۆ ماڵی ئێمە. (هەریەکەو پێڵاوێکی ئەدیداســیان بۆ کڕیبوون). گوتی: ئەوا مامۆســتا مەلا(م) قســەمان بۆ دەکا، خودا جەزای بداتەوە، پێمان ناکــرێ بــۆ نان خــواردن بێینە ماڵی ئێــوە. منیش گوتم: ئاخر ئێمــە نانمان بۆ ئامادەکردوون، هەر نان بخۆن و بڕۆن. گوتی: بەخوا ماشێن ڕاوەستاوە، مامۆستا لــە قســەکانی تەواو بێ ســواری ماشــێن دەبین، دەڕۆین. کە بــێ ئومێدبووم لە هاتنیان، وەک دڵسۆزیەک و وەفاداریەک، پێم گوت: تۆ شەڕە تفەنگت نەبینیوە، ئــاگات لە خۆت بێــت. زۆر بەنیگەڕانیەوە، گوتی: ئەگەر منت خۆش دەوێ، پێم مەڵێ ئاگات لەخۆت بێت، بڵێ انشــالله شــەهید دەبیت. منیش ڕووم لە ئاسمان کردو دەستم بەرزکردەوە، گوتم: لەخوا دەپاڕێمەوە تاقتان لێ دەرنەچێ، هەموو شــەهید بن انشالله. ئەوشەوە تا بەیانی هەر دوعام بۆ کردن.

ئەوان ســەردەمان ئیســلامیەکان لە هەڵەبجەو خورماڵ دەسەڵاتدار بوون، ڕۆژێک برادەرێکــی خەڵکــی ســلێمانی ئۆتۆمبێلێکــی بەهبەهانی هەشــت پســتۆنی پێ دەبێــت، لەبازگەی خورمــاڵ پێیان دەڵێ: ئەو کاتەتان بــاش. ئەوانیش دەڵێن: وەرە خوارەوە با فێری ســڵاوکردنت بکەین. ئەویش دەڵێ: چۆن و چۆن ســڵاو بکــەم؟! دەڵێن: بڵێ، (ئەل ســەلام و عەلەیکم و وە ڕەحمەتولاهی وە بەرەکات و)، ئێمــەش دەڵێین: (عەلەیکومەســەلام وە ڕەحمەتولاهی وە بەرەکات وهو)، کاکی شــوفێر دەڵێ: باوکم ئەم ســڵاوە پێنج لیتر بەنزینی دەوێ، ســەیارەکەم کاردەکات!!

# هەشت کەس لەسەر قالبە سەهۆڵ کوژران

رۆژێـک بەسـەفەر هاتمەوە بۆ باشـوری کوردسـتان، بۆ شـاری هەولێر. هاوین بـوو زۆر گەرمـا بوو. سـەردانی کـوڕە خاڵەکانم کرد لە کارگەی ئاسـنگەری لە پیشەسـازی باشـور. ئێـوارە بوو کارگەیان داخسـت و بەڕێکەوتیـن بۆ ماڵەوە، هەرکـە گەیشـتینە سەرشـەقامی قیرتاو کراو، لـەلای پێشـانگای ئۆتۆمبێلەکان هەندێـک تەقەکـرا. هەر ئەوەندەم زانی کوڕە خاڵەکانم (کاکەو سـەمیر) بە دوو ئۆتۆمبێـل، سـەریان لەدوای لۆریەک نـا. چەند ئۆتۆمبێلێکی تریشـی لەدوابوو، چەند چەکدارێکیش لەسـەرەوە سوار ببون. نەمزانی ئۆتۆمبێلەکە بەفر(سەهۆڵ) ی بارکـردوە، هـەر ڕای گـرت ئێمە دابەزیـن، من قالبێک بەفرم دەسـت کەوت. باشـترین دەسـتکەوت بوو، چونکە ئەوساڵە لەسەر بەفر بەس لە هەولێر هەشت کەس کوژرابوو.

گەڕامەوە ئێران، ڕۆژێک نایلەی هاوسـەرم، چووبـوو لەنانەواخانە نان وەربگرێ، نانیـان نەدابویـێ، پێیان گوتبوو: ئێـوە عێراقین، ڕادیۆی حیزبـی دیموکراتتان داخسـتوە، بۆ ڕەزامەندی جمهوری ئیسلامی، دەتانەوێ نانیشتان پێ بدەین؟!! منیش زۆرم پێ خۆش بوو کە خەڵک ئەو هەستەی هەبێ، قۆڵم هەڵکرد، گوتم: ئێسـتا یان چوار لە ئێمە نامێنێ، یان شەش لە ئەوان، بەرەو نانەواخانە چووم، کـە گەیشـتمە لای نانەواخانە، خەڵکی زۆری لێبوو، لـە ژن و پیاو. بەدەنگێکی بـەرز گوتم: بـۆم وەرنە دەرەوە، واتان لێهات نان نەدەنـە خێزانی من؟ ڕادیۆی حیزب یەکێتی دایخستوە، خۆ ئەو خێزانە بەستەزمانەی من داینەخستوە، ئەگەر کلیلی لای هاوسـەری من بێ، هەر ئێسـتا دەیکەمەوەو دەنگی زیاتر دەدەمی. بۆ ئێمە لەبرسـان دەکوژن؟ تاوانی ئێمە چیە؟ زۆربەیان منیان دەناسی، دەیانزانی دەربارەی پارچەکانی تری کوردسـتان هەڵوێسـتم چۆنە، چەند ڕێز لە خەباتیان دەگـرم. گوتیـان: توخوا ئەوە هاوسـەری تۆ بوو، ئەو ژنـە عێراقیە؟ هەر با بـوو نانی خـۆی بۆ من دانا، گوتیان: کاکە ئەوە نـان، داوای لێبوردن دەکەین،

نەمانزانی هاوسەری تۆیە.
ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئاوو هەوایەکی یەکجار سازگارو خۆشی هەیە، خەڵکی پیرانشەهر و دەوروبەری بۆ من یەکجار باش بوون، پەیوەندیەکی زۆر چاکم لە ڕوی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خەڵک هەبوو. بەڵام ژیان زۆر سەخت بوو، وەک بۆ خۆیان دەڵێن: زندەگی سەختە. حەڤدە ساڵ لەوێ ژیام. باوەڕتان بێ لەترسی ژیان، لەزەتم لە ژیان نەکرد. نەوت و سوتەمەنی کێشەکەی لەهەموان گەورەتر بوو.

# براکوژی

لەنەغەدە پیاوێکی عێراقی هەبوو بە ناوی (ا.ب) ژنەکەی خەریکی کاری لەش فرۆشی بوو، کچێک و بوکێکی هەبوو. وردە، وردە ئەوانیشی فێردەکرد. (ا.ب) لە پێشوودا، سەر بە لایەنێکی سیاسی باشوری کوردستان بوو. ژنەکەی چەندینجار لەسەر کاری بەدرەوشتی و لەش فرۆشی لەلایەن کۆمیتەی (مبارزە بە مەفاسیدی اجتماعی) واتە: کۆمیتەی بەرەنگاربوونەوەی فەسادی کۆمەڵایەتی، دەگیراو پاش ماوەیەک ئازاد دەکرا. بەڵام دەستبەرداری کارەکەی نەدەبوو. عێراقیە پەناهەندەکانی نەغەدە زۆر پێ نارەحەت بوون، کە خەڵک دەیانگوت: ژنێکی عێراقی گیراوە لەسەر کاری لەش فرۆشی. بۆیە چەند کەسێک لە عێراقیەکان بڕیار دەدەن بانگی (ا.ب) بکەن، قسەی لەگەڵ بکەن لەو بارەیەوە. دەڵێن: کاک فلان دەبێ ماڵەکەت باربکەی بچیەوە دیوی عێراق. ئەویش دەڵێ: بۆ بچمەوە، کاتێک کە پارتی و یەکێتی خەریکی ئەو شەڕە نەگریسەن؟!! ئەی بۆ ئێوە خۆتان ناڕۆنەوە؟ ئەوانیش ڕێک و ڕوون دەڵێن: ئاخر تۆ ژنەکەت ئابروی هەموو عێراقیانی بردوە. (ا.ب) زۆر توڕە دەبێ لە مەجلیسەکە هەڵدەستێتە سەر چۆکان، دەڵێ: بڕۆن ئەو کارەم پێ لە براکوژی چاکترە، بچمەوە باشور دەبێ براکوژی بکەم، منیش بۆیە ناچمەوە.

# جەنابی شێخ عەلی

لەشـاری پیرانشـەهر پیاوێکمان دەناسـی، لەرێی ئەحمەدە سـوری خەیاتەوە، کـە ڕۆژانە لەگەڵ ئەو کەسـە گاڵتەو جەفەنگیان دەکرد. بەناوی (سەربەسـت)، (بەقسـەی خۆی پێشـمەرگەی دێرینی سۆسیالیسـت بوو). سەربەسـت ژنێکی ڕۆژهەڵاتی هێنابوو. کوڕی گەورەیان هەبوون. داشـقەیەکی هەبوو بۆ کەسـابەتی ڕۆژانە، ورتکەنان و کۆنەی ماڵانی دەکڕیەوە. ئەحمەدە سور زۆری سەر دەخستە سـەری، دەیگوت: باوەڕ ناکەم تۆ پێشـمەرگە بووبی، بەو هەموو کاڵفامی و بێ عەقڵیەتـەوە. سەربەسـت ژمارەیەکی ئۆتۆمبێلی ژمارە (اربیل)ی لە داشـقەکەی دابوو. ئەوەش بۆ خۆی هەویەی ڕادەی زانیاری سەربەسـتی دەردەخسـت، پێش ئەوەی بدوێ. ڕۆژانە لەگەڵ ئەو ژن ومنداڵەی خۆی، لەجەنگێکی بێ بڕانەوەدابوو، جاری واهەبوو بەهەمویان لێیان دەدا، هەموو داموەزگای پەناهەندانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. نازانم چ خەتایەکی نوێی کردبوو( ئموری پەناهەندان)، بڕیاریان دابـوو ڕەوانەی زێوەی مەرگەوەڕی بکەن، کە لە ورمێیە لەسـەر سـێ گۆشـەی (عێراقـ ئێرانـ تورکیـا) . بەو حاڵە سەربەسـت لـە پیرانشـەهر دەرکرا، ماڵی بارکرد. دوو سـێ سـاڵی پێچوو، ئێمە سەربەستمان هەر لە یادیش نەمابوو.

ئێمـە کـە لەدێلزێ بویـن، هەر ماڵێکی نـوێ بهاتبایە ئەو ئۆردوگایە، سـەرمان دەدا، بەنیازی بەخێرهاتنی. ماوەیەک بوو، حاجی مەحمودو کاک مجید، بەمنیان دەگـوت: ماڵێک هاتوون لەگەڕەکی باڵەییان، بچینە بەخێرهاتنی. ناوی (شـێخ عەلی)یە. دەڵێن شێخێکی زۆر ناودارە، دووعاو نوشتەی یەکەویەکە. چەند ڕۆژێک بوو، بۆمان ڕێک نەدەکەوت بچین بۆ بەخێرهاتنی ماڵی شـێخ. لەدواییدا شەوێک دوای نان خواردنی ئێوارە، هەر سێکمان چوینە بەخێرهاتنی شێخ عەلی. هێشتا بە خزمەتی نەگەیشـتبوین، خۆمان پۆشـتەکردبوو، نەبادا شـێخ تێبینی لەسەر شـێوازی جلوبەرگمـان هەبـێ. لـە دەرگا زۆر بە ئارامی و ئەتەکێتـەوە بانگمان کرد: یا شـێخ لەماڵی؟ ئەویش ئەوەندە بە هەڵەشـە و لەناکاو دەرپەڕی، لەگەڵ پێشـوازی پارویێکـی زۆر گـەورەی لەناو دەمیـدا بوو، لەگـەڵ بەخێرهاتنی ئێمە

پرشــکە نانی لەدەمی دەردەپەڕی. لێی وردبوومەوە، کورە ئەوە خۆ سەربەســتە شێتەکەی خۆمانە، بوە بە شێخ عەلی!! لەناکاو کۆنترۆڵم لەدەستدا گوتم: کورە سەربەســت؟!! چــاوی لێ داگرتم. حاڵی کردم کــە دەورووبەری لێ تێ نەگەیەنم. لەپاش چا خواردنەوە، منداڵێک بەدوای حاجی مەحمود دا هات، گوتی: میوانمان هەیــە وەرەوە. کاک مەجیدیــش لەگەڵی ڕۆیشــت. من گوتم: لای جەنابی شــێخ تۆزێکــی تر لە خزمەتی دادەبم و دوایی دێمەوە.

شــێخ ئەوانــی بەڕێ کــرد، گەڕایەوە ژوورەوە، گوتــی: کاک حازم، خەریک بوو ریســەکەم لــێ بکەیەوە بــە خوری، خۆ من لە کۆڵ کاســبی بوومەتــەوە، تەنها نوشــتوان دەکــەم!! گوتــم: ئاخر هەی بێ عەقڵ، خــۆ خوێندەواریت نییە، چۆن دوعا دەنوســی؟! گوتی: وادەزانی ئەوەی بۆ دوعاو نوشــتە دێت لە سەربەســتە گێلەکەی تۆو ئەحمەدە ســور ئاقڵترە؟!! زۆری تکا کرد، بە کەس نەڵێم. منیش گوتــم: ژوورێکــی تاریک، چەند کەوڵە ڕێوی و کەوڵە گورگ و چەند مارێک لەناو شوشــەو پێنج شــەش ناڵی وڵاخ و شمشــێرێکی گەورەو چەند پشتێنێکی سەوزو دوو تــا ســێ مەنجەڵــی گــەورەو کۆمەڵێک هێلکــەی ڕەنگ کراو و دوو تا ســێ تەڵەی مشــکان و تیروکەوانێک و ....هتد، هەڵبواســە. زۆرشــتی ترســناک لەو ژوورە هەڵبواســە، لەناو شــتی مس و قوڕی سورکراوە ئاو و چا بخۆرەوە. وەک ئێمــە ئاســایی مەبــە. چەند قایش و قرۆش و چەند تەزبیحێکی گەورە ڕاســت و چەپ لە خۆت ببەســتە، وەک ئەســپی ژێر عارەبانە خۆت قایش بکە. ئاخر هەی بێ عەقڵ ئێســتا تۆ کوێت لە شــێخ دەچێ، بەتایبەتی دوعاگۆو نوشــتەچیەکان و فاڵگــرەوەکان؟!! گوتی: بەڵێن بــێ ئەوانە هەموی دەکەم بەس تۆ خەڵکم لێ ئاڵۆزمەکە.

ڕۆژێــک لــە مــاڵ هاتمــە دەر بچم بــۆ پیرانشــەهر، ( س.م)م بینــی ( خەڵکی حاجیــاوان، ئێســتاش لەوێن)، دوای ســڵاو، گوتــم: خێرە لێــرەی؟ گوتی: دوو ئەســپمان ون بوە لە شــیناوێ، هاتوومە لای ئەو شــێخ عەلیە، نوشتەم کردوە، لەبیرتە ئەوێ ســاڵێ زێڕیشــمان لێدزرابوو؟ گوتم: یا شــێخ ئەو زێڕەش لەگەڵ نوشــتەی ئەســپەکان بنوســە، بەڵکو دەیان دۆزینەوە. منیش زۆر پەست بووم، گوتم: نوشــتەی بەچەندی بۆ کردی؟ گوتی: بە سی هەزار تومەن. (گوتم: تازە ئــەوە بــە من عاقــڵ نابێ، با پاتری پێ ســەرف نەکەم) گوتم: ئەی بۆ نوشــتە

پەنجا هــەزار تومەنییەکــەت نەکــردوە؟! گوتی: بــۆ؟ گوتم: ئــەوەی بە پەنجا هەزار تومەنە، جیاوازی هەیە. لە پێســتی پشــیلە دەینوســێ، بەخوێنی ژۆژک. بە تەمابوو، بگەڕێتەوە لای شــێخ، بەڵام نەمهێشــت، گوتم: وەرە بەڵکو ئەو سی هــەزار تومەنییــە کار بکات، ئەگەر نەبوو ئینجا پەنجا هەزاریەکەی پێ بکە.

رۆژانــە ماڵــی شــێخ ببوە کاروان ســەرا، بەڵام ماڵ و منداڵێکــی زۆر بێ کەڵکی هەبــوو، لەبەر شــەڕو ئاژاوە هەموو دراوســێکانیان نیگەران کردبــوو، بەتایبەتی کاک ئەحمــەد ئاغــای ماونان، لە دۆڵی باڵەیی. ئێســتاش ئەگەر دەگەینە یەکتر لەگەڵ کاک ئەحمەد ئاغا، باســێکی شێخ عەلی دەکەین.

شەوێک شێخ عەلی واتە (سەرۆ) شێت، لەگەڵ کوڕە گەورەکەی کە سەرخۆش بــوون، بەشــەڕهاتبوون، بــوو بە هەرا. ڕامان کرد بۆ لای شــەڕەکە، شــەو بوو، کوڕەکەی دارێکی قەڵاشکەری لە لاچاوی جەنابی شێخ دابوو، چاوی دەرپەڕیبوو، بەســەر ڕومەتی شــۆڕببوەوە. ئەحمەد ئاغا بەدەم چاو تێکردنەوەو بەســتنەوەی بــە لەچکەیەک، هەتــا دەیگەیەنینە لای دکتۆر، دەیگــوت: بریا چاوەکەی تریش دەرپەڕی با. بەو شێوەیە شێخ چاوێکی لەدەستدا، بەڵام گلەیی دەکرد، دەیگوت: کاک حــازم، گوێت لێبوو، ئەحمەد ئاغــا لەجیاتی بڵێ بەداخەوە، دەیگوت: بریا چاوەکەی تریشــت دەرپەڕی با؟!! منیش گوتم: ئەحمەد ئاغا بۆ تۆیەتی کەوای گوتوە، بۆ ئەوەی چی تر ئەو ماڵ و منداڵە خراپە نەبینی، بەو چاوەی کەماوتە. بــەڵام تــۆ بێ عەقڵی نازانی کێ دوعای چاکت بۆ دەکا. ئەحمەدە ســور لەگەڵی چــوو، چاویلکەیەکی ڕەشــی گەورەی کڕیبوو، لەچاوی دەکــرد، بۆ ئەوەی چاوە کوێرەکەی دیار نەبێ، دەمانگوت: ئێســتا بە شێخان دەچی.

لەدوای ڕاپەڕین، شــێخ عەلی (سەربەســت) لەلایەن ماڵ و منداڵەکەی کوژرا. بۆ چەند ســاڵێک کچەکەی لە شــەقڵاوە زیندانی کرا، لەسەر کوشتنی (سەربەست) شێخ عەلی باوک.

# زیندان دەستت ماچ دەکات

دەمویست بێمەوە دیوی باشور، لەکانی زەردێ سەرکەوتم بۆ لای نێوزەنگ و نۆکان. لەوێ خاڵی پشکنینی یەکێتی لێبوو، کوڕێکی گەنج دەیگوت: بەهیچ شێوەیەک نایەڵم بچیە قەڵادزێ، چونکە ئەو ناسنامەیە ساختەیە تۆ بە ئێرانیان دەچی. گوتم: ئەو کۆنە بارەگا ڕوخاوانە دەبینی؟ ئەو بەردانە ئەگەر زمانیان هەبوایە، لێت وە دەنگ دەهاتن، چونکە بەردی وا هەیە دووجار هاتۆتە سەر شانی من. بەهەزار دەردەسەری ڕێگایان پێدام، تا بچمە قەڵادزی. داستانی چوونە ڕانییە و هەولێر هەر باس مەکە؟

لەهەولێر دەمویست بچمەوە ڕانییە، لەوێشەوە بۆ دیوی ڕۆژهەڵات، بۆ ماڵی خۆم. لەهەولێر، لەگەراجی کۆیە و ڕانییە سواری ئۆتۆمبێل بووم، لەناو گەراج لەبەردەرگا دەبوایە هەموومان دابەزین، بۆ ئەوەی ئاسایشی پارتی وەرەقەمان بۆ بکات، بە منی گوت: تۆ ناتوانی بچی بۆ ڕانییە. گوتم: بۆ؟ گوتی: تۆ نفوسەکەت هەولێرە، بەهیچ شێوەیەک ناتوانی بچی بۆ ڕانییە!! گوتم: ئەدی بۆ بەغدا؟ گوتی: ئازادی بۆ بەغدا. گوتم: مەگەر ڕانییە کوردستان نییە؟!! گوتی: زۆری لەسەر مەڕۆ، ئەگەر نا زیندان دەستت ماچ دەکات. بیرم کردەوە، ئەی خوایە دەبێ حوکمی چوونە ڕانییە چەند ساڵ بێ؟!! خوایە ئەو هەموو پێشمەرگایەتی و خەباتی سیاسیمان کرد بۆ ئەو ڕۆژە؟ لە ژێر سێبەری ژوورەکەی ئاسایش دانیشتم. ساڵێک دەبوو جگەرەم واز لێ هێنابوو، جگەرە فرۆشێکی منداڵ لەوێ بوو، لەگەڵ منداڵێکیش ئاوی دەفرۆشت. دوو جگەرەم کڕی، هەر بە دوو قوم دەمگەیاندە فلتەرەکە، هەردووکیانم کێشا. منداڵەکان خەریک بوون دڵی منیان دەدایەوە، یەکێکیان کە ئاوی دەفرۆشت لەناو گەراج دەستگێربوو، گوتی: باوکم شەهیدە، ڕۆژی سێ دینارم لێ دەستێنن، بۆ خاوەنی گەراجەکە، کە بە کرێی گرتوە، یەکێک بوو لە پیاوە هەرە پیسەکانی ئەمن بەناوی (م.ق)، خەمی خۆم لەبیرکرد. بەرپرسی ئاسایشەکان هاتە دەرەوە، گوتی: ها نفوسەکەت بدەمەوە، بەس پرسیارێک: تۆ کوڕی عەلی کوتک نیت؟ گوتم: بە ملی شکاوم ئەوم.

گوتـــی: دەبـــێ لێمان ببـــوری، بەخوای نەمزانی، تۆ پێشـــمەرگە بوی لەبەســـتی شـــەرغە. گوتـــم: ئەدی جەنابت؟ گوتی: من هاوڵاتی بـــووم، خزمی عەلی برنۆم، ئێـــوە دەهاتـــن بۆ ماڵەکانی ئێمە کە پێشـــمەرگە بوون، ئێســـتا ئۆتۆمبێلێک بڕوا لەگەڵی برۆ بۆ ڕانییە، ئازادی.

# ئێوە حوکم بدەن من خەڵکی کوێم

گەرمەی شـــەڕی ناوخۆ، کۆماری ئیســـلامی هەرچەندجارێ شـــەڕی ناوخۆ گەرم دەبـــوو، ئێمەی تەنـــگاو دەکرد، دەیگوت: دەبێ برۆنەوە وڵاتی خۆتان. کاروباری ناو کۆمەڵگای دێلزێ، درابوو بە پەیمانکار، ئەویش لەگەڵ چەند گورگەمێشێکی ناوخۆمـــان ڕێک کەوتبوو. بـــەو خەڵکە بێچارەیان دەگوت: هەرکەس پێش ماڵ و بەرامبەری ماڵی خۆی چاک نەکات، بەرێی دەکەینەوە وڵاتی خۆی. ئەو زوڵمە زۆر ئازاری ڕۆحی دەدام، بەڵام هیچ چارەمان نەبوو. زۆرجار لای هاوڕێکانم دەمگوت: لەمێژودا ڕوی نەداوە، بەکەسێک بڵێی: ئەگەر بەکەیفی من ڕەفتار نەکەی، بەرێت دەکەمـــەوە زێـــدی بـــاب و باپیرو ســـەرجێگاو ڕێگای خـــۆت، بەناردنەوەی وڵاتی خۆت هەڕەشـــەت لێ بکەن!! ئەوانەی ئەو خەڵکە بێچارەیان ئازار دەدا، ئێســـتا هاتونەتەوە کوردستان. لەلایەن پارتی و یەکێتی مووچەی باشیان بۆ براوەتەوە، زۆر لە خەڵکی تر لەپێشـــترن، ئەگەرچی ئەوەندەیان ســـیخوڕی و خراپە لەگەڵ خەڵک کرد، قەت باوەڕمان نەدەکرد، بتوانن بوێرن بێنەوە کوردســـتان. بەکرینی چەند فەرشـــێک بۆ بەرپرســـە چاوچنۆکەکان هەموو ئەو خراپەی لەحەڤدە ساڵی ڕابردوو کردبویان، بەیەک چرکە بسرێتەوە.

ڕۆژێـــک یەک لەو ســـیخوڕانە هەڕەشـــەی لە پێشـــمەرگەی دێرین ســـەلاح باڵەیی کردبوو، ئەگەر واز نەهێنێ لە باســـکردنی بەگرتنی دەدا. ئەوەم هاتەوە یاد، کە لە ئێران بوین، بە ئیبراهیمی ســـەکریان گوتبوو: لە ئیتلاعات ئەگەر هاوکاریمان نەکـــەن، ئـــەوەی بگەڕێتەوە کوردســـتان لەوێـــش ئێمە نایەڵیـــن هیچی بۆ بکرێ، لەوێش دەســـتمان دەڕوا. حەڤدە ســـاڵ لەدیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (ئێران) بە ئێمەیـــان دەگوت: عێراقی. کە هاتینەوە بۆ باشـــور دەیانگوت: ماڵە ئێرانیەکان.

بۆیە زۆرجار کە لێم دەپرسن: کاک حازم، ئەرێ ئێوە بە ئەسڵ خەڵکی کوێن؟ لەوەڵامدا دەڵێم: بەو خودایەی بەهەقی دەناسی، خۆشم نازانم خەڵکی کوێم، ئەگەر نا بە کەسم نەگوتبایە بە تۆم دەگوت. ئاخر وەختێک پێنج منداڵم هەبێ، هەر یەکەی لە شوێنێک لەدایک بووبێ، تا هەقمە ئەگەر نەزانم خەڵکی کوێم؟!! بۆ خۆم لە دایک بوونم گوندی گردلانکەی دەشتی دزەییاتیە، کوڕە گەورەکەم لە قوشتەپە لە دایک بوە، هۆشەنگ لە گوندی گەڕەشێخان، هەڵمەت لە ڕۆژهەڵاتی کۆیە، دەشتی لەکافێ، ناوچەی زێبارەتی، دیلان لە ئێران. ئێستاش لە ڕانییەم، ئێوە حوکم بدەن من خەڵکی کوێم ؟!! ئاخر ڕەسوڵ قولی ناهەقی نەبوو کە لەهەولێر لەگەڵ چەند گەنجێک بەشەڕهاتبووم، گوتی: هەی سەگباب، کوچاگرتان لەهیچ شوێنێک ڕەش نابی. (ئەو ماڵانەی زوو زوو بار دەکەن، دەڵێن: هێشتا کوچاگری ڕەش نەبوە باری کرد، کوچاگر مانای بەردی ئاگردان، ئێمەش لە دەست ئاغایان و دوای سیاسەت و کوردایەتی کوچاگرمان ئێستاش بە باشی ڕەش نابێ بار دەکەین). دوور نییە لەبەر نەبوونی ئازادی ڕادەربڕین و نوسینی ئەو چەند لاپەڕەیە، دیسان جێ لەق ببم و کوچاگرم ڕەش نەبێ.

ئەوکاتەی ماڵم لە ئێران لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لەگەڕەکی زەرگەتەن، بوومە هاوسێی پیاوێکی زۆر قسە خۆش بەناوی مام مەحمود. ڕۆژێک هات بەخێرهاتنم بکات، بوینە ئاشنا،گوتی: لەزەمانی شا لە کوێستانەکانی سپی ڕێزی خەیلانیان، مێرگەچەکۆ، کێلەشین، بەر بزین، حێلاتی عێراق و ئێران لەو کوێستانانە ڕەشماڵیان هەڵدابوو، پڕ بوو لە کچ و ژنی شۆخ و شەنگ وەک مەڕی بە دامێن و بەرۆک خۆیان دەلەنگاند. مام مەحمود گوتی: من ئەوکاتە چەرچی بووم، شتومەکی بەقاڵیم دەگێڕا، لە ناو ئەو حێلاتەی کە خەنە و کل و سورا و سپیاو و لەچکە و عەتر و سابوون و جوانکاری ئافرەتان بەهەموو جۆرەکانییەوە. تازە دەستم بە دەرمان حەمام ڕاگەیشتبوو، بۆ پاک کردنەوە و لوس کردنی لەشی ژنان. کە چاویان بە دەرمان حەمام کەوت، ڕەشماڵ نەما ژنەکانی لێم نەکڕن، بەڵام نەمدەزانی شێوەی بەکارهێنانی دەرمان حەمامەکەیان بە باشی پێ بڵێم، ئەوانیش دەرمانەکەیان زۆر خەست، وە ماوەیەکی زۆر بەسەر لەشیان هێشتبووەوە، هەموو لەشیان سوتابوو. کاتێک شوانەکان و پیاوەکانی تر دەچنە لای ژنەکانیان بۆ جوت بوون، کە دەست لە لەشی ژنەکانیان دەدەن، یەک

بەخۆیـان هاوار دەکەن: نەکەی، نەکەی..!! ڕێگـە نادەن مێردەکانیان لەگەڵیان جوت بن. پیاوەکان دەپرسـن: بۆ هاوار دەکەن، لەشـتان چی بەسـەر هاتوە؟!! ئـەوان دەڵێن: مەحمود ئێرانی دەزانێ. پیـاوەکان دەڵێن: ئاخر مەحمود ئێرانی چۆن دەسـتی گەیشـتە ئەو شـوێنە؟ بۆ بەیانییەکەی پیاوەکان هەر با بایە بە دوای مەحمـود ئێرانـی دا دەگەڕێن، بە گۆپاڵەوە یەک لەیەکی دەپرسـن: ئەرێ مەحمـود ئێرانیـت نەدیوە؟ ئـەوەی تر دەڵـێ: منیش لەدوای مەحمـود ئێرانی دەگەڕێم، بەڵام تۆ چ کارێکت پێیەتی؟ خۆ ناکرێ بڵێ لەشی ژنەکەی سوتاندوە، دەڵێ: قەرزی لایە ئەو پارەیە نەداتەوە دەبێ پشتی لە زگی نەرمتر بکەم. ئەی تۆ؟ ئەو دەڵێ: بەخوای بڕێک پارەی پەنیری منیشـی لایە، مەگەر بە بەردەستم نەکـەوی. مام مەحمود، گوتی: هەرچی دەمبینی دەیگوت: لەدوات دەگەڕێن، بۆ ئـەو هەمـوو پارەیەی خەڵکت لایـە؟ منیش بە کەتنی خۆم شـک دەهات، بۆیە دەمگوت: بریا پارەبایە. بە پەلە خۆم لەمێرگەچەکۆ ئاوای دیوی ئێرانێ کردەوە، چوومە گوندی گردەسور، دیاربوو لەوێش زانیبویان ئێراقی بەدوای منەوەن، بەو شێوەیە وازم لە چەرچیاتی هێنا.

# زیندانیکردنی دایکم

لـە مانگی ئابی سـاڵی (٢٠٠٠)، لەجەنگـەی ناکۆکیەکانی پارتـی و پەکەکە، من هێشـتا ماڵم لەدیوی ئێران بوو. دایکم و هەردی و تانییەی خوشـکم لە هەولێر، لە دارەتوو بوون. هەردی تۆمەتبار دەکەن گوایا کچێکی گەریلای پەکەکە چۆتە ماڵـی هـەردی و ئەویش یارمەتی داوە. کاتێک هەردی برام لەهەولێردەبێ، چەند چەکدارێکی پارتی دەچن بۆ ماڵی دایکم، پرسیاری هەردی دەکەن. دایکم دەڵێ: چوە بۆ ناو هەولێر، هاواری کوڕم هەندێک پارەی بۆ ناردۆتەوە چوە وەریبگری. بەهەردی ڕادەگەیەنن کەوا چەکدارەکانی پارتی داوات دەکەن. هەردی ناچێتەوە ماڵ، دەچێ بۆ لای بارەگای مام خدر ڕوسی، لەوێشەوە دەچێ بۆلای دۆستێک. چەکـدارەکان دەکەونە شـوێن پێ هەڵگرتنی هەردی، ئەویش خۆی بەدەسـتەوە نـادات. چەندجـار دەچنـەوە لای دایکم، بۆ گرتنی هـەردی، هەموو ماڵەکە لێک

دەدەن. ئەو سـەروبەندە بازگەکانی نێوان مەملەکەتی زەردو مەملەکەتی سـەوز زۆر تونـد بوون، کـەس لە بازگەکان دەربازی نەدەبوو، بەڵام بۆ ژێر قەڵەمڕەوی ڕژێـم ئاسـایی بوو. بۆیـە هەردی بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بـکات، لە ڕێگای چەند برادەرێکی خۆی دەگەیەنرێتە کەرکوک و دوایی چەمچەماڵی مەملەکەتی سـەوز. هەواڵگـری پارتـی، کەدەزانـن هەردی لەهەولێـر نەماوە، دەچنـەوە دارەتوو بۆ ماڵـی دایکـم. بەڵام ئەمجـارە بەهێزێکی یەکجـار زۆر، هەر چـوار دەوری ماڵی دایکـم دەگرن. زیاتر لە دە ئۆتۆمبێلی چەکـدارە تایبەتەکانی پارتی، کە خۆیان ناساندبوو بە مەکتەب سەرۆک.

ئەوەی بۆ من جێگای تێڕامانە، زۆر لە ئەنفالچی و کۆنەجاش و بەعسـیەکان کە ئێستابوون بەکادیری پێشکەوتوی حیزبە دەسەڵاتدارەکان و لەسەر لیستی ئەوان بـوون بە ئەنـدام پەرلەمان، گوایا کەس نابێ بیانگری. لەبەر ئەوەی (حەسـانە) پارێزبەندی پەرلەمانیان هەیە. بەڵام دایکم کە خاوەنی تابلۆی هەشـت شەهیدە، بە پێوەری عاجباتیەکانی ئاخری زەمان ( حەسـانە)ی نییە!! شـەهیدەکان: دوو برام شـەهیدە، دوو مامم و یەک ئامۆزا و کچێکی مامم یاسـین بە دوو منداڵەوە ئەنفالـە. ئێمە گۆڕمان گەیشـتە سـەماوە و عەرعەریش ،کەچی (حەسـانە)مان نییە و ئێسـتاش هاوڵاتی پلە دوین، بۆیە پەخشـانێکم لەسەر (حەسانە) نوسی بەم شێوەیە:

**(حەسانە)**

**دەبێ لەکوێ دەست بکەوێ؟**
**ئـەو پێوەرەی پێی دەپێون، دەبێ چی بێ؟!!**
**کام قایـش فووت، کام تەرازوو.. لەلای کامە مەزاتخانە!!**
**بە بڕیاری کام لەو هەتیو خەسـێنانە،**
**لەسـەر مێزی کام لگاو و قومارخانە،**
**بە بڕیاری کامە لەو کەللە وشـکانە،**
**بەکامە قەڵەمی چاوشـۆڕ، دەنوسن تابلۆی حەسانە؟!!**
**بـۆ ئەوانەی، لە بنیادی بوونی خۆیان.. بوودەڵە بن،**
**بـۆ ئەوانەی، نەهیچ بوون و نەهیچ دەبن،**

**خزمەتی بەعســی بوونیشیان، دەبێ بێ پسانەوە بێ،**
**بەخۆی بەعســی، باوکی بەعسی، خانەوادەی لەبەعسی بووندا خنکابێ،**
**لە لیســتە بۆگەنەکانیان، لە پرۆســەی، خائین کردن بە تێکۆشەر ناوی هەبێ،**
**بۆ بەرپرســان، ئیتاعە و وەلائی هەبێ،**
**بە ویژدانی یاســای جەنگەڵ ، ئەوە بۆ حەسانە دەبێ !!**
**من لام وابوو، لیســتی شەهید و ئەنفالی خانەوادە،**
**دەبێ بە ئارم و تابلۆمان**
**من لام وابوو، جەمەدانییە بەخوێنەکەی شــەهید کەریم**
**دەبێ بە حەسانە بۆمان**
**بەڵام هیچ کامێک لەمانە**
**بۆ دایکم نەبوە حەسانە.**

هەموومان واق وڕ مابوین، خوایە دەبێ دایکم چ گوناهێکی ( کەبیرەی) کردبێ!! ئەوان گوتیان: کەتنەکەی ئەو زۆر گەورەیە، لە ئەنفالی پایتەختی ئەنفالســتان، لەجەلەمــۆرد تۆ بلێی بەشــداری کردبێ؟!! گوتیان: لــەوەش گەورەترە. کچێکی گەریلای کوردان لای داوەتە ماڵی دایکم، شەوێک لەلای ماوەتەوە. یەک فریشتەی نەجاتی کورد، یەک مەدالیای ســەر ســنگی ئازادیخوازان، یەک فیدایی گەلی بن دەست، لەیەک لەگەن لەگەڵ دایکم نانی خواردوە. شارو گەڕەک، شەقام کۆڵان، خانوو، نیمدەر، قاپ و کەوچک، بۆنی گەریلای گرتوە. دیارە دایکم لەو شەوەوە تاکــو ئێســتا کــە تەمەنی لە (٩٠) ســاڵ تێپەڕیوە. لەدوای ئــەو هەموو خەباتە تێگەیشتوە تا دەرگای گشت ماڵە کوردێک بۆ گەریلا کراوەو لە سەرپشت نەبێ، ئازاد نابین. بۆیە ئێســتاش زەکاتی هەر بۆ گەریلایە.

دایکــم (بەدیعە شــێخە مەولــود) خێزانی عەلی حاجی تاهیر ناســراو بە (عەلی کوتک)، ئەوکاتە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵ بوو، بەو تەمەنە دایکی دوو شەهیدو چوار پێشــمەرگەی دانەبڕاو، هاوسەری پێشمەرگەی دێرین عەلی کوتک بوو. بەو تەمەنە لە ســەر نیشتمانپەروەری و پێشــمەرگایەتی ئێمە، ئەو شوێنانەی دیوەو نیشــتەجێ بوە لای بارەگاکانی پێشــمەرگە: گردلانکە، گەڕەشــێخان، قوشتەپە، پەرکانە، بەستی شەرغە، بایز اغا، کلێسە، خۆ شاردنەوە لەناو شارو، دەرکردنی لە ماڵە خزمەکان لەترســی گرتن، دۆڵی ڕوســتێ، سمیلان، ڕێزان، بارزان، کافێ

و بەری گارە، ئەشکەوتەی دۆڵی بالیسان، چوارقوڕنە، حاجیاوە...هەر شوێنەی ماوەیەک لێی نیشتەجێبوە. ئەو هێزە تایبەتە کە بەشەق و قۆنداغە تفەنگ دەرگای حەوشە دەکەنەوە، دەبینن ئەو پیرەژنەی دایکم لەسەر نیمدەرێک دانیشتوە، دووبارە ماڵەکەی دەپشکنن، دەڵێن: ئەی کوا ژنی هەردی؟ دایکم دەڵێ: هەردی ژنی نییە. ئەوانیش بە (بێ سیم) کەوا (دایکم هەموی گوێ لێبوە)، بەسەروی خۆیان ڕادەگەیەنن، دەڵێن: قوربان هەردی ژنی نییە، یەک پیرەدایکی ٧٥ ساڵەی لێرەیە، یەکسەر دەڵێن: لەگەڵ خۆتان بیهێنن. بۆیە دەڵێن: پیرەژن هەڵسە. ئەویش دەڵێ: ناتوانم هەڵسم. بە دوو چەکدار وەک گورگ تێی ڕوودێن بەنیمدەرەکەی ژێریەوە دەیخەنە ناو ئۆتۆمبێل، تەنانەت نایەڵن ددانە تاخمەکەی ببات. لەدارەتوو برادەرێکم بۆی گێڕامەوە: ئەو هەموو هێزە تایبەتە ئاژیری ئاگادارکردنەوەی ئۆتۆمبێلەکانیان هەڵدەکەن، وەک با ڕێگا دەبڕن، خەریک بوە چەند کەسێک بکەن بەژێرەوە، دەیگوت: وامانزانی، مودیر ئەمنی زەمەنی بەعس، یان چەند ئەنفالچیەک گیرابێ، لولەی تفەنگیان ڕوی لە خەڵکی قەراغ شەقامەکە کردوەو دڕیان بە ئۆتۆمبێل و خەڵکی دەدا. هەر بابا بوو خۆی ڕزگار بکات، دایکم دەڵێ: ئەوە بۆ کوێم دەبەن؟ دەڵێن: یەک پرسیار نەکەی، ئەوە ئەمری مەکتەب سەرۆکە، ئێمە هێزی مەکتەب سەرۆکین. دایکم دەڵێ: بەراستی ئێوە سەلماندتان کە جەنگاوەری ئازان. دەڵێن: بۆ پیرەژن. دەڵێ: حکومەتی بەعس چەند ساڵ بە دوامەوە بوون منیان پێ نەگیرا، ئێستا ئێوە بە ئاسانی منتان گرت. دایکم ڕاگیر ناکەن هەتا دەیگەیێنە مەسیف و شەقڵاوە. لەوێ دایکم دەبەنە ژووری لێپرسین و دەڵێن: ئەتۆ پەکەکەی؟ دایکم دەڵێ: ئەو هەموو ساڵانە لەو شاخانە بووم، نەبوومە ڕێکخستنی حیزبی شیوعی، تازە بە ٧٥ ساڵ تەمەن چۆن دەتوانم پەکەکە بم؟!! ئێوە هەموو پێشمەرگایەتی و قارەمانییەتی و برینداربوونی هەردی کوڕم لێ گەڕێن، چەند بریندارو چەکداری پارتی کە سەرۆ قادرو زۆری پارتی ئاگادارن لە (شیراتۆن) بۆ ڕزگارکردون؟ تەنها بە خاتری مرۆڤایەتی ئاوا چاکەی هەردی دەدەنەوە؟! دایکم دەیگوت: لەکاتێک من بەکەڵک ئەشکەنجەی جەستەیی نەدەهاتم، شەوان دەیانبردمە لای ئەو ژوورە تایبەتانەی کە پڕبوون لە زیندانی ژن، دەیانگوت: پیرەژن گوێ بگرە بزانە چی بە هاوتا زیندانییەکانت دەکەین، گوێت لە زیرەیان بێ، بۆ ئەوەی قسە نەکەی،

ئــاواش لەتــۆ بکەیــن. دەیگوت: تــا بەیانی لەبەر زیــڕەو ناڵەی ئــەو زیندانیانە خــەوم لێ نەدەکەوت. بە ڕۆژیش لەبەرئــەوەی نەیان هێڵا تاخمی ددانەکەم بێنم نانــم بۆ نەدەخورا. لەخەمی گرتنی خۆمــدا نەبووم ئەوەندەی زیڕەو هاواری ئەو ژنانە ئازاریان دەدام. ڕۆژێک دایکم خەریکی دەستنوێژ شوشتن دەبێت، یەک لە چەکــدارەکان دەڵێت: بۆ پەکەکەش نوێژێ دەکەن؟!!

لەرۆژهەڵاتــی کوردســتان هاتمە باشــور، چوومە چوارقوڕنە لــەوێ چوومە ماڵی مەحمــودی حاجی نادر، هەواڵی هەردی و دایکمی زانیبوو، گوتم: دەمەوێ بچمە شــەقڵاوە لای بەرپرســان و لقی پارتی، بزانم لەسەرچی ڕاوەدوی هەردی دەنێن و دایکــم دەگــرن؟! ناکــرێ ئاوا هەرچــی بیانەوێ، بێ ئەوەی شــەرم لە خەبات و قوربانــی بنەماڵەکەمان بکــەن جێبەجێی بکــەن. کاک مەحمود،گوتی: منیش دێم لە شــەقڵاوە هاوڕێ کانەبیش دەبەین، بەڵام دایکم تازە بەربببوو. بەداخەوە یەکێکــی ترمــان لەگەڵ بــوو نازانم کێ بــوو، کاتێک چوینە شــەقڵاوە کانەبیش لەگەڵمــان هــات، چوینە بارەگایەکی پارتی لە شــەقڵاوە نازانم لق بوو، بارەگای پاراســتن بوو.. چونکە کاک ئەکرەم مەنتک و هیوای ئەحمەد مســتەفا و چەند بەرپرســێکی تری لێبوو، بەداخەوە ناوەکانم لەیاد نەماوە.

کاک مەحمــودو کانەبــی قســەیان لەســەر ڕاوەدوونانی هــەردی و گرتنی دایکم کرد، منیان بە ئەکرەم مەنتک ناســاند. کاک ئەکرەم گوتی: حازمی دەناســم و خانەوادەی ماڵی حاجی تاهیر هەموو دەناســم، کەوتە ســەر تێکۆشان و خەباتی باب و مام و باپیرم لە دژایەتیکردنی چەوسانەوەی ئاغاکان هەتا پێشمەرگایەتی و ناوچەی شــەرغەو بالیســان و بارزان. ئەوەی زیاتر پەســتی دەکردم ئەوەبوو، دەیانگوت: شــوکر بۆ خوا شــتی گەورە ڕوی نەداوە، بەتایبەتی هیوای ئەحمەد مســتەفا ڕوی لــە من کــرد گوتی: خــۆت نیگــەران مەکە، چاک نییــە ڕووداوی دڵتەزێن ڕوی نەداوە؟!! گرتنی دایکیشــت هەڵە تێگەیشتن بوە.

کاک ئەکرەم مەنتک ڕوی لە من کرد گوتی: کاک حازم ماڵت هەر لە پیرانشەهرە؟ گوتــم: بەڵــێ. گوتی: کاکە ئێمە خەڵکی وەک ئێوە لە دار دەتاشــین، تۆ بۆچی نایەوە باشــور وەک هاوڕێ کانەبی و فلان و ...فلان، چەند کەســێکی شــیوعی ژمــارد کــە ببوونە پارتی، تۆش کلکە گوریســێک بگری، منیش بیرم کردەوە من بۆچی چووم ئەوانە چیان دەوێ!!

گوتم: کاک ئەکرەم لەراپەڕین، تاکو کەرکوک گیراو ئازادکرا، لەگەڵ بووم، بەڵام لەوەتای ئەو شەڕە نەگریسە بەرۆکی کوردی گرتوە، من ڕێزم بۆ ئەو تێکۆشەرانەی لەگەڵ هەر پارتێکی باشور کار دەکەن، بەڵام من بێلایەنیم لەوکاتە پێ شەڕەفێکی زۆر گەورەیە، پێم وایە ئەوەش جۆرێکە لە قوربانیدان. هەمویان سەیری یەکتریان کرد، ئەو باسەیان کۆتایی پێهێنا.


ڕێزلێنان

کاسترۆ مەعروف

بۆ بەرێز :بەدیعە شێخە مولود
خێزانی شەهیدی فەرماندە علی کوتك

وەك ژنە تێکۆشەر و سەرکردەیەك
کەخاوەنی ( ٨ ) شەهیدیت لە بنەماڵە
تێکۆشەرەکەتان، بە ئەرکی سەرشانمی
دەزانم ئەم ڕێزلێنانەت پێ ببەخشم.
هەرسەرکەوتو و تەندروست باش بیت...

کاسترۆ مەعروف
ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانی

# خەڵکی گوند هەمویان نەخۆش بوون

لەگەڕانەوەم بە گوندی سـونێ، گەڕامەوە. ژوورێکی بچوک لەسـەر ڕێگا لەسـەر گردێک بوو، ئەو ژوورە نەخۆشـخانەبوو، کارمەندێکی تەندروسـتی لێبوو، نازانم چەنـدی خوێندبـوو، بەڵام هەموو نەخۆشـەکانی بەرێدەکـرد، ئەوانیش بەدکتۆر بانگیان دەکرد، دیاربوو لە گوندەکە، کێشەیان هەبوو، منیش دەبوایە چاوەڕوانی ئۆتۆمبێـل بکـەم، لەلای ئەو دکتۆرە کاتەکە بەڕێ بکەم. لێم پرسـی: ئەوە چیە بـۆ خەڵکی گوندی کێشـەیان هەیە؟ گوتی: ئـەو داو و دەرمانەی کەدێ بۆ ئەو نەخۆشخانە بچووکە، بەشی ئەو گوندەیە، نازانم چ ڕێکخراوێکی خێرخوازی دەی نێرێ، ئەوان کە بەیانی هەڵسان لە خەو، ئەو ژن و منداڵانە بێ ئەوەی نەخۆش بن، دێن بۆ خاتری وەرگرتنی دەرمان بە خۆڕایی. خەڵکی وا هەیە چوار تا پێنج نەخۆشـی هەڵدەدا، بۆ نمونە، دەڵێ: سـەرم دێشـێ، پشتم دێشێ، زگم دێشێ، قاچم دێشێ، گورچیلەم بەردی هەیە..بۆ ئەوەی زۆرترین دەرمان وەربگرێ. ئێمە بۆ ئەوەی لەو کێشە دەرباز بین، بە خەڵکی گوندەکەمان گوتوە: دەبێ هەریەک کـەس یەک نەخۆشـی بڵێ، ئەوانـەی کە کەمتر نەخۆش دەبن، نارازین، ئێسـتا مەگەر کە سـەری مانگ دەرمان هات بۆ گوندەکە، بە یەکسـانی بەسـەر هەموان دابەشـی بکەم بە بێ جیاوازی نەخۆش و سـاغ، بەگوێرەی ژمارەی سەر خێزان.

# دروستکردنی مرۆڤ

پایـزی سـاڵی (٢٠٠٠) لەهەولێر گەڕامەوە بۆ چوارقوڕنە، کاتێک گەیشـتمە بەر دەرگای ماڵـی ئاسـۆی بـرام، هەردی بـرام لە حەوشـە گوتـی: میوانێکی زۆر خۆشەویسـتمان هەیـە، بزانم دەزانی کێیە؟ منیش چەند کەسـێکم گوت: ئەوان نەبـوون، کاتێـک چوومە ژوورەوە، برای بەرێز: کاک مەحمود چیرە و خوشـکی گەورەم زولێخا خان لەوێ بوون. گوتیان: هاتوین بۆ دیدەنی (سۆران)ی کوڕمان، بۆتـە گەریـلای پەکەکە. لە قەرەداغە، لەگەڵ هێزەکانـی پەکەکە. بەیانی ڕۆژی

دوایی من و هەردی و کاک مەحمود و خوشــکە زولێخا، ئۆتۆمبێلێکمان بە کرێ گــرت، بــۆ قــەرەداغ و بمانگەڕێنێتەوە بــۆ چوارقوڕنە. پێش نیوەڕۆ گەیشــتینە قــەرەداغ . پاشــان بەرە و قۆپی قــەرەداغ، گوندێکی بچوکی جوان لەو بنارە لە پشتەوەی گەلیەک هەبوو بەرەو قۆپی. من و کاک ڕحمان (شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە بوو) لەو گوندە ماینەوە. هەردی و کاک مەحمود و خوشکە زولێخا بەرەو گەلیەکە ڕۆیشــتن. هەتــا پاش عەســرێکی درەنــگ لای هەڤاڵانی گەریلا مانەوە، پاشــان گەڕانــەوە لای ئێمە. گەراینەوە بــۆ چوارقوڕنە، ڕۆژی دوایی من و کاک مەحمود و خوشــکە زولێخــا گەڕاینەوە بــەرە و ئێران بە ڕێگای قاچــاغ. بەلای نێوزەنگ و داوداوە بــۆ ڕۆژهەڵات. (ســۆران، دەرچوی زانکۆ بــوو خوێندەوارێکی زۆرباش بــوو، هــەر ئەو خوێندنەوە بوە هۆی ئەوەی نزیکی تەڤگەری ئاپۆیی ببێتەوە. لە بیرمە نامەیەکی بۆ ماڵەوە نوســیبوو، (دووریتان گەر چاوم بوایە لەمێژبوو دەرم هێنابوو) ئەو گەریلایانەی لەقەرەداغ بوون زۆربەیان ڕۆژهەڵاتی بوون، بەداخەوە یەکێتی هێرشــی کردە ســەریان لە مانگی ١٠/٢٠٠٠ زۆربەیان شــەهیدکردن، یەک لەوانە (ســۆران) بــوو کە بــەر لە بوون بە گەریــلا، گەنجێکی شــاری مەهاباد و خوێندکاربــوو، بەراســتی هی تفەنگ نەبوو، بەڵام پــەروەردەی گەریلا بەجۆرێک مرۆڤ دەگۆڕێ جێگای سەرســوڕمانە، بەراســتی دەتوانم بەپەروەردەی هەڤاڵانی پەکەکە بڵێم: (کارگەی دروســتکردنەوەی مرۆڤی کوردی ڕاستەقینە و وڵاتپارێز) . لەدوای شــەڕێکی گران (ســۆران) بــۆ ئەوەی بە دیل نەکەوێــت، نارنجۆکەکەی بەخۆیدا دەتەقێنێ و شەهید دەبێ).

# ڕێزلێنان لە جێگەی سەرزەنشت کردن

کــە گەڕامــەوە بۆ ماڵەوە لــە ئۆردوگای دێڵــزێ لە پیرانشــەهر، دوو ماڵی نوێ هاتبــوە ئــۆردوگا، یەکێکیان بە ناوی ( د.ا) کە چەکداری یەکێتی بوون، بە پارە تەقەیان لە حیزبی دیموکراتی ئێران کردبوو، بۆ ئەوەی لە ئێران نیشــتەجێ بن. ئەوســەرو بەندە لە میانەی شــەڕی براکوژی لە ســاڵی ١٩٩٣ هەتا ساڵی ٢٠٠٠،

خەڵکێکـی زۆر کـە ژمارەیان (٣٢١) کـەس بوون، بەرهەڵسـتکارانی ڕۆژهەڵات بەدەسـتی پیاوەکانـی ئێران لەناو حیزبە کوردسـتانییەکانی باشـور، بێجگە لە حیزبی شیوعی و زەحمەتکێشان و یەکگرتوی ئیسلامی، کوژران. زۆر لەو بکوژانە ئێسـتا بەرپرسیارەتیان هەیە لە باشـور، یان خانەنشینی پێشمەرگەی دێرینیان بۆ کراوە، زۆریان بەناو دەناسم کە پلەو ئیمتیازیان زۆر لە ئێمە زیاترە. یەکێکی تـر بەنـاوی (ع.خ) دوو گونییە پارەی موچەی پێشـمەرگەکانی یەکێتی هێنابوو بۆ ئێران، کە ئەو پارەی وەرگرتبوو لە ئیدارەی پێشـمەرگەبوو، لەجیاتی بچێتە بـەرەکان بەسـەرچەکدارە هاوڕێکانی دابەشـی بکات، هەمـوی دزیبوو بۆخۆی، ڕایکـرد بوو بۆ ئێـران. لەهەموی خۆشـتر، خەڵکی یەکێتی بەتوڕە بانگهێشـتی نان خواردنیان دەکرد، بەڵام ناهەق نەبوون، ئێسـتا ئەندامی مەڵبەندی یەکێتیە لە شـاری.....، بەداخەوە ئەو گەلەیان وا چەواشـەکردوە چاک و خراپ لەیەکتر جیاناکاتەوە.

# بڕوانامەی ساختە

لێـرەوە دەمەوێـت هەندێک لـە ڕووداوەکان بچمە پێش، سـاڵی ٢٠٠٦ بۆ ٢٠٠٧، پاشـماوەی ئەنفـال زۆر نـاڕازی بـوون لـە حکومەتـی هەرێم و هــەردوو پارتی فەرمانــڕەوا. پارتــی و یەکێتــی بەهەمــوو توانــای خۆیــان، بڕیاریانــدا هەمــوو منداڵەکانـی پاشـماوەی ئەنفال، لـە زانکۆو پەیمانـگاکان (٥) نمرەیان بۆ زیاد بکـەن لەکـۆی گشـتی (معدل). لەخەزێنەی دەوڵــەت بە بێ بەرامبــەر لەجیاتی ئەوەی کۆمپیوتەریان بۆ بکڕێ، یان شـوێنی حەوانەوەیان بۆ دابین بکات، پێنج نمـرە لـە معەدەلی پێدان، چونکە پارەی تێنەدەچـوو، پیاوەتی بەئاوی حەمام. گەورەتریـن ناپاکـی بەرامبەر پرۆسـەی خوێندن و خوێنـدکاران بوو. لە ئاکامی حوکمرانـی شکسـت خـواردوی پارتی و یەکێتـی، دەتوانم بڵێـم: کۆمەڵگایەکی نەخوێندەوار تەنها دابەشـکردنی بڕوانامە دروسـت دەبێت، کە هیچ مەعریفەیەک فێـری خەڵــک ناکەن، ئەو وڵاتەیان پڕ کرد لە دکتۆراو ماسـتەری نەخوێندەوار، بۆیە دەڵێم:

**دکتۆرا زۆریەی نەخوێندەوارە**
**هەریەک لەقاپی حیزبێ سەرکارە**
**میللەت لەبرساو سەرما ڕەقهەڵێ**
**لەلای وی، تازە جەنگەی بەهارە**
**بارە سیاسی و ڕۆژنامەنوسە**
**لەپێش بەرپرسان چەندە چاپلوسە**
**دەسەڵات دوو سێ موچەی دەداتێ**
**هەم زوڕناژەنەو هەمیش جاسوسە**

جێگای داخە، بۆ خۆیان چاک دەزانن کە شایانی ئەو بڕوانامە ساختەیە نین، بەبێ مەعریفـەی زانسـتی. بۆیە پێیان خۆش نییە پێیـان بگوترێ: دکتۆر، ئەوەندەی شـانازی بەوەوە دەکەن بڵێن: کادیری پێشکەوتوی فلان حیزب.

دیـارە زۆربەیان بروانامەی سـاختەیان لە ئێران بۆ دروسـتکرا، کە پێی دەڵێن: تەزویر.

ڕۆژێـک دوو میوانـی ڕۆژهەڵاتیـم هاتبوو، یەکێکیان گوتـی: ئەگەر کەس بیەوێ بڕوانامەی دبلۆمی بۆ دروسـت دەکەم، منیش پێمگوت: فلان، ئێمە زیاتر لە ١٥ سـاڵە یەکتـر دەناسـین، قەت کاری وام بـۆ کەس داواکـردوە ؟ گوتی: نەخێر. پێمگوت: ئەوەش ئەهلی خۆی هەیە.

بـەم بڕوانامانە دەچوونە زانکۆ، لەوێش بڕوانامەیەکی بـێ باگراوندی مەعریفیان وەردەگرت، بەتایبەتی بەرپرسی دوو حیزبەکە.

چەند برادەرێک، کە یەک دوانێکیان بەرپرس بوون، ڕۆژێک لە چیای کۆسـرەت، لەگـەڵ چەنـد برادەرێکی تـر، وەک وەفاداری بۆ من، بردمیـان گوتیان: نیوەڕۆ گیسـکمان بۆ سەر دەبڕن، لەوێ نان دەخۆین.

دیاربوو لەسەروی ئێمە ئەو شوێنەی لێی دانیشتین، چەند کەسێک بەرپرسێکیان پرۆڤە پێ دەکرد، لەسـەر فێربوونی بەسـتنی بۆینباخ، منیش نەمزانی چی لەو بەرپرسـە دەکەن، ملیان گرتبوو. ئەویش قەپۆزی بەرەو ئاسمان بەرزکردبوەوە، لەوکاتـە ئەسـپەکەی باوکمم وەبیرهاتـەوە، زۆرجار باوکم دەیگـوت: وەرن ئەو ئەسـپەم بۆ بگرن، کەسمەی دەبڕم (کەسمە مێخەکێکی سپیە لە لوتی دێت) ئەو

ئەسـپە یان ئێسـترە سـەرمای دەبێ، تا بۆی نەبڕن چاک نابێتەوەو ئالیک باش ناخوات.
دیاربوو ئەو بەرپرسـە بەهیچ شـێوەیەک فێر نەدەبوو بۆینباخ ببەسـتێ، منیش گوتم: بۆ پێیان نالێن با (گرێ بەرانی) لێ بدەن، گرێ بەرانی شوان بۆ دەست بێـن لـە بەرانی دەدا، لەدەسـتی خۆی دێخێت کە مەڕ ڕەویـەوە بەئاگای بێنێ، باشـە خـۆ ئەگەر بۆینبـاخ نەبێ لە کەسـایەتی کەم ناکاتـەوە، گوتیان: حیزب دەینێرێ سەفەری دەرەوەی هەیە، پێی وابوو ئاسایشی نەتەوەییمان بێ بۆینباخ ناپارێزرێ.
ڕۆژێـک چووم بۆ گوندی ماونان لە دۆڵی باڵەییان، چەند برادەرێکم لەوێ بوون، وەک مەحەمـەد مەلا نەبی و ئەحمـەد ئاغاو چەند بەڕێزێکی تر، لەوێ زانیم ئەو گوندە قوتابخانەیەکی لێیە (٣٦) سی وشەش کارگوزار(فەراش)ی بۆ دامەزراوە، نیوەی پارتی و نیوەی یەکێتی، دوو بەڕێوەبەر یەکێک پارتی و یەکێک یەکێتی، بـەس ئەوەی جێگای پێکەنینـە ژمارەی قوتابیەکان و خوێنـدکارەکان بەقەدەر فەڕاشەکان نەبوو!!
دوو مۆلیدەی کارەبایان بۆ دابینکردبوون، یەکێک زەردو یەکێک سـەوز.

## لە سلێمانیم یا کەربەلا؟!

چـووم بۆ سـلێمانی، لەو ئانوسـاتەدا خەڵک زۆر پەرێشـان بـوو، نانیان نەبوو بیخۆن، لەهیچ شـوێنێک نەتدەبینی کەسـێک دوو بلۆک لەسـەریەک دابنێ، زۆر کـەس نهۆمـی سـەرەوەی خانوەکەی خۆی خـراپ دەکرد، بۆ ئەوەی شـیش و دەرگاو پەنجەرەکەی بفرۆشـی. خەڵک لەگەرمەی شـەڕی براکوژی ناوماڵی خۆی فرۆشـتبوو، لـە سـەلاجەو فەرش و تەلەفزیـۆن و ....هتد . نۆرە هاتبوە سـەر خانوەکانیـان، بۆئەوی بۆ خەرجی ڕۆژانە بیفرۆشـن. مـن دەمانچەیەکی چواردە خـۆرم هەبـوو کە لـە کەرکوک گرتبـووم، پێیان گوتم: ئەگەر دەیفرۆشـی (٦) پارچە زەوی لەهەولێر پێ دەکڕدرێ، واتە ١٢٠٠ مەتر زەوی. ئەوەی پارەی دەکرد چەک وفیشـەک بوو. مەبەسـتم ئەوەیە کەس زەوی نەدەویسـت بیکاتە خانوو.

لەشــەقامی ســەرەکی ناو ســلێمانی لە پاســێکدا بەرەو ســەهۆڵەکە دەڕۆیشتم، لەدەستی ڕاست خەریکی باڵەخانەیەکی زۆر گەورەبوون دروستیان دەکرد. زۆرم پێ ســەیر بوو، پرســیم: ئەو باڵەخانە چییە و کێ دروســتی دەکات، دروســت کردنی ئەو باڵەخانەیە ســەدان دەفتەر دۆلاری تێدەچێت؟!!

گوتیــان: ئەوە (حوســێنییەی حەکیمــە) منیش دووبارە پرســیم، گوتم: چی؟ بەگومان بووم، گوێم بەهەڵە ناوی حوســێنییەی حەکیمی بیستبێ. (حوسێنییەی حەکیــم واتــە: مزگەوتی شــیعەکان) بۆیــان دووبارە کردمەوە، منیش بەراســتی ســەیری هەر چــوار دەوری خۆم کــرد، گوتم: دەبێ بەهەڵە ســواری ئۆتۆمبێلی نەجەف و کەربەلا بوبم، یان ئێرە ســلێمانییە!!

ئاخــر بــە ژیانم نەم بیســتوە کە تاکە یەک شــیعە لە ســلێمانی هەبــێ. گوتم: باشــەچۆن دەســەڵاتدارانی کوردســتان، ڕێگا دەدەن لە کەربەلاوە شیعەکان بێن و باشــترین شــوێنی ســلێمانی داگیربکەن، حوسێنییەی لەســەر دروست بکەن؟

گوتیان: خۆ ئەوان دروستی ناکەن، مام جەلال دروستی دەکات، لەسەر بودجەی یەکێتی نیشــتمانی سۆشــیال دیموکرات، بۆ یەک بارەکەڵای ئاخوندەکانی ئێران.

لەکاتێکدا گوندی کڵێســەی ڕۆژهەڵاتی کۆیــە حەفتاو دوو ئەنفالیان هەیە، حاکم ســاڵح و چەنــد خێرخوازێکــی تــر هۆڵێکی بچوکیان لەســەر ئەرکــی خۆیان بۆ ئەنفالکراوەکانی گوندەکە دروست کردوە.

ڕۆژێــک زیارەتــم کرد، وێنەی ئەو ژن و پیاو و منداڵانەی تێدا هەڵواســراوە کە لەپرۆسەی ئەنفال بۆ هەتاهەتایە نەگەڕانەوە، وێنەی ئامۆزایەکم بەدوو منداڵەوە لەنــاو ئــەو وێنانە بــوو، لەجیاتی یارمەتی ئــەو مۆنۆمێنتە بدەن، حوســێنییەی حەکیم دروست دەکەن!!

لەکاتێکدا ژن و منداڵی شــەهیدەکانی یەکێتی لە کورەخانەکانی ئێران، بۆ پاروە نانێک لەلایەن ئەربابەکان دەچەوســێنرانەوە. لەکاتێکدا لە بنەســڵاوەی هەولێر، کــە بەقــەڵای ســەوزی یەکێتی ناســراوە، زۆر ماڵمان پێ شــک دەهــات، بلۆکی دیواری حەوشــی خۆیان دەفرۆشت بۆ کڕینی چەند کیلۆ ئاردێک.

# قەڵەمفرۆش

لەجەنگـەی شـەڕی ناوخۆدا لە ئۆردوگای دێڵـزێ (م.ح)، کە هەتا مرد برادەری گیانـی بەگیانـی باوکـم ومن و هەردی بوو. هاتە ماڵی ئێمە، باسـی ئەو شـەڕە نەگریسـەی کە بەرۆکی گەلی کوردی گرتبوو. گوتی: سـەفەرێکی دهۆکمان کرد لەگـەڵ مەحەمـەد خـدر، بۆ لای (سـەردار ئامێـدی)، کە ئەویـش لەگەڵ ئێمە پێشـمەرگە بوو. گوتی: سەردار ئێستا باری ئابوری زۆر باشە، زانی ئێمە (واتە کاک (م.ح) و (مەحەمەد خدر) باری ئابوریمان زۆر خراپە (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار دیناری سویسـری داینێ، کاسـبی پێوە بکەین، هەتا خۆمان دەگرینەوە، دوایی ئەگـەر هەمانبوو بیدەینەوە. منیش گوتم: بەتەمان چی پێوەبکەن؟ گوتی: کڕین و فرۆشـتنی مەشـروب لەعێراق بۆ ئێران. منیش وەک لە ئاسـمان بەرمبدەنەوە خوارەوە، لەکۆمەڵگای ئێمە ئێستاشـی لەگەڵدا بێ کڕین و فرۆشـتنی مەشـروب زۆر کـەس خـۆی لێ بەدوور دەگرێ، بۆیە پرسـیارم کرد: ئەتۆ بەراسـتتە کاک (م.ح)؟! گوتـی: بەڵـی. لەوکاتەدا لەپێـش پارکی کودەک پیاسـەمان دەکرد، گوتـم: کاک (م.ح) کەسـایەتی تۆو بنەماڵەکەت زۆر لـەوەی گەورەترە ئەوکارە بکـەی!! (ئاخـر کاک (م.ح) دۆسـت و دوژمن حسـابی لەسـەر دەکـرد). کاک (م.ح) گوتـی: حـازم، یان دەبێ دزی بکەم، یـان دەبێ لەگەڵ پارتی و یەکێتی چـەک هەڵگـرم و براکوژی بکـەم، یان منداڵەکانمان لەبرسـان بمـرن، یان ئەو کڕین و فرۆشـتنە بکەم. من بەناچاری ئەو ڕێگایەم هەڵبژارد، کە مەحەمەد خدر زۆر پێداگیری لەسـەر دەکرد، ئینجا من خۆ ناچم لەگەڵ باری مەشـروب برۆم، تەنها شـەریکم. مەحەمەد خدر هەموی بە ئەسـتۆی خۆی گرتوە. بەیانی لەگەڵ بـارەکان دێتە (ترکێـش و کەوپەڕ). بڕیارە لەماڵی ئێـوە یەکتر بگرینەوە، بەڵام هەتـا ئـەو دێ، دەبـێ ئەحمەدە سـور کڕیارمان بۆ بدۆزێتـەوە. منیش کە کاک (م.ح) بەقەد باوکم خۆش دەویسـت، چوینەلای ئەحمەدە سـور، گوتم: ئەحمەد هەرچی دەتوانی دەبێ بۆ کاک (م.ح) بکەیت. گوتی: بەسەرچاو، با بارەکانیان بـگات خەمتـان نەبێت. لەگەڵ کاک (م.ح) چوینەوە ماڵـی ئێمە، تا چاوەڕوانی

مەحەمەد خدر بکەین.
من لە فکران ڕاچووبووم، کاتێک کاک (م.ح) گوتی: حازم، بیر لەچی دەکەیتەوە؟ گوتم: برای گەورەم، ئەو مەشروب کڕین و فرۆشتنە لەهەردوو ڕێگایەکەی تر پیاوانەو مرۆڤ دۆستانەترە، خۆ هەر نەبێ ویژدانت ئاسودەیە، تەمەنا دەکەم سەرکەوتووبیت. پێش نانخواردنی ئێوارە، مەحەمەد خدر پەیدا بوو، زۆر پەشۆکاو و تێک شکاو، قەتم مەحەمەد خدر ئاوا نەبینیبوو. کاک (م.ح) گوتی: مەحەمەد چی بوە؟ بۆ قسە ناکەی؟ گوتی: بارەکانمان هەموی گیرا، لەپاسگای کەوپەڕ. من لە نیوەڕۆوە گیراوم، مەحمود ناوێک بەریدام، برادەری هاوڕێ حازمیە. کاتێک بارەکان گیران، منیان بردە پاسگای کەوپەڕ، بەڵام من پەرۆشی بارەکانم نەبوو، ئەوەندەی کە سەرۆک پاسگا سوکایەتی پێکردم. دوو سێ زلەی زۆر خراپی لەبناگوێی دام.
ئاخر (ئاخوندی) پیاوێکی کەتەی کەڵەگەت، چاوێکی کوێرببوو لە شەڕی (عێراق ـ ئێران)، مەحەمەد خدر پیاوێکی چکۆڵەی بەژن کورت. گوتی: لای ئێوارە پیاوێکی کەوپەڕێ بەناوی مەحمود خدر نەبێ کە کاتی خۆی ئامر هێزی حیزبی دیموکرات بوو، دەوڵەت قسەیان بەهەند وەردەگرت، لە پاسگا پەیدا بوو، گوتی: ئەوە کێیە گرتوتانە؟ ئاخوندی دەڵێ: عێراقیە، مەشروبێکی زۆری لێگیراوە. ئەویش بە مەحەمەد خدری گوتبوو: کێی و لەکوێ هاتوی و لەعێراقیان کێ دەناسی؟ مەحەمەد خدریش گوتبوی: دەچمە ماڵی حازم عێراقی. کاک مەحمود گوتبوی: کاکە حازم زۆر برادەرمە، سبەی شەو لای کاک حازم بانگێشت کراوین بۆ نان خواردن، لەدێڵزێ کۆ دەبینەوە. کاک مەحمود خدر نەبی بە ئاخوندی دەڵێ: دەبێ ئەو پیاوە بەر بدەی. هەرچەندی ئاخوندی دەڵێ: ئاخر پەروەندەی بۆ کراوەتەوە. ئەویش دەڵێ: بنوسە ئەو بارانە لەناو گیاوگۆڵی گزرە حەشاردرابوون، بێ ئەوەی خاوەنی دیار بێ گرتومانە و ئەوەش بارەکان، بەڵام با ئەو پیاوە توشی زیندانی ئێران نەبێ، کە میوانی برادەرێکی منە بەناوی حازم، بەو حاڵە بەریاندام و کاک مەحمود سڵاوی هەبوو بۆت.
پاش ئەو سەفەرە کاک (م.ح) بەناچاری لەماڵەوە دانیشت، بەداخەوە نەخۆشی شێرپەنجە مەودای ئەو کەڵەپیاوەی نەدا تا گیانی برد، بەردەوام دەچوومە خزمەتی، بەداخەوەم بۆی. بەڵام مەحەمەد خدر لەگەڵ جوتیاران کاری دەکرد،

کەوتبــوە ژێــر کاریگەری پارتی، بۆ ڕەزامەندی پارتی دەســتی بە نوســین کرد.
ڕۆژێک لەهەولێر ســەرم لە بارەگای جوتیاراندا.
لەســەر شەقامی سی مەتری بوو، لە ســەرەوەی چاپخانەی بایز، کاک مەحەمەد گوتی: دانیشــە تۆزێک کارم هەیە. منیش هەندێ ڕۆژنامەی پارتی و جوتیارانی لــێ بــوو، خەریکی خوێندنەوەیــان بووم. کەوتمــە ســەرخوێندنەوەی بابەتێک، کاک مەحەمــەد خدر نوســیبوی، دەڵــێ: پەکەکەو (ئۆجــەلان) خەریکی مەوادی هۆشــبەرن، قاچاخچین، تریاک فرۆشــن!! وەک لەبیری چوو بێ خۆی لەسەرچی گیرابوو (ئاخوندی) لەســەرچی ئەو شــەقەزللانەی لێدابوو. بەراســتی بۆ من زۆر ســەیر بوو، ئەو سەدو هەشتا پلە سوڕانەوەیە!!
بۆیە زانیم دەیەوێ توانای نوســین و تۆمەت بەخشینەوەی خۆی نیشانی پارتی بدات و مێژوی خەباتی لەبەر تەرازوی فرۆشــتن بنێ، وەک قەڵەم چاوشۆڕەکانی پێش خۆی. ئامادەکاری دەکات بۆ جێگاخۆشکردنی لەناو پارتی و ڕازی کردنیان، دوایش هەر وا دەرچوو. ئێســتا لە ڕاگەیاندنەکانی پارتی بەرپرســیارێتی هەیە، دەڵێی زگماک پارتی بوە. من قســەم لەســەر کڕین و فرۆشتنی مەشروب نەبوو، بژێــوی مــاڵ و منداڵیان پێ دابین بکەن، قســەو گلەییم لەســەر ئەو تۆمەتە بێ بنەمــا و بێ ویژدانییەیە کە بۆ ڕەزامەندی لایەنێک بیخەیتە پاڵ ســەرکردەیەکی کورد.
کاک مەحەمــەد خدر لــە کتێبەکەی خۆی بەناوی (پشــوی چیا) لاپەڕە (٢٥٤) دوو ســەد و پەنجــاو چــوار، باســی ئەو گرتنــەی کردوە، لە کەوپەڕ بەدەســتی ئاخوندی. بڕوانە لاپەرە (٢٥٨) (دیسان قەندیل) ئەوەی دەمکولێنێتەوە مێژوی خەباتــی پێــش بە پارتی بوونی ئەو مرۆڤەیە کە هێندە ســەنگینە بە گرگنەکانی دەورویشــتی هەڵناگیرێ، لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبەکەی چەندین جار فرمێســکم هەڵوەری، بۆ دەبێ بۆ ڕەزامەندی پارتی، تۆمەتی ناڕەوا ببەخشیەوە !! خۆزگە بە چاوێکی بێ لایەنانە ســەیرێکی خۆی بکردبایە.

# ئێوە خیانەت کارن

لەشـاری پیرانشـەهر دوای نیوەڕۆیـەک، لەگـەڵ کاک مەجید ساڵح، دەچوینە بەری مێرگان بۆ گوندی بێکۆس. سـواری پاس (مینەبۆس) بوین. لەپیرانشـەهر بەرێکـەوت، دوو ڕانکوچۆغـەی کر (بوز)مـان لەبەر بوو، پۆشـتەو پەرداخ بوین. کاک مەجید لەلای ڕاسـتی کورسـیەکە دانیشتبوو، کابرایەکی ڕۆژهەڵاتی خەڵکی گوندی جەڕان بوو (جەڕان لەنزیک پیرانشـەهرە)، گوتی: ئێوەش ئێراقین؟ کاک مەجیـد گوتی: بەڵـی. کابرا: گوتی: دوو عێراقیش هاتون بـۆ گوندەکەی ئێمە، بوون بە کەڵەوان (گاوان)، هەردووکیان پۆلیسـی پەرلەمانن، لەبرسـان سەری خۆیان هەڵگرتوە. (لەکاتی شەڕی ناوخۆ) کاک مەجید گوتی: هەرچەندە گاوانی و کەڵەوانی کارێکی شەڕەفمەندانەیە، بەڵام ئێمە بۆ کەڵەوانی ناچین، بەڵکو لە بێکۆس کارمان هەیە. جاران لەناو کوردانی هەر سێ پارچەکەی تر کە دەتگوت: کوردی باشـورم، هەموو گوێیان بۆ شـل دەکردی. پرسـیاریان دەکرد، لە ڕوی سیاسـی و بارودۆخی ناوچەکە، چونکە ئێمە لەروی سیاسـی و بەرهەڵستکردنی داگیرکـەران زۆر لـە پێش پارچەکانی تر بوین. بەڵام کە دەسـەڵاتی کوردیان لە باشـور بینـی، کە لەهیچ ناپاکیەک سـڵ ناکاتەوە، تەنها بۆ ئـەوەی ملی یەکتر بشکێنن، لەوکاتەدا کە دەتگوت: کوردی باشورم، پێش هەموو شتێک بێ ئەوەی بزانن تۆ لەو نیشـتمانە ئالیکی چەند کەرت بەدەسـتە، ڕەخنە بارانیان دەکردی، دەیانگوت: شـەرم ناکەن دەبنە نۆکەری داگیرکەران؟

چـۆن وەڵامـی ئـەو هەموو شـەهیدە دەدەنـەوە؟ ناپاکیتان هەموو سـنورێکی بەزاند، هەر ڕۆژەی دەسـتی وڵاتێکی داگیرکەری کوردسـتان ڕادەکێشـنە سـەر خاکی باب و باپیرتان!! گومان دەکەین ئێوە کورد بن، گوناهە گۆڕتان هەبێ لە کوردستان، زۆر شتی تریش.. . لەوەڵامدا دەمانگوت: ئێمەش وەک ئێوە ناڕازین لـەو بارودۆخـە، ئەگەر نا چۆن ئێمە بەو کولە مەرگیە و سـەختی باری ژیانەوە لە ئێران دەژین!! ئەگەر فەرمانڕەوایەتی ئەو دەسـەڵاتەی باشورمان بەدڵ بوایە، هەڵبەتە دەچوینەوە وڵاتی خۆمان.

# چەمانەوە

کۆتایـی سـاڵی ١٩٩٩، لـە ڕۆژهەڵات زسـتانێکی تووش و سـارد بـوو. یەک لە خزمەکانمان بەناوی (ب) هاتە ماڵی ئێمە، گوتی: سـێرکێکی ڕوسـی دەبەم بۆ هەولێـر، کە سـتافەکەی ڕوسـی و فارسـی دەزانن، زمانی کـوردی نازانن، بۆیە داوای لە ئێمە کرد ڕێگا بدەین، ئاراسی کوڕم لەگەڵی بچێ وەک وەرگێڕی فارسی و کوردی یارمەتیان بدات، بۆ ماوەی دوو مانگ ئەو سـێرکە لەیاریگای فەرەنسـۆ هەریری هەولێر جێگیرکرا. ئەوکاتە دیکتاتۆر سەدام لە حوکم بوو، ئاراس گوتی: ڕۆژێـک هەڵبـژاردەی تۆپی پێی بەغـدا هاتبوون بۆ هەولێر یـاری بکەن، لەگەڵ یانەی هەولێر.

یانـەی بەغـدا کە چاویان بە وێنەی خوالێخۆشـبوو مەلا مسـتەفا کەوت، لەناو یاریـگا مانیـان گرت، گوتیـان: ئەگەر ئەو وێنەیـە لێرە نەگوێزنـەوە دەرەوەی یاریگا، یاریتان لەگەڵ ناکەین. بەرپرسانی یاریگا کاتیان نابێ وێنەکە بگوێزنەوە، بـە ناچاری بـۆ ڕەزامەندی عەرەبە شـۆڤێنییەکان، وێنەکە ئـاوەژوو دەکەنەوە، بەدەمی دا دەخەنە سەر زەوی، دەیچەمێننەوە. ئاراس گوتی: ئەو هەموو خەڵکە بـە پێـڵاوی بـە قوڕ ئەو وێنەیان کردە پێخوسـت. گوتی: بابـە، ئەو خۆ بەکەم زانینـەم زۆر لا ناخـۆش بـوو. منیش گوتم: کوڕم، ئەوانە زیاتر لە نیو سـەدەیە دەچەمێنـەوە بۆ داگیرکەران، نوشـتانەوەی ئەو وێنەیـە ئازاریان نادات؟!! وەک ئێمەی ئازار داوە.

# کارم بۆ هیچ حیزبێك نەکرد

زسـتانی سـاڵی (٢٠٠١)، هێشـتا ماڵم لە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان بوو. بەنیازی ئەوەی منداڵەکانم بڕوانامەی دبلۆم وەربگرن، وە نێوان پارتی و یەکێتی ئارامبێ و ئاشـتی جێگیـر بێ، ئینجـا بگەڕێینـەوە. هەواڵیان پێدام، عوسـمانی حاجی مەحمـود دەیەوێ بمبینێ، ئەوکاتە بەرپرسـی مەڵبەندی هەشـتی ڕاپەڕین بوو،

منیش هاتمەوە باشـور، لە مەلا ئاریم پرسـی، گوتی: کاک ئاریێز عەبدوڵڵا باسی تـۆی لەلای کاک عوسـمان کـردوە، بۆیە بـەدوای دا ناردوی. منیـش چووم بۆ مەڵبەند، لای سـەدیقی کۆمپیوتەر دانیشـتبووم، کاک ئاریێز هات. کاک عوسمان لە نهۆمی سـەرەوە بوو، چوینە لای، بە ئاریێزی گوت: ئەوە کاک حازمە. گوتی: بەڵی. کاک ئاریێز بە تەنیا ئێمەی بەجێ هێشـت.

کاک عوسـمان بەو کەسـەی پێش دەرگای گوت: مەیەڵە کەس بێتە ژوورەوە. کاک عوسـمان کەوتـە باسـی مێژوی خەباتی مـن وبنەماڵەکەمـان، وەک نان و پیـازی لەگـەڵ ئێمـە خواردبێ. دیـارە کاک ئاریێز بـە ویژدانەوە باسـی ئێمەی کردبوو، کاک عوسـمانیش لە بارەی پێشـمەرگایەتی من شتێکی دەزانی. گوتی: کاک حـازم، خەڵکـی وەکو تۆ چۆن دەبێ وا دوورە پەرێزو پەراوێز بێت؟!! بۆیە دەمانەوێ، تۆ پردی پەیوەندی ئێمەو ڕێکخسـتنەکانی یەکێتی بی لە ڕۆژهەلاتی کوردسـتان. تـۆ تەنها لەگەڵ چەندکەسـێک، لەهەر ئۆردوگایێـک لە ڕۆژهەلاتی کوردسـتان کۆدەبیەوە، ئەوان شـۆڕ دەبنەوە بۆخوارێ، (واتە: وەک بەرپرسـی ڕێکخسـتنی ڕۆژهەلاتی کوردسـتان) ژیانم مسـۆگەر دەکەن. منیش گوتم: کاک عوسـمان، من چەندین سـاڵە لە ڕۆژهەلاتم، ڕۆژێک پۆلیسێک پاڵی پێوە نەناوم، ئێسـتاش نامـەوێ لەسـەر هیچ حیزبێک پاڵـم پێوە بنرێ، نامـەوێ لەگەڵ هیچ حیزبێک کار بکەم، بەڕێزەوە بەرێیکردم.

من لەساڵی ( ١٩٧٧ )ەوە، لەکاتی بەرەی نیشتمانی هەتاوەکو ئێستا کۆبوونەوەی ڕێکخسـتنی حیزبیم لەگەڵ هیچ حیزبێک نەکردوە، بە حیزبی شیوعیشـەوە. ئەو ساڵانەی پێشمەرگەی ئەو حیزبەش بووم، لەهیچ ئۆرگانێکی حیزبی ڕێک نەخرام، وە نەبێ خۆم ڕەتمکردبێتەوە، لە شـاخ کەسـم لەخۆم بە شـیوعی تر نەدەزانی، بەڵام نەک وەک ڕێکخسـتنی حیزبی. پێم وایە ئێستاش حیزب ناپرژێتە سەر ئەو کارە، ئەوە (٤٢) چل و دوو سـاڵە من حیزبی نیم.

لەکۆتایی نەوەدەکان، لە جەنگەی شـەڕی ناوخۆی باشـوری کوردستان، ئێمەی پەناهەنـدەی دیـوی ڕۆژهەلاتی کوردسـتان، بەهیچ شـێوەیەک ئامـادە نەبوین بگەڕێینـەوە بـۆ باشـور. بۆیە بەهیـچ جۆرێک پێمـان خوار دانەدەنـا، نەوەکو بمانگێڕنەوە سەر زێدی باب و باپیرمان. چووم بۆ هەولێر، لەو شوێنەی (بازاڕی نیشـتمان)ی لێ دروسـت کراوە، هەرچەنـدە تەنها ڕەهەندی نیشـتمانی نییە !!

نازانم لەســەر کام سیاســی بازرگان تاپۆکراوە، ئەوکات پێی دەوترا ( ســاحەی ڕیمەکان)، پاســی گەورە گەورەی لێ دەوەســتا. چەند گەنجێکی شەڕواڵ کورتم بینی، ســمێڵ و لچیان ئەتک کردبوو، ڕیش درێژو بیر کورت، بەدوای ســێ کچی جل مۆدەو ســەرکۆت کەوتبوون، تەماتە بارانیان کردن. کچەکان خۆیان خســتە ناو پاســێک، هەر وازیان لێ نەدەهێنان تەماتەیان لە پەنجەرەی پاســەکەوە بۆ دەهاویشــتن. ئــای چەندم پــێ زوڵمێکی گەورەبوو، لەو کچانــە کرا، ئەو کلتورە چەند نامۆیە بە کوردستان!! پۆلیسێک نەبوو بیان پارێزێ، ئەو بێ دەنگیە بوو، بوە هۆی گەشــەی فکری توندڕەوی لە کوردستان.

# باپیرم تێر سەیری کرد

لەڕۆژهەڵاتــی کوردســتان، مەلایــەکان زۆر ئەهلی نوکتەو قســە خۆشــەکانی ناو کۆمەڵــگای کوردەواریــن، بەتایبەتــی لەو کۆڕانەی کەوا خــۆ بەخۆن. منیان لەو کۆبوونەوانــە هەڵنەدەبــوارد. لەسەرانســەری ئێــران ســەتەلایت واتە (مهــوارە) قەدەغەیە، کوڕێک لەلای سەردەشــتێ، باپیری مەلایە، ئەو کوڕە ناوی مسعودە، باوکــی مهــوارە دەکــڕێ و لەســەربان دایدەبەســتن. مەســعود زۆری پێ خۆش دەبێ. باوک و دایکی مەسعود لەژوورێک دەخەون، تەلەفزیۆن لەدیوەخان دەبێ، مەســعودو مامۆستای باپیری لەدیوەخان دەخەون. مەســعود دەیگێڕایەوە: خوا خــوام بــوو باپیــرم بنوێ، مەندیلی لەســەری کردبــوەوە، دەرپێیەکی ســپی لە پێبــوو، وەک مــن لــە تەلەفزیۆنی ڕامابــوو، کاتژمێر بوو بە دوازدەی شــەو هەر نەخەوت، بوو بە یەکی شــەو هەر نەخەوت، بەناچاری کەناڵەکانم دەگۆڕی. ژنی واهەبوو ڕووت بوو، وردە وردە هەتا شەو زیاتر ڕادەشکا، دەمخستە سەر کەناڵی ژنانــی ڕووت تــر. بینیم باپیرەم هیچ نارەزایەتیەک نیشــان نــادا، لە من جوانتر ســەیر دەکا!! کردمــە کەناڵێکی سێکســی. باپیــرم جارجــار لەبەرمن دەیگوت: تف بە لەعنەت بن. ســەیری دەکردوو دەیگوت: غەرقی غەزەبی خوا بن. دوایی وای لێهــات بەحاڵ دەیگوت: تف لەو قوونە ڕەشــانەتان. لەگــەڵ باپیرم تێرمان تەماشــای فیلمی سێکســی کرد. خەوتیــن، بەیانی کە خەبەرم بــوەوە، باپیرەم

هەر دوو کۆنترۆڵەکەی لەدەست بوو، هەموو دوگمەکانی فشار دەدا، نەیدەزانی مهوارەکە بەکاربێنێ، لەسەرخۆ بانگی منی کرد، مەسعودە....مەسعودە، ڕۆڵە هەستە بە قورئانی لەسەر ڕانی چەپەم داناوە شەوی ئەو شەو دە عەزاب دا بویمە، بۆم بکە کەناڵەکانی شەوی ڕابردوو، با هەندێک تفیان لێ بکەم، بەڵکو خوا جەزام بداتەوە.

## ئۆباڵ بە ملمان نرخێکی چاکت بۆ داناوە

لە ئۆردوگای دێڵزێ، وەستا جەنگی ئامۆزام تەلەفزیۆنێکی زۆر باشی کڕی بوو، چووم تەماشای بکەم. جەنگی خەریکی گۆڕینی کەناڵەکان بوو، (ئەوکات سەتەلایت قەدەغەبوو لەئێران)، تەنها چەند کەناڵێکی ناوخۆیی ئێرانی هەبوو. جەنگی هەر کەناڵێکی دەگۆڕی بۆ کەناڵێکی تر، مەلا (ئاخوند)ی لەسەربوو، یەک کەناڵی نەدۆزیەوە، سەیری بکەین مەلای لەسەر نەبێ، بۆیە بە تووڕەییەوە گوتی: ئاوارە،کوڕم بڕۆ سەربان بزانە ئەو ئانتێلەی تەلەفزیۆن، ڕوی لە مزگەوت نییە؟!!

ڕۆژێک بڕیارمدا بچمە سەردانی هەندێک برادەر لەمەهاباد، کۆنە تودەی و پیاوی سیاسی و چەپ بوون، دەمێک بوو دەیانگوت: وەرە سەرێک بدە. ڕانکوچۆغەیەکی کرم لەبەر کرد، کراسێکی سپی، سواری مینەبۆسی نەغەدە بووم، لەلای پەنجەرە جێگا نەمابوو، لەلای ڕێڕەوەکە سواربووم. یەکێک هاتە ناو مینەبۆسەکە، جلێکی بەخۆڵ و تۆزی لەبەر بوو، گونییەیەکی بەدەستەوە بوو، دیاربوو شتێکی قورسی تێدایە. پێش ئەوەی دابنیشێ، ئەو ئاسنەواڵەی ناو گونییەکەی لەتەختی نێوچاوانی مندا. زۆر نە ئێشا بەڵام برژایەوە، کە دەستم بەنێوچاوانم داهێنا، دەستم پڕلە خوێن بوو، خوێن بەچاومدا هاتە خوارەوە، خەڵکەکە گوتیان: سەرت شکاوە، بیشۆوە. من بەچاوان بە کابرام دەگوت: دە هەڵسە بڵێ نەمزانی، بمبورە. خەڵکەکەش هەر سەیری ئەو کابرایەیان دەکرد، بە چاوان هەر وایان پێ دەگوت. بەڵام زۆر ناحاڵی بوو، منیش چوومە خوارەوە لە مینە بۆسەکە، شێرەیەکی ئاو لەوێ بوو لە گۆڕەپانی گەراجەکە، سەری خۆم

شوشـــتەوە. شـۆفێرەکە چەســپێکی بۆ لێدام، کابرای سەری شــکاندم لەشوێنی خۆی نەجولاّیەوە!!

هاتمەوە ناو مینەبۆســەکە، کۆنترۆڵی خۆم لەدەســتدا، هەردوو دەســتم خستە سەر شانی کابراو گوتم: کاکە ئەگەر نازانی بڵێی بمبەخشە، دەبڵێ گوم خوارد؟ ئەویش گوتی: خۆ من بە عەندەنم لێ نەداوی، وێت کەوت، (عەندەن لە عەمدەنی عەرەبی وەرگیراوە، بەلاّم لە ڕۆژهەلاّت وایان ســەرو گوێلاکی ئەو وشــە عەرەبیە شکاندوە، عەرەبەکانیش نایناسنەوە). منیش گوتم: دەزانم، بە عەندەن ئەوەت نەکــرد، بۆیــە بەو نرخەی لێت دەگەڕێم، ئەگەر نا ورگــم دەدڕاندی. خەڵکی ناو مینەبۆســەکە بە پێکەنینەوە گوتیان: ئۆباڵ بە ملمان نرخێکی چاکت بۆ داناوە، بــۆ لــێ خۆش بوون. بە کابرایان گوت: تۆ بۆ هەڵناســتی داوای بەخشــینی لێ بکــەی؟ تکایــان کرد، گوتیــان: وازی لێ بێنە، هەر ئەوەندە دەزانێ. ئێســتاش برادەرەکانم لە ڕۆژهەلاّت دەڵێن: وەک حازم عێراقی گوتەنی (ئەگەر نازانی بڵێی بم بەخشە بڵێ گوم خوارد!!).

لەپیرانشــەهر و بەری مێرگان برادەری باشــم هەبوو، ڕۆژێک مام حاجی شەفیع، ڕیش سپی و پیاوی سوڵح و سەلاح بوو، بانگی کردم گوتی: وەرە دەچینە کانی ئەشــکەوت، ئــەو خزمانــەی کاک مەحمود خدر نەبی لەگــەڵ هەندێک خزمی تر، لەســەر ئاو و جۆگا بەشــەڕهاتون. چەند ســاڵ بوو، جار بەجار دووبارەو چەند بارەیــان دەکــردەوە. کاک مەلا مەحمــود و چەند کەیخودای تــر پەیدابوون، بۆ مــن شــانازیەکی گەورەبوو کە ئــەو ڕێزەیان بۆ من دادەنــا. هەردوولامان بەیەک گەیاندن، دەست و چاوی یەکتریان ماچ کرد، هیچیان لەنێوان نەما، بەراستی ئەو ڕۆژە بۆ من زۆر خۆش بوو، کە دوو بنەماڵەی کورد لەســەر دەســتی ئێمە ئاشت ببنەوە. دوای ماوەیەک، شــەڕی پارتی و یەکێتی بەخەســتی دەستی پێکردەوە، دوو ڕۆژ بوو هەواڵی زۆر ناخۆش لە باشورەوە بۆ ڕۆژهەلاّت دەهات. ئەو ڕۆژە من لە فلکەی سەردەشــت، پشتم بەدیواری باخچەی مندالاّن (پێیان دەگوت (پارکی کــودەک) دابوو)، جگەرەیەکم بەدەســتەوە بوو، هەر ئــەو ڕۆژەش ئەو خزمانەی کاک مەحمودی خدر نەبی لەکانی ئەشکەوت دووبارە لەگەڵ ئەوانی گرد ڕەحمەت بەشەڕ هاتبوونەوە، پیاوێکی پیر کوژرابوو. لەوکاتە عەزیزی حاجی قادری هات، گوتی: بۆ ئاوا بە پەرێشــانی دانیشــتوی حازم عێراقی؟ وەک پیشەی هەمیشەیی

خۆی کردی بە جەفەنگ، گوتی: دەڵێی جەنازەت لە پێشە، وا داماوی ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە؟!

منیش گوتم: لە بەینی دوو شتدا تێماوم، نازانم نە گۆڕی بابی ئەو خزمانەی کاک مەحموودی بگێم، نە گۆڕی بابی پارتی و یەکێتی، ئاخر ئەمەریکا، پارتی و یەکێتی پێک نەهێناوە؟ ئاخر حاجی شەفیع، ئەو خزمانەی کانی ئەشکەوتی پێک نەهێناوە؟ بۆ ئەو شەڕەیان هەڵگیرساندەوە؟!! لەوە بەدوا هەموویان هەر کەچاویان بە من دەکەوت، دەیانگوت: حازم عێراقی، کامیان بە پێش کامیان دەخەی؟ بەتایبەتی کاک مەحموود زۆری پێ خۆش بوو، من ئەو هەستەم هەیە. ئەوانەی شەڕەکەشیان کردبوو بۆم دەگێڕانەوە، دەیانگوت: هەق بە تۆیە کاک حازم.

# لەبازگە دزیان لێکردم

لەهەولێر خزمێکمان بەناوی حاجی تەها، بەخۆی و براو کوڕەکەی، دوکانیان لە بازاڕی سیروان (ئەسواق سیروان) هەبوو. جلوبەرگی بوکان و پۆشاکیان هەبوو، حاجی تەها گوتی: کاک حازم، بۆ لە ئێران هەندێک شتومەک لەگەڵ خۆت ناهێنی بۆ فرۆشتن؟ ئێمە لێت وەردەگرین. لیستێکی بۆ نوسیم و گەڕامەوە ئێران، شتەکانم کڕی. هێنامە حاجی ئۆمەران، لەوێ لۆریەک چیمەنتۆی بارکردبوو، داوام لێکرد ئەو شتانەی من کە چەند گونییەیەک بوو، کێشی زۆر سوک بوو، هێندە نەبوو تا ئۆتۆمبێلی بۆ بگرم، لەسەر چیمەنتۆکە بار بکەم و شتێکی کرێ بدەمی. بۆی فرێدامە سەر بارەکەی خۆی، گوتی: وەرە سواربە لەهەولێر هەرچەندی پێت باش بوو بمدەرێ. لە گەلی عەلی بەگ، لەسەر ڕێگای بێخاڵ، بنکەی بەناو گومرگ و چەکدارەکانی پارتی لێ بوون. لەچۆمان شتەکانم گومرگ کردبوو. کە گەیشتینە گەلی دنیا تاریک ببوو، لەلای چەکدارەکانی پارتی وەستاین، کاخەزی چیمەنتۆو شتوومەکەکانی من درا بە چەکدارەکان. کە زانیان جلی بوکان و گوڵ و پۆشاکی لەگەڵە، دوو چەکدار بەسەر بارەکە کەوتن، منیش ویستم بێمە خوارەوە لە ئۆتۆمبێل کەلوپەلەکانیان نیشان بدەم، بەڵام ئەو دووچەکدارەی سەربارەکان خۆیان لێ تورە کردم، گوتیان: سەرکەوە

برۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە، ئێمە سـەیری شـتەکان دەکەین. گوێم لە شـڵپەیەکی زۆر گەورە بوو بۆ لای قەراغی جادەکە، بە گومان بووم، لەسەر ئۆتۆمبێلەکە شتێک فڕێ درایە خوارەوە.

هـەر بـە تورەیی گوتیان: برۆن. کاخەزی گومرگـی حاجی ئۆمەرانیان داینەوە، (ئـەوکات گومـرگ لە چۆمان بـوو). هاتینە خەلیفان، ویسـتمان نانێک بخۆین. ڕامانگرت، من گورج سـەرکەوتم شـتەکانم بەسـەرکردەوە. بینیم گونییەیەک لە شتەکان دیار نییە، زانیم لە بنکەی گەلی فڕێدرا خوارەوە، بە شۆفێرەکەم گوت: دەگەڕێمـەوە لێیـان وەردەگرمەوە، چۆن مـن لەدوای ئەو هەمـوو ماندووبوونە، ڕازیم خۆم بەخۆم بژێینم، کەچی ئەوانە بەو شێوەیە ڕووتم بکەن؟!! شۆفێرەکە گوتـی: وەرە بـا تۆمەتێکیشـت بـۆ هەڵنەبەسـتن بتگرن. بەو شـێوەیە چوومە هەولێر، شـتەکانمان سـەیرکرد، بای شـەش سـەد دینار کەلوپەلیـان فڕێدابوە خـوارەوە، چەکدارەکان بەمجۆرە پارێزەری سـەروماڵی خەڵـک بوون، لەجیاتی قازانج زیانیشم پێ کەوت.

## گوتم: بزانن دەستکردنەوە چەند پیرۆزە؟

ماڵمان هێشـتا لە دیـوی ڕۆژهەڵات بوو، لە ئۆردوگای دێڵـزێ. لەبەدبەختی من ماڵـم بەرامبەر مزگـەوت بوو، ئەو کووچەی نێوان ماڵی ئێمەو مزگەوت، بیسـت مەترێـک دە بـوو. ئـەو پەناهەندانە کە لـەوێ دەژیان، خەڵکـی وەرتێ و دۆڵی باڵەیان و خەیلانی و قەڵادزەیی و سەنگەسـەری و پشـت ئاشـانی بوون. لەگەڵ هەمویـان پەیوەندیـم باش بوو. ئیسـلامیەکان، مامۆسـتا عەلی مەمک و شـێخ سـعیدی چۆمسـاک و مەلا عەوڵای وەرتێ و زۆر بەرێزی تر لەدێڵزێ، منیش هەر سـی ڕۆژی ڕەمەزان بـە ڕۆژو بووم، نوێژم دەکرد. ئێـواران لەگەڵ ئەو بەرێزانە بەربانگـم لـە مزگەوت دەشـکاند، ڕۆژێـک دوای بەربانگ لـە دەرگای ئێمەیاندا، گوتـم: کێیە؟ کاک نەسـروڵای بـرای مەلا عەوڵا بوو. فەرمـووم لێ کرد، گوتی: دانانیشـم، کاکم و (ئەو بەرێزانەی لەسـەرەوە ناوم هێنان )، دەڵێن: ئەوە کاک حـازم بۆ نایەتـە نوێژی تەراویح؟ منیش تورەبووم، گوتم: وەرە نەسـروڵا چیت پـێ دەڵێم برۆ ئاوایان بۆ بگێڕەوە.

گوتی: بەڵی. گوتم: سڵاویان لێ بکەو بڵێ: سی ڕۆژی مانگی ڕەمەزان دەگرم، نوێژ دەکەم، کاکە من دووساڵە موسوڵمان بوومە. ئەگەر ئەوانە منەتیان بەوەندە نەبێ، من ئـەوە نیم، بارم لەوەی زیاتر گران بکەن، ئەوەندەش واز لێ دەهێنم، نایکـەم. ئەویـش چووبوو وەک خۆی بۆ گێڕابوونەوە، زۆر پێکەنی بوون. نایلەی هاوسەرم گوتی: بۆچی ئاوا جوابت دانەوە؟ ئەوان هەموویان تۆیان خۆش دەوێ!! گوتم: ئافرەت، ناوێرم زیاتر بۆیان شـل بکـەم، تەراویح بکەم، دەڵێن: بۆ ناچی بۆ حەج؟ هەزارو یەک شـتم بۆ دەدۆزنەوە، ئەتۆ مەلایان وەک من ناناسـی. لەو قسـانەبووم، غەڵبەغەڵب لەبەر دەرگا پەیدابوو، گوتیان: کاک حازم، هاتوین بۆ میوە خواردن، کاکە ئەوەی دەیکەی وازی لێ مەهێنە، لە تەراویحان گەڕێ، بوو بە پێکەنین، گوتم: بزانن دەسـتکردنەوە چەند پیرۆزە؟!!

## ئەو کولتورە نامۆیەی جوانییەکان و میهرەبانیمان دەخاتە ژێر پرسیارەوە

لـە ئـۆردوگای دێڵزێ، سێسـەد ماڵ دەبویـن. ڕۆژێک حاجی مەحمـود، گوتی: کاک حـازم، ئـەو خانوەی بەرامبەری ماڵی ئێوە هـەر چۆڵە؟ گوتم: چۆڵە، مام عەلی بادینی هەندێک داری سـوتانی تێداناوە، بەڵام تۆ چکارێکت پێیە؟ گوتی: خزمێکمان لە کوردسـتانی عێراق هاتوە، کچێکی هەڵگرتوە، پێم چاکە بێتە ناو ئەو خانوە، تۆش چاوت لێیان دەبێ، کوڕێکی بێ دەنگەو ئارامە، پێم وایە لە نزیک تۆ تا ڕادەیەک پارێزراو دەبێت. ئەوەبوو هاتنە ناو خانوەکە، شەش سەر خێزان بوون، منداڵێکی شیرەخۆرەی بچووکیان پێبوو، دەیانگوت: لە بەندیخانە لەدایک بوە لەهەولێر. (ف) کوڕێکی بیسـت و سـێ سـاڵ دەبوو، کچێکـی هەڵگرتبوو. پێش هەڵگرتن، منداڵی لە سـکدا بوە. لە زیندان منداڵەکەی ببوو. کوڕەکە باڵا مام ناوەندو چوارشـانەی ڕەش ئەسـمەر و چاو و برۆ ڕەشـبوو. ڕۆژانە خەریکی کرێکاری و کەسابەت بوو، بۆ بژێوی ماڵەوەیان. ئەو کچەی هەڵیگرتبوو، کچێکی ڕەنگ و ڕوخسـار گەنمی زۆر جوان و نەرم و هێدی. ئێسـتاش، لەبەخێرهێنانی مـن، کـە یەک دووجار چوومە ماڵیان زیاتر گوێم لەدەنگی نە بوو.

دایکـی کوڕەکە، پـورە ( ل) تەمەنی نزیکەی پەنجا سـاڵێک دەبوو، تەزبێحێکی

سەد و یەک دەنکی لە ملی بوو، لەنێوانی هەر چەند دەنکێک پەڕۆکێکی سەوزی لێگـرێ دابوو، بـۆ ئەوەی ژمارەی زکری خوای لێ تێکـەڵ نەبێ، هەر پەڕۆکێک ئامـاژە بـوو بۆ جۆری زیکرەکـە. دوو کچی گەنج تەمەنیان لـە نێوان هەژدە بۆ بیسـت و پێنـج سـاڵ دەبوو، کچی پـورە (ل) بوون، کچی ماڵ بـوون. هەر زوو هەسـتمان پێکـرد، پـورە (ل) دەخوازێ، ئـەو منداڵەی لـە بەندیخانە لە دایک ببـوو، لـە بەین بچێت. لە ترسـی کەسـوکاری کچە هەڵگیراوەکـە (واتە دایکی منداڵەکـە) هاتبوونە دیوی ئێران، بۆ ئەوەی نەیکوژن. هەستیشـیان کردبوو کە بەدوایانەوەن.

ڕۆژێـک هەردی برام گوتـی: کاک حازم، کچێک لەهەولێر هەڵگیراوە، بە ئەسـڵ خەڵکـی کەرکوکە، کەسـوکارەکەی زانیویانـە، گوایە: لەنزیک ماڵـی ئێوەیە لە ئۆردوگای دێلزێ، هاتونەتە لای من چەند جارێک، زۆریان تکاکردوە دەڵێن: کاک حـازم برا گەورەی تۆیـە، ئەگەر یارمەتیمان بدات، ئـەو کچەی خۆمان بکوژین. بۆیە پێت دەڵێم: ئاگاداربە شـتێکی ئاوا لە ئارادا هەیە، ئەگەر داوایان لێکردی. بتوانـی نەهێڵـی ئەو کارە ئەنجام بـدەن و لەهەمان کات زیـان بەهیچ لایەکیان نەگات، منیش گوتم: خەمت نەبێ.

ماوەیـەک بەسـەر ئەو قسـەیەی هەردی بـرام تێپەڕبوو، ڕۆژێک لـە ماڵ هاتمە دەرەوە، بچم بۆ پیرانشەهر، ئۆتۆمبێلێکی پەیکان لەبەردەمم وەستا. سێ کەسی تێدابوو، خەڵکی باشـوربوون و کەرکوکی بوون. سـڵاویان کرد گوتیان: تۆ کاک حازمـی؟ گوتـم: جیاوازی نییە فەرموون. گوتیان: تۆ ئێمە ناناسـی، بەڵام ئێمە لەلای فڵان کەس و هەردی برات هاتوین، ئەوان دەماننناسن، بۆ ئەوەی باوەڕیان پـێ بکـەم. منیـش هەر خـوا خوام بـوو لەوکاتەدا ئـەو کچە نەیەتـە دەرەوە، نەوەکوو بیکوژن، بۆیە گوتم: کاک حازم لە پیرانشـەهرە، بە پەلە بسـوڕێوە با بچینـە لای کاک حـازم، هەتا بۆ لایەک نەڕۆیشـتوە. گەڕاندمنەوە بۆ ناو شـار، یەکێکیـان گوتـی: تۆش بەکاک هەردی دەچی، دیـارە برای کاک هەردی و کاک حازمی؟ گوتم: بەڵی.

چوینە پیرانشەهر، لە پارکی کودەک دانیشتین، گوتیان: ئەی کاک حازم؟ گوتم: مـن حازمم، ئێوە کێـن؟ یەکێکیان گوتی: کاک حازم، ئەتۆ دەردی ئێمە نازانی، لەوەتـای ئـەو کچەمان هەڵگیراوە، نەدەچینە ناو خەڵک نە تازیە، نە سـەردان،

ناو پیاوانمان تەرک کردوە. هەتا ئەو کچە نەکوژین، ئێمە خۆمان بەپیاو حساب ناکەیـن، ئێوەش دەبێ پارمەتیمان بدەن. یان هەر نەبێ چاوپۆشـیمان لێبکەن. دوو دەمانچەشیان پێبوو، قسەو داواکاری خۆیان هەموو کرد، منیش گوتم: ئێوە بۆ سـمێڵ هاتون با ڕیشـیش نەخەنە بانی، ئێستا بێ ئەوەی دەست ببزێون بەو دەمانچانــەوە بگیرێن بە بیسـت سـاڵ حوکم ڕزگارتان نابێ، پاشـان من قبوڵی ناکـەم لە پەنا ماڵی من ئەو شـتە ڕووبدات. تکایەکـی برایانەم لێتان هەیە، ئەو کارە نەکەن.

ئەگـەر وەسـتانەکەتان کاتیـش بێ، من سوپاسـتان دەکەم. لەبـەر چاوی من، ئەگـەر لێبوردەییتـان هەبـێ پیاوتر دەردەکـەون وەک پێشـینان دەڵێن: (ئەو لەزەتـەی لـە لێبـوردن هەیە لە تۆڵەدا نییـە)، بەهەرحاڵ توانیـم ڕازیان بکەم، ماچـم کـردن. چونکە من دەرکم بە ئـازارە کۆمەڵایەتیەکەی نـاو خەڵک دەکرد کـە دەیچێـژن، گوتم: ئەگەر پێویسـتان بە یارمەتی هەیە بۆ گەڕانەوەی باشـور ئامادەم یارمەتیتان بدەم. یەکێکیان هەستی بەوە کرد بوو کە بەپەلە گێڕامنەوە بـۆ شـار، ئەو کچـە زۆر لە ماڵی ئێمە نزیکە. گوتـی: تکامان وایە کەس نەزانێ ئێمە دەمانچەمان لایە.

بەکـوردی پێـی گوتم: هەواڵگریمـان لێنەکرێت و بمانگـرن. منیش گوتم: ئەگەر دەستکێشـی و ناپاکیم بۆ سـەر دراوسێکەم قەبوڵ نەکرد، دەبوایە بزانی من لەو پیاوانــە نیـم. مامی کچەکە گوتـی: ئێوە وەک من بنەماڵەی هــەردی و براکانی ناناسـن، لەخۆم زیاتر باوەڕم بەوانە هەیە. ڕۆژێک دواتر بانگی حاجی مەحمودم کرد، گوتم: حاجی واچاکە ئەو ماڵە خزمەت بۆ شوێنێک بەڕێ بکەی، بۆ ئەوان ئێرە بە باش نابینم. هەرچەندەی گوتی بۆ وا دەڵێی؟ چیت زانیوە تۆ لەخۆتەوە قسـە ناکەیـت؟!! من هــەر ئەوەندەم گوت: دەبـێ لێم حاڵی بی، بـا بەیەکەوە خەمێکیان بخۆین.

ئەو دراوسـێ نوێیەمان بێ خەبەر لەوەی کە پیلانی کوشـتنیان لە ئارادایە، بێ ئەوەی پێی بزانن، ئێستاش لەگەڵ بێ من ببوومە پاسەوانی ئەوان، بە خۆم و بە نایلەی هاوسەرم. ئەو ماڵە ئەوەندەی لەخەمی ئەوەدابوون ئەو منداڵە بچوکەیان لــە بەیـن بچێ و لەیەخەی خۆیان بکەنەوە، نیو هێندە ئاگاداری خۆیان نەبوون. ئەو منداڵانەی پێش مارەبڕین لەدایک دەبن، لەوڵاتانی پێشکەوتوو ئەورووپی، بەو

منداڵانە دەگوترێت: منداڵی (عەشـق)، ئێمە بەداخەوە لەکاتێکدا ئەو منداڵانەی پێش مارەبڕین لەدایک دەبن وەک تاوانبار سەیر دەکرێن، وەک هاتنیان بەدەست خۆیـان بێ!! ئـەو منداڵە لە کۆمەڵگای ئێمە پێـی دەگوترێ (بیژو). بۆیە نەنک و پورەکانــی منداڵــە ســاوایەکە، نەیان دەهێڵا دایکی شـیری بداتــێ بۆ ئەوەی بمـرێ، دەیانگوت: ئەو بەڵایە شــوومە، لەهــەر ماڵێک بێ، نوێژو ڕۆژویان بە بەر ناکــەوێ. خێروبەرەکــەت لەو ماڵــە و تەنانەت لەدەوروبەریشــی نامێنێ. کاتێک خەســوو خوشــکە مێردەکانی لە مــاڵ دەردەچون، دایکی منداڵەکــە بە دزیەوە شــیری دەدایە، نەیدەهێشــت بمــرێ. ماوەی دووبۆ ســێ مانگ دەبــوو، ڕۆژێک ئــەو منداڵــەم لە باوەشــی باوکی و دایکــی نەبینی، چونکە پێیــان وابوو مایەی شــەرمەزاریەو نەهامەتیــە، ئەو منداڵــە بەتەنها لەژوورێکدا فڕێــدرا بوو. نایلەی هاوســەرم دەیگــوت: زۆرجــار پورەکەی ئاوی ســاردی بەو منداڵــەدا کردوە، بۆ ئــەوەی لەســەرمان ڕەقبێتەوە، ســەرمای دێلــزێ بەناوبانگ بــوو، ئاخر لەدیوی ڕۆژهەڵات بە بناری قەندیلەوەیە، لەخوار گەلی ئاشــی.

شــەوێک لەناو مێشە دارەکانی (کۆزە ئەســپیندار)ی دێلزێ فڕێیان دابوو، بەڵام کاتێک ســەگەکان دەورەیان دابوو، لەدەنگی ســەگوەڕ پیاوێکی دێلزێ دۆزیەوەو بــۆی هێنانەوە. هەرچەندی هەوڵیان دەدا ئــەو منداڵە نە دەمرد. ڕۆژێک نایلەی هاوســەرم و قەدری دراوســێمان لەناو تەشــتە ئاوی ســارد دەریان هێنابوو، بە پورەکەیان گوتبوو: ئەو منداڵە گوناهی نییە، بۆ وای لێ دەکەن، چ خوا بەردارە ئــەو منداڵە جیاوازی چیە لەگەڵ منداڵی ئێمە؟!!

ئاراســی کــوڕم لەگــەڵ خەڵکی دێلزێ دەچوون بۆ نۆک ڕنینەوە، وەک حەســەن زیرەک دەڵێ (دەســکەنەی نۆکێ). لەرێگای نەغەدە- پیرانشــەهر، ماشێنەکەیان پەنچــەر دەبێــت، زۆربەیــان فەقێ و کوڕە مــەلا بوون، ئــەوەی ئەهلی مزگەوت نەبــوو ئاراســی کوڕم بوو. بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی، ئــاراس گوتی: باوکە چی تر لەگــەڵ ئەوانە ناچمــەوە کار. گوتم: بــۆ؟ گوتی: کە ماشــێنەکەمان پەنچەربوو لــەلای گونــدی خاڵدار، هــەر هەمویان ڕویــان لە من کرد، دەیانگــوت: حەتمەن نوێژنەکەرێکمــان لەگەڵــە، بۆیە ماشــێن پەنچەر دەبێ. گوتــم: ئاراس ئەدی تۆ چیــت پــێ گوتــن؟ گوتی: پێم گوتن، ڕاســت دەکەن، ئەدی ئــەوە نییە وڵاتانی ئەوروپی و نوێژ نەکەرەکانی دنیا، تەیارەو ماشێن و موشەکی سەرمانگ و .....

هتد، یان کار ناکات ؟!!
لــە ئــۆردوگای دێڵزێ ماڵی ئێمە و چەند ماڵێکــی تر، مەلاو فەقێ نەبوو. ئەگەر بانگت بکردبایە: مەلا، فەقێ، بیســت تا ســی کەس وەڵامی دەدایەوە. ناوی ئەو هەمــوو مــەلاو فەقێیــە دوو لاپەڕەی زیاتــر دەوێ، بۆیە ناویان نانوســم. ئەگەر مەلاو فەقێکانیان دادپەروەرانە دابەش بکردبایە من پێنج بۆ شــەش مەلاو چەند فەقێیەکم بەردەکەوت.
لەو ئۆردوگایە وەک لە پێشەوە باسم کرد، خەریک بوون منداڵێک کە بەخواستی خــۆی نەهێنرابــوە ئەو دنیایە پڕ کێشمەکێشــە، هێنابویان بێ ئــاگا لەو هاتنە، دەیانویست لەبرسان و لەسەرمان، بە هەر شێوەیەک بێ بیکوژن. یەک لەو مەلایانە ورتــەی لەدەمی نەهاتەدەر. کێشــەیان ئەوەنەبوو منداڵێــک بەناهەق دەکوژرێ، بەڵکوکێشــەیان ئەوەبوو ئاراسی کورم نوێژنەکەرە یان ئەهلی مزگەوتە!!
نەنک و پوری منداڵەکە واتە پورە (ل) و کچەکانی، هەر شتێک ڕوویبدایە لەئەستۆی ئەو منداڵەیان دەئاخنی. لەبیرمە ئەو ســاڵە بەفرێکی زۆر کەوت، ڕێگای دێڵزێ و پیرانشــەهر لەبەر بەفربارین گیرابوو. هەر پێمان دەکرا بەفری ســەربان وپێش دەرگا بماڵیــن، بــۆ ئــەوەی منداڵەکانمــان بگەنــە دەستشــۆری و تەوالێت. ئەو پورە (ل) نەنکی منداڵەکە دەستی بۆ لای ژووری منداڵەکە درێژ دەکرد، دەیگوت: ئەمــن دەزانم ئەو هەموو بەفــرە غەزەبی خودایە بەســەرماندا دەبارێنێ، ماڵێک بیژوی لێ بێت چاکە تەورداس ناباری. ئێمە هەشــت مریشــکمان هەبوو، ڕۆژێک دەرمانی قەلاچۆی مشــک و جرجیان دانابوو، مریشکەکان خواردبویان، هەمویان مردن. نەنکی ئەو منداڵە دەیگوت: من دەزانم کاری ئەو منداڵە شوومەیە. باوەڕ بکەن لەبارینی بەفرەوە هەتا دەگاتە ڕەشــەبا، هەموو پێشــهاتە سروشتیەکان و مانــگ گیرانیش، لەئەســتۆی ئــەو منداڵە دەئاخندرا، گوایــە: فەڕی باش نییە و بەرەکەت ڕوو لەو شوێنە ناکات.
نەنک و پوری ئەو منداڵە، نەهامەتی و شەڕو فیتنەی بەینی پارتی و یەکێتیشیان هــەر لــە قــەدەم و نێوچەوانــی ئــەو منداڵە دەزانــی، کەوا چەندین ســاڵ پێش لەدایکبوونــی ئەو منداڵە دەســتی پێکردبوو، پێش ئــەوەی باوکی ئەو منداڵە لە دایک بێ ئەو شەڕە هەبوو.
ڕۆژێــک گرێی بەختــی منداڵەکە کرایەوە، (ناوی نرا بوو(س) منداڵەکەیان دابوە

ژن و پیاوێکی ئۆردوگای (لاوێن). ئەوانیش خەڵکی گوندی (مەلەکان)ی باشوری کوردستان بوون. ئیدی ئەو منداڵە ڕۆژ بەڕۆژ گەورە دەبوو، بە تەندروستیەکی زۆر چاک، بەسکێکی تێر، بە شوێنێکی حەوانەوەی گەرم. ئەو ژن و پیاوە زۆر نازیان دەکێشا، وەک دایک و باوکێکی میهرەبان. سەنەدو کاخەزی سەد هەزار دیناری سویسریان پێکردن، لەکاتی پەشیمانی. لەقوتابخانە دەمانبیست کە زۆر زیرەک و وشیارە.

ئەو پیاوەی، منداڵەکەی هەڵگرتەوە و بردیە لای خۆی، ناوی (مەلامسلح) بوو. ژنەکەی ناوی (مریەم) بوو. مەلامسلح، لەمەلەکان بە بەرکیمیابارانی فڕۆکەکانی بەعس کەوتبوو، باری تەندروستی ناجێگیر بوو، دکتۆر پێی گوتبوو: بەهۆی کیمیابارانکردن، بۆهەتاهەتایە ناتوانی منداڵ بخەیتەوە. لەگەڵ خوشکە مریەم، ئەو منداڵەیان بۆ خۆیان بردە ئۆردوگای لاوێن. بەداخەوە مەلا مسلح باری تەندروستی زۆر خراپ و خراپتر دەبوو، میزی ڕانەدەگرت، کۆنترۆڵی لەدەستدابوو لەبەر کیمیازەدەیی. وەک هەموو ئاوارەکانی تری ئێران، ماڵی مەلا موسلحیش هاتنەوە باشور. بەداخەوە بەهۆی نەخۆشیەکەی مەلا مسلح شەهید بوو. دووبارە کاکە (س) بێ باوک مایەوە. پاش ماوەیەک خوشکە مریەم مێردی بەمامی برادەرێکی من کردەوە. بە مەرجێک، کاکە (س) لەگەڵ خۆی بەرێ و بێ نازی دایکانە نەبێ. لەکاتی نوسینی ئەو ڕووداوە، هەواڵی منداڵەکەم پرسی، گوتیان: ئێستا تەمەنی بیست و دوو ساڵە، پیاوێکی زۆر باش و میهرەبانی لێ دروست بوە، کارو کاسبی بۆ دایک و باوکە نوێیەکەی دەکات. خزمەکان و ناسیاوەکانی زۆر زۆر باسی چاکەی دەکەن، بەتایبەتی لەکاتی نەشتەرگەری چاوی ئەو پیاوەی کە ئێستا بۆتە باوکی. لە برادەرەکەی خۆم پرسی، گوتی: ئێستا (س) ئامۆزای منەو زۆری ئاگا لەمامم هەیە و زۆری لێ ڕازین.

لەوکاتەی کە کاک مستەفای برادەرم ئەوەی بۆ گێڕامەوە، فلمێکی کۆنم هاتەوە یاد، کە ئەو ژنەی منداڵەکەی بەخێوکردبوو، لەپێش دادوەر گوتی: ئێوە پێتان وایە بەتەنها ئەوەی منداڵی لە دامێنی دەبێ، دایکە؟ یان ئەوەی گەورەی دەکات؟!!

# پرۆسەی ئازادی عێراق

لە ٢٠٠٣/٣/٢٠ ، لەسنوری کوێت هێرش بۆ سەر هێزەکانی سەدام دەستپێکرد، چەند ڕۆژێک بەرگری کرا، لە ٢٠٠٣/٤/٩ بەغدا گیرا، پەیکەری دیکتاتۆر هێنرایە خوارەوە، وەرچەرخانێکی نوێبوو لە مێژوی عێراقیەکان. ئەو ڕۆژە لەماڵی وەستا سەعدوڵڵا لە پیرانشەهر، من و وەستا سەعدوڵڵاو حاجی مەحمود و کاک مەجید و برایم سەکری و چەند ئاوارەیەکی تری دیوی ئێران دانیشتبوین، بە شاهێدی ئەو برادەرانە کە پەیکەرەکەی سەدامی دیکتاتۆر هێنرایە خوارەوە، دوو ڕکات نوێژی شوکرانەم کرد، سوزدەی شوکرم برد.

دواجار ئەو هەڵە یەک لەدوای یەکانەی سەرکردایەتی کورد بۆ ناوچە دابڕێندراوەکان کردی، باوەر ناکەم قەرەبوو بکرێتەوە. ئەوەندەی سەرگەرمی سەرمایە و پۆست کۆکردنەوەبوون، لەبیری گێڕانەوەی ناوچە دابڕێندراوەکان نەبوون. کورد پێگەی ئەوەندە بەهێزبوو، دەیتوانی لەنوسینەوەی دەستور دەستکەوتی زۆر لەوە زیاتر بۆ خۆی مسۆگەر بکات. لەبیرمە کە مادەی ١٤٠ نوسرایەوە، ئێمە زۆرمان پێ سەیر بوو، ئەو کەسەی لەسەر خانوو موڵکی خۆی دەرکرابێ لە کەرکوک، دە ملیۆن دینار قەرەبوو بکرێتەوە، ئەوەی موڵکی کوردانی داگیرکردوە، بیست ملیۆن دینار بە دەستخۆشانە وەربگرێت!!

لەدوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراق و ڕوخانی سەدام و بەعس، گەورەترین هەل بۆ کورد ڕێکەوت کە کەرکوک بگێڕێتەوە باوەشی نیشتمان. بەڵام بەداخەوە، سەرانی کورد کە پێم وایە هەرگیز مێژوو ونەوەکانی داهاتوو لێیان خۆش نابن. ئەوەی بیریان لێنەدەکردەوە، گێڕانەوەی کەرکوک بوو. دەتوانم بڵێم: کەرکوک بوو بە قوربانی هەوێداری و خۆ ڕاپێشکردنی ئەو دوو لایەنە ( پارتی و یەکێتی) بۆ ئەمریکیەکان لەدژی یەکتر، پێشبرکێ بوو لەسەر سازشکردن و چەمانەوە لەهەمبەر ئەمریکیەکان وەک برێمەر لە کتێبەکەی باسیان دەکات.

کاتێک هێزو چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی لەکەرکوک بوون، بەماوەیەکی زۆر کەم، نمونەیەکی ناشیرینی حوکمڕانیان پێشکەشکرد، خەڵکی کەرکوک بەکوردو نەتەوەکانی تر ناڕازیی بوون، وە قەراج و مەخموری کوردستانیان خستە گرەوەوە. بەچەند بەرپرسێکم گوت: کاکە بە برا عەرەبەکان بڵێن: ئەوە دوو

سـەد سـاڵ زیاترە حەیـران هەیەو عەتابـەی عەرەبیش هەیـە، چەندین حەیران بێـژی کـوردان هەن و بوون، چەندیـن گۆرانی بێژی عـەرەب عەتابەیان گوتوە. دەچین، سـێ سـەد بەکرەی کۆنی گۆرانی حەیران و عەتابە دێنین، ئەگەر قەراج و کەندێنانـەوەو مەخمـور، لـە عەتابەی عەرەبی ناوی هێنـرا، ئەوە هی ئێوەیە، ئەگەر تەنها لە حەیرانی کوردی ناوی قەراج و کەندێناوەو مەخمور هەبوو، ئەوە موڵکی کوردانە.

گرتنـی سـەدام، لـە۲۰۰۳/۱۲/۱۳ لەناو ئەو کونە بچووکەی نێـو باخێکی نزیک شـاری تکریت، دروسـت خۆشـاردنەوەی خـۆم وە بیرهاتەوە، کـە چووبوین بۆ ناو شـاری هەولێر. بەداخەوە لەکاتی دادگاییکردنی زۆرشـت مابوو تا لەسـەری دادگایی بکرێت و دانی پێدابنێ. بەهۆی باڵادەستی برایانی شیعە و ئێران، تەنها لەسـەر کەیسی دوجەیل، کەوا تایبەت بوو بە شیعەکان، لەسێدارە درا (نامەوێ لەقەبـارەی ئـەو تاوانـە کەم بکەمـەوە، بـەڵام تاوانی زۆر لەکەیسـی دووجەیل گەورەتر هەبوو، بەتایبەت بەرامبەر گەلی کورد، تا لەسـەری لەسـێدارە بدرێ).

## حەبێکی هێورکەرەوە

ئەو سەردەمە، لەبەر خوێندنی منداڵەکانمان، هەر لە ئێران مابوینەوە. هەڵبژاردنی ئێران هێندەی نەمابوو، کاندیدەکان، ئەوەی لەیادم مابن: هاشـمی ڕەفسەنجانی، ناتقـی نوری، مەحەمەد خاتەمی...من هەرچەند سـەروکارم لەگەڵ کۆنە تودەی و کۆنگـرەی چـوارو کۆمەڵـەو دیموکـرات و چەپەکان هەبوو، بـەڵام قەتم گوێ لەناوی خاتەمی نەبیبوو. کەسێکی زۆر دیاری ناو کایەی سیاسی نەبوو. ڕەهبەری ئێـران، عەلـی خامنەئـی، پڕوپاگەندەی بۆ ناتقی نوری دەکـرد. داوای لەهەموو ئۆرگانەکەکانی دەوڵەت دەکرد: دەنگ بدەن بەناتقی نوری. لەبەرامبەردا خاتەمی بانگەشـەی ڕیفۆرمی بۆخەڵکی ئێران دەکرد، بۆ پشـتگیری لە چاکسازی دەنگی پـێ بـدەن. ئەوکاتە خەڵکـی ئێران زۆر تووڕە بـوون لە ویلایەتـی فەقیێ، بێ ئومێدبـوون. تونـدڕەو و موحافیزکارەکانـی ئێران، هەڵسـان بەهەندێک تیرۆری کەسـایەتی چـەپ و ڕووناکبیـرو مخالفەکانـی ویلایەتی فەقیێ، ئـەوەی لەیادم

بێ (فروهەرو خێزانەکەی) کوژران، زۆری تر کە ناوەکانم لەیاد نین. بەو پرۆسەیە دەگوترا: (قەتلهای زنجیرەیی) کوشتاری زنجیرەیی، زۆریشیان هەڵاتن بۆ دەرەوەی وڵات.

ئەو پرۆسەیە ناوی لێندرا (فەراری مەغزها)هەڵاتنی مێشکەکان، فەراری مەغزها تاوەکو ئێستاش بەردەوامی هەیە. لە ئێران ڕیفۆرم، ئیسلاح، چاکسازی، یەکەم جاربوو باسی لێوەبکرێ، خەڵک ئومێدی لەسەر هەڵچنی. ئەوەبوو لە دژی ڕەهبەرو دوو کاندیدەکەی تر، دەتوانم بڵێم: مەلاکانی ئێران یاریەکی زیرەکانەیان کرد. خاتەمی، بیست و دوو ملیۆن دەنگی بەدەست هێنا. ئەوە ڕەتکردنەوەی ڕژێمی ویلایەتی فەقیێ بوو لەلایەن خەڵکی ئێران، بێ ئەوەی خاتەمی سیاسیەکی دیاری کایەی سیاسی بێ، لە ئێران هەڵتۆقی. تەنها ماسکی ڕیفۆرم و دژایەتی ڕەهبەرو ویلایەتی فەقیێ ئەو دەنگانەی بۆ کۆکردەوە.
هەشت ساڵی سەرۆکایەتی جمهوری ئیسلامی لەلایەن خاتەمی، بووبە حەبێکی هێورکەرەوە (حب مسکن) بۆ گەلی ئێران و زیاتر بێ ئومێدکردنیان بەناوی چاکسازی و ڕیفۆرم.
کە هیوادارم لەباشوری کوردستانیش ئەوە ڕوو نەدات و مێژوو خۆی دووبارە نەکاتەوە، ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە دروست بێت. زۆرجار لە ئێران بە ئێمەیان دەگوت: حەز ناکەن بچنەوە بۆ باشوری کوردستان؟ زۆرجار ئەوەم بۆ دەگێڕانەوە: لە گوندی گەڕە شێخان بوین، کۆتایی شەستەکان، حکومەتی عێراق، دەشتی کۆیەی بۆردومان دەکرد. گوندی بانەمورد یەک لەو گوندانە بوو،ماڵێک کە خەڵکی بانە مورد بوون، هاتبوونە گوندی ئێمە. شێتێکی زۆر نەقۆڵایان پێ بوو، بە دوو زنجیر لەپشتەوەی پیکەبێکی جەمسی بەستبویانەوە. کە هێنایانە خوارەوە بردیانە ناو خانوێکی کۆنی چۆلی ئاغاکان. بە پێنج شەش پیاو زنجیریان کردبوو، لەناو خانوو بە دوو زنجیر لەپەنجەرەوە لەکاریتەی میچی خانوو بەسترابووەوە. ئێمە مێردمنداڵ بوین، لە پەنجەرە تەماشامان دەکرد، (گوندی بانەمورد لەگەڵ گوندەکەی ئێمە تەنها گوندی پۆریجەی لە نێوان بوو)، برنج و شلەیان لەسەر سینییەک بۆ شێتەکە هێنا، (لەو کاتەدا برنج مانگێ جارێک لێدەندرا). ئەو شێتە حەیرانی دەگوت، لەگەڵی دەگریا، دەیگوت: نان و کفری بانەموردێ بخۆی، لە پڵاو برنجی ئێرە خۆشترە. (کفر، ڕوەکێکی زۆر

تاڵە هیچ ئاژەڵێک نایخوا)
منیش بەو شـێوە وەڵامــی برادەرەکانی ئێرانــم دەدایەوە، دەمگــوت: تۆ بڵێی ئێمەش بەقەدەر ئەو شـێتەی بانەموردێ هەسـتمان نەبێ بۆ زێدی خۆمان؟!!

# کابرای عەجەم پەنیری شێخی فرۆشت

کەم کەس هەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردســتان، ناوی شـێخی گەزگەزکی نەبیستبێت، لەبەرئــەوەی تەکیــەو خانەقای لەورمێ هەبوو، زۆر کەســی لــێ دەمایەوەو نانی لــێ دەخــوارد. لەناوچــەی بەری مێــرگان و پیرانشــەهر، مرید و ســۆفی زۆری هەبوو. ڕۆژێک یەک لەو سۆفیانە، نازانم پلەی چی بوو، لەناو خەڵک دەگەڕا بۆ کۆکردنەوەی ئەو شــتانەی کە هەموو کەســێک ساڵانە بۆ تەکیەی شێخی دەبرد، بــۆ ورمــێ. تەنکە ڕیشـێک و کۆرپــە ســمێلەکەی ماکەر پاچ کردبــوو، ئەوەندە بەناشـیرینی سـمێڵی ئەتک کردبوو، تاحەزبکەی ناحەز بوو. چەند چڵە موێکی نیوە پچڕاوی بە لچیەوە مابوو، چاوی خێل وخوار، تەماشای تۆی بکردبایە، وات دەزانی تەماشــای ئەوەی تەنیشــتت دەکات، سـپیلک و گلێنەی وا تێکەڵ ببوو، وەک هێلکە و ڕۆنی ژنی نەشــارەزا و نا کابان.

ڕۆژێــک، منداڵێکــی بە بۆن کەوتوی برادەرێکمــان بردە لای، بۆ ئەوەی بۆنی لێ ببڕێ. گازی لە باســکی منداڵەکە گرت، بەڵام ددانی پێشــەوەی شــاش و واش بوو، دەتگوت: شــەنەیەکی شــکاوە. دوو گیرەی لەلای پشتەوە مابوو، هەتا تکە ئاوێکی چڵم لەســەری لوتی دەتکایەوە، یەکێکی تر حازر دەبوو.

پــاش بانگەوازەکــە، ســۆفیەکی بەری مێــرگان، پوتێک پەنیری بۆ ماڵی شـێخ بردبــوە ورمــێ، لە دوکانــی عەجەمێک لە نزیک ماڵی شـێخ بەجێی هێشــتبوو، لەگەڵ منداڵێکی شــەش ســاڵان. گوتبــوی: هەتا دێمــەوە. عەجەمەکە زانیبوی ئــەو پوتــە پەنیرە بۆ ماڵی شـێخە. کاتێک ئەو منداڵــەی بەڕوتی و بێ گۆرەوی دەبینــێ، هەڵدەلەرزێ لە ســەرمان. نایکاتە نامــەردی، پوتە پەنیر بە پارەیەکی زۆر چاک دەفرۆشــێ، بە پارەی پەنیرەکە منداڵەکە پۆشــتە دەکا و کۆت و جلو بەرگــو پێڵاوی بۆ دەکڕێ. کابرای ســۆفی دەگەڕێتــەوە، عەجەمەکە باقی پارەی

پوتە پەنیرەکە دەداتە سۆفی و دەڵێ: باقیەکەیم بۆ ئەو منداڵە خەرج کردوە، حەز دەکەی وەرە با حسابی بکەین. سۆفی هەرچەندەی بۆڵە بۆڵ دەکات بێ سود دەبێت. عەجەمەکە دەڵێ: چیت نەکردوە برۆ بیکە، خێر ئەوە نییە ئەو پوتە پەنیرە بۆ ماڵی شێخ بەری، خێر ئەوەیە منداڵەکانت ڕووت و برسی نەبن، چونکە چاویان لەدەستی تۆیەو تۆ باوکیانی.

# با هی مامۆستاشی تێدابێ

مەلا عوسمان و حاجی مەلا ڕەسوو، حاجی مەحەمەد شێرزاد و بەندە، لەماڵی مەلا سلێمانی شیناوێ بۆ نان خواردنی ئێوارە بانگهێشت کرابوین. من و حاجی مەحەمەد شێرزاد بەیەکەوە بوین، حاجی گوتی: با نوێژی شێوان لەسەر تاتەکانی پاشسازی شەهرداری بکەین، پاشان بچینە شیناوێ. لەسەر تاتەکان نوێژمان دا بەستا. مەلا سەید، (دووکانی وێنەگرتنیان هەبوو)، هەر لەو گوزەرەی پێش نوێژی کردین. ئێمە بەپەلەبوین زوو تەواو بێ، کەچی دوو ڕکاتمان کردبوو یەک ڕکات مابوو، بەپەلە سڵاوی دایەوە، گوتی: دەستنوێژم نەبوو، لەبیرم چووبوو، تکایە نوێژەکان دووبارە بکەنەوە. منیش گوتم: خوا بکا هەر دەستنوێژبێ غوسلت لەسەر نەبێ!! مەلا سەید گوتی: حازم ئێراقی، بەخوای بەس دەستنوێژە. کاتێ چوینە ماڵی مەلا سلێمان، مەلا کۆبوونەوە، من و مەحەمەد شێرزاد پێدەکەنین. بۆمان گێرانەوە، مەلا عوسمان و مەلا ڕەسو گوتیان: حازم، ڕۆژێک دەچین بۆ خزمەت مەلا خدری (وەتەمێش)، (وەتەمێش، دەکەوێتە سنوری بۆکان). شتێکی خۆشیان بۆ گێڕامەوە کە بەسەر مەلاخدری وەتەمێش هاتبوو. گوایە دەهۆڵ و زوڕنا دەیکوتێ لە گوندەکە، لەدوای چەند شەو و ڕۆژێک دەهۆڵ کوتین و زەماوەند، چاوەشەکان کێشەیان لێ پەیدا دەبێ. بۆ چارەسەری کێشەکەیان دەچنە لای مامۆستا، یەک لە زورناژەنەکان دەڵێ: مامۆستا وەک بۆ خۆت دەزانی، ئێمە چەند ڕۆژە ئەو داوەتە بێ کەم و کوڕی هەڵدەسورێنین. مەلا دەڵێ: خواخێرتان بنوسێ. چاوەش دەڵێ: ئێمە دوو دەستەین، دەستەی دوەم ڕۆژێک دوای ئێمە هاتوون، گوتومانە با بەهەردووکمان بەشەریکی داوەتەکە هەڵسورێنین. ئێستا، زوڕنایەکمان دیارنەماوە، زوڕنایە هەرە باشەکەشمانە.
مامۆستا دەڵێ: شک و گومانتان لەکێیە؟ دەڵێن: لەو سمێڵ فشە.
مامۆستا دەڵێ: کورە سمێڵ فش، ژنت هێناوە؟ ئەویش لەسەر چۆکان دەست

لەسـەر ئەژنۆ چاوی دەپوتێنێتەوە، دەڵێ: بەڵێ مامۆسـتا ژنم هەیە. مامۆسـتا دەڵـێ: گوێبدێ، ئەگەر تۆ زوڕنای ئەوانەت دزیوە (کێری ئەوانە بە قوزی ژنت). ئەویـش دەڵـێ: مامۆسـتا با کێری تۆشـی لەگەڵ بـێ. ئەویش دەڵـێ: کوڕم، هەرچەنـدە ئەهلی ئـەو بەرنامانە نیم، بەڵام مادام فیتنـەی پێ دەکوژێتەوە، با هی منیشی لەگەڵ بێ.

# گەڕانەوەم بۆ زێدی خۆم

لەرۆژهەڵاتی کوردسـتان، هەڵمەت و دەشتی کوڕم شەهادەی دبلۆمیان وەرگرت، دەبوایـە بچـن بۆ زانکۆ. لە ئێـران منداڵی پەناهەندە بۆی نەبـوو بچێتە زانکۆ. لەو سـەروبەندە کۆمسیاری پەناهەندەکان هاتبوو، بۆ ئەوەی خەڵک بەرێبکاتەوە بۆ عێراق. لە پیرانشـەهر ئۆفیسـیان کردبوەوە، ئێمەش ناوی خۆمان نوسـی بۆ گەڕانـەوە. چاوەڕوانمان دەکرد تاوەکـو نۆرەمان دێت. ڕۆژی بەڕێکردنەوەیان بۆ دیاریکردیـن. چووم بۆ خواحافیـزی هەموو برادەرەکانم، لـە مەهابادو نەغەدەو شـنۆ و سەردەشـت و میراوەو بـەری مێرگان و گونـدەکان. ڕۆژی پێش ئەوەی لەسـنور ئـاوا بین، هەمـوو برادەرەکانم هاتن، بۆ ئەوەی لە دوای حەڤدە سـاڵ دەربـەدەری، بەڕێم بکەنەوە بۆ مەفتەنی خۆم.

هەمویان لەماڵی ئێمە کۆبوونەوە، دوو سـێ مەلایان تێدابوو، کۆنە کۆمەڵەبوون، کۆنـە تودەی، کۆنە دیموکرات، چریـک، کۆنگرەی چوار.. . ئەوەبوو مەلا خالید گوتـی: ماڵـی کاک حازم ئەمڕۆ دەڵێی بەرەی کوردسـتانییە. (چونکە هەمویان یەکتریان دەناسی) گوتیان: حازم عێراقی، چ هەستێکت هەیە؟ گوتم: ئەگەر بیر لە دابڕانی ئێوە دەکەمەوە، جەرگم ژان دەکات کەوا بەجێتان دێڵم، تەمەنێک لێرە لەگـەڵ ئێوە ژیاوم. بەڵام ئەگەر بیر لەدامـودەزگای حکومەتەکەتان دەکەمەوە، کە زۆریان ئازاری ڕۆحی داوم، خۆشحاڵم کە ئازاد دەبم. چونکە من هیچ خراپە و گوناهێکم نەکردبوو بەرامبەر بەدەوڵەت.

گوتـم: کابرایـەک کوڕێکی خراپی دەبێ، دوعا دەکات کوڕەکەی بکوژرێ. ڕۆژێک هەواڵـی دەدەنـێ: کوڕەکەت لەفلان شـوێن کـوژراوە. باوکی دەچێـت، تەرمی کوڕەکەی دەبینێ، ددانی گڕ بوونەتەوە، باوکە دەڵێ: کوڕم، ئەگەر بیردەکەمەوە

کوڕی منی جەرگم دەسـوتێ، ئەگەر بیر لەکردەوەکانیشت دەکەمەوە، ئەو ددانە گرانـەت دەگێم. منیـش بۆ ئێوە دەسـوتێم، بەڵام بانگکردنەکانـم وام لێدەکات بـڕۆم. بـە نارەوا بانگیان دەکردم، بەقسـەی هەندێک سـیخوڕی ناوخۆمان. ئەو چەنـد سـیخورەی ڕۆژانە خەڵکیان بەگرتن و لێـدان دەدا، لە ئێران گەڕانەوە بۆ باشـور، بن باڵی یەکێتی و پارتی، زۆر لە ئێمە باشـتر پێشـوازی کران، مووچە و ئیمتیازیان پێدان. دەمێکە دەسـەڵاتی کوردی خەریکی پرۆسـەی بە تێکۆشەر ناساندنی ناپاکەکانە.

بۆیە لە دوای ١٤ چواردە سـاڵ هێشـتا بەسـەفەریش نەچوومەتـەوە بۆ ئێران، لەگەڵ ئەوەی بۆ برادەرەکانم دەسوتێم.

ڕۆژی ٢٠٠٤/٩/١ لەسنوری دەستکردی داگیرکەران لەحاجی ئۆمەران، ئێمە چەند پاسـێک بویـن کاروانی نەغەدەو شـنۆش لە پەناهەندەکان بەگـەڵ ئێمە کەوتن. هاتیـن بۆ سـۆران، لەوێ کەمپـی (un) کرابوەوە، لۆریە بارهەڵگرو پاسـەکان وەسـتان، شـەو چوینە ماڵی نەزیهەی ئامۆزام، بەیانی هاتینەوە کەمپەکە، گوایا خێـوەت و هەندێ کەلوپەلمان دەدەنێ. زۆر دڵمان بەخێوەتەکان خۆش بوو، بۆ ئەوەی منداڵەکانمان لەژێری بحەوێنینەوە. بەڵام سەرپەرشـتیارەکانی کەمپەکە، بینیـان ئێمە زۆرین، پەشـیمان بوونەوە لەوەی ئـەو کەلوپەلانەمان بدەنێ. بۆیە ئـەو بەرێزانـەی لەگـەڵ ئێمەبوون گوتیـان: کاک حازم، تۆ لـە جیاتی هەموان قسـەیان لەگەڵ بکە، من و شـێرزاد قسـەمان لەگەڵ کردن، گوتمان: ئەوە چەند ڕۆژە لـە کەمپـی دیوی ئێران، بە ئێمە دەڵێن: ئـەو کەلوپەلانەتان دەدەنێ، وە ئەوانـەی لـە پێش ئێمە هاتوون وەریان گرتوە، بـۆ نایاندەن بە ئێمەش؟! هەتا لای ئێوارێ وەک مانگرتن نەچوینە ژێر باری ڕۆیشـتن، بەڵام مافی مرۆڤ کەوتە قسـەکردن لەگەڵمـان. ئەوانیـش هەمویان حیزبـی بوون، تەنهـا نوێنەری مافی مـرۆڤ نەبوون، ئەگینا هەموو شـت بوون. یەکێکیـان بەمنی گوت: تۆ لە ئێران پاڵت دابوەوە، ئێمە لێرە شەڕە ئاڕ.پی.جیمان دەکرد. گوتم: مەبەستت لەشەڕی خۆکوژیـە؟ ئاخر لـەدوای ڕاپەڕیـن، چ کارێکی نیشـتمان پەروەرانەتان کردوە، ئێمەی پەناهەندە لەگەڵمان نەکردبن؟ شـانازی بە شەڕە ئاربیگی، شەڕی ناوخۆ دەکەن، تۆ چ نوێنەرێکی مافی مرۆڤی، وەک بەرپرسـێکی شـەڕی ناوخۆ لەگەڵ ئێمـەی ئاوارە، ئاوا دەدوێی؟!! گوتیان: بزانن ئەو برادەرە دەچێتەوەکوێ، ئەوە

دەیەوێ خەڵکمان لێ هانبدات، ئەوە دەستی لەپشتە تابوری پێنجە!! بۆ ئەوەی مافــی مــرۆڤ فەلاقەو دارکاریمان نەکــەن، بەناچاری ئــەو برادەرانەی لەگەڵمان بوون، گوتیان: کاك حازم، هیچ ســودی نییە باســواری پاســەکان بین و برۆین. کەزانیــم پشــتگیریم لێ ناکرێ، بەناچاری ڕۆیشــتین، بێ ئــەوەی (un) و مافی مــرۆڤ هیچمــان بدەنێ و هیچمان بۆ بکەن، وەکو ئەوانەی پێش ئێمە.

لە ڕانییە نیشــتەجێ بووم، بەخۆم و منداڵەکانم هەســتمان بەنامۆیی دەکرد. ئەو دوو هێــزە فەرمانڕەوایــە، کارێکیان بەو گەلە کردبوو لە میانەی شــەڕی ناوخۆ. بــاوەڕ بکەن، ئــەو گەلەی خۆم نەدەناســیەوە. بە پێشــمەرگایەتی و ئاوارەیی، بیســت و چــوار ســاڵ لەباشــور دوورکەوتبوومــەوە، قــەت بــاوەڕم نەدەکرد بە چــواردە ســاڵ حوکمرانی کــوردی، ئاوا بتوانن ئەو گەلــە لەهەموو ئاکارە مرۆڤ دۆســتی و ڕاســتگۆیی و زۆر شــتی نیشــتمان پــەروەری دابماڵــن. لەماڵی ئێمە وەک پرســەمان هەبــێ وابوو. ڕۆژانــە لەدەوری یەکتر دادەنیشــتین. هەریەک لە ئەندامانی خێزانەکەم، کەلێی ورد دەبوومەوە دەتگوت: لەسەر جەنازە دانیشتوەو پرســەیەتی. هەمویان دەیانگوت: بریا هەموو ڕۆژێ پاســداری ئێران تێر شەقیان بکردبوینایــە، نــەک بێینەوە ژێر دەســەڵاتی ئەو حکومەتــە خراپەی خۆمان، کە گەندەڵــی وێرانــی کردوە. بەهەرحــاڵ کوڕەکانم هەڵمەت و دەشــتی م لە زانکۆ دامەزرانــد بــۆ خوێندن، دیلان م بردە هەولێر، تا لە دارەتوو لای دایکم بخوێنێ. ئــەوکات لــە مەملەکەتــی زەرد ئــاوارەی گەڕاوەی ئێــران لەهەمــان پۆلی خۆی وەردەگیرایەوە. کەچی، لە مەملەکەتی ســەوز، دەبوو ســاڵێک بێتە دواوە، واتە پۆلێــک لەخــوار پۆلەکەی خۆی. بۆیە دیلان م بردە هەولێر ســاڵێک بخوێنێ بۆ ئەوەی داینەبەزێنن بۆ پۆلێکی خوار خۆی و ســاڵێکی بەفیڕۆ بڕوات.

بەڕاســتی بۆ ئێمە ژیانێکی ســەخت و ناهەموار بوو، لەگەڵ ڕانەهاتبووم. شەوان کاتژمێر ســێی شــەو یان لە ئێــوارەوە ئۆتۆمبێلم لەبەنزینخانــە ڕادەگرت، جاری واهەبــوو لەنــاوی دەخەوتیــن، بەیانــی بەنزین دەهــات، پێش ئــەوەی ئەوانەی لەنۆبەتی ڕۆژی پێشــوو وەستابوون، بەنزین وەربگرن. لەناو بەنزینخانە بەرپرس و کوڕەبەرپــرس و ڕەفیــق حیزبیەکانــی زەمانی بەعس و کۆیلــەو پێش دەرگاو دەربــارو هەمــوو ئەوانە، هەتا بەنزیــن کۆتایی دەهات ســوکایەتیان بەو خەڵکە دەکرد. چەندین جار خەریک بوە تووشــی کێشــەو شــەڕ ببم، بەڵام دوایی گوتم:

ئــەوە بــۆ من نابێ، هەموو ڕۆژێک بێ ڕێزیم پــێ بکرێ لە نۆبەی بەنزین. لەوەی خۆشــتر: جــاری واهەبوو ئەوانــەی بەنزینیان بــەر نەدەکەوت لەنۆبــەی بەنزین لەســەر پارتــی و یەکێتــی و ڕەنگــی پەڕۆکەکانیان دەبوو بە شــەڕیان، من ئیتر هەرگیز نەچوومەوە بەنزینخانە.

## لەدەڤەری ڕاپەڕین

لەڕانیە، لەڕێگای مەحەمەدی مام ڕەســوڵ، بەشــێخ عیســامەدینی کوڕی شــێخ مســتەفای باقلانێ ئاشــنابووم، تاوەکو ئێســتاش ئــەو برادەرایەتیــەم لەگەڵیدا بەردەوامە.

شێخ، هەتا بڵێی کۆمەڵایەتی و هەمیشە لەناو چارەسەرکردنی کێشەکانی خەڵک ژیــان دەکات، هەوڵــی چارەســەرکردنیان دەدات. لە پاڵپشــتی پارچەکانی تری کوردســتان کەمتەرخەمی نــاکات، لەهەموو کەمپیــن و هاریکارییێک بۆ ڕۆژئاوای کوردســتان و بەرەکانــی بەرگری لە خاکی کوردســتان بەشــداربوو. بەکورتی و بەکوردی، مرۆڤێکی سودبەخشە بۆ دەوروبەری، بەتایبەتی بۆ ئاشتی کۆمەڵایەتی. بەلام ئەوەی ڕاســتی بێ هەر کەســێک کاری بەشێخ هەبێت، دەبێ هەتا کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ چاوەڕێی بکات، ئەگەر نا لەدەرەوەی بازنەیە و بەردەست نییە، چونکە دەچێ تۆزێک خەمی ئەو دنیایە بە دوو پێک عەرەق بشــواتەوە. جێگای داخــە لەلایەن خەڵکــی کاڵ فام و بێ ویژدان بەهەڵە لێک دەدرێتەوە، دەیانەوێ ئــەو کارە چاکانــەی شــێخ لەبەرامبــەر خواردنەوەی دوو پێک، بەیەک شــەمچە بســوتێنن. وەنەبێ من پاڵپشــتی خواردنەوەکەی بکەم، بــەڵام بۆ بەراوردکردنی لەگــەڵ هەندێــک کاری نابەجێ کە ئەوان دەیکەن، زۆر جیاوازە. ئەگەر نا منیش بــە نۆبــەی خۆم، زۆرجار داوام لێکردوە، کەمی بکاتەوە، یا هەر نەیخواتەوە. خەیامی نەیشابوری دەفەرموێ:

جــارجـــارە پەنا بەمـــەی دەبـــەم نــاچارم
خــەفـــەت بارم، پێم ئەڵێن کە تاوانبارم

## خۆزگە وەکو مەی درۆو دزیش مەستی ئەکرد
## مەردێکم ئـەویست کە بیگوتبا وشیارم

شـێخ عیسامەدین تاوەکو خێزانەکەی تووشـی کارەساتی هاتوچۆ نەببوون، زۆر مەجلیس خۆش و حەزی بە نوکتە و بەسەرهاتی خۆش دەهات. پازدە ساڵ بەر لەنوسـینی ئەو کتێبە، شـتێکی خۆشی بەم شـێوەیە بۆگێڕاینەوە: (دیارە شێخ مسـتەفا کوڕی شـێخ بایـزی باقلانێ کاتی خۆی پیاوێکی دیـاری ناوچەکە بوە، ئێسـتاش لەناو جەرگەی ڕانییە تەکییە و مزگەوتی شـێخ مسـتەفا بەناوبانگە. تەریقەتیـداوە، ئەوەی لەهەموی زیاتر جێگای شـانازیە نەبوە داردەسـتی ڕژێمە یـەک لەدوای یەکـەکان، لەدژی گەلەکەی خـۆی)، خەلیفەیەکـی هەبوە بەناوی (خەلیفە نەبی) کە هەمیشـە بەدەفەیەکی بە پرپرە و زریزەی بەشـانییەوە بوە، لەگەڵ شمشـێر و خەنجەر و زەرگ و قایشـی ڕاست و چەپ، وەک بڕواتە جەنگ لـە پێنـاوی خـوا. کەچی بە داخـەوە نوێژی نەزانیـوە. خەلیفە هەمیشـە نزای دەکرد، دەیگوت: خوایە هەڵمبکێشـەوە لای خۆت، لەناو ئەو خەڵکە بێ باوەڕە نەجاتم بدە. شـێخ دەچێتە لای پێی دەڵێ: خەلیفە، خەبەرم هەیە لەو شـەوانە هەڵتدەکێشـنەوە لای خوا، ئەویش زۆر خۆشـحاڵ دەبێ و خۆی ئامادە دەکات.

شـێخ عیسـامەدین لەگـەڵ چەنـد برادەرێک دەچنە سـەربانی تەکیـە، لەکونی سـۆبە، بەو شەوە درەنگە، بانگی دەکەن: خەلیفەنەبی، خەلیفەنەبی.. . ئەویش دەڵـێ: بەڵـێ.. بەڵـێ. دەڵێـن: ئێمە مەلائیکەتـی خواین، هاتوین بۆ ئاسـمان هەڵتکێشـینەوە، بەئەمری خوای گەورە. ئەو گوریسـە زۆر باش لەخۆت بپێچە. ئەویـش بـەدەم شـوکرانە و خـۆ بەقوربانیکردنـی مەلائیکەتەکان، گوریسـەکە لەخۆی دەبەسـتێ، دەڵـێ: هەڵمبکێشـن. ئەوانیش هەڵیدەکێشـن، هەتا بە بن میچی تەکیەیەوە دەنوسـێنن و سـەرە گوریسـەکە لە گوێسـوانەوە گرێ دەدەن و دەڕۆن. تاوەکـو بەیانـی نوێژکـەرەکان دێنـە تەکییـە، خەلیفـە نەبی، بە بن میچـی تەکیـەوە دەبێ. کاتێک نوێژکەرەکان گوێیان لـە نوزەی پیاوێک دەبێت، ڕووناکی دادەگیرسێنن، دەبینن خەلیفە نەبی بەو بن میچەوەیە. خێرا گوریسەکە دەکەنـەوە و دای دەبەزێنـن. دەڵێـن: ئەوە کێ وای لێکـردوی؟ ئەویش دەڵێ: خـوای گـەورە بە قوربانی بم، دوو مەلائیکەتی زۆر بێ ئەقڵی ناردبوو، گوتبوی:

بـڕۆن خەلیفەنەبـی م بۆ بێنن، ئەوانیش نەیانزانی مـن بەو کونەوە ناچم، زۆری جنێو بە مەلایکەتەکان دا بوو.

## تاقمی ددانی مامۆستا

تازە ماڵم لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوەوە باشـور. کاک (مەحمود چیرە) و خێزانی لە مەهابادەوە بەسـەردان هاتبوونە لامان لە ڕانییـە. کاک مەحمود گوتی: بابچینە هەولێر، سـەرێک لە ماڵی هاوڕێ ئەحمەد شـاهین بدەین. ئەوەی ڕاسـتی بێت، ماڵی کاک مەحمود بۆ هەموو کەسـێک کراوە بوو. ئەحمەد شـاهین کوڕی مەلا قـادری گونـدی سەردەشـت ی نزیک گوندی سـابلاغ ە، کـە دەکەوێتە خواروی هەولێـر، لەخۆشـناوەتی پێیـان دەگـوت: مەلا قـادری سـاڵح گەڕۆتەیی. مەلا قادر لە حیزبی شـیوعی نزیک بوو، مەلایەکی کراوەو ڕۆشـنبیر بوو، دوو کوڕی پێشـمەرگەبوون لەگەڵ ئێمە، ئەحمەد شـاهین و ئارام شاهین، (بەداخەوە ئارام لەگەڵ پێشـمەرگەیەکی تر لە سماقەی دەشتی کۆیە هەلیکۆپتەری ڕژێمی بەعس شـەهیدی کردن، لەکۆتا شەڕەکانی لەگەڵ ڕژێم).

جارێکیـان هاوڕێ ئەحمەد شـاهین لەگەڵ چەنـد هاوڕێیەک لەناو هەولێر پێکەوە دەبن، مامۆسـتا مەلا قادری باوکی دەڵێ: ئەحمەد ئەوانە کێن؟ (ئەو پرسـیارە زۆر دووبـارە دەکاتـەوە) ئەحمەد، تورە دەبێ دەڵێ: هاوڕێی خۆمانن، بۆ هێندە دەپرسی؟ مامۆستا دەڵێ: لەبەرئەوەی دەمەوێ بیان ناسم، ئەگەر دایکیان گای، ئەمن دایکیان بگێمەوە. ئەو پێشمەرگەی لەگەڵ ئەحمەد شاهین بوو، ناوی هیوا ڕەش بوو ( ئێسـتا لە سـوید)ە، مامۆستا بەرەو ڕوی هیوا ئەو جنێوە دەدا.

مـەلا قـادر لەکاتی شـەڕی ناوخۆ لەگەڵ قەشـەیەک و جوتیارێک و کرێکارێک و کارمەندێک، واژۆیەکی زۆریان کۆکردەوە بۆ ئەوەی شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی ڕابگرن. لەناوەڕاستی نەوەدەکان چوون بۆ لای کاک مەسعودو دوایی بۆ لای مام جەلال. مام جەلال پێی گوتبوو: کاخەزی سپی واژۆ دەکەم. مەلا قادر گوتبوی: ئەو قسـانەت زۆر کردوون، شـەرتە بیکەیتە بواری کردار. لەماڵەوە بە مامۆسـتا

دەڵێـن: بـەو پێـڵاوە دڕاوە چۆن دەچیـە حزور کاک مەسـعود و مام جەلال؟!!
مامۆسـتا دەڵێ: ڕێز لێگرتن بە پێڵاوی چاک یان دڕاو نییە، ئەگەر ڕێز لەو موە سـپیانە نەگرن، باوەڕناکەم هەڵسەنگاندن بۆ پێڵاوە دڕاوەکەم بکەن.
لەگـەڵ کاک مەحمـود چوین بۆ ماڵی ئەحمەد شـاهین، کاتێک نانیان بۆ دانایـن، مامۆسـتا لەگەڵ ئێمە دانەنیشت لەسەر سـفرە، بەتەنیا نانیان بۆ دانا. ئەحمەد شـاهین وەک پیشـەی هەمیشـەیی خۆی گوتی: ئەو باوکەی من واز لە مزگەوت ناهێنێ!! ئێمەش پرسـیمان: بۆ، چی لێهاتـوە؟!! ئەحمەد گوتی: باوکم، مەلای مزگەوتـی کورانـە، پێش نوێژیان بـۆ دەکات. ئێوارەیەک لـەدوای نوێژ، هاتەوە گوتـی: ئەحمـەد تاخمـی ددانەکـەم دیـار نییە، نە لـە زارمەو نە لـە گیرفانی سـەڵتەوکەواکەم. بڕۆ بزانە یان لە ڕێگا لێم کەوتوە، یان لەمزگەوت لای میحراب دامنـاوە. ڕۆیشـتم بـەو ڕێگا و کوچانـەی باوکم پێی دادەچـوە مزگەوت، چاوم دەگێـڕا، نەبـادا لێـی کەوتبـێ. لەهەموی ناخۆشـتر ئەوەبوو، هـەر کەس منی دەبینـی، دەیگـوت: کاک ئەحمەد، ئەوە لە چی دەگەڕێی، چت ون کردوە؟ ئاخر ناکـرێ بڵێـم: بابم ددانی ون کردوە!! خـۆ تەزبێح و چەرخ نییە، ددان چۆن ون دەکرێ؟ بەناچاری دەمگوت: هیچ نییە.
ڕێگـەو مزگـەوت گـەڕام، تاخمی ددانم نەدۆزیـەوە. هاتمەوە، بـە باوکم گوت: دیـار نەبوو، نەمدۆزیـەوە. ڕۆژی دوایی، حاجیەکی تەمەن حەفتاو پێنج سـاڵە، هەمیشە لەدوای باوکم نوێژی دەکرد، سەری بە پشتی باوکم وە نە نابایە، نوێژی لـە ڕیزەکانـی پشـتەوە نەدەکرد، لەناو ئەو دەسـتڕە پڕ لە چڵمـەی کە ڕۆژانە دەموفلچی پێ دەسترێت، ددانەکانی باوکمی هێناوە، هەموی کەلوکرۆم کردبوو، هیچی بەسـاغی نەهێشتبوەوە. پرسـیمان: ئەوە بۆ ئەو ددانانە شکاون؟ گوتی: مامۆسـتا دەبێ گەردنم ئـازاد بکەی، من ئەو دوو ددانەم کەوتوون، دەمویسـت دوو ددانی لەتاخمەکەی تۆ دەربێنم، لە شوێنی ئەو دوو ددانەی خۆم دای بنێم، بـەڵام هەموم تاقی کردەوە هیچیان بۆی نەبوون.
هەرچەنـدی هەوڵیانـدا هیـچ ددانێک بـۆ مەلا قـادر نەگونجـا، وەک ددانەکانی پێشـوی، چونکە سـی بۆ چل ساڵ دەبوو ئەو ددانانەی لە دەمی بوو، هەتا مرد بـێ ددان مایەوە، بەداخەوە لە ٢٠٠٦/١٠/٢٩ کۆچی دوایی کرد.
دکتۆر لوقمانی کوڕی مامۆسـتا مەلا قادر، ڕۆژێک لەماڵی خۆیان خەریکی ئارەق

خواردنەوە دەبێ، ئەو ئارەقەی ئەو دەیخواردەوە پێی دەڵێن: (ئۆزۆ). مامۆستا لێـی دەپرسـێ: لوقمان شـەوی ڕابـردوو بۆ دیـار نەبوی، بێی بـۆ ماڵی ئێمە؟ د.لوقمـان دەڵێ: بابـە میوانم هەبوو. ئەویش دەڵێ: کێت میوان بوو؟ د.لوقمان دەڵێ: کاک ئۆزۆ. مامۆسـتا دەڵێ: ئەوە یان سـورچیە یان هەرکی، ئەوانی لای سـەرەوە ناویـان بـۆزۆ و عـەزۆ و ئۆزۆیـە. د.لوقمانیش دەڵێ: بەڵـێ بابە ئەو برادەرەم خەڵکی سـەرێیە. (لەهەولێر، لە شـەقڵاوە بـەو لاوە پێی دەڵێن: لای سەرێ).

# فەرماندە هۆشەنگ

لەگەڕەکی سەرای ڕانییە، خانویەکی سەرگڵی خراپم کڕیبوو، (زۆربەی دانیشتوانی گەڕەکی سـەرا، شـاورین) بە دەهەزارو شەشسـەد دۆلار. زۆر کەس دەیانگوت: شاوری هێندە و هێندە خراپن، ناتوانی لەناویان بژی. کەچی بە پێچەوانەوە، چوار پێنج ساڵ لە براگەورەیی کەمتریان بەمن نەگوت. زۆر دراوسێیەتیان خۆش بوو. کـە خانوەکـەم کڕی، مانگێک مۆڵەت بوو بۆ چۆڵکردن، ماڵم لەحەوشـەی ماڵی ئاسـۆی برام لە ژێر نایلۆن داپۆشیبوو. خانوەکە دوو ژوورو هەیوان لە پێشەوە، دوو ژوورو هەیـوان لە پشـتەوە بەرامبەری یەکتربوون. خاوەن خانوو ڕۆیشـت، بـەڵام دوو ژوورەکـەی تـر، کوڕێکی چەکـداری حیزب، کە لـەلای فەرماندەیەک چەکداربـوو، کرێچی بوو، بەهیچ شـێوەیەک چۆڵی نەدەکرد. لەدوای ئەو هەموو پێشمەرگایەتیەم، خۆی خۆش کردبوو پارەیەکم لێ بستێنێ، ئینجا چۆڵی بکات. منیش بەژیانم خاوەم نەداوەتە کەس، هەردی هەموو جارێ دەیگوت: کاک حازم بـە ئارامـی تکایە، با توشـی بەڵایەک نەبی لەسـەر ماڵی خـۆت. منیش ڕۆژێک هەندێ پڕێسکەم بردە دوو ژوورە چۆڵەکە. کابراش نێوچاوانی تێک نابوو، وەک ئـەوەی مـن خانوی ئەوم زەوت کردبێ، وای دەزانی لـە زۆنی زەرد لەبەرخاتری مـن هاتۆتـە ڕانییە. منیش ئەوەی حسـابم بۆ نەدەکرد چەکـداری برا کوژ بوو، بۆیە تفەنگم لەگەڵ خۆم برد، نەبادا لەبەڕی خۆی زیاتر پێ ڕابکێشـێ. خەریکی دامەزراندنی شتەکان بوین.

کوڕێکــم کــە تەمەنی (٣٥) ســاڵە مەنگۆل و ناتەواوە، ئەو ڕۆژە ئاراس ســەری سـفرکردبوو، بەڕاسـتی بــە شـێت دەچوو، هەرچەنـدە زۆر هەژارو بــێ دەنگە، هێزی نییە دەسـتکاری چەک بکات. منیش تفەنگەکەم لەتەنیشت هۆشەنگ دانا، کەسـێک هۆشەنگی نەناسـی بایە، دەیگوت: ئەو شێتە ئەو تفەنگەی بۆ لەلایە!! ئێمـە بـێ ئاگا لەوەی ئەو قارەمانەی پیـاوی کاک فلان بەخۆی و خێزانەکەیەوە زیرەی کردوە لەبەر هۆشـەنگ. ژنەکە، بانگی پیاوەکەی کرد، سـرتەیەکی لەگەڵ کرد، بۆ ئەوەی بزانن هۆشـەنگ کوڕی منەو ئەویش دێتە ئەو ماڵە؟ کوڕە هاتە لای مـن، گوتـی: ئەوە کوڕی تۆیـە؟ گوتم: بەڵێ. گوتـی: دەڵێی وەزعی تەواو نییە؟ گوتم: شـێتێکی زۆر دەسـت وەشـێنە. گوتی: ئەدی بۆ ئەو تفەنگەت لەلا داناوە؟!!

گوتم: هەر لەمنداڵییەوە ئەگەر تفەنگی لەلا نەبێ، ئەو شـارەم دێنێتە سـەیران. گوتـی: ئەدی تەقەی پێـدەکات؟ گوتم: کەیف کەیفـی خۆیەتی، جاری وا هەیە یـەک مەخزەن فیشـەک لە پەنجـەرەوە دەتەقێنێ، ئەوێ سـاڵێ دوو گولەی لە قاچم داوە، قاچم هەڵکرد گوتم: ئەو برینە کۆنەکانییەتی، من باوکی ئەوم گولەم لـێ بـدا، ناچارم قبوڵـی بکەم، بەڵام خەڵکی بێگانە کـوا ئەوە قبوڵ دەکات؟!! هۆشـەنگیش، خـۆش خۆش دەسـتی بەتفەنگەکـە دادێنا، دەیزانی باسـی چی دەکەین. کاتێک ژنەکە گوێی لەو قسانە بوو، بەپەلە بوخچەی کۆکردەوە، بانگی ئەو قارەمانەی مێردی کرد. کوڕەکە گوتی: کاک حازم، دەڕۆم بۆ ماڵی خەزوورم، هەتا خانوو پەیدا نەکەم نایەمەوە. گوتم: بەخوای نایەڵم بڕۆی، جێگای هەردوو ماڵ دەبێتەوە، لەو سـوێندو لە من سـوێند، ئەوەندە لە هۆشـەنگی ترسـابوو، لەدەرگای حەوشە هەر ئاوڕی دەدایەوە، سەر سمێکیدا، خەریک بوو ملی بشکێ، گوتم: مەترسە من ئاگام لێیەتی. شەو ماڵی گواستەوە، بەوشێوەیە خانوی چۆڵ کـرد، وەک خزمانـی بۆڵی دەڵێـن، گوتم: بڕۆ لەگەڵ کاکـی فەرماندەت........، خانوم لێ زەوت دەکەی؟!!

بـووم بەدراوسـێی کوڕێکی زۆر چاک بەناوی کاک سـەلام، ئەوەندەی دراوسـێ بویـن، قـەت ڕۆژێک دڵم نەیەشـا. ڕۆژێک باسـی ژن و ژنخوازی نـاو کۆمەڵگای کوردەواریمان دەکرد، گوتی: کاک حازم، دایکم بە (بنەتۆ) هاتوە. گوتم: چۆن؟ گوتـی: کاتێـک کچێک دەدرێت بە بنەتۆ، واتە: ئەگەر ئەو ژنە منداڵی نێری بوو

بـۆ ماڵــی مێردەکەی دەبێ، ئەگەر مێ بــوو بۆ ماڵی باوکی ژنەکە دەبێت. (کوڕ بۆ ماڵی مێردی، کچیش بۆ ماڵی بابی ژنەکەی) ئەو بنەتۆیە لە پشـدەرو بیتوێن و دۆڵی سەرکەپکان باوبوە.

لەو خانوە شڕە زستان و بەهارمان بەڕێ کرد، نایلۆنم بەسەر خانوەکە دادابوو. پــڕی ســەرخانوەکە، کۆنە تایەو کیســە لم بوو، بۆ ئەوەی بـا هەڵی نەدات. کە هاویــن داهات ئێمە فێری ســاردکەرەوە نەبوین، لە ڕۆژهەڵات فێنک بوو، ســارد کەرەوەی نەدەویســت. پانکەیەک بە بەر میچی خانوەکە بەدارێک هەڵواســرابوو. ڕۆژێــک هەڵــم کرد، بەڵام پەڕەکانی هێندەی تۆز لێ نیشـتبوو وەک هەلیکۆپتەر بنیشـێتەوە وابوو، وەک شــەنە بـا بکەم، ئەو ناوە هەموو بــوو بە خۆڵ و تۆز. بەڵام لەهەموی خۆشــتر ئەوەبوو، شــەوان کە پانکە شەق و شڕەکەم هەڵدەکرد، هەرخوا خوام بوو بەســەرمدا نەکەوێ، چونکە ســوڕانەوەکەی سەنتەر نەبوو. لە ســەرەتادا، لەگەڵــی ڕا نەهاتبووم، بەدەنگەکەی زۆر بــێ تاقەت دەبووم، خەوم لێ نەدەکەوت.

بــەلام دوایی زۆر بە باشــی لەگەڵی ڕاهاتم، بۆ مــن وەک ئاوازێک وابوو، ئەگەر ژمارە یەک و دووم هەڵدەکرد، ئەو پانکە شڕە ئاوازی مەقامی کوردی بوو، چونکە تۆزێــک خاوبوو، ئەگەر ژمارە ســێ و چــوار بایە، بۆ من وەک گۆرانی هەی مینە عەمــرم مینــە و برایانی زیزی وابوو.. . چــاک لەگەڵی ڕاهاتبووم، چاکم خەو لێ دەکەوت بەو ئاوازە. بەلام بەداخەوە ڕۆژێک، هاوڕێ بێکەســی زەحمەتکێشــان و هەردی برام لە ماڵی ئێمەبوون، خەریکی نان خواردنی نیوەڕۆ بوین، لە دەرگای ئێمەیاندا، دەرگا کرایەوە ژنێکی کزی ڕەقەڵەی وەک ســیرمە، دەتگوت: مانگایە تەلی خواردوە، گەورە کچێکی ئەو ماڵەی کە پێشوو ئەو خانوەی من هی ئەوان بــوو، گوتی: هاتــووم پلاکی هەڵکردنی پانکەکە لێدەکەمــەوە، چونکە ئەوخانوە ئەو پلاکەی لەگەڵ نەبوە کە فرۆشتومانە. دەرنافیس و پلایز بەدەستەوە، منیش بەگورجی پلاکەکەم بۆ لێکردەوە، دامە دەســتی و ڕۆیشــت. زۆرم هەوڵدا هاوڕێ بێکــەس نەزانێ، بەڵام دیاربوو حاڵــی ببوو. لە مەقەڕی خۆیان کۆنە پانکەیەکی بــە هەردیــدا ناردبــوو. دوای ماوەیەک ئەو کچە هاتبوو بۆ ســەری ئاودەســت و حەمام، کە بە جەمەلۆن داپۆشــرابوو هەڵیبوەشــێنێ و بیبا، دەیگوت: بەخوای کە فرۆشــتومانە، ســەری ئەو ئاودەســت و حەمامەی لەگەڵ نەبوو!! منیش بیرم

کـردەوە گوتم: بۆ هەرچی بـێ و من دەنگ نەکەم، دەرگاو پەنجەرە و کاریتەش دەبـات، بـەس زەویەکە دەمێنـێ، بۆیە گوتم: برۆ باپیـاوەکان بێن، من خانووم لەوان کڕیوە خۆ تۆ ناناسم!!

# ئەوەیە پیاو ماقوڵ

لــە پیرانشــەهر کابرایــەک هەبوو ناوی (م.ح) ئــاوارە بوو وەک ئێمــە، تەمەنی شەســت ســاڵ دەبــوو، لەوەرگەی خۆی لەپارتی گواســتبوەوە بۆ نــاو یەکێتی. کە شــیعەکان ڕێپێوانیان بۆ عاشــوراو شــینی حەســەن و حوســێن دەکرد، ئەو لە پێشــەوە بــوو. هەر شــتێک، پەیوەندی بەویشــەوە نەبوایە، ئەو لەپێشــەوە جێگای دەگرت. ئەگەر باســی دینداری بکرایــە، ئەو حەدیس و ئایەتی لێک جیا نەدەکــردەوە، وای تێــک هەڵدەشــێلا، بە دوو ســەد مــەلای دوازدە عیلم بۆمان لێـک جیانەدەکرایــەوە، تــا هاوێــری بکەین. ئەگــەر دەهۆڵ و زوڕنــا بیکوتایە، دەســترەکەی بــەر پشــتی دەردەهێنــا، دەبوە ســەرچۆپی کێش. ئەگــەر یادی دامەزراندنــی یەکێتــی بەرێوەدەچــوو بەخێرهاتنی خەڵکی دەکــرد، وەک یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەو حیزبە بێت. ئەگەر یەکێک لە ئاغا، ســەرۆک عەشــیرەت، نــاودار، تازیەو سەرەخۆشــی هەبوایە، زۆر بەجدی بەخەڵکــی دەگوت: بەخوای نابــێ بــڕۆن، دەبــێ بۆ نان خواردن لێرەبن، مۆڵەتی کەســتان نــادەم بەبێ نان خــواردن بــڕۆن، لەکاتێکــدا نەخزمی خــاوەن تازیەکە بوو، نە کــەس ئەرکداری کردبــوو بــەو کارە!! ڕۆژێــک کابرایــەک گوێزی هێنابــوو بیفرۆشــێ، گوێزەکانی ســەرەوەی گونییەکە تۆزێــک گەورەتربوون لەوانەی ژێرەوە. (م.ح) هات گوتی: ئــەوە غەشــە، خوا لە قورئانــی پیرۆز دەفەرمێ: (من خەتەنەتــی) منیش زانیم لەگەڵ چیەتی، گوتم: بەڕاســتی من ئەو ئایەتەم زۆر لە قەلبی خۆشــە، با بچینە لای مەلا عوســمان، (دەمویســت مەلایەکان تۆزێک سەرزەنشــتی بکەن، دەم لە شــتێک نەکوتێ کە نایزانێ). (مەلا عوســمان دوکانی فەرش فرۆشی هەبوو) کە چوینە ژوورەوە یەک دوو مەلای تریش لەوێبوون، گوتم: مامۆستایان (م.ح) ئەو ئایەتەی باســی کردوە لەبارەی چیە کە دەڵێ: (مەن خەتەنەتی). مامۆســتاکان

کەوتنــە لۆمەو سەرزەنشــتی کردنی، گوتیان: ئەتۆ ئــاگات لەخۆتە چی دەڵێی؟ گوتم: مامۆستایان، ڕەنگە بەو حەدیسە حاڵی بووبێ کە پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ: (مــن غشــنا فلیس منا) ئــەوەی غەش بکات لە ئێمە نییــە. (م.ح) گوتی: کاک حازم ڕاســت دەکات، مەبەستم ئەوەبوو، وامزانی ئایەتە قسەی خودایە، نەمزانی حەدیسە.

ڕۆژێک تازە (م.ح) لە شــەڕە جنێوی زۆر ســوک ببوەوە، مەلا بانگی دا، هەر قۆڵ و باســکی هەڵکردو گوتی: کاکە ناموســتان هەبێ شــەڕەفتان هەبێ، خوای بناســن، با بچین دەســت نوێژان هەڵبگرین، ڕوو لەخوا بکەین. لەوکاتەدا، زۆر لە برادەرانی دێڵزێ لەوێ بوون، توند قۆڵم گرت، گوتم: تۆ تازە لەو شــەڕە جنێوە ســوکانە بویتەوە، ئێســتاش غوسلت لەسەرە، چیت لە دەست نوێژگرتن داوە؟!! ئەگــەر فەردە ئاردیشــە هەتــا لەگەڵت بار بکەین، ئەگــەر بەرمیلە نەوتە، ئەگەر تانکی گەورەت کرپوە با لەگەڵت باربکەین، ئەگەر نا دەستنوێژ لە نێوان خۆت و خوای خۆتە. پاڵێکم پێوە نا، گوتم: بڕۆ ملت بشکێنە و دەست نوێژەکەت بشۆو نوێــژ بکــە. دەتەوێت بــۆ کردنی نوێژێکی غەڵەت و پەڵەت کــە هیچی لێ نازانی شــارێک ئاگادار بکەیتەوە؟!! بوو بە پێکەنین..

هــەر ئــەو کەســە ڕۆژێک لــە ڕانییــە، لەبەردەم باخی گشــتی، دەهــۆڵ و زوڕنا دەیکوتــا، بەبۆنــەی دووبارە بە هەڵبژاردنەوەی ســەرۆک کۆمار مام جەلال، تۆز بەری ئاسمانی گرتبوو، سەیرم کرد (م.ح) سەرچۆپی شایی گرتبوو. سێ جرتی لەخۆی هەڵدەدا، دەسرەیەکی سەوز بەدەستەوە، خۆی لە ئارەقەی ڕەش و شین وەرێنابوو، لەدوای ڕۆژێک لە شاییەکە، گوتی: تۆ هەر حساب بۆ من ناکەی ئەوە هەویەی پیاوماقوڵیەکەم لە مەڵبەند بۆیان کردووم. گوتم: خواماڵی ئەو کەســە کاول بــکات کە ئەوەی بۆ کردوی، تۆ بەس پیاوماقوڵ نیت.

## فەوزیە عۆرە

لەچەندین شــارو شارۆچکە خەڵک لەسەر بەنزین تەقەیان لەیەکترکرد، خەڵکیش کوژراو بریندارببوو، لەســەر بەفر(سەهۆڵ) خەڵک یەکتری کوشت.

جۆرێـک لـە پەنجادینـاری هەبـوو، لەویلایەتی سـەوز لەڕانییـە وەر نەدەگیرا، لەگـەڵ موچە دەیـان دایە خەڵک، کەچی بۆپارەی کارەبـاو ئاویش لە خەڵکیان وەرنەدەگرتـەوە!! هەر لـەو ویلایەتە لە سـلێمانی پەنجادیناریەکـە وەردەگیرا، بەراسـتی ئەو شتانە بۆمن زۆر ئازار بەخش بوون.

من ئەوکاتە بە جێگر دەستە (ئەو پلەیە لە پێشمەرگایەتی هەر نەبوو) خانەنشین کرابووم. لەسـەر لیستی حیزبی شیوعی، کۆنە چەکدارەکانی بەعس لەناو هەموو حیزبەکان بەلیواو عەقیدو عەمید خانەنشـین بوون، لەکاتێکدا من لە شـاخ پلەی فەرماندەیـم زیاتربوو، لەوەی پێی خانەنشـینکرابووم. حەمە ڕەشـید قەرەداغی و هاوڕێیانی سـلێمانی زوڵمێکی زۆر گەورەیان لە من و زۆر پێشـمەرگەی دێرین کردبوو. بە ڕاسـتی لەتۆرەی موچە وەرگرتن، خۆم لە پەنای خەڵک دەشـاردەوە بـۆ ئەوەی کـەس نەمبینێ. نەوەک بڵێن: حازمی مـام عەلی دەبێ چ گوناهێکی نیشـتمانی کردبێ ئاوا بەو پلەیە خانەنشـین کراوە؟!! سێ چوار مانگی بەرایی، پارەکەم وەرنەگرت، گەڕایەوە خەزێنەی بەناو حکومەت. خێزانی هەندێک کەس، کە بەژیانیان پێشـمەرگە نەبوون، خانەنشین کرابوون. کەچی، دایکم و خێزانم و خێزانی هەموو ئامۆزاکانم خانەنشـین نەکرابوون. حیزبی شیوعی لەهەولێر زەوی بـۆ ئەوانـە وەرگرت کە لەکاتی (جەبهە لەگەڵ بەعس) ئەنسـاربوون، بەڵام یەک ڕۆژ پێشـمەرگە نەبـوون، لە پازدە پێشـمەرگە لە باوکـم و براکانم و ئامۆزاکانم ناوی یەک کەسـی ئێمەی تێدا نەبوو. لەبارەگای حیزبی شیوعی لەهەولێر، زۆرم قسـەی ناجوان پێگوتن، بەڵام هاوڕێیان هیچ وەڵامیـان نەبوو. لەبیرمە گوتیان: ئەگـەر خەباتـی خەڵـک لەسـەر زەوی بێ، خەباتـی ماڵی عەلی کوتک لەسـەر هەورانـە، گوتـم: کاکە من بۆ ئەو هەڵوێسـتەتان سوپاسـتان دەکـەم، خەباتی ئێمەش هەروەک ئەو خەڵکە تێکۆشـەرەیە، بەڵام ئەوەیە، ئەو هەڵوێستانە سکی منداڵـەکان و خەرجی زانکۆیان تێر ناکات.

چیرۆکی فەوزیە عۆرەم بۆ یەک دوو برادەر گێڕایەوە: من کە بێ وەفاییەک دەبینم، فەوزیە عۆرەم دێتەوە یاد. لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨بەسەرۆکایەتی عەبدولکەریـم قاسـم، لەدوای ژنێک دەنێرێ بەنـاوی فەوزیە عۆرە، واتە: فەوزیە خێل. بە فەوزیە خێل دەڵێ: تۆ نمونەی بێ ڕەوشتی، (چەند ژنێکی لەبەردەست بوە کاری لەش فرۆشـی پێکردون، شـۆفێری تایبەت و چەند خانویەکی گەورەی

لەبەغـدا هەبـوە بۆ کاری بێ ڕەوشـتی)، چەنـد ڕۆژێک مۆڵەتی بـۆ دادەنێ کە مولْکەکانـی بفرۆشـێ لەبەغـداو لەعێراق نەمێنێ. دەڵێ: خاکـی ڕافیدەین لە تۆ حەرامە، ئەو ژنە هەموو مولْکەکانی دەفرۆشێ، پێش ئەوەی لە فڕۆکەخانە سوار بـێ، وڵات بـەدەر بکرێ، بە شـۆفێرەکەی دەڵێ: وەرە فلان خانـوو لەگەڵ ئەو ئۆتۆمبێلەت بەناو بکەم، چونکە زۆرت زەحمەت لەگەڵ من کێشاوە، مرۆڤ دەبێ بە وەفا بێ، بەرامبەر بەو کەسـانەی لەگەڵی کار دەکەن و ماندوو دەبن.

# بۆچی بە ئێمەتان نەگوتوە

وەک هەموو کەس دەزانێ لە هەڵگیرسـانەوەی شۆڕشـی نوێ، یەکێتی پشـکی شـێری بەردەکەوێ، ئەندام و لایەنگرانی هەمیشـە شـانازی بەوە دەکەن کە لە ڕۆژێکـی ئەنگوسـتەچاو، کـە بێهیـوای ڕوی لەتاک بەتاکی کوردسـتان کردبوو، بەدروسـتکردنی چەنـد مەفرەزەیەکـی سـەرەتایی، جاڕی شۆڕشـێکی نوێیاندا. لەگـەڵ تێبینیمـان لەسـەری.. . لەیـادی دامەزراندنی یەکێتی و دروسـتکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکان، گوێم بۆ وتاری مام جەلال گرتبوو، بەو بۆنەیەوە قسەی بۆ کۆمەڵانی خەڵکی کوردسـتان دەکرد. گوتی: لەناوەڕاستی حەفتاکان کە هیچ ئومێدێـک بۆ خەڵک نەمابوو، ئێمە وەکو یەکێتی لەناوچەی سـۆران شۆڕشـمان هەڵگیرسـاندەوە، برایانـی پارتیـش لـە بادینان شۆڕشـیان هەڵگیرسـاندەوە. بەڕاسـتی بۆ من کە کەموکورتێک ئاگام لە سیاسـەت و شۆڕش هەبوو، زۆرم پێ سـەیر بوو لەو مێژوە پارتی کرد بە شـەریک، کە دوورو نزیک لەو سەردەمە هیچ ڕۆڵیان لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ نەبوو. تەلەفۆنم بۆ یەک دوو بەرپرسی یەکێتی کرد، بەتوانجەوە گوتم: مادام پارتی بەشداربوە بۆ تا ئێستا بە ئێمەتان نەگوتـوە؟ لە وەڵامـدا گوتیان: مام جەلال برای گەورەیە کێ بکات بە شـەریک لەو مێژوە.

# ئەو چیرۆکانەی ئازارم دەدەن

برای خۆشەویستم کاک مەحەمەدی مام ڕەسوڵ، گوتی: ئەگەر میوانت نییە بۆ نەچین بۆ جەژنانەی کاک مستەفای سەید قادر؟ (ئەوکاتە وەزیری پێشمەرگە بوو، دیاربوو کاک مەحەمەد زۆری پێ ناخۆش بوو من ئەو زوڵمەم لێکراوە لە خانەنشین کردن، بۆیە لەهەلێک دەگەڕا کە بەرپرسێکی پەیوەندیدار ببینێ باسی منی لا بکات). لەدوای جەژنانە، کاک مەحەمەد بەهەلی زانی بەکاک مستەفای گوت: کاک حازم ناناسی؟ گوتی: زۆرم دیوە، بەڵام هیچی لەبارەوە نازانم، (من چەند جارێک کاک مستەفام لە چەند شوێنێک دیبوو)، کاک مەحەمەد کەوتە سەرباسی خەبات و پێشمەرگایەتی من، وە یارمەتی دانی بریندارەکانی یەکێتی لە ڕۆژهەڵات و زۆر شتی تریش. لەبەر خۆشەویستی کاک مەحەمەد بۆ من، پێم وابوو زیادەڕەوی کرد لەخەبات و ماندووبوونی من. کاک مستەفا کاخەزێکی دەرهێنا نوسی: (بۆ خانەنشینی پێشمەرگە، تکایە کاک حازم بخەنە سەر وەزارەت بە پلەیەکی شایستە بەخەبات و ماندوبوون و ساڵانی خزمەتی پێشمەرگایەتی بێت و بەزووترین کات جێبەجێی بکەن). دوای دوو ساڵ حیزبی شیوعی لە ڕانییەدە، ڕۆژێک هاتن گوتیان: وەرە با یەک دوو پلەت بۆ زیاد بکەین. گوتم: کاکە ئێستا لەجێگای من وەرن پلەی عەلی گۆران، جەنگی، فلان و فلان، زیاد بکەن، کە پلەی هەر یەکێکیان یەکسان نییە بە ڕابردوەکەیان. من پلەی خۆم تارادەیەک چاکردوە. دوای ماوەیەک ئەو شەست هەزار دینارەی ژنی شاخیان بڕی، تەنها ئەوانە ناویان مایەوە، کەوا لە شاخ نەبوون.

خانوێکمان لەهەولێر هەبوو، تەنها ئەوم شک دەبرد، چووم فرۆشتم. خانوەکی سەر گڵم لە ڕانییە پێ کڕی. ئەوەی مایەوە دوکانێکم بۆ کوڕە گەورەکەم ئاراس پێ دانا، لەبازاڕی سەید عەلی. ڕۆژێک لەدوکانی ئاراسی کوڕم دانیشتبووم، دوو دەبەی ئسپرتۆی بۆ نەجارەکان لەپێش دوکانەکەی دانابوو، لەوکاتە منداڵێکی پێنج شەش ساڵان، بەپێش دوکانەکە تێپەڕبوو. دەستی بە دەستی دایکیەوە بوو، چاوی بەو دوو دەبە ئسپرتۆیە کەوت، وایزانی نەوتە. هێندەیان لەماڵەوە باسی نەوت کردبوو.. . گەڕایەوە پرسیاری کرد: مامە دەبەی نەوت، بەچەندە ئەمرۆ؟ (چونکە هەمیشە نرخی لە هەڵکشان و داکشان دابوو)، ئاراسیش گوتی: ئەوە نەوت نییە، دیاربوو ئەو منداڵە دەیەویست مزگێنییەک لەگەڵ خۆی بۆ

باوکــی بەرێتــەوە بۆ مــاڵ، دڵیان پێ خۆش بکات، بە دابەزینــی چەند دینارێک لەنرخی دەبە نەوتێک!!

خوێنەری بەڕێز: ڕەنگە بڵێی ئەو پیاوە تەنها کارە خراپەکانی دەسەڵاتی کوردی کۆکردۆتــەوەو دەینوســێ. ئێســتا کە خەریکی نوســینی ئەو چەنــد لاپەڕەیەم، خۆم وادێتەبەرچاو کە چوار مشــتی لە ســەر ســنگی خۆم دانیشتووم، بەسوژن خەریکــی دەرهێنانــی گلێنەی چاوەکانی خۆمم. بۆ من زۆر ناخۆش بوو، لە دوای ڕشــتنی دەریایەک خوێن و فرمێســک و، لەدەستدانی پێنج کەس، لە براو مام و ئامۆزا و چەند بریندار‌بوون، ماڵ تاڵان کردن و ســێ کەســی ئەنفال لە بنەماڵەم، بەرهەمەکەی بەم شێوەیە ببینم. ئەو چەند لاپەڕەیە تەرخان دەکەم بۆ ناپاکی و پیســخۆری هەموو پارتە سیاسیەکانی باشور. بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو باوەڕ بەدرۆ نوســراوەکانی قەڵەم چاوشــۆڕە دەربارەکان نەکەن. وانە لە ڕابردوی پڕلە شــەرمەزاریان وەربگرن و، لێنەگەڕێن گۆڕیان لە کوردستان بێ.

لەکەم دەســتەکاندا، دەســت پێدەکەم. ڕۆژێک ئاراس هاتــەوە ماڵ، گوتی: بابە ئەمــڕۆ هــاوڕێ (س) هاتبــوو پێــی گوتــم: وەرە دەتکەین بە پۆلیــس، هەر لە دوکانی خۆتبە، بەڵام پارەکەی نیوە بدە بە حیزبی شــیوعی کوردستان، بەناوی پۆلیســی پارێــزگاری بــارەگا. ڕێگام پێ نەدا ئەوە بکات، ئاراس خۆشــی مەیلی ئــەو گەندەڵیــەی نەبوو. ئەوەی پارتــی و یەکێتی دەیانکرد، دروســت ئەوانیش بــە ئەنــدازەی قەبارەی خۆیان لاســاییان دەکردنەوە. گەورەتریــن هەڵەی دوای ڕاپەڕیــن کەوا حیزبی شــیوعی کردی، ئەوەبوو: نەبوو بە ئۆپۆزســیۆن، بەڵکوو تەنها گلەیی لە بەشــی خۆی دەکرد، لەهەمبەر ڕووداوەکان تەنها بەیاننامەیەکی شــیرتێنی دەردەکرد، هەســتی نارەزایەتی خەڵکی تێر نەدەکرد. ڕۆژێک سەیری تەلەفزیۆنــی (ڕێــگا)م دەکــرد، کە زمانحاڵی حیزبی شــیوعی کوردســتان بوو. تابلۆی شەهیدانیان بەسەر چەند ماڵە شەهیدێک دابەش دەکرد. یەکەم ماڵی کە ســەردانیان کرد، ماڵی ناســیاوێکی نزیکی من بوو، کە لەناو ڕەبیەی جاشــایەتی گوللــەی پێکــەوت وکــوژرا، تابلۆیان دایــە. لەگەڵ ئەوەی ئەو ناســیاوە زۆر لێم نزیک بوو، بەڵام پێم خۆش بوو، لە جیاتی تابلۆی شــەهیدان، دوو ســێ دەفتەر دۆلاریــان بدابایــە منداڵەکانــی، بەڵام ئەو تابلــۆی شــەرەفەیان نەدابایە. ئەگەر گلێنەی چاویشــم بێت، شــایانی ئەو تابلۆیە نەبوو. لەدوای ئەوو دوای هەمویان،

ئینجـا چوونــە ماڵی شــەهید داود، (لەناپاکیەکەی مەمۆ دەرمـان خوارد کراو، لــەدادگای (محکمــە ســەورە) جنێوی بە عــەواد بەندەرو ســەدام دا، بە عەواد بەندەری گوت: ئێســتاش کلاشـینکۆفێکم پێبێت، ســەدانی وەک تۆ دەتۆپێنم، ســزای لەسـێدارەدانی بەسەردا برا). تابلۆی شەهیدیان دا بەدایک و براکانی. من بــە خیلیـم بە ئازایەتی شــەهید داود دەبرد. ئەوە لەهەرە حیزبە بێ دەســەڵات و پاکەکانــی باشــوری کوردســتانە بە قســەی خۆیان، خۆیان بــە دژە گەندەڵی دەزانن، ئەوەی ڕاســتی بێ، گەندەڵی و ناعەدالەتی لەناو حیزبەکانی تر ســەدان هێندەی ناو حیزبی شیوعیە.

ڕۆژێـک چـووم بۆ سـلێمانی بـۆ کۆمەڵــەی هەرەوەزیــەکان، (حاکـم یەحیا)م لەبەرامبەری ســەرا بینی. (یەحیا، حاکم نەبوو، بەڵام لە پێشـمەرگایەتی وامان پێ دەگوت، برای شــەهیدی قارەمان شــەهید داود بوو، لەدوای ڕاپەڕین یەحیا ببوە یەکێتی، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەو بنەماڵە تێکۆشــەرە ســاڵانێک بوو دۆســت و بــرادەری یەکتربویــن). چاومان دەگێڕا لە شــوێنێک دانیشــین، تۆزێک دەردی دڵ بکەیــن، لــە سێگۆشــەکەی بەرامبەری ســەرا، پارکێکی بچـوک هەیە، لەوێ دانیشــتین. هەواڵم پرســی: هاوڕێ یەحیا ئێســتا چی دەکەی؟ گوتی: ئاسایشم، لەگــەڵ یەکێتیـم. گوتم: پلــەو مووچەو خانــوو ژیانت چۆنە؟ گوتــی: لەخانوی کرێـدام لە گەڕەکی کۆســەی چەم، (دەتگوت بەکرێ گیــراوە بۆ ئازاردانی من)، گوتی: مفەوەزم لە ئاســایش، کاک (ق.ر) قەولی پێداوم بە مامۆســتا سەیفەدین بڵێ: (ئەوکات بەرپرســی ئاسایشــی گشــتی بوو) یەک دوو پلەم بۆ زیاد بکەن. (ئاخــر (ق.ر) مەفــرەزە خاســەی دائیــرەی ئەمنــی هەبوو، ســەگی لەخەڵکی بەردەدا، دەیان کەس لەسەر دەستی (ق.ر) قۆڵبەست کران و تەسلیمی دائیرەی ئەمن کران و پاشــان لە ســێدارەدران). نامەوێ بچمە ناو پرۆفایلی ئەو خائینە، بە بیســتنی ئەوەی، کە (ق.ر) شــەکوا بۆ یەحیای پێشـمەرگەی دێرین و برای شــەهید داود و ئەو خێزانە قارەمانەی حیزبی شــیوعی بکات، بۆ یەک دوو پلە بەرزکردنــەوە!! زۆرم ناڕەزایەتی خۆم دەربڕی، گوتم: بەڕاســتی خەمەکانم کەم بوون، جا ئەوەشی بێتە سەربار.

گەڕامەوە لەچوارقوڕنە خزمێکمان فەرمانی دامەزراندنی خۆی لەپێش دانام، گوتی: دەزانم خەم بەو شتانەوە دەخۆی، بۆیە دەمەوێ بیخوێنییەوە. ئەوەی ڕاستی بێ

ئەو برادەرە قەت ئاو و بەفری لەوێسـکی نەدەکرد، دەیگوت: وێسـکی وە یا هەر مەشـڕوبێک ئـاوی تێ بکەی حەرام دەبێ، دیار بوو ئـەو فەرمانی دامەزراندنەی بە (موئەزینی مزگەوت) بۆ کرابوو!! (لەگەڵ ڕێزم بۆ مەشـروب کڕو مەشـروب فرۆشـەکان). گوتی: مەشـڕوب فرۆشـیش هەیە بە موئەزین خانەنشـینە. گوتم: قسـەم لەسەر خانەنشـین یان موچەدان بەخەڵک نییە، بەڵام ناکرێ مزگەوتی وا هەبێ پازدە موئەزینی بۆ دابمەزرێ و دەرچوی کۆلیژەکانیش پاقلە بفرۆشـن!!

ڕۆژانە تەماشای تەلەفزیۆنەکانمان دەکرد، یان ڕادیۆی نەوامان گوێ لێ دەگرت.

بـۆ (عاجل)ی عەرەبی، واتە: هەواڵی بەپەلە.

هـەر کەناڵەی ناوێکی بەکاردەهێنا، یەک دەیگوت: بەپەلە، ئەوەی تر دەیگوت: ئێسـتا، نوکـە، بلـەز، چەندین وشـەی تر. کە هەموی مەبەسـت بـە پەلە بوو، هەندێـک کەسـیان دێنا لە شـێوەی کۆیلە وێنەیان دەگرتن. کـە من پێم وابوو، گەورەترین سـوکایەتی بوو پێیان دەکرا، گوایە ئەوانە گەڕاونەتەوە ناو باوەشـی ماڵە گەورەکە. وەک پێشوو لە سەنگەرەکەی تر نوقمی ناپاکی نیشتمانی بوبن!!

ئـەوەی زیاتـر ئـازاری دەدام، خۆ ڕەپێشـکردنی ئەو کۆیلانە بـوو بۆ بەردەمی کامێـرای تیڤیەکان، بۆ ئەوەی وێنەی باش دەربچێت. ڕۆژ بەڕۆژ کاریان لەسـەر داڕمانی ئەخلاقی تاکی کورد دەکرد، بۆ نمونە: باسـی پەیداکردنی کەپسـولێک گازی سروشـتی، سوکایەتیان بە خەڵک دەکرد، یان وەرگرتنی بەرمیلێک نەوت. چەندین کوشـتن و تەقە لەیەکترکردن لەسـەر پێداویسـتیەکانی ڕۆژانەو لەسـەر نۆبە دووبارە دەبوەوە. کار لەسـەر بێ کەرامەتکردنی تاکی کورد دەکرا.

ماڵـم لەگەڕەکـی سـەرابوو، پێش ماڵی ئێمە سـەرەو لێژ بـوو، هەندێک میوانی بەغدامـان هاتبـوون، وە هـاواری برام و مامۆسـتا عادل لە سـوید هاتبوونەوە، لەگەڵ هاوڕێ سـتاری پێشـمەرگە، ( بەستار مخابر ناسـرابوو) لەماڵی ئێمە لە حەوشـە خەوتبوین، هێشـتا خـۆر هەڵنەهاتبوو، لەپرخـەی خەودابوین. کاتێک بـوە گرمـەی بەرمیل غلۆر کردنەوە، بە دە چرکە سـەد بەرمیـل لە پێش ماڵی ئێمە کۆبوەوە. هەر گرمەو هاشـەبوو، من و ئاراسـی کوڕم، بەچاوی بەخەوەوە یـەک و بەرمیلمان دەسـت دایە، لەوکاتـە هەموو میوانـەکان ڕاپەڕین، خەریکی کۆکردنەوەی جلوبەرگی خۆیان بوون. مامۆستا عادل ( مامۆستای زانکۆ بوو لە سوید)، بەدوای مندا ڕای دەکرد.

و دەیگـوت: ڕەفیــق حازم، شــنوو قەزییە؟ منیش دەمگوت: ماکو شــی ڕەفیق، نەفت،نەفت. ئەگەر بۆ وەڵامدانەوی مامۆســتا عادل بوەســتاباما، تۆرەی بیســت کەسم بە پێش دەکەوت. بۆیە بەدەم ڕاکردنەوە دەمگوت: ڕەفیق ، نەفت نەفت. کاتێــک کــە بەرمیلەکانمان لە تۆرەدا دانا، مامۆســتا عادل کامێرای هێناو کەوتە وێنەگرتنــی ئــەو خەڵکە. دوای کەمێک، بوو بەشــەڕێک ســەگ ســاحێبی خۆی نەدەناسیەوە!! بەم شێوەیە بەبێ زیان بەرمیلەکانمان بە بەتاڵی هێنایەوەماڵەوە. ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە: کۆمەڵگای ئێمە، زۆرینەی هەســتی بەم سوکایەتیە نەدەکرد، بۆیە دەســەڵات ڕۆژ بەڕۆژ شــوڵی لێ هەڵکێشــا. هەر ناڕەزایەتیەکت دەردەبڕی بەرامبەر پارتی و یەکێتی، دەیانگوت: ئێوە بۆ شــوکری خوا ناکەن؟ دەتانەوێ شــەڕی ناوخۆ بکەینەوە؟ ئێوە دەبێ مەمنون بن، ئێمە ئەو شــەڕەمان ڕاگرتــوە!! وەک عەرەب گوتەنی: (ئانی مەمنون).

بەداخەوە هیچ پیشــەیەک لەشــوێنی خۆی نەما، خەڵکی نەفس نزمی وا هەبوو، تەنها بەشــان و باڵی بەرپرســەکانی هەڵدەدا و ماستاوی بۆ دەکردن، لەبری هەر ماســتاوێک دوو ســەد مەتر زەوی وەردەگرت، پیشــەی ببــوە زەوی وەرگرتن و فرۆشــتن، هیچ کاســبیەکی تری نەبوو. لەکاتێکدا، گەنجی وا هەیە توانای ســەد مەتر زەوی نییە بیکاتە خانوو، هاوسەرگیری پێک بێنێ. هیچ منداڵە بەرپرسێک نەما، زەوی ئەو خەڵکەی نەدەنێ، منداڵی بەرپرس هەیە لەخوێندنگای سەرەتایی تــا دەگاتــە زانکۆ، مووچــەی خۆی هەبــوە. قوتابی وا هەیە، باوکی بەرپرســی ســەربازیە، لای باوکــی بەپلــەی جۆراوجۆرو بەناوی پاســەوانی تایبەت، مووچە وەردەگرێ و لەخوێندن بەردەوامە، زەوی وەرگرتنیشــی لەولا بوەستێت.

دەشــتی کــوڕم، لەزانکــۆ دەیخوێند، گوایە کوڕە بەرپرســێک بە مامۆســتایەکی زانکۆی گوتوە: با وەرەقەی بەنزینت بۆ بکەم، بچۆ بیست لیتر بەنزین وەربگرە. خزمێکمان چەندین جار مێژوی لەدایکبوونی خۆی گەورە دەکرد، تاوەکو ئیمتیازو بەدەســتهێنانی ئەو شــتانەی کە دەیویســت. دوایی بۆ شــتێکی تر کە دەبوایە تەمەنی بچوک بێ، دەچوو لەدایک بوونی خۆی بە شــێوەیەکی تر دەگۆڕیەوە!!

ئــەو باشــورەیان والێکرد، زۆرجــار وام دەهاتە بەرچاو، وەک کەلاکی ئەســپێکی تۆپیو ئەو هەموو داڵاش و پیسخۆرە هەر بابایە بەشی خۆی لێ ببچڕێ و بیخوا. ڕۆژێــک دەچــووم بۆ چوارقوڕنە، ســەرێکی دایکم بدەم کە لەماڵی ئاســۆی برام

بوو. گەیشتمە پێش فەرمانگەی ناحیەی چوارقوڕنە، قەرەباڵغیەکی زۆری لێبوو. پۆلیسێکی هاتوچۆ، سەرو گوێلاکی شکێندرابوو، پرسیم: ئەوە چ دەقەومێ لێرە؟ گوتیان: ئەو پۆلیسە سەیارەی کوڕی فلان کەسی (فەرماندەیەکی سەربازی بوو، بەناوی (م)، ئەو کوڕە لەدەرەوەی وڵات دەژیا)راگرتوە. پۆلیسەکە هەر وەک هاولاتی ئاسایی، وەک ئێمەی پلە نزم، هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوە، ئەو شازادەیە زۆر توڕەبوە، چۆن دەبێ پۆلیسی ژێر قەڵەمڕەوی باوکی ئەوەندە نەزان بێ؟!! پۆلیس نەزانێت کەوا کوڕی کێیەو کەی گەڕاوەتەوە لەدەرەوەی وڵات؟ بۆیە دارکاری ئەو پۆلیسەیان کردبوو، بەڵام کە باوکی بەو رووداوە دەزانێ، یەکسەر لە پێناوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرەو پێشبردنی وڵات، فەرمان دەدات: هەر هەموو پۆلیسەکانی هاتوچۆ لەچوارقوڕنە دەست بەسەر بکەن و دارکاریان بکەن!!

ئینجا ئەوەی خۆشبوو، کوڕی یەک لە خزمەکانم، دیاربوو زۆر بەو ئازاردانەی پۆلیسەکە نیگەران بوو، بۆیە دەیگوت: دەزانن ئەو پۆلیسە چەند دڵسۆزی یەکێتیە؟ لەکاتی هەڵبژاردندا، دەیان دەنگی ساختەکردوە، ئەوە پاداشتەکەیەتی لەلایەن بەرپرسانی یەکێتی، ئاوا دارکاری بکەن؟!!

لە ٢٠٠٦/٤/٢٢ لەدیار تەلەفزیۆن دانیشتبووم. گوێم لێ بوو: مام جەلال بوو بە سەرۆک کۆمار. فرمێسکی شادومانیم هاتەخوارەوە، پێم سەرکەوتنێکی یەکجار گەورەبوو، بۆ هەر چوارپارچەکەی کوردستان. نەک لەبەر خۆشەویستیم بۆ ئەو بەرێزە، بە هەڵە لێم تێمەگەن، ئەگەر هەر پێشمەرگەیەکی تر بوایە فرمێسکم دەهات. لەخۆشی ئەوەی پێشمەرگەیەکی کورد، دەبێ بە سەرۆک کۆماری عێراق. من لە گۆشەنیگایەکی تایبەت سەیری ئەو سەرکەوتنەم دەکرد، لەبەرئەوەی دڵۆپێک لەبەرهەمی خەباتی منیشی تێدایە.

ئەم نامەیەم لە رۆژنامەی هاوڵاتی بڵاوبوەوە، ئەمە هەموی نییە تەنها ناوەڕۆکی نامەکەیە:

(دوێنێتان لەبیر نەچێ)

نامەیەک لە پێشمەرگەیەکی دێرینەوە بۆ خانمی یەکەمی عێراق، هێرۆخان.

لەبیرتە؟

لەنەورۆزی ١٩٨٩ لە ئۆردوگای دیلێزێ کە بڕیارت دابوو، جەژنی نەورۆز لەلای

ئێمەی پێشـمەرگە و ئاوارەی ئێران بکەی؟ لەیادمە قاتێکی خاکی و کامێرایەک لەسەرشان، من لە تەکت وەستابووم، کە وێنەی ئەو منداڵە چەکمە قوڕاوییانەت دەگـرت، کـەوا لەگوێ سـوانە و سـاپیتەی خانـوەکان هەڵتوتکابـوون، بەدەم هەناسـەیەکەوە فەرمـوت: خۆزگە ڕۆژێک شـتێکمان بۆ ئەو منداڵە چاوگەشـانە پێ بکرابایە و ویژدانمان ئاسـودە بایە. بەڵام بە خۆڕاگری لەهەمبەر ئەو هەموو لێبوردنـی گشـتی و ئیغراکردنـی دیکتاتۆری سـەدام، خۆمان ڕاگـرت. بەژیانی کولەمەرگـی ئەو منداڵە چەکمە قوڕاویانەمان پێگەیاند، ئێسـتا قوتابی زانکۆن، بەڵام زۆرجار ڕووبەڕوی پرسیارێکمان دەکەنەوە کە نازانم چۆن وەڵامیان بدەمەوە. دەڵێن: بابە پێشـمەرگایەتی تۆ جیاوازی چی بوو لەگەڵ پێشـمەرگایەتی باوکی ئەوانەی لەگەڵ ئێمە لەزانکۆن؟ کە باوکیان باڵەخانەی بۆ هەڵچنیون سەر لەناو هەوران، هەر ڕۆژەی بە ئۆتۆمبێلێکی ئاخر مۆدێل و لاپتۆپی دوا مۆدێل و مۆبایل و جلوبەرگی دوا مۆدێل دێن بۆ ناو زانکۆ. لاف و گەزافی ئەوە بەسـەر خەڵکدا لێ دەدەن، کە ڕۆژێک باوکیان پێشـمەرگە بوە، تەنها وەڵامی ئەو پرسـیارەم لە تـۆ دەوێ و هیچی تر، خانمی یەکەمی عێراق؟

پێشمەرگەی دێرین: حازمی عەلی کوتک

بەداخـەوە ئێسـتاش وەڵامـی بەدوو دێـر نوسـراو نەدامەوە. تازە سـاڵێک بوو گەڕابوومـەوە لـە ئێـران، ئەگـەر دەمزانی بارودۆخـی هەرێـم و حوکمڕانی بەم جۆرەیـە، ڕەنگـە بۆ هەتا هەتایە ڕووم لەو مەملەکەتە ئەتک کراوە نەکردبایەوە.

## دەبێت بەها بگەڕێنینەوە بۆ زۆر شت

لەهەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، بە بیرمە هەر کەسێ هەر خێزانێ هەر بنەماڵەیەک، کە تێکەڵاوی سیاسـەت و حیزبایەتی و تێکۆشـان دەبوو، لەریزی هــەر حیزبێک، تەنهـا حیزبی قائیدو حیزبە کارتۆنییەکانی دروسـتکراوی بەعس نەبێ. ئەندامی هەر حیزبێکی دەرەوەی بەعس کە لەهەر شـوێنێک لەناو خەڵک ببینرایـە، ڕێزێکـی تایبەتـی هەبوو، کەسـایەتی جیاوازی هەبـوو لەناو خەڵک،

خۆشەویست بوو، دەیانگوت: ئەوە نیشتمان پەروەرە، خۆنەویستە دەیەوێ ببێتە سوتەمەنی بۆ گەل و نیشتمان. ئەو نیشتمانپەروەریەی ئەوکات جلێکی ئەوەندە پیرۆز بوو، بە باڵای هەموو کەس نەدەبڕا، چونکە نرخی گرانبوو. خەڵک شانازی بە حیزبایەتیەوە دەکرد، کە ئیمتیازبوو، ئەو ئیمتیازە پیرۆزە بەخوێن و ئارەقەو فرمێسک بەدەست دەهات. بەڵام بەداخەوە لەدوای بیست و حەوت ساڵ لە حوکمڕانی پارتی و یەکێتی و هەندێک حیزبۆکەی شاگردتۆغلان، گەورەترین جنێو کە بتەوێ بەیەکێکی بدەی ئەوەیە کە پێی بڵێی: (هەی حیزبی، هەی بەرپرس).

وەک لەپێشەوە باسم کردوە، دەبێ پارێزەر بگرین بۆ ئەوەی کەسایەتی و خۆشەویستی بۆ ئەوانە بگێڕینەوە کە حیزب دزێوی کردون لەبەرچاوی خەڵک، وەک: حیزب، بەرپرس، ڕەنگی زەردو سەوز، سەرپەرشتیار، مودیر، وەزیر، سکرتێر....هتد. بەداخەوە دەچم بۆ هەر فەرمانگەیەک، هەر یانەیەک، هەر زانکۆیەک، هەر قوتابخانەیەک، هەر شارەوانییەک..هتد. کەسی یەکەمی پشت هەر مێزێک، کە دەبینم بەرپرسی دوو کرێکاری شارەوانییەو شەقامەکان پاک دەکەنەوە، هەتا دەگاتە باڵاترین دەسەڵاتی ئەو هەرێمە، جێگای داخە لەگەڵ یەکەم دیدار، بێ ئەوەی لەپێشینەو کەسایەتی ئەو مودیرە شتێک بزانم، یەکسەر وێنەی دزو ماستاوچی و گەندەڵ و حیزبی دێتە بەرچاوم، زۆرجار لەخۆم دەکەومە گومان، دەڵێم: لەوانەیە تووشی نەخۆشی دەروونی بوبم!!

بەڵام کاتێک کەوا دەزانم، حیزب دەستی خستۆتە ناو هەموو کایەکانی ژیانی ئەو کۆمەڵگایە، ناتوانم مودیرم خۆش بوێ، دەبێ کەسایەتی بۆ مودیرەکان بگێڕینەوە. لەکاتی پێشمەرگایەتی، ئەو بەرپرسە سەربازی و مەدەنیانەی کە بەیەکەوە پێشمەرگەبوین، زۆرجاری وا هەبوە بەرپرسی سەربازی لە حیزبێکی تربوە، جیا لە حیزبەکەی من، بەڵام بەدڵ و گیان نزام بۆ کردوە، ئەوکاتانەی لەشەڕێکی خوێناوی دا بوین لەگەڵ ڕژێمی بەعس. پڕبە دڵم گوتومە: منداڵەکانم و بۆ خۆم بە قوربانی ئەو سەرکردەیە بم!! چونکە، پێم وابوو بۆ گەلە ستەم لێکراوەکەم شتێکی لەهەگبەدایە. بەڵام ئێستا شەو و ڕۆژ نزا دەکەم، لەخوا دەپاڕێمەوە، هەر ئەو کەسە خوا بیکاتە پەندی زەمانە، داواکارم گۆڕی لە کوردستان نەبێ، چونکە دەترسم لەژێر خاکیش ستەم لە شەهیدەکان بکات،

قووتیان بخۆن و کردەوەکانیان ببەن.
رۆژانــە ئــازاری ڕۆحی و دەروونی دەدرام، چونکە بەپێی توانای خۆم بە درێژایی ژیانــم قوربانــی زۆرم لەپێنــاوی ســەروەری یاســا و یەکســانی و پێشــکەوتنی کۆمەڵایەتی و وشیاری کۆمەڵگا دابوو. هەستم دەکرد، دەستم لە قوژبنی جەوال دەرچوە، ڕەنج بە خەســاربووم، ڕۆژانە زۆر ئازار دەدرام.
لەبچوکترین نایاســایی و نایەکســانی، هەتــا گەورەترینیــان، دژایەتیم دەکردن.
مــن نامــەوێ دژایەتی ئاینی پیرۆزی ئیســلام بکــەم، کە ئاینــی کۆمەڵگایەکەی خۆمە، بەڵام خۆشــم بە پیاوێکی ئاینی نازانم، بۆیە داوا لە هەموو ئەو بەرێزانە دەکــەم، کــەوا پیاوی ئاینین (وا چاکــە بڵێم کە دینــدارن) بەهەڵە تێم نەگەن، کاتێــک، مزگەوتێکم دەبینی لەســەر ئەو زەویە دروســت دەکــرا، کە بۆ باخچەی ســاوایانی منــداڵان تەرخان کرابوو، یــان بۆ باخچە یان هەر شــتێکیتر، من زۆر پێی دڵتەنگ دەبووم، چونکە دەمزانی زیادەڕەویە لەسەر مافی ئەو منداڵانەی لە ئایندە لەدایک دەبن، بە منداڵی ئەو بەرێزانەشــەوە کە بەناوی ئاین هەڵدەســتان بــەو زیادەڕەویــە. زەوی باخچەی منداڵان داگیردەکەن، ئاخــر ئێمە نەک هەر لە حیزبایەتی و فەرمانڕەوایەتی شکســتمان هێنا، بەڵکو لەڕوی دینداری و ئاینیش ناحاڵین. ئەگەر نا، چۆن داوا دەکەین مزگەوت لەســەر زەوی باخچەی ســاوایانی منــداڵان دروســت بکرێــت؟!! لەکاتێکــدا، مزگەوتێکــی تر، دوو ســەد مەتر لێی دوورە. دەبوایە گەڕەکەکان هەموو خزمەتگوزاریەکی تێدابایە بە مزگەوتیشــەوە.
لەوڵاتێکــدا، کــە لەماڵەکەی خۆت، ســەلاجە و فێنک کــەرەوەت نەبێ، نەتوانی لەهاوینی تاقەت پڕوکێندا، جامێک ئاوی ســارد دەســتەبەر بکەی بۆ خواردنەوە.
بامالەکەت پڕبێ لە پەرتوکی ئاینی، خۆ ئاوت بۆ ســارد ناکەن؟!!
لەســەر گۆی زەوی، هەموو ئاینەکان باســی ڕاســتگۆیی و دەســتپاکی دەکەن.
پێشــەنگی هەموو ئاینەکان خەڵکی خۆنەویست و نمونەی پاکین.
رۆژێــک لەهەولێــر، مەلایــەک چەنــد چەکدارێکــی لەگەڵ بوو، لام ســەیر بوو لە پایتەختی هەرێمی کوردستان، مەلا هەیە هەشت زێرەڤانی بۆ تەرخان کراوە، بۆ ئەوەی ببێتە دەســتکەلای دەســەڵات، ئەگەر نا ئەو مەلایە چ کارێکی بە هەشــت پاســەوان هەیــە؟!! بۆ چەند شــەڕی دەســتەو یەخەی کردوە، چەنــد مۆڵگەی بەعســی بەســەر یەکــدا ڕوخاندوە؟!! دەبــێ نەزانێ ئەو هەمــوو ئیمتیازە بۆ بە

چاوەشــکردنییەتی، بــۆ دەســەڵاتی گەندەڵکاران و پشــتکردن لــە خەڵکی ماف خــوراوو لغاوکردنــی لەئاســت زوڵم و ســتەم ؟!! مەلا (ب) ڕۆژانە لــە مزگەوت، لەگەڵ ووتارەکانی، هۆڕ و هۆڕ خەڵکی سادە و کاڵ فامی دەگریاند، ئێستا بۆتە دەستکەلا و چاوەشی دەسەڵات. پێم سەیرە لەگەڵ لێدانەوەی سیدییە کۆنەکانی چۆن سەد تف لە خۆی ناکات؟!!

دەســەڵاتی کوردی بەتایبەت، پارتی و یەکێتی هیچ شتێکیان نەهێشت بەپیرۆزی بمێنێتەوە، هۆکاری دروستبوونی فکری توندڕەویش هەر سیاسەتی خراپی ئەوان بوو. کەی کەسایەتی و خۆشەویستی بۆ ڕەنگەکان دەگەڕێتەوە؟ چەند ساڵی تر ڕەنگی زەردو ســەوز لەناو خەڵک خۆشەویســتیان بۆ دەگەڕێتەوەو دێنەوە ڕیزی ڕەنگەکانــی تر؟!! ئاخر ئەوانەی کەلوپەلــی ناو ماڵ و جلوبەرگی خۆیان دەکڕن خۆیــان دەپارێــزن لە کڕینی ئەو دووڕەنگە، تەنها دەربارو چاو لەدەســتەو گوێ لــە مشــتی ئــەو دوو حیزبە نەبێ، هەقــە پارێزەر بۆ ئــەو دوو ڕەنگە بگرین، بۆ ئــەوەی ئیعتبارو کەســایەتیان بۆ بگێڕینەوە، ئــەوەش ئەوکاتە دەکرێ دادگاکان سەربەخۆ بن، کە ئێستا نین. ئاخر ویژدانەن ئەو دوو ڕەنگە چیان لە ڕەنگەکانی تــر کەمترە کە خەڵک خۆیان لێی دەپارێــزێ؟!! تەنانەت کاتێک ئەو دوو لایەنە شــوێنێکیان لەیەکتــر دەگرت، ســەراپای شــوێنەکەیان بۆیاغ دەکــرد لە ڕەنگی خۆیــان، لەجیاتی ئاوەدانکردنــەوەو چاککردنەوەی. بۆیاغچیــەکان لەناوخۆیاندا خواخوایان بوو شوێن لەیەکتری بگرن، چونکە بازاڕی ئەوان گەرم دەبوو. هاوکات هــەر لــە ڕقی یەکتر ناو و زمان و وشەکانیشــیان گــۆڕی، وەک: ژن=ئافرەت... قوتابی=خوێندکار. ئەو ناوانەی بەلای ئەوان پیرۆزبوو دەستکاریان نەکرد، وەک : پــارە، دەســەڵات، قەڵەمڕەو، دێگەڵە، نــەوت، غاز، پشــک، برابەش. زۆریان هەوڵــدا ناوی پەنجابە پەنجا بگۆڕن، بەڵام کردیان بە (فیفتی، فیفتی). هەندێک دەســتەواژەی بازرگانیــان هێنا ناو کایەی سیاســەت، بەدرێژایــی ژیانم گوێم لێ نەبیوو، وەک: شــەڕاکەت، ســازان، پشکی شێر، برابەش، بەشــمان لەداهات... هتد، چونکە ئامانجی ســتراتیژی و تاکتیکیان هەر دابەشــکردن بوو، بۆیە دەڵێ: (المعنا فی القلب الشاعر)

دەشــتی کــوڕم، لە کۆتا ســاڵی زانکۆی بــوو، لە زانکۆی کۆیــە. من و دایکی و کچەکەم چووین بۆ کۆیە، بۆ بەشــداری مەراســیمی دەرچوونەکەی. دەشتی، هەر

چـوار سـاڵەکە لە زانکۆی کۆیــە، یەکەم بوو. لەکابینەی دکتۆر بەرهەم سـاڵح، چەنـد خوێندکارێکـی زیرەکیان لەژێر ناوی توانا سـازی ڕەوانەی بەریتانیا کرد، ئەویـش یەکێـک لەو خوێندکارانەبوو. ماجسـتێری بە پلــەی زۆر باش وەرگرت. ئــەوکات چـل هــەزار دۆلاریــان لێ خەرج کــرد. کە گەڕایــەوە، لەکۆیــە بوو بە مامۆسـتای زانکۆ، هەموو جارێ دەمگوت: دەشـتی، دەزانی ئەو پارەیەی لە تۆ ســەرف کــراوە، پارەی ئــەو خوێندکارانەی زانکۆیە کە وانەیــان پێ دەڵێی؟ من قەت گەردنت ئازاد ناکەم، ئەگەر زۆر بەجوانی وانەیان پێ نەڵێی. لەکاتێکدا تۆ بــە پارەی ئەوانە ماجسـتێرت لە بەریتانیا وەرگرتوە. ئەوەی ڕاسـتی بێ، چوار ساڵ لە زانکۆی کۆیە، بە شایەتی مامۆستاو خوێندکارەکانی، بە جوانترین شێوە وانەکانــی گوتۆتــەوە. جێ دەســتی دیاربــوو، کاتێک کە مووچە کــرا بەچارەگە مووچــە، چەنــد مانگێک دەچوو بــۆ زانکۆ، خەرجــی ئۆتۆمبێلەکــەی و جێگای حەوانەوەی دەرنەدەهێنا. بەناچاری بەجێی هێشــت.

من بە گومانم لەدەسەڵاتی کوردی، دەیانەوێ خەڵک نەخوێندەوار بێت. منداڵە بەرپرسەکان لە باشترین زانکۆو خوێندنگاکان بخوێنن، بۆ ئەوەی لەدوای خۆیان کوڕەکانیان فەرمانڕەوایی کوردسـتان بکەن. کوڕی هەژاران باگڕاوندی زانستیان نەبێ، لەکاتێکدا کوڕی خزمەکانم یان سەرەتاییان تەواو کردوە، یان نەخوێندەوار بوون. پاسـەوانی بارەگا حیزبیەکان و پێش دەرگای بەرپرسـەکان بوون، سـێ بەرابــەری دەشــتی مووچەیــان وەردەگرت. ئاخر مــن لەخۆڕایی نەبــوە دەڵێم: حکومەتە نەخوێندەوارەکەی خۆمان.

## ئیشکردن لەسەر لەتوپەتکردنی کۆمەڵگا لەڕێگای تیرەو هۆزەکان

ڕێزی تایبەتیم بۆ ئەو ئاغاو ســەرۆک عەشــیرەت و سەرۆک خێڵ و بەگ و هەموو ئەو کەسـایەتیانە هەیە، کە لەســەنگەری گەلی خۆیان بوون وهەن، کەتاوەکوو ئێسـتا نەبوونەتە نۆکەری بێگانەو داگیرکەران و ئامرازی دەستی دەسەڵاتدارانی هەرێــم. بۆ بەکارهێنانیان لــەدژی یەکتر، بە وڵاتپارێــزی ماونەتەوە. بەداخەوە،

لە حەفتاکانی سـەدەی ڕابردوو، بە تێکۆشـانی زۆر لەکەسایەتیەکانی ناو کایەی سیاسـی، هەتا دەهات، عەشـیرەت و تیرەو خێڵ، بـەرەو کاڵ بوونەوە دەچوو. زۆر لە ئێسـتا لەپێشـتربوو، بەڵام ئێسـتا لە سایەی دەسـەڵاتی دوو حیزبەکەی کوردسـتان، گەڕاوینەتـەوە دواوە. لـەدوای ڕاپەڕیـن، کار لەسـەر دابەشـکاری کۆمەڵگای کوردی کرا. هەر حیزبەی بەجیا، فیسـتڤاڵی بۆ عەشـیرەتەکان سـاز دەکـرد، بـۆ بەکارهێنانیـان لـەدژی یەکتر، ئـەوەش ئامانجێکی نا شـەریفانەی تێدابوو. کەلتووری هۆز، زۆر شتی مرۆڤ دۆستانەو ڕاستگۆیانەی تێدایە، وەک: ڕاسـتگۆیی، پەیمان، هاوکاری، مل کەچ نەکـردن و نەچەمانەوە بۆ داگیرکەران، داڵدەدانـی لـێ قەوماوان، خۆشەویسـتی خاکی کوردسـتان، نـان دەری و دیل نەکوشتن..هتد. بەداخەوە، نەهاتن پەرە بەو نەریت و تایبەتمەندیانەی عەشیرەت بـدەن. بەڵکو هاتن هەمویان لەگێشـکەو سـەرەندو بێژینـگ دان، بۆ داماڵینیان لـەو بەها مرۆڤدۆسـتانەو بەنرخانەی ناو کۆمەڵگای کـوردی و گەمژەکردنیان بۆ حیزب، داماڵینیان لەبەها پیرۆزەکانی ناو عەشـیرەت.

خۆزگـە خێڵێکـی وڵاتپارێـزو پڕ لە بەها جوانەکانی ناو خێڵ و عەشـیرەت بان، بەڵام ئەوان تەنها شـتە نا سـەردەمیەکانی ناو خێڵیان بە بنەما وەرگرت. لەناو خێڵ و عەشیرەت، دیل کوشتن نییە، بۆیە گوناهە ئەمانە بەخێڵ بەراورد بکەین. نەهاتن دوو خولی ڕۆشـنبیری بۆ گەنجان بکەنەوە، ئەوەندەی ئیشـیان لەسـەر فیسـتڤاڵی عەشـیرەتەکان کرد، کاریان بۆ فەرهەنگی تازە نەکرد. زۆر لەسەرۆک عەشـیرەتەکانی کە سـەرۆک جاشـی ڕژێم بوون لە زەمەنی سـەدام و بەعس و بەشـداری ئەنفالی کردبوو، بە دیکۆمێنت و بەڵگە لەوکاتی نۆکەری بەعس بوو، قەت هێندەی ئێستا بەدەسەڵات و سودمەند نەبوە، بۆ نمونە: خاوەنی تێکستی ( زێڕە، سـەرۆکمان زێڕە )، کە لە پێشـمەرگایەتی دوو کاتژمێر پاسـەوانیمان بە داڵغەی ئەوە تەواو دەکرد، کە دەبێ ڕۆژێک ئەو خۆفرۆشـە بکەوێتە دەسـتمان، بۆ ئەوەی بە سـزای گەلی بگەیەنین. بەڵام ئێسـتا لەژێر فەرمانڕەوایەتی پارتی لەهەولێر، بە لیوا خانەنشـین کراوەو پەروەردەی کادیرانی پارتی دەکات.

لەهەمـان کات ئێمـە پێنـج برا پێشـمەرگەی دانەبـڕاو، دوو برای شـەهید، دوو مامی شـەهید، یەک ئامۆزای ئەنفال، سـێ ئامۆزای پێشمەرگەی دانەبڕاو، بەهەر هەموومـان ئیمتیازو مووچەی ئەو زاتەمان نییە!!

جێـگای داخە لەکاتێکـدا داهێنانی دەسـتەواژەی بندیـوار و دیوەخانانە، هێنرا نـاو کایەی سیاسـی، لەلایەن حیزبێکی بەنـاو دیموکرات و حیزبێکی سۆسـیال دیموکـرات. بـەڵام ئەوانەی کە ئـەو ئیمتیازانە دەیانگرێتـەوە. ئەوانە بوون، کە نۆکـەرو چڵکاوخـۆری بەعـس بـوون، ئەو دیوەخانانەبوون کە شـەوانە سـەری شـوانێکی کـوردی بێ تاوانی تێدا بەدیاری دەدرا ڕەفیـق حیزبیەکان و دائیرەی ئەمنی بەدناو. یان پیلانی ئەوەی تێدا دادەندرا، کە کەمینی ئەو شەویان لەکوێ دابنێـن بۆ مەفرەزەکانی پێشـمەرگە و لەکوێ زیاترین جەنازەی پێشـمەرگەیان دەسـت دەکەوێ. بەیانی بەدەست و دیاری بگەڕێنەوە لای ئاغاکانیان.

لەکاتێکـدا تەمەنـای ئەوەمـان دەکرد، کە ئەو دیوەخانانە بۆ ئـەوماڵانە بکرایە کە لەدەشـتی کۆیە و بەسـتی شـەرغەو دۆڵی مەلەکان و ناوچەی خۆشـناوەتی و هەمـوو گوندەکانـی کە لەبن پێی پێشـمەرگە، نانی بـە تەنیایان نەدەخوارد، وەک: وەرتێ، بالیسـان، نێرەگین، بەلەبان، سـماقولیەکان و هەموو گوندەکانی کوردسـتان، ببرێتـەوە. ئـەو دیوەخانانە شـایانی ئەوان بوو، بـەڵام بەداخەوە پێچەوانـە بـوەوە، دەبێ کەسـایەتی و ڕێز بـۆ دیوەخان بگێڕینـەوە، وەک ئەو هەموو شتانەی حیزب ناشیرینی کردن.

کـەم ئەندامان چووبوونە پێـش ئەنجومەنی وەزیران، بۆ داواکاری مووچەکانیان، داوای عارەبانەی کەم ئەندامیان کردبوو. سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، هەر بـۆ ئـەوەی ڕۆژی دوایی چـاوی بە کەم ئەندامەکان نەکـەوێ. پێش ئەوەی دنیا ڕوونـاک دابێت، تاقمێک ویژدان مردوو هەر هەموویان بارکردن لەدەرەوەی شـار، وەک خاشـاک فڕێیانـدان. لەوکاتـەدا مافی مـرۆڤ، ویژدان، غیـرەت، کەرامەت لەخەوێکی قوڵدا بوو.

## یادکردنەوەی داستانی هەندرێن

لەمانگی ٢٠٠٨/٥ کاتێک سەیری تیڤیەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانم دەکرد، یادی شەڕە گەورەکەی داستانی هەندرێنی دەکردەوە. من زۆرجار لەکاتی گەنجیم کە شـیوعی بووم، لەگەڵ برادەرانی پارتی، گفتووگۆ دروسـت دەبوو، خۆمان بە

داســتانی هەندرێن هەڵدەدایەوە و بێدەنگمان دەکردن.
کــە چیــای هەندرێن لەلایــەن حکومەت داگیر دەکرێ، شــیوعیەکان لەوێ بوون. خوالێخۆشــبوو مەلا مســتەفا، دەڵێ: شــیوعیەکان چۆنیان تەســلیم کرد، دەبێ ئــاواش بیگرنــەوە. بۆیە فاخیری حەمەد ئاغا و، ملازم یونس و، زراری ســلێمان بــەگ و، ڕەئیــس کەمال و، مــلازم خدرو، مام ئەلیاس و، مســتەفا چاورەش و، زۆرانــی تــر، کــە ژمارەیان شەســت خۆبەخش بــوە. هیمەت دەکــەن، هەندرێن دەســتێننەوە، هێزەکانی حکومــەت هەتا کاولۆکان ڕاودەنێن. ئەو داســتانە بوە هــۆکاری ئەوەی، ڕژێــم بێتە ژێرباری گفتوگۆ. بەڵام لــە تیفیەکانی پارتی، وەک ئەوان ئەو داستانەیان تۆمارکردبێ بەسەرپەرشتی کاک فڵان بوە، کە لەکۆسپەی ســپی نەچۆتە خوار، نەک لەچیای هەندرێن. بەراســتی شێواندنی مێژوو کارێکی زۆر بێ ویژدانانەیە، ئەوەبوە هۆی نارەزایەتی شیوعیە بەتەمەنەکان دەیان گوت: دەبێ حیزبی شــیوعی کوردستان ئەو داستانەی بەچەند فرۆشتبێتە پارتی؟!!
پاســۆک وتەیەکــی گەورەی هەیــە، دەڵێ: (ئەگەر شۆڕشــکردن گرانە، خیانەت نەکردن ئاســانە). ئێســتا پارتی ئەو وتەیەشــی دەســت بەســەردا گرتوە، بۆیە بــە ئەرکی ئەخلاقی و ویژدانی خۆم زانیوە کە ئەو شــەڕو داســتانانەی خۆشــم لەگەڵ نەبووم، بەناوی بەشــداربوەکان بیانوســم، بۆ ئەوەی لە فرۆشتن و دەست بەســەرداگرتن بیانپارێزین!! ئەوەش لایەنی کەمی وەفاداریە بۆ شەهیدەکان.

ماوەیەک بوو، کاک مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێم دیار نەمابوو، جگە لە چەند کەسێک کە زۆر نزیک بوون لێی، کەسی تر نەیدەزانی لەکوێیە. چونکە نە کلیلی تەلاری سەرۆکایەتی هەرێم و، نە مۆرەکەشی، بۆ جێگرەکەی (کە کاک کۆسرەت بــوو) بەجــێ نەهێشــتبوو. وە لــەدوای خۆی کەس بــۆی نەبوو لە شــوێنەکەی دابنیشــێ و کاری هاوڵاتی و دەوڵەتداری بەرێبکات. دەتوانم بڵێم جێگرەکەشــی تاوەکو ئێســتا ئەو تەلارە پێ نازانێ. بۆ سەفەرەکەشــی جێگرەکەی وەکو ئێمە، بێ خەبەر بوو. مقۆ مقۆ لەناو خەڵک پەیدا بوو، هەندێک دەیانگوت: لەدەرەوەی وڵات دەورەی هەیە، هەندێک هەر هەڕەمەکی شــتێکیان دەگوت. دوای مانگێک، ئینجــا زانــدرا کە چۆتە نەمســا بۆ پڕکردنەوەی یــەک دوو ددانی. من زۆر لەلام

سەیر بوو. ئاخر لە ئێران، ئەحمەدی نەژاد هەر لە تاران عیلاجی نەخۆشیەکانی خۆی دەکرد، هەمان حەب و دەرزی کۆگاو دەرمانخانەکانی ئێرانی بەکاردەهێنا، ئاخر ئەوە چۆن حوکمڕانیەکە لەماوەی بیست و حەوت ساڵ، نەتوانێ دکتۆرێک پــەروەردە بکەیــت، بتوانێ یــەک دوو ددانی ئەو بەڕێزە پــڕ بکاتەوە!! دەبێ لە نەمسا چیمان پێ وترا بێ، کە کاتی خۆی لە ئەڵمانیا چیان بە حسنی موبارەک گوتوە هەر ئەوەشــیان بە ئەو گوتوە.

# گوناهم چییە خودا بە گێل دروستی نەکردوم

ئێســتا کــە ئــەو چەند لاپــەڕەی دوایی بۆ کتێبەکەم دەنوســم، تــا ئەندازەیەک خــۆم بەندکــردوە، بۆ ئــەوەی نەچمە ناو خەڵک. چیتر ئەو نا یەکســانی و زوڵم و ســوکایەتیە بە هاوڵاتیان نەبینم، لەلایەن دەســەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان.
لەو چەند ڕۆژەی دوایی، چووم مووچەی کەمئەندامی هۆشــەنگی کوڕم وەربگرم، کەلە ســەدو پەنجا هەزار دینارەوە کەمکراوەتەوە بۆ شەســت هەزار دینار. ئەو کوڕەم تەمەنی (٣٥) سی و پێنج ساڵە، هەر لە زگماکی هۆش و جەستەی تەواو نییە، شەلەل دەماغە.
لەبەر پەنجەرە، لەبەر ئەو سورە تاوە، وەک هەموو سوکایەتی و بەکەم زانینی هاوڵاتی لەلایەن دەسەڵاتدارانی هەرێم، ئەو خەڵکە هەژارە وەستابوو. وەک ڕازی بوونێــک بەو پلە نزمیەی کە بەســەریان داســەپابوو، ئێمەی پلــە نزم، لە نۆرە وەســتابوین. لەدەرەوە، هەرکێی کەســێکی لەو کارمەندانەی ژوورەوە دەناســی، دەچوە ژوورەوە مووچەکەی وەردەگرت. هەتا یەک لەدەرەوە لەنۆرەی مووچەکەی وەردەگرت، زیاتر لە دە کەس لەژوورەوە نۆرەی دەبڕی و مووچەی وەردەگرت!! مــن نــۆرەم نزیک کەوتبــوەوە، نزیک پەنجەرەکــە ببووم، بەڵام لەبــەر ئەوانەی ژوورەوە خۆیان ڕاپێش دەکردو کارمەندەکانیان دەناســی، من هەر وەســتابووم.
پیاوێک لەژوورەوە شوناسنامەی دا کارمەندەکە، من کۆنترۆڵم لەدەستدا، هەستم بە سوکایەتی کرد، گوتم: کاکە دەمێکە نۆرەی منە، تۆ بۆچی وەک ئێمە نایەیتە دەرەوە، نۆرەی بگری؟

شـەرم لـە ئێمە ناکەی؟ هـەر وەڵامی نەدامـەوە، وەک حکومەتەکەی خۆی. کە هاوڵاتـی ڕۆژ تـا ئێـوارە نارەزایەتی دەردەبری، ئەو گوێی لـێ ناگرێ. ئینجا بە ناچـاری بـە کارمەندەکـەم گوت: ئەگەر ئەو کەسـە لە پێش مـن وەربگرێ ئەو هەمـوو گاشـە بەردە لەو پەنجـەرە دەدەم، بەهیچ شـێوەیەک قبوڵ ناکەم، ئەو هەمـوو سـوکایەتیەم پـێ بکرێ. ئەویش گوتـی: کاکە تۆ لەجیاتـی ئەو هەموو خەڵکە بۆ خۆت پیاو خراپ دەکەی؟!! تۆ لەو خەڵکە زیاتری؟ منیش زۆر توڕە بووم، گوتم: گوناهم چیە خودا بە گێل دروسـتی نەکردوم، بۆ ئەوەی هەسـت بە چەوسانەوە نەکەم. گوتی: کاکە بۆ ئەو خەڵکە هەموو گێلە؟ گوتم: هەر کەسێک هەست بە سوکایەتی نەکات، لە گێل زیاتر شایانی چیە؟! ئەگەر هەستیش بکات و بێ دەنگ بێ، دەبێ ئەوکات پێی بڵێی: ترسنۆک و بێ کەڵک. هەربە خێرایی گوتی: کوا ناسـنامەکەت؟ گوتم: دەمێکە لەبەردەمتە و خوێندراوەتەوە. بەپەلە مووچەکەی دامێ.

ڕووم لەخەڵکەکـە کـرد، گوتم: ئێوەش وەک ئەوان تاوانبـارن، ئەوە بێ دەنگی ئێوەیـە ئـەو زاڵمانـە حوکمان لەسـەر دەکەن. بـێ دەنگی تاوانـە. ڕازی بوون بەمەڕایەتـی ئێمە، ئەوان دەکات بە گورگ.

# ئەو ئۆخەیەی زۆری ئازاردام

هاوینـی ٢٠٠٨ تازە ببوومە خاوەنی خانوی سـەر کۆنکرێت، لەدەسـتی باگردێن و نایلـۆن، ڕزگارم ببـوو. باگردێـن و نایلۆن هەمـوو تەمەنمیـان لەگەڵ خۆیان لولـدا. کوڕەکانـم لە زانکۆ دەیانخوێند، دەشـتی لە زانکـۆی کۆیە و هەڵمەت لە زانکـۆی سـەلاحەدین لەهەولێر، بەراسـتی مـن نزیکەی نیو سـەدەبوو بە ئاوات بووم، خانوەکی سـەرکۆنکرێتم هەبێ، شـەو هەڵنەستم بۆ باگردێن گێڕان یان لە شلێپەی نایلۆن دڕانی سەربان خەبەرم بێتەوە. ئەوەی زۆر ئازاری دام کە هەرگیز لەیادم ناچێ، ئەوەبوو: هەڵمەت لەزانکۆ هاتبوەوە بۆ ماڵ، زۆر چاشمیش ببوو، کەسـەیری نـاو خانوەکەی دەکـرد، دیاربوو ئەویش زۆر بە ئـاوات بوو کە ماڵی

خۆمان لەناو خانویەکی ئاوا ببینێ. لەیادمە هەڵمەت، دەستی دەشوشت لەسەر (مەغسەل) دەستشۆر، ئاگای لە من نەبوو، لەپشتی وەستابووم، گوتی: ئۆخەی من لەماڵی خۆمان دەستم لە مەغسەل دەشۆم!! ئەوەی ڕاستی بێ ئەو ئۆخژنەی هەڵمەت زۆری ئێشاندم، ئێستاش دەم کولێنێتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٨ سەردەمی تەکنەلۆژیا و پێشکەوتن ئۆخە بە مەغسەل بخوازێ. بەڵام من خۆم بەهۆکاری ئەوە دەزانی کە منداڵەکانم ئاوا لە ڕوی ژیانەوە لەپاش خەڵک بن.

## ئەبوو هورەیرە

لە ڕانیە برادەرێکم بینی لەگەڕەکێکی ڕانییە دەژیا. مەلایەک لە ئێران لەگەڵ ئێمە بوو، لەدوای گەڕانەوەمان لەمزگەوتی هەمان گەڕەکی ئەو برادەرە، ببوە مەلاو(خەتیب) وتاربێژ، منیش لێم پرسی: مەلاکەتان فلان کەسە؟ گوتی: بەڵێ بۆ خزمەتە؟ گوتم: نەخێر، بەڵام دەیناسم، وتارەکانی چۆنە، بەدڵتە؟ گوتی: کاکە، ئەوەندەی باسی ئەبو هورەیرە بۆکردوین، ئێستا ئەبو هورەیرە لە بازاڕی حاجیاوە ببینم، قەسەم بەخوای دەیناسمەوە.

## ئەنفالی شەنگال

هێرشی داعش بۆ شەنگال، لەڕۆژی ٢٠١٤/٨/٣، دەتوانم بڵێم: هیچی لە ژان و سۆی بۆردومانی هەڵەبجە کەمتر نەبوو. لە کاتێکدا نۆ هەزار چەکداری پارتی لە شەنگال بوون، چەکدارەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لەعێراق و شام هێرشیان کرد، کەچی پارتی تفەنگێکی نەتەقاند، چەکدارێکی نەکوژرا، چەکدارێکی بریندارنەبوو. ئەوەبوو ئەو برا ئێزدیانەی بەو هێزە نەگریسە دژە مرۆڤە سپارد، هەندێک

لەعەرەبەکانی دەوروبەری شـــەنگال هاوکاری داعشیان کرد. ئێزیدیەکان بەچەکی سوکی خۆیان هەندێک تەقەیان کرد، بەڵام زۆر نابەرابەر بوو. هەندێکیان لەلایەن چەکدارەکانی پارتی لەگەڵ هەڵاتنیان تفەنگەکانیان لە ئێزیدیەکان ستاند، ئەوەی ڕاســتی بێ ئەو بەدەســتەوەدانە زیاتر بە ڕێکەوتنی ژێر بەژێر دەچوو، ئەگەر نا، چۆن نۆ هەزار چەکداری پارتی نەتوانێ نۆ کاتژمێر شەڕ بکات؟!! هەر هەمویان بەو خەندەکەدا هەڵاتن بۆ ڕۆژئاوای کوردســتان، کە ماوەیەک پێش شــەڕەکە بۆ خنکاندنی ڕۆژئاوا لێیان دابوو. بەرۆژئاوای کوردســتان خۆیان گەیاندەوە دهۆک، بەهەزاران ژن و منداڵ زیندەبەچاڵ کران و کڕان و فرۆشــران.

وڵاتە عەرەبیەکان بوونە بازاڕی کڕین و فرۆشتنی کچ و ژنی کوردی ئێزیدی. ئەو هێــزە دڕندەیەی داعش جیاوازی بەهیچ کــەس نەدەکرد. تەنها ئامانجی تۆقاندن و زیادکردنــی ژمــارەی کوژراوەکان بوو. لەوکاتەدا لە موســڵ بیســت و هەشــت کــەس کە لە قونســوڵخانەی تورکیا بوون، لە ڕاســتیدا، میتــی تورکی بوون بۆ هــاوکاری داعش و جینۆســایدکردنی برا ئێزیدیەکان لــەوێ بوون. کە کارەکەیان تــەواو بــوو، داعــش بەڕێیکردنەوە بــۆ تورکیا. لــە بیرمە ئەردۆغــان گوتی: بە ئۆپەراسیۆنێکی کۆماندۆیی ڕزگارمان کردن. بەڕاستی درۆیەکی زۆر بێ شەرمانە بــوو. بەداخەوە تەلەفزیۆنی حیزبەکان وەک توتی درۆیەکانی ئەردۆغانی دووبارە دەکردەوە، کە دەبوو وەک خۆی ورد.. ورد، باســی کارەســاتی شەنگال و میتی تورکی بکات. لەو ڕۆژەدا خوشــک و برا ئێزیدیەکان بەرەو چیای شــەنگال ملیان نــا، داعــش بەدوایاندا بــێ بەزەییانە قڕچ و بــڕی دەکردن. لەوکاتــەدا، دوازدە گەریــلای پەکەکــە لەچیای شــەنگال بوون، بەڵام دوو گەریلا لەلایەن ئاسایشــی پارتی دەســتگیرکرابوون، ئەگەرنا زیاتــر خەڵکی ئێزیدیان ڕزگار دەکرد، ئەو دە گەریلایــەی مابوونەوە، ئــەو خەڵکەیــان ڕزگارکرد، بەکردنــەوەی کۆریدۆرێک و شــەڕکردن لەگــەڵ داعش کە لەکردنەوەی ئەو ڕێگایــە، گەریلای پەکەکە فیدایی گەلــی کورد (گەنجۆ) شــەهیدبوو. لەهەمانکاتدا یەپەگەو یەپەژە، بە پاڵپشــتی گەلی ڕۆژئاوای کوردســتان، توانیان ئەو خەڵکەی بە کامیۆن و ئۆتۆمبێلەکانیان بۆ ڕۆژئاوای کوردستان بگوێزنەوە. لەرۆژئاوا، کەمپی نەورۆزیان بۆ کردنەوە. ئەو ڕۆژە ڕەشەی مێژوی گەلەکەمان، قەت لە میمۆری مێشکی هیچ کوردێکی خاوەن ویــژدان ناســڕێتەوە. تەنهــا لەڕوی ژمــارە جیاوازی هەبوو لەگــەڵ کۆمەڵکوژی

ئەرمەنەکان، ئەگەر نا هەمان کۆمەڵکوژی ئەرمەنەکان بەسەر خەڵکی شەنگال و برا ئێزدیەکان دا هات و هەمان زیهنییەت و میراتگری عوسـمانییەکان ئەنجامیان دا. بەداخـەوە لـەدوای داگیرکردنی موسـڵ و سـێ یەکی خاکی عێـراق لەلایەن داعش و ئەو کوشتارە وەحشیگەریەی لە سوپای سپایکەر، سەرۆکی ئەو کاتەی هەرێم کاک مەسعود بارزانی لە وتارێکی بەپەلەی گوتی: ئێستا ئێمە هیچ شتێک بە دەوڵەتی عێراق و بەغدامان نابەسـتێتەوە، جیرانێکی ترمان هەیە (مەبەستی دەوڵەتی ئیسـلامی لە عێراق و شـام (داعش)بوو)، ئەوە وەک دانپێدانان بوو بە داعش. گوتی: مادەی سـەد و چل جێبەجێ بوو، ئەو مادەیە کۆتایی هات.

لەکاتێکـدا کە چەند شـەڕڤانێکی ڕۆژئاوا خەریکی گواسـتنەوەی خوشـک و برا ئێزیدیـەکان بـوون، بـە ئۆتۆمبێلەکانیـان بۆ ڕۆژئـاوا. کە یەک لە شـێخەکانی بـرا ئێزیدیەکانیـان لەگەڵ بوو. ئـەو ڕێگایە هەموی ببوە خۆلەپـۆت، لەناو ئەو خۆلەپۆتەو لەبەر ئەو گەرمایە تاقەت پڕوکێنە، شتێک بەدی دەکەن دەجولێتەوە. شـەڕڤانەکان ئۆتۆمبێلەکە ڕادەگرن، خۆڵەکەی لێ دەتەکێنن دەبینن، منداڵێکی تەمـەن حەوت سـاڵانە. دەیگەیێنـە نەخۆشـخانەی دێرکا حەمکـۆ، دکتۆرەکان گوتیان: ئەگەر زیندوش بمێنێ بینایی چاوەکانی لەدەسـت دەدا، لەبەر تینوێتی و تیشکی خۆر، بەداخەوە دوای چەند ڕۆژێک گیانی لەدەستدا. باجی کوردبوون و ئێزیدبوونـی دا، مـن زۆرجار دەڵێم: خۆزگـە لایەنە پەیوەندیدارەکان ئەو ڕۆژە لەهەر چوارپارچەی کوردسـتان بکەنە ڕۆژی ئاو، لەو ڕۆژە کەس پێش دەرگا و ئۆتۆمبێل نەشـواو ئاو بەفیرۆنەدا، بۆ ئەوەی دنیا و مرۆڤایەتی بزانن، لەسەدەی بیسـت و یەک، منداڵە کوردێک لە تینوان خنکا. وە بەمجۆرەش ئەم هەواڵە لە میدیاکان ڕوماڵ کرا (دایک و باوکی هێمای جینۆسـایدی ئێزیدییەکان دۆزرانەوە، دایـک و باوکـی منداڵە بێ ناونیشـانە ئێزیدییەکە، کە بوە هێمای جینۆسـایدی ئێزیدییەکان، پاش مردنی ئاشکرا بوو، کەناڵی (بی.بی.سی) ئاشکرای کرد، ئەو کوڕە حەوت سـاڵانە ئێزیدیەی کە بەهۆی برسـێتی و تینویەتی و گەرمای چیای شـەنگالەوە هەردوو چاوی لەدەسـتدا و دوو ڕۆژ پێش ئێستا لە نەخۆشخانەیەکی ڕۆژئاوای کوردسـتان گیانی سـپارد. چوار کاتژمێر دوای مردنی، باوکی گەیشـتۆتە ڕۆژئاوای کوردستان.

دوای ئاشـکرابوونی باوکی، دەرکەوت منداڵە بێ ناونیشـانەکە ناوی (عەزین)بوە و ناوی باوکی منداڵەکەش جەلال بەدرۆ، بەدەم هەنسـکی گریانەوە بە (بی.بی.سی)

ڕاگەیانـدوە لەکاتـی هاتنـی داعش خۆی و هاوسـەرەکەی و چـوار منداڵەکەیان ڕایانکـردوە بـەرە و چیای شـەنگال، بـەڵام بەهۆی ئەوەی عەزیـز ئیفلیج بوە و توانـای هەڵگرتنیان نەبوە، کەوتونەتە بـەردەم بڕیارێکی قوڕس بۆ ڕزگارکردنی خۆیان و سـێ منداڵەکەی تریان، ناچار بوون بەجێی بێڵن. پاش ئەوەی وێنەی لە کەناڵەکانەوە بڵاوکرایەوە بەرە و ڕۆژئاوای کوردسـتان بەرێکەوتوە بۆ ئەوەی بیهێنێتەوە بەڵام بەر لە گەیشـتنی عەزیز گیانی سپاردوە).

لەپرۆسـەی بەدنـاوی ئەنفالیـش، کچێکـی منداڵی کورد بۆ خەیـار دەگرێ، کە کاک عارف قوربانی لە کتێبەکەی باسـی دەکا، دایکی پارچە نەعلێکی سـەوزی بـۆ دەبڕێ و دەیداتە دەسـتی دەیجوێ، هەتا دەمـرێ هەر داوای خەیار دەکات، خۆزگـە ڕۆژێـک هیچ کوردێـک خەیـاری نەخواردبایە، بۆ بەزیندوو هێشـتنەوەو لەبیرنەکردنی ئەو کچۆڵە کوردە.

## فۆرمی بایەعی

هەشـت سـاڵ دەبوو هەڵمەتی کوڕم زانکـۆی تەواو کردبوو، لەبەشـی بایەلۆژی بەنمرەی زۆر چاک. سـاڵی ٢٠١٥ چەندسـاڵ بوو لەهەولێـر کاری دیزاینی کتێب و لۆگـۆ و ڕیکلامـی دەکـرد. هەموو سـاڵێک فۆڕمی دامەزرانـدن و داواکاری بۆ دامەزراندن، پڕ دەکردەوە. بەڵام هەموو جارێ پێیان دەگوت: تۆ فۆڕمی بایەعیت ڕانییەیە، بۆیە ناتوانین داتبمەزرێنین. منیش دەمگوت: کوڕم، تۆ نازانی حوکمی ئەوەی کە فۆڕمت ڕانییەبێ چەندە؟!!

ڕۆژێک هەڵمەت گوتی: بابە، بەرپرسـی نەخۆشـخانەی مێرگەسۆر، لەسەر خەتی تەلەفۆنەکەمە، قسـەی لەگەڵ بکە، (دەیویسـت لەوێ دابمەزرێ، چونکە کەس نەدەچوو بۆ ئەو شـوێنە دوورە)، من قسـەم لەگەڵ کرد، گوتم: زۆرم پێخۆشـە کوڕەکـەم لەو شـوێنە دوورە دەسـتە خزمەت بـە خەڵک بکات، دوایـی هاتینە سـەر ئەوەی گوتم: مووچەکەی چەندە؟ گوتی: سـێ سەد هەزار دینارە. گوتم: بڕوانامـەی بەکالۆریۆس بەو پارەیـە، کەم نییە؟ گوتی: مانگی پازدە ڕۆژ دەوام

دەکات. منیــش زۆر لــەو جۆرە دەوامانە بێزارم، هەتا لە پێشــمەرگایەتیش، ئەو جۆرە لەدەوام کردن گاڵتەکردنە بە پیشــەو دەوام.
قەت باوەڕ ناکەم لەهیچ وڵاتێکی سەر ئەو گۆی زەویە ئەو جۆرە لە دەوام هەبێ، ئەو داهێنانە هەر لەو ســەرکردەو کاربەدەســتانەی هەرێم دەوەشــێتەوە، زۆری لێ پەســت بــووم، گوتم:کاکە بۆ ئێوە لەلای (ز.خ) یــان (ن.ع) دەیکەن بە بن دیوار، (دوو بەرپرســی ســەربازی پارتی و یەکێتین) گوتی: مام بندیواری چی و چ دبێــژی؟ بەو جۆرە خوا حافیزیم لێکرد.

# کۆبانێ..کەرامەت و مێژوو، بەرگری و وەرچەرخان

موتربەکردنــەوەی ڕوحیەتــی خاکپارێزی و کوردبوون، لەناخی تاکی تێکشــکاوی کورد، لە بەرگری کۆبانێ، لەگەرمەی شەڕی بەرگریکردن لە کۆبانێ، کە پێم وایە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لەمێژوی کوردان. لەســەر ئاســتی دنیا، دەنگدانەوەی هەبــوو. ژنی کورد توانی، لەســەر ئاســتی دنیا ناوبانگــی ئازایەتی و وڵاتپارێزی بەدەســت بێنــێ. لەوکاتەدا پارتی دیموکراتی کوردســتان ســنوری ســێمێلکای بــەڕوودا داخســتن. خەندەقــی لێدا، بەراســتی ئــەم خەندەقە خزمــەت بوو بە داگیرکەرانی کوردســتان. ڕۆژانە لە ڤیڤیەکان سەیرمان دەکرد، پیرەژنی دێرک و قامشلۆ، بە چەنگ و نینۆکەکانیان، ئەو خەندەقەیان پڕ دەکردەوە. بەڵام ئەوەی زۆری ئــازاردام: ڕۆژێک چەکدارێکی پارتی، بە لولەی تفەنگەکەی، لە پەراســوی پیرەژنێکی دەدا. بە قۆنداغە تفەنگ کەوتبوە لێدانی. ئەو ڕۆژە حەجاجی نوگرە ســەلمانم هاتەوە یاد. کە لە ئەنفالەکان، چی بە ژن و پیاوی کورد دەکرد. بۆیە زارم هەڵناگرێ بەوە بڵێم: پێشــمەرگە. پاش ماوەیەک کە شــەنگالیان ڕادەســت کــرد، هەمــان ئــەو چەکدارانە بەو شــوێنەدا هەڵاتــن، کە ئــەو پیرەژنانە پڕیان دەکردەوە. بە ڕۆژئاوای کوردســتان دا ڕایانکرد، ئەو براو خوشــکە ئێزدیانەیان گورگان خواردوو کرد. دوای ماوەیەک لە ڕانییە کەمپینێکیان بۆ کۆبانێ دروست کرد، خەڵکی دەروازەی ڕاپەڕین بەشــداری کارایــان کرد لەهێنانی خواردەمەنی. بەنیازی یارمەتی کۆکردنەوە، گەیشــتە چەند کامیۆنێک. هاوڕێ کاسترۆ و چەند

برادەرێکی تر، سەرپەرشــتیان دەکرد، بە هەزار حاڵ ڕەوانەی ڕۆژئاوایان کرد. دوایــی کەمپینێکــی ترمــان کرد، بــۆ پارە کۆکردنــەوە. بۆ ئەو بــرا ئێزیدیانەی کەمپەکانــی ڕۆژئــاوا. بەڵام بەداخەوە، پارتی ڕێگری کــرد، کە چەند برادەرێکی چالاکــوان بچن لە ســێمێلکا بــۆ ڕۆژئاوا، ئەو پازدە هــەزار دۆلارەیان بۆ بنێرن. بەناچــاری بردمــان بۆ نوســینگەی کانتۆنەکانــی ڕۆژئاوا. دامانە دەســت هەڤاڵ غەریب حەســۆو چەند هەڤاڵێکی تر، لەشاری سلێمانی.

ڕۆژێــک هەڤاڵ ئاڵــدار خەلیل هات بۆ ڕانییە، لەبارەگای حیزبی زەحمەتکێشــان لــەدوای منیان نارد، (لێرەوە سوپاســیان دەکەم). لەگــەڵ هەڤاڵ ئاڵدار خەلیل دانیشــتین، هەریەکەو پێشــنیاری خۆی بۆ ڕۆژئاوا دەربڕی. بۆئەوەی هەڵەکانی ئێمــە دووبارە نەکەنــەوە، گوتم: مەهێڵن گوندەکان چۆڵ بن، کەرتی کشــتوکاڵ پــەرە پێبــدەن. بەگوێرەی زانیاری خــۆم ئەوەی دەمزانی پێشــنیارم کرد، یەک لەوپێشنیارانەم ئەوەبوو: کۆبانێ بەکاولکراوی بهێڵنەوە، دەورەی تەلبەند بکەن، ڕۆژێک دێ گەشــتیار ڕوی تێدەکات، بۆئەوەی دەورێک بەناو کۆبانێ دا بگەڕێ، ئامادەیە ســەد دۆلار لە ســندوقی هاوکاری بکات. دەبێتە دەرامەتێکی زۆر چاک بــۆ کۆبانێ. زۆر پێشــنیازی تری لەوبابەتــە. لەبەرکەمی کات پەلەم کرد، گوتم: هەڤاڵ، بزانە ئێمە لە باشــوری کوردســتان لەدوای ڕاپەڕین چیمان کردوە، ئێوە پێچەوانەی ئەوە بکەن، ڕاســت و تەواو دەردەچێ. چونکە دەســەڵاتدارانی هەرێم کاری خراپیــان زۆرە، هیوادارم هەڵەکانی ئێمە دووبارە نەکەنەوە. هەر بەم بۆنە پیرۆزەوە ئەم هەڵوێستە شیعرەم نوسی:

ئەمشەو خەوێکی سەیرم دی..
لەو خەوەدا هێندە ســووڕام، ئێستاکەش سەرم دەسووڕێ
بۆ شــەهیدانی کۆبانێ، مۆنۆمێنتێکیان دانابوو،
لەسەر گردی مشتەنوورێ
دەیانگــوت: هەر کوردێک بێتوو، بەدڵ و دەروونێکی پاک،
دووجار لەدەوری بسووڕێ
لــە تاوان پاکدەبێتەوە، خودا لەگوناهی دەبوورێ

***

**گۆڤەنــدو داوەتی كوردان، ئەوجارە یەكجار گەورەیە**
**گاوانییەكەی لە جەلەولا،**
**سەرچۆپی لە شێرانەیە..**
**ســەرچۆپی كێش (ئارین مێركان)، فەرماندارى یەپەژەیە**
**ریكۆردى جیهانمان شكاند،**
**كێ كچی وەك كوردی هەیە؟!!**

كاتێــك گەریلا لە قەندیل بەرەو جەلەولا، بەناو شــاری ڕانییــە تێپەرین. كاتێك پێشــمەرگە ســنوری دەستكردی ســێ وڵاتی بڕی بەرەو كۆبانێ. كاتێك، یەپەگە و یەپەژە، لە هاواری خەڵكی شــەنگال هاتن بــۆ ئەوەی لەكۆمەڵكوژی ڕزگاریان بكــەن و لــە ڕۆژئاوا لە ئامێزیان بكەن. هەســتێكی زۆر خۆشــم هەبوو، گوێم لە خرمە خرمی شــكانی بەســتەڵەكی (ســایكس بیكۆ) بوو، لەژێرپێی پێشمەرگەو گەریلاو شەرڤانان. كاتێك كە پێشوازیمان لەتەرمی پیرۆزی كچ و كوڕی باشورو مەهابادو ئیلام و شارەكانی ڕۆژهەڵات دەكرد، لەگەڵ هەلهەلەی دایكی شەهیدان، كە ڕۆڵەكانیان لە كۆبانێ و شــەنگال دەگەڕێندرانەوە، ئێمە بەرپێمان پڕ دەبوو لە كاخەزی دڕاوی پەیماننامەی (لۆزان). هەســتم دەكرد سنورە دەستكردەكان، بەهیممەتــی كــچ و كوڕانی كــورد، لە هەر چوارپارچە قــرچ و بڕ دەكرێ. واتای گرنگــی هەیــە، ئــەو كچەی كانــی كوردانی بۆ داعش كردە گۆڕســتان، شــەهید (دەســتینە)ی چوارقوڕنە بوو لە باشــور، ئەو قەناس بەدەستەی كۆبانێ شەهید (موســا) ڕۆژهەڵاتــی بوو. ئەوانــە پەیڕەوی ئایدیایەكن كە ســنوری دەســتكرد ناناسێ و دەیانەوێ تێكی بشكێنن.

بەداخەوە ئەو هەلە زێرینەمان نەقۆستەوە، لەوكاتەدا پارتی دیموكراتی كوردستان، دەیان دەزگای هەڵكەندنیان لەســەر ســنوری دەستكردی باشورو ڕۆژئاوا، ڕۆژانە بەچاودێــری و خزمەتی میتی توركیا، خەریكی تۆخكردنەوەو قوڵكردنی ســنورە دەســتكردەكان بوون، بێ ئەوەی گوێ بدەنە نارەزایەتی دڵسۆزانەی گەلەكەمان. ئــەو هەلەیان لەبار بردو لە خەندەق لێدان بەردەوام بوون.

# خۆشحاڵم بە هەڵوێستەکەم

نارەزایەتی مامۆستایان لەسەر مافە سەرەتاییەکانیان وەک بڕینی موچەکانیان سەری هەڵدا. بۆ ئەم مەبەستە، لەڕانیە خۆپیشاندانیان کرد. منیش بەشداریم کرد، وەک پێشمەرگەیەکی دێرین، بەئەرکی خۆم زانی لەسەر مافە ڕەواکانیان هاوکاریان بم. بانگیان کردمە سەر پەیژەکە، لەکاتێکدا زۆر لە ئەندام پەرلەمانی حیزبەکان، لەپشت پەیژەکەبوون. بەڵام ڕێکخەری نارەزایەتیەکان نەیانهێشت قسە بکەن. چونکە چەند ڕۆژێک پێشتر ئێمەی پێشمەرگەی دێرین، خۆپیشاندانمان کرد بوو بۆ لای شارەوانی، بەڵام لە مەڵبەندی یەکێتی (ع.ت) هات، دەستی بە هاوار هاوارێک کرد، بۆئەوەی وا نیشان بدات، بە تەنها پارتیە موچە و قووتی خەڵک نادات، وەک حیزبەکەی ئەو بەشداری برا بەش نەبێ لەو حکومەتە. کەوتە گێڕانەوەو پێهەڵدانی ڕۆژانی شۆڕشی چەکداری، بۆ چەواشەکردن و بەلاڕێدابردنی خۆپیشاندانەکە، ئەو دیماگۆگیە لە سیاسەت، مرۆڤ پێی بێ تاقەت دەبێت. ئەوە بوو من بە دەنگێکی بەرز گوتم: هەست ناکەم ئێمە بۆ نارەزایەتی و خۆپیشاندان هاتبینە ئێرە. وەک دوێنێ شەڕی قەیوان ماوەت و شەڕی هەڵەموند ڕوی دابێ، ئەو برادەرە ئاوا بە حەماس دەیخوێنێتەوەو دەرخواردمان دەداتەوە. هەندێک لە بیریان چوبووەوە ئێمە بۆ گردبوینەوە!! زۆر بەقسەی من دڵگران بوون، بەتایبەتی ئەوانەی شایستەی خانەنشین نەبوون. هەر تاوان بوو پێیان بگوترێ پێشمەرگەی دێرین. من لەگەڵ عەبدوڵڵا کوردستانی و چەند برادەرێکی وەک تەلعەتە ڕەش ڕۆیشتین، هەتا گەیشتمەوە لای ماڵی خۆمان، هەر گوێم لە خوێندنەوەی ئەو داستانە کۆنانەی کاتی پێشمەرگایەتی بوو، دەرخواردی ئەو خەڵکە ماف خوراوە دەدران. دوو ڕۆژ دواتر، لە پارکی گشتی هی وا هەبوو کاوێژی دەکردەوە.

بۆ ئەوەی نارەزایەتی مامۆستایان ئاوای بەسەر نێت، بەهیچ شێوەیەک ڕێگایان بە پیاوەکانی ئەحزاب نەدا بچنە سەر پەیژەکە. لە دورەوە بانگیان کردم، بێ ئەوەی بەخۆم داوا بکەم کە دەیانزانی بەهەق پیاوی هیچ حیزبێک نیم و هەوڵ

دەدەم (خۆم بم) مایکەکەیان دامێ.
ئەو تێکستەی شێخی سەعدیم خوێندەوە کە لەپێش دەرگای نەتەوەیەکگرتوەکان دراوە بـە ئینگلیزی وەرگێڕدراوە، کە دەڵێ:

**ئادەمـیزادان ئـەحزای یەکترن**
**لەدروستبوونا لەیەک گەوهەرن**
**ئـەگەر ئـەندامێ کەوتەبەر ئازار**
**ئەندامانی تر دەوەستێن لـەکار**
**تـۆ کە لەدەردی کۆمەڵ بێ خەمی**
**نـاشێ کە ناوت بنێن ئادەمـی**

چەنـد ڕۆژێک دواتر بەرپرسـێک پێی گوتم: کاک حـازم، نەدەبوو تۆ لەگەڵ ئەو منداڵ و تارە لەسەر شەقام بیت، زۆری ئامۆژگاری کردم!! منیش گوتم: بەڕاست، پێت وایە قسـەی خراپ و نابەجێم کردوە؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: دەترسام قسەی باشـم نەکردبێ، چونکە فشارم لەسـەربوو، لەبەرامبەر ئەو گەندەڵ و مافیایانە، بەڵام کە تۆ پێت قسەی خراپ بوبێ، ئینجا من دڵنیام کە چاکم گوتوەو ئەرکی خۆم بەجێگەیاندوە.

## نابەرابەری

لەگەرمـەی شـەڕی کۆبانێ، هەتـا دەگاتە جەلەولا، کورد لە شـەڕێکی خوێناوی دابـوو، لەگـەڵ دەوڵەتی ئیسـلامی لـە عێراق و شـام (داعش). ڕۆژانـە تەرمی پیـرۆزی کـچ و کوڕی قارەمانـی گەلەکەمانی بۆ دەهاتنـەوە. بەدرێژایی چەندان کیلۆمەتر، کورد لەشـەڕدا بوو. ڕۆژانە دیمەنی سەر بڕینی پێشمەرگە دیلەکانمان دەبینـی، لـە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان. بەتایبەتی ئەو دیمەنەی لە حەویجە لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاوبوەوە، ویژدانی مرۆڤایەتی هەژاند. چەندان پێشمەرگە خۆی کوشـت لەبـەر نەداری و قـەرزداری وکرێی خانوو. بۆ خۆم گوێـم لە تەلەفزیۆن

گرتبـوو، ژنێـک لە دەربەندیخان لەگەڵ مێردەکەی بڕیاریان دابوو کۆرپە شـەش مانگەکەیـان بفرۆشـن. بۆدابینکردنی بژێوی چوار منداڵەکـەی تریان و خەرجی چونـە قوتابخانە و کڕینی جانتاو دەفتەر و قەڵەم.
خۆ کوشـتن ببوە دیـاردە، ڕۆژانە لە تیڤیەکان دەمانبینـی بەهۆکاری بێکاری و قەرزداری. لەگەڵ چەند برایەک لەپێشـوازی تەرمی شـەهید نەریمان دۆشـکەو پرسـەکەی بوین، کاتێـک چوومەوە ماڵەوە تەلەفزیۆنم کـردەوە، لەناو کەرکوک دوو یـان سـێ چەکداری دەوڵەتی ئیسـلامی لەسـوپەرمارکێتێک دەوریان گیراو شـەڕ دەستی پێکرد. من وەکو پێشمەرگەیەکی دێرین، سەیری شەڕەکەم دەکرد لەکەناڵـەکان. لەبەیانی تا ئێوارە هەرچی هات فیشـەکەکانی لە ئاسـمان خاڵی کردەوە، هی وا هەبوو فیشەکەکانی خۆی هەموو تەقاندبوو، تفەنگی پۆلیسەکانی تـری وەردەگرت، دەیگـوت: کامێرامانەکان با ئامادەبن عەمید....... دەسـت بە تەقە دەکات. ئەو بێ ویژدانە ئەو هەموو فیشـەکە چاکەی بەو ئاسـمانەوە دەنا بێ ئەوەی سـێرە لە پەنجەرەیەک بگرێ. بەشـەڕ نەدەچوو، شـایی ڕەشبەڵەکی دەشـتی هەولێری سـاڵی حەفتاکانم هاتەوە یاد، کە پارتی و شیوعیەکان، ئاغاو کرمانجەکان، لەدژی یەکتر ئەو هەموو فیشـەکەیان بەو ئاسـمانەوە دەنا لەکاتی شاباشـکردن. ئەو شـەڕە بەردەوام بوو هەتا لای ئێوارە و نیوەشەو، پیاوەکانی بەر کامێراکان هەمویان لە سـلێمانی وهەولێر بەو شـەڕە ڕاگەیشتن. بەخۆیان و کامێراکانیان، ئەو فیشـەک و تەقەمەنییەی لەو شەڕە بەکارهات، نە لە داستانی حەمـک، نـە لەداسـتانی هەنارە، نە لە سـەری جوانـەگا، نە لـە هەڵەموند، نە لـە بۆلقامیـش، نە لە شـەڕی بەنەباوێ و سـماقوڵی، نە لەداسـتانی دەشـتێو، بەکارنەهات و نەتەقێندرا!!
مـن وەک پێشـمەرگەیەکی دێرینـی ئـەو گەلە، هەسـتم بەشـەرمەزاریەکی زۆر کرد ئەو ڕۆژە. چونکە تاکە دەسـتکەوت لەو شـەڕە، کـە دوو چەتەی دەوڵەتی ئیسـلامی بوون کوژران. تەنها لەشـکۆدانی پێشمەرگە و کورد نەبێ، هیچی تری لێ سـەوز نەدەبوو. تەنها چەواشەکاری و خۆ وەک ڕامبۆ نیشان دان بوو، چەند ڕۆژ بـوو کەناڵـەکان وەک توتـی دەرخواردی ئـەو خەڵکەیان دەدایـەوە. گوایە لەهەولێر هێزی زێرەڤانی و ئاسایشـی گشتی و لە سلێمانی هێزە ڕەشەکەو هێزە دەمامکدارەکەو چەند ناوی سـەیرو سـەمەرە، گوایە بەشداربوون لەو شەڕە. ئەو

شـــەڕە پێویستی بە شەش پێشـــمەرگە هەبوو، نەک شەش چەکداری حیزب، کە تفەنگچـی بـاش بن، جامانەکانیـان دەمامک بدەن بۆ ئەوەی کەس نەیانناســێ، نەک خۆ دەرخســتن لەپێش کامێرا. واتە شـــەش پێشمەرگەی (بۆر، بۆر). نەک چەکـداری حیزب، قات ئوتوکراوەکان و قژ جەلی کراوی بەر کامێرا.

# ئامانجێکی پیرۆز

راپرســی بۆ ســـەربەخۆیی، لوتکەی ئەو خەون و ئامانجە پیرۆزەیە، دەیان هەزار شـــەهیدمان لەپێناویدا بەخشـــی، بـــەڵام لەوکاتەدا وەک ئـــەو ڕۆژوەوانەین پێش بەربانگ فتار بکەینەوەو ڕۆژوو بشکێنین، یان پێش مەلا بانگدان نوێژ دابەستین. کارەســاتە، بەم هەموو ناشــیرینی و گەندەڵیەوە، بەم هەموو قەیرانەوە، باس لە پیرۆزترین و جوانترین ئامانجەکانی کورد بکرێت. بیست ڕۆژ پێش ڕیفراندۆم، لە کتێبخانەی گشــتی ڕانییە دیبەیتێک بەســترا، ئەو بەرێزانە ئامادەبوون: مەسعود عبدالخالق، عەبدوڵڵا ئاگرین لە پارتی، ئەبوبەکر هەڵەدنی لە یەکگرتوی ئیسلامی، کامـــەران بابان زادە لە کۆمەڵی ئیســـلامی، قادر ڕەزگەیی لە یەکێتی، عبدالرزاق شەریف لە بزوتنەوەی گۆڕان.

هەموو ئەو بەڕێزانە قسەی خۆیان کرد دەربارەی ڕیفراندۆم، تەنها بەڕێز مەسعود عبدالخالق لەگەڵ ڕاپرســـی نەبوو بە زەلالی، ئەوانیتر هەڵوێســـتیان شیرتێن بوو، ئەو قسانەی کە ڕۆژانە گوێمان لێ دەبوو هەر هەمویان سەد بارە کردەوە، ئاخر باشـــترین بنێشت ئەگەر زۆرت جویی، شەویلاکت دێشێ.

کاک عەبدوڵڵا ئاگرین باســـی ڕاپرســـی بۆ کردین، کە چەند گرنگە لەوکاتە کاتی خۆیەتی، ئێمە گرنگی ئەو ڕیفراندۆمە دەزانین، هەر هەمویان هاتنە سەر پەیژەکەو قسەی خۆیان کرد. دیاربوو کەمیان خۆیان بوون!! لەسێبەری حیزبەکانیان زیاتر شـــتێک نەبوون. گەورەترین کێشـــەی باشـــور ئەوەیە: کەم کەس خۆیەتی، هەر کەســـێ بوو بە ڕێکخستنی حیزبێک، کەم وایە خۆی بمێنێ.

لەبەرئەوەی من بەتەمەن بووم و لە پێشـــەوە دانیشـــتبووم، دەستم بەرزکردەوە،

مایکەکەم وەرگرت و گوتم: نمایندەی هیچ حیزبێک نیم، بەڵام ئەو ڕیفراندۆمە بۆ (ئـاوت) کردنــی نارەزایەتیەکانی خەڵکە، ئێمە لە ٢٠٠٥ە وە لە ٩٨٪ ی خەڵکی کوردســتان دەنگمان بە جیابوونەوە داوە، بەڵام ســەرکردەکانمان ئەوەندەی ئەو دەنگانەیان بۆ فشــار لەســەر ئەمریکیەکان و بەغدا بۆ پارەو دەستکەوتی کەسی بەکارهێنــا، نەهاتن بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردســتان بەکاری بهێنن. تکا دەکەم هیچ شــتێکتان نەهێشــت لە کوردســتان پیرۆزبێ، هەموتان خست، ڕیفراندۆم بۆ ئێمە زۆر پیرۆزە، بەس ئەو ماوە، لەپیرۆزی مەدەن. ئێوە کاتێک تاکی کوردتان تێک شکاندوە، ئەو تاکەی ئێوە بەرهەمتان هێناوە، ئەوە هی وڵات پارێزی نییە، ئەگەر دەوڵەتیشی بۆ دروست بکەی گرنگی و بایەخی پاراستنی نازانێ. من ئەو ڕیفراندۆمە وا وێنا دەکەم: دایکم شــیری هەوێن دەکرد، بیکات بە ماســت، بەڵام جاری وا هەبوو دەیگوت: (شیرەکە هەڵبزرکا) یان هەڵگەڕا. نەدەبوو بە ماست، وە نە لە حالەتی شــیری خــۆی دەمایەوە، لەبەردەمی ســەگەکانیان ڕوو دەکرد بیخــۆن. خۆ ئەگەر بەشــیری بمابایە بەڵکــو کابانێکی چاکتر لەدوای ئەوانە بێت هەوێنی بکات، ببێ بەماســت. جا بۆیە وەک هەولێری گوتەنی: تکایە ڕیفراندۆم هەڵمەبزرکێنــن، ئێمــە زۆرمــان گــوت: ئێوە کەمتان گــوێ لێگــرت. دیبەیتەکە کۆتایــی هات. لەتیڤیەکان، کاک مســعود گوتی: پارتی بەتەنهــا نییە، لەبڕیاری ئەنجامدانــی ڕیفراندۆم. بەڵکو شــازدە پارتی سیاســیمان لەگەڵە. پارتەکانیش، ســەری خــۆ چەتاڵکــردن و بــێ ئیرادەیــی و بندیواریان بۆ لەقانــد. هەندێک لە سکرتێرو نوێنەری پارتەکان، هێندەی لەخەمی ئەوە دابوون لەتیڤیەکان وێنەیان لەمەجلیســی سەرۆک دەربچێت و خزم و ناســیاوەکانیان بیانبینن کەوا ئەوانیش لــە خانەدانەکانــن، نیوهێندە لەخەمی ئەو بانگدانە ناوەختــەو دەرئەنجامەکانیدا نەبــوون، تەنهــا (نەوەی نــوێ) بەئەنجامدانی ڕیفرانــدۆم ڕازی نەبوو لەوکاتەدا، کەهیــوادارم ئەویــش وەک ( گــۆڕان) نەبێتە حەبێکی هێور کــەرەوەو زیاتر بێ ئومێدکردنی خەڵکی مافخوراو. ئەوەبوو دەرەنجامەکانی ڕیفراندۆم: نیوەی خاکی کوردســتانی زیاتر لێ سەندین نەوەکو سەربەخۆیی و بوون بە دەوڵەت.

ئەوەم بۆ هەندێک کەس گێڕایەوە: ماڵمان لە ئێران بوو، یاری تۆپی پێ لە نێوان ژاپــۆن و ئێران کرا، ژاپۆن بە ســێ گۆڵ لە ئێرانــی بردەوە، کە یاریەکە کۆتایی هــات، بێژەرەکەی تیڤی ئێران هەتا دەنگی تێدابوو هاواری دەکرد:

- ئێران ســـــــــفـــــــــر (بەدەنگێکی بەرز)
- ژاپۆن سێ (بەدەنگێکی کز)
گوایە ڕیفراندۆم قۆچانی ڕەشـە بۆ نەوەکانی داهاتوی باشـوری کوردسـتان، من پێـم وابوو نامەکەی ڕێکس تیلرسـون وەزیـری دەرەوەی ئەمریکا قۆچانی ڕەش بـوو. کـە پڕاوپڕ بوو، لە دەسـتکەوتی زۆر زیاتر لە فیدراڵـی، ئەگەر ڕیفراندۆم بـۆ مـاوەی سـاڵێک دواخرابا. ئەگەر سـەرانی کوردی باشـور، وەک دوژمنان و داگیرکەرانـی کوردسـتان، لەسـەروی هەمویـان، ئەردوگان و سـەرانی جمهوری ئیسـلامی ئێـران بـە ووردی ناوەڕۆک و گرنگـی ئەو نامەیان شـیتەڵ بکردبایە، دەبوو ئەو نامەیە بکەن بە قۆچانی ڕەش بۆ کوردی باشـور.
کـە داگیرکەرانـی تەنگەتاو کردبـوو، دژایەتیان دەکرد. ئەو هەموو سـکرتێر و سـەرۆک حیزب و ڕاوێژکار و وتەبێژەی پارتە سیاسسـیەکان، ئێسـتاش لەگەڵ بێت لەسـەر ناوەڕۆک و بەندەکانی ئەو نامەیە لێکۆڵینەوە توێژینەوەیان نەکرد. کەسـیان زاتیـان نەکرد ناوەڕۆکی ئـەو نامەیە بۆ خەڵکی شـی بکەنەوە. وە یا بڵێن: با بۆ ماوەی سـاڵێک ڕیفراندۆم دوابخەین. نامەکەی تیلرسـون بە بۆچونی من لەکاتی ڕێکەوتنی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ دەسـتکەوتی زیاتر و گرنگتری هەبوو بـۆ کورد، بەداخەوە ئەو دەسـتکەوتە نوسـراو و مێژوییەشـیان هەروەکو هەڵە زێرینەکانی زیاتر لە نیو سـەدەی ڕابردوو، خسـتە ناوئاگری شـانۆ سـوتاوەکە. دواتـر لـە شـەرمان بێت، یان بە ئەنقەسـت، ئەو نامەیە سـەرنگۆم کـرا. بۆیە دەمەوێ ئەو نامە گرنگە بخەمە بەر دیدی خوێنەران، بۆ ئەوەی دەسـت لەسـەر ویژدانیان دابنێن و بڕیار بدەن لە نێوانی ڕیفراندۆم لەو کاتەدا و دواخسـتنی بۆ ماوەی سـاڵێکی تر، کامیان لە بەرژەوەندی گەلی کورد بوە؟ وە جوان تێبگەن کە لەنێوان دواخسـتنی ڕیفراندۆم ونامەکەی تیلرسـون، کامیان قۆچانی ڕەش و کامیان قووچانی ڕەشـە؟!!دەقی نامەی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ بارزانی، دوو ڕۆژ پێش ئەنجامدانی ڕیفراندۆم:

**بەرێز سەرۆک بارزانی...**

بەناوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ڕێزی زۆر بۆ بەڕێزتان و خەڵکی هەرێمی کوردسـتانی عێـراق دەنوێنین، پێکەوە، چەندین دەیەیـە، پەیوەندیەکی مێژویی

لەنێوانمــان بنیاتنــراوە وە مەبەســتی ئێمەیــە وە پەیوەستبوونیشــمانە بەوەی ئــەم پەیوەندیــە بەهێــز تر بکەین بۆ چەندین دەیەی تر. لە ســێ ســاڵی ڕابردو بەتایبــەت، هاوبەشــی بەهێزکان وە بڕیــاری ئازایانەی تۆ بــۆ هەماهەنگی تەواو لەگەڵ هێزە ئەمنییەکانی عێراق بویە هۆی تێکشــکاندنی شــەپۆلی داعش. ئێمە ئــەوە بــەرز دەنرخێنیــن وە هەرگیز قوربانی دانی پێشــمەرگە لەبیــر ناکەین لە شەڕی هاوبەشمان دژ بە تیرۆریزم.

لە ئێســتادا پرســیاری ڕیفراندۆم لەبەردەممان دایە کــە بڕیارە لە ٢٥ ی ئەیلول ســازبکرێت، دەربــارەی ئایــندەی هەرێمــی کوردســتان. ئێمــە نیگەرانیەکانــی خۆمــان دەربڕی. ئەم نیگەرانیانەش وەک شــەڕی بــەردەوام دژی داعش، لەوانە ئۆپەراسیۆنی ڕزگارکردنی حەویجە، نادڵنیایی هەرێمی لە ناوچەکە، وە پێویستی تەرکیزکردن لە گێڕانەوەی ئارامی بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکان بەشێوەیەک نەهێڵین داعــش هەرگیز بگەریتەوە. بەمهۆیەوە، داوا لــە بەڕێزتان دەکەم بەدیلەکە قبوڵ بکــەن، کە ئێمــە باوەڕمان وایە باشــتر یارمەتیتــان ئەدات، بۆ بەدەســتهێنانی خەونەکانتان، وە دڵنیایی ئەدات لە ئارامی و ئاشتی لەبەرامبەر پێویستی شەڕ، دژی داعش.

ئەم پرۆپۆزەڵە بەدیلە چوارچێوەیەکی تازە وە خێرا دروست دەکات بۆ دانوستان لەگەڵ حکومەتی ناوەندی و ســەرۆک وەزیران عەبادی. ئەم چوارچێوەیە خێرایە ئەجێندایەکــی کــراوە لەخــۆ دەگرێــت بۆ یەک ســاڵ زیاتر درێژە ناکێشــێت وە ئەشــتوانرێت درێــژ بکرێتــەوە. ئامانجی ئەمەش چارەســەرکردنی هەموو کێشــە هەڵواســراوەکانی نێوان هەولێر و بەغداد و سروشــتی ئایندەی پەیوەندی نێوان هەردولا. وە ئێمە پێویســتیە دارایی و ئەمنییەکانتان لەبەرچاو دەگرین.

جەنابی ســەرۆک، من لە ترس و نیگەرانیەکانتان لە دەیەی ڕابردو تێدەگەم، وە بەراســتی ئەو هەڵە مێژویو ئازارانەی دەرهەق بە کورد کراوە، لە ســاڵی ١٩٢١ ەوە لەبەرچاوە. ئێمە هاوڕاین لەپێویســتی ڕێگە چارەیەک، بۆ پێشــەوەمانببات کــە پێویســتی و داواکاری ســەرجەم ڕەگــەز و پێکهاتە و ئیتنیکیــەکان کە لەم زەویــە مێژویــە دا دەژیــن دابین بــکات. ئەمــە بنەمایەکی گرنگە بۆ ئاسایشــی هەرێمەکەتان، وە پاراســتنی ئاسایشــی نیشــتیمانی خۆتان. لەبــەر هەموو ئەم هۆکارانــە، ئەوە سیاســەتی ویلایەتــە یەکگرتوەکانی ئەمریکایــە لەژێر ئیدارەی

سـەرۆک ترامپ کە هەمووشـتێک بکەین، لە توانای ئێمەدایە بۆ چارەسەرکردنی کێشـە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان هەولێر و بەغداد، وە دڵنیایی بدەین کە هێز و قورسـایی تەواوی ئێمە لە پشت ئەم چوارچێوەی دانوستانەوەیە.

لەوەش زیاتر، ئێمە ئامادەین بۆ کارئاسـانیکردن بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ئاسـایش بەزوترین کات ئەم بەدیلە پەسەند بکات وە بۆ پشتیوانی زیاتر بەشداری تەواوی نەتـەوە یەکگرتـوەکان مسـۆگەر دەکەین بە هاوبەشـی لەگـەڵ هاوپەیمانەکانی وەک بەریتانیا و فەرەنسـا. ئەمە دەرفەتێکی ناوازەیە کە ئێمە بەوپەڕی ڕێزەوە داوادەکەین قبوڵی بکەن وەک بەدیل بۆ ئەم ڕیفراندۆمەی ئێستا. ئێمە باوەڕمان وایـە ئەم ڕیفراندۆمە دەرئەنجامی مەترسـیداری ئەبێت، وە بەپێچەوانەوە ئەبێتە هۆی پاشەکشە لە ئامانجەکانتان.

بە لەبەرچاوگرتنی مێژوی گەلی کورد، ئێمە دەزانین تۆ ئەم پرۆپۆزەڵە بۆ دیالۆگ وەک دوا چانس تەماشا دەکەیت. ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەمە چانسێکە شیاوی ئەوەیـە کـە قەبوڵی بکەن، بەتایبەت دوای سـەرکەوتنە مێژویەکانی ئێوە دژ بە داعش و، هەماهەنگی بێ پێشـینەی سـوپای عێراق و پێشـمەرگە و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەکۆتایی ئەم پرۆسەیەدا، بەبێ گومان ئەگەر گفتوگۆکان نەگەیشتە دەرئەنجامێکی قبوڵکراو بۆ هەردولا یان شکسـتیهێنا بەهۆی نەبوونی نیازباشـی لەلایەن بەغداوە، ئێمە دان دەنێین بە پێویسـتی سازکردنی ڕیفراندۆم.

وەک پشـتیوانی و ئیلتزامی ئێمە بۆ سەرخسـتن و پشتیوانی کردنی ئەم دیالۆگە (وەک بەدیلێک بۆ ڕیفراندۆم) ئێمەش داوای ئیلتیزامی ئێوە دەکەین لەم خاڵانەدا.

یەکـەم: دانوسـتانکردن لەگـەڵ بەغداد خاڵی سـەرەکی یە بۆ لێکتێگەیشـتن و ڕێکەوتنـی هاوبەش بۆ سروشـتی ئایندەی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردسـتان و حکومەتـی عێـراق. ئـەوەش بە بوونـی فیدرالیزمێکی کارا یان شـێوەیەک لە کۆنفیدرالیزم یان سـەربەخۆیی، پێویستە لەسەر بنەمای ڕێکەوتنی و دانوستانی ئاشتیانە بێت.

دوەم: هەرێمی کوردستان و هێزی پێشمەرگە وەک هاوبەشی گرنگی هاوپەیمانی نێودەوڵەتـی دژی داعش بمێنێتەوە، پشـتیوانی هاوپەیمانی بەردەوام دەبێت، و ئێـوەش بـەردەوام بن لە هەمانهەنگی مێژویی لەگەڵ هێـزە ئەمنییەکانی عێراق. ویلایەتـە یەکگرتوەکانـی ئەمریـکا هەوڵەکانی خۆی خێرا دەکات بـۆ پێکهێنانی

میکانیزمی ئاسایشــی هاوبەش بەتایبەت لە ناوچەکانی وەک شــەنگال کە دوای داعش نائارامی تێداماوە. پێویستە هەردولامان کاربکەین بۆ دابینکردنی ئاسایش بۆ ناوچە هەستیارەکان.

ســێیەم: ســنوری هەرێمی کوردستانی عێراق بە دانوستان لەگەڵ بەغداد یەکلای دەبێتــەوە بەپێــی برگەکانــی مادەی ١٤٠ ی دەســتور. ویلایەتــە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بە هاوبەشی لەگەڵ یوئێن و حکومەتی عێراق کاردەکات بۆ خێراکردنی جێبەجێکردنی ئەمە، لە هەمان ئەو ســەقفە زەمەنییە لەسەرەوە باسکراوە.

چوارەم: ئێمە چاوەڕواندەکەین ئێوە هەوڵەکانی خۆتان بخەنەگەڕ بۆ هەماهەنگی کــردن لەگەڵ حکومەتی ئێســتای عێراق بە ســەرۆکایەتی حەیــدەر عەبادی، وە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی نیشتیمانی، نیسانی ٢٠١٨، وە ڕۆڵی ئیجابی خۆتان لــە بەغداد بخەنە گەڕ بۆ دروســتکردنی حکومەتــی داهاتو دوای هەڵبژاردنەکان. ســەرکردایەتی ئێــوە وەک پیاوی دەوڵەت زۆر گرنگە بــۆ دابینکردنی ئارامی بۆ تەواوی ناوچەکە دوای داعش.

هاوشــانی چوارچێــوەی دیالــۆگ، ئێمــە پشــتیوانیتان دەکەیــن بــۆ بەخێرایی چارەســەرکردنی ئەم گرفتانە لەماوەی یەک ساڵ دا.

١ جێبەجێکردنی تەواوی ڕێکەوتنەکانی بواری دابەشکردنی دەسەڵات و سەروەت.

٢ جێبەجێکردنی مادەیی ١٤٠

٣ چارەسەرکردنی کێشەکانی تر وەک پێشمەرگە، فرۆکەوانی مەدەنی، نوێنەرایەتی دبلۆماسی و ئەوانیتر.

ئێمــە باوەڕمــان وایە کە ئەم نامەیــە، وە ئازایەتی ئێوە بۆ بڕیــاردان بنەمایەک دەبێت بۆ دەرفەتێکی مێژویی لەنێوان هەرێمی کوردستان و ئەمریکا و حکومەتی عێراق، لەدوای قوربانیدان و ســەرکەوتنی هاوبەشــمان بەسەر داعش دا. بەناوی گەلی ئەمریکا و ســەرۆک دۆناڵد ترەمپ و تەواوی تیمی ئاسایشــی نشــیتمانی، شەرەفمەندین بە کارکردن لەگەڵ ئێوە.

ڕێزی زۆرم

**ریکس تیلەرسن**

بەداخەوە چاوشـۆڕەکانی دەربار، ڕۆژانە شکستەکانمان بە سەرکەوتن دەرخوارد دەدەن.
لـەدوای ئـەم ئەتکردنـەی کەرکوک و بـە گورگانخـوارد کردنی تـەواوی ناوچە کوردسـتانییە دابڕێندراوەکان ئەم هەلوێستە شیعرەم نوسی:

وتــە بێژی حــیزب دەدوێ
وەک پەشێو ڕشــانەوەم دێ
ڕووی خۆتان و بابتان ڕەش بێ
حەمرینتان چۆن هێنا پردێ

***

کەرکوک نە قودس بوو نە دڵ
دایاندۆشــی بــە درۆی زل
خــــەونی بە عەرەبکردنت
داگیرکــەر دەیباتە ژێر گڵ

***

خورماتوی چەندین جار سوتاو
هەڵسانەوەی لەدوای شالاو
لەســای سەری ئەو (هینانە)
بــوی بەناوچەی ئەتککراو

***

نــەوت فرۆشــن تـریاک کڕن
سنوکیسەڵــەن، دۆ بــڕن
کــڕیار هــەبێ لێیان بکڕن
مەمکی دایکی خۆشیان دەبڕن

# لاچن کاری حەزرەتی غەوس نییە

خۆپیشـاندانی خەڵکی خورماتو و دەوروبەری لەپێش مەکتەبی سیاسی یەکێتی، ویژدانـی هەموومانـی هەژاند. پێشـتر بەناوچەکانی خورماتـوو دەگوترا: ناوچە دابڕێنـدراوەکان. بـەڵام من لەوکاتـەوە دەڵێم: ناوچـە ئەتککراوەکانی بەرهەمی دووبەرەکـی پارتی و یەکێتی و ڕیفراندۆم.

لەنـاو پارکی گشـتی ڕانییـە، کۆمەڵێک چالاکی مەدەنی و پێشـمەرگەی دێرین، باسـمان کرد لە ڕیفراندۆم و خەندەقی نێوان باشـورو ڕۆژئاوا و هاتنی حەشـدی شـەعبی و، ڕێگەدانیـان بـۆ خورماتـوو دەوروبەری و ڕادەسـتکردنی شـەنگال بەداعـش، لەسـەر ڕێنمایی ئەردۆغان. زۆر لـەو کارانەی دەسـەڵاتدارانی هەرێم لەبەرژەوەنـدی داگیرکـەران ئەنجامی دەدەن. ڕۆژانە سـنورو گوندو باخ و ڕەزو پاوان و خاکمان دەسـوتێنرێ و بۆردومان دەکرێت. ئەم هەموو دەزگا جاسوسی و پایـەگاو دەزگایـەی دەوروبەرمـان، هەریەکـە بۆچونـی خۆی دەخسـتە ڕوو. منیـش بەنۆرەی خۆم شـتێکی ڕۆژهەڵاتـم بۆ گێڕانەوە: (لەگوندی (سـۆغانلۆ) ی سـەر بە پیرانشـەهر ڕویدا) کابرایەک تراکتۆرێکی هەبوو، بەداخەوە ناوەکەیم لە یاد نەماوە، ئەو تراکتۆرە بەیانیان هەڵنەدەبوو، سـۆغانلۆ شـوێنەکەی لێژە، دەڕوانێتـە مەزرای گوندەکە. ئەو کابرایە تراکتۆرەکەی لەشـوێنێکی سـەرەولێژ ڕاگرتبوو، کاتێک کە دەچێ هەڵیبکات، بەردی پێشەوەی تایەکەی لا دەباو کلاج دەکا. تراکتـۆر دەوری وەردەگـرێ بـۆی ناگەڕێتەوە، لەیـەک دوو بەردی گەورە دەدا، کڵاوو جامانەی دەکەوێتە خوارەوە. سوکانی تراکتۆر بەدەستیەوە دەردێ، بەنـاو مەلاغان کێشـان دەکـەوێ، کە لە مـەزرای گوندەکـە کار دەکەن، چەند مەلەغانکێشێک کەلوکرۆم دەکات، هەندێک غار دەدەن بەردی بهاوێژنە بەر تایەی تراکتۆرەکە، هاوار دەکەن: یا حەزرەتی غەوس. کابراش سـوکانی تراکتۆر بەرز دەکاتەوە دەڵێ: لاچن، کاری حەزرەتی غەوس نییە، بەخوای ڕێشمەی لەدەستی منیش نەماوە. بۆیە گوتم: براینە سـەرانی باشـوور سووکانیان لەدەستی خۆیان نەماوە. لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاسـت بەگشـتی و لەباشوری کوردسـتان بەتایبەتی،

هەموو سـەرۆک و سکرتێرو مەکتەب سیاسـی حیزبەکان، یاساو نەریتی خێڵیان تێپـەڕ نەکـردوە. هەر هەمویـان دەیانەوێ کـوڕو کچەکانیـان جێگرەوەیان بن، کوڕی یەکێکیانم نەدی ببێتە دکتۆر، ئەندازیار، دارتاش، کاسبکار، بەرگ دروو.. هتد. لەهەموی سـەیرتر ئەوەیە: بۆ خۆشـیان واز لە دەسـەڵات ناهێنن، زۆربەی بەرپرسەکانی باشور، لە دابی بۆ دابی سەرۆک و سکرتێرە. ئاخر مرۆڤ لەکاتی واژۆ یان پەیمان نوسـین یان داواکاری گەلەکەی یان هەر شـتێکی هەستیارە بە ئایندەی نیشتمان، وەک ئاسایشی نەتەوەیی. گوێی شەیتان کەڕبێ لەوکاتە دابی جەنابی عالی تەڕبێ، خۆ ئەوەندەی لەفکری وشـکردنەوەی ناو گەڵ و پاشـەڵی خۆیەتـی، نیـو ئەوەندە لەفکـری ئایندەی گەلەکەی نابێ. شـازادەیەک هەندێک شـەکری شـکاند، بۆ کۆیلەو خەسێندراوەکانی کۆشـک، دیاربوو پڕۆڤەی دەکرد ببێتـە گەورەی منداڵەکانی ئێمە، لەدوای باوکی.

گوتم:

لـەو مـەملەکەتە پڕ خێروبێرە
مـیللەت برسـیە، بەرپرس تێرە
ئەگەر مەنگۆلە، گەر گێلە هێڕە
کوڕ لـــەجێی بابی خۆی سکرتێرە

## خۆپەراوێزخستن

لەدوای ڕاپەرینە پیرۆزەکەی گەلی باشـوری کوردسـتان و حوکمی خۆبەخۆ، لەو ڕۆژگارەدا پیاوەکانی بەعس وەک مستەشارو ڕەفیق حیزبی و مەفرەزە خاسەکان، هەر بابا بوو خۆی بەحیزبێکەوە هەڵدەواسـی. بەزۆری خۆیان دەدایە پاڵ پارتی و یەکێتـی. لەبەرئەوەی دوو هێزی کاریگەری سـەر گۆڕەپانی کوردسـتان بوون و خـاوەن دەسـەڵات بـوون. دیارە سـێبەری ئەوانیان بە پارێزراوتـر دەزانی لە حیزبـە بچوکـەکان. یەک لەو کوڕە سـەرۆک جاشـانەی زەمانـی بەعس، لەگەڵ

خالّم قادرو بێستون کەوتبوو، کە پێشمەرگەی دێرینی پارتی بوون. بێستون بۆی گێڕامەوە: ڕۆژێک لەگەڵ ئەو کوڕە جاشە لەهەولێر، لەگەڕەکی تەیراوە دەیانەوێ ترومبێلەکەیان لە تەیراوە ڕابگرن، بێستون لەگەڵ لێوی شۆستەکە، ترومبێلەکە جووت دەکاو ڕایدەگرێ، بەگوێرەی یاسای هاتوچۆ. لەناکاو ئەو کوڕە جاشە، سوکانی ترومبێلەکە دەسوڕێنێ بۆ ناوەندی شەقامەکە، دەڵێ: دەبێ لەناوەندی شەقام ڕایگرین، خۆ ئێمە ماست فرۆش نین، ئاوا بەگوێرەی یاسا ڕایبگرین!! بۆ ئێمە زۆر شەرمە، وەک خەڵکی ئاسایی ترومبێل ڕابگرین، ئێمە چەکدارین دەبێ لەخەڵکی ئاسایی جیا بین. ناکرێ وەک ترومبێلی ماست فرۆشان ڕایبگرین، ئابرومان دەچێ و کەس لێمان ناترسێ. ئێمەی پێشمەرگە لەچاو ئەو هەموو جاش و چەکدارەی زەمانی بەعس کەمینە بوین، بۆیە ئەوان توانیان زۆربەی پێشمەرگە بخەنە ژێر کاریگەری کولتوری بەعس، وەک ئێستا ڕۆژانە دەست و پەنجەیان لەگەڵ نەرم دەکەین، ئەوەی لەگەڵ ئەو کولتورەی بەعسە نەگونجا، ئێستا لە پەراوێز ژیان دەکا. یان لە بەرامبەر ئەو واقیعە تاڵە سەری خۆیان هەڵگرت بۆ هەندەران. یان لەماڵەکانی خۆیان قەتیس مانەوە و حوکمی ( ئیقامەی جەبریان بەسەرخۆیان دا سەپاند) واتە: نیشتەجێ بوونی بەزۆرەملێ وەک بەندە و هەزارانی تر.

# کۆمەکی شێتەکان

لەڕانیە بەرامبەری مزگەوتی ناجیەخانێ، دوکانێکی تایەفرۆشی هەبوو کە خاوەنەکەی، پیاوێکی چلوهەشت ساڵی بوو، بەناوی ڕەمەزانی ڕەسوڵ ئاڵی، ساڵی ٢٠٠٤ بوو، ماوەیەک بوو بەلای دوکانەکەی ئەودا تێپەڕ دەبووم. بێ ئەوەی من بناسێ، یان تەنانەت ناوم بزانێ، زۆربەی ڕۆژەکان هەڵوەستەیەکم دەکرد. نیوەڕۆیان لەلای دوکانەکەی، بەدەستی خۆی خەریکی نان دانی شێتەکانی ڕانییە بوو. بۆ من دیمەنێکی سەیر بوو، لەکاتێک لە کۆمەڵگای ئێمە، ئەوەی شێتیش نەبێ، تۆزێک کاڵ فام بێ شێتی دەکەن، هێندەی پێ ڕابوێرن و پەلە بەردی تێ بگرن. بەڵام ئەو برادەرە نانی بۆ هەموو شێتەکان دەکڕی و چای

دەدانــێ. زۆرجار جنێویان پێ دەدا، یــان لای دوکانەکەی، خۆیان پیس دەکرد، میزیان بە داروديواردا دەکرد. لەلای کاك ڕەمەزان زۆر ئاســایی بوو. شــێتەکان زۆربــەی هــەرە زۆریان ناویــان مەحەمەد بــوو ( مەحەمەد هەمــزە، مەحەمەدی تیتۆکــەی، مەحەمەد نیلی، بە حەمەنیلی ناســرابوو، لەگــەڵ چەند محەمەدێکی تــر)، ڕۆژێــك کاك ڕەمەزان بە مامۆســتا حەمەدەمین دەڵێ: مســتێکم لێ بدە، ئەویــش نازانێ بۆچیە، مســتێکی لــێ دەدا، حەمەنیلی ئــەوە دەبینێ دەکەوێتە ڕاونانی مامۆســتا حەمەدەمین، بە زۆر خۆی لەدەســتی ڕزگار دەکات. حەمەنیلی تایبەتمەندیەکی هەبوو، نەیدەهێشــت هیچ بەردێك لەســەر شــەقامەکان هەبێت، گورج لەســەر ڕێگای خەڵکــی فرێیدەدا. بەداخەوە ڕۆژێك ئۆتۆمبێل لەکەسێك دەدا لەڕانیە، جەنازەکەی دەبەنە مزگەوتی گەورە، کەس نایناسێتەوە. گومانیان بــۆ پەیــدا دەبێت کە حەمەنیلی بێ. بۆیە لــەدوای کاك ڕەمەزان دەچن، دەڵێن: وەرە ســەیری ئەو جەنازە بکە، بزانە حەمەنیلی نییە؟ ئەویش گوتی: کە چووم ســەیری بکــەم، حەمەنیلی بۆ خــۆی ڕەش بوو، ئەو جەنازەیە ســپی بوو، بۆیە گوتم: حەمەنیلی کاتی خۆی ڕانی سوتاوە، کە ڕانمان هەڵکرد، سوتابوو، گوتم: ئــەوە حەمەنیلیە، کاك ڕەمەزان زۆری پەرۆش بوو.

## شیوعی

لــەدوای ڕاپەڕینەکــەی ســاڵی ١٩٩١، هەندێــك لەبەرپرســانی حیزبی شــیوعی کوردســتانی و دەوروبــەرو خزمەکانیــان، دەمیان لە مێژوی خەباتــی ئێمەمانان نــاوە، بــە وەرگرتنی بودجــەو ئیمتیازات وەرگرتن. وەك زەوی و زۆر شــتی تر، لە پارتی و یەکێتی، لە ئارەق و فرمێســك و خوێنی ئێمە کەڵك وەردەگرن. لە زۆر شــت لەگــەڵ پارتی و یەکێتــی بۆمان جیاناکرێنەوە، مەگەر پشــتیان ڕەنگ بکەم. زۆربەیان دوو ژنیان هێنا، (ئاخر ئێمە لە ساڵی حەفتاکان عەولا قولیمان لەحیــزب دەرکــرد چونکــە دوو ژنی هێنابوو، ئاخر حیزبی شــیوعی و ســەهمی حەج!!) مێژوێکمان بۆ نەخشاندن، بەشی چەندین ساڵی تریان دەکات، لەسەری بلەوەڕێن. چۆن دەبێ وتەبێژی حیزبێك نەزانێ لەدەســەلاتە یان ئۆپۆزســیۆنە!!

لینیــن دەڵــێ: هــەر حیزبێکی شــیوعی، جێــگای ڕەزامەندی پارتە بــۆرژواکان بــوو، بێگومــان ئــەو حیزبــە لای داوە، حیزبــی شــیوعی عێراق چونکــە لەگەڵ نارەزایەتیەکانی خەڵکە، چەند کورســیەک بەدەست دێنێ، بە پێچەوانەی حیزبی شیوعی کوردستان.

# پێویستمان بە شۆڕشی ڕۆشنبیری هەیە

شۆڕشــی وشــیاری نەتەوەیــی و سیاســی، حاجەتێکی هەنووکەیــی زۆر گرنگە، بۆیە دەڵێم: شۆڕشــێکی زهنی. لەدوای داگیرکردنی شــاری عەفرین لە ڕۆژئاوای کوردســتان، ڕۆژێک کە خەڵکەکەی ئاوارەبوون لە کەمپێکی نزیک شاری عەفرین نیشــتەجێ بوون. ڕوســیا چەند کامیۆنێک ئازوقەو کەلوپەلی پێویســتی ڕۆژانەی بــۆ خەڵکــی ئاوارەی عەفریــن بردە کەمپەکەیــان، ئەو هەموو پیــرەژن و پیاوو منداڵە، بەڕیزوەســتابوون، بەو کەســانەی کەلوپەلەکانی ڕوسیایان پێبوو،گوت: زۆر زۆرمــان پێویســت بــەو کەلوپەلانە هەیە، بــەڵام لێتــان وەرناگرین، چونکە ناپاکیتان لە ئێمە کرد. ئێمەتان کردە کارتێک بۆ ڕەزامەندی تورکی داگیرکەر و چەتەکانی، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن مرۆڤ دۆستن، ئێمەتان دەربەدەر نەدەکرد لەســەر زێدی خۆمان، بۆیە لەکوێ هاتوون بڕۆنەوە بۆ ئەوێ.

چەند ڕۆژێکی پێچوو، لەشکری تورکی داگیرکەر بە چاوساغی هەندێک (گورگەمێش) هاتنــە گوندی بەرمیــزە، خەڵکی گوندەکــە نانیان لەگەڵ خــواردن، بەربانگیان لەگەڵ شــکاندن، بۆیە ئەگەر لە باشــور شۆڕشــێکی زهنی لە مێشکی مرۆڤەکان بکرابایــە، ئــەوە لە بەرمیزە ڕوی نەدەدا. گەنجی کورد ئاڵای تورکیای بەســنگی خــۆی هەڵواســی بوو. ئــەوە گوناهی ئــەو گەنجە نییە، گوناهی دەســەڵاتدارانی هەرێمی کوردســتانە لە باشــور. هــەر ئەوکاتە گوتم: شۆڕشــی چەکداری ئەگەر شۆڕشــێکی زهنــی لەگەڵ نەبــێ، تاکەکان و کارەکتەرەکانی شۆڕشــی چەکداری ڕەنگە تەقە و هێرش بکەنە ســەر برپرەی پشــتی خۆیان، لە جیاتی داگیرکەرانی کوردستان. پارتە سیاسیەکانی باشوری کوردستان، لە وتاریان کەمێک جیاوازی نیشــان دەدەن بۆ چەواشــەکردن و گەمژەکردنی مرۆڤی کــورد، بەڵام لەکردار و

ڕەفتاریـــان بـــۆم لێک هاوێر ناکرێـــن، ئاخر ئەوان توخم و ڕەچەڵەکی سیاســـیان دەگەڕێتەوە بۆ یەک هەناو، تاوەکو ئێستا هیچ کامیان ئەوی تری تێنەپەڕاندوە. لەمیانەی حوکمڕانی بیســـت و هەشـــت ســـاڵەیان، دیموکراتیەت و هەڵبژاردنیان ئەتک کرد، دادگا و دادوەرەکانیان خســـتە ژێر پرســـیار، پەروەردە و خوێندن و تەندروستیان ئیفلیج کرد. پڕۆسەی بە تێکۆشەر ناساندنی خائینانیان دەستپێکرد. پڕۆسەی ئاوەڕووت کردنی کۆمەڵگا لە بەها جوانەکانی مرۆڤ و داماڵینی مرۆڤی کـــورد لە ڕوحیەتی وڵات پارێزی و خۆشەویســـتی خـــاک بەردەوامە، بەکوردی و بەکورتی: سەد کۆمەڵناسی وەک عەلی وەردی ناتوانن کۆمەڵگای باشور شیتەڵ بکەن.

ئەو پەرتوکەی لەبەر دەســـتت دایە، کە خۆی لەبیرەوەریەکانی مندا دەبینێتەوە، لەکاتێکدا بڵاو دەبێتەوە کە سەدەیەک بەسەر پەیمانی سیڤەردا تێپەڕدەبێت. کە لە ساڵی ١٩٢٠ لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانی سەرکەوتووی جەنگی جیهانی یەکەم و تورکیـــا مۆرکـــرا. یەکەم بەڵێنامەی نێو دەوڵەتی یاســـایی بوو، کەدانی بەمافە ڕەواکانی گەلی کورد دانابوو. بەڵام کاتێک ( کەمالیەکان) لەتورکیا دەسەڵاتیان کەوتە دەســـت، لەدوای سێ ســـاڵ لەو پەیمانە هەڵگەڕانەوە، پەیمانی سیڤەریان لەگۆڕنا. پەیمانە شـــوومەکەی لۆزان جێگەی گرتەوە. وەک دابەشـــکردنی میراتی بابیـــان، کەوتنە دابەش کردنی خاکی کوردان. لەو ڕۆژەوە، گەلی کورد لەهەوڵی ئەوە دایە مافە ڕەواکانی بەدەست بێنێ بە ئاشتی. کەهەمیشە شارێگەی یەکەمی بوە. زۆر جاریش ناچار کراوە، پەنا بۆ چەک ببات، بۆ خۆپاراستنی ڕەوا. وەک ئێســـتا لە ڕۆژئاوای کوردستان، بەبەر چاوی دنیای مۆدێرنەدا دەبیندرێ، نەوەی کەمالیەکان بەهەمان زهنییەتی ســـەد ســـاڵ بەرێ، هەڵس و کەوت لەگەڵ کورد دەکەن. منیش لەبەر ئەوەی، شەســـت و پێنج ســـاڵ تەمەنم کەوتۆتە ناو جغزی ئـــەو ســـەدەیە، کە بەچاوی خـــۆم زۆر پەلاماری دڕندانەی نـــاڕەوای داگیرکەرانم دیـــوە، بۆ ســـڕینەوەو قڕکردنی گەلی کورد. بۆیـــە هەروەک چۆن بە ئەرکی خۆم زانیوە، لەهەمبەر چەوســـانەوەوداگیر کاری تەماشـــا چی نەبم، ئاواش بە ئەرکی خۆمم زانیوە بیرەوەریەکانم یاداشـــت بکەم و بیخەمە بەردەستی نەوەی تازە، بۆ ئەوەی ئەرشـــیفی ئەزموونی ئێمە بەر پێیان ڕووناک بکاتەوە.

# وەسیەت نامەم

داواکارم لە کەسوکار و برادەرەکانم، کاتێک دەمنێژن ئەو تێکستەم بخوێننەوە:
( بۆ ئەو دەمەی دەچمە ئامێزی خاک).

من بەجێمهێشت ئەو جیهانە پڕ لەئەندێشەو خەمە
لە ئامێزی خۆشەویستی خاکەکەم ئاسوودەمە
تازە بە من چی بەیانە، وا بەیانی وادەمە
ئەوەی بەکارم دێ لێرە تەنها کاروو چاکەمە

ناپرسم کوا توێشوی ڕێگەم، نە پەلەی سەرسفرەمە
بەکەس ناڵێم کوانێ مافم، بۆ بەشم هەر ماتەمە!!
هەتاکوو ڕۆژی حەشر دێ ئێرە جێگەو ڕێگەمە
گوێم لێتە، بۆم بخوێنەوە بۆئەو بەرهەمە، هەمە

لەو گەشتە دوورەی ژیانم سەگی زۆر جێم پێ وەڕی
ئێستاکە وەعدەی میعادە قەلی مەرگم لێ قڕی
هەمووتان هەر دێنە ئێرە تەنها خودا نامری
کەس تاسەر لەدنیا نابێ تێهەڵدەدرێ بوزگوڕی

لێرە کەس باڵادەست نییە لەوی تر بکات ستەم
نەکەس ڕاوە دوی من دەنێ نە من ڕاوی کەس دەکەم
دەوڵەتی کوردانم نەدی هەوڵم بۆدا داخەکەم
بەڵێن بێ ڕۆژی حەشر بێ ئاڵای ئێوە هەڵدەکەم

لــه کۆتاییــدا دەمــەوێ داوا له کەســوکارم بکــەم، هەرچەندە دەزانــم بۆ ئەوان ســەختە، بــەڵام هەموو ئەندامانی جەســتەم لــەدوای مردنم دەبەخشــم بۆ هەر مرۆڤێــک کە کارەکــەی پێ ڕاپی دەبێت، گرنگ نییــە چ نەتەوەیەکەو چ دینێکی هەیە، تەنها بۆ ئەوانە نەبێ کە ناپاکی نیشــتمانی و نەتەوەییان لە گەل و خاک کردوە.



شـەهید یاسین حاجی تاهیر (۱۹۷۳ ـ هەولێر )



لە راسـتەوە: حازم، شەهیدحسێن حاجی تاهیر (۱۹۷٤ ـ هەولێر)



لەراســتەوە: شــەهید عمر گێرسە، شەهید کەریم (١٩٨١ ـ بەستی شەرغە)



حازم ( ١٩٧٤ ـ ســەربازگەی هەولێر )



شـەهید کەریم عەلی کوتک (١٩٨١ ـ پشت ئاشان )



لەراستەوە:شـەهید کەریم، شەهید ملازم ئارام (١٩٨١ ـ بۆڵێ)



شـەهید عەباس محەمەد (١٩٨٣ ـ ئێران)



حازم عەلی کوتک (١٩٨٣ ـ پیرانشـار)



هاوڕێ عەلی کوتک، (دەڤەری بارزان ١٩٨٤)



لەراستەوە: هاوڕێ عەلی کوتک، حازم (بارزان ـ ١٩٨٤)



لەراستەوە:ئەبوجوان، حاجی جەمال، شەهید رۆستەم، قادر(گوندی بۆڵی ـ ١٩٨١)



لەراستەوە:کانەبی گەورە، حازم، هەڵکەوت (١٩٨٣ ـ سێڵوێ)



هەردی عەلی کوتک (١٩٨٣ ـ ماشـکان)



دڵشـادی شەهید کەریم لەئامێزی حازم (١٩٨٣ ـ سماقوڵی)



ئاراس حازم نیتاقی کردووەتە جۆلانە (١٩٨٥ - هۆستان)



ئاراس حازم لە بەردەم کونەتەیارە لەچاوەڕوانیدایە (١٩٨٥ - بارزان)



لەیەکەم کەســەوە؛ مام عەلی کوتک، حازم، شــەهید حاجی، تەحسین، هەردی، بۆتان، ئەردەلان، هاوار، دلێر (١٩٨٥ ـ پێش خانووی شـێخ عوسـمان بازرانی)



لەراستەوە:حەســەن کاکە، مام سەعید، شەهید سالار، عەلی کوتک مام جوامێر (رێزان ـ١٩٨٥)



لەراستەوە:شـەهید داود، حازم (١٩٨٣ ـ گوندی هەمزاوە)



لەراســتەوە :حازِم، شەهید سەرباز، شەهید بڕیار (١٩٨٣ ـ سێڵوێ)



لەراستەوە:حازم، شەهید کاکە سوور (١٩٨٦ ـ گوندی بۆڵقامیش)



لەراستەوە:کەڵەکوان، حازم، شەهید عەونی (١٩٨٥ ـ پەڕینەوە بۆ ڕێزان)



**دانیشتوان لەراستەوە هاوار، ئاسۆ، تەحسین**
**وەستاوەکان لەراستەوە:هەردی، جەنگی، حازم، مام پیرداود**
**(١٩٨٤ - ڕێزان)**



**خێزان و منداڵەکانی نووسەر لەژێر ڕەحمی تۆپباران (١٩٨٥ - گەلی پڵنگان)**



لەراستەوە:شــەهید فاخیر، حەمە ڕیش، کرێکار، شێخە، شەهید کۆسرەت،
ئاسـۆ، مامۆستا دیار، شەهید حاجی محمد (١٩٨٤ ـ بارزان)



لەراســتەوە:کرێکار، کانەبی گەورە، ئەبو میلاد، شـێخە، ئاسۆ (١٩٨٥ ـ گەلی
خەلک)



**لەراستەوە:شــەهید جیڤارا، حازم، فەهد پۆڵا (کەپە) (١٩٨٥ ـ بەری گارە)**



**لەراستەوە:حازم، موحسین یاسین، شەهید ملازم ڕەنجبەر (١٩٨٦ ـ گەلی خەڵک)**



لەراستەوە:حازم، شەهید دکتۆر عادل، ڕێبوار، ئاسۆ، شەهید جیڤارا، هاوار، بۆتان
دانیشتووەکان لەراستەوە: شێخ لەتیف و سورە (١٩٨٥ ـ بانێ)



لەراستەوە:مەحموود حاجی نادر، حەمەدەی مام عەولای، حازم (١٩٨٥ ـ چیای پێرس)



نووســەر لەگەڵ هاوســەر و منداڵەکانی (دیڵزێ ڕۆژهەڵاتی کوردستان ـ ١٩٩٥)



ئاســۆ مام عەلی کوتک (١٩٨٦ ـ بیرکەکۆر)

# فەرهەنگۆك:

**ئاوەڕوت:** داماڵینی پەڕو باڵی باڵندە
**هاوێر:** لەیەکتر جیاکردنەوەی مەڕو بەرخ
**ئەنگوچک:** تیرێژی ئانیشـکی کراسی کوردی
**گێشـکە:** پاک کردنەوەی دانەوێڵە بە بێژینگ
**ئاوقات:** لە باکوری کوردسـتان بە پارێزەر دەگوترێ
**سـەرکوت و بن کوت:** پاشماوەی دانەوێڵە لە دوای لەبێژینگ دان
**ئەسـتێرک:** لەسەر یەک دانانی پێخەف و سەرین
**کوزر:** بەو گرێیە دەگوترێت کە لە قەسـەر دایە
**ئاودڕ:** ئەو شەقاڵەی ئاو دەیدڕێ
**بزگـوڕ:** بەجل و بەرگی کۆن دەگوترێ
**مەرکەز شـەباب و تەلایع :** دوو ڕێکخراوی سەردەمی بەعس
**باول :** لەتەنەکە دروسـت دەکرا بۆ هەڵگرتنی شتومەک
**گرگن:** مرۆڤی بودەڵە
**بەریـوک:** بەو ژنە دەگوترا کە بووکی بۆ زاوا دەهێنا
**هەوسـار:** بەو پەتە دەگوترێ کە ئاژەڵی پێ ڕست دەکرێ
**بەدرەقە:** ڕێ نیشان دان
**هەرزەلین:** ترازان
**تیتـوڵ :** دڕاویەک کە بەڵکی پینە کردن نایەت
**سەرچیغ:** تەنها ڕوشاندنی ئامانج
**توربێن:** هەگبەی بچووک
**پزدان:** وێڵاش
**تەڕاح:** ئەوەی کە دانەوێڵە دەکڕێ و دەفرۆشـێ
**دیماگۆگیەت:** دیوێکی ڕەشـی دیموکراسی چەواشەکاری
**هەڵاواردن:** پەراوێزخستن
**تەلەف:** لەکارخستن

**جەزم:** سەرمەست بوونی عیرفانی

**جوانو:** بێچووی ماین

**حەمەدۆک:** ناوی پاڵەوانی رۆمانێکی یەشـار کەمال

**هەڵم و بەڵم:** باش نەجوین

**حێلات:** رەوەند

**دەرخۆنە:** بۆ داپۆشـینی سەری زۆر شت بەکاردێ

**عەشتەبا:** هیچ

**کەپەسیسە:** لەسەر یەک کەوتن

**لوغە لوغ:** کاتێ منداڵ خەریکە فێری قسـە دەبێ

**یاساغ:** قەدەغە

**دەهری:** تورەبوونێکی زۆر

**دان بژێر و بەردەشـۆر:** شووشـتنەوە ی دانەوێڵەو جیا کردنەوەی دانەوێڵە و بەرد لەیەکتر

**مەحچەچە:** خڕنووکی وشک

**شـەوارە:** ئێشکگرتن لەمنداڵی تازە لەدایک بوو

**هەوێز:** ئەو شـوێنەی مەڕی لێ رادەگرن

**ریە:** پێوەری دانەوێڵە

**کـەرە مەڕ:** بەو کەرە دەگوترێ لەگەڵ مێگەلە مەڕدایە

**فرچک:** یەکەم قومە شـیر لەدوای لەدایک بوون

**مۆرە:** لێڕوانینێکی تورە

**پێخـۆر:** هەر خواردنێک نانی پێوە بخورێ

**خێس بوونەوە:** تێڕوانینێکی قوڵ

**خرت:** بەرانی دوو ساڵە

**فـەروج :** لەنێوان جوجکە و باڕۆکە

**مۆرەدار:** دارێکی ئەستوور

**قەشاویش:** لاواندنەوەی ئاژەڵ

**کافور:** زۆر سپی

**کەڵەکوان:** سەوڵ لێدەر

**غەزرین:** مان گرتن

**مـارە بەجاش:** جۆرێکە لە چاک کردنەوەی تەلاق

**شارژ:** پڕکردنەوە

**فەرهود:** تاڵان

**قابیلی نیە:** شایەنی نیە
**مەخسەرە:** گاڵتەجاڕی
**نەقڵ:** گێڕانەوەی ڕووداوێک
**پادگان:** مۆڵگە
**چەرچی:** وردەواڵە فرۆش
**سۆسەکردن:** پشکنینی ئامانجی سەربازی



## تکـــــايـه

کۆدی ئەو تەلیسمانە بشکێنن
کە کۆمەڵگای پاش ڤەرۆ، وەکو جغزێك بە چوار
دەوری داکێشاون
هەر بۆ ئەوەی سبەینێمان، کت ومت
وەك دوێنێ نەبێ
لە ئاکامی بێ تفاقی باری ئەو نەوەی داهاتوو
لەوەی زیاتر قورس نەبێ
نەبنە داردەستی ئەوانەی بۆ یەك ژەمی
ماسی برژان، پەنا دەبەن بۆ سوتانی
تەختەرەشی منداڵەکان
نەبنە خەلفەی ئەو وەستایەی
دیواری زیندانی خۆتان پێ هەڵدەچنێ
نەبنە هەسان و مەسەدی
ئەو قەسابەی، کێرد بۆ ملی ئێوە دەسوێ
بچنە سەر ئەو شاریگەیەی
بەرەو خۆرەتاوتان دەبا
تامی فرچکی یەکسانی و دادپەروەری و، دەرخوارد دەدا
وانەزانی، بچووك کردنی بەرامبەر
گەورەیی تۆ نیشان دەدا
تەنها و تەنها بەیەك بونمان
سەرکەوتن مسۆگەر دەکا

حازم عەلی کوتك

٢٠٢٠